www.alibapir.com

عەلی باپیر

# پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ

و

## دەرس و پەندەکانی

بە دەستکاریی و لێ زیادکردنەوە

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
عەلی باپیر/AliBapir
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

التفسير
چاپی سێیەم

www.alibapir.com

# پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دەرس و پەندەکانی

به دەستکاریی و لێ زیادکردنەوە

عەلی باپیر

چاپی سێیەم
١٤٣٤ - ٢٠١٢




بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن

www.alibapir.com

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب : | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دەرس و پەندەکانی |
| ناوی نوسەر: | عەلی باپیر |
| چاپ و بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی ناوەوە: | عزالدين محمد |
| خەت : | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ: | ئەمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | سێیەم ١٤٣٤ك – ٢٠١٢ز |
| تیراژ: | ٢٠٠٠ دانە |

مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە بۆ
نوسینگەی تەفسیر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن (٢٥٥١)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر – شەقامی دادگا – ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com



www.alibapir.com

چاپکردنی بە شێوەی کتێب کاتێ بە نصیب بە گوێرەی

توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە لەمێژ بوو هیوام وابوو شێوە چاپکردنێکی

وای بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانی بێ . جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵدەستێ .

خوا بەرەکەت بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت ، هەمیشە سوپاسیان دەکەم .

عەلی باپیر

www.alibapir.com

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد ومن والاه

بەندە (عەلی باپیر)، ٢ برای مامۆستا مخلص و شەوهێنگەی تەفویضم تەخویل کرد بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و پیتی زیاتر بخاتە ئیشی و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسی دیکە مافی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

عەلی باپیر

١١ ربيع الثاني ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

www.alibapir.com

# پێشکەش بێ

بە هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری کۆتاییان ﷺ لە خۆیانو باب‌و دایك‌و سەرجەم خزم‌و کەس‌وکارو تێکڕای خەڵکی خۆشتردەوێ‌و، بەهۆی شوێن پێ هەڵگرتنی‌و بەرجەستەکردنی بەرنامەو ڕێبازەکەیەوە، لەژیانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتییاندا، دەعوای لە هەموو کەس زیاتر خۆشویستنییان، پەکی لەسەر ئیسپاتکردن ناکەوێ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# ئەم کـــتێـبـە

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له.

وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾(١) آل عمران.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾(٢) النساء.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾(٣) الأحزاب.

---

١) واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی، وە بە مسوڵمانیی نەبێ مەمرن).

٢) واتە: {ئەی خەڵکینە! لەو پەروەردگارەتان بترسن کە لە تاکە کەسێك (ئادەم) دروستیکردوون، هەر لەویش هاوسەرەکەیشی (حەوا)ی دروستکرد، وە لەو دووانەیش (ئادەمو حەوا) پیاوانو ئافرەتانێکی زۆری بە دنیادا بڵاوکردەوە، وە پارێز لەو خوایە بکەن کە بە ناوی وی شت لە یەکدی داوادەکەن، هەروەها خزمایەتی بپارێزن، بێگومان خوا چاودێرە بەسەرتانەوە}.

٣) واتە: {ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو قسەی راستو رێکوپێك بکەن، ئەوسا (خوا) کارەکانتان بۆ چاك دەکاتو، گوناهەکانتان بۆ دەپۆشێ، وە هەر کەسێك گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بێگومان سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە}.

www.alibapir.com


أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّـهِ، وَخَيْـرُ الْهَـدْيِ هَـدْيُ مُحَمَّـدٍ، وَشَـرُّ الأُمُـورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلُّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ[(١)].

خوێنـەری سەنگین‌و شیرین!

ئـەم کتێبـە بریتیـە لـەکۆی پەنجاوچـوار دەرس، کـە لـەژێر ناوونیشـانی: (پوختـەی ژیاننامـەی پێغەمبەری خوا ﷺ)دا، پێشـکەش کـراون‌و پـاش هێنرانـە سـەر کاغـەزو سووکە دەستکارییەك، کە شێوازی کتێب دەیخوازێ، بەم جۆرەی لێهاتوە.

ئنجا ئەوەی لێرەدا بەپێویستی دەزانم، ئەگەر بـەئاماژە پێکـردنیش بـێ بـاس بکـەم لەم چەند خاڵەدا دەیخەمە ڕوو:

یەکـەم: ئاشـکرایە، کـە بـاس‌و خـواس‌و لێکۆڵینـەوە لـەبارەی ژیـان‌و گـوزەران‌و بەسەرهاتەکانی پێغەمبەرمان (محمد)ەوە ﷺ بەتایبـەت بـە زمـانی عـەرەبی زۆرو زەوەندن، خوا پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە، بـەزمـانی کـوردیش کـەم‌و زۆر بـاس‌و لێکۆڵینـەوە لـەو بـوارەدا هـەن، بـەڵام بەڕاسـتی ئێسـتاش ئاتـاجیی زۆر لـەوبارەوە هەیەو، ئەم هەوڵەی بەندەش هەنگاوێکـــە لـەو ڕێیـەداو، هیـوام وایـە کـەلێنێکی باش بگرێ.

دووەم: تایبەتمەندیی‌و ئیمتیازێکی گرنگی ئەم کتێبەش، بریتیە لـە پشتبەسـتنی زۆری بە قورئان، چونکە بێگومان ڕەوشت‌و هەڵس‌وکەوت‌و ژیـان‌و گـوزەرانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، هـەمووی بـەپێی قورئـان بـووەو لەبـەر ڕۆشـنایی قورئانـدا بـووە، وەك دایکمان عـائیشە -خوا لێی رازی بێ- لە وەڵامی (قتـادة)دا کـە لـەبارەی ڕەوشـت‌و

---

١) ئەمە (خطبة الحاجة)ی پێدەڵێن کە وابباشە پێش هەر وتارو لێدوانێکی گرنگ بگوترێ. رواها إبن ماجه: ٤٥، وأحمد: (١٤٣٣٤)، (١٤٣٨٦)، ومسلم بعضها: (٤٣)، (٤٤)، ( ٨٦٧).

ڕەفتاری پێغەمبەرەوە ﷺ پرسیاری لێکردوە، گوتوویەتی: (..فإن خلق نبيّ الله ﷺ كان القرآن) رواه مسلم[1].

بەڵێ ئێمە هەوڵمانداوە بەپێی تواناو بۆ لوان زۆربەی ئەو ئایەتە بەپێزانە کە پەیوەستن بە هەڵوێستو ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەرەوە ﷺ، بیانهێنین، یان لانیکەم ئاماژەیان پێبکەین.

سێیەم: هەروەها تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە هەوڵمان داوە گرنگیەکی زۆر بەهێنانەوەی ئەو دەقانەی سوننەت بدەین کە پەیوەستن بە ژیانو گوزەرانو بەسەرهاتو هەڵوێستەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ، بەتایبەتی ئەو دەقو فەرمایشتانەی کە هەردووك کتێبی: (صحيح البخاري)و (صحيح مسلم) هێناویانن، وە هەوڵیشم داوە کە هیچ قسەیەك لەبارەی هەڵوێستو ڕووداوەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ نەهێنم، کە پشتبەستوو نەبێ بە سەرچاوەیەکی متمانەپێکراوو موعتەبەر.

چوارەم: بەپێی توانا ویستوومە ئەم ژیاننامەیە کورتو پوخت بێتو زیاتر بابەتە سەرەکییو گرنگەکانی سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ بخەمەڕووو زۆر نەچمە نێو وردە بابەتەکانەوە، هەروەها بۆ خستنە ڕووی پەندو عیبرەتەکانیش بەهەمان شێوەو بگرە جاری وایە پەند وەرگرتنەکە حەواڵەی سەلیقەو هۆشی خوێنەر کراوە، چونکە بەزەقی دیار بووە، یان هەربەکورتی ئاماژەی پێکراوە.

پێنجەم: سەرچاوەکانی ئەم کتێبەش پاش قورئانو سوننەت، کە بە پلەی یەکەم پشتیان پێ بەستراوە، بریتین لە:

١- (السيرة النبوية لابن هشام)[1]، کە یەکەمینو گرنگترین سەرچاوەیەو هەموو ئەوانەی دوای خۆی پشتیان پێبەستوە.

---

١) صحيح مسلم : ١٧٣٦.

www.alibapir.com

٢- (البداية والنهاية)ی (ابن كثير)، كە وێڕای پشتبەستنی بە كتێبەكەی (ابن هشام) خۆیشی لێكۆڵینەوەی زیادەی هەیە.

دیارە جاروباریش سوود لە: (السيرة النبوية الصحيحة)ی (د.أكرم ضياء العمري)و (السيرة النبوية)ی (د. علي محمد الصلاّبي) وەرگیراوە.

شەشەم: وە لەكۆتاییدا بەپێویستی دەزانم كە وێڕای سوپاسگوزاریی‌و دووعای خێر ئاماژەبكەم بەو كەسانەی كە دەوریان بینیوە لە هاتنەدی‌و سازبوونی ئەم بەرهەمەدا، كە دیارە لێرەدا بەگوێرەی ڕیزبەندیی كارەكانیان لە ڕووی زەمەنییەوە باسیان بكەم.

١- (موحەممەد)ی كوڕم كە هەر پەنجاوچوار دەرسەكەی لە ماوەی مانگێكدا لە كاسێتەوە هێنایە سەر كاغەز.

٢- كاك (ئەبووبەكری)ی برام‌و كاك (زانا حەسەن بابەكر) كە تایپیان كرد.

٣- مامۆستا (حەسەن بابەكر) كە پاش تایپكرانی، بەوردی پێیدا چۆوەو وەك خۆی گوتوویەتی: جاروبار دەستكاریی هەندێك ڕستەو بڕگەشی كردوەو زۆر لە فەرمایشتەكانیشی (تخريج) كردوون.

٤- كاك نەوزاد كۆیی (نەوا محمد سەعید) كە وەك عادەتی هەمیشەیی زۆر بە وردیی پاش دیزاین‌و كۆتاجار بەم كتێبەو سەرجەم كتێب‌و نامیلكەكانی دیكەشمدا، كە لە نووسینگەی تەفسیر چاپ كراون، چۆتەوەو، لە تێبینی‌و سەرنجەكانی سوودمەند بووم.

٥- كاك (حەیدر موزەففەر) كە پاش پێداچوونەوەی خۆم دووبارە، بە هەڵەگیرییەكەدا چۆوەو لەسەر كۆمپیوتەر ڕاستی كردەوە.

---

١) ئەو چاپەی كە من لەبەردەستم بوو لەكاتی پێداچوونەوەی ئەم كتێبەدا بەم شێوەیە: چوار بەش (جزء)ە لە یەك بەرگدا، دووبەشی یەكەمی سەرجەم (٤٢٤) لاپەڕەیە بەشی سێ‌وچواریشی (٤١٥) لاپەڕەیەو ژمارەی لاپەڕەكانیان پێكەوە حیساب كراون‌و، چاپی یەكەم (٢٠٠٦)ی (دار ابن الهيثم)ە.

www.alibapir.com

٦- كاك (حاجی ڕزگار) كە پاش دیزاین (تصمیم)كرانی لەلایەن برایەكەوە، جارێكی دیكە هەڵسایەوە بەچاو پێداگێڕانەوەی دیزاینەكەی.

خوا پاداشتی هەموو لایەكیان بە چاكترین شێوە بداتەوەو هەموویان سەربەرزو بەختەوەری دنیاو سەرفرازو خۆشنوودی ئەولا بكات.

شایانی باسیشە لە كۆتاییدا خۆیشم دووبارە بەوردیی پێیدا چوومەوەو ئەوەندەی بە پێویستم زانیبێ، لە زۆر شوێنان وردەدەستكارییو لە هەندێك شوێنانیش كەمو زیاد گۆڕانكارییم تێدا كردوە.

سبحانك اللّهم وبحمدك أشهدأن لا اله الاَ أنت أستغفرك وأتوب اليك

عەلی باپیر
٢٠ جمادي الأولى ١٤٣٠
١٥ مایسی ٢٠٠٩
هەولێر

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

# پێشەکی چاپی سێیەم

**الحمد لله العلي القدير والصلاة والسلام على رسول الله الأعظم ونبيِّه الخاتم محمد الموصوف بالبشير والنذير، والمشبَّه بالسراج المُنير، وآله الّذين حَفَظوا من الله الحكيم بإبعاد الرِّجس عنهم والتطهير، وهم كلّهم؛ قرابةً وصحباً وأزواجاً وذرية أهلٌ لِكُلِّ إحترامٍ وتقدير.**

خوێنەری بەڕێزو سەنگین

ئەمە چاپی سێیەمی کتێبی: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دەرسو پەندەکانی)یەتیو ئەم چاپی سێیەمە چەند گۆڕانکارییو چاکسازییەکی گرنگ لەم چاپەدا کراون:

١/ بەشێکی گەورەو گرنگی لێ زیاد کراوە بە ناوونیشانی: (شێوەو دیمەنو ڕەوشتو خەسڵەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ) کە نیزیکەی هەشتا (٨٠) لاپەڕەی گرتۆتەوە.

٢/ سەرجەم فەرمایشتەکان بەتایبەت ئەوانەی (بخاري ومسلم) هێناویانن، بە ژمارەکانیانەوە (تخريج) کراون.

٣/ دەستکاریی هەندێك دەقو ماناو لێکدانەوەی هەندێك دەق کراوە، پاش زیاتر لێوردبوونەوە بەراوردکردن، وێڕای ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەکی چاپیی.

لە خوای پەخشەرو بە بەزەیی داواکارم هەرچی زیاتر هاوکارو هیدایەتدەرمان بێت بۆ باشتر شارەزابوونو پێوە پابەندبوونی ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢٤ ڕەجەبی ١٤٣٣هـ

١٣ی حوزەیرانی ٢٠١٢ز

# پێشەکی چاپی دووەم

الحمد لله العلي الكبير والصلاة والسلام على نبيّ الله الخاتم البشير النذير والسراج المنير محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب، وآله أجمعين صحباً و أزواجا وقرابة، والتابعين لهم بإحسان.

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا محمد ﷺ بەرجەستەکەر (تجسید)ی ئیسلامەو لێکدانەوەو تەفسیری کردەیی قورئانە، بۆیە پاش قورئانی بەڕێزو پیرۆز، پێویستە بۆ تێگەیشتنی ئیسلام‌و لێ‌شارەزابوونی ڕێبازو ژیان‌و بەسەرهاتی پێغەمبەری خوا ﷺ پشکی شێری پێ ببڕێ‌و گەورەترین گرنگی و بایەخی پێبدرێ لە هەموو ڕووەکانییەوە، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ سەرمەشق و پێشڕەوو چاوساغمانە لە تێکڕای بوارو لایەنەکانی دینداریی‌و دنیاداریی دا، وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقێکی باشتان هەیە بۆ هەر کەسێك، کە بەهیوای خواو ڕۆژی دوایی بێ‌و زۆر یادی خوا بکات.

وەك دەبینن خوای کاربەجێ سبحانە و تعالى بە ڕەهایی باسی سەرمەشقێتی‌و پێشڕەوێتی پێغەمبەری خۆی کردوە بۆ هەرکەسێك ئومێدی وابێ لە دنیاو دوارۆژدا شایستەی بەزەیی و پاداشتی خوابێ!

کەواتە:

پێویستە هەتا دەتوانین وردبینەوەو شارەزاو بەرچاوڕوون بین لە ناسینی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئاشنابوون‌و بە ڕێبازو سیرەو ژیانەکەی، هیچ گومانیشی تێدانیە، کە سوننەت‌و

سیرەی دەوڵەمەندو گشتگیری ئەو بەڕێزەو خۆشەویستە لە هیچ ڕوویێکەوە نائومێدمان ناکات، کە بۆمان ببێتە ڕێنمایی و ڕۆشنایی.

لەبارەی چاپی دووەمی ئەم کتێبەشەوە دەڵێم:

ئەم کتێبە: ((پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و دەرس و پەندەکانی)) لەم چاپەیدا، جگە لە ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەکی چاپی یەکەمو زیادکردنی چەند دێڕێك لە دوو سێ شوێندا، کتومت وەك خۆی هێڵراوەتەوە، ئەویش لە سۆنگەی چەند هۆکارێکەوە:

یەکەم: چاپی یەکەمی ئەم کتێبە تاڕاددەیەکی باش بەنەفەسێکی درێژەوەو بێ پەلەپەلکردن ئەنجام دراو وردەکاریی زۆری تێدا کرا.

دووەم: ئەم کتێبە هەرچەندە قەبارەکەیشی بچووك نیە، بەڵام وەك لە ناوونیشانەکەشییەوە، دیارە نەویستراوە دووردرێژ بێو سەرجەم وردەکارییەکانی سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ تێدا بێ، بەڵکو بەشتە بنەڕەتییو گرنگەکان وازی هێناوە.

سێیەم: هەرچەندە پاش چاپو بڵاوکرانەوەی هەر بەرهەمێکم، حەزم کردوەو چاوەڕێ بوومە، کە خوێنەرانی دڵسۆزو وردبین بە سەرنجو ڕەخنەو تێبینیەکانیان، من بەهرەمەندو بەرهەمەکەشم دەوڵەمەند بکەن، بەڵام لەبارەی ئەم کتێبەوە هەرچەند لەچاو قەبارەیو نرخیو ژمارەی زۆری نوسخەکانی، چاپی یەکەمی بەخێرایی بڵاوبۆوە، بەڵام هیچ تێبینیو سەرنجو ڕەخنەیەکم پێنەگەیشت، کە مایەی چاوپێداگێڕانەوەی باسو بابەتەکانی بێت.

بەهەرحاڵ بەهیوای ئەوە، کە لە چاپەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا، دەرفەتو هۆکاری باشتر بۆ چاوپێداگێڕانەوەو دەوڵەمەندترکردنی بڕەخسێ.

خوا بە لوتفو کەرەمی بێسنووری خۆی، هیدایەتی زیاترمان بداتو لەسەر ڕاستەشەقامی خۆیو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی ﷺ باشترو باشتر ڕاوەستاوو دامەزراومان بکات.

نووسەر

١٩ی صفر ١٤٣٢

٢٣ کانوونی یەکەمی ٢٠١١

هەولێر

# پێشەکی

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، کە سۆزو بەزەییەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوەو دینێکی گشتگیری هەمە لایەنەی ئەوتۆی ناردوە کەمایەی بەختەوەریی‌و سەرفرازیی ئینسانەکانە.

درودو سەلامی خوای بەخشندە بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ کە خوا هەڵیبژاردوەو کردوویەتی بە پێغەمبەرو سەرمەشقی مرۆڤایەتی وەك دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾الأحزاب. کە بە قسەو کردارو هەڵوێست‌و ڕەفتار، ئیسلامی ڕانواندوەو تەرجەمەیەکی کردەیی قورئانی بەڕێز بووەو خوای میهرەبان بەرەحمەت بۆ جیهانیانی ناردوە.

خوێنەری بەڕێز!

باسکردنی ژیان‌و بەسەرهاتی پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- بەگشتی‌و پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ بەتایبەتی بۆ کەسانێك کە بیانەوێ پەند وەربگرن، جێی پەندو عیبرەت‌و تێوەڕامانەو ئینسان لێی بەهرەمەند دەبێ، لە ناسینی خواو بەندایەتی ڕاستەقینەو یەکلابوونەوە بۆی‌و، زانینی فەلسەفەی دروستکرانی بوونەوەرو ژیان‌و مردن‌و، دنیا بەکەمگرتن‌و، بەخەمەوە بوون‌و خەبات‌و هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤەکان‌و، بەڕێوەبردنی کاروباری هەمەلایەنەی ژیانی خەڵك بە باشترین شێوەو لەخۆدا بەرجەستەکردنی چاکە بەرانبەر خواو خەڵك‌و...هتد.

هەر بۆیە خوای زانا لەچەندین شوێنی قورئانی بەڕێزدا باسی بەسەرهاتی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام-و كارو تێكۆشانو شێوازی بانگەوازو ژیانیان لەگەڵ گەلەكانیان دەكاتو، ئەوان بیری خەڵكی دەخاتەوەو وەك سەرمەشقو پێشەوایانی ژیانی مرۆڤایەتی ناویان دێنێ كە لە مێژوودا جێ پەنجەی چاكەیان دیارەو هەوڵی گۆڕینی واقعی خوارو خێچیان داوەو هەنگاویان بەرەو رەزامەندیی خواو رزگاركردنی چەوساوانو چەسپاندنی دادگەری ناوە.

باسكردنی ژیانی پێغەمبەریشمان موحەممەد ﷺو نووسین لەوبارەوە زۆر هەڵدەگرێ، چونكە باس لەمرۆڤێكی هەڵبژاردەو ناوازە دەكرێ كە خوای پەروەردگار وەك فریادرەسو رزگاركەرێك بۆ تێكڕای مرۆڤایەتی دەینێرێو بەبەرنامەیەكی هەمەلایەنەی تێرو تەسەلەوە خەڵكی دەدوێنێو لە تاریكاییەكان بەرەو رووناكی ئیسلام دەریاندێنێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝١﴾ إبراهيم.

ئەم كتێبەش (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ) كە سەرەتا مامۆستا عەلی باپیر بە (٥٤) دەرس لە هەولێر بۆ كۆمەڵێك لە خەڵكی گوتوویەتیەوەو دواتر كراوەتە كتێب، بەكورتی باس لە قۆناغە گرنگو بەسەرهاتە هەستیارو سەرەكییەكانی ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ دەكات، كە لە ژیانی پێش پێغەمبەرایەتی و دوای بوونی بە پێغەمبەر تا وەفاتكردنی پێیاندا گوزەری كردوەو روویان داوە، ئەمەش بە مەبەستی زیاتر ئاشناو شارەزابوونی خوێنەر بە ژیانی پێغەمبەر ﷺو پەندو عیبرەت لێ وەرگرتنیو شوێنپێ هەڵگرتنی زیاتری هەنگاوەكانی لە تێكڕای بوارەكانی ژیانیدا، كە خۆشویستنی بەندە بۆ خواو هی خوا بۆ بەندە بەزیاتر پابەندبوونو شوێنكەوتنی

ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ و ڕێبازە گشتگیرەکەیەوە بەندە، وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران.

قەڵەمی خاوێن و بەبڕشتی مامۆستاو دەوڵەمەندییەکەی لە ڕووی نووسینەوە وای کردوە خەڵکێکی زۆری کوردستان لێی بەهرەمەند بن و لەزۆر ڕووەوە وەك نووسەر و بیرمەندێکی ناوازەی ئەم کوردستانە سەیر بکرێ، کە نەیارە فکرییەکانیشی دان بەو ڕاستییەدا دێنن.

ئەم پوختەیە لەژیانی پێغەمبەر ﷺ تام و چێژێکی تایبەتی خۆی هەیەو بەپشت بەستن بەقورئان و حەدیس و سەرچاوەی دیکەی سیرەی پێغەمبەر ﷺ کە جێی متمانەن و لەشتی هەڵبەستراو دوورن، دەوڵەمەند کراوە، بۆیە خوێنەر زانیاری و داهێنانی تازەی بەپێزی لێ هەڵدێنجێ، کە ئەو زانیارییەش بۆ ئینسانی ئیماندار هۆیەکی سەرەکی پتەوتربوونی ئیمان و چاکتر پیادەکردنی شەریعەتی خوایە.

ئەوەی من لەم کتێبەدا پێی هەستاوم:

١- تەخریج کردنی حەدیسەکانی (بخاري و مسلم) و نووسینی ژمارەکەیان بە پێی (صحيح البخاري وصحيح مسلم)، کە لەدووتوێی ئەم کتێبەدا هاتوون.

٢- پێداچوونەوەی وردو ڕاستکردنەوەی چەند وشەو تەعبیرێك کە ڕەنگە لەکاتی هێنرانە سەر کاغەزدا پەیدابووبن و زیادکردنی هێندێك بڕگەو ڕستە.

خوای بەخشندە بەرەکەت بخاتە ئەم کتێبەو بە باشترین شێوە پاداشتی نووسەر بداتەوە.

حەسەن بابەکر

٢٠/ ٨ / ٢٠٠٩

# دەستپێك

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله (محمد) سيد المرسلين، وخاتم النبيين وإمام المتقين وقائد المجاهدين، وآله أجمعين، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.

سەبارەت بەو زنجیرە دەرسەی ئامادەم كردوە بەناوی (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ) بە پێویستی دەزانم بۆ بەرچاو ڕوونی زیاترو دەرخستنی چۆنیەتی بابەتەكە ئەم چەند خاڵە بخەمە ڕوو:

یەكەم: خوا پشتیوان بێ بە پێی توانا هەوڵ دەدەین بەپوختیی‌و كورتی دەربارەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بدوێین، دیارە (سیرە)و ژیانی پێغەمبەر ﷺ كتێب‌و لێكۆڵینەوەی زۆری لەسەر نووسراوە، بەڵام ئێمە دەمانەوێ پوختەیەك لەو بارەوە باس بكەین، بۆیە داكۆكی لەسەر مەسەلە بنەڕەتییەكانی (سیرە)ی پێغەمبەر ﷺ دەكەین.

دووەم: لە ڕیزكردنی باس‌و بابەتەكاندا ڕیزبەندیی زەمەنیی ڕەچاو دەكەین، وەك زۆربەی ئەو كتێبانەی كە لەبارەی ژیان‌و (سیرە)ی پێغەمبەرەوە ﷺ نووسراون، واتە: لە سەرەتاوە لەدایكبوونی پێغەمبەر ﷺ، ئنجا قۆناغەكانی منداڵیی‌و گەنجیەتیی، دوایی وەحی بۆ هاتنی‌و... بەو پێیە.

سێیەم: سەرچاوەی ئەم ژیاننامەیەش سێ شتە:

١ - قورئان (كتێبی خوای پەروەردگار).

٢- سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، بەتایبەت هەردووك كتێبی (صحيح البخاريو صحيح مسلم).

٣- ئەو كتێبانەی كە دەربارەی ژیانی پێغەمبەرنووسراون بەتایبەت (السيرة النبوية لابن هشام) كە یەكەمین كتێبە لە ڕووی زەمەنییەوە دەربارەی ژیانو بەسەرهاتی پێغەمبەر ﷺ نووسراوەو هەموو كتێبەكانی دیكەی (سیرە)ش پشت بەو دەبەستن.

چوارەم: هەوڵ دەدەین هەڵوەستە بكەین لەسەر قۆناغو ڕووداوەكانی ژیانی موبارەكی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی دەرسو پەندیان لێ وەربگرین بۆ ژیانی دینداریيو دنیادارییمان، چونكە ئەوە فەلسەفەو حیكمەتی مێژوویە بەگشتی، وە بەتایبەت بەسەرهاتو مێژووی پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ... ﴿١١١﴾ ﴾ يوسف، واتە: بێگومان لە گێڕانەوەی بەسەرهاتو ژیانو گوزەرانی پێغەمبەراندا -عليهم الصلاة والسلام- پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان، واتە پەندی گەورە هەن بۆ هەركەسێك كە عەقڵی هەبێ، كەواتە ئینسان بە ئەندازەی عەقڵو تێگەیشتنو وردبوونەوەی، دەرسو پەند وەردەگرێ لە ژیانی پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- بە گشتیو لە ژیانی سەرورەرو كۆتاییان (محمد) ﷺ بەتایبەتی.

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە كە ئەم بابەتە مایەی بەرچاوڕوونی زیاتر بێ دەربارەی ژیانی پێغەمبەرمان ﷺو ئاشنابوون بە كەسایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونكە هەروەك لە داهاتوودا باسی دەكەین، بەبێ شارەزا بوونی چاك لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ نە ئیمانمان چاك دادەمەزرێ، وە نە دەتوانین بە باشی دینداریی بكەین، كەواتە ئاشناییو شارەزایی لە ژیانو بەسەرهاتو گوزەرانی پێغەمبەر ﷺ شتێكی سادە نیە، بەڵكو بەشێكە لە دینداریيو مسوڵمانەتییمان.

بەڵێ بێگومان هەتا ئینسان زیاتر لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ شارەزا بێت، زیاتر خۆشی دەوێت‌و لە دڵیدا شیرینترو بەڕێزتر دەبێ.

وە لەڕاستیدا هەموو ئەوانەی ناحەزی پێغەمبەرن‌و بێ‌ڕێزییان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ نواندوە، لە ڕابردووو ئێستادا لە دوو حاڵان بەدەر نین، یان ئەوەتا نەفام‌و نەزانن‌و ئەو پەندە عەرەبیەیان بەسەردا دەچەسپێ کە دەڵێ: **(الناس أعداء ما جهلوا)**، واتە: خەڵك دوژمنی شتێکن کە پێی شارەزا نین، یان هەرچەندە ناسیویانە، بەڵام کەسانێکی داخ لەدڵن بەرامبەر پێغەمبەرو ئیسلام، بەهۆی بێ‌بڕواییانەوە، دیارە لە مێژووی پێغەمبەرانیشدا -علیهم الصلاة والسلام- زۆر وابووە کە دوژمنانیان بەتایبەتی ئەوانەی کە لەئاستی بەرپرسێتیدا بوون، پێغەمبەرانیان باش ناسیوەو زانیویشیانە کە ئەهلی حەقن‌و پەیام‌و بەرنامەکەشیان حەقە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو پەیام‌و بەرنامەیەی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- لەگەڵ بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی ئەوان تێکگیراوە، دژایەتیان کردوە، وەك خوای پەروەردگار لەبارەی فیرعەون‌و دارودەستەکەی دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾﴾ النمل، واتە: فیرعەون‌و دارودەستەکەی بێ‌بڕوایی‌و کوفریان نیشاندا بەرامبەر بە بەرنامەی (موسی) عليه السلام لە حاڵێکدا کە لە دەروونیشیاندا یەقینان هەبوو کە ئەو پەیام‌و بەرنامەیەی (موسی) حەقە وە موعجیزەو بەڵگەکانیشی ڕاستن، بەڵام لەبەرئەوەی کە ستەمکارو خۆ بەزلگر بوون بڕوایان پێ نەهێنا، ﴿...فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ سەرنج بدە سەرنجامی شوومی خراپەکاران چۆن بوو!

بەڵێ زۆر کەس دژایەتی پێغەمبەر ﷺ دەکات لەبەرئەوەی دەزانێ، کە ئەگەر خەڵك لە پەیامی پێغەمبەر ﷺ تێبگات، وە بەرنامەو شەریعەتێك کە خوای

پەروەردگار ناردوویەتیە خوار، بچەسپیٚ، ئەو ڕاوەی کە ئەو لە ئاوی لیٚڵدا دەیکات ئاوەکە ڕوون دەبێتەوەو ڕاوەکەی لیٚ تێکدەچێت، وە ئەو بازاڕە ئاڵۆزەی کە ئەو دزیی تێدا دەکات ئاڵۆزییەکەی نامێنیٚو دزییەکەی لیٚ تێکدەچێت، ئەوەش سوننەتی خوایە کە خۆ بەزلگرانو خۆشگوزەرانان، وە ئەوانەی کە چاویان لە چەوساندنەوەی خەڵك بووەو ویستوویانە پەروەردگاریێتیو پەرستراوێتی بەسەر خەڵکەوە بکەن، هەمیشە دژی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- بوون، بۆچی؟ چونکە پێغەمبەران هاتوون تاکو خەڵك ڕزگارو ئازاد بیٚ، وە بانگی ئازادییان بەگوێی خەڵك داداوە، کە خەڵك هەندێکی نەچەوسێنێتەوەو نەیکاتە کۆیلەی خۆی، بەڵکو هەموویان بەندەی خواو ملکەچو پابەندی شەریعەتو بەرنامەی خوا بن، ئەو بەرنامەو شەریعەتەی کە لەلایەن خواوە هاتوەو لە زانیاریو ڕەحمەتو حیکمەتی بیٚسنووری خواوە سەرچاوەی گرتوە، کە بەیەك چاو تەماشای هەموو ئینسانەکان دەکاتو نایانکاتە چەند چینو توێژێكو هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا باو نادات، بە پێچەوانەی هەموو بەرنامەکانی دیکەوە، کە زادەی بیرو هۆشی ئینسانانو هەمیشە لایەنگری کۆمەڵێك دەبن لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## مانای وشەی (السیرة):

وشەی (سیرة) وشەیەکە، زۆربەی زانایان کە لەبارەی ژیاننامەی پێغەمبەرەوە ﷺ شتیان نووسیوە لەژێر ئەو ناونیشانەدا نووسیویانە، بۆ وێنە (ابن هشام) کە یەکەم کەس بووە لەوبارەوە کتێبی نووسیوە کتێبەکەی بەو ناوەوەیە (السیرة النبویة لإبن هشام)، هەروەها زۆربەی زانایانی دیکە بۆ وێنە (محمد الغزالي، (محمد سعید رمضان...)، هەروەها زانایانی دیکەش بە زۆری وشەی (سیرة)یان بەکارهێناوە.

جا با بزانین وشەی (سیرة) لە چیەوە هاتوە.؟!

(سیرة) وشەیەکی عەرەبییەو ناوە، لە کرداری (سار، یسیر، سیرًا)وە هاتوە (سار) واتە ڕۆیشت، (یسیر) واتە بە ڕێگەدا دەڕوات (سیراً) واتە ڕۆیشتن، کە چاوگەکەیەتی، وە (سیرة) ناوەو واتە (ڕۆیشتن)، شایانی باسیشە ئەم وشەیە یەکجار لە قورئاندا هاتوە کە خوای پەروەردگار بە (موسی) دەفەرموێ: ﴿ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ ﴾ طه، واتە: (گۆچانەکەت بگرەو لێی مەترسێ دەیگێڕینەوە حاڵەتی پێشێ) -ئەوە لە کاتێکدا بوو کە خوای پەروەردگار فەرمانی بە (موسی) کرد گۆچانەکەی فڕێ بدات، بە فەرمانی خوا گۆچانەکەی بوو بە ئەژدیهایەکی گەورەو مووسا -علیه الصلاة والسلام- ترسا، (أبو جعفر الطبري) لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی دەستەواژەی (سیرتها الأولی) دەڵێ (أي حالتها الأولی) یان (هیأتها الأولی)، واتە: بۆ حاڵەتو چۆنیەتییەکەی پێشێی.

کەواتە (سیرة) واتە حاڵەتو هەیئەتو چۆنییەتی، کە دەڵێین (سیرة)ی پێغەمبەر ﷺ، واتە چۆنیەتی ژیانی پێغەمبەر ﷺ، کە چۆن ژیاوە؟ چی کردوە؟ واتە: مانای وشەی (سیرة) بریتیە لە ژیاننامە، چۆنیەتی ژیان بەسەر بردنو گوزەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

# بۆچی وردەکارییەکانی ژیـانی پێغەمبـەر ﷺ باسکراون؟

لەنێوان ژیانی پێغەمبەر ﷺو ژیانی پێغەمبەرانی دیکەدا -علیهم الصلاة والسلام- جیاوازییەکی سەرەکیو بنەڕەتی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ژیانی پێغەمبەرمان (محمد)ی کوڕی (عبدالله) ﷺ زۆر بەوردیو بەڕوونی بۆ ئێمە تۆمارکراوە لە هەموو لایەنەکاندا، چ پێش پێغەمبەرایەتی، چ دوای پێغەمبەرایەتی، ئەوکاتەی کە لە مەککە بووە، یان ئەوکاتەی کە لە مەدینە بووە، تەنانەت حاڵەتی کاتی سەرەمەرگیشی، زۆر بەوردیو بەڕوونی هەموو شتێك دەربارەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمە تۆمارکراوە، لە قورئانو لە دەقەکانی سوننەتدا، وە لەو کتێبانەدا کە لەبارەی ژیانی پێغەمبەرەوە ﷺ نووسراون، کە سوودیان لەوبارەوە لە قورئانو سوننەت بینیوە، بەڵام هی پێغەمبەرانی پێشوو بەو شێوەیە نیە، بەڵکو ئەوەی کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەربارەیان فەرموویەتی زیاتر ئەو ڕووداوو هەڵوێستانەیانە کە پەندو عیبرەتیان لێ وەردەگیرێ، بەڵام وردەکارییەکانی دیکەی ژیانی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- لە قورئاندا تۆمار نەکراوە، کە بێگومان ئێمە جگە لە قورئان، لە کتێبە ئاسمانییەکان، کتێبێکی دیکەمان لەبەردەستدا نیە کە بە متمانەو باوەڕەوە بیخوێنینەوەو دڵنیابین کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی، چونکە کتێبەکانی دی کە خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی ناردوون هەموویان گۆڕدراون، وەك خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکان فەرموویەتی: ﴿...يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ...﴿١٣﴾﴾ المائدة، واتە: (وشەکان لە شوێنەکانیان لادەدەن)، وە فەرموویەتی: ﴿...وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ...﴿١٣﴾﴾ المائدة، واتە (بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاری کرابون لەبیریان چوو)، هەرکەسێکیش بە ویژدانەوە تەماشای ئەو کتێبانە بکات کە دەربارەی ژیانی پێغەمبەران نووسراون چ تەورات، چ ئینجیلو زەبوور وە باقی ئەو کتێبانەی دیکە کە (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نوێ)دا بە ناوی وەحی خوای

پـەروەردگار تۆمـارکراون، زۆر بـەڕوونیو ڕاشـکاویی دەتوانـیٚ بڵـێ، ئەوانـە گـۆڕراونو دەستکاریی کراون، هەم (پەیـمانی کۆن) کـە نزیکـەی (٢٠٠٠) لاپەڕەیـە کـە تـەورات بەشـێکیەتیو زۆر کتێبـی دیکەشـی تێـدان، وەك زەبـوورو حیکمـەتی سولەیـمانو کۆمەڵێك کتێبی دیکە کە پاڵدراونـە لای کۆمـەڵێك لـە پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئێمە نازانین ئایا ئەوانە پێغەمبەری خوابوون، یا لە ئەسڵدا ئـەو کتێبانـەیان بۆ هاتوون یان نا؟ وە هەم (پەیـمانی نوێ) کە جگـە لـە چـوار ئینجیلـەکان، زۆر شـتی دیکەشیان تێدایەو، من هەموویانم خوێندوونەوە، کـە دەربـارەی ژیـانی عیسـا ﷺ پێش وەحـی بـۆ هـاتنی هـەر هـیچ شـتێك بـاس نـەکراوەو دوای وەحـی بـۆ هاتنیشـی کۆمـەڵێك سەفەرو گەشتی عیسای ﷺ تێدایە، وەبێگومان خـوای پەروەردگـار یـەك ئینجیلـی بـۆ (عیسـی) ﷺ ناردوە، بـەڵام ئـەوان دوای عیسـا ﷺ چـوار جـۆرە ئینجیلیان نووسیوە!!

حیکمەتی ئەوەش کە ژیانی پێغەمبەرمان (محمد) ﷺ زۆر بـەڕوونیو زۆر بـەوردی بۆ ئێمە تۆمار کراوە، بەڵام ژیانی پێغەمبەرانی پێش ئـەو -علـیهم الصـلاة والسـلام- بەو شێوەیە نیە، ئەوەیە کە (محمد) ﷺ پێغەمبەری خوابووە بـۆ هـەموو مرۆڤایـەتی، وەك خوای پەروەردگار بە پێغەمبـەر دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ... ﴿١٥٨﴾ ﴾ الأعـراف، واتـە: بڵـێ ئـەی خەڵکینـە! مـن پێغەمبـەری خـوام بـۆ هـەمووتان، بـەڵام دیـارە پێغەمبـەرانی پـێش (محمـد) ﷺ بـۆ گەلێکی تایبەت، یان عەشیرەتێکی تایبـەت، یـان چـەند کـەسو کۆمـەڵێکی تایبـەت بوون، بۆ وێنە بەنی ئیسرائیل کە (موسی) ﷺ یان بۆ ڕەوانە کراوە کۆمـەڵێك بـوون، وە بۆ کاتو قۆناغێکی دیـاری کـراو هـاتوون، بـەڵام (محمـد) ﷺ بـۆ هـەموو بـەرەی ئادەمیزاد هاتوە بە درێژایی زەمـانو بـە پانـایی زەمـین، وە لـەدوای (محمـد) ﷺ کـە خاتەمو دوایینی پێغەمبەرانە، پێغەمبـەرێکی دیکـە نایـەت، تـاکو ئەگـەر تـەحریفو دەستکارییەك لە ژیانیدا کرا، ئەو پێغەمبەرەی دوای ئـەو ڕاستی بکاتـەوە، هـەر وەك

چۆن (محمد) ﷺ ئەو دەستکاریی کرانو تەحریفو گۆڕانەی کە بەسەر کتێبەکانی پێش قورئانو بەسەر ژیانی پێغەمبەرانی پێش خۆیدا هاتوە، هەموویانی ڕاست کردۆتەوە، واتە ئێستا ئێمە تەنها بەهۆی قورئانەوە دەزانین کە (موسی) ﷺ چۆن بووە، ئەگەر (تەورات) بخوێنینەوە کۆمەڵێك شتی وا پاڵ دراوەتە لای (موسی) ﷺ کە تەنانەت کەسێکی ئاسایی نایکات، یان کۆمەڵێك شتی وا پاڵ دراوەتە لای (ابراهیم) ﷺ کە مسوڵمانێکی عادەتیش نایکات، هەروەها (یعقوب)و (یوسف)و باقی پێغەمبەرانی دیکە -علیهم الصلاة السلام- بۆ نموونە: لە عەهدی قەدیمدا هاتوە کە (سولەیمان) ﷺ هەر پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو جادووگەر بووە، ئینجا (داود)یان ﷺ بە مەلیکێکی زاڵم زانیوە، بەڵام قورئان بۆ ئێمەی ڕوون کردۆتەوە کە ئەوانە پێغەمبەری خوای پەروەردگارن، وە پیاوانی پایە بەرزن، وە ئەو درۆو دەلەسەی کە بۆیان هەڵبەستراوە هەمووی لەلایەن ئەهلی کیتابەوە بۆیان هەڵبەستراوەو وانیە.

هەروەها بۆیە ژیانی (محمد) ﷺ زۆر بەوردی بۆ ئێمە تۆمارکراوە لە قورئانو لە سوننەتدا، بۆئەوەی ئێمە سەرمەشقێکی زۆر چاکمان لەبەردەستدا بێتو بتوانین شوێنی بکەوین لە هەموو لایەنەکانی ژیانماندا، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأحزاب) لە ئایەتی (٢١) لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ... ﴾، واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە سەرمەشقێکی باش هەیە، وە لە هەموو ڕوویەکەوە (محمد المصطفى) ﷺ باشترین سەرمەشقە بۆ ئێمە، لە ڕووی عەقیدەییو ئیمانییو فیکرییو ئەخلاقییو عیبادەتییو هەڵسوکەوتی تاکییو خێزانیی، وە لە ڕووی مەعنەوییو ماددییو سیاسیو کۆمەڵایەتیو جەنگو ئاشتی...هتد، وە لە هیچ ڕوویێکەوە هیچ شتێك نیە کە (محمد) ﷺ بۆ ئێمەی دەستنیشان نەکردبێ، جا چ خوای پەروەردگار لە قورئاندا پێی فەرموو بێ، یان بۆخۆی وەك شەرحو ڕوونکردنەوەی قورئان فەرموبێتی، کەواتە ئەگەر کەسێك بیەوێ بە

شێوەیەك بژی كە خوا لێی ڕازی بێ لە هەموو لایەكانی ژیانیدا، تاكە چارەی ئەوەیە كە بەدوای (محمد) ﷺ بكەوێ وە بیكاتە مامۆستاو سەرمەشقو چاوساغی خۆی.

هەربۆیە خوای پەروەدگار ژیانو بەسەر هاتو گوزەرانی ئەوی وا لێكردوە كە هەم لە قورئاندا تۆمار بكرێتو هەم لە دەقەكانی سوننەتدا، بۆ ئەوەی ئێمە سەر مەشقێكی ئاشكرامان لەبەردەست بێت تا بزانین چۆن بژیین، ژیانێك كە خوای پەروەردگار بە هۆیەوە لێمان ڕازی بێ، ئنجا وەكو گوتمان (محمد) ﷺ لەبەرئەوەی كە دواین پێغەمبەری خوایە، ئەگەر هاتباو ژیانو (سیرة)ەكەی شێوێندرابا، یاخود كۆمەڵێك لایەنی تاریكی تێدا بان، كە بووبایە هۆی ئەوەی خەڵك سەری لێبشێوێندرێ، وەكو كۆمەڵێك لایەنی نەزانراو هەیە لە ژیانی پێغەمبەرانی دیكەدا -علیهم الصلاة والسلام-، ئەوكاتە كەس نەدەبوو ڕاستی بكاتەوە، چونكە لە دوای (محمد) ﷺ وەحی نەهاتوەو ناشیەت، وەك خوا -عزّ وجلّ- دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: (محمد) بابی هیچ كام لە پیاوانتان نیە، بەڵكو ڕەوانەكراوی خوایەو كۆتایی پێغەمبەرانە -علیهم الصلاة والسلام) وە خوا بە هەموو شتێك زانایە.

وە لەبەرئەوەی كە بەهەموو شتێك زانایە خوای پەروەردگار وای كردوە ژیانی ئەو (محمد)ە ﷺ بۆ ئێمە زۆر بە وردی تۆمار بكرێ، بۆ ئەوەی هیچ كەس مەجالی نەبێ بەرنامەو پەیامەكەی بگۆڕێو دەستكاریی بكات، وە بۆ ئەوەی ئۆممەتەكەی بەتەواوی ژیانی ئاشنا بنو پابەندبن بە قسەو هەڵوێستەكانییەوە.

# گرنگــی شــارەزابــوون لــە ژیاننامــەی پێغــەمبــەری خــوا ﷺ

## یەکــەم: لە ڕووی ئیمــانییــەوە:

بێگومان بەو ئەندازەیە ئیمانت بە (محمد) ﷺ بۆ دروست دەبێ کە پێغەمبەری خوایە، کە دەیناسیو پێی ئاشنایو دەزانی کێ بووەو چی کردوەو، چۆن ژیاوە؟ چونکە ئیمان بە نەزانراو (مجهول) قەت پەیدا نابێت، بەڵکو بەشتی زانراو (معلوم) پەیدا دەبێ، چونکە ئەگەر ئینسان (محمد) ﷺ نەناسێو نەزانێ چۆن ژیاوەو قۆناغەکانی ژیانی چی بوونو چی کردوەو چۆنی کردوە، چۆن ئیمانی پێ دێنێ؟ وە خوای پەروەردگار نەهی کردوە لەوەی ئێمە بەدوای شتێك بکەوین کە زانیاریمان پێی نیە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ...﴿٣٦﴾﴾ الإسراء، واتە: بە دوای شتێك مەکەوە کە زانیاریت پێی نیە، واتە ئیمانیشی پێ مەهێنە، چونکە کە تۆ عیلمت بە شتێك نەبێو ئیمانیشی پێ بێنی، مانای وایە تۆ ئیمانت بە شتێك هێناوە کە شارەزای نیو نازانی نە چاکە نە خراپە، کەواتە لە بنەڕەتدا ئیمان هێنان بە (محمد) ﷺ وەك پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوە بەندە کە دەبێ ئێمە شارەزای ژیانو گوزەرانو بەسەرهاتی بین، ئنجا بێگومان ئیمان هێنان بە پێغەمبەریش لەلایەن خوای پەروەردگارەوە فەرزکراوە، وەك دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ...﴿١٣٦﴾﴾ النساء، واتە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە! ئیمان بێنن بەخواو پێغەمبەری خوا، وە بەو کتێبەی کە ناردوویەتە سەر پێغەمبەرەکەی، واتە: بەردەوام بن لەسەر ئیمانەکەتان بە وردیو

تێفکرینەوە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ... ﴿٢٨﴾ ﴾ الحديد، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن ئیمان بە پێغەمبەرەکەشی بێنن.

ڕەنگە یەکێك بڵێ: ئینسانی ئیماندار چۆن ئیمان دێنێ؟

لە ڕاستیدا ئیمان چەندان پلەیە، زانایان لەوبارەوە دەڵێن: ئیمان سێ پلەی هەیە، کە ئەمانە: (مطلق، واجب، مستحب):.

أ- ئیمانی (مطلق) ئەوەیە، کە ئەگەر ئەو ئیمانەت نەبێ، بە مسوڵمان لە قەڵەم نادرێی.

ب- ئیمانی (واجب)یش ئەوەیە، کە ئەگەر ئەو ئیمانەت نەبێ، لە دۆزەخ ڕزگارت نابێ.

ج- ئیمانی (مستحب)یش ئەوەیە، کە ئەگەر ئەو ئیمانەت نەبێ، بە دۆستی خوا دانانرێی.

وە زانایان باسی ئیمانی (مُجْمَل و مُفَصّل)یان کردوە، واتە: ئیمان بە کورتیو بە درێژی، کەواتە ئێمە هەر بۆ دامەزرانی ئیمانمان بەوە کە (محمد) پێغەمبەری خوایە ﷺ پێویستمان بەوە هەیە کە (محمد) ﷺ بناسین بەهۆی لێ تێگەیشتنی ژیاننامەکەیو شارەزابوون بە هەڵوێستو هەڵسوکەوتەکانیو قۆناغەکانی ژیانییەوەی.

ئنجا شارەزابوون لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ پێویستە، بۆ ئەوەی ئیمانمان دامەزراوترو کامڵترو ڕۆچوو تر بێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ يونس، واتە: ئەی (محمد) ﷺ بە کافرەکان بڵێ: ئەگەر خوا حەزی کردبا قورئانم بەسەردا نەدەخوێندنەوەو، ئێوەم پێ شارەزاو پێ ئاشنا

نەدەکرد، من پێش ئەوەی قورئانتان بەسەردا بخوێنمەوەو باسی پێغەمبەرایەتی خۆم بکەم، تەمەنێکم لەنێو ئێوەدا گوزەراندوە بۆچی ئاقڵتان نیە؟

بەڵێ (محمد) ﷺ پێش ئەوەی وەحی بۆ بێ (٤٠) ساڵ تەمەنی بەڕێ کرد، کەواتە خوای پەروەردگار سەرنجمان ڕادەکێشێ، بۆ ئەوەی خەڵك تەماشا بکات کە چل ساڵ تەمەنی (محمد) ﷺ لە پێش پێغەمبەرایەتیدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوایە، ئەگەر نا، وەك کافرەکان دەیانگوت ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لەخۆوە ئەو قورئانەی هەڵبەستبایە، لەو تەمەنە درێژەی پێش (٤٠) ساڵیدا لەوبارەوە شتێکی هەر دەگوت، بەڵام تا (٤٠) ساڵی تەواو نەکردوە، هیچی نەفەرمووەو دوایی لەناکاو فەرموویەتی: ئەمن پێغەمبەری خوام ﷺ!!

دیارە ئەو ئەنجامەش بەوە دەست مرۆڤ دەکەوێ، کە شارەزای ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بێ، هەروەها خوای پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾﴾ العنكبوت، واتە: ئەی (محمد) تۆ لە پێش قورئاندا هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە، وە هیچ شتێکیشت بە دەستی ڕاستت نەنوسیوە، (پێغەمبەر) ﷺ لەپێش قورئاندا خوێندنو نوسینی نەبووە، وە دوای ئەوەی کە قورئانیشی بۆهاتوە نووسینی هەرنەبووە، بەڵام خوێندنەوەی هەبووە، ئەویش ئەوەبووە قورئانی خوێندۆتەوە، ﴿إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ ئەتۆ ئەگەر پێش ئەوەی قورئانت بۆ بێ، خوێندنو نووسینت زانیبایە ئەوە ئەوانەی ئەهلی (باطل)ن بۆیان هەبوو بکەونە گومانەوە، بەڵام تۆ لەناکاو فێری هەموو شتێك بووی، کەواتە: دیارە خوای پەروەدگار فێری کردوە، ئەوەش کاتێ دەیزانین کە شارەزای ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بین.

مەسەلەیەکی دیکە لەوبارەوە ئەوەیە کە ئەبوو سوفیان بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە وەك لە (صحيح مسلم)[١]دا هاتوە: ئەبوو سوفیان دەڵێ: ئێمە چووین بۆ شام لە کاتێکدا کە صوڵحی حودەیبیە کرا (هیرەقل) بانگی کردین گوتی: بیستوومە ئێوە خەڵکی ئەو شوێنەن کە ئەو کابرایەی لێیەو تازە پەیدا بووەو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات.

دەڵێ: گوتمان بەڵێ.

گوتی: کامەتان زۆر لێی نزیکن بابێ هەندێك پرسیاری لێ دەکەم دەربارەی ئەو کابرایە، داخۆ بزانین پێغەمبەرە یان نا؟.

دەڵێ: من چووم وە ئەوانەی لەگەڵیشم بوون لەدوای منەوە دانیان و گوتی: هەرچی لێی دەپرسم ئەگەر درۆی کرد ئێوە بڵێن درۆ دەکات، (هیرەقل) کۆمەڵێك پرسیار لە ئەبوو سوفیان دەکات دەربارەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەو کابرایە کێیە؟ نەسەبی چۆن بووە؟ لە چ جۆرە عائیلەیەکە؟ ئایا هیچ کام لە باب و باپیرانی مەلیك و پادشا بوون؟ ئایا دەسەڵاتدارەکان شوێنی دەکەون، یان بێ دەسەڵاتەکان؟ شەڕو جەنگ لە نێواندا ڕووی داوە؟ ئەنجامی چۆن بووە، ئایا ئەوانەی ئیمانی پێ دەهێنن لێی هەڵدەگەڕێنەوە؟ ئایا قەت درۆتان لێ بیستوە؟

ئەبوو سوفیان دەڵێ: منیش ئەوەی ڕاست بوو دەربارەی موحەممەدو بانگەوازەکەی و ئەوانەی شوێنی کەوتوون هەموویم پێ گوت.

چونکە پێغەمبەر ﷺ پەرێزی ئەوەندە پاك بووە دوژمنانیشی نەیانتوانیوە قسەی خراپی لەسەر بکەن، (هیرەقل) کۆمەڵێك شت دەربارەی (محمد) ﷺ دەپرسێ کە لە دواییدا دەیانکاتە بەڵگە کە ئەو پێغەمبەری خوایە، چونکە لە کۆتاییدا (هیرەقل) دەڵێ، ئەو کابرایەی کە تۆ دەڵێی ناوی (محمد)ە ئەو پرسیارانەی کە لێم کردی ئەگەر

---

١) صحيح مسلم: ٤٥٨٣، کە لە بەرگی چوارەمی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)داو لە باسی ئیمان بە پێغەمبەراندا هێناومانەو ماناشمان کردوە.

وەڵامەکانت هەمووی ڕاست بن، ئەوە پێغەمبەری کۆتاییەو ئێمە چاوەڕێ بووین پێغەمبەرێکی وا بێ، بەڵام نەمانزانی لەنێو عەرەباندا دێ، وامانزانی لەنێوە ئێمەدا دێ، دەڵێ ئەگەر تۆ ڕاست بکەی ئەو (محمد)ە شوێن پێی منیش دەگرێ (وليَبلُغَنَّ ملكُهُ ما تحت قدمَيَّ)، واتە (شام)، بێگومان قسەکەشی ڕاست دەرچوو.

کەواتە ئێمە بەهۆی ناسینی پێغەمبەرەوە ﷺ و شارەزاییمان دەربارەی سیرەو ژیانییەوە زیاتر ئیمانمان دادەمەزرێ.

## دووەم: لە ڕووی تێگەیشتنی قورئانەوە:

بێگومان شارەزابوونو ئاشنابوون بە ژیانو هەڵسوکەوتو هەڵوێستەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، یارمەتی زۆرمان دەدات بۆ چاك تێگەیشتنی قورئان، چونکە خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی ﷺ بە ڕوونکەرەوەی قورئان پێناسە کردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿...وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، واتە: ئێمە (ذكر)مان بۆ تۆ ڕەوانە کردۆتە خوار -(ذكر) یەکێکە لە ناوەکانی قورئان، چونکە ئەو ڕاستییانە دەخاتەوە بیر خەڵك کە عەقڵو فیطرەتی ساغیان پێیان ئاشنایە- تاکو ئەوەی کە بۆ خەڵکی نێردراوەتە خوار بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بۆئەوەی خۆشیان بیر بکەنەوە.

کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسەو کردەوەو هەڵوێستەکانی قورئانی ڕوون کردۆتەوە، واتە: شتە بنەڕەتییەکانی قورئانی ڕوون کردوونەوە، نەك جوزئیاتەکانی، چونکە جوزئیاتەکانی قورئان دەبێ زەمان ڕوونی بکاتەوەو زانایان بەپێی بارودۆخو ژینگەی خۆیان قورئان تەفسیر بکەنو بەدرێژی وردەکارییەکانی قورئان ڕوون بکەنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ قورئاندا دوو شێوە ڕوونکردنەوەی هەبووە: یەکێکیان

ئەوەیە کە قورئان هەندێك شتی تێدایە کورت (مجمل)ە بۆ وێنە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ... ﴿٧٢﴾﴾ الأنعام، (نوێژ بەرپا بکەن)، نوێژ چۆن بەرپا دەکرێ...؟ پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ ڕوون کردووینەوە لە سوننەتی خۆیدا، هەروەها چۆنیەتی ڕۆژووگرتنو حەج کردنو گەلێ شتی دیکە.

ئەوەی دیکەیان ئەوەیە قورئان هەندێ شتی تێدایە ڕوونە، بەڵام نازانرێ کامەی لە کوێدایەو لە چ کاتێکدا وە لە چ شوێنێکدا جێبەجێ دەکرێ، پێغەمبەر ﷺ ئەوەشی بۆ ڕوون کردووینەوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٧٧﴾﴾ النساء، واتە: سەرنجی ئەوانە نادەی کە پێیان گوترا خۆتان بپارێزنو شەڕمەکەن (لەگەڵ موشریكو کافرەکان هەرچەندە ئەشکەنجەتان دەدەن)، وە نوێژ بەرپابکەنو زەکات بدەنو ماڵی خۆتان ببخەشن، ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتێکی دی کە دەفەرموێ: ﴿... وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ... ﴿٣٦﴾﴾ التوبة، واتە: وەتێکڕاتان لەگەڵ هاوبەشدانەراندا بجەنگن، وەك چۆن ئەوان بەتێکڕایی لەگەڵتاندا دەجەنگن، ئێمە چۆن بزانین ئەوەی پێشێیان لە کوێدا جێبەجێ بکەینو ئەوەی دوایشیان لە چ حاڵێکدا؟ بێگومان بەهۆی ژیانی پێغەمبەرەوە دەزانی ئەو ئایەتەی پێشیان لە چ حاڵێکدا جێبەجێ دەکەیو ئەوی دیکەیان لە چ حاڵێکدا، وە تووشی سەرلێشێواویی نابی.

وە بەڵگەیەکی دی لەسەر ئەوە کە ئێمە تا لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ شارەزاتر بین چاکتر لە قورئان تێدەگەین، ئەو ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار ئەرکی سەرەکی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ لە چوار شتدا دەخاتە ڕوو، وەك دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّۦنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ

﴿وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ۝٢﴾ الجمعة، واتە: (خـوا) ئـەو زاتەیـە کـە لـەنێو –نـە شـارەزایان بـە وەحـی-دا پێغەمبـەرێکی لـەخۆیان ڕەوانـە کـردوە، ئایەتـەکانی خوایـان بەسـەردا دەخوێنێتـەوە، وە تەزکیـەیان دەکـات -پاکیـان دەکـاو چاکیان دەکاتو پاکیان دەکاتەوە لە هەرچی خـوا پـێی ناخۆشـە، دەشـیان ڕازێنێتـەوە بەهەر شتێك کە خوا پێی خۆشـە لـە هـەموو ڕووێکـەوە- وە شـەریعەتو بەرنامـەی ژیانیان فێر دەکـات، وە حیکمەتیشـیان فێـر دەکـات، (حیکمـەت بـە مانـای ئـادابو ڕەوشتی بەرزو قسەی بەجێو کرداری بەجێ دێت) هەرچەندە ئەو خەڵکـە پـێش ئـەوەی (محمـد)یان ﷺ بۆ بێ، بە تەئکید لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابوون.

جا لێرە با تەماشا بکەین: خوای پەروەردگار چوار ئیشی بۆ پێغەمبەرەکەی دەست نیشان کردوون، کە وەك ئەرك پێیان هەڵدەستێ:

١- خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا.

٢- تەزکیەکردنی ئەو خەڵکە.

٣- کتێب فێرکردنیان.

٤- حیکمەت فێرکردنیان.

جا هەندێك لـە زانایـانو توێـژەرەوانی قورئـان، کتێـبو حیکمـەتیان بـە قورئـانو سـوننەت تەفسـیر کـردوون، بـەڵام وانیـە، چـونکە ئەگـەر (کتـاب) قورئـان بێـت، خـۆ ئایەتـەکانیش کـە پێغەمبـەر ﷺ دەیانخوێنێتـەوە هـەر قورئـانن، جـا چـۆن پێشـێ ئایەتەکان دەخوێنێتەوە، پاشان قورئانیـان فێـر دەکـات؟!! بـەڵکو بـە بۆچـوونی بەنـدە (کتـاب) لێرەدا بە مانای بەرنامەی ژیانەو (حکمة)یش واتە چۆنیەتی پیادەکردنی ئـەو شەریعەتەیە بە شێوەیەکی ڕاستو دروستو، بە تەئکید سـوننەتی پێغەمبـەریش ﷺ دەبێتە هۆی ئەوە کە تۆ بە ڕاسـتو دروسـتی شـەریعەتی خـوای پـەروەردگار جێبـەجێ بکەی، بـەڵام وشـەی حیکمـەت بـە مانـای سـوننەت نیـە، چـونکە خـوای پـەروەردگار

دەربارەی (لقمان) دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ... ﴿١٢﴾﴾ لقمان، واتە: ئێمە حیکمەتمان بە لوقمان بەخشی، دیارە کە (لوقمان)یش پێغەمبەر نەبووە، کەواتە حیکمەت بەمانای قسەی بەجێو کرداری بەجێیە، یاخود لە (نیشانە) دان لە قسەو کرداردا، (الأصابة في القول والفعل).

ئنجا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین کە تەزکیەکردنو، فێرکردنی کتێبو فێرکردنی حیکمەت، هەرسێکیان دەچنەوە نێو ئەو ئایەتانەی کە (محمد) ﷺ دەیانخوێنێتەوە بەسەر ئەو خەڵکەدا کە بۆیان ڕەوانە کراوە، کەواتە قورئان هەڵدەستێ بە تەزکیەکردنی خەڵك، وە فێرکردنیان لە شەریعەتو پاشان فێرکردنیان لە حیکمەت، جا ئایا ئێمە چۆن دەتوانین ئەو سێ ئەرکە بە قورئان لەنێو کۆمەڵگای خۆماندا جێبەجێ بکەین، وە ئەو سێ ئامانجە بێنینە دیو، چۆن دەتوانین کۆمەڵگایەك بنیات بنێین کە تەزکیەکراو بنو کیتاب فێرکراو بن، وە حیکمەت فێر کراویش بن،؟!

لە ڕاستیدا تەنها بەهۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوە دەتوانین، چونکە پێغەمبەری خاتەم ﷺ چۆن قورئانی خوێندۆتەوە بە لەفظ بەسەر خەڵکدا، وە بۆخۆشی بە کردەوە لەخۆیدا جێبەجێی کردوە، تۆش ئاوا بکە خەڵك بەهۆی ئەو قورئانەوە تەزکیەش دەکەی، وە دەشیانخەیە سەر بەرنامەی خوای پەروەردگار، وە حیکمەتو ئادابو ڕەوشتی بەرزیشیان فێر دەکەی، کەواتە: دیسان بۆ لێتێگەیشتنی قورئان، وە بۆ لە خۆدا جێبەجێ کردنی، وە لە کۆمەڵگەدا بەرپاکردنی، دەبێ لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ شارەزا بین.

## سێیەم: لە ڕووی خوا پەرستیی و دینداریی یەوە:

شارەزابوون لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بزانین چۆن خواپەرستییو دینداریی بکەین، چونکە بەبێ ئاشنابوونو تێگەیشتن لە ژیان

گوزەرانی پێغەمبەر ﷺ ناتوانین بەو شێوەیە کە خوا دەیەوێ دینداریی و خواپەرستی بکەین، چونکە پێغەمبەر ﷺ چاکترین بەندەی خوایەو سەروەرو کۆتایی پێغەمبەرانیشەو یەکەمینی مسوڵمانانە، لەڕووی زەمەنییەوە بەنسبەت ئوممەتی، وە لەڕووی پلەو پایە (رُتبي)یەوە بەنسبەت هەموو مرۆڤایەتی، چونکە ئەو لە هەموو کەس بۆ خوا گەردن کەچتر بووە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾ الأنعام.

سەرنج بدەن! لێرەدا کە خوای پەروەردگار بە (محمد) ﷺ دەفەرموێ‌وا بڵێ دیارە (محمد) ﷺ وایە، چونکە لەکاتێکدا کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئاوا خۆت پێناسە بکە، دیارە لەڕاستیدا وایە، ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾، واتە: ئەی (محمد) ﷺ ئەتۆ بڵێ: من پەروەردگارم ڕێنمایی کردووم بەرەو ڕاستە شەقام ﴿دِينًا قِيَمًا﴾، واتە: بەرنامەیەکی ڕاستو دروستو بێ گرێ‌وگۆڵە ﴿مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا﴾، واتە: ئەو بەرنامە ڕاستو دروستەیە کە ئیبراهیم لەخۆیدا بەرجەستەی کردوە، چونکە (دین) کە پاڵ دەدرێتە لای ئینسان پێی دەگوترێ (میللەت)، وە کە پاڵ دەدرێتە لای خوا پێی دەگوترێ (دین)، ناگوترێ: (دینی ئیبراهیم)، بەڵکو دەگوترێ (میللەتی ئیبراهیم)، کەواتە (میللەت)، واتە: ئەو کەسەی کە دینی لە خۆیدا بەرجەستە کردوە، ﴿حَنِيفًا﴾، واتە: ئیبراهیم وازی هێنابوو لە هەرچی (باطل)ەو

ڕێی حەقی گرتبوو لە هەموو ڕووەکانەوە، ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، واتە: لە هاوبەش پەیداکەران نەبوو.

کەواتە: لە ڕووی بەرنامەوە ئەوە بەرنامەی (محمد)ە ﷺ، وە دینداریيەکەشی لەسەر ئەو خەتە ڕاستەیە، جا با بزانین لە ڕووی پراکتیزەکردنی ئەو بەرنامەیەوە چۆنە، لەوبارەوە خوا دەفەرمویٚ: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، واتە: ئەی (محمد) ﷺ بڵێ: بەتەئکید نوێژم و قوربانی سەربڕینم و ژیان مردنم هەمووی بۆ پەروەردگاری جیهانیانە.

کەواتە: ئەو (محمد)ە ﷺ نوێژو قوربانی سەربڕینیشی تەنیا بۆ خوا بووە کە دوو عیبادەتی ڕووحین، وە ژیان و مردنیشی هەمووی هەر بۆ خوای پەروەردگار بووە.

پاشان دەفەرمویٚ: ﴿لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، واتە: خوا هیچ هاوبەشی نین، وە من بەوە فەرمانم پێکراوە کە وابم، وە من یەکەمینی مسوڵمانانم، واتە: من هیچ هاوبەش بۆ پەروەردگارم دانانێم نە لە نوێژمدا نە لە قوربانی سەربڕینمدا، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾ الكوثر، واتە: نوێژ هەر بۆ پەروەردگارت بەرپا بکەو قوربانییش بەس بۆ وی سەربڕە، هەروەها لە هەڵسوکەوتەکانی ژیانمدا هاوبەشی بۆ دانانێم و ئەمرو نەهی و حەڵاڵ و حەرامیش بە تەنها لە خوا وەردەگرم، وە ژیانم لە هەموو ڕووەکانییەوە: سیاسی و ئابووری، کۆمەڵایەتی و خێزانیی، بە جۆرێك ڕێك دەخەم کە خوا دەیەوێ، جا دیارە ئا ئەوە خوا بەیەکگرتنی ڕاستەقینەیە.

بەڵێ پێغەمبەرمان (محمد) ﷺ یەکەمینی مسوڵمانانە لە ئۆمەتەکەیدا لە ڕووی زەمەنییەوە، وە یەکەمینی هەموو بەشەریەتە بۆ مسوڵمانەتیی لەڕووی پلەو پایەوە،

www.alibapir.com


واتە لە هەموو پێغەمبەران زیاتر بۆ خوا ملکەچ و مسوڵمان بووە، هەرچەندە پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- هەموویان لە لوتکەدا بوون، بەڵام (محمد) ﷺ لە لوتکەی هەرە بەرزی لوتکەکاندا بووە.

کەواتە ئێمە کاتێك دەتوانین خواپەرستیی و دینداریییەکی ڕاستەقینە بکەین، کە بەتەواوی بەدوای ئەو پێغەمبەرە ﷺ بکەوین، وە کاتێك دەتوانین چاکی بە دوا بکەوین، کە چاکی شارەزا بین و بزانین چۆن ژیاوەو چی کردوە، ئنجا خوای پەروەردگار بە (محمد) ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَـٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾ الأعراف، واتە: ئەی (محمد) ﷺ ئەتۆ بڵێ: ئەی خەڵکینە من پێغەمبەری خوام بۆ هەمووتان، ئەو خوایەی کە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی بەتەنیا هی ئەوە، جگە لەو پەرستراوی دیکە نین، دەژیێنێ و دەمرێنێ، وە ئیمان بێنن بەخواو بەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەی کە ئیمانی هێناوە بە خواو بە وشەکانی خوا (کە قورئانە)، وە شوێنی بکەون بۆئەوەی ببنە ڕێنمایی کراو.

لێرەدا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کە تۆ ئاوا خۆت پێناسە بکە کە تۆ ئیمانت هەیە بە خوای پەروەردگارو بە وشەکانی، جا دیارە پێغەمبەر ﷺ ئەو ئیمانەی لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەرجەستە کردوەو ژیانەکەشی موجەسسەمەی ئیمان و تەقواو بۆ خوا سوڵحان بووە.

کەواتە تا زیاتر شارەزا بین بە ژیان و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ، زیاتر دەزانین خواپەرستیی چۆن دەبێ بەرجەستە بکرێ و، مسوڵمانەتیی و دینداریی دەبێ چۆن بکرێ.

www.alibapir.com


(قتادة) لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دایکی مسولمانانو هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەری ﷺ پرسی: ئەخلاقو ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە؟

عائیشە دەفەرموێ ئایا قورئان ناخوێنی؟!

ئەویش دەڵێ با.

عائیشە دەفەرموێ: ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ قورئان بوو، واتە: قورئان چۆن دەفەرموێ ئاوا بوو.

دیارە ڕستەی: (فأن خلقَ نبِي الله كان القرآن)[1] واتاو چەمکێکی فراوانتری هەیە لەوەی کە ئێمە دەچێتە زەینمانەوە، چونکە وشەی (خُلُق) لێرەدا واتە هەڵسوکەوت بەگشتی، ئەخلاقی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خوا، لەگەڵ خەڵکی خوا، لەگەڵ ماڵو خێزان، لەکاتی جەنگو ئاشتی، لە مەیدانی سیاسەتو عیبادەتو چالاکییە کۆمەلایەتیەکاندا بە شێوەیەك بووە کە قورئان دەفەرموێ، کەواتە ئێمە کاتێك کە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ باش شارەزا دەبین، دەکەوینە سەر ڕاستە شەقامێك کە چۆن دینداریی بکەین بۆ خواو، چۆن کتێبی خوا لە خۆماندا بەرجەستە بکەینو، چۆن مسوڵمانەتییو خواپەرستیی بکەین؟!

## چوارەم: لە ڕووی کارو چالاکی ئیسلامییەوە:

شتێکی ڕوونو ئاشکرایە لە هەموو ژیانماندا پێویستمان بە سەرمەشقو کەسێك هەیە کە مامۆستاو چاوساغمان بێ، لە هەموو لایەنەکانی ژیانماندا، بەتایبەت کەسانێك کە بیانەوێت کۆمەڵگاو خەڵکی خۆیان بگۆڕن بە شێوەیەك کە خوا پێی خۆشە، ئەوانە لە هەموو کەس زیاتر پێویستیان بەوە هەیە کە سەرمەشقێکی باشیان

---

١) رواه مسلم: ١٧٣٦.

هەبێت، چونکە ئەگەر تۆ بە تەنیا لە دینداریی تاکییدا تووشی هەڵەیەك بی بە تەنیاش باجەکەی دەدەیت، بەڵام ئەگەر لە ڕیزی کۆمەڵێکدابی، هەموو کۆمەڵەکە باجەکەی دەدەن، جا ئێمە بە ئەندازەی ئەوەی کە لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ شارەزاو سەر ڕاست دەبینو سوودی لێ دەبینین، بەو ئەندازەیەش خوای گەورە یارمەتیمان دەدات کە لە تەرازووی شەرعدا لای خوای پەروەردگار مەقبوولو پەسند بین، ئنجا شتێکی بەڵگەنەویستە –وەك دوایی بەدرێژی باسی دەکەین- کە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا بە پێی وەحی بەڕێوەچووەو هەنگاوێکی نەناوە تاکو بەرپێی خۆی نەبینیبێو، لەبەر ڕۆشنایی وەحیدا هەنگاوی ناوەو هەڵوێستی دەربڕیوە، جاری وا بووە پرسیاری لێکراوە فەرموویەتی نازانم، ویستوویەتی بزانێ خوای پەروەردگار لەوبارەوە چی دەفەرموێ، جاری واش هەیە لەبەر ڕۆشنایی وەحیدا ئیجتیهادێکی کردوە، بەڵام ئەگەر هەڵەی کردبێ خوای پەروەردگار بۆی ڕاست کردۆتەوە، ئەوە لەکاتێکدا پێی وابووە کە ئەو ئایەتە دەلالەت لەسەر ئەو شتە دەکات، بەڵام ئەگەر دەق (نص)ێکی لەبەردەستدا نەبووبێ کە ئیجتیهادی لەبەر ڕۆشناییدا بکات، ئیجتیهادیشی نەکردوەو ڕاوەستاوە تا خوای کاربەجێ ئایەتی بۆ ناردۆتە خوار.

بۆ زیاتر ڕوونکرنەوە با سەرنجی ئەم ئایەتانە بدەین، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٦ ﴾الأنعام، واتە: شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە، بێجگە لەو پەرستراوێکی دیکە نیە، وە پشت لە هاوبەش دانەران بکە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ١٠٩ ﴾ یونس، واتە: شوێن ئەوە بکەوە کە لەمەودوا بۆت ڕەوانە دەکرێ، وە

www.alibapir.com


خۆڕاگر بە تاکو خوا حوکم دەکات، بێگومان خوا چاکترین فەرمانڕەوایە - وچاکترین دادوەرە -.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ ﴾ الأحقاف، واتە: ئەی (محمد) ﷺ تۆ بە موشریکەکان بڵێ: من لەنێو پێغەمبەرانی خوا -علیهم الصلاة والسلام)دا شتێکی داهێنراو نیم، وە من ناشزانم کە منو ئێوە چیمان پێدەکرێت، دیارە بۆیە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر دەفەرموێ وا بفەرموو، بۆئەوەی موشریکەکانیش بزانن کە پێغەمبەر ﷺ قورئان لەخۆیەوە ناڵێ، بەڵکو ناشزانێت کە خوای پەروەردگار ئەمڕۆ، یان سبەی چی پێ دەفەرموێو چ شتێکی بۆ حەڵاڵو چیشی لێ حەڕام دەکات!

جا دیارە ئەمە وا دەگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ بەتەواوی تەسلیمی وەحی بووەو خوای کاربەجێ چی فەرموبێ وایکردوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾، واتە: من جگە لە ئاگادارکەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکرا، هیچی دیکە نیم.

کەواتە: ئێمەش ئەگەر بمانەوێت چاك بەدوای ئەو وەحییە بکەوین کە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوە، دەبێ شوێن پێی ئەو هەڵگرین، کە قۆناغ بە قۆناغ جێ بەجێی کردوە، چونکە وەحی بەیەکجار نەهاتۆتە خوار، ئەوەتا موشریکەکان لەوبارەوە ڕەخنەیان گرتوە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ... ﴿٣٢﴾ ﴾ الفرقان، واتە: ئەوانەی بێبڕوان گوتیان بۆچی قورئانی بەیەك جار بۆی نایەتە خوار؟!

خوای پەروەردگاریش بەم جۆرە وەڵام دەداتەوەو، دەفەرموێ: ﴿...كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ٣٢﴾ الفرقان، واتە: ئاوا بۆئەوەی لە دڵو عەقڵتدا بیچەسپێنین و، پێ بە پێ بۆت دەخوێنینەوە، چونکە قورئان بەرنامەی ژیانە، بۆیە پێویستە جێبەجێ بکرێو بۆ ئەوە نەهاتوە، کە هەر بخوێندرێتەوەو بەس، بۆیە دەبێ قۆناغ بە قۆناغ بێت، جا ئێمە لە کارو چالاکی ئیسلامییدا بە ئەندازەی ئەوەی، کە شارەزای ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەبین، بە ئەندازەی ئەوە سەرڕاست دەبینو دەزانین ئەو قۆناغەی، کە هاتۆتە پێشمان چ قۆناغێکە، بە بەراوردکردن لەگەڵ قۆناغەکانی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ و، ئەو چ هەڵوێستێکی تێدا وەرگرتوە، ئێمەش ئەو هەڵسوکەوتەی تێدا وەربگرین، ئەو چۆنو کەیو ئایەتەکانی بە چ شێوەیەك جێبەجێ کردوەو لێکداوەتەوە، ئێمەش بەهەمان شێوە، کە بێگومان ئەوەش بەبێ شارەزایی لە بەسەرهاتو هەڵوێستەکانو قۆناغەکانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ مەیسەر نابێ.

جا داواکارم لە خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە زیاتر شارەزایی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەبنو، چاکتر شوێن پێیەکانی هەڵدەگرن، بەو جۆرەش بژین، کە پێغەمبەر ﷺ پێی ژیاوە، بەو شێوەیە بەڕێوە بچین، کە ڕووسووری دنیاو دوارۆژ بین.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# ناوو نەسەب و کات و شوێنی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ

## ١) ناوی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ:

خوای پەروەردگار لە قورئاندا دوو ناوی بۆ پێغەمبەر ﷺ بەکارهێناون، وە لە ژیانیشیدا هەر ئەو دوو ناوەی لێ هەڵدراون، کە بریتین لە (محمد و أحمد)، کە لەم ئایەتانەدا ئەم دوو ناوە موبارەکە هاتوون:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ...(١٤٤)﴾ آل عمران، واتە: وە موحەممەد تەنیا پێغەمبەرێکە کە لەپێش ئەویشدا پێغەمبەری دیکە ڕابردوون، هەروەها دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ ...(٤٠)﴾ الأحزاب، واتە: موحەممەد ﷺ بابی هیچ کام لە پیاوەکانتان نیە بەڵکو ڕەوانەکراوی خوایەو کۆتایی پێغەمبەرانە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۙ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ (٢)﴾ محمد، واتە: وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، وە ئیمانیان هێناوە بەوەی کە نێردراوەتە سەر موحەممەد ﷺ کە حەقەو لە پەروەردگاریانەوەیە، ئا ئەوانە خوا گوناح و خراپەکانیان لێ دەکوژێنێتەوەو حاڵ و وەزعیان باش دەکات، هەروەها دەفەرموێ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ

بَيْنَهُمْ ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح، واتە: موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایەو ئەوانەی کە لەگەڵیدان لەسەر کافران توندو تیژو لە نێو خۆیاندا بەبەزەیین، کەواتە چوار جار ناوی (محمد) هاتوە لە قورئانداو یەکجاریش ناوی (أحمد) هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ... ﴿٦﴾ ﴾ الصف، واتە: وە کاتێك عیسای کوڕی مەریەم گوتی ئەی وەچەی ئیسرائیل! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە، وە ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا نێردراوە من بە ڕاستی دەزانم، وە مژدەتان پێ دەدەم بەهاتنی پێغەمبەرێك لە دوای منەوە کە ناوی (أحمد)ە.

پێویستە بشزانین کە هەرکام لە ناوی (أحمد) و (محمد) یەك مانایان هەیە ئەویش واتە (ستایش کراو)، واتە ئەوکەسەی کە ستایشی کراوەو ستایشی دەکرێ لە دنیاو لە قیامەتدا، کە بەتەئکید پێغەمبەری کۆتایی ناوو نێوەڕۆکی یەکن، واتە: وەك ناوی (محمد) و (أحمد)ە بەهەمان شێوە بە کردەوەش ستایشی کراوە، هەم لەلایەن خوای پەروەردگارەوەو هەم لەلایەن خەڵکیەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾ الإسراء، جا ئەگەر لە دونیادا تەنیا لە لایەن ئوممەتەکەیەوە مەدح دەکرێو کراوە، لە دوارۆژدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن هەموو مرۆڤایەتییەوە سوپاسو ستایش دەکرێ، وە ئەو ناوەش (آمنە)ی دایکی لێیناوە، وەك لە (سیرة ابن هشام)[1]دا هاتوە، وە لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتوە کە (عبدالمطلب)ی باپیری ئەو ناوەی لێناوەو کە لێیان پرسیوە: بۆچی ناوی لێدەنێی (محمد) گوتوویەتی: ئومێد دەکەم پیاوێکی لێدەرچێ خەڵك

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج١، ص٨٤ .

ستایشی بکاتو سوپاسی بکاتو، مەدحو سەنای[1] بکات، کە بێگومان ئومێدو هیوایەکەی باپیری هاتۆتە دی.

ئەوە بە نسبەت قورئان، لە سوننەتیشدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{أنا محمد وأنا أحمد وأنا الماحي الذي يمحو الله بي الكفر وأنا الحاشر، الذي يحشر الناس على قدمي وأنا العاقب}** رواه البخاري[2]، واتە: من (محمد)م وە (أحمد)م وە من سڕەرەوەم، ئەوکەسەی کە خوای پەروەردگار کوفرو بێباوەڕیم پێ دەسڕێتەوە، وە من کۆکەرەوەم ئەو کەسەی کە خەڵك لەبەردەستی مندا کۆدەکرێتەوەو حەشر دەکرێت، وە من کۆتا پێغەمبەرم، بەڵێ پێغەمبەر ﷺ یەکەم کەسە کە زیندوو دەکرێتەوەو لەدوای ئەو خەڵك کۆدەکرێتەوە، وە ئاڵا هەڵگری ڕۆژی مەحشەرە، وە دوای ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ تکاو ڕەجا دەکا لای خوای پەروەردگار، ئنجا دادگایی‌و لێپرسینەوەی خوا بۆ خەڵك دەست پێدەکات، (عاقب)یش ئەوەیە کە لەدوایەدا دێو هیچ پێغەمبەری دیکەی بەدوادا نایەت.

## ٢) نەسەبی پێغەمبەر ﷺ :

نەسەبی پێغەمبەر ﷺ بە گشتی دوو بەشە، بەشێکی هەموو زانایانو مێژووزانو پسپۆڕان لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ کە پێشیان دەگوترێ: زانایانی ڕەچەڵەکناس (علماء الأنساب) هەموویان لەسەری یەك دەنگن بەبێ هەڵاواردن، ئەویش ئەو زنجیرەیەیە کە لەخۆیەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە (عدنان) کە یەکێکە لە نەوەی (اسماعیل)ی کوڕی (ابراهیم) -عليهما الصلاة والسلام- ئەوەش، کە زانایان ڕا جیاییان تێیدا هەیە ئەوەیە کە لە عەدنانەوەیە تا دەگاتە ئیسماعیل، جا لە

---

١) البداية والنهاية ، لابن كثير، ج٢، ص٣٤٥ .
٢) صحيح البخاري (٣٥٣٢)، (٤٨٩٦) وصحيح مسلم: ٦٠٥٨,

www.alibapir.com


(محمد)ەوە ﷺ تا دەگاتە عەدنان کە بیستو دوو پشتە ئەوە هەموو زانایان لەسەری یەك دەنگن، ئەویش بەم شێوەیەیە: (محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب بن هاشم بن عبد المناف بن قصي بن كلاب بن مرّة بن كعب بن لؤي بن غالب بن فهر بن مالك بن النضر بن كنانة بن خذيمة بن مدركة بن إلياس بن مضر بن نزار بن معد بن عدنان)[1].

بۆیەش جەختم لەسەر ئەم مەسەلەیە کردەوە، چونکە هەندێ خەڵکی نەزانو نەفامو بێبڕواو دڵ ڕەش، بەو دوادواییەوە دەیانەوێ توانجو پلار لە نەسەبی پێغەمبەر بدەن، -وەك لە دواییشدا باسی دەکەم- ئنجا دیارە پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ عارەبە وەك ڕەچەڵەکی نزیکی، چونکە ئەو قوڕەیشیەو قوڕەیشیش یەکێکن لە (مضر)، کەواتە پێغەمبەر ﷺ لەڕووی نەسەبەوە عارەبەو، گەلی عارەبیش بەگشتی سێ جۆر بوون:

**یەك: عارەبی بائیدە (العرب البائدة):** واتە: عارەبی فەوتاو کە نەماون، ئەوانە ئەو تیرە عارەبانەن کە کاتی خۆی لە مێژوودا هەبوونو باسیان کراوە هەیانبووە دەوڵەتو کیانیشی هەبووە، وە خوای پەروەردگاریش باسی هەندێکیانی کردوە، وەك (عاد، ثمود، طسم، جدیس، حضرموت...) کە نەماون بۆیە پێیان دەگوترێ: **(العرب البائدة)**، کە تەنها لە کتێبەکانی مێژوودا ناویان ماوە، ئەگەرنا ئەسڵو وەچەیان نەماوەو بڕاونەتەوە.

**دوو- عارەبی ئەصڵ (العرب العاربة):** بریتین لەو عارەبانەی کە لە پشتی (یشجب بن یعرب بن قحطان) دێنە خوارێ وە پێیان دەگوترێ (العرب القحطانیة) **دیارە** ئەو عارەبانە ئەسڵن، چونکە لە سەرەتاوە بە عارەبایەتی هاتوون.

---

١) بڕوانە: ١- سیرة ابن هشام، ج١، ص١-٢.
٢- تأريخ الطبري ج٢، ص٢٣٩ إلى ٢٧١، شایانی باسە، کە ئەم زانیارییە هەرکام لە: (ابن سعد)و (بخاري)و (ابن القيم)و (الذهبي)یش هێناویانە.

**سێ:- ئەو عارەبانەی، کە کراون بە عارەب (العرب المستعربة):** بریتین لەوانەی، کە لە پشتی (اسماعیل) ﷺ و دوای خۆیشی لە پشتی (عدنان) هاتوونە خوار، کە پێیان دەگوترێ (العرب العدنانیة)، چونکە باپیرەیان عەدنانە کە ئەویش دەچێتەوە سەر ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم -علیهما الصلاة والسلام- بۆیەش پێیان دەگوترێ عارەبی بە عارەب کراو، چونکە ئیسماعیل کە کوڕی ئیبراهیمە، وە ئیبراهیم بۆخۆی عارەب نەبووە (اسماعیل)یش هەر عارەب نەبووەو (هاجرة) کە دایکی ئیسماعیلە هەر عارەب نەبووە، بەڵکو قبطي بووەو خەڵکی (مصر) بووە، وە خودی ناوی (ابراهیم)یش ناوێکی عارەبی نیەو لە زمانی عارەبیدا پێی دەگوترێ (أعجمي)، بەلاّم ئیسماعیل لە دواییدا لە قەبیلەی (جُرْهم) ژنی هێناوەو هەر لەوانیشەوە فێری عارەبی بووە[1]، بۆیە وەچەی ئیسماعیل پێیان دەگوترێ (العرب المستعربة).

## ٣) کات و شوێنی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ:

(محمد بن عبدالله) لە ماڵی (أبو طالب) لەدایکبووە، لە شیوەکانی بەنی هاشم (شعب بني هاشم)و لە شاری مەککە، لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممە، (١٢ ربیع الأول) یان (٩ی ربیع الأول) کە زانایان مشتومڕیان لەوبارەوە هەیە، لە ساڵی فیل کە دەکاتە (٥٧١)ی زایینی، ئەو ساڵەش بۆیە ناونراوە ساڵی فیل، چونکە لەو ساڵەدا (أبرهة)ی حەبەشەیی لە (صنعاء)ەوە سوپایەکی هێناوە بۆ ئەوەی (کعبة) بڕوخێنێ، چونکە پەرستگایەکی دروست کردبوو لە (صنعاء) بەناوی (قلیس) دەیویست ئەو هاتووچۆیەی، کە خەڵك دەیکەن بۆ (کعبة) بگوازرێتەوە بۆ ئەو پەرستگایەی، کە ئەو لە (صنعاء) بنیاتی ناوە، تاکو ئەو بازرگانییەش کە لە مەککە دەکرێ،

١) (صحیح البخاري): ٣٣٦٥، ٣٣٦٤.

بکەوێتـە (صنعاء)، بۆ ئـەو مەبەسـتە (أبرهــة) بـە سـوپایەکی زۆرەوە، کـە فیلێکـی زۆریشیان پـێ دەبـێو فیلێکـی گـەورە لـە پێشـەوەی سوپاکەیان دەبـێ بـەناوی (فیـل محمود)، دەچن بۆ مـەککە بـە مەبەستی ڕووخانـدنی کەعبـە، کاتێـك نزیکـی مـەککـە دەبن، ئەوکاتە (عبدالـمطلب)ی باپیـری پێغەمبەر ڕیش سپی خـەڵکی مـەککـە دەبـێ، تەماشا دەکات سوپایەکی زۆرەو لەو باوەڕەدا دەبێ، کە بەو لەشکرە نـاوێرنو شـەڕیان بۆ لەگـەڵ نـاکرێ، بۆیـە دەچنـە شـاخەکانی دەوروبـەری مەککـە، لـە نزیکـی مـەککـە ئەبرەهە بانگی ڕیش سپی‌یانی خەڵکی مەککە دەکاتو (عبدالـمطلب) دەچێ بـۆ لای‌و زۆر ڕێزی لـێ دەگرێ، ئەبرەهە پێی دەڵێ: ئەگـەر خزمـەتێکت هـەبێ؟ ئـەویش دەڵـێ ئیشـی مـن ئەوەیـە کـە (٢٠٠) حوشتــرتان بـە تـالآن بـردووم داوا دەکـەم کـە بـۆم بگەڕێنیەوە، ئەبرەهەش پێی دەڵێ: کە بینیمی لە چاومدا زۆر بەڕێزو حورمەت بووی‌و سامم لـێکردی، بەڵام کە باسی حوشترەکانت کردو باسی (کعبـة) ناکـەی، کـە هـاتووم بیـڕووخێنم، لەبەرچاوم کەوتی!! (عبدالـمطلب)یش وەڵامی دەداتـەوەو دەڵـێ: (أنـا رب الأبـل وللبيـت ربٌّ يَحْمِيـهِ)، واتـە: مـن خـاوەنی حوشتــرەکانمو داوای حوشتــرەکانم دەکەمەوە، وە ئەو (بيـت)ەش خاوەنێکی هەیە دەیپارێزێ!

دیارە ئەوان بە تەجرەبە بۆیان دەرکەوتوە، کە هەرکەسـێك بیـەوێ خراپـە بەرامبـەر یەکەم ماڵی خوا بکات، ناتوانێو زەرەرمەند دەبـێ، بۆیـە بـە قیـاس لەسـەر ڕابـردوو، زانیویانە کە ئەبرەهە سەری سەلامەت نابێ، ئەوەبوو کە دوای ئەوەی ئەوانەی خـەڵکی مەککە بوونو لە دەوری کەعبە بوون دەگەڕێنەوە بۆ شاخەکانی دەوری کەعبـە، خـوای پـەروەردگار سـوپایەك لـە باڵنـدە پـۆل پـۆل دەنێـرێ بـۆ سـەر لەشـکری ئەبرەهـە، کـە مێژوونوسان زۆر بەوردی باسیان کردوەو دەڵێن: ئەو باڵندە وا پێدەچـێ ئـەو باڵندەیـە بووبێ کە ئێمە پێی دەڵێین (پەرەسێلکە) کـە هـەر یـەکێك لـەو باڵندانـە سـێ بـەردی پێبووە، یەکێك بە دەنووکی دووەکەی دی بە پێیـەکانی، وە بـە هەرکەسـێك کەوتبایـە

وەك ئەوە بووە کە تیژابی پێدا بکەی‌و ئەگەر بەسەری کەوتبایە هەتا بەری پێی گیر نەدەبووو بەدەنی دادەڕزا، ئەو باڵندانە بەو وردە بەردانە بەردبارانیان کردن.

خوای پەروەردگار هەر بەو بۆنەیەوە سووڕەتێکی ناردۆتە خوار کە دەفەرمـــــوێ: ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴿٥﴾ ﴾ الفيل، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، نابینی پەروەردگارت چی کرد بە خاوەن فیلەکان، ئایا ئەو پیلان‌و فێڵەی کە بەدەستیانەوە بوو پووچی نەکردەوە، پۆل پۆل باڵندەی نارده سەریان‌و بە بەردێك بەردبارانیان دەکردن کە لە قوڕ دروست کرابوو {چونکە وشەی (سجیل) لە ئەسڵدا وشەیەکی فارسی، یان کوردییەو (طبري) دەیباتەوە سەر ئەصڵی (سەنگی گڵ)، (سەنگ)، واتە: بەردو (گڵ)یش، واتە: قوڕ، واتە: بەردێك کە لە قوڕ دروستکراوە، لەبەرئەوەی کە پیتی (گ) لە زمانی عارەبیدا نیە گوتراوە: (سَنْج جِل) ئنجا کە دوو جیمەکەیان بەیەکەوە دەغم کردوە، گوتوویانە: (سِجِّيل)} ﴿ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴾، واتە: وەکو (کا)ی خوراوی لێکردن، (عصف) یانی (کا) جا هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەستی ئەوەیە وەك تەرس‌و ڕیخی لێکردن، هەندێکیشیان دەڵێن: وەك چەوەڵێك کە ئاژەڵ دەیخوا.

بەڵێ لەو مانگەدا پێغەمبەرمان (محمد) ﷺ بە هەتیوی لەدایك دەبێ، ئەو جۆرە لەدایکبوونەش حیکمەتی زۆری تێدان، کە سەرپەرشتی بابی‌و سۆزو پەروەردەی دایکی نابینی‌و، دواتریش دەبێتە پێغەمبەری هەموو مرۆڤایەتی.

ئەو پێغەمبەرەی کە بابی خۆی نەبینیوەو لەزگی دایکیدا بووە کە مردوەو، لە تەمەنی (٦) ساڵیشدا بووە کە دایکیشی مردوەو، دواتر کە باپیری بەخێوی کردوە،

ئەویش پاش دوو ساڵ لە مردنی دایکی مردوەو دواتر چۆتە لای (أبو طالب)ی مامی، کە ئەویش هەتا مردوە بڕوای بە پێغەمبەرایەتی (محمد) نەهێناوە، جا ئەمانە هەموویان ئەوە دەگەیەنن کە ئەو دینو بەرنامەیەی پێغەمبەر ﷺ هێنای لەلایەن خواوەیەو، خزمو کەسو نزیکانی هیچ کاریگەرییەکیان نەبووە لەسەر سەرهەڵدانی ئەو بانگەوازەی کردوویەتیو پشتیوانی نەبوون بۆ ئەو مەبەستە، بەڵکو بەویستی پەروەردگار بەو شێوەیە پەروەردەو گەورە بووەو بۆتە پێغەمبەری هەموو مرۆڤایەتی.

## قسەیەکی بێ بنەما:

لێرەدا دەمەوێ ئاماژەیەك بەوە بکەم کە لە کوردستانی خۆماندا کابرایەك بەناوی (جمال رشید) ماوەیەك لەمەوبەر کتێبێکی نووسیوە، کە دەزگای (ئاراس) لە هەولێر بۆی چاپ کردوە، لە سەرەتاوە نووسەری ئەو کتێبە بانگەشە دەکاتو دەڵێ من ڕێبازێکی عیلمییانەم بەکارهێناوە لەم کتێبەمدا، بۆیە هەر شتێك کە بەڵگەو ئیسپاتی عیلمی لەسەر نەبێ نەمنووسیوە، بەڵام کە باسی پێغەمبەری کردوە ﷺ دەڵێ: (محمد) ناوی (قُثَم) بووە، بابیشی ناوی (عبدالله) نەبووەو ناوی (عبد اللات) بووە، ئنجا دەڵێ (قُثْم) واتە (محمد) بە چوار ساڵ لەدوای مردنی بابی لە دایك بوو، وە دەڵێ: پێم عەجایبە چۆن (عبدالمطلب) نەوەیەك، کە چوار ساڵ پاش مردنی بابی لە دایك بووە، بە نەوەی خۆی لە قەڵەمی داوە!، جا بێگومان ئەو قسەیە کوفرو لەدین دەرچوونە، بەڵام من تەماشام کرد بۆ ئەوەی بزانم داخۆ پشتی بە چ سەرچاوەیەك بەستوە، کەچی بۆم دەرکەوت کە پشتی بە هیچ سەرچاوەیەك نەبەستوەو ئاماژەی بەهیچ سەرچاوەیەك نەکردوە، لە حاڵێکدا کە هەرچی سەرچاوەی مێژووی ئەنسابە هەمووی لەسەر (٢٢) پشتی (محمد) یەك دەنگن، وە هیچ کام لە مێژوونووسانو لێکۆڵەرەوان شتی وایان نەگوتوە، بۆیە مرۆڤ سەری سووڕدەمێنێ، کە ئەو کابرایە ئەو

www.alibapir.com

قسەو درۆو دەلەسانەی لەکوێ هێناوە، لە کاتێکدا کە ئیددیعای عیلمی بوونی شێوازەکەشی دەکات!![1]

شایانی باسیشە، کە لەنێو عارەباندا نەسەب گرنگییەکی زۆری هەبووە، پیاوێکی وەك (أبوبکر) -ڕەزای خوای لێ بێ- بە دوو شت مەشهوور بووە: بەوە کە بازرگانێکی گەورە بووەو، بەوەش کە ڕەچەڵەکناس (نسّاب) بووە، واتە زۆر نەسەب ناس بووە، بەڵێ عارەب زۆر گرنگییان داوە بە نەسەبو ڕەچەڵەکی خۆیان، ئەو (جەمال)ە ڕەنگە سێ پشت بابو کەسوکاری خۆی نەناسێ، بەلام (محمد المصطفی) نەك بۆخۆی وا بڵێ، بەڵکو هەموو مێژوونووسان تا (٢٢) پشتی دەڵێن: بەبێ ئیختیلاف، دوایی نزیکەی (٢٠) پشتی دیکەشی باس دەکەن، تا دەگاتەوە سەر (اسماعیل)، دیارە ئەو قسەیە سەرەڕای کوفرەکەی، ئەو کتێبە ئەگەر خەڵکی دی بیخوێنێتەوە دەڵێن: ئەو حکومەتەی کە ئەو کتێبە چاپ دەکات دیارە لایەنگری ئەو فیکرەیەو تەئیدی دەکات!

ئنجا سەرەڕای ئەوەش شتی زۆر خراپو بێ مانای دیکەی، تێدایە بۆ نموونە: لەبارەی نیکاحەوە دەیەوێت شتەکە بەرەو ئەوە بەرێتەوە، گوایە لەنێو عەرەباندا نیکاح بەشێوەی هاوسەرگیریی حەلال، بوونی نەبووەو، کە باسی (أبوبکر)و (عمر)یش دەکات، دەیەوێ بڵێ ئەوانە ڕەنگە هیچ کامیان کوڕی بابی خۆیان نەبن!!

جا من پەرۆشی سومعەی میللەتەکەمانمە، چونکە هەرکەسێك کە ئەوە بخوێنێتەوە دەڵێ: وا دیارە ئەو میللەتە زۆر جاهیلە، چونکە عارەب بۆخۆیان زیاتر نەسەبی خۆیان دەزانن، وەك لە کەسێکی غەیرە، وە بۆخۆشیان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن وەك ئاماژەمان پێ کرد کە ڕەچەڵەکی (محمد) ﷺ هەتا (٢٢) پشتی

١) بڕوانە: (ظهور الكورد في التأريخ) لجمال رشيد احمد، ج٣، ص٣٩٩-٤٠١، ط١، مطبعة وزارة التربية.

www.alibapir.com

یەکدەنگیی لەسەرە، جا کەسێك لەولاوە شتێك بێنێ کە هیچ کەس نەیگوتبێ، ئەوە یەکەم: میللەتەکەمان بە میللەتێکی جاهیل و نەفام لەقەڵەم دەدەن، دووەم: بە کافریشی لەقەڵەم دەدەن، وە لەڕاستیدا من سەرم لەوە سووڕ دەمێنێ، کە کتێبەکەشی هەدیە کردوە بۆ ڕووحی (مەلا مصطفی)، ئەو (مەلا مصطفی)یەی کە کاتی خۆی، خۆی بە مسوڵمان ناساندوەو هەموو ڕێزێکی بۆ ئیسلام هەبووەو دژی ئەو جۆرە قسە ناڕەواو درۆو دەلەسانە بووەو، هەر ئەوەو چەند شتێکی دیکەش بووە وایکردوە، کە خەڵك لە دەوری کۆببێتەوە!

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# کورتەیەك لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی لەدایك بوونییەوە هەتاکو سێ ساڵ پێش وەحی بۆی هاتنی

ئەم کورتەیە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە یازدە بڕگەدا دەخەمە ڕوو:

**یەکەم:**

(عبدالمطلب) (١٠) کوڕی هەبوون کە کوڕی گچکەیان (عبدالله) بووە، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: (أنا ابن الذبيحين)، واتە: من کوڕی دوو قوربانییەکانم، لەبەرئەوەی کە کاتی خۆی خوای گەورە فەرمانی بە ئیبراهیم کرد کە ئیسماعیل سەر ببڕێو بیکاتە قوربانی، ئەوەبوو دوایی خوای پەروەردگار بەرانێکی گەورەی ناردەخوار کە ئیبراهیم لەبری ئیسماعیل ئەو بەرانە سەربڕێ، ئەوە (ذَبیح)ی یەکەم، (ذَبیح)ی دووەمیش ئەوە بوو کە (عبدالمطلب) لە کەعبەدا لەخوا پاڕایەوەو داوای لێکرد کە (١٠) کوڕی بداتێ، چونکە ئەو ڕیش سپی قوڕەیشیەکان بوو، لەوە دەترسا کە کوڕی نەبێو دوایی زوڵمی لێبکەن، بۆیە داوای لە خوا کردو گوتی: خوایە ئەگەر (١٠ ) کوڕم بدەیتێ ئەوا یەکیان لە پێناوی تۆدا سەر دەبڕم، جا کە خوای پەروەردگار (١٠) کوڕی دایە، قورعەی کرد بۆ سەربڕینی یەکێکیان، سەرەنجام سێ جار کەوتە سەر (عبدالله) کە لە هەمووشیانی خۆشتر دەویست، چونکە لە هەموویان گچکەتر بوو، ئنجا نەیزانی چ بکا، پرسی کرد بە ڕیش سپییان، ئەوانیش گوتیان: ئەگەر خوێنێکی زۆر گەورە بدەی لە جیاتی سەربڕینی (عبدالله)، ئەوە گوناحبار نابی،

کە ئەویش بریتیە لە سەربڕینی (١٠٠) حوشتـــر، جا بۆیـە هـەم (اســماعیل) و هـەم (عبدالله) هاتوونە سەر ئەوەی کـە سـەر ببــڕدرێن، بـەڵام خـوای پـەروەردگار شـتێکی دیکەی بۆ کردوون بە بەدیـــل(١).

دایکیشـی (آمنـة بنت وهـب بـن عبـد الــمناف بـن زهـرة بـن كـلاب)ە، (آمنـة)ش لەگـەڵ (عبـدالله)دا لـە پشـتێدا دەگەنـەوە یـەك، جـا (عبدالــمطلب) (آمنـة)ی کچـی (وهــب)ی خواســتوە بـۆ (عبــدالله)، کــە ماڵــە بــابی ئامینــە زۆر خانــەدان بــوونو کچەکەشیان ئامینە زۆر هەڵکەوتوو بـووە، چـەند مـانگێـك دوای ئـەوەی، کـە ئامینـە (مـحمد) ﷺ ی وەسك دەکەوێو پێی حامیلـە دەبـێ، (عبـدالله) سـەفەری بازرگـانی دەکات بۆ شامو لەسەری گەڕانەوەدا لەلای ماڵی خاڵـەکانی، کـە لـە (بنـي عـدي بـن النجـار) بووە، لەوێ وەفات دەکات(٢).

## دووەم:

کە ئامینە (مـحمد)ی دەبێ، یەکسەر نەفەرێك دەنێرێ مزگێنـی دەدەن بـە باپیــری (عبدالــمطلب) کە ئەوکات (عبدالله)ی مێردی کە بـابی پێغەمبـەرە، وەفـاتی کـردوە، عـادەتی عـارەب وا بووە کە زۆر پێیان خۆش بووە کوڕیـان ببـێ، چـونکە پێیـان پشـتو قووەت بووەو پێیان وا بووە کە بەهۆی کوڕەکانـەوە نەسـلو وەچـەیان بـەردەوام دەبـێ، مزگێنیان برد بۆ (عبدالــمطلب) کەوا خێزانی (عبدالله) کوڕی بـووە، ئـەویش یەکسـەر دێتەوە (محمد) ﷺ هەڵدەگرێو دەیباتە نێـو کەعبـەو لـە خـوا دەپاڕێتـەوەو سوپاسـی دەکـات(٣)، چـونکە ئــەوان خوایـان ناسـیوە، بــەڵام شــەریكو هاوبەشـیان بـۆ خـوا پەیداکردوە، وە ناویشی لێدەنێ (مــحمد) وەك پێشتر باسـم کـرد، وە نـاوی (مــحمد)

---

١) بڕوانە: (السيـرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص٨٠-٨٢، ط١ دار ابن الهيثم.
٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص٨٣.
٣) هەمان سەرچاوە، ص٨٤.

لەنێو عارەباندا ناوێکی نامۆ بووە، هەندێك دەڵێن: لە پێش (محمد)ی کوڕی (عبدالله)دا کەس ناوی (محمد) نەبووە، وە لە ڕۆژی حەوتەمیدا خەتەنە کراوە، لە لایەن (عبدالمطلب)ی باپیریەوە دەعوەتێکیشی بۆ کردوە، کە لای عارەبان وا باوبووە، هەندێکیش گوتوویانە بە خەتەنەکراویی لەدایك بووە، بەڵام (إبن کثیر) تێبینی لەسەر ئەو ڕایە هەیە[1].

**سێیەم:**

عارەب عادەتیان وابووە منداڵیان بە دایەن داوەو خۆیان منداڵیان بەخێو نەکردوە لەنێو مەککەدا، بەتایبەت ئەوانەی، کە دەوڵەمەندو خواپێداو بوون، ئەگەر منداڵەکانیان کوڕ بووبن ناردوویانن بۆ لادێ، چونکە پێیان وابووە ئاوو هەوای لادێ سازگارترەو لەڕووی (فطرة)یشەوە لە (فطرة)ی ئینسان نزیکترەو، لەوێ منداڵ باشتر پەروەردە دەبێو، لەش ساغو زمانی ڕاستترو پاراوتر دەبێتو عادەتی باشتر وەردەگرێ، بۆیە (عبدالمطلب) لە هەوڵی پەیداکردنی دایەنێکدا دەبێ بۆ (محمد) ﷺو سەرەنجام ئەو قسمەتو نسیبە بۆ (حلیمة بنت أبي ذؤیب عبدالله بن الحارث) دەبێ، کە بە (حلیمة السعدیة) مەشهوورە، وە مێردەکەشی ناوی (الحارث بن عبد العزی) بووە، کە بە (أبي کبشة) ناسراو بووە، وە هەردووکیشیان لە تیرەی (بني سعد بني بکر)ن، دوای ئەوەی (حلیمة) لەگەڵ هاوسەرەکەیدا (محمد)ی کۆرپە لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ ئەوەی بەخێوی بکەن، هەرچەندە (حلیمة) زۆریش حەزی نەدەکرد، کە (محمد) لەگەڵ خۆیدا بەرێ، چونکە بابی نەمابوو، بەڵام دوایی چونکە کەسی دیکەی دەست نەکەوت بەناچاری لەگەڵ خۆی برد، چونکە لەوە دەترسا لەبەرئەوەی، کە بابی نیە نەفەقەکەی بەتەواوی نەدەنێ، حەلیمە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کە چووین لە ڕێگەدا

---

١) بڕوانە (البدایة والنهایة)، ج٢، ص٣٤٤.

ئێمە سواری ولاخێك بووین، كە لەدوای هەموانەوە دەڕۆیشت، ولاخێكی لاوازو لەڕ بوو، خۆشمان كەم دەرامەتو نەدار بووین، بەڵام جێی سەرسوڕمان ئەوەبوو، هەر كە ئەو كوڕەمان وەرگرت بەرەكەت ڕووی تێكردین، تەنانەت لەسەری گەڕانەوە ولاخەكەمان پێش هەموو ولاخەكان كەوتبۆوە، هاوەڵەكانم پێیان دەگوتم ئەی كچی فلانكەس ئەو ولاخەی تۆ چی لێهاتوە..!! تۆ لەسەری هاتن نەدەگیشتیە ئێمە، كەچی ئێستا لەپێش هەموومانەوە دەڕۆی!! خێرو بەرەكەتێكی زۆرمان بەسەردا ڕژا، وە دوای ئەوە ئەو شوێنەی، كە ئێمەی لێبووین لەوەڕی زۆر بوو، شیر هاتە گوانی ولاخەكانمانەوە، هەروەها حەلیمە دەڵێ: چەند جارێك ئامینەی دایكی (محمد) هاتوە كە (محمد) بباتەوە، بەڵام من دەمگوت نا با جارێ هەر لێرە بێ[1].

## چوارەم:

لە تەمەنی چوار ساڵیدا ڕووداوێك لە پێغەمبەر ﷺ ڕوویدا، كە لە (صحيح مسلم)دا هاتوەو ئەوە دەقەكەیەتی:

**((عن أنس أن رسول الله ﷺ أتاه جبريل وهو يلعب مع الغلمان فأخذه فصرعه فشق عن قلبهِ فاستخرج القلب فاستخرج منه عَلَقَةً، فقال هذا حظ الشيطان منك ثم غَسَلَهُ في طست من ذهب بماء زمزم، ثم لأَمَهُ ثم أعادَهُ في مكانه، وجاء الغلمان يسعون إلى أمه (يعني ظئره) فقالوا إن محمداً قد قتل، فاستقبلوه وهو منتقع اللّون، قال أنس وقد كنت أرى أثر ذلك المُخيط في صَدْره))**[2].

ئەنەس دەگێڕێتەوە، كە دیارە یان لە پێغەمبەری بیستوە ﷺ یان لە یەكێك لە هاوەڵان (أصحاب) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو كاتەی كە منداڵ بووەو تەمەنی چوار

---

١) بڕوانە: (سيرة ابن هشام)، ج١، ص (٨٥-٨٦)، وە: (البداية والنهاية)، ج٢، ص (٣٥٤-٣٥٥).
٢) (صحيح مسلم): ٤١١، وە: (البداية والنهاية)، ج٢، ص٣٥٧.

www.alibapir.com


ساڵ بووە، لە بادیەی بەنی سەعد لەگەڵ منداڵان یاری کردوە، جبریل هاتوە بۆ لای گرتوویەتیو لە عەرزیی داوە، پاشان سینەی (موبارەکی) شەق کردوەو دڵی دەرهێناوە وە شتێکی لە دڵی هێناوەتەدەرو فەرموویەتی ئەوە بەشی شەیتانە لەتۆدا، دوایی دڵەکەی لە تەشتێکی زێڕیندا بە ئاوی زەمزەم شوردۆتەوەو، ئنجا خستوویەتیەوە شوێنی خۆیو سینەی (موبارەکی) بەیەکەوە نووساندۆتەوە، وە ئەو منداڵانەش کە لەگەڵ (محمد) بوون ڕایان کردوە بۆ لای حەلیمەو گوتوویانە (محمد) کوژرا، دوایی کە بەرەو ڕووی چوون هەڵستاوەتەوەو ڕەنگی بزرکاوە، ئەنەس دەڵێ: من شوێنەواری خەتی شەقکرانی سینەی موبارەکی پێغەمبەرم ﷺ دەبینی.

دیارە ئەنەسی کوڕی مالیك (١٠) ساڵ خزمەتی پێغەمبەر ﷺی کردوە، لە تەمەنی (١٠) ساڵی تا (٢٠) ساڵی، لەبەرئەوە لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ سینەی موبارەکی ڕووت بووە، یان کە خۆی شۆردوە، خاولی وێداوەو خزمەتی کردوە، ئەو شوێنی شەق کرانو خەتی سینگی موبارەکی بینیوە.

وە مەسەلەی سینە لەتکران (شق الصدر) زانایان زۆریان دەربارە گوتوەو، سوورەتی (الإنشراح)یش هیچ پەیوەندی بەو مەسەلەوە نیە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾﴾.

چونکە ئەوە مەبەست پێی سینە گوشادبوونی مەعنەوییە بەهۆی ئیمان هیدایەتەوەو، ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە.

## پێنجەم:

(حلیمە)ش، کە ئەو سینگ شەق کردنە دەبینێ، دەترسێو بە پەلە (محمد) ﷺ دەگێڕێتەوە بۆ لای (آمنة)ی دایکی، چونکە ترساوە لەوەی کە شتێکی بەسەربێ،

بۆیە ئەو دوو ساڵە لە (٤ ساڵی تا ٦ ساڵی) لای دایکی دەمێنێتەوەو، کە تەمەنی دەبێتە شەش ساڵ دایکی دەچێت بۆ (یثرب) بۆئەوەی سەردانی خاڵەکانی (محمد) بکات، بەڵام لە گەڕانەوەیدا لە (أبواء)، کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان شاری (مکة)و (مدینة) وە، (آمنة) کۆچی دوایی دەکات، وە (عبدالمطلب)ی باپیری، کە لەو سەفەرە لەگەڵی دابووە (محمد)ی بێ بابو دایك لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە بۆ مەککەو بۆخۆی سەرپەرشتی دەکات[1].

## شەشەم:

دوای ئەوەی کە تەمەنی (محمد) ﷺ دەگاتە (٨ ساڵو ٢ مانگو ١٠ ڕۆژ) (عبدالمطلب)یش وەفات دەکاتو وەسیەت دەکات بۆ (أبو طالب)ی مامی، کە دوای مردنی خۆی (محمد) ﷺ بگرێتە لای خۆی، (أبو طالب)یش هەڵدەستێ بە وەئەستۆ گرتنیو سەرپەرشتی کردنی (محمد) ﷺ[2].

## حەوتەم:

لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا هەندێك لە مێژوونووسانیش دەڵێن لە تەمەنی (٢٠) ساڵیدا، لە بازاڕی (عکاظ) شەڕێك لەنێوان (قریش) و(کنانة) لەلایەك، وە (قیس بن عیلان) لە لایەکی دیکەوە ڕوو دەدات، کە بە (حرب الفِجار) ناسراوە، چونکە لە مانگەکانی حەرامدا ئەو شەڕە کراوە، وە عارەبەکان عادەتیان وابووە لەم چوار مانگەدا شەڕیان نەدەکرد کە بریتی بوون لە (ذوالقعدة و ذوالحجة ومحرم ورجب) لەبەر ئەوەش ناوی لێنراوە (حرب الفجار)، واتە: شەڕێکی تاوانبارانە، چونکە

---

١) بڕوانە (سیرة ابن هشام)، ج١، ص ٨٨.

٢) بڕوانە: (السیرة النبویة لابن هشام)، ج١، ص٩٣، ط١ دار ابن الهیثم.

حورمەتی مانگە حەرامەکانی تێدا شکێنراوە، پێغەمبەر ﷺ لەو جەنگەدا بەشداری کردوە، وەك بۆخۆی فەرموویەتی: **{كنت أُنبِّلُ على أعمامي}**[1]، واتە: تیرم بۆ مامەکانم ئامادە دەکرد، بۆیە ئەو ڕیوایەتە نزیکترە، کە تەمەنی (١٥) ساڵ بووبێ، چونکە ئەگەر تەمەنی (٢٠) ساڵ بووبایە ئەویش بە کردەوە بەشداری شەڕەکەی دەکرد، بەڵام لەبەرئەوە کە (١٥) ساڵ بووە هەر ئەوەندەی پێکراوە، کە تیر بداتە دەست مامەکانیو بەوە هاوکارییان بکات.

لەدوای ئەو جەنگەش لەنێو تیرەکانی قورەیشدا پەیمانێك دەبەسترێ بەناوی (حلف الفضول)، واتە: (پەیمانی جوامێران) کە لەنێوان ئەم تیرانەدا بەستراوە: (بنوهاشم، بنو عبدالمطلب، أسد بن عبد العزى، زهرة بن كلاب، تيم بن مرة) لە ماڵی (عبدالله بن جدعان) ئەویش لەسەر ئەوەبوو کە کابرایەکی غەیری مەککی لە مەککە شت دەفرۆشێ یەکێك لە ئەشرافی مەککە پارەکەی ناداتێ، ئەویش هاوار دەکاتو دەڵێ: ئەی خەڵکی مەککە بەرگریم لێبکەن، فلان کەس زوڵمم لێدەکات، پێغەمبەریش ﷺ زۆر بەڕێزەوە باسی ئەو پەیمانەی کردوە، کە لە ماڵی (عبدالله بن جدعان)دا بەستراوە، کە دەفەرموێ: **{لقد شهدت في دار عبدالله بن جدعان حِلْفاً ما أحب ان لي به حمر النعم ولو أُدعى به في الإسلام لأَجَبْتُ}**[2] واتە: لە ماڵی (عبدالله)ی کوڕی (جدعان) لە بەستنی پەیمانێکدا ئامادەبووم، حەزناکەم کە لە جیاتی ئەو پەیمانە چەند حوشتری سوورم ببوایە -کە ماڵێکی بەنرخ بووە لەنێو عارەبەکاندا- وە ئەگەر لە ئیسلامیشدا بۆ پەیمانێکی وا بانگ بکرێم تێیدا بەشدار دەبم.

---

١) (سيرة إبن هشام)، ج١، ص(٩٥-٩٦).

٢) (سيرة ابن هشام)، ج١، ص ٧٢.

زۆر لە زانایان ئەو فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە، کە مسوڵمان بۆی هەیە لەگەڵ هەر لایەنێکدا پەیمان ببەستێ با مسوڵمانیش نەبێ، بەڵام لەسەر کاری چاکەو شتی باش، وە لەوەش بەهێزتر ئەو ئایەتەیە، کە خوای پەروەردگار تێیدا دەفەرموێ: ﴿...وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ...﴿٢﴾﴾ المائدة، واتە: وە هاوکاریی بکەن لەگەڵ خەڵك لەسەر هەرچی چاکەکارییو پارێزکارییە، چونکە ئەو دەستەواژەیە دەکەوێتە کۆتایی ئایەتی دووەمی سووڕەتی (المائدة) کە دەربارەی هەڵسوکەوتی مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیاندا دەدوێت، کەواتە مسوڵمان بۆی هەیە هەر شتێك کە سوودو قازانجی تێدا بێت هاوکاری غەیری خۆی بکات، مادام شتەکە خۆی لە خۆیدا چاك بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺیش هەر وای کردوەو لەگەڵ (خزاعة) پەیمانی بەستوە کە قەبیلەیەکی موشریك بوون لەسەر ئەوە کە بەرگری لەیەك بکەن[1]، وە لەگەڵ (جوولەکەکان) پەیمانی بەستوە کە پارێزگاریی لە شاری (مدينة) بکەن[2].

**هەشتەم:**

پێغەمبەر ﷺ هەر لە سەرەتاوە چاوی لە کارو کەسابەت بووەو حەزی نەکردوە بار بێت بەسەر شانی کەسەوە، بۆیە لە تەمەنی دوای باڵغ بوونیدا شوانی کردوە، وەك بۆخۆی دەفەرموێ: {**ما بعث الله نبياً الاّ رعى الغنم، فقال أصحابة: وأنت؟ فقال: نعم، كنت أرعاها على قراريط لأهل مكة**}[3] رواه البخاري، واتە: خوا هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردوە مەگەر شوانی کردوەو مەڕی لەوەڕاندوە،

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص٢١٩، ط١ دار ابن الهيثم.

٢) هەمان سەرچاوە، ج٢، ص٢٦٢.

٣) (صحيح البخاري)، رقم الحديث ٢٢٦٢.

هاوەڵەکانی پێیان گوت: ئەتۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ من شوانیم دەکرد بۆ خەڵکی مەککە لەسەر چەند (قیراط)یك.

هەندێك دەڵێن: (قیراط) جۆرێك بووە لە دراوی ئەو سەردەمە، هەندێکیش دەڵێن کە (قیراط) دەشتێك یان بیابانێك بووە لەدەوری مەککە، بەڵێ پێغەمبەر پێش هاتنی وەحیو پێغەمبەرایەتیش چۆن بڵێی چاك ئاوا بووە، وە یەکێك لەو سیفەتە چاکانەی ئەوە بووە کە چاوی لە دەستی خەڵکی نەبووە.

## نۆیەم:

لە تەمەنی (٢٥)ساڵیدا بەماڵو سامانی (خدیجة)ی کچی (خویلد) دەچێ بۆ شام لەگەڵ غولامێکی (خدیجة)دا، کە ناوی (میسرة) بووە، کە دەگەڕێتەوە قازانجێکی زۆر چاك دەکات، چونکە زۆر دەستپاكو لێزان بووە، (میسرة)ش باسی ئەخلاقو ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر ﷺ بۆ (خدیجة) دەکات، کە ئەوکات (محمد) پێغەمبەر نەبووە، (خدیجة)ش -خوا لێی ڕازی بێت- کە ئافرەتێکی تەمەن (٤٠) ساڵیی بووەو لە پێش (محمد)یشدا ﷺ دوو شوی دیکەی کردوون، کە هاوسەرەکانی زوو مردوونو ئافرەتێکی خاوەن تەجروبەش بووە، دڵی بە (محمد)دا دەچێو بۆی پێشنیار دەکات کە بیخوازێ دوای ڕاوێژکردنی بە مامەکانی ڕازی دەبێ، وە ئەوکاتە (خدیجة) هەڵکەوتووترینو خانەدارترینو ژنی نێو قورەیش دەبێ، لەدواییشدا لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ دەردەکەوێت کە (خدیجة) چەند ئافرەتێکی هەڵکەوتوو بووە، وەك دەڵێن: لە پشت هەر پیاوێکی گەورە ئافرەتێکی گەورە هەبووە، بەتەئکید (خدیجة) ئەو ئافرەتە گەورەیە بووە، وە لە ئەنجامدا پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا (خدیجة)ی تەمەن (٤٠) ساڵان دەخوازێ کە ئەو یەکەمین ژنی پێغەمبەر بووەو تا

خەدیـجە وەفاتی کرد پێغەمبـەر ﷺ هیچ ژنی دیکەی نەهێنـاوە[1]، شایانی باسیشـە کە پێغەمبەر ﷺ سەرجەم منداڵـەکانی کـە سێ کـوڕی بـوون، لەگـەڵ چوار کچـان، هەموویان لە (خدیـجة) بوون جگە لە (ابراهیـم) کـە لـە (ماریـة القبطیـة) بـووە، کـە ئـەویش کـەنیزەکێك بـوو پادشـای (مصـر) بـۆ پێغەمبـەر ﷺ ی نـارد، ئـەو شـەش منداڵەش کە لە خەدیـجە بوون بەپێی ڕیزکردنـی زەمەنییـەوە بـەم شـێوەیەن: (قاسـم، زینب، رقیـة، أم کلثـوم، فاطمـة، عبدالله)، وە لەبەرئەوەی (قاسـم) یەکەمین منـداڵی بـووە، بـەوەوە (کنیـة) کـراوەو پێیـان گوتـوە (یـا أبـا القاسـم) ئـەوە لـەپێش پێغەمبەرایەتیدا، (عبدالله)ش دوو لەقەبی هەبوون (طیـب و طـاهر)وە سێ کوڕەکانی هەرسێکیان پێش بـاڵغ بوون وەفاتیان کـردوە.

کچـەکانیش هەرچـواریان گـەورە بـوون، وە ئیمانیـان بـە پێغەمبـەر ﷺ هێنـاوەو شوویان کردوە، کـە (زینـب، رقیـة، أم کلثـوم) پـێش وەفـاتی خـۆی وەفاتیـان کـردوەو (فاطمـة)ش (٦) مـانگ دوای وەفاتی باوکـی وەفـاتی کـردوە -خـوا لـە هـەموویان ڕازی بێت-[2].

**دەیـــەم:**

پێغەمبـەر ﷺ لـە تەمـەنی (٣٥) سـاڵیدا دەبـێ، کـە لافاوێـك دێو (کەعبـە) دەڕووخێنێ، قوڕەیش هەڵدەستن بـە تازەکردنـەوەی (کەعبـە)و دروسـتی دەکەنـەوە تـا دیوار دەگاتە ئەو ئاستەی (الـحجر الأسود) بـەردە ڕەشـەکە دابنێنـەوە، ئیـدی دەبێتـە کێشـەیان کە کێ بەردە ڕەشەکە دابنێتەوە، چـونکە ئـەوە شـەڕەفێکی گـەورە بـووە بـۆ هەرکەسێك پێی هەستێ، دوایی لەسەر ئـەوە ڕێـك دەکـەون، کـە ئـەمڕۆ هەرکەسێك

---

١) بڕوانە: (سیـرة ابن هشام)، ج١، ص (٩٦-٩٧)، وە: (البدایة والنهایة)، ج٢، ص ٣٧٧.

٢) بڕوانە: (سیـرة ابن هشام)، ج١، ص ٩٨، وە: (البدایة والنهایة)، ج٢، ص (٣٧٧-٣٧٨).

یەکەم کەس لە دەرگاوە بێتە ژوور با دادوەریمان بکات بەو شێوەیە چاوەڕێ دەکەنو (محمد) ﷺ یەکەم کەس دێتە ژوورێ، هەموویان هاوار دەکەنو دەڵێن: (هذا الأمين رضينا هذا محمد)، واتە: ئەمە ئەمینە ڕازین، ئەمە موحەممەدە! ئەویش کە پێش پێغەمبەرایەتیشی بە (أمين)و ڕاستگۆو چاکەکار ناوی دەرکردبوو، دادوەرییان دەکاتو عەباکەی ڕادەخاتو دەفەرموێ: بەردە ڕەشەکەی لەسەر دابنێنو پێیان دەفەرموێ: هەر سەرۆك هۆزە با بەشێکی عەباکە بگرن، ئیدی بەردەکە بەرز دەکەنەوە تا دەگاتە ئاستی جێگەکەی خۆی، پاشان بەدەستی موبارەکی بەردەکە دەخاتە جێگاکەی خۆی، بەو شێوەیە بە لێزانییو بە حیکمەتی خۆی ئەو کێشەیە کۆتایی پێ دێنێ[1].

## یازدەیەم:

پێغەمبەری خوا ﷺ پێش پێغەمبەرایەتی چ سیفەتێکی بەرزو جوان هەیە، کە یەکی لەسەر وەحی نەکەوتوەو عەقڵی سەلیمو فیطرەتو سروشتی ساغ داخوازی دەکات، تێیدابووە، لە ڕاستگۆییو پاکیی (أمانة)و بەخشەری (سخاوة)و ئازایەتیو دادگەریو بەزەیییو...هتد، هەر بۆیەش بە (الأمين) ناوبانگی دەرکردوە، وەك بۆخۆی دەفەرموێ: **{ما هممت بقبيحٍ مما كان أهل الجاهلية يهمون به إلاّ مرتين من الدهر كلتيهما يعصمني الله منهما... فوالله ما هممت بعدها بسوءٍ مما يعمل أهل الجاهلية حتى أكرمني الله بنبوتهِ}** [2]، واتە: لە ژیانمدا بە دڵیشمدا نەهاتوە، کە شتی خراپ بکەم، کە خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیانکرد، دووجاران نەبێ ئەویش هەرکام لەو جارانە خوای پەروەردگار دەیپاراستم، لە درێژەی

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص١٠١، ط١ دار ابن الهيثم.

٢) رواه إبن ماجة والحاكم وأبو نعيم في (دلائل النبوّة)، وقال الحاكم: صحيح على شرط مسلم .

فەرموودەکەیدا دەفەرموێ: شەوێك مەڕم دەلەوەڕاند لە پشتی مەککە بە شوانێکی هاوەڵم گوت ئاگات لە مەڕەکانم بێ دەچم با بزانم گەنجان چ دەکەن، چونکە دەنگی دەف‌و تەپڵ‌و شمشاڵ دەهات، کە چووم دوورو نزیك بوومەوە گوتم ئەوە چیە؟

گوتیان: ئەوە فلاَن ئافرەتەیە شووی کردوە بە فلاَن پیاو.

دەفەرموێ: گوێم هەڵخست بۆ ئەو دەف‌و شمشاڵە تا خەوم لێکەوت، کە بە گەرمای ڕۆژ بەخەبەر هاتمەوە، دەفەرموێ: شەوێکی دیکەش دیسان چوومەوە هەروەك جاری پێشوو بوو تا خوای پەروەردگار وای لێکردم جارێکی دی بە فیکرو خەیاڵیشمدا نەیەت، پێغەمبەری ئێمە ئاوا خاوەنی بەرزترین ڕەوشت‌و پاکترین فیطرەت بووە، وە خاوەنی گەورەترین‌و سەلیم ترین عەقڵ بووە، بۆیە بەرلەوەش، کە وەحی بۆ بێ لە هەموو شتێکی خراپ‌و ناشیرین بەدوور بووە.

لە تۆڕە کۆمەلایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# زەمینـەسـازییەکانی پێـش دابەزینـی وەحـی بۆ پێغەمبـەری خـوا ( محمـد ) ﷺ

خـوای پـەروەردگار سـوننەتی وایـە، ئەگـەر بیـەوێ هـەر کارێـك بکـات کۆمـەڵێك پێشەکی بۆ ڕێز دەکات دوایی ئەو کارە وەك ئەنجامێك بەدوای ئەو پێشـەکیو زەمینـە سازییانەدا دێ، وەك گوتراوە: (إذا أراد الله أمراً هيأ لـه أسبابه)، جـا ئێمـە دەتـوانین ئەو زەمینە سازییانە لە سێ خاڵاندا کۆ بکەینەوە:

## یەکـەم: سەرگـەردانیـی و گومڕاییـەکی گشـتی و هەمەلایەنـە لە نێو مرۆڤـایەتیدا:

هەموو مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك دەنگن مسوڵمانو نامسـوڵمانیش، کـە پـێش هاتنی پێغەمبەرمان (محمـد) ﷺ لـە هـەموو ڕووەکانـەوە بەشـەریەت لـە قۆنـاغێکی یـەکجار تاریـكو تەڵەمـدا ژیـانی بەسـەردەبرد، لــە ڕووی فیکریـیو ئـەخلاقیو کۆمەلایەتیو سیاسیو فەرهەنگیو...هتدەوە، لـە تـاریکترین قۆنـاغی ژیـانی خۆیـدا بووە، وەك خـوای پـەروەردگار لـەوبارەوە دەفـەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة، ئەو (إنْ)ە بۆ تەئکیـدە، بـە بەڵگـەی ئـەوە، کـە دوایی (لام) هەیـە لەسـەر (فـي) یەکـە: ﴿وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾، واتـە: خـوا ئـەو کەسـەیە کـە لـەنێو نەشـارەزایاندا پێغەمبـەرێکی لـەخۆیان بـۆ نـاردن،

www.alibapir.com


ئایەتەكانییان بەسەردا دەخوێنێتەوەو تەزكەیەیان دەكاتو كتێبو حیكمەتیان فێر دەكات، وە بە تەئكید ئەوانە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بێ بۆ نێویان، لە گومڕاییەكی زۆر ئاشكرادا بوون.

ئنجا وەك پێشتریش باسمان كرد وشەی ﴿ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ﴾ كە كۆی وشەی ﴿أُمّيّ﴾یە مانای ئەوە نیە كە ناتوانێ بنووسێو بخوێنێتەوە، وەك هەندێ لە زانایان گوتوویانە، بەڵكو ﴿أُمِّيِّنَ﴾ ئەوانەن كە شارەزای وەحی خوا نەبوون، چونكە هەموو ئەو گەل نەتەوانە دەگرێتەوە كە ئەهلی كیتاب نەبوونە، كەواتە مانای ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ﴾ ئاوایە: (خوا پێغەمبەرێكی نارد لەنێو ئەوانەدا كە شارەزای كتێبەكانی خوا نەبوون)، واتە (محمد) لە نێو ئەهلی كیتابدا نەهات، كە ئەوكاتە ئەهلی كیتاب تەنها جوولەكەو نەصرانیەكانی دەگرتەوە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، ئەوەیە كە خوای پەروەردگار لە ئایەتی دوای ئەوەدا دەفەرموێ: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ كەسانێكی دیكەش لەو ﴿أُمِّيِّنَ﴾نانە كە جارێ پێیان نەگەیشتوون، جا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كراوە كە ئەوانە كێن؟!

ئەویش لەوكاتەدا سەلمانی فارسیی لە تەنیشت بوو، دەستی لەسەر سەلمان دانا[1]، واتە: ئەمەو گەلەكەی، یانی گەلی عارەب ئیمانیان پێهێناوە، دوایش میللەتەكانی دیكەی غەیری عارەب.

یەكێكی دیكە لەو فەرمایشتانەی كە دەریدەخات بەشەریەت ئەوكاتە زۆر لەسەر گەردانییو گومڕایی دابووە، ئەم فەرمودەیەیە:

---

١) وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، بڕوانە: سورة الجمعة: باب قوله: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ ... ۝٣﴾: ٤٨٩٧

www.alibapir.com


**{عن عياض بن حمار المجاشعي أن رسول الله ﷺ قال ذات يومٍ في خطبته: ألا إن ربي أمرني ان أعلمكم ما جهلتم مما علمني يومي هذا: كُلُّ مالٍ نَحَلْتُهُ عبداً حلالٌ واني خلقت عبادي حنفاء كلهم، وإنهم اتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم، وحرمت عليهم ما أحللت لهم، أمرتهم ان يشركوا بي ما لم أنزل به سلطاناً، وان الله نظر إلى أهل الأرض فمقتهم عربهم وعجمهم إلا بقايا من أهل الكتاب}**[1] رواه مسلم.

ئەو هاوەڵە بۆمان دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ وتاری داوەو فەرموویەتی: ئاگادار بن پەروەردگارم فەرمانی پێ کردووم، کە فێرتان بکەم ئەوەی کە نایزانن لەوەی کە ئەمڕۆ منی پێ شارەزا کردوە: هەرماڵو سامانێك، کە بە بەندەیەکی خۆمم بەخشیوە بۆی ڕەوایە، وە من بەندەکانی خۆمم پاك خوڵقاندبوون (هەموویانم وا خوڵقاندبوون، کە بەندەی ڕاستو چاك بن بۆ من)، بەڵام دوایی شەیتانەکان هاتنە لایان لەو دینە ڕاستەی، کە لەگەڵ سروشتیاندا دەگونجێ لایاندان، وە ئەوەی، کە من بۆم حەلاڵ کردبوون ئەو شتانەیان لێ قەدەغە کردن، وە شەیتانەکان فەرمانیان پێکردن، کە شتێك بکەن بە هاوبەشی من، کە هیچ بەڵگەیەکم لەسەر نەناردۆتە خوار، جا خوا تەماشای ئەهلی سەر زەوی کردو ڕقی لە هەموویان هەڵسا بە عارەبو عەجەمەوە، جگە لە کەسانێکی کەم لە ئەهلی کیتاب، کە لەسەر ڕێی ڕاست مابوونەوە.

ئەم فەرموودەیە قسە لەو کاتە دەکات، کە پێش ئەوەی (محمد المصطفی) بێت، بەشەرییەت لە حاڵەتێکدا بوون کە خوای پەروەردگار هەموویانی بوغزاندوە جگە لە کەمێك لە ئەهلی کیتاب کە لەسەر بەرنامەی پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- مابوونەوە. (أبو الحسن الندوي) بەدرێژی باسی دەکات، کە هەرکام لە ئیمپراتۆریەتی (ڕۆمانییو فارسییو هیندەکان) چۆن بوونو لە چ وەزعێکی

---

١) (صحيح مسلم): ٧١٣٦.

بێسەروبەر دابوون لەڕووی کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیو سیاسیو...هتدەوە، پاشان باسی گۆڕانو تەحریفکرانی هەریەك لە دینەکانی (یەهودییەتو نەصرانییەتو بووذییەتو بەرهەمیی...) دەکات کە وا پێدەچێ (زەردەشتیو بووذییەتو بەرهەمایەتی) ئەسڵێکی ئاسمانیان هەبووبێ، بەڵام لەدواییدا لەگەڵ یەهودییەتو نەصرانییەتیشدا سەریان لە بتپەرستییو شەخص پەرستییەوە دەرچووە، ئەوە دەربارەی مرۆڤایەتی بەگشتی، وە دەربارەی عارەبیش ئەوانیش لە گومڕاییەکی سەرسوڕهێنەری گەورەدا بوون، ئاماژە بە هەندێك لایەنی ئەو گومڕاییە دەکەین:

## ١/ لە ڕووی بیروباوەڕەوە:

(عن أبي رجاء العطاردي ﷺ قال: كنا نعبد الحجر فإذا وجدنا حجراً هو أخير منه ألقيناه وأخذنا الآخر، فإذا لم نجد حجراً جمعنا جثوةً من تراب ثم جئنا بالشاة فحلبناه عليه ثم طفنا به...!!)[(١)] رواه البخاري، واتە: (ئەبوو ڕەجاء) دەڵێ: ئێمە بەردمان دەپەرست، ئەگەر بەردێکی جوانترمان لەوەی کە هەڵمان گرتبوو دەست کەوتبایە ئەومان فڕێ دەداو ئەوی دیکەمان هەڵدەگرت، -هەر بەردێك مەرج نیە، کە لەسەر شێوەی گیاندار بووبێ، بەردێکی ئاساییان لەگەڵ خۆیان گێڕاوەو پەرستوویانە- ئەگەر بەردیشمان دەست نەکەوتبایە هەندێك گڵمان کۆدەکردەوەو مەڕێکمان لەسەر دەدۆشیو شیرمان لەگەڵ تێکەڵ دەکردو تۆپەڵە قوڕێکمان لێ دروست دەکرد، دوایی بە دەوریدا دەسووڕاینەوەو دەمانپەرست.

یەکێکی دیکە لە هاوەڵان دەڵێ: ئێمە لە سەفەرێ بتمان لە خورما دروست دەکرد ئەگەر هیچمان دەست نەکەوتبایەو برسیشمان بووایە دەمانخوارد!!

## ٢/ لە ڕووی سیاسییەوە:

---

١) (صحيح البخاري): ٤٣٧٦.

www.alibapir.com

عەرەب زۆر پەرتەوازەو تیرە تیرە بوون وە لەنێو خۆدا زۆر ناكۆك بوون، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ ... ١٠٣﴾ آل عمران، واتە: وە یادی نیعمەتی خوا بكەن بەسەرتانەوە كاتێك كە پێكەوە دوژمن بوون، خوا دڵی پێكەوە گرێدان، وە بەهۆی نیعمەتی خواوە بەیەكەوە بوونە برا، وە لەسەر قەراغی چاڵە ئاگر بوون خوا ئێوەی رِزگار كرد.

لە سەرچاوەكانی سیرەو مێژوودا هاتوە كە یەكێك لەو جەنگانەی كە لە نێوان خێڵە عارەبەكاندا بەرپا بووە بە جەنگی (بسوس) ناوی دەركردوەو (بسوس) كچی یەكێك لە دەسەڵاتدارو سەرۆك هۆزەكان بووەو حوشتری دراوسێیەكی (بسوس) دەچێتە نێو قەدەغەی كابرایەكی دیكەوە كابراش تیرێك لە حوشترەكە دەگرێ‌و چاوێكی كوێر دەكات، كچە سەرۆك خێڵ هاوار دەكات‌و عەشیرەتەكەی دێن‌و كابرای تیرهاوێژ دەكوژن، لەسەر ئەوە جەنگێك بەرپا دەبێ (٤٠) ساڵ درێژە دەكێشێ كە لەو ماوەیەدا كوشتارێكی زۆر لە هەردوولا دەكرێ هەتا پێغەمبەر ﷺ دێ‌و كۆتایی بەو شەرِانە دێنێ، كە لەسەر شتی گچكەو بێ‌مانا دروست بوون.

## ٣/ لە رِووی ئابوورییەوە:

ئەگەر تەماشا بكەین قرِیی‌و پرِییەكی زۆر لەنێویاندا هەبووە، بۆ نموونە! لە شاری مەككە كەسانی وەك (أبو جهل)و (ولید بن المغیرة)و (عتبة و شیبة بني ربیعة)و چەند كەسێكی دیكەی هاوڕێنەیان كەمینەیەكی یەكجار ساماندارو دەوڵەمەندو خۆشگوزەران بوون‌و، زۆربەی هەرەزۆری خەڵك‌و جەماوەرەكەی دیكەی شارەكە هەژارو كەمدەست‌و بێ‌دەرامەت بوون .

## ٤/ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

دەمارگیریی‌و تیرەگەرییەکی بێسنوور هەبووەو، ئافرەتیان زۆر بە سووکی تەماشا کردوەو هێندێك تیرەیان هەبووە کچیان زیندەبەچاڵ کردوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ۝٨ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ۝٩﴾ التکویر، واتە: کاتێك کچی زیندەبەچاڵ کراو لێی پرسرا، بەچ تاوانێکەوە کوژراوە؟! وە لەڕووی ئەخلاقییەوە بەگشتی داڕووخانێکی زۆر هەبووە.

کەواتە بەشەرییەت لە حاڵەتێکدا بووە کە گەیشتۆتە گیانەڵاو سەرەمەرگ‌و پێویستی بە فریاد ڕەسێك بووە کە بۆی بێ‌و رزگاری بکات، بۆیە خوای بەبەزەیی بە (محمد) ﷺ دا بەرنامەیەکی بۆ ناردوە وەك هەموو پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- کە مایەی ڕەحمەت‌و بەختەوەریی بووە، ئایین‌و بەرنامەیەکی گشتگیرو هەمەلایەنەی وا کە لە هەموو ڕوویەکەوە: فیکریی، عەقیدەیی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، ئەخلاقیی‌و خێزانیی... پاکسازیی‌و چاکسازیی بکات.

## دووەم: چاوەڕوانیی خەڵکی بەگشتی کە پێغەمبەری کۆتایی بێ:

### ١) چاوەڕوانیکردنی هاتنی موحەممەد ﷺ:

پێش ئەوەی (محمد) ﷺ بێت مرۆڤایەتی بەگشتی چاوەڕێ بوون، کە پێغەمبەری کۆتایی بێت، ئەو چاوەڕوانییەش لە کۆمەڵە شتێکەوە دروست بووە، کە بۆ زانینیان پێویستە مێژووی ئەوکاتە بێنینە پێش چاوی خۆمان، لەسەرەتاوە خوای پەروەردگار بە هەموو پێغەمبەرانی فەرمووە، کە دەبێ بە قەومی خۆیان بڵێن، کە پێغەمبەری کۆتایی دێت، خۆ خوای پەروەردگار زانیویەتی کاتێك (محمد) دێت کە ئەو پێغەمبەرانە هیچیان نامێنن -علیهم الصلاة والسلام- بەڵام بۆ ئەوەی بووە کە ئەو پێغەمبەرانە بە قەومەکانی خۆیان بڵێن، وە ببێتە شتێکی باو، کە پێغەمبەرێك دێ خاتەم‌و کۆتایی پێغەمبەرانەو لەسەر هەموو بەشەرییەت پێویستە کە شوێن ئەو

پێغەمبەرە بکەوێو ئیمانی پێ بێنێ، چونکە پێغەمبەرانی دیکە -علیهم الصلاة والسلام-بۆ میللەتێکی دیاریکراوو بۆ قۆناغێکی دیاریکراو هاتوون، کە لەسەر هەموو میللەتانی دیکە پێویست نەبووە بەدوای ئەو پێغەمبەرە بکەون، بۆیە کە سەرنج دەدەین (مووساو عیسا) (علیهما السلام) بە تەنها هەر باسی (بني إسرائیل) دەکەن، کە عیسی ﷺ دەفەرموێ: ﴿... يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم ...﴾ (٦) الصف، واتە: ئەی وەچەی ئیسرائیل من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لاتان، بەڵام (محمد) ﷺ باسی هەموو خەڵك دەکات، وەك خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ...﴾ (١٥٨) الأعراف، واتە: بڵێ ئەی خەڵکینە! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ تێکڕاتان، دیارە ئەوەش ئەو ڕاستییە دەردەخات، کە لە ئایەتی (٨١)ی سوورەتی (آل عمران)دایە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾، واتە: وە یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە خوا پەیمانی لە پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- وەرگرت پێی فەرموون: چونکە من کتێبو حیکمەتم بەئێوە داوە، هەرکاتێك پێغەمبەرێك هات کە بەرنامەکانی ئێوە بەڕاست دەزانێ، دەبێ ئیمانی پێ بێننو پشتی بگرن، فەرمووی: ئایا دانتان بەوەدا هێناو پەیمانتان لەسەری لێم وەرگرت؟ گوتیان: بەڵێ دانمان پێداهێنا، فەرمووی شاهید بن منیش لەگەڵ ئێوە لە شاهیدانم، (مەبەست ئەوەیە شاهید بن بەسەر میللەتەکانی خۆتانەوەو هەموو میللەتەکانی ئێوە لەسەریان پێویستە، کە ئیمانی پێ بێنن، چونکە دوایین پێغەمبەری خوایەو دوا پەیامی خوا بۆ بەشەرییەت دێنێ).

## ٢) دووعای ئیبراهیم ﷺ :

شتێکی ئاشکرایە، کە ئیبراهیم (علیه السلام) پێغەمبەرێکە هەموو میللەتان مسوڵمانو جوولەکەو نەصرانییو...هتد ڕێزیان بۆی هەیەو بە پێغەمبەری خوای دەزانن، جا ئیبراهیم کاتی خۆی ئەم دووعایەی کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٢٩ ﴾ البقرة، واتە: پەروەردگارمان! وە پێغەمبەرێکیان لەخۆیان لەنێودا ڕەوانە بکە، ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو کتێبو حیکمەتیان فێربکاو تەزکیەیان بکات، بێگومان تۆ باڵادەستو کاربەجێی.

ئەم دووعایەی ئیبراهیم (علیه السلام) لە نێو عارەباندا بە تایبەت وە لەنێو میللەتانی دیکەدا بەگشتی باوبووەو هەموو زانیویانە، کە ئیبراهیم دووعای کردوەو لە وەچەی ئەو پێغەمبەرێك دێت، بۆیە چاوەڕوانی ئەو پێغەمبەرە بوون، کە (محمد) ﷺ بوو.

## ٣) مژدەدانی کتێبەکانی پێشوو بە هاتنی (محمد) ﷺ :

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ ... ١٥٧ ﴾ الأعراف، واتە: ئەوانەی شوێنی ئەو ڕەوانەکراوە پێغەمبەرە دەکەون، کە نەشارەزایە (لە کتێبەکانی خواو لە خاوەن کتێبان نیە) غەیری ئەهلی کتابە کە ناوەکەیو نیشانەکانی بە نووسراو لای خۆیان دەبینن لە تەوراتو ئینجیلدا...).

من کە تەماشای پەیمانی کۆن (العهد القدیم)م کردوە، کە تەورات بەشێکیەتی ئێستاش لە چەند شوێنێکیدا ئەو پێناسەو باسانەی تێدان، کە جگە لە (محمد) ﷺ بەسەر هیچ پێغەمبەرێکی دیکەدا ناچەسپن، وە (عبدالله بن عَمرو بن العاص) لەوبارەوە دەڵێ: (والله إنه لموصوف في التوراة ببعض صفته في القرآن ﴿ يَٰٓأَيُّهَا

www.alibapir.com

ﭐلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ الأحزاب، وحرزاً للأميين أنت عبدي ورسولي سميتك المتوكل ليس بفظ ولا غليظ ولا سخابٍ في الأسواق ولا يدفع بالسيئة الحسنة، ولكن يعفو ويغفر ولن يقبضه الله حتى يقيم به الملة العوجاء بأن يقولوا: لا إله إلاّ الله ويفتح بها أعيناً عمياً وآذان صماً وقلوباً غلفاً)، رواه البخاري[1].

(عبدالله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاس –خوا لێیان ڕازی بێ- ئەم دەقە لە تەورات دەردەهێنێ، کە دیارە ئەو تەوراتەی لە سەردەمی پێغەمبەردا هەبووە ئەمەی تێدا بووە، بەڵام دوایی گۆڕیویانە، دەقەکە مانای ئاوایە، دەڵێ: ((ئەی پێغەمبەر ئێمە تۆمان ناردوە کە چاودێر بی، وە موژدەدەرو ترسێنەر بی، وە پەنا بی بۆ ئەو میللەتانەی کە ئەهلی کیتاب نین، تۆ بەندەی منو ڕەوانەکراوی منی ناوم لەتۆ ناوە پشت بە خوا بەستوو، ئەتۆ قسە ڕەقو دڵ ڕەق نی، لە بازاڕ دەنگ هەڵناهێنی، وە خراپە بە خراپە پاڵ پێوە نانێیو چاوپۆشییو لێبوردنت دەبێ، وە خوا ڕووحی ناکێشێ هەتاکو خەڵکی خوارو لاری پێ ڕاست نەکاتەوە کە بڵێن: (لا إله إلا الله) وە ئەو چاوانەی کە کوێرنو ئەو گوێیانەی کە ئاخنراونو ئەو دڵانەی کە بەستراون، هەموویانی پێ دەکاتەوە)).

هەروەها لە (زەبوور)یشدا باسی پێغەمبەر ﷺ کراوە (ابن تيمية) -ڕەحمەتی خوای لێبێ- لە کتێبی (الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح)دا دەڵێ: من لە هەندێك لە نوسخەکانی زەبووردا خوێندوومەتەوە، کە بە ڕاشکاویی گوتراوە: (محمد) پێغەمبەری خوایە، دوایی هەندێك نوسخەی زەبوورم بینیون کە ئەوەیان تێدا نەبووە، بۆیە دەڵێ دوور نیە، کە هەموو کتێبە ئاسمانییەکان ناوی پێغەمبەریان تێدا بووبێ، بەڵام لەدواییدا گۆڕڕابن.

---

١) (صحيح البخاري): ٢١٢٥ و ٤٨٣٨.

هەروەها لە (ئینجیل)یشدا هاتوە، وە تاکە (ئینجیل)ێك، کە بگونجێ زیاتر بەڕاستی دابنێین (ئینجیل)ی (بەڕنابا)یە، لەو ئینجیلەدا لە{(إصحاح)ی (٤١)دا، کە (إصحاح) وەك سوورەت وایە} ئەم دەقە هاتوە: (خوای پەروەردگار خۆی لە ئادەمو حەوا پەنهان کرد، وە فریشتە میکائیل لە بەهەشت دەری کردن، ئادەم ئاوڕی دایەوە تەماشای کرد لەسەر دەرگای بەهەشت نوسرابوو: ((لا إله إلا الله (محمد) رسول الله))[1].

ئینجیلی بەڕنابا لە کۆتایی سەدەی پێنجدا نەصرانییەکان شاردیانەوە، بەڵام زانایانی شوێنەوارناس، دەڵێن: لەو حەفریاتو شوێنەوارانەی (البحر الميت)دا نوسخەی ڕاستی ئینجیلی بەڕنابا دۆزراوەتەوە، دوایی هەندێك لە زانایانی مسوڵمان ئەو ئینجیلەیان چاپ کردوە، بەڵام نەصرانییەکان زۆر دژایەتی دەکەن چونکە بەڕاشکاویی ناوی پێغەمبەر ﷺی تێدایە، وە تێیدا حەزرەتی (عیسى) فەرموویەتی: لەدوای من پێغەمبەرێك دێ ناوی (أحمد)ەو لە فلان شوێن دێتو دەبێ هەمووتان بڕوای پێ بێنن.

ئنجا جگە لەوەش زانایانی خاوەن کتێب هەموویان چاوەڕێی هاتنی (محمد) ﷺ بوون هەر بۆیە پیاوێکی وەك (عبدالله بن سلام) وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە[2]، دوای ئەوەی تەماشای پێغەمبەر دەکاو لێی ورد دەبێتەوە ئیمانی پێ دەهێنێ، دوایی دەچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو پێی دەڵێ: ئەتۆ پێغەمبەری خوای وە من گەورەترین زانای یەهوودم لە مەدینەدا، بەڵام جوولەکە قەومێکی بوختانکەرن، کە بزانن من ئیمانم بەتۆ هێناوە بوختانم پێ دەکەن، بۆیە بانگیان بکەو لەبارەی من لێیان بپرسە، بزانە چۆنم باس دەکەن! ئیدی عەبدوڵلا دەچێتە ژوورێکەوەو پێغەمبەر

---

١) بڕوانە: (إنجيل برنابا) الإصحاح: ٤١، الآية: ٢٩، ص (٦٣).
٢) صحيح البخاري: ٣٩٣٨.

ﷺ لە دوای زانایانی ئەهلی کیتاب دەنێرێ، وە لێیـان دەپرسێ: (عبدالله بن سلام) چ پیاوێکە لەنێو ئێوەدا؟!

لە وەڵامدا دەڵێن: گەورەترین عالممانەو کوڕی گەورەترین عالمیشمانە، چاکترین پیاومانەو کوڕی چاکترین پیاویشمانە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر ئیمان بێنێ ئێوە هەڵوێستتان چی دەبێ؟

دەڵێن: خوا لەوە بیپارێزێ، کە ئیمان بێنێ قەت شتی وا ناکات.

دەفەرموێ: (عبدالله) وەرە دەرێ (عبدالله) دێتە دەرێو دەڵێ (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أنك رسول الله)، دەفەرموێ: دەی ئەوە (عبدالله) ئیمانی هێنا، کە زاناترینو چاکترین پیاوتانە دەی ئێوەش ئیمان بێنن.

لە وەڵامدا دەڵێن: وەڵڵاهی لەوە نەزانترمان تێدا نەبووەو باوکیشی لە هەموو کەس نەزانتر بوو..!!

وە سەلمانی فارسیی وەك لە گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی درێژی خۆیدا باس دەکات کە چووە بۆ لای ئەوانەی کە خوایان ناسیوەو دەڵێ: ڕاهیبی (عمودیة) پێی گوتم: زەمانی هاتنی پێغەمبەری کۆتایی نزیکبۆتەوە، کە بەدینی ئیبراهیم دەنێردرێو لە ئەرزی عارەبەوە دێ، وە ئەو شوێنەش، کە کۆچی بۆ دەکات، دەکەوێتە نێوان دوو شاخەوە، کە دارخورمای لێن، وە ئەو پێغەمبەرە کۆمەڵێك نیشانەی هەن، کە لە کەس شاردراوە نین، ئەو ڕاهیبە لە سەرەمەرگدا وەسیەتی بۆ دەکات، دەڵێ: من دەمرم، بەڵام تۆ دەتوانی بڕۆی بۆ لای ئەو پیاوەو نیشانەکانیشی ئەمانەن: مۆری پێغەمبەرایەتی لەنێوان هەردوو شانیەتیو دیاریی (هدية) دەخوات، بەڵام خێر (صدقة) ناخوات، سەلمان دەڵێ: کە چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا خواردنێکم بۆ برد.

فەرمووی: ئەوە چیە؟

گوتـم: ئەوە (صـدقة)یە.

فەرمووی: ناخـۆم.

وە جارێکی دیکە شتێکی دیکەم بۆ برد، فەرمووی: ئەدی ئەوە چیـە؟

گوتـم: دیاریی (هديـة)یە.

وەریگرتو دەستی کرد بە خواردنی، دیارە خوای پـەروەردگار ویسـتی وا بـووە، کـە هیدایـەتی سـەلمان بـدات، سەلـمان دەڵـێ ئنجـا داوام لێکـرد کـە تەماشـای شـانی موبارەکی بکەم کە سەرنجمدا مۆرەکەم بینی، وە ئەخلاقو ئەوصافی دیکەشم تەماشا کرد، زانیم کە پێغەمبەری خوایە(١).

یان (هرقل)، کە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ چەند شـتێك لـە (أبـو سـفيان) دەپرسـێ، ئەویش وەلامی پرسیارەکانی دەداتەوە، دوایی (هرقل) دەڵێ: ئەگەر ڕاست بکەی، ئـەو کەسە پێغەمبەری کۆتاییـیە، کـە هـەموو بەشـەرییەت چاوەڕێی دەکـات، هـەروەها کاتێك نامەی پێغەمبەری پێ دەگات دەڵێ: من دەمزانی پێغەمبەرێك دێت کـە نـاوی (محمد)ە، بەس نەمزانی لەنێو عارەباندا دێت(٢).

ئنجا جوولەکەکانی مـەدینـە زۆر چـاوەڕێ بـوون کـە پێغەمبـەری کۆتـایی بـێ، بـە بەڵگەی ئەوە کە هەڕەشەیان دەکرد لە (أوس)و (خـزرج)و دەیـانگوت: زەمـانی هـاتنی پێغەمبەری کۆتایی نزیك بۆتەوەو ئەگـەر هـات ئێمـە ئیمـانی پێـدەهێنینو لەگەڵتانـدا شەڕ دەکەین، وەك چۆن قەومی (عـاد)و (إرم) لەنێوچوون، ئاوا لەنێوتان دەبەین، دیـارە لەکاتێکدا ئەوەیان دەگوت کە زوڵمیان لێـدەکرا لەلایـەن (أوس)و (خـزرج)ەوە، چـونکە جوولەکەکان بێدەستەڵات بوون.

---

١) بڕوانە: (السيـرة النبوية لأبـن هشـام)، ج١، ص(١٠٩-١١٤)، ط١، دار ابـن الهيـثم، کـە بەسـەرهاتی سەلـمانی بەدرێژیی هێناوە.

٢) (صحيح البخـاري): ٤٥٨٣.

www.alibapir.com


یەكێك لەو هۆیانەی كە پاڵی بە خەڵكی مەدینەوەنا ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بێنن ئەوەبوو، هەر بۆیەش لە یەكەم دیداریان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ یەكێكیان گوتی: ئاگادار بن خەڵكینە! سوێند بەخوا ئەوە ئەو پێغەمبەرە كۆتاییەیە كە جوولەكە هەموو جارێ هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەكەن، با زوو ئیمانی پێ بهێنین، چونكە هەموو نیشانەكانی دیارن(١).

بەڵێ ئاوا بەم شێوەیە مرۆڤایەتی هەمووی چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەری كۆتاییان ﷺ كردو پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- و زانایانی شارەزا لە كتێبە ئاسمانییەكاندا، زانیویانەو هەواڵیان پێداوە.

## سێیەم: ئامادەكردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ وەرگرتنی وەحی:

ئەو ئامادەكردنەی پێغەمبەریش ﷺ لە چەند شتێكدا دەدرەوشێتەوە، كە بریتین لە:

١/ كاتێك پرسیاری لێكراوە (ما كان أول بدء أمرك)؟ واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتای دەستپێكردنی پێغەمبەرایەتی تۆ چۆن بووە؟ پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە وەڵام داوەتەوە: **{دعوة أبي إبراهيم، وبشرى عيسى، ورأت أُمي أنه يخرج منها نور أضاءت قصور الشام(٢)}** رواه أحمد، واتە: سەرەتای پێغەمبەرایەتی من سێ شت بووە: (دوعای ئیبراهیمی بابم، وە مژدە پێدانی عیسا، وە دایكم كاتێك، كە منی بووە ڕۆشنایی یەكی لێ دەرچووە كۆشكەكانی شامی ڕۆشن كردۆتەوە.

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص٢٢١، ط١ دار ابن الهيثم.

٢) مسند إمام أحمد: ٢٢٢٦١، وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

٢/ پێغەمبەر ﷺ لە پەرستنی غەیری خواو لە هەر کردەوەو ڕەوشتێکی ناڕێکو ناڕەوا خۆی پاراستوە، سەبارەت بەوە کە پێغەمبەر ﷺ (بت)و هیچ شتێکی دیکەی نەپەرستوە، ئەو فەرموودەیە کە (إمام أحمد) بە سەنەدێکی (صحیح) هێناویەتی، بەڵگەیە لەوبارەوە: **{عن عروة بن الزبير عن أبيه، قال: حدثني جارٌ لخديجة أنه سَمِعَ النبيّ وهو يقول لخديجة: أي خديجة! والله لا أعبد اللات ولا أعبد العزى أبداً[1]}**، واتە: (عروة)ی کوڕی زوبەیر لە بابی دەگێڕێتەوە، کە زوبەیر گوتوویەتی: دراوسێیەکی خەدیجە بۆی گێڕامەوە، کە لە پێغەمبەر ﷺی بیستوە، کە بە خەدیجەی فەرمووە: ئەی خەدیجە سوێند بە خوا, (لات) ناپەرستم، سوێند بە خوا, (عوززا) ناپەرستم.

لەوبارەشەوە، کە ئەخلاقو ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ پێش پێغەمبەرایەتی زۆر بەرزبووەو هەرچی لەسەردەمی نەفامییدا باو بووەو خەڵك کردوویەتی لە خراپەو شتی ناپەسند, ئەو پێیەوە گرفتار نەبووە، بەڵگەمان ئەو فەرموودەیە کە عەلی گێڕاویەتەوە: **{عن علي ﷺ: سمعت رسول الله ﷺ يقول ما هممت بقبيحٍ مما كان أهل الجاهليةِ يهمون به الاّ مرتين من الدهر كلتيهما يعصمني الله منهما... فوالله ما هممت بعدهما بسوءٍ مما يعمل أهل الجاهلية حتى أكرمني الله بنبوته))**، اخرجه (محمد) بن اسحق في السيرة، والبخاري في التاريخ الكبير، والبزار في مسنده، وابن ماجه في صحيحه، والحاكم وابو نعيم في (دلائل النبوة)، وقال الحاكم حديث صحيح على شرط مسلم، واتە: عەلی دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەو شتە خراپانە، کە خەڵکی ڕۆژگاری جاهیلی دەیانکرد, نەك هەر نەمکردوە، بەڵکو هەر بەدڵیشمدا نەهاتوە کە بیکەم، دووجار نەبێ، وەك هەر گەنجێك, ئەو دوو جارەش خوای پەروەردگار پاراستمیو دوای ئەوەش قەت بیرم لێ نەکردۆتەوە.

---

١) مسند امام أحمد: ١٧٩٤٧، وإسناده صحيح.

چونکە پێغەمبەر ﷺ ئینسان بووە، بەڵام ئینسانێکی فیطرەت چاکو پاك بووە، وەك یەكێك لە شاعیرەکان دەڵێ:

**(محمد) بشرٌ وليس كالبشر          بل هو ياقوتةٌ والناس كالحجر**

بێگومان پارێزرانی (محمد) لەلایەن خواوە بەو شێوەیە زەمینە سازییەك بووە بۆی لەلایەن خواوە بۆ پێ سپاردنی ئەرکی پێغەمبەرایەتی، هەر ئەوەش لە حیکمەتو ڕەحمەتی خوا چاوەڕی دەکرێ، چونکە پێغەمبەرێك کە خوا بیەوێ بیکات بەکۆتایی هەموو پێغەمبەرانو بیکاتە هەڵگری پەیامی خۆی بۆ هەموو مرۆڤایەتی، دەبێ پێش پێغەمبەرایەتیشی هەر پاكو چاك بووبێ، بەڵێ پێش پێغەمبەرایەتی لە جۆرە بێئاگاییو سەرلێشێواوییەکی فیکرییو عەقیدەیی دابووە، چونکە وەحیو دینی خوای لەبەردەستدا نەبووە، کە خەڵکی پێ هیدایەت بدات، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الضحى، جا دیارە ئەو (ضلال)ە (ضلال)ی فیکریی بووە، ئەگەرنا لە ڕووی پاکییو چاکییەوە، بەپێی ئەو فیطرەتە پاكو چاکەی کە خوا پێی بەخشیوە ڕەفتاری کردوە، بۆیە توخنی هیچ شتێکی خراپو ناشیرین نەکەوتوەو غەیری خوای نەپەرستوە.

٣/ وە بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ جۆرێك لە زەمینەسازیی نەفسی بۆ بکرێ سڵاولێکرانی بوو لەلایەن بەردێکەوە، وەك بۆخۆی دەفەرموێ: **{عن جابر بن سمرة قال: قال رسول الله ﷺ إني لأعرف حجراً بمكة كان يُسَلِّمُ عليّ قبل أن أُبْعَث إِني لأعرفه الآن}**[1] رواه مسلم، واتە: (جابر) -خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی بەردێك هەیە لە مەککە، کە هەموو جارێ سەلامی لێدەکردم، ئێستاش دەیناسم.

١) صحيح مسلم: ٥٨٩٨.

ڕەنگە حیکمەتی ئەمەش ئەوە بووبێ، کە جۆرێك لە زەمینەسازیی دەروونی بۆ دروست ببێ بۆئەوەی کاتێك، کە (جبریل) هاتو پێی گوت: تۆ پێغەمبەری خوای! زۆری پێ تێك نەچێت، جا لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەو زەمینەسازییانەشی بۆ کراوە، بەڵام یەکەمجار، کە وەحی بۆ هات بەهۆی (جبریل)ەوە، لای شتێکی نائاسایی بووە، کە دیارە ئەگەر ئەو زەمینەسازییانەی بۆ نەکرابایە، زیاتر پێی تێکدەچوو.

٤/ یەکێکی دیکەش لەو زەمینەسازییانە ئەوەبوو، کە پێغەمبەر ﷺ شەش مانگ پێش ئەوەی (جبریل) بێت بۆ لای خەونی زۆر ڕاستی بینیون، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت: **{عن عائشة رضي الله عنها، قالت: أول ما بُدِيءَ به رسول الله ﷺ من الوحي الرؤيا الصالحة في النوم، فكان لا يرى رؤيا إلاّ جاءت مثل فلق الصبح}**[1]، واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: یەکەمین شت، کە بە هۆیەوە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد، خەونی ڕاست بوو, کە لەکاتی نووستندا دەیبینیو هەر خەونێکی, کە دەیبینی وەك سپێدەی بەیان ڕێكو ڕاست دەردەچوو.

٥/ یەکێکی دیکە لە زەمینەسازییەکانی پێش هاتنی وەحی، ئەوە بووە، کە بە (٣) ساڵ پێش هاتنی وەحی پێغەمبەر ﷺ حەزی کردوە، کە بچێتە خەڵوەوە، ئەمەش دیسان (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێت- لە فەرموودەکەی پێشوودا دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: **((وكان يخلو بغار حراء فيتحنث فيه (وهو التعبد) الليالي ذوات العدد قبل أن ينزع إلى أهله ويتزوّد لذلك ثم يرجع إلى خديجة فيتزوّد لمثلها...}** رواه البخاري[2]، واتە: پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی وەحی بۆ بێ، دەچوو لە ئەشکەوتی (حراء)دا بیری دەکردەوەو خواپەرستی

---

١) صحيح البخاري: (٣)، كتاب بدء الوحي.
٢) صحيح البخاري رقم: (٣).

www.alibapir.com

دەکرد، (چونکە زانیویەتی کە خوا هەیە لەبەرئەوەی کە (معرفة الله) لە فیطرەتی هەموو بەشەرێکدا هەیە) وە چەندان شەو لەوێدا دەمایەوە، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خەدیجە، دووبارە توێشوو هەڵگرێتەوە بۆ شەوانی دواتر.. دیارە ئەو جۆرە مانەوەش لە شوێنێکی تایبەتیو بە تەنیاو، بیرکردنەوە لە دروستکەری بوونەوەرو ناوو سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی خوای پەروەردگارو پەرستنو یادکردنی، دەورو کاریگەرییەکی گەورەو گرنگی لە مشتوماڵکردنی دڵو دەروونی مرۆڤو لەخوا نیزیکخستنەوەیدا هەیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# سەرەتای هاتنی وەحی بۆ (محمد) و هەڵبژێررانی بە کۆتا پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەر ﷺ پێش تەمەنی (٤٠) ساڵی‌و هاتنی وەحی بۆی، چەندان جار بۆ ماوەی چەند شەوو ڕۆژێك بۆ عیبادەت‌و بیرکردنەوەو پەرستنی خوا، لە (مەککە)وە دەچوو بۆ ئەشکەوتی (حراء) لە (جبل النور)و, بەتەنیا دەمایەوەو بیری دەکردەوەو یادی خوای دەکرد.

خوای پەروەردگار ویستوویەتی ئەو ئینسانە ئامادە بکات بۆ هەڵگرتنی ئەمانەت‌و پەیامێکی بەرزو گەورە، بۆ ئەوەی گۆڕانکاریی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دروست بکات‌و خەڵکی بەرەو پەرستنی خواو سەرفرازیی دنیاو قیامەت بانگ بکات، تا سەرەنجام لە تەمەنی(٤٠) ساڵی (مانگیی)دا (هێندێك لە زانایانیش دەڵێن: لە تەمەنی (٤١) ساڵیدا) خوای بەخشندە بە (جبریل)دا وەحی بۆ نارد.

عائیشەی دایکی مسوڵمانان (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە، کە سەرەتای هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەرمان ﷺ بەم شێوەیە بووە:

**(أول ما بديء به رسول الله ﷺ من الوحي الرؤيا الصالحة في النوم، فكان لا يرى رؤياً إلا جاءت مثل فلق الصبح ثم حبب إليه الخلاء، وكان يخلو بغار حراء فَيتحَنّثُ فيه -وهو التعبد- الليالي ذوات العدد قبل أن يَنزِعَ إلى أهله ويتزوّدُ لذلك ثم يرجعِ إلى خديجةَ فيتزود لمثلها، حتى جاءهُ الحق وهو في غار حراءٍ فَجاءَهُ الملكُ فقال: اقرأ! قال: ما أنا بقاريء، فأخذني فَغطّني حتى بلغ مني الجُهد ثم أرسَلَني، فقال: اقرأ! قلت ما أنا بقاريء، فأخذني فغطّني الثانية حتى بلغ مني الجُهد، ثم أرسَلَني، فقال: اقرأ! فقلت ما أنا بقاريء، فأخذني**

www.alibapir.com


فغطّني الثالثة، ثم أرسلني، فقال: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥﴾ العلق، رواه البخاري.(١)

عائیشە دەڵێ: سەرەتای دەستپێکردنی وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو، کە لە کاتی نووستندا خەونی باشی دەبینی، هەر خەونێکی دەیبینی وەك سپێدەی بەرەبەیان ڕاست دەهاتەدی، دوایی حەزی دەکرد، کە گۆشەگیرو تەنها بێ، بۆیە لە ئەشکەوتی (حراء)دا دەچووە خەڵوەوەو چەندان شەو دەمایەوەو پەرستشی بۆ خوای پەروەردگار دەکرد، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ لای خەدیجە، توێشوو هەڵبگرێتەوەو دووبارە بچێتەوە بۆ ئەشکەوتەکە، هەتا وەحی بۆ هات لە کاتێکدا، کە لە ئەشکەوتی (حراء) دابوو، فریشتە هات بۆ لای و پێی گوت: بخوێنە! فەرمووی: من خوێندەوار نیم، پێغەمبەر دەفەرموێ (جبریل) منی گرت و توند بەخۆیەوە گوشیمی هەتا ئازارم پێگەیشت دوایە بەریدام، دووبارە گوتی: بخوێنە! منیش دووبارەم کردەوە گوتم: خوێندەوار نیم، بۆ جاری دووەم بەخۆیەوە گوشیمی، تا ئازارم پێگەیشت، ئنجا بەریدام، دیسان پێی گوتم: بخوێنە! منیش گوتم خوێندەوار نیم، بۆ جاری سێیەم بە خۆیەوە گوشیمی، ئنجا گوتی: بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەت، کە هەموو شتێکی دروست کردوە، ئینسانی لە خوێن پارە دروست کردوە، بخوێنە، کە پەروەردگارت زۆر بەخشندەیە، ئەو کەسەی بەقەڵەم خەڵکی فێر کردوە، ئینسانی فێری شتێك کردوە، کە نەیدەزانی.

ئنجا لە درێژەی قسەکەیدا دەڵێ:

---

١) صحیح البخاري: (٣).

(فرجع بها رسول الله ﷺ يرجف فؤاده)، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەو چەند ئایەتانەی لەگەڵ خۆی بردنەوەو دڵیشی زۆر بەخێرایی لێی دەدا، **((فدخل على خديجة بنت خويلد (رضي الله عنها) فقال: زملوني زملوني، فزملوه حتى ذهب عنه الروع، فقال لخديجة وأخبرها الخبر، لقد خشيت على نفسي))**، واتە: پێغەمبەر ﷺ دەچێتەوە بۆ لای خەدیجە، وە دەفەرموێ دامپۆشن دامپۆشن، وە دایدەپۆشن تا ئەو ترسەی لێ‌دەڕەوێتەوە دوایی هەواڵەکە بۆ خەدیجە باس دەکاتو دەفەرموێ: لەخۆم ترسام **((لقد خشيت على نفسي))** کە ئەمە زاراوەیەکە عارەب لەبارەی شەیاطینو جندەوە بەکاریان دەهێنا، (فقالت خديجة: كلاّ والله ما يخزيك الله أبداً انّك لتصل الرحم، وتحمل الكلّ، وتكسب المعدوم، وتقري الضيف، وتعين على نوائب الحق).

جا با لێرەدا سەرنج بدەینو تەماشابکەین داخۆ خەدیجە ئافرەتێکی چەند عاقڵو زیرەكو تێگەیشتوو بووە! ئەوەتا لێرەدا ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ دەکاتو دڵی خۆش دەکاتو بەڵگەشی بۆ دەهێنێتەوە, کە نەخێر شەیتانەکان دەستیان لە تۆ نەوەشاندوە! تەماشا بکەن خەدیجە ئافرەتێکی چەند شارەزاو فیطرەت پاك بووە، بێگومان پێغەمبەریشی زۆر باش ناسیوە، بۆیە ئەو شایەدییە گەورەیەی بۆ داوە, کە دەڵێ: نەخێر, وەڵڵاهی خوا قەت تۆ شەرمەزار ناکات!

ئنجا خەدیجە پێنج سیفەت لە پێغەمبەر ﷺ هەڵدەداتو دەیانکاتە بەڵگە لەسەر ئەوە, کە شەیاتینەکان توانای ئەوەیان نیە دەستی لێ بوەشێنن، دیارە ئەو بەڵگە هێنانەوەیەی خەدیجە ئەوەشی لێ دەفامرێتەوە, کە جنۆکەو شەیتان زەفەر بە ئینسانی ئیماندارو چاکەکار نابەن، پێنج سیفەتەکەش بریتین لەوانە، کە دەڵێ: (إنك لتصل الرحم)، واتە: تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنی، (وتحمل الكل) تۆ یارمەتی کەسانی لێقەوماو دەدەی، (وتكسب المعدوم) ئەوەی ,کە خەڵك لە هیچ شوێنێك دەستی ناکەوێ, تۆ دەیکەی بە موڵکیان، (وتَقْري الضيف) میوانداریی میوانان

www.alibapir.com

دەکەی، (وتعين على نوائب الحق) کەسێك، کە بەڵای بەسەر دێ، تۆ پشگیریی‌و هاوکاریی دەکەی.

عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- لەسەر گێڕانەوەی فەرموودەکە بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: (فانطلقت به خديجة حتى أتت به ورقة بن نوفل بن أسد بن عبدالعزى ابن عم خديجة، وكان امرأً تنصر في الجاهلية، وكان يكتب الكتاب العِبْراني فيكتب من الانجيل بالعبرانية ماشاء الله ان يكتب وكان شيخاً كبيراً قد عَمِيَ).

دیارە لەوەشدا عاقڵیی‌و دانایی خەدیجەمان بۆ دەردەکەوێ، بەوە واز ناهێنێ، کە خۆی دڵی داوەتەوە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خۆی دەبات بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل، کە کوڕە مامی خۆیەتی‌و لە سەردەمی نەفامییدا بووە بە نەصرانیی‌و کابرایەکی خوێندەوار بووەو بە عیبریی نووسیویەتی، لەسەر ئینجیل نووسیویەتی‌و بەتەمەن‌و کوێریش بووە.

(فقالت له خديجة يا ابن عم اسمع من ابن أخيك) ئەوەشی دیسان عاقڵیی‌و دانایی یە لە جیاتی ئەوەی بۆخۆی بەسەرهاتەکەی بۆ باس بکات، دەڵێ: ئەی ئامۆزام گوێ بگرە, بزانە برازایەکەت (محمد) چی دەڵێ؟! چونکە ئەو مەسەلەیە شتێکی گەورەیەو باشتر وایە, کە لە دەمی خودی (محمد) ببیستێ:

(فقال له ورقة يا ابن أخي ماذا ترى؟!)، واتە: وەرەقە لێی پرسی ئەی برازام چ دەبینی؟!

(فأخبره رسول الله ﷺ خبر ما رأى)، واتە: پێغەمبەر ﷺ چی بنیبوو، چی بیستبوو بۆی گێڕایەوە.

(فقال له ورقة) ئنجا وەرەقە پێی گوت: **(هذا الناموس[1] الذي نزّل الله على موسى يا ليتني فيها جذعاً، ليتني أكون حياً اذ يخرجك قومك)**، واتە: ئەوە ئەو

---

١) (الناموس)، واته: فريشتەی پەیك.

فریشتەیەیە کە خوا ناردوویەتە خوار بۆ سەر مووسا ﷺ، خۆزگە لەم ڕۆژگارەدا گەنج بام! خۆزگە زیندوو بام ئەوکاتەی کە گەلەکەت دەرت دەکەن!

(فقال رسول الله ﷺ **(أو مُخرجيّ هم؟!)** پێغەمبەر ﷺ زۆری پێ سەیر دەبێ‌و دەفەرموێ: یانی دەریشم دەکەن؟!

**(قال: نعم لم يأت رجل قط بمثل ما جئت بهِ إلا عودي، وإن يدركني يومك أنصرك نصراً مؤزراً)** وەرەقە دەڵێ: بەڵێ دەرت دەکەن، چونکە هیچ پیاوێك لە پێش تۆدا ئەو پەیامەی, کە تۆ هێناوتە هی وەك تۆی نەهێناوە, مەگەر دژایەتی کراوە، ئەگەر من بگەمە ئەو ڕۆژەی, کە تۆ بانگەوازەکەی خۆتی تێدا ئیعلان دەکەی‌و قەومەکەت دژایەتیت دەکەن، زۆر چاك پشتگیرییت لێ دەکەم.

(وەرەقە) چونکە شارەزای کتێبە ئاسمانییەکان بووەو، مێژووی پێغەمبەرانی زانیوە، زانیویشیەتی، کە پێغەمبەران لەلایەن زلە زلەکان‌و دەسەڵاتدارانەوە دژایەتی یان دەکرێ، چونکە پەیامی پێغەمبەران دژی بەرژەوەندی نارەوای دەسەڵاتدارانە، هەر لەبەر ئەوەشە, کە دژایەتی دەکرێن.

دوایی عائیشە دەڵێ: **(ثم لم يَنْشَبْ ورقة ان توفي وفتر الوحي)**[1]، واتە: دوایی زۆری پێ نەچوو, وەرەقە وەفاتی کرد (کە دیارە ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە) وە سروش (وحی)یش بۆ ماوەکی کورت بڕا.

جا لێرەدا بە پێویستی دەزانم, کە هەڵوەستەیەکی کورت لەسەر ئەم فەرموودەیە بکەم:

<u>**یەکەم:**</u> ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێت ,کە ئیعتیکاف‌و گۆشەگیریی, جارجار پێویستە بۆ ئینسان بۆ ئەوەی لە خۆی وردبێتەوەو بەخۆیدا بچێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەپێش پێغەمبەرایەتیدا ئیعتیکافی کردوە، لەپاش

---

١) صحيح البخاري: (٣).

پێغەمبەرایەتیشدا بەهەمان شێوە، بۆ نموونە: هەموو دە شەوێکی کۆتایی ڕەمەزانان دەچووە ئیعتیکافەوە.

**دووەم:** ئەوەشی لێ وەردەگیرێ، کە خەونی ڕاستو چاك، جۆرێکە لە وەحی، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{لم يبق من النبوة إلاّ المبشرات، قالوا: وما المبشرات؟ قال الرؤيا الصالحة}** رواه البخاري[1]، واتە: لە پێغەمبەرایەتی نەماوە، مەگەر دڵخۆشکەرەکان، گوتیان دڵخۆشکەرەکان چین؟ فەرمووی: خەونی چاكو ڕاست...،کەواتە: ئێمە جگە لە خەون، دەلاقەیەکمان نیە بەرەو مەلەکووتو (ملأ الأعلى)، بەڵام بێگومان، تەنها خەونی پێغەمبەران (معصوم)ەو بە وەحی دادەنرێو، خەونی غەیری پێغەمبەران ،زیاتر هەر بە دڵخۆشکەر دادەنرێو، حوکمی شەرعیشی لێ وەرناگیرێ[2].

**سێیەم:** حیکمەتی ئەو بەخۆوە گوشینەی (جبریل) بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەوەبووە، کە پێغەمبەر دڵنیا بێت لەوەی، کە ئەوە مەخلووقێکی دیکەیە بەخۆیەوە دەگوشێت، بۆیە سێ جاران بەخۆیەوە گوشیویەتی، تا تەواو دڵنیا بێت، کە ئەوە حاڵەتێکی واهیمەیی نیە، کە لە دەروونی خۆیدا بۆی دروست بووبێو، حەقیقەتو ڕاستییە.

**چوارەم:** ترس ڕێ نیشتنی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە بووە، کە نەیزانیوەو دڵنیا نەبووە، کە دەبێ بە پێغەمبەر.

**پێنجەم:** وەك باسمان کرد، وەڵامی خەدیجەش ئەوەی لێ وەردەگیرێت، کە ئەو (محمد)ە ﷺ خوای پەروەردگار بە تایبەتی بۆ ئەوە ئامادەی کردوە، کە بیکاتە پێغەمبەر، وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿... ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ

---

١) صحيح البخاري: (٦٩٩٠).

٢) لە هەرکام لە کتێبی (ڕێگای صالح بوون...)و، بەرگی دووەمی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا، بە درێژی باسی خەونو خورپە (الرؤيا والإلهام)مان کردوە.

www.alibapir.com


يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ... ﴿١٢٤﴾ ﴾ الأنعام، واتە: خوا بۆخۆی دەزانێ پەیامی خۆی لەکوێ دادەنێ، هەر بۆیەش کەسێکی بۆ هەڵگرتنی پەیامەکەی هەڵبژاردوە، کە مەعدەنێکی ئەوەندە چاكو ڕەوشتێکی ئەوەندە بەرزی هەبێ ,بەجۆرێك پێش پێغەمبەرایەتیشی, کەس نەتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێت، هەروەك لە پێش پێغەمبەرایەتیشدا بە(الصادق الأمین) ناوی دەرکردبوو، دوژمنەکانیشی ڕاستگۆیی پێش پێغەمبەرایەتییان کردبوو بە بەڵگەی پێغەمبەربوونی.

**شەشەم:** بۆیە خەدیجەش (محمد) دەبات بۆ لای وەرەقە لەبەرئەوەی, کە دەزانێ وەرەقە پیاوێکی ئەهلی کیتابەو پسپۆڕو شارەزایە.

بۆیە پێویستە ئێمەش شتەکانی خۆمان بگێڕینەوە بۆ لای خەڵکی پسپۆڕو شارەزا، وەك خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ ...فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النحل، الأنبیاء ٧٠.

**حەوتەم:** وەك باسمان کرد یەکەم وشەی پەیامی کۆتایی خوا, کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەرمان (محمد) ﷺ هاتوە، بریتی بوو لە وشەی (إقرأ) بخوێنە! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ, کە ئیسلام دینی زانستو فێربوونەو، دەری دەخات, کە ئیسلام چەندە گرنگی بە خوێندنەوەو زانستو زانین دەدات، وە دەری دەخات, کە ئینسان بەهۆی خوێندنو شارەزاییەوە, زۆر لە نهێنیەکانی دروستکراوەکانی خوا ئاشکرا دەکاتو، خوێندنو زانستو بیرکردنەوە, زەینی مرۆڤ فراوانتر دەکاتو، بەو هۆیەوە, ئەگەر بیەوێ عەقیدەو ئیمان دەچەسپێو، بەپێی شەرعی خوا سەرزەمین لە تێکڕای بوارەکاندا ئاوەدان دەکاتەوە.

## مانای وەحی:

وشەی (وحي) لە بەکارهێنانی قورئاندا سێ مانای هەن:

www.alibapir.com


**١- واتـایەکی گشـتی:** کە بریتیە لە ئاڕاستەکردنو مشوور لێخواردنو ئاماژە کردنو قسەی پەنهان، ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتانەی خوارەوە بکەین، ئەو مانا گشـتییەی (وحي) زۆر چاك دەدرەوشـێتەوە: خوای پەروەردگـار دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ﴿٦٩﴾ ﴾ النحل، واتە: وە پەروەردگارت (وحي) بۆ هەنگ نارد، کە لـە شـاخ مـاڵ دروسـت بکـەو، لـە دارو درەخـتەو، لـەو کـەپرو ساباتەی خەڵك دروستی دەکەن، پاشان لە هەموو بەرو میوەکـان بخـۆو ڕێگایـەکانی پەروەردگاردت بگـرە، زۆر بـە گـەردن کەچیی. دەبیـنین خـوای پـەروەردگار وشـەی (وحي) بۆ هەنگ بەکارهێناوە، کە بەتەئکید لێرەدا مەبەست پێی ڕێنمـایی کردنـی (غـەریزیی) هەنگە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

هەروەها لە سووڕەتی (مریم)دا دەربارەی پێغەمبەر (زەکەرییا) لە کاتێـدا، کـە خوای پەروەردگار موژدەی (يحي)ی کوڕی پێ دەدات -سەلامی خوایان لـێبێ-، کـە هەم زەکەرییا بۆخۆی کەوتبۆ تەمـەنەوەو، هەم خێزانەکەشی بەتەمـەنو نـەزۆك بـوو، ئـاوا دەفـەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾ مـریم، واتـە: زەکـەرییا لـە (مـحراب[١])ەکـەی چـۆ دەرێ بـۆ لای عـەشیرەتو هۆزەکەی وە ئاماژەی بۆکردن کە خوا بە پاك بگـرن بـەیانیانو ئێـواران، لێرەدا هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کـە: ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ﴾، واتـە: (فأشـار إليهم)، کەواتە: لێرەدا (وحي) بە مانای ئیشارەتە، جا لەکاتێکدا خوای پەروەردگار لەو تەمـەنەی زەکەرییادا منـداڵێکی پێبەخشـی زۆری پـێ سـەیر بـوو، بۆیـە داوای

١) الـمحـراب: واتە پەرستگاو ئەو شوێنەی، کە خواپەرستی تێدا دەکرێت.

www.alibapir.com


بەڵگەو نیشانەیەکی لە خوای پەروەردگار کرد، خوای پەروەردگاریش پێی فەرموو: ﴿قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ۝١٠﴾ مریم، واتە: نیشانەت ئەوەیە کە سێ شەوو ڕۆژان قسەت بۆ ناکرێ، بۆیەش بە ئیشارەت پێیان دەڵێ: پەروەردگارتان بە پاك بگرن بەیانیانو ئێواران، چونکە پەروەردگار موعجیزەیەکی ئاوا گەورە دەخولقێنێ، کە لە پیاوێکی پیرەمێردو پیرێژنێکی نەزۆك کوڕێك پەیدا دەبێ!!

هەروەها لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١١٢)دا خوای پەروەردگار دەربارەی (شیاطین[١]) دەفەرموێ: ﴿...شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ...﴾، واتە: شەیتانەکانی ئادەمیزادو جنۆکە هەندێکیان (وحي) بۆ هەندێکیان دەکەن، بە قسەی زریقو بریقو فریودەرانە، لێرەدا (یوحي) یانی: (یوسوسُ) بەو مانایە کە وەسوەسە دەکەن بۆ یەکترو دنەی یەکتر دەدەن، وەسوەسەش لە ئەسڵدا بە دەنگی خشڵ دەگوترێ (صوت الحُلِيِّ)، چونکە خشڵ، کە دەنگی لێدێ دەنگەکەی کپە، وەسوەسەش دەنگێکی کپی شەیتانە دەیخاتە دڵی ئەو کەسەوە، کە بیەوێت فریوی بدات، ئەوە مانای یەکەمی وشەی (وحي) بوو.

**٢- واتایەکی تایبەتی:** کە بریتییە لە ئاڕاستەکردنی خواو ڕێنماییکردنی بۆ فریشتەکانیو بەندە چاکەکانی غەیری پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام-، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟

---

١) شیاطین: کۆی (شیطان)ە، وە لە بەکارهێنانی قورئاندا بۆ هەرکەسێك بەکاردێ، کە لە خوا دوور بێ، جا چ ئادەمیزاد بێ، چ جنۆکە.

ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ... ﴿١٢﴾ ﴾ الأنفال، واتە: کاتێك پەروەردگارت (وحي) دەکرد بۆ فریشتەکانی کە من لەگەڵتانم ئێوەش دڵی ئیمانداران دەمەزراو بکەن.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ ﴾ القصص، واتە، ئێمە وەحییمان کرد بۆ دایکی مووسا کە شیر بدە بە کوڕەکەت، وە کاتێك کە لێی ترسای بیکوژن بیخە تابووتێکەوەو بیخە نێو ڕووبار، وە هیچ مەترسێو دڵ تەنگ مەبە، ئێمە بۆلای تۆی دەگێڕینەوەو دەیکەین بە یەکێك لە ڕەوانەکراوانمان.

لێرەدا مەبەست لە (وحي) خوای پەروەردگار بۆ دایکی مووسا -علیهما السلام- خوریە (إلهام)یە، کە ڕێنمایی کردنێکی پەنهانەو لە زاراوەی شەرعدا پێی دەگوترێ: (إلهام) کە مەبەست خستنە نێو دڵە.

**٣- واتایەکی تایبەتی تایبەت:** مانای سێیەمی وەحی بریتیە لە فەرمایشت کردنو ڕێڕوونی کردنو ئاڕاستەکردنی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی -علیهم الصلاة والسلام- چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ لە پشتی پەردەوە، چ بەشێوەی ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی فریشتەوە، ئەم ئایەتانەش مانای سێیەمی وەحییمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُوحِىٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ﴾ الشوری، واتە: ئاوا بەو شێوەیە (ئەی محمد ﷺ) خوای بالادەستی کاربەجێ وەحی بۆتۆ دەنێرێ، وە بۆ ئەوانەی پێش تۆش وەحی ناردوە (کە پێغەمبەرانن -علیهم الصلاة والسلام-) کەواتە: لێرەدا مانای سێیەمی وەحییمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئەویش بریتیە لە قسەکردنو فەرمایشتکردنی خوای پەروەردگار لەگەڵ پێغەمبەرانیدا -علیهم الصلاة والسلام- چ لە پشتی پەردەوە،

وەك لەگەڵ مووسادا كردی، وە لەگەڵ پێغەمبەری خۆشمان لە شەوی ئیسراو میعراجدا، وە چ لە ڕێی فریشتەوە، كە ئەوە ڕێگەی گشتی وەحییە بۆ پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام-، هەروەها خوای پەروەردگار هەر لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ ...﴿١٦٣﴾﴾ النساء، واتە: (ئەی محمد ﷺ) ئێمە وەحییمان بۆلای تۆ كردوە، هەروەك وەحییمان بۆ لای نووحو پێغەمبەرانی دوای ئەویش ناردوە -علیهم الصلاة والسلام-، هەروەها فەرموویەتی: ﴿يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ...﴿٢﴾﴾ النحل، واتە: فریشتەكان بەڕووحیك لە ئایینی خۆی لەلایەن خۆیەوە دەنێرێتە خوارەوە بۆ سەر هەركام لە بەندەكانی كە بیەوێ، لێرەدا وشەی (الروح) بە مانای (وحي)یە، چونكە وەك چۆن ئینسان بە ڕووح دەژییو زیندووە، ژیانی بەشەرییەتیش ئاوا بەهۆی (وحي)یەوە ژیانی لەبەر دەبێو زیندوو دەبێ.

**دیارە** لەكاتێكدا، كە خەڵك وشەی (وحي) بەكاردەهێنێ زیاتر مەبەستیان پێ مانای سێیەمیەتی، وە هێندێكیان وادەزانن، كە (وحي) تەنیا ئەو مانای سێیەمەی هەیە، كە ئەویش بریتیە لە فەرمایشت كردنی خوا لەگەڵ پێغەمبەراندا -علیهم الصلاة والسلام-، وە ڕاسپاردنی بەرنامەو پەیامی خۆی بۆ لایان بەهۆی فریشتەكانەوە، لەكاتێكدا كە ئەوە یەكێكە لە ماناكانی (وحي)و ئەو دوو مانایەی دیكەشی هەن، كەواتە: دەتوانین بڵێین (وحي) سێ مانای هەیە: گشتیو تایبەتیو تایبەتی تایبەت.

## دابەزینی (وحي) لە چ ڕۆژو مانگێك دا بووە ؟

لێرەدا مەبەستمان لە یەكەم جاری هاتنی (وحي)یە كە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوە، ئایا بۆ یەكەم جار لە چ ساڵو مانگو شەوێك دابووە؟

بۆ دەستکەوتنی وەڵامی ئەم پرسیارە با سەرنجی ئەم خاڵانە بدەین:

**یەك:** سەرەتای هاتنی وەحیو دابەزینی قورئان لە مانگی ڕەمەزانو شەوی قەدردا بووە، وەك خوای زانا لەم ئایەتانەدا بە ڕاشکاویی ئاماژەی پێ دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ ... ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: مانگی ڕەمەزانێك کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوار، کەواتە: بە تەئکید سەرەتای هاتنو دابەزینی قورئان لەمانگی ڕەمەزاندا بووە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ ﴾ الدخان، واتە: (ئێمە قورئانمان بۆ یەکجار ناردۆتە خوار لە شەوێکی پڕ پیتو پێزدا، ئێمە وریاکەرەوەو ترسێنەرین)، کە مەبەست لەو شەوە شەوی (قَدْر)ە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴿١﴾ ﴾ القدر، واتە: ئێمە لە شەوی (قدر)[1]دا قورئانمان ناردۆتە خوار.

**دوو:** شەوی (قدر) یەکێکە لە دە (١٠) شەوەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزان، کە فەرمایشتی پێغەمبەرﷺ لەوبارەوە زۆرنو یەکێکیان ئەم فەرموودەیەیە: **{عن عائشة رضي الله عنها أن رسول الله ﷺ قال: تحرّوا ليلة القدر في الوتر من العشر الأواخر من رمضان}** رواه البخاري[2]، واتە: لە شەوە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا لە شەوی (ليلة القدر) بگەڕێن، کەواتە: بە تەئکید (شەوی قەدر) لە شەوە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندایە.

---

١) القدر: دوو مانای هەن، یان بە مانای پیتو فەڕ دێت، یان بە مانای ئەندازەگیریی دێت، کە دیارە ئەو شەوە هەم شەوێکی پڕ پیتو فەڕەو هەم شەوێکیشە کە ئەندازەگیریی هەموو کارەکانی ئەو ساڵەی تێدا دەکرێت.

٢) صحیح البخاري، : (٢٠١٧).

**سێ:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، کە لە ڕۆژی دووشەممەدا لەدایك بووەو هەر لە ڕۆژی دووشەممەشدا بۆ یەکەم جار وەحی بۆ هاتوە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: **{عن أبي قتادة ﷺ: أن رسول الله ﷺ سئل عن صوم يوم الإثنين، فقال: ذاك يوم ولدت فيه ويوم بعثت فيه، أو أنزل عليّ فيه))**[١] رواه مسلم، واتە: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی دووشەممە، ئەویش فەرمووی: ئەوە ڕۆژێکە تێیدا لە دایك بووم‌و وەتێیدا ڕەوانەکرام یان وەحییم بۆ هاتۆتە خوار، (بۆ یەکەم جار، ئەگەرنا وەحی لە هەموو ڕۆژەکانی دیکەی ساڵیشدا هاتۆتە خوار).

**چوار:** بەپێی حیساباتی فەلەکیی، دووشەممەکانی مانگی ڕەمەزانی (٤١)ەمین ساڵەی تەمەنی پێغەمبەر ﷺ، بریتین لە ڕۆژانی: (٧، ١٤، ٢١، ٢٨)[٢].

جا بە لەبەرچاوگرتنی ئەو چوار خاڵەی، کە ڕابردن، ناچارین بڵێین:

شەوی (٢١)ی مانگی ڕەمەزانی (٤١)مین ساڵەی تەمەنی پێغەمبەر ﷺ ، کە شەوی دووشەممە بووە، یەکەمین شەوی دابەزینی سەرەتای وەحی خوا -عزّوجلّ- بووە بۆ سەر (محمد) ﷺ، چونکە:

١- وەك گوتمان مسۆگەر سەرەتای دابەزینی وەحی لە یەکێك لە شەوە بەپێزەکانی مانگی ڕەمەزانی ساڵی یەکەمی پێغەمبەرایەتی (محمد)دا بووە، وەك هەرکام لە ئایەتی (١٨٥)ی (البقرة)و ئایەتی (٣)ی (الدخان)و سورەتی (القدر) بەڕاشکاویی ڕایگەیاندوە.

---

١) صحيح مسلم: (٢٧٣٩).

٢) بڕوانە: (الرحيق المختوم)، لاپەڕە: (١٥)، صفي الرحمن مباركفوري.

٢- وە ئەو شەوەش بەتەئکید یەکێکە لە شەوە تاکەکانی دە (١٠) شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان، وەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: **{تحرَّوا ليلة القدر في الوتر من العشر الأواخر من رمضان}** دەیگەیەنێ.

٣- وە ئەوشەوە تاکەش بریتییە لە شەوی دووشەممەی (٢١)ی مانگی ڕەمەزان، چونکە بەپێی ئەو فەرموودەیەی (أبو قتادة) گێڕاویەتەوە پێغەمبەر ﷺ لە شەوی دووشەممەدا وەحی بۆ دابەزێنراوەو دووشەممەکانی (١٤,٧)ی ئەو ڕەمەزانەش، چونکە ناکەونە دەشەوی کۆتاییو دووشەممەی (٢٨)یش، چونکە لە شەوە تاکەکان نییە، هیچ کامیان ناگونجێ ئەو شەوە دیاریکراوەبن، کەواتە: ئەو شەوە موبارەکە بەتەئکید شەوی دووشەممەی (٢١)ی مانگی ڕەمەزانە.

## دابڕانی وەحیو چۆنیەتیو حیکمەتو ماوەکەی:-

### أ- چۆنیەتی پچڕانی وەحی :

بوخاریی دەربارەی پچڕانی وەحی، گوتوویەتی: (وفتر الوحي فترة حتى حَزِن النبيّ ﷺ فيما بلغنا حزناً غدا منه مراراً كي يتردَّى مِن رؤوس شواهق الجبال فكلما أوفى بذروةِ جَبل لكي يُلْقيَ منه نفسه تبدّى له جبريلُ فقال: يا (محمد) إنك رسول الله حقاً، فيسكن لذلك جأشُهُ وتقرّ نفسه فيرجع، فاذا طالت عليه فترة الوحي غدا لمثل ذلك فإذا أوفى بذروة الجبل تبدّى له جبريل فقال له مثل ذلك)[1]، بوخاریی دەڵێ: پێم گەیشتوە، کە (وحي) بۆماوەیەك پچڕا پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵتەنگ‌بوو، دڵتەنگ بوونەکەی بەڕاددەیەك بوو، کە چەند جارێك دەچوو بۆ سەر لووتکەی چیا بەرزەکان بۆئەوەی خۆی هەڵداتە خوارێ، وە هەرجارێك، کە دەچوو بۆ سەر لووتکەی شاخەکان (جبريل) خۆی پێشان دەداو دەیگوت: ئەی

---

١) (صحيح البخاري) رقم الحديث ٦٩٨٢.

موحەممەد بێگومان تۆ پێغەمبەری خوای، پێغەمبەریش دڵی ئاسوودە دەبووو، دەروونی ئارامی دەگرتو دەگەڕایەوە، وە کە وەحی پچڕانەکەی درێژەی دەبوو دیسان دەچوو بۆ سەر لووتکەی چیا بەرزەکان بۆئەوەی خۆی هەڵبداتە خوارێ، بەڵام دیسان (جبریل) لێی دەردەکەوتو پێی دەگوت، کە بەتەئکید تۆ پێغەمبەری خوای، ئەویش دەگەڕایەوە، (مەبەست لە پچڕانی وەحی دواکەوتنی وەحی بووە، بۆ ماوەیەکی کەم)[1].

## ب- حیکمەتی پچڕانی وەحی:

(ابن حجر العسقلاني) گوتوویەتی: (وفتور الوحي عبارة عن تأخره مدة من الزمان وكان ذلك ليذهب ماكان ﷺ وجده من الروع وليحصل له التشوق إلى العود)[2]، (ابن حجر العسقلاني)ی کە زانایەکی گەورەیە لە زانا فەرموودە ناسەکان دەڵێ: (پچڕانی وەحی بریتیە لە دواکەوتنی بۆ ماوەیەك، ئەوەش بۆ ئەوە بوو، کە ئەو ترسەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست بووە لێی لابچێ، وە لە لایەکی دیکەشەوە بۆ ئەوەی تامەزرۆیی زیاتری هەبێ بۆ وەرگرتنی وەحی)، چونکە لە کاتێکدا کە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهاتە خوارێ زۆر قورس بوو لەسەری، لەو بارەوە دایکمان (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێ- وەك بوخاریی بۆمان دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: (لە ڕۆژی زۆر ساردی زستاندا کە پێغەمبەر وەحی بۆ هاتبا دڵۆپی ئارەقی دەردەکردو بە دەموچاوی موبارەکیدا دەهاتە خوارێ)[3]، هەروەها (زيد بن ثابت) لەوبارەوە گوتوویەتی:

---

١) بەڵام هەندێك لە زانایانی سیرەو فەرموودە تێبینی یان لەسەر ئەم ڕووداوە هەیە بۆ وێنە: خاوەنی کتێبی (السيرة النبوية عرض وقائع و تحليل أحداث) د. علي محمد الصلابي کە لە لاپەڕە (٨٤)دا گوتوویەتی: (وأما ما جاء بلاغاً أنه ﷺ حزن حزناً جعله يغدو ليتردى من شواهق الجبال، وأن جبريل -عليه السلام- كان يظهر له في كل مرة، ويبشره بأنه رسول الله، فمرسل ضعيف، كما أنه يتنافى مع عصمة النبي ﷺ .

٢) كتاب فتح الباري، ج١، ص ٣٦.

٣) صحيح البخاري: (٢)

www.alibapir.com


(جارێکیان ڕانی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕانم بوو کە وەحی بۆ هات ئەوەندە قورسایی خستە سەر ڕانم خەریك بوو ڕانم ورد بێ)[1]، هەروەها دەگێڕنەوە جاری وا هەبووە پێغەمبەر ﷺ لەسەر حوشتر بووە کە وەحی بۆ هاتوە حوشترەکەی پێی بەعەرزیدا چۆتە خوارێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ کەوتۆتە حاڵەتێکی سەختەوە تاکو وەحی یەکەی وەرگرتوە.

## ج- ماوەی پچڕانی وەحی :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{جاورتُ بحراء فلما قضيت جواري هبطت فنوديت فنظرتُ عن يميني فلم أرَ شيئاً، ونظرتُ عن شمالي فلم أرَ شيئاً، ونظرتُ أمامي فلم أرَ شيئاً، ونظرت خلفي فلم أرَ شيئاً، فرفعت رأسي فرأيت شيئاً، فأتيت خديجة فقلت دثّروني وصبوا علي ماءً بارداً، قال فدثروني وصبوا عليّ ماءً بارداً، قال فنزلت:** ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنذِرْ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ (٥) وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ (٦) وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ (٧)﴾ المدثر، **ثم تتابع الوحي}** رواه البخاري[2]، واتە: ماوەیەك لە خەڵوە دا بووم – کە مەبەستی لە مانگی ڕەمەزانە - کاتێك خەڵوەکەم تەواو کرد لە شاخ چوومە خوار، بانگ کرام، تەماشای لای ڕاستم کرد هیچم نەبینی تەماشای لای چەپم کرد هیچم نەبینی، تەماشای پێش خۆم کرد هیچم نەبینی، تەماشای پشت خۆم کرد هیچم نەبینی، سەرم بەرزکردەوە شتێکم بینی، {لە ڕیوایەتێکی

---

١) بڕوانە: (فتح الباري)، ج٨، ص٧١٠.
٢) (صحيح البخاري)، برقم: ٤٩٢٢.

دیکەی بوخاریدا هاتوە بە ژمارە (٤٩٢٤)، ئەو فریشتەیەم بینی، کە لە غاری (حراء) بۆ یەکەم جار هاتبوو بۆ لام **(فإذا الملك الّذي جاءني بحراء)**، کە لەسەر کورسییەك دانیشتبوو لەنێوان ئاسمانو زەوی، زۆر لێی ترسام تاکو کەوتم} دوایی چوومەوە بۆ ماڵێو بە خەدیجەم گوت: دامپۆشنو ئاوی ساردم پێداکەنو، ئاوی ساردیان پێدا کردمو پاشان دایان پۆشیم، پاشان ئەم ئایەتانە هاتنەخوار: (ئەی ئەو کەسەی خۆت لە نوێنێ وەرپێچاوە، هەڵسەو خەڵکی ئاگادار بکەوە، وە پەروەردگارت بە گەورە بگرەو، بەرگو پۆشاکت پاك بکەوەو، واز لە گوناه بێنە -وەك، کە هەر وازت لێهێناوە-، وە شت مەبەخشەو بەزۆری بزانی، وە بۆ پەروەردگاری خۆت ئارام بگرە) پاشان وەحی بەردەوام بوو.

چۆنیەتی دەلالەتی ئەم فەرمایشتەش لەسەر دیاریکردنی ماوەی ئەو پچڕانەی وەحی بەم جۆرەیە:

١) .. ڕستەی **(جاورت بحراء)** ماوەیەك لە ئەشکەوتی حیرادا لە خەڵوەدا بووم، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە ئەو ماوەیەی پێغەمبەر تێیدا چۆتە خەڵوەوە لە کاتی هاتنی وەحی دا ماوەی مانگێك بووەو مانگی ڕەمەزانیش بووە، چونکە بۆ یەکەمجار لە شەوی قەدردا وەحی بۆ هات وەك پێشتریش ڕوونمان کردەوە.

٢) ..ڕستەی **(فلما قضيت جواري)**، واتە: کاتێك، کە خەڵوەکەم تەواوکرد، دەریدەخات کە پێغەمبەر ﷺ ئەو مانگە کە مانگی ڕەمەزانە هەمووی لە خەڵوەدا بووە، وە دوای ئەوەی، کە تەواوی کردوە لە شاخ هاتۆتە خوار.

٣) ..ڕستەی **(فإذا الملك الذي جاءني بحراء)**، واتە: ئەو فریشتەیەم بینی، کە یەکەم جار لە ئەشکەوتی (حراء) هات بۆ لام، کەواتە ئەو ڕستەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەوجارە جاری دووەمی بووە (جبریل) ببینێ.

www.alibapir.com

٤) ئنجا وەك سەلماندمان كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی (٢١)ی ڕەمەزاندا بۆ یەكەم جار وەحی بۆ هاتوە، وەلەم فەرموودەیەشدا دەریخستوە جاری دووەم، كە (جبریل)ی بینیوە كاتێك بووە كە خەڵوە یەك مانگییەكەی تەواو كردوە، كەواتە: ئەم جاری دووەمە كە (جبریل)ی بینیوەو سەرەتای سوورەتی (المدثر)ی بۆ دابەزیوە، پاش كۆتایی مانگی ڕەمەزان بووە، واتە (١)ی شوال ئینجا دیارە كە ماوەی نێوان (٢١)ی (رمضان) هەتا (١)ی (شوال)یش (٩) یان (١٠) ڕۆژە.

كەواتە: پچڕانی وەحی بۆ ماوەی نێوان دابەزینی سوورەتی (العلق)و سەرەتای سوورەتی (المدثر)، یانی: (٩) یان (١٠) ڕۆژ بووە، نەك وەك هەندێك لە زانایان گوتوویانە: سێ مانگ یا سێ ساڵ!! بەڵكو چەند ڕۆژێك بووەو هیچی دیكە.

بۆیە دەتوانین زۆر بە دڵنیایی‌یەوە بڵێین:

(محمد)ی كوڕی (عبدالله)ی كوڕی (عبدالمطلب) ﷺ بە دابەزینی (إقرأ) پلەی پێغەمبەرایەتی (النبوّة)ی پێ بەخشراوەو بە هاتنی (المدثر)یش پلەی ڕەوانەكراوێتی (الرسالة)ی پێ دراوەو ماوەی نێوانی ئەو دوو ئەركەش (٩) یان (١٠) ڕۆژ بووە.

بەڵام ئەوەی هەندێك لە مێژوونووسانو زانایان گوتوویانە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ مانگ، یان سێ ساڵان وەحی لێ پچڕاوە، وە هەندێكیان دەڵێن سوورەتی (الضحى) كە خوای بەرز تێیدا دەفەرموێ: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ الضحى، واتە: پەروەردگارت وازی لێنەهێناویو لێت تووڕە نەبووە، هەر بەو بۆنەیەوەو بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خوار، ئەوانە هیچیان وانین، بەڵكو پێغەمبەر ﷺ لە (٩) یان (١٠) ڕۆژ زیاتر وەحی لێ نەبڕاوە.

پێش کۆتایی هێنان بەم باسەش بەکورتی ئامـاژە بـە جۆرەکـانی هـاتنی وەحـی بـۆ پێغەمبەر ﷺ دەکەین، کە وەك (ابن القیم)[1] دەڵێ: ئەم شـەشـەن:

١/ خـەونی ڕاست (الرؤيـا الصادقة).

٢/ (جبـریل) شتێك بـخاتە دڵی پێغەمبـەرەوە بێئەوەی ببینـرێ، وەك فەرموویـەتی: **((ان روح القدس نفث في روعي: أن نفساً لن تموت حتى تستكمل رزقها وأجلها، فاتقوا الله وأجملوا في الطلب))**، رواه ابن حبّان في صحيحه.

٣/ (جبـریل) لـە شـێوەی پیاوێـك دێتــە لای‌و شـتی پـێ ڕادەگەیـەنێ، ئـەم شـێوەیە هێندێك جار هاوەڵانی بەڕێزیشی بینیویانە.

٤/ هێندێك جار وەحی بۆ هاتوە لە شێوەی دەنگی جەرەسـدا، کـاتی وابـووە کـە بـەم شێوەیە وەحی بۆ هاتوە لە کاتێکی زۆر سەرمادا ئارەقەی پێدا هاتۆتە خوارێ.

٥/ (جبریل) لە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیدا هاتوەو پێغەمبەر ﷺ بینیویەتی‌و وەحی لـێ وەرگرتوە، کە ئەمە دووجار ڕووی داوە، وەك لە سوورەتی (النجم)دا هاتوە.

٦/ ئەو شێوازەی کە خـوای مـەزن لـە شـەوی (معـراج)دا وەحـی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ کردوە لەکاتێکدا کە لە سەرووی ئاسمانەکان بووەو نوێژی لەسەر واجب کردوە، کـە ئەمیان وەك قسەکردنی ڕاستەوخۆی خوا بووە لەگـەڵ مووسـادا: ﴿...وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾ النساء.

شایانی باسیشە، کە ئێمە لێکۆڵینەوەیەکی خەسـتوخۆڵمان لەبارەی وەحییەوە لە کتێبی (الإسـلام كما يتجلّى فـي كتاب الله)دا کردوە[2].

---

١) (ابن القیم) گوتوویەتی: حەوتن، بەڵام من پێم وایە شەش‌و حەوت هەریەکن‌و حەوت دووبارەی شەشە.
٢) لە (الفصل الخامس)ی (الباب الثاني) دا.

# حیکمـەتی هەڵـبژێـرانی پێغـەمبـەری کۆتـایی محـمـد ﷺ لەنێـو گـەلـی عـارەبدا

سەرەتا دەڵێم:

ئێمە وەکو مسوڵمان نەك هەر بۆمان هەیەو دروستە، بەڵکو شتێکی پەسندو جاری وا هەیە پێویستیشە کە لە حیکمەتەکانی خوای پەروەردگار بکۆڵینەوە، چ لە عالەمی خەلقی، چ لە عالـەمی ئـەمری دا، وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿... أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف، واتە: هەرچی دروست کراوە موڵکی خوایە، وە شەریعەتو فەرمانیش هەر لە لایەنی ئەوەوە هاتووەو هەر بۆ ئەوە، بەڵێ ئیسلام ئینسان هەڵدەنێ تاکو لە حیکمەتی شتەکان بکۆڵێتەوەو کوێرانە بەدوای شت نەکەوێو ئەو شتانەی دەگونجێ بچێتە بنجو بناوانیانەوە بەسەر کێڵیی لێیان نەڕوانێ، وە لـە ڕووی زانینو لێکۆڵینەوەوە بڕیار بداتو هەوڵبدا حیکمەتی بوونی شتەکان بەو شێوەیەی کە هەن بزانێ، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەستە چەند نموونەیەك لە قورئان دێنینەوە:

١ – فریشتەکان -سەلامی خوایان لێبێ- پاکترینو چاکترین دروستکراوی خوان بەگشتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا داوای حیکمەتی دروستکرانی (آدم) لە خوای پەروەردگار دەکەن، وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ... ﴿٣٠﴾﴾البقرة، واتـە: وە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: مـن دەمـەوێ جێنشینێك لەسەر

زەوی بۆ خۆم دابنێم، فریشتەکان گوتیان ئایا کەسێکی تێدا دەگێڕی بە جێنشین کە خوێن دەڕێژێ‌و خراپەی تێدا دەکات لە کاتێکدا، کە ئێمە تۆ بە پاك دەگرین لە هەموو کەم‌وکوڕییەك؟!

لێرەدا ئەو پرسیارەی فریشتەکان پرسیاری ڕەخنەگرتن نەبووە، چونکە بێگومان ئەوە لە مسوڵمانی عادەتیش ناوەشێتەوە چ جای فریشتەی بێ‌هەڵە، بەڵکو تەنها لە حیکمەتەکەی دەپرسن، کە داخۆ حیکمەت چییە خوای پەروەردگار (آدم)و نەوەکانی لە زەویدا دەکات بە جێنشین؟ بە بەڵگەی ئەوە کە دواتر خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ واتە: ئەوەی کە من دەیزانم ئێوە نایزانن، دوایی ناوەکان هەموو فێری ئادەم دەکات، پاشان لە فریشتەکان دەپرسێ: ئەو شتانە ناویان چییە؟؟ ئەوانیش نایزانن، وە ئادەم ناوی هەموو شتەکان هەڵدەدات، پاشان خوای پەروەردگار بە فریشتەکان دەفەرموێ: ئەدی پێم نەگوتن ئەوەی کە من دەیزانم ئێوە نایزانن، وە من ئەوەی کە ئێوە ئاشکراو پەنهانیشی دەکەن دەیزانم! کەواتە: لێرەدا فریشتەکان داوای حیکمەتی دروستکران‌و بەجێنشین دانرانی ئادەم دەکەن لە خوای پەروەردگار.

٢- هەروەها ئیبراهیم عليه السلام لە پەروەردگاری دەپرسێ: ﴿...رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي ٢٦٠﴾ البقرة، واتە: پەروەردگارم پیشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە؟ (خوای پەروەردگار) فەرمووی: ئایا ئیمانت نیە کە من دەتوانم مردووان زیندوو بکەمەوە؟! (ئیبراهیم) فەرمووی: با ئیمانم هەیە، بەڵام دەمەوێ دڵم ئارام بگرێ، کەواتە: ئەگەر ئینسانی مسوڵمان داوای حیکمەتی شتێك بکات لە خوای پەروەردگار بۆ ئەوەی کە ئیمانی پێ بەهێز بێ، ئەوە شتێکی زۆر چاکی کردوە، چونکە ئەوە ڕێبازی فریشتان‌و پێغەمبەرانە، وە ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین کەم حوکمی

شەریعەت هەیە کە خوای پەروەردگار بۆخۆی حیکمەتو عیللەتەکەی باس نەکردبێ، بەڵام لێزانییو ورد بینیی دەوێ تا دەیدۆزیتەوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار باسی نێردرانی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- دەکات، دوایش حیکمەتەکەی باس دەکات کە بۆچی پێغەمبەرانی ناردوون، کە دەفەرموێ: ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾ النساء، واتە: پێغەمبەران کەسانێکی مژدەدەرو ترسێنەرن بۆ ئەوەی خەڵك بەڵگەیان نەبێ لەسەر خوای پەروەردگار پاش هاتنی پێغەمبەران، وە خوا زاڵی کاربەجێیە.

وەك لێرەدا دەردەکەوێ حیکمەتی نێردرانی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- ئەوە بووە کە خەڵکی بیانوویان نەبێ، وە خوای پەروەردگار بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران-علیهم الصلاة والسلام- خەڵکی بیانووبڕ کردوە.

٣- هەروەها خوای بەخشندە لە باسی بەشایەدگرتنی دوو (شاهید)دا لە کاتێکدا کە مسوڵمان قەرز بەیەك دەدەن دەفەرموێ: ﴿...وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَىٰ ...﴿٢٨٢﴾﴾ البقرة، واتە: {ئەگەر قەرزتان بەیەکتردا} دوو کەس لە پیاوانتان بە شاهید بگرن، ئەگەر دوو پیاو نەبوون با پیاوێكو دوو ئافرەت بن، لەو شاهیدانەی کە خۆتان بە چاکیان دەزانن، دوایی حیکمەتی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی دوو ئافرەت لەجیاتی پیاوێکە، وەك دەفەرموێ: ﴿أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَىٰ﴾ کەواتە: حیکمەتەکەی ئەوەیە کە ئەگەر یەکێکیان لەبیری چۆوە ئەوی دیکە بیری دەخاتەوە، کەواتە ئافرەت لەبەر ئەوەی، کە سەرگەرمی

پەروەردەکردنی منداڵو کۆمەڵێك شتی ئافرەتانەیە، کە پەیوەستن بە سروشتی ئافرەتانەوە، ڕەنگە وای لێ بکەن، کە تەرکیزی زۆر نەبێ لەسەر کڕینو فرۆشتن، یاخود عاتیفەی بەسەردا زاڵ بێ، یان لەبیری بچێتەوە، جا ئەگەر دوو ئافرەت بن بیر یەکتری دەخەنەوە، کەواتە: حیکمەتەکەی ئەوەیە نەك ئەوەی کە ناحەزانی ئیسلام دەڵێن کە زوڵم لە ئافرەت کرابێ!.

٤- وە لە مەسەلەی سزای دەست بڕیندا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَـٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ المائدة، واتە: وە پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن ئەوە سزای ئەوەیە کە کردوویانە، دوایی حیکمەتەکەی بەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ نَكَـٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: ئەوە ترساندنێکە لەلایەن خواوە، چونکە (نکال) بەسزایەك دەگوترێ، کە خەڵکی پێ بترسێنن، کەواتە ئەو سزایەی، کە دەچەسپێندرێ بەسەر دزدا بۆ ئەوەیە، کە خەڵکی پێ چاوترساو بێو لە دزییو ڕێگریی دوور بکەونەوە.

ئەم چەند نموونەیەم بۆیە باس کردن بۆ ئەوەی بزانرێ، کە ئێمە لە حیکمەتی نێردرانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لە نێو عارەبدا دەکۆڵینەوەو باسی لێوە دەکەین، شتێکی زۆر ئاسایی‌یە، بەڵکو بۆ بەرپەرچدانەوەی ناحەزانی دینو کەسانێك کە بە نەزانیی یان بە زۆر زانیی دژایەتی دین دەکەنو لەو ڕووەوە ڕەخنە دەگرن، زۆر لە جێی خۆیەتیو بگرە پێویستیشە، جا ئێستا با چەند حیکمەتێکی ئەو مەسەلەیە بخەینەڕوو:

## یەکەم: کەسایەتی ناوازەو هەڵکەوتووی پێغەمبەر ﷺ:

یەکێك لە حیکمەتەکانی هەڵبژێررانی موحەممەد ﷺ بە پێغەمبەری کۆتایی ئەوەیە کە خاوەنی کەسایەتییەکی ناوازەو هەڵکەوتوو بووە، وەك خوای پەروەردگار لەچەند

www.alibapir.com


ئایەتێکدا ئامــاژەی پــێ دەکــات، بــۆ وێنــە: ﴿ وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ ...﴿١٢٤﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە کافرو بێبڕواکان کاتێك، کە موعجیزەیەکیان بۆ دێ، دەڵێن: بڕوا ناهێنین تاکو ئەوەی، کە دراوە بە پێغەمبەرانی خوا بە ئێمەش نەدرێ –واتە: پەیامو وەحی- جا خوای کاربەجێ لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾ واتە: خوا بۆخۆی زاناترە بەوە کە پەیامی خۆی لای کێ دادەنێ، کە لێرەدا مەبەست پێغەمبەری (خاتەم)ە ﷺ و بێگومان هەموو پێغەمبەرانی دیش لە سەردەمو ڕۆژگاری خۆیاندا باشترین خەڵکی سەردەمی خۆیان بوون، وە (محمد)یش ﷺ باشترین کەسی سەردەمی خۆیەتیو باشترین کەسیشە لەسەر ئاستی هەموو بەشەرییەت، چونکە ئەو تاکە پێغەمبەرێکە کە بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە.

هەروەها هەرلەوبارەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ ...﴿٣٢﴾ ﴾ الزخرف، واتە: کافرەکان گوتیان دەبووایە ئەم قورئانە لەسەر یەکێك لە پیاوەکانی نێو دووشارە گەورەکان هاتبایە خوار، ﴿کە مەبەستیان (مەککە)و (طائف) بووە﴾ ئایا ئەوانن کە ڕەحمەتی پەروەردگار دابەش دەکەن، ئێمە ژیانو گوزەرانیشمان بەسەریاندا دابەش کردوە، کەواتە ئەو ڕەحمەتە بۆیە دراوە بە (محمد) ﷺ، چونکە شایستەی ئەو ڕەحمەتەیە وەك خوای بەخشەر پێی فەرمووە: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ﴿١﴾ ﴾ الکوثر، واتە: ئێمە خێرێکی زۆر گەورەمان بەتۆ بەخشیوە، کە ئەو خێرە هەریەك لە پێغەمبەرایەتیو (نبوة)و حەوزی کەوسەرو تکاکردنی مەزن (الشفاعة العظمی) دەگرێتەوە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤ ﴾ القلم، واتە: سوێند بە قەڵەمو بەوەی کە پێی دەنووسن، تۆ بەهۆی نیعمەتی پەروەردگارتەوە (کە پێغەمبەرایەتی‌یە) شێت نی، بەڵکو تۆ پاداشتێکی نەبڕاوەت هەیە، وە بێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، کەواتە: حیکمەتی یەکەم پەیوەندی بە پێغەمبەرەوە هەیە، چونکە ئەو تایبەتمەندیی و هەڵکەوتوویەتییانەی لە پێغەمبەردا هەبوون ﷺ لە خەڵکی دیکەدا نەبوون.

## دووەم: هۆکاری شارستانێتی :

گەلانی ڕۆمو فارسو هیند، هەریەکەی شتێکیان هەبووەو لەڕووی ژیانی دونیاوە لە بەرەوپێش چوون دابوون، بەلام گەلی عارەب ئەوکات بێبەش بووە لە هەموو شێوەکانی ژیارو شارستانێتیو هەتا خوێندنو نووسینیشیان نەزانیوە، وەك خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ٤٨ ﴾ العنكبوت، واتە: تۆ (ئەی محمد ﷺ) لە پێش قورئاندا هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوەو هیچ شتێکت بەدەستی ڕاستت نەنووسیوە، چونکە ئەگەر خوێندنو نووسینت هەبوایە، بێبڕوایان دەکەوتنە گومانەوە، واتە: تۆ نە خوێندنەوەت هەبووەو نە نووسینیشت هەبووە، نەك هەر پێغەمبەر ﷺ بەڵکو قەومەکەشی هەر نەخوێندەوار بوونو خوێندنو نووسینیان نەبووە، وە لە هەموو لایەنەکانی ژیانو شارستانێتیدا لە پاش بوون، بەڵێ بۆیە خوای پەروەردگار لەنێو دواکەوتووترین میللەتدا پێغەمبەری خۆی نارد ﷺ، کە دوای هاتنی ئەو پێغەمبەرە لە هەموو ڕوویێکەوە بە هۆی ئیسلامەوە وەپێش هەموو شارستانیەتەکان کەوتنەوە،

بۆ ئەوەی خەڵك بزانن، کـە هۆکـارێکی غـەیری بەشـەری هاتۆتـە نێـو هاوکێشـەکەوە، ئەویش بریتیە لە وەحیو پەیوەست بوون بە پەیامی خوای پەروەردگـارەوە.

## سێیەم: هۆکـاری سیاســی :

ئەوکاتە نیوە دورگەی عارەبی لە ژێر کۆنتـڕۆڵی کەسدا نـەبووە، چـونکە هیچـی وای لێ نەبووە، کە ڕۆمو فـارس تـەماعی تێبکـەن بـێن داگـیری بکـەن، بـەڵکو بیابـانێکی کاکی بەکاکیو وشكو دێمەکار بووە، کە جێی تـەماعی هـیچ کـەس نـەبووە، ئـەوەش وای لێکردوە کە کەشو هەوایەك بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئەو کۆمـەڵە هاوەڵەی لەگەڵیـدا بـوون بڕەخسێ، کـە کیـانێکی وا دروسـت بکـەن هـیچ فشـارو هەیمەنـەو ترسـی ڕۆمو فارسیان بەسەرەوە نەبێو شوێنێکی گۆشەگیرو لاپەڕ بێ، بۆئـەوەی نـەمامی پـەیامی خوای تێدا بڕوێتو سەروبەر بگرێ.

## چوارەم : هۆکـاری جوگرافی :

نیوە دوورگەی عارەبی ئاسیاو ئەفریقا بەیەکەوە دەبەستێو لە ئەورووپاش دوور نیە، واتە: شوێنێکی نێوەند (وسـط)ە، وەکاتێك ئەو دیـمەنەمان بەچاکی دەکەوێتە بەرچاو، کە تەماشای نەخشەی سیاسی بڵاوبوونەوەی ئیسلام بکەین، کە چۆن لە نیوە دوورگەی عـارەبییەوە بە هەموو لایەکدا بڵاوبۆتەوە، کـە بەتەئکیـد ئەگـەر لـە شـوێنێکی دیکـە بووایە ئاسان نەبوو بەو شێوەیە بە هەمولایەکدا بڵاوبێتـەوە.

## پێنجەم : هۆکـاری ڕووحی :

(کەعبە) کە پەرستگایەکی بەڕێزی سەرجەم خـاوەن شـەریعەتە ئاسـمانییەکانە، لـە نیوە دوورگەی عـارەبیدا بووەو لەلایەن کەسێکیشەوە دروست کراوە کە خاڵی هاوبەشـی نێوان هەموو خاوەن شەریعەتە ئاسـمانییەکان بـووە، چـونکە (مسـوڵمانو نەصـڕانییو

جوولەکەو صائیبە) هەموویان ڕێزیان هەیە بۆ ئیبراهیم -علیە الصلاة والسلام-، بۆیە کەعبە وەك جەمسەرێکی ڕووحی بووەو خەڵکی بۆ لای خۆی پەلکێش کردوە، کە بێگومان هیچ شوێنێکی دیکە ئەو هۆکارە کاریگەرە ڕووحییەی لێنیە.

**شەشەم: هۆکاری کۆمەڵایەتی :**

گەلی عارەب ئەوکاتە وەکو کەرەسەیەکی خاو وابوو، کە لە هیچ قاڵبو بۆتەیەکدا شکڵی نەگرتبوو، وە کۆمەڵێك خەسڵەتو تایبەتمەندیشیان هەبوون کە بۆ هەڵگرتنو گەیاندنی دوا پەیامی خوا پێویست بوون، بۆ نموونە: گەلێکی ئازا بوونو ژیانێکی سادەیان هەبووەو ڕاستگۆ بوونو خاوەن بەڵێن بوون، وە ڕازاوە بوون بە سیفەتەکانی وەك: فیداکاریی‌و سەخاوەتو تەحەمول کردنی ژیانی نارەحەت، کە بێگومان ئەو سیفەتانەش زۆر پێویستن بۆ میللەتێك کە بۆ یەکەم جار پەیامی خوایان دەخرێتە سەرشان، بۆئەوەی بە زەویدا بڵاوی بکەنەوە، بۆ وێنە: ئەگەر ئەو دینە لەنێو گەلێکی وەك فارس‌و ڕۆم...هتددا هاتبایە خوار، کە ئەوکات بەهۆی زیادەڕۆیی‌و خۆشگوزەرانییانەوە تا ڕاددەیەکی زۆر کەوتبوونە جلێتاوی ڕەوشت نزمییەوە، ئایا دەیانتوانی ببنە هەڵگرو گەیەنەری ئەو پەیامەو هەموو شتێکی خۆیانی لەپێناودا بەخت بکەن؟! بێگومان نەخێر، چونکە پێغەمبەر ﷺ کە حەجی ماڵئاوایی (حجة الوداع)ی کردوەو زۆربەی مێژوونووسان ژمارەی هاوەڵە بەڕێزەکانی بە سەد (١٠٠) هەزار مەزەندە دەکەن، ژمارەیەکی زۆر لەوانە لەپێناو دینی خوادا شەهید بوون، کە ئەوە بەڵگەیە لەسەر فیداکاریی ئەو گەلە.

لێرەدا دەمەوێ سەرنجتان بۆ لای ئەوە ڕابکێشم، کە هەموو گەلو میللەتێك لە مێژووی خۆیدا بە بەرزیی‌و نزمییدا تێپەڕ دەبن، هەموو میللەتان کاتێك دەبێ، کە لە لووتکەدا دەبن، جاری واش هەیە سەرەو لێژ دەبنەوە، جا ئەوکاتە گەلی عەرەب خاوەنی کۆمەڵێ سیفەتی زۆر باش بوون، کە ئەو سیفەتانەیان یارمەتی داونو کردوونیە کەرەستەیەکی زۆر باش کە پێغەمبەر ﷺ کاکڵی ئەو دەوڵەتە ئیسلامیەیان

www.alibapir.com

لێ دروست بکاو بیانکاتە میللەتێك کە بتوانن پەیام‌و بەرنامەی خوا کە مایەی بەختەوەریی دنیاو دوارۆژە، بگەیەنن بە هەموو میللەتانی دیکەو ئامادەش بن، کە سەرو ماڵی خۆیانی لە پێناودا بەخت بکەن، کە بەداخەوە هەندێك کەسی نەزان لەبەرئەوەی کە تەنها عارەبی بەعسی شۆڤێنی بینیوە، هەڵدەستێ ڕاست‌و چەپێك بەسەر هەموو میللەتی عارەبدا دێنێ، کە ئەمە هەڵەیەکی گەورەو بێویژدانییەو لە هەموو میللەتێکدا چاك‌و خراپ هەیەو، ئیسلامیش مایەی چاکیی ئینسانەکانە.

## حەوتەم: هۆکارو حیکمەتی زمانەوانی :

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەندێك تایبەتمەندیی، کە لە زمانی عارەبیدا هەن، بەڵام لە زمانەکانی دیکەدا نین، کە بێگومان ئەوە پسپۆڕانی زمان دەیزانن، بۆ وێنە: مەسەلەی نێرینەو مێینە (التذكير والتأنيث)دا، ئەگەر بتەوێ بڵێی (پیاوێك هات) لەگەڵ ئەوەدا کە بڵێی (ئافرەتێك هات) جیاوازە، کە لە کەم زماندا شتی وا هەیە، یان مەسەلەی دووانە (المثنى) کە تەنها لە زمانی عارەبیدا هەیە، وە زۆر شتی دیکەی ورد لە بواری ڕاناوەکان (الضمائر)و لە بواری سەرو بۆرو ژێرو...هتددا، وە مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ ئەوەیە کە زمانی عارەبی ڕێگە دەدات قورئان بە (٧)و بگرە (١٠) جۆر بخوێندرێتەوەو هەر شێوەیەش مانای تایبەتی خۆی هەبێ، بێئەوەی کە لە چوارچێوەی زمان دەربچێ، بۆ وێنە: ئەو ئایەتەی کە (نوح) عليه السلام داوا لە خوای پەروەردگار دەکات، کە کوڕەکەی بۆ نەجات بدات، کە دەفەرموێ: ﴿... فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ هود، واتە: گوتی: پەروەردگارم کوڕەکەم لە ئەهلی منەو بەڵێنی تۆش ڕاستەو ئەتۆش لە هەموو فەرمانڕەوایان دادگەرتری، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ ...﴿٤٦﴾ هود﴾، هەروەها ئاواش خوێندراوەتەوە:

﴿إِنَّهُۥ عَمِلَ غَيۡرُ صَٰلِحٍ﴾ واتە: ئەی نووح تۆ چۆن دیفاع لەو کوڕەت دەکەی کە کردەوەی باشی نەکردوە؟ کە من ئەم خوێندنەوەیەی دووەمیانم هەڵبژاردوە، بۆ خۆ دوورگرتن لە ئیشکالێکی وەهمیی، کە لە بابای وردبین پەنهان نیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ به شێوەی ئاشکرایی و پەنهانیی

وەك پێشتر باسمان کرد خوا -عزّوجلّ- (محمد بن عبدالله) ﷺی کرد بە کۆتایی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- وە یەکەمین شت کە بۆی هاتۆتە خوارێ بریتی بوو لەو پێنج ئایەتەی سەرەتای سوورەتی (العلق) کە بە بناغەی تێڕوانینی ئیسلامیی دادەنرێن و ئەمانەن: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾﴾ العلق.

ئەم پێنج ئایەتە بەسەر یەکەوە هاتوون و ئایەتەکانی دیکەی ئەم سوورەتە لە دوای ئاشکراکردنی بانگەواز بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوونە خوار، چونکە باسی هەڵوێستی (أبو جهل) دەکەن لە بەرامبەر پێغەمبەردا ﷺ، کە بێگومان (أبوجهل) و باقی سەرانی دیکەی کوفر کاتێك ئەزیەت و ئازاری پێغەمبەریان دەست پێکردوە، کە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی خوای ئاشکرا کردوە، کەواتە پێنج ئایەتی یەکەم لەگەڵ ئایەتەکانی دواتریان لە سوورەتی (العلق) قۆناغی هاتنە خوارەوەیان جیایە، مانای ئەو پێنج ئایەتەش بەم شێوەیەیە: بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە دروستی کردوە، ئینسانی لە خوێن پارە دروستکردوە، بخوێنەو پەروەردگاریشت زۆر بەخشندەیە، ئەو زاتەیە، کە بەهۆی قەڵەمەوە -ئینسانی- فێر کردوە، ئینسانی فێری هەرشتێك کردوە کە نەیدەزانی.

ئەم پێنج ئایەتە ئەو حەوت حەقیقەتەیان لێ وەردەگیرێن، کە حەقیقەتو ڕاستی زۆر گەورەن، وە بناغەو بنەمای تێڕوانینو بوونناسیی ئیسلامیی دەربارەی ژیانو بوون پێکدەهێنن:

**یەکەم:** لە وشەی (اقرأ) وەردەگیرێ، ئەویش ئەوەیە، کە پێغەمبەرو ﷺ شوێنکەوتووانی دەبێ وەحی خوا بخوێننەوە، دیارە دەقێکیش، کە دەیخوێنینەوە، بۆ ئەوەیە، کە لێی تێبگەینو شارەزای بین، وە دوایش کاری پێبکەین، کەواتە بەرنامەی ژین دەبێ لە خواوە بێ (جل شأنه)، کە پێویستە ئینسان بیخوێنێتەوەو لێی تێبگاو کاری پێ بکات، وە بەپێی ئەوە ژیانی تاکیی و کۆمەڵیی خۆی ڕێك بخات، وە زۆر جێی سەرنجە یەکەمین وشە، کە خوای پەروەردگار ئاڕاستەی پێغەمبەری دەکا ﷺ دەفەرموێ: (بخوێنە) واتە: ئەو بەرنامەو وەحییە بخوێنەوە، کە خوا بۆت دەنێرێ.

**دووەم:** حەقیقەتی دووەم ﴿بِٱسۡمِ رَبِّكَ﴾ بەناوی پەروەدگارت، چونکە بەرنامەی (ژین) دەبێ لە پەروەدگارەوە بێتو بەناوی ئەویشەوە بێ، کە دروستکەری هەموو شتێکەو دەزانێ چ شتێك دەگونجێ لەگەڵ سروشتی ئینسانداو زانیارییەکەی بێ سنوورە.

**سێیەم:** لێرەدا وشەی (رب) بەکارهاتوە کە یەکێکە لە سیفەتەکانی خواو بە مانای پەروەردەکەرو بەخێوکەرو مشوورخۆرو گەورەو سەروەر دێت، وە بە مانای بەرنامەڕێژو پەرستراویش دێت، چونکە ئەوکەسە شایستەی ئەوەیە، کە بەرنامەی ژیان بۆ ئینسان دابنێ، کە پەروەردەکەرو مشوورخۆرو سەییدو بەدیهێنەری ئینسانانە، ئەویش خوای پەروەردگارە -جل شأنە- بۆیە خوای پەروەردگار وشەی ﴿رَبِّكَ﴾ بە: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ پێناسە دەکات، واتە ئەو پەروەردگارەی کە دروستی کردوە، کە لێرەدا (مفعول)ی (خَلَق) (محذوف)ە، واتە: نەیوتوە چی دروست کردوە، بۆئەوەی زەینی ئینسان بەرەو هەموو شتێك بچێ، چونکە هەرچی بەزەینی تۆدا دێ خوا خوڵقاندوویەتی، کەواتە تەنیا بەدیهێنەرو دروستکەری

هـەموو دروستــــراوەکان، شایستەی ئەوەیە، کـە پـەروەردگاری ئینسـان بێتو بەرنامەی بۆ دابنێ.

**چوارەم:** خـوای پـەوەردگار لـەنێو هـەموو دروستکراوەکانیدا باسـی (ئینسـان) دەکـا، چونکە ئینسان دروستکراوێکی زۆر ناوازەی خوای پـەروەردگارە، ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴾، واتە: ئینسانی لە خوێنپارە دروستکردوە، ئینسان لە ماوەی دروستبوونیدا بەچەند قۆناغێکدا دەڕوات، کـە خـوای پـەروەردگار لـە چـەند شـوێنێکدا باسـی کـردوون، وەك ﴿نُّطْفَـةٍ﴾، ﴿عَلَقَةً ﴾، ﴿ مُضْغَـةً ﴾، دوایـی ئێسـقان، دوایـی ئێسقانەکە بە گۆشت دادەپۆشرێ، دوایـی ڕووحـی بەبـەردا دەکـرێ، وە ﴿عَلَقَةً ﴾ بریتیە لەو ﴿ نُّطْفَـةٍ ﴾یەی کە گەشە دەکات دوایی خۆی بـە منداڵدانی ئافرەتـەوە هەڵدەواسێ، وەك ژیانداریکی زۆر بچووك کە بە چاویش نابینرێ، لێرەدا خوای زانا سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ئـەو سـەرەتای سـەرەتایە کـە ئێمـە زینـدەوەرێك بـووینو نەبینراوینو پەروەردگار ئێمەی لەوێوە هێناوەو کردووینـی بـە ئینسـانێکی تـەواو، کەواتـە: ئـەو خوایـەی ئـاوا ئێمـەی پـەروەردە کـردوە، هـەر ئـەویش دەتوانـێ لـە قۆناغەکانی دیکەی ژیانماندا ژیـانی سیاسـیو کۆمـەڵایـەتیو خێزانیو...هتـد، بـە بەرنامـەی خۆی پەروەردەمان بکات، وەك دەفـەرموێ: ﴿ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ ﴾ نـوح، واتـە: ئـەوە چـیتانە ڕێـزی خـوا نـاگرن، لەحاڵێکدا کە بەچەند قۆناغێك دروستی کـردوون؟! وە فەرموویـەتی: ﴿ ...خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ... ﴿٦﴾ ﴾الزمـــــر، واتـــــە: دروســــتکران دوای دروســتکران، یــان قۆنــاغ دوای قۆنــاغ لــەنێو ســێ تاریکییانــدا، کەواتــە: ئــەو پەروەردگارە حەکیمو زانایەی، کە ئێمەی لـەنێو سـێ تاریکیـداو لـەنێو منداڵـدانی

دایکماندا ڕێنمایی کردوە، هەر ئەویش دەتوانێ لە هەموو قۆناغەکانی دیکەی ژیانماندا ڕێنماییمان بکاتو بەرنامەی ژیانمان بۆ دابنێو هیدایەتمان بدات.

**پێنجەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴾ واتە: بخوێنەو پەروەردگاری تۆش زۆر بەخشەرە، (کریم) واتە: بەخشەر، (الأکرم)یش پلەی هەرەبەرزو باڵای (کریم)ە، ئەوەش بۆ ئەوەیە، کە ئینسان هەمیشە ئومێدەوار بێو، بە هیوای بەخششو چاکەی خوای پەروەردگار بێ.

**شەشەم:** کە خوای پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴾، واتە: خوا ئینسانی فێر کردوە بە هۆی قەڵەمەوە، کە لێرەدا خوای پەروەدرگار ئاماژە بە ڕۆڵی قەڵەمو پێنووس دەکات لە فێرکردنی ئینساندا، ئاماژەیە بە گرنگی دان بە هۆکارەکانی فێرکردن.

**حەوتەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴾، واتە: فێری ئینسانی کرد ئەوەی، کە نەیدەزانی فێری ببێ، لێرەدا ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەوەی خوای پەروەردگار لەڕێی پەیامێکدا، کە بە پێغەمبەراندا -علیهم الصلاة والسلام- ناردوویەتی بۆ بەشەرییەت، ئینسانی فێری شت کردوەو، کە ئینسان بەبێ ئەوە نەیدەتوانی بۆخۆی فێری ببێ، واتە: وەحی ئەو حەقیقەتو ڕاستییانە فێری ئینسان دەکات، کە ئینسان ناتوانێ بۆخۆی پەییان پێ بەرێ، خەڵکی وا هەیە دەڵێ: باشە بۆ خوای پەروەردگار باسی چۆنیەتی دروستبوونی تەلەفزیۆنو بەرهەمەکانی دیکەی تەکنەلۆژیای نەکردوە...؟

وەڵامەکەی ئەوەیە، کە ئەوشتانە لەژێر تواناو قەڵەمڕەوی ئینسان دانو، ئینسان بۆخۆی دەتوانێ ئەو شتانە دروست بکات، بێئەوەی بگەڕێتەوە بۆ وەحی، بەڵام خوای کاربەجێ ئەوشتانەی خستۆتە نێو وەحی خۆیەوە، کە ئینسان لەڕێی عەقڵەوە پەییان

پێ نابات. نەك شتانە كە ئینسان بەهۆی عەقڵی خۆیەوە پەییان پێ دەباو لەژێر قەڵەمڕەوی عەقڵیدان، كە خوای زانا بە پێویستی نەزانیوە لەڕێی پێغەمبەرانەوە -علیهم الصلاة والسلام- ئینسانیان لێ ئاگادار بكاتەوە.

لێرەدا بۆمان هەیە ئەو پرسیارە لە خۆمان بكەین: بۆچی یەكەمین وشە، كە خوا ئاراستەی پێغەمبەری ﷺ دەكا (اقرأ)ە بخوێنەیە؟

بۆچی پێی نەفەرمووە، كە خوا بناسەو، باسی ئیسپاتی بوونی خوای نەكردوە؟! بۆچی باسی بەدیهێنەرایەتی خوای نەكردوە؟!

بەبۆچوونی بەندە هۆیەكەی ئەوەیە، كە قەناعەت هەبوون بە پەروەردگاریێتیو بەدیهێنەرایەتی خوا، شتێكی خوارسكە لە سروشت (فطرة)ی ئینسانەكاندا، وە پێویستی بە فێركردن ناكات، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی موشریكەكان دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾ الزخرف، یان دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الزخرف، واتە: ئەگەر لێیان بپرسی: كێ ئاسمانەكانو زەویو خۆشیانی دروست كردو؟ دەڵێن: (خوا)، كەواتە: خوای پەروەردگار نە لێرەو نە لە هیچ شوێنێكی دیكەشدا بە پێویستی نەزانیوە، كە بۆ پێغەمبەری خۆی ﷺ لەو نوختەوە دەست پێبكات، كە لە سروشت (فطرة)ی ئینسانەكاندا هەیە، كە بریتیە لە خواناسین، بەڵكو هەمیشە خوای پەروەردگار لەگەڵ پێغەمبەراندا -علیهم الصلاة والسلام- لەو خاڵەوە دەستی پێكردوە، كە بە ئۆممەتو میللەتەكانیان ڕابگەیەنن: چۆن خوا بپەرستنو بەندایەتی بۆ بكەنو چۆن خوای بەرزو مەزن لە خۆیان ڕازی بكەن؟! چونكە خەڵك زانیویانە، كە خوا هەیە، بەڵام نەیانزانیوە چۆن ڕەفتاری لەگەڵدا بكەنو، چۆنی بپەرستن، وە ئایا ئەو خوایە چی پێ چاكەو چی پێ خراپە؟ یان چی حەڵاڵ كردوەو چی حەرام كردوە؟، بەڵام كە خوای پەروەردگار لە قورئاندا لە زۆر

شوێنان باسی بەدیهێنەرایەتیو ناوو سیفەتە بەرزەکانی خۆی دەکات، ئەوە بۆ ئەوەیە، کە خەڵکی زیاتر خوا بناسنو بە سیفەتەکانی باشتر ئاشنا بن.

ئنجا دوای ئەو (٥) ئایەتەی سەرەتای سوورەتی (العلق) خوای پەروەردگار (٧) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (المدثر)ی بۆ پێغەمبەر ناردن، کە پێی فەرمووە: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴿٧﴾﴾، واتە: ئەی ئەوکەسەی، کە خۆت لە نوێنێ وەرپێچاوە! هەڵسە پێو ئاگادار بکەوە، وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە، وە بەرگو پۆشاکت-یاخود پەرێزت- پاك بکەوە، وە واز لە گوناح بێنە، وە ببەخشەو بەخشینەکەشت بە زیاد مەزانە، وە بۆ پەروەردگاری خۆت ئارامگر بە.

ئەم حەوت ئایەتەش کۆمەڵێك بەهاو حەقیقەتی زۆر گەورە دەگرنە نێو خۆیان، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکراوە لەبەر ڕۆشنایی ئەو حەقیقەتانەی لەم حەوت ئایەتانەدا هەن دەست بەکار ببێو، بێگومان بۆ ئێمەو بۆ هەرکەسێکیش کە بیەوێ لەڕێی پێغەمبەرەوە -علیه الصلاة والسلام- بڕواتو بەشوێن پێی ئەودا هەنگاو هەڵێنێ، جێی خۆیەتی زۆر باش سەرنجی ئەم (٧) ئایەتانە بدا، جا من (٩) حەقیقەتم لێ هەڵهێنجاون، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

**یەکەم/** لە ئایەتی یەکەمدا کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾ ئەی ئەو کەسەی، کە خۆت لە نوێنێ وەرپێچاوە!، وشەی (مدثر) لە ئەسڵدا (مُتَدثِّر)ە، وە (دثار)یش بریتیە لەو شتەی کە ئینسان لەکاتی نووستندا خۆی پێ دادەپۆشێ، وە (شعار)یش ئەوەیە کە لەسەر پێستەوەیە، واتە بەرگو پۆشاك، دیارە ئەم تەعبیرە لێرەدا جۆرێکە لە قسەی خۆش لەگەڵکردن (ملاطفة)ی پێغەمبەر، وەك جارێکیان پێغەمبەر ﷺ بە (عەلی) ئامۆزای دەفەرموێ: **((قم يا أبا تراب))**، لە کاتێکدا، کە (عەلی) -خوا لێی ڕازی بێ- لە مزگەوتێدا نووستبوو تۆزو خۆڵی بە جەستەوە

www.alibapir.com

نووسابوو، وە ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێت، کە ئەگەر کەسێك بیەوێ پەیامی خوا هەڵبگرێو خەمی دینی خوای لەبەربێ، چونکە ئینسانێکی ئاسایی نیە، نابێ وەك خەڵکی ئاسایی بژیو، وەك چۆن خەڵکی ئاسایی دەخەونو دەخۆنو..هتد، وەك وان بێ، جا ئەوە چ پێغەمبەری خوابێ ﷺ کە لەپێش هەموو کەس دایە، چ هەر کەسێکی دیکە بێ، کە بە ڕێی ئەودا بڕوا، وە بە ئەندازەی ئەوە، کە دەیەوێ پەیڕەوی لە پێغەمبەر ﷺ بکات، بەو ئەندازەیەش دەبێ بە سیفەتو ئاکارەکانی ئەو خۆی برازێنێتەوە.

**دووەم/** حەقیقەتی دووەمیش لە وشەی ﴿قُمْ﴾ دایە، کە بە واتای (هەڵستەپێ) دێ، چونکە کەسێك دەتوانێ کاریگەری هەبێ لەسەر خەڵکی و بیانخاتە کارو هەڵیانبستێنێ، کە بۆخۆی وریاو ئامادەو هەڵستاوبێ، هەر بۆیە خوای پەروەردگار کاتێك باسی (أصحاب الکهف) دەکات، دەفەرموێ: ﴿... إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ... ﴿١٤﴾﴾ الکهف، واتە: کاتێك هەڵستانە پێو گوتیان پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوییە.

بۆیە ئینسانی ئیماندار، گەر بیەوێ گۆڕانکاریی بکات، پێش ئەوەی قسەیەك بکات، پێویستە بە کردەوە لەخۆیدا هێنابێتیە دیو لە مەیدانی کارو کردەوەدا قسە بکات.

**سێیەم/** حەقیقەتی سێیەم لە وشەی ﴿فَأَنذِرْ﴾ وەردەگیرێ، وشەی (إنذار)یش بە: (إعلام مع تخویف)، واتە: ئاگادارکردنەوە لەگەڵ ترساندا ماناکراوە، وە ئەوەی جێی سەرنجە لێرەدا ئەوەیە کە لە قورئاندا مەگەر چۆن ئەگەرنا هەمیشە (إنذار)و (تبشیر) بەیەکەوە هاتوون، وەك دەفەرموێ: ﴿...بَشِيرًا وَنَذِيرًا ...﴾، یان ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾، بەلام لێرەدا بە تەنیا (إنذار)ە، چونکە لە

قۆنـاغـی یەکەمـدا پێویسـتـە خـەڵك بێـدارو هۆشـیار بکرێتـەوەو هەڵسـێنرێتە پـێ، نێوەڕۆکـی ئەو (إنـذار)ەش ئەم ئایەتانەو ئایەتـەکانی دیکـەی قورئـان دەیگرنـە نێـو خۆیان، کە بریتیـــە لەوەی: خوا بناسیو بزانی، کە ئەو بوونەوەرە بێ خاوەن نیە، وە بزانی کـە تـۆ بـەبێ هـوودە نەخولقـاویو، ئامـانجێـك بـۆ ژیـانی تـۆ دیـاری کـراوەو حیکمەتێـــك لـــە پشـــت دروســـتکرانی تـــۆوە هەیـــە، هـــەروەها ڕێگەیـــەکت بـــۆ دیاریکراوەو دەبێ بەو ڕێیـەدا بـڕۆی، وە مـەنزڵگایـەكو هەوارگەیـەکت هەیـــە، کـە بەرەو ئـەوێ دەڕۆی، ئەو (إنذار)ە دەبێ نێوەڕۆکەکەی ئەوە بـێ، کـە ئـەو ڕاسـتییانە بە خەڵکی ئاشنا بکات.

**<u>چوارەم/</u>** حەقیقەتی چوارەمیش لەوەدایـە، کـە دەفـەرموێ: ﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾ واتـە: وە پـەروەردگارت بـە گـەورە بگـرە، دیـارە لێـرەدا مەبەسـت تـەنها لـە بەگـەورەگرتنی زارەکیی (لفظي) نیە، کە بەس بڵێی (ألله أکبر)، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە بە قسە بڵێی (ألله أکبـر) وە بە کردەوەش بیسەلمێنی کە خوا لە هەموو شتێك گـەورەترە، وە قەناعـەتو فیکرو دڵو دەروونت وای لێبێ کە لەخوا گەورەتری تێـدا نـەبێ، ئـەویش بەوە کە هەرچی خوا دەیفەرموێ هەوڵی جێبەجێکردنی بدەیو بەپێی فەرمانی ئـەو بەڕێوە بچی، وە هیچ شتێك لە دڵی تۆدا گـەورەتر نـەبێ لـە ئیهتیمـامو گرنگـی دان بەوەی کە چۆن خـوا لـەخۆت ڕازی بکـەی؟ وە چۆن شـەریعەتو بەرنامـەی خـوا لـە ژیانی خۆتو خەڵکدا پیادە بکەی؟، ئنجا بە هەڵوێسـتیش خـوا بەگـەورە بگـری بـە جۆرێك، کە هەرکەسێك تەماشای ژیانی تۆی کرد ئەوەی تێدا ببینـێ، کـە بەڕاسـتی خوا لەلای تۆ لە هەموو شتێك گەورەترە، کەواتە: پێویستە ئەوە بە کردەوە ئیسپات بکەی، ئەگەرنا ئەگەر ئینسان هـــەزار جار بڵێ: خوا گەورەترە (ألله أکبـر)، بەڵام بە ڕەفتارو کردەوە ـشتی دیکە پێش فەرمانی خوا بخات، ئەوە مانای وایە ئـەوەی، کـە بە زار گوتوویەتی بە کردەوە هەڵیوەشاندۆتەوە!!، جا با سـەرنج بـدەین داخـۆ بۆچـی خوای پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکاتو پێی دەفەرموێ: پەروەردگارت

بە گەورە بگرە!! چونکە ئینسان لەڕێی دینداریی کردنو حەق گوتنو خەڵك بانك کردن بۆ لای خوادا تووشی دەیان یاخود سەدان کۆسپو لەمپەر دێ، جا ئەگەر خوات لا زۆر گەورە نەبێ، ئەوا هەڕەشەو گوڕەشەی خەڵکت لا گەورە دەبێو، ترسو تەماعت لا گەورە دەبێو دنیاو ئەوەی کە تێیدایە لات گەورە دەبێو ئەوانەش هەموو دەبنە کۆسپو لەمپەر لە نزیکبوونەوەت لە خواو دەتگێڕنەوە بەرەو دوا، بەڵام کە خوای پەروەردگار لە دڵی تۆدا لە هەموو شت گەورەترو بەڕێزترو خۆشەویست تر بوو، ئەو شتانەی دیکەت هەموو لەلا بچووك دەبنەوەو ناتوانن پاشەکشەت پێ بکەنو کاریگەریی خراپیان هەبێ لەسەرتو ڕێگەت لێبگرن.

**پێنجەم/** پێنجەم حەقیقەت، کە لەم ئایەتانە وەردەگیرێ ئەوەیە، کە دەفەرموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ وشەی (ثیاب) کۆی وشەی (ثوب)ە واتە بەرگو پۆشاك (طَهِّـر)یش یانی: پاکی بکەنەوە، وە وشەی (طهر) زیاتر بۆ باری مەعنەویی بەکاردێو وشەی (نظافة) زیاتر بۆ باری ماددیی بەکاردێ، کە لێرەدا واپێدەچێ هەردوو دیوەکەی پێ مەبەست بێ، واتە: هەم مانا ڕواڵەتییەکەیو هەم مانا مەجازییەکەی وەك عارەب دەڵێن (فلان طاهر الذيل)، واتە: (فلان کەس داوێنی پاکە، یان پەرێزی پاکە)، کەواتە لێرەدا دەتوانین بڵێین: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ یانی هەرچی پیسو پۆخەڵیی ماددییو مەعنەویی هەیە لە خۆتی دوورخەرەوە، چونکە بەرەو خوایەکی هەرە پاكو چاك بانگەواز دەکەی، بۆیە بۆخۆشت پێویستە هەوڵ بدەی هەرچی زیاتر خۆت پاكو چاك بکەی، چونکە کەسێك خەڵکی پێ چاك وپاك دەکرێ، کە خۆی وابێ.

**شەشەم/** حەقیقەتی شەشەم لەو ئایەتە دایە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ﴾ واتە: وە واز لە هەرچی خراپەو پیسیو گوناح هەیە بێنەو تەرکی بکە وەك تەرکت کردوە، چونکە تۆ پێویستە خەڵکی دوور بخەیتەوە لە هەرچی خراپەو گوناهو پیسی یە، جا بۆ ئەو مەبەستە ئەگەر دەتەوێ خەڵکی پاکسازیی بکەی دەبێ، بۆ خۆت پاك بی، وە ئەگەر بتەوێ خەڵکی چاکسازیی بکەی، دەبێ بۆخۆت چاك بی.

**حەوتەم و هەشتەم/** حەقیقەتی حەوتەم و هەشتەمیش لەو ئایەتە وەردەگیرێن، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ﴾، واتە: وە کاتێك چاکە لەگەڵ خەڵك دەکەی چاکەکەت لەبەرچاو زۆر نەبێ، وەك کوردەواری خۆمان دەڵێن: (چاکە بکەو بە ئاوێی دادە) یان (چاکە بکەو لەبیری بکە)، جا ئەو چاکەیەش بریتیە لەوەی کە دینی خوایان پێ ڕابگەیەنیو تێبگەیەنیو شارەزایان بکەی، جا ئەوە بەزۆر مەگرە، چونکە لەپێناو خوادا هەموو کردەوەو چاکەو ماندووبوونێك هەر کەمە.

**نۆیەم/** حەقیقەتی کۆتاییش لەو ئایەتەدایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ﴾ واتە وە بۆ پەروەردگارت خۆڕاگرو پشوو درێژ بە، وشەی (صبر) یانی: خۆ حەبس کردنو خۆ ڕاگرتن، جا ئەگەر سەرنجی ئایەتەکانی قورئان بدەین چەمك (مفهوم)ی وشەی (صبر)مان باشتر بۆ دەردەکەوێ، بۆ وێنە خوای مەزن لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿... وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ... ﴿١٧٧﴾﴾ البقرة، واتە: وە خۆ ڕاگران لەکاتی نەدارییو نەخۆشیو لەکاتی جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەدا، هەروەها لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٥٥،١٥٦)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾﴾ البقرة.

کەواتە: هەم پێغەمبەر ﷺ، کە ئەرکێکی گەورەی خوایی لەسەر شانەو گۆڕانکاریی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دەکات بەرەو ڕێی خواو سەرفرازی، وە هەرکەسێکیش ڕێی ئەو بگرێو کاری ئیسلامیی ئەنجام بدات، بێگومان تووشی چەندین گرفتو ئازارو ناڕەحەتیی دەبێ، بۆیە پێویستە ئارامگر بێو لە بەرانبەر گرفتەکاندا چەسپیو بێ.

لەوەی ڕابرد ئەوەمان بۆ دەرکەوت، کە خوای بەخشندە چۆن پێغەمبەر ﷺی ئاراستە کردوە، کە بە چ شێوەیەك خەڵکی بانگ بکات بۆ ئیسلام‌و مەبەست لە بانگەوازەکەی چی بێت؟ وە هەڵسوکەوتی بە گشتی چۆن بێت؟ کە بێگومان پێغەمبەریش ﷺ بەوپەڕی دڵسۆزیی‌و لێزانانە هەوڵی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پەروەردگاری داوەو بەو شێوەیەی پێویستە جێبەجێی کردوون.

بەڵکو ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەمووی بریتی بووە لە جێبەجێکردنی قورئان‌و لەخۆدا بەرجەستەکردنی ئەو ئایەتانەی بۆی هاتوونە خوار، ئەوەش کە ئێمە ئێستا دەڵێین: شەریعەت دوو سەرچاوەی ڕوونی هەیە: (قورئان‌و سوننەت) لەڕاستیدا سوننەتیش هەرچۆنیەتی جێبەجێکردنی قورئانە، وشەی (سنة)یش لە قورئاندا بە مانای یاساو قانونی خوا دێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ... ﴿٦٢﴾ ﴾ الأحزاب، وە پێغەمبەریش ﷺ وشەی (سنة)ی وەك زاراوەیەکی عورفی بەمانای (ڕێباز) بەکارهێناوە، کەواتە: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ واتا شێوازو ڕێبازی پێغەمبەر لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوادا، وە جاری وا هەبووە بۆ جێبەجێکردنی هێندێك لە ئایەتەکانی خوا، خوای زاناو توانا (جبريل)ی ناردوە تا فێری بکات‌و، هێندێك جاریش خوا بە ئیلهام خستوویەتە دڵی پێغەمبەرەوە، کە ئەو ئایەتانە چۆن جێبەجێ بکات! هێندێك جاریش پێغەمبەر ﷺ ئیجتیهادی کردوە، کە ئەو فەرمانە ئاوا جێبەجێ دەکرێ، جا ئەگەر لە ئیجتیهادەکەیدا پێکابێتی ئەوا خوای کاربەجێ لێی گەڕاوەو، ئەگەر بە هەڵەشدا چووبێ، خوای مەزن بۆی ڕاست کردۆتەوە، جا ئەگەر لە (اجتهاد)ەکەیدا پێکابێتی ئەوا دوو پاداشتی بووە، خوای پەروەردگاریش (إقرار)ی لەسەر کردوە، وە ئەگەر لە (إجتهاد)ەکەیدا نەیپێکابێ، خوای پەروەردگار بۆی ڕاست کردۆتەوە، بەڵام ئەجرو

پاداشتێکی هەر هەبووە[١]، کەواتە: ئەوەی کە لە قورئاندا وەك گوناه (ذنب) پاڵ دەدرێتەی لای پێغەمبەر ﷺ وەك سەرەتای سوورەتی (الفتح)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ... ﴿٢﴾﴾، واتە: ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان بۆتۆ ڕەخساند بۆئەوەی، کە خوا لە گوناهی پێشیی و دواییت خۆش بێ، لێرەدا مەبەست لە (گوناح) بۆ پێغەمبەر ﷺ، واتە: نەپێکانی لە (إجتهاد)دا، ئەگەرنا هیچ پێغەمبەرێك هیچ گوناهێکی نەکردوە، کە زانیبی ئەوە گوناهە، بەڵکو ئەوەی، کە بۆ پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- باسکراوە، وەك هەڵەو کەموکوڕیی و گوناه، هەمووی بریتی بووە لە هەڵەی (إجتهاد)یی، واتە: شتێك وایانزانیوە، کە ئاوا چاکە، بەڵام خوای پەروەردگار جۆرێکی دیکەی پێ چاك بووە.

١) وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إذ حكم الحاكم فاجتهد ثم أصاب فَلَهُ أجران، وإذا فاجتهد ثم أخطأ، فَلَهُ أجرٌ)) رواه البخاري: ٧٣٥٢.

www.alibapir.com

# یەکـەمیـن کەسـانێك کـە ئیمانیـان بە پێغەمبـەرایەتی ( محمـد ) ﷺ هێـنا

## یەکـەم: خدیـجة بـنـت خویلـد:

وەکـو گوتـمان پێغەمبـەر ﷺ زۆر بـە دانـایی‌و وەسـتایی، دەسـتی کـردوە بـە بانگەوازو، کێ زۆری لێ نزیك بووە، یەکەم جار قسەی لەگەڵ ئەودا کـردوە، بۆیـە پێش هەموو کەس، لە هاوسـەری دڵسـۆزو وەفـادارو عـاقڵو تێگەیشـتووی (خدیـجة بنت خویلد)، دایکی مسوڵمانانەوە -خوا لێی ڕازی بێ- دەستی پێکردوە، هەرچـەند لە کتێبەکانی (سیرة)دا گوتراوە، کە (خدیـجة) یەکەم کەس بووە لـە ئافرەتـان، بـەڵام بـە تەئکیـد یەکـەم کـەس بـووە بـە موتڵـەقی لـە پیـاوو ئـافرەتو وردو درشـت، کـە مسـوڵمان بـووەو ئیمـانی هێنـاوە، بێگومـان ئـەوەش شـایەدییەکی زۆر گەورەیـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، چـونکە هاوسـەری ئینسـان لـە هـەموو کـەس ئاشـناترە بـە هاوسەرەکەی، واتە: پیاو لە هەموو کەس زیاتر ژنی خۆی دەناسێ، ژنـیش لـە هـەموو کەس زیاتر مێردی خۆی دەناسێ.

(خدیـجة) -خـوا لێـی ڕازی بێـت - کاتێـك، کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە ئەشـکەوتی (حیـراء) گەڕایەوە، دڵی دایەوەو پێی گوت: نـەخێر مـوژدەت لێبـێ، بـە خـوا، خـوا قەت ناهێڵێ تۆ تووشی زەبوونیی‌و عـەیبـداریی ببـی، دوایـی کۆمـەڵێك سـیفەتی لـێ هەڵدەدا، کەواتە خەدیـجە لە ڕووی شارەزایی‌و ئاشنایی هەبوونی بەو مێردەی خۆیـەوە زانیویەتی، کـە (مـحمـد) ﷺ جگـە لـە شـتی چـاك‌و بـاش، هـیچ شـتێکی دیکـەی شـایسـتە نیە، هەر بۆیەش یەکەمین کـەس، کـە ئیمـانی بـە پێغەمبـەر ﷺ هێنـاوە،

(خديجة) بووە -خوا لێی ڕازی بێت-. کە پێغەمبەر ﷺ لە وەصفیدا فەرموویەتی: **{خير نسائها مريم وخير نسائها خديجة}** رواه البخاري[١]، واتە: چاکترین ئافرەتی ئۆممەتی عیسا مەریەمەو چاکترین ئافرەتی ئۆممەتی موحەممەد خەدیجەیە.

## دووەم: علي بن أبي طالب :

دووەمین کەس، کە ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە (علي بن ابي طالب) بووە -خوا لێی ڕازی بێت-، کە ئەوکات تەمەنی (١٠)ساڵ بووە[٢]، بۆیەش لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ بووە، چونکە کاتی خۆی (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ نەداربووەو هێندێك لە خزمەکانی، کوڕەکانی (أبو طالب)یان گرتوونە لای خۆیان، بۆئەوەی بەخێویان بکەنو باری شانی سووك بکەن، پێغەمبەریش ﷺ عەلی هێنایە لای خۆی، جا عەلی -ڕەزای خوای لێبێ- هەر لە ماڵی پێغەمبەردا بووە ﷺ، یەکەمین کەسیش لە منداڵان، ئەو ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، لە کتێبەکانی سیرەدا هاتوە، کە عەلی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، بەڕۆژێ نەیانویستوە لە مەککەدا لەپێش چاوی موشریکەکان نوێژ بکەن، بۆیە دەچوونە شیوو دۆڵەکانی مەککەو، بەیەکەوە نوێژیان دەکردو ئێوارە دەگەڕانەوە ماڵ[٣].

---

١) صحيح البخاري: (٣٨١٥).

٢) بڕوانە: (السيرة النبوية لأبن شهبة)، ج:١، ص (٢٨٤)، هەروەها: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج:١، ص (١٢٦).

٣) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

## سێیەم : زید بن حارثة :

سێیەمین کەس، کە ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، زەیدی کوڕی (حارثة) بوو، کە یەکێك بوو لەو کۆیلانەی، کە پێغەمبەر ﷺ ئازادی کردوەو، پێشتر دراوە بە (خدیجة)و ماوەیەکی کەم کۆیلەی ئەو بووە، دوایی پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردوە کە بیداتێ ئەویش زەیدی داوە بە پێغەمبەرو ﷺ دواتر کردوویەتی بە کوڕی خۆی -پێش ئەوەی وەحی بۆ بێ- ئنجا بابو خزمو کەسی زەید هاتوون بۆلایو ویستوییانە داوا لە پێغەمبەر ﷺ بکەن لەگەڵ خۆیانی ببەنەوە، پێغەمبەریش ﷺ پێی گوتوە: ئەگەر پێت خۆشە لای من بمێنەوە، ئەگەر پێشت خۆشە بچیتەوە ئەوە بڕۆوە، بەڵام زەید مانەوەی لای پێغەمبەری ﷺ هەڵبژاردو لەگەڵ بابو کەسەکانی نەڕۆیشتەوەو لە وەڵامدا، کە بابو خزمەکانی گلەییان لێکردوە گوتوویەتی: ئێوە نازانن ئەوە چ پیاوێکە چەندە جوامێرو بە شەهامەتو بە ڕەحمو چاکەکارە! دەمەوێ هەر لە خزمەتی ئەودا بم، دواتر پاش ماوەیەك پێغەمبەر ﷺ ئازادی کردوە، ئەوەش دیسان شایەدییەکی دیکەیە، کە (محمد) ﷺ پێش پێغەمبەرایەتیش ڕەوشتو ئەخلاقو ئەدەبێکی یەکجار بەرزو جوانی هەبووە، وە پێغەمبەریش ﷺ لە پاداشتی ئەوەدا کە زەید لەگەڵ خزمەکانی خۆیدا نەچۆوە کردوویەتی بە کوڕی خۆی، کە لەنێو عارەباندا ئەوشتە باوبووەو هەرکەسێك کەسێکی زۆر خۆش ویستبایە دەیکرد بە کوڕی خۆی، کە پێی دەگوترا (المُتَبَنَّى)، واتە: زەید بۆتە (مُتَبَنَّى)ی پێغەمبەر ﷺ، کە دوای هاتنی ئیسلام ئەوەی هەڵوەشاندۆتەوە، هەر بۆیەش خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ:﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ ... ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: (محمد) بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە، چونکە هەتاکو خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ زەید هەرپێی دەگوترا: (زید بن محمد) دوایی ناوی گۆڕرا بە: (زید بن حارثة) لەبەرئەوەی، کە خوای کاربەجێ فەرموی: موحەممەد

www.alibapir.com


بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە، واتە بابی زەید نیەو هەرکەسە بەناوی بابی خۆیەوە بانگ بکەن[١].

## چوارەم: کچەکانی پێغەمبەر ﷺ :

کچەکانی پێغەمبەریش ﷺ یەکەمین کەسانێك بوون لەنێو مالّی پێغەمبەردا ﷺ، کە ئیمانیان بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، کە بریتی بوون لە: (زینب، أم کلثوم، رقیة، فاطمة) -خوا لێیان ڕازی بێ-[٢]، کەواتە: مالّی پێغەمبەر ﷺ خەدیجەو کچەکانیو، زەیدی کوڕی (حارثة)، کە بەکوڕکراو (مُتَبَنَّی)ی بووەو، عەلی کوڕی (أبو طالب)، کە ئامۆزای بووە، هەموویان یەك خێزانو یەکەمین خێزانی مسولّمان کە دروست بووە ئەو خێزانەی پێغەمبەربوو ﷺ، بۆیە دەتوانین بلّێین: لە کۆمەلّگای ئیسلامییدا ئەو خێزانەی پێغەمبەر ﷺ یەکەمین خشت بووە، وە لە ڕێکخستنی کۆمەلّی ئیسلامیی یەکەم (الجماعة الأسلامیة الأولی)دا، ئەو خێزانەی پێغەمبەر ﷺ یەکەمین شانە بووە، ئاشکراشە کە خێزانی مسولّمان (الأسرة المسلمة) یەکەمین خشتی بنیاتنانی کۆمەلّگای ئیسلامییەو، شانە (خلیە)ش یەکەمین هەنگاوی سەرهەلّدانو پێکهێنانی کۆمەلّێکی ئیسلامییە.

## پێنجەم: (أبوبکر الصدیق) لە دەرەوەی مالّی پێغەمبەر ﷺ :

یەکەم کەس لە دەرەوەی مالّی پێغەمبەر ﷺ، کە ناودارو کەسایەتی مەککە بووەو ئیمانی بە پێغەمبەر هێناوە ﷺ دوای ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ قسەی بۆ کردوە(أبوبکر الصدیق) بووە، -خوا لێی ڕازی بێ-، وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئیمان هێنانی (أبوبکر) ئاوای فەرمووە: **{ما دعوت أحداً إلى الإسلام إلا كانت**

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص١٢٧.

٢) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص٩٧-٩٨ .

**عنده كبوة وتردد ونظر إلا أبابكر ما عكم حين دعوته ولا تردد فيه}**[١]
واتە: هیچ کەسێکم بانگ نەکردوە بۆ نێو ئیسلام، مەگەر کاتێ، کە بانگم کردوە هەڵوێستەو تێفکرینێکی هەبووە جگە لە (أبوبكر)، کە بانگم کرد بۆ ئیسلام هیچ بیانوو و دواخستنو تێفکرینێکی نەبوو لەو بارەوەو یەکسەر ئیمانی هێنا، بێگومان ئەوەش لەبەر دوو هۆکار بوو: یەکەم: لەبەرئەوەی، کە مەعدەنی ئەبوو بەکر زۆر سافو فیطرەتیشی زۆر پاك بووە، دووەم: لەبەرئەوەی، کە زۆر نزیك بووە لە پێغەمبەر ﷺ وە تەمەنیشی لە تەمەنی پێغەمبەرەوە ﷺ نزیك بووە، کە (٣٨)ساڵ بووە، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەبووبەکر فەرموویەتی: **((لو كنت متخذاً من أُمتي خليلاً لاتخذت أبا بكر ولكن أخي وصاحبي))** رواه البخاري[٢]، واتە: ئەگەر لەنێو ئۆممەتمدا هیچ کەسم بە خۆشەویستترین کەس هەڵبژاردبایە ئەبووبەکر دەبوو، بەڵام هەر براو هاوەڵمە.

وە (ابن هشام) ئاوا باسی (أبوبكر)مان بۆ دەکات، ((وكان رجلاً مألفاً لقومه محباً سهلاً وكان أنسب قريش لقريش وأعلم قريشٍ بها، وبما كان فيها من خير وشرّ، وكان رجلاً تاجراً ذا خلقٍ ومعروف، وكان رجال قومه يأتونه ويألفونه، لغير واحدٍ من الأمر لعلمه وتجارته وحسن مجالسَتِه))[٣]، لێرەدا (ابن هشام) پێنج سیفەتی لە (أبوبكر) هەڵداون:-

١) پیاوێك بوو، کە خەڵکی زۆر هۆگری دەبوو، وە گونجاوو خۆشەویست بووەو هەڵسوکەوتیشی لەگەڵ خەڵکدا سەهل بووە.

٢) لە هەموویان زیاتر بە ڕەچەڵەکەکانی قوڕەیش ئاشنا بوو، وە زۆر زانا بوو بە مێژووی قوڕەیشو بەوەی کە لە قوڕەیشدا ڕووی داوە لە چاکەو لە خراپە، دیارە

---

٢) بڕوانە (السيرة النبوية)، لأبي شهبة، ج١، ص ٢٨٤.
٢) صحيح البخاري: (٣٦٥٦).
٣) بڕوانە (السيرة النبوية)، لابن هشام، ج:١، ص٣٧١.

کەسێکیش تا بە قەومێك شارەزاتر بێت چاکتر دەتوانێ هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات، چونکە بناغەی هەڵسوکەوتی ڕاستو دروست بریتییە ئاشنابوون بە خەڵك، بۆیە هیچ کەسێك تاخەڵك نەناسێو شارەزایان نەبێ ناتوانێ هەڵسوکەوتێکی عاقڵانەو لێزانانەیان لەگەڵدا بکات.

٣) وە (أبوبکر) پیاوێکی بازرگانیش بووەو بەهۆی بازرگانیەکەشییەوە دەستڕۆیشتوو بووە، وە لەگەڵ خەڵکێکی زۆر تێکەڵو شارەزای وڵاتان بووەو، چەند جار چووە بۆ شامو یەمەن وە شارەزاییو دونیا دیدەییەکی باشی هەبووە.

٤) زۆر ڕەوشت جوانو زۆر چاکە کاریش بووە.

٥) وە پیاوانی قەومەکەی (قوڕەیش) سەردانیان کردوەو لە مەجلیسیدا دانیشتوون، وە هۆگری بوونو خۆشیانویستوە، نەك هەر لەبەر شتێكو دوو شتان لەبەر زۆر شتان لەوانە: (لعلمه وتجارتهِ وحسن مجالسته)، واتە: هەم شارەزاو پیاوێکی زانا بووە، هەم بازرگانو دەوڵەمەندو سەخیش بووە، هەم خۆش مەجلیس بووە.

بێگومان لێرەدا ئەوە دەفامرێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ چ جۆرە کەسانێکی مەبەست بوونو ویستوویەتی بیانکاتە بناغە بۆ ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییەی کە بنیاتی دەنێ، پیاوی وەك ئەبووبەکر، ئافرەتی وەك خەدیجە، وەباقی ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ بە مەبەستێکی تایبەت دیاری کردوون، بێگومان پێغەمبەر ﷺ جوان دیراسەی دەروونو کەسایەتیو ڕابردووی ئەو کەسانەی کردوە، ئنجا قسەی لەگەڵدا کردوونو ویستوویەتی کەسانی دامەزراوو پاكو لێهاتوو بکاتە بەردی بناغەی کارەکەی.

ئنجا (أبوبکر)یش کە ئیمانی هێناوە دانەنیشتوە، بەڵکو یەکسەر دەستی کردوە بە بانگەواز بۆ ئیسلام، چونکە ئەگەر بەڕاستی ئیمان کەوتە نێو دڵو دەروونی ئینسان، یەکسەر ئەو کەسە دەجوولێنێ، وەك کوردەواری خۆمان دەڵێن: (تیغی ڕەسەن خۆی لە کالانێدا ڕاناگرێ)، بەڵام ئەو کەسەی، کە ئیدديعای ئیمانو ئیسلامو مسوڵمانەتی دەکا، بەڵام لە شوێنی خۆی دەبێو ناجوولێو بە هیچ شتێك نێوچاوانی گرژ نابێو، هیچ ناکات بۆ دینی خوای پەروەردگار، بەڕاستی ئەو کەسە دەبێ چاو بە ئیمانو

www.alibapir.com

مسـولمانەتییەکەیدا بگێڕێتـەوە، ئەگـەرنا ئیمـان لـە شـوێنێکداو لەکاتێکـدا، کـە پێویست بکـا خاوەنەکـەی دەجوولێنـێ، وەك ئەبووبـەکر -خـوا لـێی ڕازی بـێ- کـە دەجوولـێو لـە پێـنج کـەس لـە بـرادەرە نزیکەکانیـەوە دەسـت پێدەکـاتو وادەکـات هەموویان ئیمان بێنن، کە هەر پێنجیان هەتا دوا تەمـەنیان وەك پایەیـەك وابـوون بـۆ بانگەوازی ئیسلامو بەردی گەورە گەورە بوون لە بناغەی کۆمـەڵگای ئیسـلامیدا، کـە بریتـی بوون لەمانە[1]: (عثـمان بن عفان)، کـە ئـەوکات تەمـەنی (٣٤) سـاڵ بـووەو (عبد الرحمن بن عوف)، کە (٣٠) ساڵ بووەو (سعد بن أبي وقاص)، کـە (١٧) سـاڵ بووەو (زبیـر بن العـوام)، کە (١٢) ساڵ بووەو (طلحه بـن عبیـدالله)، کـە (١٣) سـاڵ بووە، دوایی ئەو پێنج کەسە لەگەڵ (عەلـی)دا -خـوا لە هەموویان ڕازی بێـت-، ئـەو شەش کەسەبوون، کە (عمر بـن الخطـاب) -خـوا لێـی ڕازی بـێ- داینـان، کـە لـەدوای مردنی خۆی لەنێو خۆیاندا خەلیفە دەستنیشان بکەن، کەواتە ئەو پێـنج کەسـە لەگـەڵ (عەلی)دا شایستەی ئەوەبوون، کە دوای عومەر ببنە خەلیفـە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە (أبوبکر) -خوا لێی ڕازی بێ- پیاوێکی زۆر سـەرناس بووەو خەڵکی باش ناسیوەو زانیویەتی قسە لەگەڵ چ جۆرە کەسانێکدا دەکـات، جـا چ تەمـەنیان کەم بـێ چ زۆر، بۆیـە ئێمـەش دەبـێ تەماشـا بکـەین داخـۆ لـە کۆمـەڵگای خۆماندا کاتی خۆمان لەگەڵ کێ سەرف دەکەین، چ پیـاوان لـەنێو خـۆدا چ خوشـکان، چـونکە پێویسـتە ئـەو کـاتو ماندووبوونـەت لـە شـوێنێکدا سـەرف بکـەی، کـە بەرهەمێکی هەبێو، ئەو کەسەش، کـە بـانگی دەکـەی کـەڵێنێك بگـرێ بـۆ ئیسـلام، لێـرەوە ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێت، کـە بێگومـان کـاری ئیسـلامیی نابـێ تـەنها پەزمـەندەکردنو خڕکردنەوەی خەڵك بێت، بەڵکو دەبێ دیـاریکردنی خـەڵكو کەسـەکان بێو بزانی کێ چی لە تواناداا هەیە، وە کانزاکانیان باش بناسی بـۆ ئـەوەی لـە شـوێنی

---

١) بڕوانە: (السیـرة النبویة لابن هشـام)، ج:١، ص١٢٨، ط١ دار ابن الـهیثم.

www.alibapir.com

خۆیاندا سوودیان لێ ببینی، هەرچەندە چەندیەتیش هەر پێویستە، بەڵام چۆنیەتی گرنگترو پێویستترە.

دیارە ئەو سیفەتانەی (أبوبکر) زۆر زەمینەیان بۆ خۆش کردوە، کە هەم خەڵکەکە باشتر بناسێو هەم خەڵکەکەش باشتر بەدەنگییەوە بێنو، هەم بازنەیەکی فراوانی هەبێ بۆ پەیوەندی کۆمەڵایەتی، کە هەندێکی بەهۆی بازرگانییەوە ناسیونو هەندێك بەهۆی شارەزایی لە نەسەبو، هەندێکیش بەهۆی ئەوەوە کە قسە شیرینو خۆش مەجلیس بووەو، هەندێکی دی بەهۆی ئەوەوە، کە خۆش خولقو ڕەفتار جوان بووەو سەخیو خێرخواز بووەو هاوکاری خەڵکی کردوە.

کەواتە ئینسان هەتا ڕەفتاری جوانی زیاتر بن، باشتر دەتوانێ بازنە کۆمەڵایەتییەکانی فراوانتر بکات، وە ئەوەش دەبێتە هۆکار، کە تواناو بواری زیاتری هەبێ لە دیاریکردنو هەڵبژاردنی خەڵك بۆکاری ئیسلامیی.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# چەند ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی قۆناغی یەكەمی بانگەوازەوە: قۆناغی بانگەوازی تاكیی و پەنهانیی

## یەكەم: ماوەكەی:

بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەی تاكیی و پەنهان لە كتێبەكانی (سیرة)دا بە ناوو نیشانی (الدعوة السرية) هاتوە، بەڵام وا باشترە بگوترێ: بانگەوازی تاكیی پەنهان (الدعوة الفردية السرية)، چونكە پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی كە لەم قۆناغەدا بانگی كردوون، تاك تاك و جیاجیاو بە پەنهانیی دواندوونی و بانگی كردوون، كە ماوەكەی سێ ساڵ بووە، واتە بانگەوازی نهێنیی و تاكیی، هێندێكیش دەڵێن سێ ساڵ و چەند مانگێك بووە، بەهەر حاڵ چوار ساڵی تەواو نەكردوەو لە سێ ساڵیش كەمتر نەبووە، لێرەدا دەپرسین ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی بەشێوەی تاكیی و پەنهانیی بە كۆشش (اجتهاد)ی خۆی بووە، یان بە فەرمانی خوا بووە؟!

وا پێدەچێت خوای پەروەردگار فەرمانی پێ كردبێ، چونكە خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾ الحجر، واتە: ئەوەی فەرمانت پێدەكرێ بە دەنگی بەرز ڕایبگەیەنەو پشت بكە هاوبەشدانەرەكان، كەواتە لێرەدا پەروەردگار بە پێغەمبەر ڕادەگەیەنێ: بە ئاشكراو بە دەنگی بەرز بەرنامەكەت ڕابگەیەنە! لەوەوە دەردەكەوێ، كە تا ئەوكاتە بە فەرمانی خواو لەبەر سەركەوتن و بەرژەوەندیی بانگەوازەكەی پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی كردوویەتی، چونكە كارێكی زۆر گرنگ بووەو لەسەرەتای كاردا بووە، بۆیە وا پێدەچێ بانگەوازكردنی تاكیی و نهێنییش هەر بە فەرمانی خوا بووبێ و بەشێوەیەك لە شێوەكان ئەو شێوازەی تێگەیاندبێ، وەك چۆن بۆ ئاشكراكردن بە فەرمانی خوا بووەو بە كۆششی پێغەمبەر ﷺ نەبووە، بەهەمان شێوە بانگەوازی نهێنییش هەر بە فەرمانی خوا بووە.

**دووەم: نــاوو ژمارەی ئەوانەی کە لەم ماوەیەدا ئیمانیــان هێناوە:**

وەك پێشتر باسمان کرد کە لـەنێو مـاڵی پێغەمبـەردا ﷺ لـە سـەرەتاوە (خديجـة)ی خێزانـیو هـەرکام لـە چـوار کچـەکانی (زينـب، رقيـة، أم کلثـوم، فاطمـة) وە (علـي) ئامۆزایو (زيد بن حارثة) -خوا لە هەموویان ڕازی بێ-، ئیمانیان پێ هێنـاوە، وە لـە دەرەوەی ماڵیشــی (أبـوبکر) هـاوەڵو ڕەفیقــی هــەرەنزیكو دڵســۆزی وە یـەکێك لـە ئەشرافو پیاوە ناودارەکانی قوڕەیش ئیمانی پێهێنا، کە ئەویش یەکسـەر قسـەی کـرد لەگەڵ ئەوانەی کە زۆر لێی نزیك بوون، وە دوایی لەگەڵ خۆیدا بوون بـە شـەش کەسـی بەرجەستە لە ئیسلامدا کە بریتی بوون لە: (عثمان بن عفان، عبدالرحـمن بـن عـوف، زبيـر بن عوام، طلحة بن عبيدالله، سـعد بـن أبـي وقـاص) -خـوا لـە هـەموویان ڕازی بێت-، جگە لەمانەی کە ناومـان هێنـان، ئەمانـەش کـە (٤٨) کەسـن لـەم قۆناغـەدا ئیمانیان بە پێغەمبەر ﷺ هێنا، کە سەرجەم لەگەڵ ئەوانـەی نێـو مـاڵی پێغەمبـەرو ئەبووبەکرو هاوەڵەکانی ژمارەیان دەبێ بە (٦١) کەس، کە لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا ئیمانیان هێناوەو ئەوانەی کە لەم قۆناغەدا ئیمانیان هێناوە جگە لە مـاڵی پێغەمبـەر ﷺو ئەبووبەکرو پێنج هاوەڵەکەی، ئەمانە بوون:

١- أبو عبيدة عامر بن الجراح.

٢- أبو سلمة ابن عمة رسول الله.

٣- الأرقم بن أبي الأرقم.

٤- عثمان بن مظعون.

٥- عبيدة بن الحارث بن عبدالمطلب.

٦- و٧- سعيد بن زيد، وامرأته (فاطمة بنت الخطاب أخت عمر بن الخطاب).

٨- قدامة بن مظعون.

٩- عبدالله بن مظعون.

١٠- أسماء بنت أبي بکر.

www.alibapir.com

١١- خباب بن الأرت.

١٢- سليط بن عمرو.

١٣- حاطب بن عمرو.

١٤- عياش بن أبي ربيعة.

١٥- أسماء بنت سلامة (زوجة عياش).

١٦- خنيس بن حذافة السهمي.

١٧- عامر بن ربيعة.

١٨- عبدالله بن جحش.

١٨- أبو أحمد (أخ عبدالله بن جحش).

٢٠- و٢١- جعفر بن أبي طالب، وامرأته أسماء بنت عُميس.

٢٢- و٢٣- حاطب بن الحارث، وامرأته فاطمة بنت المجلل.

٢٤- حطاب بن الحارث.

٢٥- فكيهة بنت يسار.

٢٦- معمر بن الحارث.

٢٧- السائب بن عثمان بن مظعون.

٢٨- و٢٩- المطلب بن أزهر، وامرأته رملة بنت أبي عوف.

٣٠- نُعَيم بن عبدالله بن أسيد.

٣١- عامر بن فهيرة مولى أبي بكر.

٣٢- و٣٣- خالد بن سعيد بن العاص، وامرأته أُمَيْنة بنت خلف.

٣٤- و٣٥- أبو حذيفة بن عتبة بن ربيعة، وواقد بن عبدالله بن عبد مناف.

٣٦- و٣٧ و٣٨ و٣٩- خالد وعامر وعاقل واياس بنو البُكَير بن عبد ياليل.

٤٠- عمار بن ياسر.

٤١- صهيب بن سنان الرومي.

٤٢- و٤٣ و٤٤- أبوذر الغفاري وأخوه أُنَيس وأُمه.

٤٥- بلال بن رباح الحبشي.

٤٦- عمير بن أبي وقاص.

٤٧- عبدالله بن مسعود.

٤٨- مسعود بن القاري[1].

ئەوانە ژمارەیان (٤٨) کەس بوو لەگەڵ (أبوبکر)و پێنج کەسەکەی هاوەڵی ئەوانەی نێو ماڵی پێغەمبەر ﷺ، کە سەرجەم ژمارەیان دەکاتە (٦١) کەس، بەرهەمی کارو بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ بوو لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا.

## سێیەم: جۆرو چۆنیەتی ئەوانەی لەم قۆناغەدا ئیمانیان هێناوە:

**یەك:** زانایانی مێژووناس دەڵێن: زۆربەیان گەنج بوونو تەمەنیان لەنێوان (١٥ تا ٣٠) ساڵیدا بووە.

**دوو:** پێك هاتوون لە هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ، کە سەرجەم (١٥) ئافرەتیان تێدا بووە.

**سێ:** زۆربەی هەرەزۆری تیرەکانیشیان تێدا بوون، بۆ وێنە:

١) (أبوبكر الصديق)، لە تیرەی (تیم) بوو.

٢) (عثمان بن عفان)، لە تیرەی (بني أُمية).

٣) (زبیر)، لە تیرەی (بني أسد).

٤) (علي بن أبي طالب)، لە تیرەی (بني هاشم).

٥) (عبد الرحمن بن عوف)، لە تیرەی (بنی زهرة).

٦) (سعيد بن زيد)، لە تیرەی (بني عدي).

٧) (عثمان بن مظعون)، لە تیرەی (بني جمح).

---

١) بڕوانە: (سیرة ابن هشام)، ج١، ص٢٤٥-٢٦٢، وە (السيرة النبوية لأبي شهبة)، ج١، ص٢٨٧.

٨) (عمار بن یاسر)، لە هۆزی (عنس)، قورەیشی نەبوو.
٩) (عبداللە بن مسعود)، لە هۆزی (هذیل)، قورەیشی نەبوو.
١٠) (أبوذر)، لە هۆزی (غِفار) بووە.
١١) (مصعب بن عمیر)، لە تیرەی (بني عبدالدار).

**چوار:** هەموو چینو توێژەکانی نێو کۆمەڵگاشیان تێدا بووە، لە دەوڵەمەندو هەژار، ئازادو کۆیلەو ....هتد.

**پێنج:** عەرەبو غەیرە عەرەبیشیان تێدا بووە، بۆ وێنە بیلال حەبەشیی بووەو صوهەیب ڕۆمیی بووە، جا کە تەماشای ئەو پێکهاتە تێکەڵو جۆراو جۆرەی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە دەکەین، لە پیاوو ئافرەتو وردو درشتو عارەبو غەیرە عارەبو سەرۆك عەشیرەتو خەڵکی سادەو هەموو تیرەکان، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە خوای پەروەردگار دینی خۆی ناردوە بۆ هەموو ئینسانەکان، بۆیە لە هەموو فیکرەیەکدا دەگونجێ چینێك یان میللەتێك جیا بکرێتەوەو ئیمتیازی زیاتری پێبدرێ، بەڵام لە ئیسلامدا شتی وا نیە، ئینسانەکان هەموو بەیەك شێوە سەیر دەکرێنو چاکترینیان لای خوا ئەوکەسەیە کە تەقوای زیاتری هەبێ، بۆیە کاتێك کە ئیسلام وەك خۆی پیادە بکرێ، بەیەك چاو تەماشای هەموو چینو توێژەکانو هەموو نەتەوەو ڕەگەزەکان دەکات، ئەوەی لە کۆتایی ئەم خاڵەدا دەمەوێ هەڵوەستەیەکی کورتی لە بەرانبەردا بکەم ئەوەیە کە:

پێغەمبەر ﷺ زیاتر هەوڵیداوە لەگەڵ گەنجەکاندا قسە بکاو بیانهێنێتە نێو ئیسلام، چونکە چینی گەنج چ پیاو بن چ ئافرەت، ئامادەیی وەرگرتنی شتی تازەی زیاترەو فیکری ئازادترو دڵی سافترە، وە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەستو پێی نەبەستوەو بیروبڕوای کوفرو نەفامیی لە دڵو مێشکیدا ڕەگی دانەکوتاوەو، ئامادەیی خۆگۆڕینو چاککردنو وەرگرتنی شتی نوێی زیاترە، بۆیە بە زۆری شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ گەنج بوون، ئەگەرنا دین بۆ هەمووانەو خەڵکی پیریش لەنێو یارانیدا هەبوونو دەوریان بینیوە.

## چوارەم: هەڵبژاردنی خەڵکی دانستە:

خاڵی چوارەم کە سیماو نیشانەکانی بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات، ئەوەیە کە لە سەرەتاوە خەڵکی دانستەو تایبەتی بانگ کردوە، وە پێغەمبەر ﷺ لەو قۆناغەدا بە نهێنیی بانگەوازی کردوە نەك بە ئاشکرا، وە لە شوێنە گشتییەکاندا نەبوە، بەڵکو لە ماڵانو لە شوێنی پەنهاندا بووە، وە پێغەمبەر ﷺ یەك بەیەك ئەو نەفەرانەی دەستنیشان کردوە، جا یان بۆخۆی چووە قسەیان لەگەڵدا بکات، یان یەکێك لە هاوەڵانی ناردوە، وەك (أبوبکر) کە لە کتێبەکانی (سیرة)دا جگە لە ئەبووبەکر کەسی دیکە باس نەکراوە کە لەو سەرەتایەدا بانگەوازی کردبێ، شان بەشانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ئەمەش ئیمتیازێکی گەورەیە بۆ (أبوبکر)، چونکە پێنج کەس لە کەڵە پیاوەکانی ئیسلام لەسەر دەستی ئەو مسوڵمان بوون کە پێشتر باسمان کرد، یەکێکی دیکەش لەو بەڵگانەی کە دەیسەلمێنن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی کە لەم قۆناغەدا هەڵیبژاردوون گوڵبژێری کردوون، ئەوەیە کە:

لەوانەدا کە ئیمانیان پێهێناوە سێ کەس لە چوار خەلیفەکانی ئیسلامیان تێدان، واتە: (ئەبووبەکرو عوسمانو عەلی)، هەروەها (٩) لەو (١٠) نەفەرەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی ژیانیاندا موژدەی چونە بەهەشتی پێدان، لەنێویاندا بوون، کە بریتین لە: (أبوبکرو عثمانو عليو طلحةو زبيرو عبدالرحمن بن عوفو سعد بن أبي وقاصو سعيد بن زيدو أبو عبيدة بن الجراح)، هەروەها (عمر)یش هەر لە موژدە پێدراوان بووە، بەڵام دواتر مسوڵمان بووە، خوا لە هەموویان ڕازی بێ.

کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای بانگەوازەکەیدا ئەو خەڵکەی بانگی کردوە، خەڵکێکی دانسقەو تایبەت بووە، لەمەشدا مەبەستی ئەوە بووە، کە دروستکردنی بینای دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستی بە بناغەیەکی پتەوی قایم هەیە، کە لە کەسانی هەڵکەوتوو شایستەو دانستە دروست بکرێ، تاکو بتوانێ سەرمەشقیی مرۆڤایەتی بکات، هەرچەندە ئەوانی دیکەش ژیاننامەی هەرکامێکیان تەماشا بکەین کۆمەڵێك شتی باشو تایبەتی دەبینین.

www.alibapir.com

## پێنجەم: پەنهانکاریی:

سیماو نیشانەی پێنجەم، کە ئەو قۆناغەی پێغەمبەر ﷺ دیاری دەکات بریتیە لە (پەنهانکاریی)، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەو قۆناغەدا زۆر بەپەنهانیی کاری کردوە، ئەمەش وەڵامێکی بەهێزی ئەوانەیە، کە دەڵێن: دەبێ کاری ئیسلامیی دوور بێ لە کاری ڕێکخراوەییو کۆمەڵ بوون، وە لەوە کە برا گەورەو ڕێکخستنو ڕێكو پێکی تێدا هەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ واینەکردوە! بەڵام بێگومان ئەوە بەپێچەوانەوەیە، بەڵکو نەبوونی ڕێکوپێکی لە کارکردندا، یا نەبوونی پەنهانکاریی لە کاتێکدا، کە پێویست بێت، یا نەبوونی کۆمەڵ بوونو ڕێکخستنێکی تۆکمە لەوکاتەی کە مسوڵمانان کیانیان نەبێ، ئا ئەوانە داهێنراو (بدعة)و پێچەوانەی ڕێوشوێنی پێغەمبەرن ﷺ، چونکە جێدار (بدیل) ڕێكوپێکی هەر فەوزاو بێسەرەوبەرەییە.

بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم قۆناغەدا بەوپەڕی پەنهانییەوە کاری خۆی کردوەو گرنگی پێداوە، بۆ نموونە:-

١/ کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی بانگکرد بۆ نێو ئیسلام عەلی -خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: (هذا أمرٌ لم أسمع بهِ قبل اليومِ فلست بقاضٍ أمراً حتى أحدث أبا طالب، فقال النبِّي - يا علي إذا لم تسلمٍ فاكتم هذا -، فمكث ليلة ثم إن الله تبارك وتعالى هداه للإسلام فأصبح غادياً إلى رسول الله فأسلم)[١]، واتە: ئەوە شتێکە، کە پێش ئێستا نەمبیستوە، لەبەرئەوە هیچی لەبارەوە ناڵێم تاکو مەشوەرەت بە (أبو طالب)ی بابم نەکەم، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: ئەی عەلی! ئەگەر مسوڵمان نابی ئەم قسەیە بشارەوەو لەگەڵ بابت باسی مەکە، ئەو شەوە مایەوە پاشان خوای پەروەردگار هیدایەتیدا، بۆ بەیانیەکەی چوو بۆلای پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانەتیی خۆی ڕاگەیاند.

١) بڕوانە: (السيرة الحلبية)، ج١، ص٤٣٣.

کەواتــە: پێغەمبــەر ﷺ لــەم قۆناغــەدا زۆر هەوڵیــداوە لــەپێناو ســەرکەوتنی مەبەستەکەیدا کە کارەکەی پەنهان بێت، هەرچەندە خـەڵکێك هەسـتی بـەوە کـردوە کە (محمد) ﷺ جموجۆڵێکی هەیە، بەڵام حەزەریشـی کـردوە لـە پێنـاوی پاراسـتنی گیانی ئەوانەی کە لەگەڵیدان، تا ئیمان لە دڵیاندا بەچاکی دادەمەزرێ.

٢/ بەسەرهاتی مسوڵمانبوونی (أبو ذر الغفاري)[١] کە (عبدالله بـن عبـاس) لـە (أبـو ذر)ی گێڕاوەتەوەو پوختەکەی بەم شێوەیەیە:

ســەرەتا (أبــو ذر) بــانگی (أُنــیس)ی بــرای دەکــاتو پێــی دەڵــێ: بیســتوومە پێغەمبەرێك پەیدا بووە لە مەککە بچۆ هەواڵو دەنگو باسـم لـەوبارەوە بـۆ بێنـە، (أنیس) دەچێو پاش پرسیارو وەرگرتنی زانیاری لەوبارەوە دەگەڕێتـەوە بـۆلای (أبـو ذر)و پێی دەڵێ: لە خەڵکم بیست هێنـدێکیان دەیـانگوت یـان شـاعیرە یـان شـێتە، هێندێکیشیان دەیانگوت: پیاوی چاکە، (أبو ذر) ئەو زانیارییەی بـەدڵ نـەبوو، بۆیـە بڕیاریدا خۆی بچێ بۆ ئەوەی لە نزیکەوە دەربارەی (محمد)ی کوڕی (عبدالله) زانیاری زیاتر بزانێ.

(أبو ذر) دەڵێ: مەشکەیەك ئاوم لەگەڵ خـۆم هـەڵگرتو چـووم بـۆ مـەککـە، لـەوێ مامەوە هەتا ئێوارێ، تووشی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب بووم پێی گـوتم: هـا کاکـە وا دیارە غەریبەی؟

منیش پێم گوت: بەڵێ.

گوتی: مەنزڵگەت لێرە هەیە؟

گوتم نەخێر.

گوتی: باشە لەگەڵ من وەرەوە ماڵێ، منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتمەوە من هیچ باسی ئەو مەسەلەیەم نەکرد، ئەویش بەهەمان شێوە.

---

١) بڕوانە: (سبل الهدی والرشاد)، ج٢، ص٤٢٣.

(أبو ذر) دەڵێ: دیسان بۆ بەیانی هەتا ئێواری ڕۆژی دواتر مامەوەو چاوەڕێ بووم پێغەمبەر ﷺ ببینم، بەڵام نەمویست لەکەس بپرسم بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبم، بەڵام دیسان تا ئێوارێ دەربارەی پێغەمبەر ﷺ هیچم دەست نەکەوت، دووبارە عەلی منی لەگەڵ خۆیدا بردەوە، بۆ ئێوارەی سێیەم عەلی لێی پرسیم: ئەرێ دیارە تۆ ئیشێکت هەیە؟

منیش گوتم: بەڵێ.

گوتی: چییە؟!

پێم گوت: پێت دەڵێم بەڵام ئاشکرای مەکە.

گوتی: باشە، خەمت نەبێ.

گوتم: ئیشەکەم ئەوەیە: بیستوومە دەڵێن پێغەمبەرێك پەیدا بووە پێغەمبەری کۆتایی، کە هەموومان چاوەڕێمان دەکرد ئێستاش هاتووم بیبینم: وە ئەگەر ڕاست بێ ئیمانی پێ دێنم.

(عەلی)ش گوتی: ئەگەر من پێت بڵێم دەیشاریەوەو نایدرکێنی؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: باشە تۆ لەگەڵم وەرە من پێشت دەکەوم‌و ماڵەکەت پێشان دەدەم، ئەگەر لەوکاتەدا کەسێکیشمان بینی من خۆم خوار دەکەمەوەو وا پێشان دەدەم، کە خەریکم میز دەکەم، تاکو فیکری هیچی دیکەمان لێ‌نەکات‌و ئاشکرا نەبین، سەرەنجام منی بردە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش ﷺ باسی ئیسلامی بۆ کردم، منیش یەکسەر مسوڵمان بووم.

دوایی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: (أبو ذر) بچۆوە بۆ نێو قەومەکەت‌و

هەواڵی ئیسلامیان پێڕابگەیەنە هەتا فەرمانی منت پێدەگات، واتە: هەر کاتێك بیستت ئێمە بانگەوازەکەمان ئاشکرا کردوە وەرەوە لامان[١].

دیارە ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوە، کە پێغەمبەر ﷺ بە پەنهانیی کاری کردوەو لەسەرەتاوە نەیویستوە جموجۆڵەکەی دیارو ئاشکرا بێ، بۆ ئەوەی کارەکەی بەرهەمدارتر بێ.

٣/ نوێژکردن بە پەنهانیی: وەك (ابن هشام) دەڵێ: (وذكر بعض أهل العلم أن رسول الله إذا حضرت الصلاة خرج إلى شعاب مكة وخرج معه علي بن أبي طالب مستخفياً من أبيه أبي طالب ومن جميع أعمامهِ وسائر قومهِ فَيصليان الصَلاة فيها فإذا أمسيا رجعا..)[٢]، واتە: ئەهلی عیلم باسیان کردوە، کە پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی ئامۆزای لەگەڵ بوو دەچوونە شیوو دۆڵەکانی مەککە، کە عەلی خۆی پەنهان دەکرد لە بابیو سەرجەم مامەکانیو هەموو عەشیرەتەکەشی، لەوێ نوێژیان دەکردو ئێوارە دەگەڕانەوە.

هەروەها گوتوویەتی: (وكان أصحاب رسول الله إذا صلوا ذهبوا في الشعاب فاستخفوا بصلاتهم من قومهم، فبينا سعد بن أبي وقاص في نفر من أصحاب رسول الله ﷺ في شعاب مكة إذ ظهر عليه نفر من المشركين وهم يصلون فناكرهم وعابوا عليهم ما يصنعون حتى قاتلوهم، فضرب سعد بن أبي وقاص يومئذ رجلا من المشركين بلحى بعير فَشجَّه، فكان أول دمٍ هريق في الإسلام)[٣]، واتە: هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ -خوا لێیان ڕازی بێت- لە دۆڵو شیوەکانی مەککەدا بە پەنهانی نوێژیان دەکرد بۆ ئەوەی قەومەکەیان پێیان نەزانن، ڕۆژێکیان (سعد بن أبی وقاص) لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە یەکێك لە

١) بڕوانە: (صحیح مسلم): ٦٣١٢.
٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(٣١٣-٣١٤).
٣) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(٤٥٦-٤٥٧).

www.alibapir.com

شێوەکانی مەککەدا نوێژیان دەکرد، کۆمەڵێك لە موشریکەکان پێیان زانین ڕەخنەیان لێگرتن‌و لەگەڵیان بەشەڕ هاتن، (سعد)یش ئێسکی شەویلاگەی حوشترێکی لەسەری یەکێکیاندا‌و بریندار‌ی کرد، کە ئەوە یەکەم خوێنی کافران بووە بە دەستی مسوڵمانان بڕژێ {لە کاتی بەرگرییکردن لە خۆدا نەك بە دەستپێشخەریی}.

٤/ پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەو ڕووداوەو ئاشکرابوونیان‌و گرفت هاتنە پێشیان، کۆبوونەوەو عیبادەت‌و نوێژی لەگەڵ هاوەڵانی بەڕێزی لە دۆڵ‌و شیوەکانەوە گواستەوە بۆ ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم)، کە لە (السيرة الحلبية)دا بەم شێوەیە هاتوە: (ثم دخل رسول الله ﷺ دار الأرقم - بن أبي الأرقم - أي بعد هذه الواقعة فان جماعة أسلموا قبل دخوله دار الأرقم، فكان ﷺ وأصحابه يقيمون الصلاة في دار الأرقم ويعبدون الله تعالى فيها إلى أن أمره الله بإظهار الدين)[1]، واتە: دوای ئەو بەسەرهاتەو مسوڵمانبوونی چەند کەسێکی دیکە پێغەمبەر ﷺ‌و یارانی بۆ کۆبوونەوەو عیبادەت‌و نوێژکردن دەچوونە ماڵی ئەرقەم‌و لەوێ کارەکانیان بە نهێنی ئەنجام دەدا تا خوای توانا فەرمانی پێکرد بە ئاشکراکردنی دین.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە بانگەوازو کاری ئیسلامیی هەر لە سەرەتاوە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوەو لە هەر قۆناغێکدا شێوازێکی تایبەتی بەخۆوە بینیوە، بۆیە ئێستاش بەهەمان شێوە هەرکاتێ وا پێویست بکات کە کارو جموجۆڵی ئیسلامیی بە نهێنیی بکرێ‌و دەرس‌و ئاراستەکردن‌و کۆبوونەوەکان تایبەتی بن دەبێ وا بکرێ، ئەگەر واش باش‌و پێویست بوو بە جۆرێکی دیکەو بە ئاشکرا بن، دەبێ وا بکەین، وە ئەمە جێبەجێکردنی سیرەو سوننەت‌و ژیاننامەی پێغەمبەرە ﷺ.

---

١) (السيرة الحلبية)، ج١، ص(٤٥٦-٤٥٧).

# جیهانیی بوونی ئیسلامو بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ

خوای پەروەردگار هەر لەسەرەتای ڕاگەیاندنی دوا پەیامو بەرنامەی خۆیدا جیهانیی بوونی ئیسلامی ڕاگەیاندوە، بەوەی ئەم دینە بۆ هەموو نەتەوەو گەلو هۆزو تیرەکانەو بۆ تێکڕای مرۆڤایەتیو جندە، بێ هەڵاواردنو تادنیا کۆتایی دێ، نەك وەك خەڵکێکی ناحەز بە ئیسلامو هێندێك لە مێژوونووسە نامسوڵمانەکان دەیڵێن، کە گوایە (محمد) ﷺ لەسەرەتاوە نەیگوتوە من پێغەمبەری خوام بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بەڵکو گوتوویەتی من بەس بۆ عەشیرەتی خۆم ڕەوانە کراومو دواتر، کە بانگەوازەکەی سەرکەوتوو بووە، گوتوویەتی بۆ هەموو عارەبم، دواتر گوتوویەتی من پێغەمبەری هەموو مرۆڤایەتیم، کە بێگومان ئەوە وانیەو ئەمەش درۆو هەڵبەستراوێکی دیکەی ناحەزانەی دوژمنانە بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ.

چونکە خوای پەروەردگار لە سوورەتە مەککیەکاندا کە لە سەرەتای پێغەمبەرایەتیدا هاتوونە خوار، لە چەندین شوێندا جیهانیی بوونی بەرنامەی ئیسلامی ڕاگەیاندوە، بۆ وێنە: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾﴾ التكوير، واتە: ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، بۆ هەر یەکێك لە ئێوە کە بیەوێ ڕاست بێت، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ... ﴿٢٨﴾﴾ سبأ، واتە: وە تۆمان نەناردوە ئەی (محمد) ﷺ، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی مژدەدەرو ترسێنەر بی، وە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾ الأنبياء، واتە: وە تۆمان نەناردوە — ئەی موحەممەد- مەگەر بەزەیی خوا بی بۆ تێکڕای جیهانیان.

## پەروەردەو پێگەیاندنی کۆمەڵێکی هەڵبژاردە

پێغەمبەری خوا ﷺ ئامانجو مەبەستی لەم قۆناغەدا ئەوەبوو، کە کۆمەڵێك پەروەردە بکاتو پێ بگەیەنێ، کە لە داهاتوودا بتوانن ببنە سەرقافڵەو بناغەو پایە بۆ ئەو کۆمەڵگا ئیسلامییەی، کە دەیەوێ لەهەموو لایەنەکاندا جیهان بگۆڕێو، وەرچەرخانێك لە ژیانی ئادەمیزاددا دروست بکات، بۆ ئەو مەبەستەش پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی لە چەند بوارێکی سەرەکیدا، ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردەو پێشەنگو سەرقافڵە، بۆ کاری ئیسلامیی لەو قۆناغەدا پێ بگەیەنێ، وەك لەم پێنج خاڵانەدا دەیخەینە ڕوو:

### یەکەم: تێڕوانینو بوونناسییەکی ڕاستو دروست :

یەکەم بوار، کە پێغەمبەر ﷺ ئەو کۆمەڵە پێشەنگو سەرقافڵەیەی پێ پەروەردە کردوە، بریتی بووە لە تێڕوانینو بوونناسییەکی ڕاستو دروست، جا ئێمە هەوڵدەدەین، کە لە شەش خاڵی کورتدا بوونناسییو تێڕوانینێکی ڕاستو دروست، بەرامبەر بە بوون (وجود)و خوای پەروەردگارو، ژیانو ئینسانو دوارۆژو کێشەو ململانێی نێوان هەقو ناهەق، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بخەینەڕوو:

١- **تێڕوانین بەرانبەر بە (بوون) وجود:** ئەگەر تەماشای قورئان بکەین لە سوورەتە مەککییەکاندا ژمارەیەکی زۆر لە ئایەتەکان باسی (بوون) دەکەنو دەیخەنە ڕوو کە ئاسمانەکانو زەویو تێکڕای بوونەوەر بە ڕێكوپێکی دروست کراوەو، خوای پەروەردگار سەرپەرشتی دەکاتو هیچ شتێك لە بوونەوەردا بێهوودە بەدی نەهێنراوەو، بوونەوەر لەوپەڕی وردەکاریی دایە، بۆ وێنە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن

تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ﴿٤﴾ ﴾ الملك. لێرەداو لە زۆر شوێنی دیکەدا خوای زانا باس لەوە دەکات کە هیچ نارێکییەك لە دروستکراوەکانیدا نیە، ئەوەش بۆ ئەوەیە، کە ئینسانی مسوڵمان تێڕوانینی بۆ (بوون) بەشێوەیەك بێ، کە بزانێ دنیا شاری بێخاوەن نیەو، خوای بەرزو مەزن لە نەبوونەوە بە ڕێکوپێکترین شێوە هێناویەتە بوون.

زۆر کەس وا دەزانێ بیروبڕوای ئیسلامیی لە ئیمان هێنان بە خواوە دەست پێدەکات، بەڵێ ئیمان بە خوا کاکڵەو جەوهەری بناغەی عەقیدەی ئیسلامیی یە، بەڵام پێش ئیمان بە خوا بوون، پێویستە خوا بناسرێ، وە ئەو بوونەوەرە بناسرێ، کە دەستکردی خوای پەروەردگارە، پێویستە ئینسان خۆی بناسێو شوێنەوارو پەرێزی خوای کاربەجێ بناسێ، ئنجا ئەو ناسینە پاڵ بە ئینسانەوە بنێ کە ئیمان بەو پەروەردگارە بێنێ، هەروەك تەماشا دەکەین لە قورئانی مەککیدا زۆر گرنگی دراوە بە باسی بوونەوەر، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ ...﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەویو هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە، وە لە سوورەتی (الغاشية)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنج نادەنە (حوشتر)، کە چۆن دروست کراوە، وە ئاسمان، کە چۆن بەرزکراوەتەوەو ڕاگیراوە، وە چیاکان، کە چۆن داکوتراون بە زەویدا، وە زەویش، کە چۆن ڕاخراوە! وە لە سوورەتی (عبس)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئینسان با

تەماشای خواردنەکەی خۆی بکات، لە سوورەتی (الطارق)دا دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَـٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: با ئینسان تەماشا بکا داخۆ لە چی دروست کراوە! ئەوەش بۆ ئەوەیە کە ئینسان چاك خۆی بناسیێو لە دروستکرانی خۆیو دروستکراوەکانی دیکە لە ئاسمانەکانو زەویدا وردببێتەوەو، لە دیاردە سروشتیەکان ڕامێنیێ، کە هەموو بەڵگەو نیشانەی هەبوونی پەروەردگارنو تواناو دەسەڵاتو مشوورگێڕیی ئەو زاتە دەسەلمێنن، بۆ هەموو بوونەوەر.

٢- **تێڕوانیــن بەرانبەر بـە خـوا سبحانه وتعالى:** پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی هەوڵیداوە تێڕوانینی هاوەڵانیو شوێنکەوتووانی بەرانبەر خوای پەروەردگار بەو شێوەیە بێ کە خوا لە قورئاندا باسی خۆی دەکاتو، تواناو دەسەڵاتو سیفەتە بەرزەکانی بزاننو، لە ناسینیدا بەهەڵەدا نەچن، خوای پەروەردگار دەربارەی خۆی دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ ﴾ الزمر، واتە: خوا بەدیهێنەرو سەرپەرشتیاری هەموو شتێکە، وە لە سوورەتی (الفاتحه)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان، وە خوای بێ وێنە خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێکی بەرزو پەسندە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ... ﴿١٨٠﴾ ﴾ الأعراف، وە دەفەرموێ: ﴿ ...وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾ الروم، واتە: وە بۆ خوا هەیە سیفەتی هەرەبەرز لە ئاسمانەکانو زەویدا، کەواتە: چ سیفەتو ناوێك زۆر چاكو پەسندە هی خوای پەروەردگارە، بۆیە سەرەتا خەڵك دەبێ بەو شێوەیە خوا بناسێ، کە تاکە بەدیهێنەرەو هەر ئەو شایانی پەرستنەو خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزە، ئنجا دەزانێ ئیمانی بەچی هێناوە.

٣- **تێڕوانیـن بەرانبەر بە ئینسان:** خوای پەروەردگار لە قورئاندا زۆر باسـی ئینسـانی کردوە کە سەرگوزشتەی چییەو چۆن دروست کراوە؟ وە بۆچـی دروسـت کـراوە؟ وە دەبێ چی بکا؟... بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾ الإنسان، واتە: بە تەئکید کاتێك بەسەر ئینساندا هاتوە کە شتێکی باسکراو نەبووە، ئێمـە ئینسانـمان لە تۆویلکەیەکی تێکەڵ بەدیهێناوە، تاقی دەکەینـەوە، (وە بۆئـەوەی، کە بتوانێ تاقی بکرێتـەوە) گێڕاومانـە بـە بیسـەرو بینـەر (واتـە: هێـزی بیسـتنو بینینمان داوەتێ)، وە دوای ئەوەی، کە ئەو توانایەمان پێداوە کە لـە تاقیکرنـەوە پێی دەرچێ ڕێگەشـمان پێشان داوە، جا سـوپاسگوزارە یان سپڵەو ناسوپاس.

٤- **تێڕوانیـن دەربارەی ژیانی دونیا:** خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنی قورئاندا باسـی ژیانی دونیای کردوەو تەشبیهی کردوە بە گژو گیایەك کـە دوای بارانـان دەڕوێـتو لە دواییشدا لـەنێو دەچێت، وە باسـی حیکمـەتو ژیـانی دونیـای بـۆ کـردووینو دەفەرموێ: ژیانی دونیام دروست کردوە بەمەبەستی تاقیکردنـەوەی ئینسـانەکان، وەك دەفــەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾﴾ الكهف، واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەویدا دامـان ناوەو زەویـمان پـێ ڕازاندۆتەوە بـۆ ئەوەیـە ئـەوانی تێدا تـاقی بکەینـەوەو دەرکـــــەوێ کـە کامیـان کردەوەی باشترە، وە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا... ﴿٢﴾﴾ الـملك، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە، کـە مـردنو ژیـانی دروسـت کردوون تاکو تاقیتان بکاتەوە، کە کامـەتان کردەوەی چاکتـرە.

٥- **تێڕوانیـن دەربارەی ڕۆژی دوایی:** خوای پەروەردگار لـە باسـی ڕۆژی دواییـدا کـە چـیەو چـۆنە؟، دەفـەرموێ: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤﴾ العنکبوت، واتـە: ئـەم ژیـانی دونیایـە تـەنیا کـات بەسـەر بـردنو یارییـە، وە مـەنزڵگای دوارۆژ -بـۆ ئیمانداران کە بەهەشتە- ژیانی ڕاستەقینەیە ئەگەر بزانن.

کەواتـە: ڕۆژی دوایـی دوا مـەنزڵگای ئینسـانەو دوای مـردن ئینسـانەکان بـۆ لێپێچینەوەو حیساب لەگەڵکرانی دادگەرانەی خوا، زیندوو دەکرێنەوەو چاکەکاران بە چاکەو نیعمەتو بەخششی خواو، خراپەکارانیش بە سزاو تۆڵـەی پـەروەردگار، پاداشتو سزا دەدرێنەوە، بۆیە پێویستە ئینسان هـەموو کـات دوارۆژی لـە بیـرو بەرچاو بێو بەمەبەستی ڕەزامەندیی خوای بێهاوتا لە دنیادا شتێك بکات کە لـە قیامەتدا ڕوو سوورو سەرفراز بێ.

٦- **تێڕوانیـن دەربارەی کێشەی نێوان حەقو ناحەق:** حەق هەمیشە لـە پێغەمبەرانـدا بەرجەستە بووە لە ئادەمەوە تا خاتەم، ناحەقیش لـە طـاغـووتو خـۆ بـەزلگرانو خۆشـگوزەرانـاندا بەرجەسـتە بـووە، کـە دوژمـنو ناحـەزی پێغەمبـەرانو ڕێبازەکەیانن.

ئەگەر تەماشا بکـەین دەبیـنین پانتاییـەکی زۆر لـە قورئانـدا بریتیـە لـە گێڕانـەوەی سەرگوزشـتەی پێغەمبـەران، دیـارە ئـەوە بـۆ حیکایـەتی بـەرئاگردان نیـە، بـەڵکو بـۆ ئەوەیە، کە بزانین پێغەمبەران -علـیهم الصـلاة والسـلام- لـەپێناو چەسپاندنی دینـی هەقی پەروەردگاردا چەند تووشی نارەحەتییو دەردەسـەرییو ئـازاردران بـوون لەلایـەن ناحەزانو زاڵمانی سەردەمی خۆیانەوەو ئەوانیش چەند ئـارامگرو دڵسـۆزی دینـی خـوا بوونو زۆر خۆڕاگرانە لە مـەیدانی کـارو خەمـخواردندا ژیانیـان بەسـەر بـردوە، وە بـۆ ئـەوەی مسـوڵمانان پەنـدو ئامۆژگـاری وەربگـرن لـە مسـوڵمانانی پـێش خۆیـانو

بەسەرهاتی پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام-، وە دڵنیاش بن کە ئەوانیش وەك شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانی پێشوو سەرەنجامی دونیاو دوارۆژیان خێر دەبێت، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ... ﴿١١١﴾ ﴾ يوسف، واتە: بێگومان لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیاندا دەرسو پەند هەیە بۆ عاقڵمەندان...

### پوختەی مەبەست:

هەرکەسێك بیەوێ میللەتێکی مسوڵمان پەروەردە بکات پێویستە لە خواناسینەوە، کە کاکڵو ئامانجی تێڕوانینو بووناسییەکی ڕاستو دروستە دەست پێ بکات، ئنجا ئیمانەکەی ئیمانێکی دامەزراو دەبێ، دیارە ئەمەش لە میانەی ناسینیو پەیبێردنی ئایەتە بینراوەکانییەوە، وەك خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ... ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت، وە خوێندنەوەو تێگەیشتنی ئایەتە بیستراوەکانی، وەك دەفەرموێ: ﴿ ...وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا... ﴿٢﴾ ﴾ الأنفال، وە بە ئەندازەی ئەوە، کە لە ئایەتەکانی خوا (بیستراوو بینراوی) شارەزا دەبین، خوای پەروەردگار باشتر دەناسین، وە خوای پەروەردگار بۆیە ناوی لە دیاردە سروشتییەکان ناوە ئایەت، لە هەمانکاتیشدا ناوی لە ڕستە قورئانییەکان ناوە ئایەت، چونکە وەك چۆن بەهۆی ئایەتەکانی خواوە، خوا دەناسیو لە حەڵاڵو حەرامی خوا ئاگادار دەبی، بەهەمان شێوەش لە دیاردە سروشتییەکانیشەوە گەورەییو بەرزیی خوای پەروەردگار دەبینیو، هەرکام لەو دووجۆرە ئایەتە مایەی چەسپینو دامەزراویی ئیمانن.

www.alibapir.com

**دووەم: ئیمانی پتـەوو دامـەزراو :**

پێغەمبەر ﷺ گرنگی داوەو کاری کردوە لەسەر ئەوە، کە ئەو کۆمەڵـە مسـوڵمانە هەڵبژاردەیەی، کە ئومێدی ئەوەی پێیان هەیە، ببنـە پێشـەنگو سـەرقافڵە، ئیمانیـان تێبگەیەنێو لەسەر ئیمانیش پەروەردەیان بکاتو پێیـان بگەیـەنێ، جـا ئێمـە باسـی ئیمان لەم چەند خاڵەدا کورت دەکەینەوە:

**یەك: ئیمـان بە خـوا:**

واتـە: ئیمـان بـەوە کـە خـوا تاکـە بەدیهێنـەرو پـەروەردگارو خـاوەنو مشـورگێڕی هەمەکارەی ئەم کەونو کائیناتەیە، بۆیە پێویستە تاکە پەرستراویش هەرئـەو بێـت، وە ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە خوای زانـاو توانـا زۆر باسـی بەدیهێنەرایەتی خۆیو پەروەردگاریێتیو خاوەنداریێتی خۆی بۆ هـەموو شـتێك دەکـات، وە پاشان تەنها پەرستراوێتی خۆی لەسەر بینا دەکات، واتـە: دەفـەرموێ: لەبەرئـەوەی کە هەر من پەروەردگارو بەدیهێنـەرو خـاوەنو مشـوور خـۆرم، کەواتـە پێویسـتە هـەر منیش بپەرسـتن، ئنجـا بێگومـان بـە درێـژایی مێـژوو کێشـەی پێغەمبـەران -علـیهم الصـلاة والسـلام- لەگـەڵ خـەڵکی لەسـەر ئـەوە نـەبووە کـە ئیمانیـان نـەهێنابێ بـە پەروەردگاریێتیو بەدیهێنەرایێتی خوا (جل شأنه) بـەڵکو کێشـە لەسـەر ئـەوە بـووە کـە ئیمانیان نەهێناوە بە (تەنها پەرسـتراوێتی خـوا)، وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٣ ﴾ فاطـر، واتـە: ئـەی خەڵکینـە! چاکەو نیعمەتەکانی خوا یادبکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، ئایا بێجگە لە خـوا خـالیقێکی دیکە هەیە لە ئاسمانەکانو زەویدا ڕسـقتان بـدات؟! بێجگـە لـەو هـیچ پەرسـتراوی دیکـە نـین، بـەرەو کـوێ ڕێتـان پـێ لادەدرێ!، هـەروەها لـە سـوورەتی (الغـافر)دا

دەفەرمـــوێ: ﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ غافر، واتە: خوا ئەو زاتەیە، کە شەوگاری بۆ گێڕاون بە مایەی ئیسراحەت تێداکردن، وە ڕۆژگاریش تێیدا دەبینن، بێگومان خوا خاوەنی بەخشش‌و چاکەیە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی شوکرانە بژێر نین، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە، کە بەدیهێنەری هەموو شتێکە، جگە لەو پەرستراوی دیکەتان نیە، ڕووتان بۆ کوێ پێ وەردەگێردرێت؟!

لێرەدا دەبینین خوای بێ‌وێنە لەسەر ئەوەی، کە تەنها بۆخۆی بەدیهێنەرو ڕۆزیدەرو پەروەردگارە، پێویستی دەکات، کە بەتەنیا هەر ئەویش بپەرسترێ.

## دوو: ئیمان بە دواڕۆژ:

واتە: ئیمان بوون بەڕۆژێك کە ئەم دونیایەی تێدا کۆتایی دێت، وەك خوای پەروەردگاردەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ ﴾ الحج، واتە: خەڵکینە! پارێز لە پەروەردگارتان بکەن، بێگومان لەرزینەوەی ڕۆژی قیامەت شتێکی زۆر گەورەیە، وە هەموو ئینسانەکان حیسابیان لەگەڵ دەکرێ‌و ئیماندارو چاکەکاران بەچاکە پاداشتیان دەدرێتەوەو دەنە بەهەشت‌و خراپەکارانیش سزا دەدرێن‌و دەچنە جەهەننەمەوە.

**سێ: ئیمان به‌ فریشته‌كان:**

كه‌ جۆره‌ دروستكراوێكی خوان‌و هه‌رده‌م له‌ خواپه‌رستی دان‌و بێ‌فه‌رمانیی خوا ناكه‌ن‌و ئه‌ركی تایبه‌تییان له‌لایه‌ن خواوه‌ پێ سپێردراوه‌.

**چوار: ئیمان به‌ كتێبه‌كان:**

كه‌ فه‌رمایشتی خوان‌و بۆ پێغه‌مبه‌ران نێرراون‌و به‌رنامه‌و كه‌ته‌لۆكی ژیانن.

**پێنج: ئیمان به‌ پێغه‌مبه‌ران:**

كه‌ هه‌ڵبژارده‌ی مرۆڤایه‌تیین‌و خوای به‌به‌زه‌یی بۆ ڕێنمایی ئاده‌میزاد ناردوونی‌و ئه‌وانیش پله‌پله‌ن‌و جگه‌ له‌ موحه‌مه‌د ﷺ، كه‌ بۆ تێكڕای به‌شه‌رییه‌ت نێردراوه‌، تا دنیا به‌كۆتا ده‌گات، ئه‌وانی دیكه‌ هه‌ركامێكیان بۆ كات‌و شوێن‌و قه‌وم‌و كه‌سانێكی تایبه‌تی نێردراون.

**سێیه‌م: به‌ندایه‌تی بۆ خوا به‌ ساغیی‌و پاكیی :**

ئه‌م خاڵی سێیه‌مه‌ش به‌رهه‌می ئه‌و دوو خاڵه‌ی پێشێیه‌، چونكه‌ هه‌ركه‌سێك بوونناسیی‌و جیهانبینییه‌كی ڕاست‌و دروست‌و ئیمانێكی ته‌واوی هه‌بوو، به‌ندایه‌تییه‌كی پاك‌و بێ خڵته‌شی ده‌بێ بۆ خوای په‌روه‌ردگار، وه‌ك خوای تاك‌و پاك ده‌فه‌رموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ... ﴿٣﴾ ﴾ الزمر، واته‌: ئێمه‌ كتێبمان بۆ تۆ ناردۆته‌ خوار به‌حه‌ق، ده‌جا به‌ندایه‌تی بۆ خوا بكه‌ به‌ ساغیی‌و گه‌ردن كه‌چیی، بزانن كه‌ به‌ندایه‌تیی ساغ، ته‌نیا شایسته‌ی خوایه‌، هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾ البينة، واته‌: فه‌رمانیان پێ نه‌كراوه‌ -ئه‌و خه‌ڵكه‌- به‌وه‌ نه‌بێ، كه‌ به‌ندایه‌تیی بۆ خوا

بکەن‌و لە هەموو چەوتییەك لابدەن بەرەو ڕاستە شەقامی حەق، وەنوێژ بەرپا بکەن‌و زەکات بدەن، ئا ئەوە دینی میللەتێکی ڕاستە.

وشەی (عبادة) لە ئەسڵدا بە مانای ملکەچیی دێت، عەرەب دەڵێن: (طريق مُعَبَّد إذا وطئتهُ الأقدام)، واتە: ڕێگەیەکی بێ گریو گۆڵ وەختێك خەڵك زۆر بەو ڕێگەیەدا بڕواو تەختی بکات، وە دەڵێن: (بعير مُعَبَّد)، واتە: حوشترێك کە قەترانی تێدرابێ‌و لە جموجۆڵ‌و بزۆزیی کەوتبێ، ئنجا عیبادەتیش بۆ خوا دەبێ سێ شتی تێدا کۆببنەوە، کە ئەمانەن:

١) ئەوپەڕی گەردنکەچیی (أقصى الطاعة).

٢) ئەوپەڕی خۆشویستن ( غاية المحبة).

٣) ئەوپەڕی بە گەورەگرتن ( منتهى التعظيم).

هەرکاتێك ئەوانە هەرسێکیان لە (عبادة)دا هەبوون، ئەو بەندایەتیی ڕاستەقینەیە، وە هەرکاتێکیش ئینسان یەکێك لەوانەی بۆ غەیری خوا بوو، ئەوە غەیری خوای پەرستوە، بۆیەش خوای پەرستراو دەربارەی فیرعەون‌و گەلی مووساو هاڕوون لەسەر زمانی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿...وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ ﴿٤٧﴾﴾ المؤمنون، فیرعەون دەڵێ: قەومی مووساو هاڕوون بۆ ئێمە (عابد)ن، یانی: گەردن کەچن، ئەگەرنا نوێژو ڕۆژوویان بۆ فیرعەون نەکردوە، کەواتە: هەرکەسێك بە مانای وشە گەردنکەچی کەسێکی دیکە بوو، ئەو (عبد)ی وییە، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا، دەفەرموێ: **(تَعِسَ عبد الدينار والدرهم والقطيفة والخميصة ان أُعطي رضي وان لم يعط لم يرض)** رواه البخاري[1]، واتە: بەدبەختە ئەو کەسەی دەبێتە بەندەی زێڕ، بەدبەختە ئەوکەسەی دەبێتە بەندەی زیو، بەدبەختە ئەو

---

١) صحيح البخاري:٦٤٣٥.

کەسەی دەبێتە بەندەی جل‌و بەرگ، ئەگەر بیدرێتێ، رازی دەبێ‌و ئەگەر نەیدرێتێ نارازی دەبێ.

ئینسان کاتێك دەبێتە بەندەی زێڕو زیوو جل‌و بەرگ، کە هیچ شتێك لە دڵ‌و دەروونیدا گەورەترو خۆشەویستتر نەبوو لەوشتانە، وە لە هەموو شتێك زیاتر عەودالی ئەو شتانە بێ، چونکە لەوکاتەدا کردوونی بە پەرستراوی خۆی.

دەربارەی ئەوپەڕی خۆشویستنی خوای پەروەردگاریش، خوا فەرمووویەتی: ﴿... وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ... ﴿١٦٥﴾﴾ البقرة، واتە: وە ئەوانەی ئیماندارن خۆشەویستییان بۆ خوا زیاترە لە خۆشەویستی خەڵکی دیکە بۆ پەرستراوەکانی خۆیان.

هەربۆیەش ئێمە لە نوێژدا درووشمی (الله أكبر)مان هەیە، چونکە نابێ هیچ شتێك لە ژیانی ئێمەدا لە خوا گەورەتر بێت، وەنابێ هیچ شتێك لە دەروونی ئێمەدا لە خوا حورمەت لێگیراوترو گەردن بۆکەچکراوتر هەبێ.

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا هاوەڵانی تێدەگەیاندن، بۆیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(لا إله إلاّ الله)** زانیویانە، کە نابێ هیچ پەرستراوێك هەبێ جگە لە خوا، وە دەبێ خوایان لە هەموو کەس زیاتر خۆش بوێ‌و، لە هەموو کەس زیاتر ملی بۆ کەچ بکەن، چونکە لە مانای وشەی (إلە) گەیشتوون، کە بەداخەوە هێندێك لە خوێندەوارو تەنانەت مەلایەکانیشمان مانای ئەو وشەیە وەك پێویست نازانن وە ڕستەی (لا إله إلاّ الله) ئاوا مانا دەکەن‌و دەڵێن: (بێجگە لە خوا هیچ خوا نین)، کە لە ڕاستیدا ئەوە لێکدانەوەیەکی هەڵەیە، چونکە (الله) یانی (خوا)، بەڵام (إلە) یانی (پەرستراو)، کەواتە: ماناکەی ئاوایە: (بێجگە لە خوا -الله- هیچ پەرستراو نین)، چونکە کێشە لەسەر ئەوە نەبووە، کە کەسێك بڵێ دوو خوا هەن، یان سێ، بەڵکو گوتوویانە دەبێ دوو پەرستراو، یان سێ پەرستراو هەبن، بۆیە خوای پەروەردگار نەفی ئەو شتەی کردوە، کە خەڵك پێیەوە گیرۆدە بووە، کە (پەرستراوێتی) بڕیاردانە بۆ غەیری خوا!

www.alibapir.com


## چوارەم: ڕەوشتی بەرزو جوان :

خوای پەروەردگار لە کۆتایی سوورەتی (الفرقان)دا چەند سیفەتێك باس دەکات کە بەندە هەڵبژاردەکانی خۆییان پێ مەدح دەکات، کە هەندێکیان بریتین لە سیفەتی بەرزو جوان کە دەبێ خۆمانیان پێ بڕازێنینەوەو هەندێکیشیان بریتین لە سیفەتی دزێوو ناشیرین کە دەبێ خۆمانیان لێ بێزار بکەین، هەروەها لە سەرەتای سوورەتی (المؤمنون)یشدا کە ئاوا دەست پێ دەکات: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢﴾ المؤمنون، خوای پەروەردگار حەوت سیفەت باس دەکات کە ئەوانیش بەهەمان شێوە کۆمەڵێك سیفەتی باشن کە خۆمانیان پێ بڕازێنینەوەو، کۆمەڵێك سیفەتی خراپیشن کە دەبێ خۆمانیان لێ بەدوور بگرین.

هەروەها لە سوورەتی (الشوری)دا لە ئایەتی (٣٦ تا ٣٩)دا، کە ئاوا دەست پێدەکەن: ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ...۝٣٦﴾ الشوری، (٩) سیفەت باس دەکات، هەروەها لە سوورەتی (الرعد) لە ئایەتی (١٩ تا ٢٢) یازدە سیفەت باس دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ...۝١٩﴾ الرعد، ئەگەر سەرنج بدەین بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو سیفەتانە ئەوە نیە، کە هەموویان سیفەتی باش بن و فەرمان بکا کە خۆمانیان پێ بڕازێنینەوە، یان هەموویان خراپ بن و فەرمان بکا کە خۆمانیان لێ دوور بگرین، بەڵکو خوای کاربەجێ پێکەوە تێکەڵی کردوون، لەبەرئەوەی کە ئینسان هەمیشە پێویستی بە ڕووخاندن و دروستکردن هەیە لەخۆیدا، یانی: سیفەتی خراپ لەخۆیدا نەهێڵێ و وە سیفەتی چاکیش لەخۆیدا زیاد بکاو خۆی پێ بڕازێنێتەوە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤﴾ الأعلی، یانی بەڕاستی سەرفرازە کەسێك، کە خۆی پاك کردوەو چاك کردوە، چونکە وشەی (زکاة) هەم بە مانای پاکیی دێ، هەم بە مانای

گەشەکردن دێ، کەواتە: (تزكية) واتە خۆ پاککردنو خۆ لە بێزینگدان لە سیفەتی پیسو خراپ، وە خۆ ڕازاندنەوەو خۆ جوانکردن بە سیفەتی پەسندو چاك.

## پێنجەم: گیانی گۆڕانکاریی‌و شۆڕش‌و بەرەنگاربوونەوە :

بواری پێنجەم‌و کۆتاییش ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو مسولمانانەی پەروەردە دەکرد لەسەر ڕووحی بەرەنگاریی‌و شۆڕشگێڕیی لەپێناو گۆڕینی واقیعدا نەك تەسلیم بە واقیعی خراپ بوون‌و لەگەڵدا ڕۆیشتنی، وەك ڕێبازی پێغەمبەرانی پێشوو، کە چۆن لەپێناو چەسپاندنی هەق‌و ڕاستیدا بەرەنگاری طاغووت‌و زاڵمەکانی سەردەمی خۆیان بوونەوەو لێیان نەترساون‌و بێ باك بوون، هاوەڵانی بە شێوەیەك پەروەردە دەکردن، کە لە پێناو دینی خوادا نەفس‌و ماڵ ببەخشن‌و ڕەزامەندیی خوا لە سەرووی هەموو شتێکەوە دابنێن.

بەڵێ بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ لەم پێنج بوارەدا، ئەو کۆمەڵە مسولمانە هەڵبژاردەیەی پەروەردە کرد، کە ئومێدی ئەوەی پێیان هەبوو ببنە پێشەنگ‌و سەرقافڵە بۆ کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی‌و، سەرەنجام هەموو دونیا لەگەڵ خۆیاندا بگۆڕن، کە بێگومان هەرواشیان کرد، کەواتە: هەرکاتێك بویسترێ کۆمەڵگا یاخود میللەتێك بەرەو چاکە گۆڕانیی بەسەردا بێ، دەبێ بەو شێوەیە هەوڵ بدرێ‌و خەڵکەکەی پەروەدە بکرێ‌و، جارێکی دیکە لە ڕاستییەکان تێبگەیەنرێتەوەو، وەك پێویست لە قورئان حاڵی بکرێ.

## سەرەتای دەستپێکردنی بانگەوازی ئاشکراو گشتی :

وەك پێشتر باسمان کرد، سەرەتای بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ، بریتی بوو لە شێوازی تاکیی‌و پەنهانیی، ئەوانەی لە سەرەتاوە قسەی لەگەڵ کردن‌و بانگی کردن بۆ ئیسلام، کەسانی هەڵبژاردەو دانستە بوون، ئەو قۆناغەش ماوەکەی (٣) سێ ساڵ، یا سێ ساڵ‌و چەند مانگێك بوو، بەرهەمی ئەو چەند ساڵەش (٦١) شەست‌و یەك کەس

www.alibapir.com


بوون لە پیاوانو ئافرەتان، کە هاتبوونە نێو ئیسلامەوەو پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو پێنج بنەمایەی باسمان کردن، بەیەکەوەی هۆنینەوەو گرێی دان کە ئەمانە بوون:

أ- بووناسییو تێڕوانینی ڕاستو دروست.

ب- ئیمانی پتەوو دامەزراو.

ج- عیبادەتی پاكو بێ خلتە.

د- ڕەوشتی بەرزو جوان.

هـ- گیانی گۆڕانکارییو شۆڕشو بەرەنگاربوونەوە.

دوای ئەو قۆناغە نهێنییە تاکییەی پێغەمبەر ﷺ پێی هەستاو، پاش زیادبوونی ژمارەی مسوڵمانانو دەنگدانەوەی ئیسلام لە مەککەدا، خوای مەزن فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد، کە بگوازێتەوە بۆ قۆناغێکی دیکەی بانگەوازی ئاشکرای گشتی، یەکەم ئایەتیش کە خوای گەورە تێیدا فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات بریتی بوو لە ئایەتی: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾ الشعراء، واتە: وە خزمە نزیکەکانت ئاگادار بکەوەو بیانترسێنە، وە ئایەتی: ﴿فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾﴾ الحجر، واتە: بە دەنگی بەرز ڕایبگەیەنە ئەوەی فەرمانت پێدەکرێ، وە گوێ مەدە هاوبەش بۆ خوا پەیداکەران، واتە لێیان بێباك بەو مەترسەو هەقو ناهەق لە یەکدی جیا بکەوە.

وشەی (صدع) بە شتێك دەگوترێ کە بشکێندرێو دەنگی لێ بێت، وەك (شووشە)، لێرەدا خوای کاربەجێ ئەم وشەیەی بەکارهێناوە بۆئەوەی ئاشکراکردنی بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ مانای زۆر هەڵبگرێ ﴿فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾ ئەوەی کە فەرمانت پێکراوە ڕایبەگەیەنە بە دەنگێکی بەرزو ئاشکراو زوڵاڵو گوێش مەدە بە موشریکەکان، لێرەدا مەبەست لە (اعراض) گوێ پێنەدانو بێباك بوونە لە تانەو تەشەرو ئەزیەتو ئازاریان.

جا ئێستا با سەرنج بدەین!

کاتێك خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾، واتـە: وە خزمەنزیکەکانت بترسێنەو ئاگادار بکەوە، (عشيرة) واتە: خزمی نزیکی ئینسان، وەك زۆرجاری دیکەش باسم کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ موو بەموو لەبەر ڕۆشنایی وەحییدا بەڕێوە چووە، هەر بۆیەش کاتێك، کە ئەم فەرمانانەی پێکراون، وەك هەر فەرمانێکی دیکەی خوای تاكو پاك یەکسەر بیری کردۆتەوە، لە چۆنێتی جێبەجێکردنیان، خۆ ئەگەر چۆنیەتییەکەی پێ ڕانەگەیەنرابێ، ئەوە ئیجتهیادی کردوەو لە ژێر ڕۆشنایی فەرمانەکانی دیکەی خوای پەروەردگارو زانینو تێگەیشتنی خۆیدا کارەکەی جێبەجێ کردوە، وە لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ چەند دەقێك هاتوون، کە تیشکمان بۆ دەخەنە سەر چۆنیەتی هەڵسانی پێغەمبەر ﷺ بە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی خوا (جل شأنه)، یەکێ لەو دەقانە ئەوەیە، کە (ابن سعد) لە کتێبی (طبقات)ی خۆیدا هێناویەتی، دەڵێ: (عن عبدالرحمن بن القاسم عن أبيه قال: أُمِرَ رسولُ الله أن يَصْدَع بما جاء به من عند الله وأن يُبادي الناس بأمرِهِ وأنْ يدعو إلى الله تعالى فدعا في أول ما نزلت عليه النبوة ثلاث سنين مستخفياً إلى أن أُمِرَ بظهور الدعاء)[١]، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکراوە لە خواوە ئەوەی بۆی نێرراوەتە خوار بە دەنگی بەرز ڕایگەیەنێ، وە ئەوەی پێیەتی بۆ خەڵکی ئاشکرای بکات وە بانگی خەڵك بکات بۆ پەیامو بەرنامەی خوا، وە یەکەم جار کە بوو بە پێغەمبەر سێ ساڵ بە پەنهانیی بانگەوازی کرد بۆ لای خوا، هەتا فەرمانی پێکرا کە ئەو بانگەوازە ئاشکرا بکات، کەواتە: بە پەنهانیی بانگەواز کردنەکەیو ئاشکرا کردنەکەی هەر بە فەرمانی خوای بەرزو مەزن بووە.

ئنجا با بزانین پێغەمبەر ﷺ بۆ دۆزینەوەی میکانیزمو شێوازی گونجاو بۆ ئاشکراکردنی ئەو بانگەوازە کە خوای پەروەردگار کردوویەتی بە ئەرکی سەرشانی چی کردوە؟!

---

١) (طبقات ابن سعد)، ج١، ص ١١٩٩.

جەعفەری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەلحەکەم دەگێڕێتەوەو دەڵێ: { (لما نزلت على النبّي: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ اشتد ذلك على النبّي وضاق به ذرعاً فمكث شهراً أو نحوه جالساً في بيته حتى ظن عماته أنه شاكٍ فَدَخَلْنَ عليه عائدات، فقال: (ما اشتكيت شيئاً لكن الله أمرني ان أنذر عشيرتي الأقربين فأردت جمع بني عبدالمطلب لأدعوهم إلى الله تعالى) } ، واتە: کاتێك کە ئەو ئایەتە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ هاتە خوار، کە دەفەرموێ: خزمە نزیکەکانت ئاگادار بکەوەو وریایان بکەوەو بیانترسێنە! ئەوە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سەخت بوو، وە پێی نارەحەت بووە بۆیە ماوەی مانگێك لە ماڵی خۆیدا مایەوە تا خوشکەکانی بابی —پوورەکانی- وایانزانی نەساغە بۆیە سەردانیان کرد ئەویش پێی فەرموون: هیچ نەخۆشییەکم نیە، بەڵام خوا فەرمانی پێ کردووم کە خزمە نزیکەکانم ئاگادار بکەمەوەو پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنم، منیش دەمەوێ نەوەی (عبدالمطلب) کۆبکەمەوەو بانگیان بکەم بۆ لای خوا، واتە: لە بیری ئەوەدام، کە چۆنیان بانگ بکەم، وا پێدەچێ ئەو پوورانەی ئەوکات مسوڵمان نەبووبن، بەڵام خەمیان لێخواردوە بۆیە سەردانیان کردوە، جا بۆیە ئەوانیش لە وەڵامی ئەو قسەیەی پێغەمبەردا ڕای خۆیان پێ گوت: (قلن فادعهم ولا تجعل عبدالعُزّى فيهم -يعني أبا لهب- فإنه غير مجيبك إلى ما تدعوه إليه وخرجن من عنده)، واتە: پوورەکانی پێیان گوت: بانگیان بکە بەڵام با -عبد العُزّى- یان تێدا نەبێ، کە کونیەکەی (أبو لهب) بووە، چونکە بۆ ئەو شتەی، کە بۆی بانگ دەکەی وەڵامت ناداتەوە، وە دوایی پوورەکانی ڕۆیشتن، (فلما أصبح رسول الله ﷺ أرسل إلى بني عبدالمطلب فحضروه ومعهم عدة من بني عبد مناف وجميعهم خمسةٌ وأربعون رجُلاً، وسارع أبو لهب)، واتە: پێغەمبەر ﷺ، کە ڕۆژی کردەوە یەکسەر لە دوای ئەو خزمانەی نارد، کە لە نەوەی ( عبدالمطلب)ن -لێرەدا وا دیارە، کە پێغەمبەر ﷺ سوودی وەرگرتوە لە پێشنیاری پوورەکانی ئەوەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە دەگونجێ ئینسانی مسوڵمان سوود لە عەقڵو تەدبیری خەڵکی نامسوڵمانیش وەربگرێ، لە کاتێکدا، کە لە ڕووی

www.alibapir.com


دڵسۆزییەوە پێشنیار دەکەن- وە خزمە نزیکەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان هاتن، کە ژمارەیان (٤٥) پیاو بوو بەڵام (أبو لهب)یشیان لەگەڵ بوو لەوێ (أبو لهب) یەکسەر دەستی بە قسان کرد، (کە پوختەی قسەکانی ئەوەبوو: گوتی: ئەتۆ ئەی (محمد) شتێکت هێناوە، کە شەڕو کێشەمان بۆ دروست دەکا لەگەڵ هەموو عارەبدا، ئێمەش لە تواناماندا نیە، کە دژایەتی هەموو گەلی عارەب بکەین -نەیزانیوە هی عەجەمیشی دێتە سەر- لەبەرئەوە دەبێ واز لەو شتە بێنی، ئەگەرنا ناچارین سجنت بکەین، ئەوە هەڵوێستو قسەی (أبو لهب) بوو بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەرەتاوە، (فسكت رسول الله ﷺ ولَم يتكلم في ذلك المجلس)، (لەبەر ئەوەی قسەکانی ئەو کابرایە -أبو لهب- زۆر خراپو نەگونجاو بوونو ئەوانەی لەگەڵیشی بوون ڕایان لەگەڵ -أبو لهب- بووە) (بۆیە پێغەمبەر ﷺ وای بەباش زانیوە، کە بێدەنگ بێ هیچی نەگوتوە لەو مەجلیسەدا)، (ومكث أياماً وكثر عليه كلام أبي لهب فنزل عليه جبريل فأمره بإمضاء ما أمره الله به وشجعه عليه فجمعهم ثانية فقال) واتە: چەند ڕۆژێك دوای ئەوە مایەوە وە قسەکەی (أبو لهب)یش زۆر لەسەر دڵی قورس بوو هەتا (جبریل) هات بۆ لای وە فەرمانی پێکرد بە جێبەجێ کردنی ئەوەی خوا فەرمانی پێ کردوەو هانیدا لەوبارەوە، دوایی جارێکی دیکە کۆی کردنەوەو قسەی بۆکردن.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ چەندە ئازارو دەردەسەری لەپێناو سەرکەوتنی بانگەوازەکەیو گەیاندنی پەیامی خوادا بە خەڵکی، بینیوە، لەو پێناوەدا ئارەقەو خوێنی ڕشتوەو ناخۆشی زۆری چەشتوە، هەرچەندە خوای کاربەجێ یارمەتی داوەو فریشتەکان لەگەڵی بوونەو ئیلهامیان بۆی کردوە، بەڵام لەو پێناوەدا مەینەتیو نارەحەتی زۆری بینیوەو هەڕەشەی لێکراوەو دژایەتی کراوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو خەڵکی دیکە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی بیری کردۆتەوەو مەشوەرەتی کردوەو هۆکارو ئامرازەکانی سەرکەوتنی بانگەوازی ڕەچاو کردوون، بەڵام ورەی بەرزبووەو

ئیمانی قایم‌و عەزمی گەورە بووە، ئارامگرو پشوو درێژو لە مەیدانی کاردا کۆڵنەدەر بووەو پشتی بە خوای زاڵ بەستوە.

ئنجا پێغەمبەر، کە بۆ جاری دووەم کۆی کردنەوەو چەند قسەیەکی کورتی پڕ مانای بۆکردن، کە کاکڵەی بانگەوازو پەیامی پێغەمبەری ﷺ تێدایە، کە ئاوا دەستی پێ کرد: **{الحمد لله، احمده واستعينه وأؤمن به واتوكل عليه واشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له}** سەرەتا مەدح‌و ستایش‌و سەنای خوای کرد (جل شأنه) فەرمووی: ستایشی خوا دەکەم وە داوای یارمەتی هەر لەو دەکەم، ئیمانی پێدەهێنم‌و پشتی پێدەبەستم، وە شایەدیی دەدەم، کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە نین، وە تاکەو هیچ هاوبەشی نین، دوای ئەوە فەرمووی: **{إن الرائد لا يَكْذِبُ أهْلَهَ.... والله الذي لا إله إلاّ هو إني رسول الله إليكم خاصة وإلى الناس كافة، والله لتموتُنَّ كما تنامون ولَتُبْعَثُنَّ كما تستيقظون، ولتحاسبن بما تعملون، ولتجزون بالإحسان إحساناً وبالسوء سوءاً، وانما لَلْجَنة ابداً أو للنار ابداً، وانكم لأول من أُنذِر ومَثَلي ومثلكم كمثل رجلٍ رأى العدو فانطلق يَرْبَأُ بأهله فَخَشِيَ أنْ يُسْبَقُوا فجعل يهتف، يا صباحاه}**[١]، واتە: پێشڕەوی دڵسۆز درۆ لەگەڵ خەڵکی خۆی ناکات، {(رائد) بە کەسێك دەگوترێ، کە پێش کۆمەڵێك کەوتبێ لە ئاوێ بگەڕێ‌و ڕێیان پێشان بدا لێرەدا، واتە: من دڵسۆزی ئێوەم‌و بەپەرۆشم بۆ ئێوەو درۆتان لەگەڵدا ناکەم،} سوێند بەوخوایەی، کە جگە لەو هیچ پەرستراو نین، من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە بە تایبەت وە بۆ خەڵکی بە گشتی، وە سوێند بەخوا وەك چۆن دەخەون ئاواش دەمرن، وە وەکو چۆن بێدار دەبنەوە لە خەوێ، ئاواش زیندوو دەکرێنەوە، وە بەوەی، کە دەیکەن لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێ بە چاکە چاکەتان دەدرێتەوەو بە خراپەش سزا دەدرێن، وە مەنزڵگای دوا ڕۆژ یان بەهەشتە بە هەمیشەیی، یان جەهەننەمە بە هەمیشەیی، وە ئێوەش یەکەمین کەسن، کە ئاگادار

---

١) أنساب الأشراف، ج١، ص(١١٨-١٩٩).

دەکرێنەوەو دەترسێنرێن، وە وێنەی منو ئێوەش وەکو ئەوە وایە پیاوێك دوژمنێك ببینێت کە هێرشو شەبەیخون دەکاتە سەر قەومەکەی، ئەویش لەبەر زێدە پەرۆشیی لەبەر خزمو عەشیرەتەکەی بەپەلە ڕادەکا، دەترسێ، کە هەتا ئەو دەیانگاتێ دوژمن پێش بکەوێ، لەبەرئەوە هەر لە دوورڕا هاوار دەکاتو دەڵێ: ئاگاداربنەوە! (یا صباحاه)، (عارەبەکان عادەتیان وابووە وەك ئاگادارکردنەوە دەستەواژەی (یا صباحاه)یان بەکارهێناوە، کە بە مانای -ئاگادار بن- دێت).

(ابن عباس)یش -ڕەزای خوای لێ بێ- لەوبارەوە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

{لما نزلت ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴾: **صعد النبي ﷺ على الصفا فجعل ينادي: (يا بني فِهر، يا بني عَدي) البطون قريش، حتى اجتمعوا، فجعل الرجل إذا لم يستطع أن يخرج أرسل رسولاً لينظر ما هو، فجاء أبو لهب وقريش فقال: (أرأيتكم لو أخبرتكم أن خيلاً بالوادي تريدُ أن تُغيرَ عليكم أكنتم مُصَدِّقيَّ؟) قالوا: نعم، ما جَرَّبنا عليك إلا صدقاً، قال: فأني نذير لكم بين يدي عذاب شديد، فقال أبو لهب: تبّاً لك سائر اليوم، ألهذا جمعتنا؟ فنزلت:** ﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢ ﴾ المسد} رواه البخاري[1]، واتە: کاتێك ئایەتی: ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴾ هاتە خوار پێغەمبەر ﷺ چۆ سەر (صفا) بانگی کرد ئەی کوڕانی فیهر! ئەی کوڕانی عەدی، تیرەکانی قوڕەیش، ئەوانیش کۆبوونەوە، ئەگەر یەکێکیش لەبەر هۆیەك نەیتوانیبێ ئامادە ببێ یەکێکی نارد، بۆ ئەوەی بزانێ ئەو بانگە چیە؟ ئەبوو لەهەبو قوڕەیش هاتن.

---

١) البخاري: ٤٧٧٠.

www.alibapir.com


پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم، کە چەند سوارێك لەو شیوەدانو دەیانەوێ بەسەرتاندا بدەن، باوەڕم پێ دەکەن؟

وتیان: بەڵێ چونکە جگە لە ڕاستیی شتی دیکەمان لێ نەبینیوی.

گوتی: من وریاکەرەوەم بۆ ئێوە لە پێش دەستی سزایەکی زۆر بە ئێشدا.

(أبو لهب) پێی گوت: بە درێژایی ئەمڕۆ لەنێو بچی، هەر بۆ ئەوە ئێمەت کۆکردەوە ؟!

پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی وەڵامی نەدایەوە، بەڵام خوای پەروەردگار وەك دیفاعێك لە پێغەمبەرو دەرخستنی ئەو ڕاستییە کە (أبو لهب) چ ئینسانێکی خراپ بووە، وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝٤ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ۝٥﴾ المسد، واتە: هەردووك دەستی ئەبوو لەهەب لەبەین بچیو لەنێویش چوو، ماڵو سامانەکەیو کەسابەتو بەرژەوەنییەکانی سوودیان پێ نەگەیاند، وە لەمەولا دەخرێتە نێو ئاگرێکی بڵێسەدارەوە، وە ژنەکەشی کۆڵەدار هەڵدەگرێ، وە لە ملیشیدا پەتێکی هۆنراوە هەیە.

(أبو هريرة)ش لایەنێکی دیکەی ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە: **{عن أبي هريرة** رضي الله عنه **قال: لما نزلت هذه الآية:** ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ **دعا رسول الله** ﷺ **قريشًا فاجتمعوا فَعَمَّ وخَصَّ، فقال: يا بني كعب بن لؤي! أنقذوا أنفسكم من النّار...، يابني عبد مناف! أنقذوا أنفسكم من النّار، يا بني هاشم أنقذوا أنفسكم من النّار... يا فاطمة أنقذي نفسكِ من النّار! فأني لا أملك لكم من**

www.alibapir.com


**الله شيئاً غير ان لكم رَحِمًا سَأَبُلُّها بِبلالِها}** رواه مسلم[١]، واتە: (أبو هريرة) -ڕەزای خوای لێبێ- دەڵێ: کاتێك ئایەتی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ هاتە خوار پێغەمبەر ﷺ قورەیشی کۆکردەوەو قسەی بە گشتیو تایبەتی کردو فەرمووی: ئەی بەنی کەعب! خۆتان لە ئاگر ڕزگار بکەن، ئەی بەنی عەبدومەناف! خۆتان لە ئاگر ڕزگار بکەن...، ئەی (فاطمة)! خۆت لە دۆزەخ ڕزگار بکە، من لای خوا هیچم بۆ ئێوە پێناکرێ تەنیا ئەوەیە ئێوە خزمن، منیش هەوڵ دەدەم ئەو خزمایەتییە بگەیەنمو، زیندوو بکەمەوە.

بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتاوە بە فەرمانی خوا بانگەوازی خزمە نزیکەکانی کرد، ئەمەش شتێکی ئاسایيو سروشتیی یە بەتایبەت لە شوێنێکی وەکو (مەککە)دا، کە خەڵکەکەی لەچەند تیرەیەك پێك هاتبوو، وە مافی خزم لەسەر خزم زیاترەو ئەوان لەپێشتربوون بۆ هەر بانگ کردنێك لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، کە هەر لە سەرەتاوە لەنێویاندا گەورە بووەو سۆزو بەزەییان بۆ یەکتری هەبووەو، وەکو هێزو پشتیوانێك بوون بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئایەتی ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾یش، کە لە سوورەتی (الشعراء)ە دوا بەدوای چەند ئایەتێك دێ، کە باسی بەسەرهاتی (موسی) عليه السلام لەکاتی بوونی بە پێغەمبەرەوە تا کۆچ کردنی لەگەڵ (بني إسرائيل)و ڕزگاربوونیان لە فیرعەونو خنکانی فیرعەونو دارو دەستەکەی دەکات، پاشان باسی هەرکام لە ئیبراهیمو نووحو هوودو صالحو لووط و شوعەیبو گەلەکانیان دەکات، بۆئەوەی وەك چەند نموونەیەك نیشانی پێغەمبەرو ﷺو یارانی بدات، کە بانگەوازی پێغەمبەران باجی نارەحەتیو ئازارو دەربەدەری دەوێو، لەپێناو ئەو بانگەوازەو لەو ڕێگایەدا تووشی گرفتو کێشەو ململانێ دەبن لەگەڵ کەسانی کافرو بێ بڕواداو، پێویستە چەسپاوو ئارامگر بن، وە ئەوەشیان بۆ دەردەخات، کە سەرکەوتنی کۆتاییو

---

١) صحيح مسلم: ٢٠٤.

سەرەنجام لە دنیاو دوارۆژدا بۆ ئیماندارانە، وەك چۆن مووساو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێنا لەگەڵیدا تووشی ناخۆشی بوون، هەروەها سەرجەم پێغەمبەرانی دیکەو شوێنکەوتووانیان، بەڵام سەرەنجام سەرکەوتن‌و دوژمنەکانیان لەبەین چوون، بەهەمان شێوە پێغەمبەرو هاوەڵانیشی لە کارەکەیاندا ناخۆشی‌و دەربەدەری دەبینن، بەڵام سەرەنجام سەردەکەون‌و ناحەزانیان شکست دێنن.

## هەڵوێستی فیکریی بێبڕوایان لە بەرانبەر بانگەوازو پەیامی پێغەمبەردا ﷺ

دوای ئەوەی، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاروچالاکی ئیسلامییانەی خۆی بردە قۆناغی ئاشکراوە، نەیاران‌و ناحەزانی پێغەمبەر ﷺ، کە بریتی بوون لە هاوبەش بۆ خوا دانەران بە گشتی لە کۆمەڵگای مەککەدا، دواییش ئەهلی کیتاب‌و مونافیقەکان لە کۆمەڵگای مەدینەدا، ئەوانە هەر هەموویان هەڵوێستی خراپیان هەبوو بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ، پێویستە ئەو ڕاستییەش بزانین‌و لامان ڕوون بێت، کە کێشەی بنەڕەتی پێغەمبەر ﷺ، هەموو پێغەمبەرانی دیکەی براشی -علیهم الصلاة والسلام- لەگەڵ میللەتانیاندا لەسەر سێ تەوەر بووە، کە ئەمانەن:

١) خوا بەیەکگرتن (التوحید).
٢) پێغەمبەرایەتی (النبوة).
٣) ڕۆژی دوایی (الیوم الآخر).

بۆیە ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین، دەبینین، کە هەڵوێستی نەیارانی پێغەمبەر ﷺ زیاتر لەو سێ بوارەدا بەرجەستە بوون، واتە: کافرو بێبڕواکان دژایەتییان بۆ خوا بەیەکگرتن دەربڕیوە، وە بۆ پێغەمبەرایەتی‌و وەحی، وە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، کە لێرەدا یەك لەدوای یەك باسیان دەکەین:

## یەکـەم: خوا بەیەکگـرتن (التوحید):

خوای بێوێنە ئاوا باسی خوا بەیـەکگرتن (التوحیـد)مان بـۆ دەکـات:﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِىَ ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّى وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾﴾ غافر، واتە: خوا ئەو کەسەیە، کـە زەوی بـۆ گێـڕاون بـە مایـەی لەسـەر نیشـتەجێ بـوون، وە ئاسمانیشی بۆ گێڕاون بە سەقفو سەربان، وە ئێوەی وێنە کێشاوە لە چـاکترین وێنـەدا، وە لـە ڕزقـە پـاکو چـاکەکان ڕۆزی ئێـوەی داوە، ئـا ئـەو خوایـەتان پەروەردگارتانـە، بەرزیـیو بەرقەراریـیو شـکۆ بۆ خوای پـەروەردگاری جیـهانەکان، خـوا زینـــدوویە —خاوەنی ژیـانی ڕاستەقینەیە-، جگـە لـەو پەرستــراوی دیکـە نیـن، لێـی بپاڕێنـەوەو بیپەرستـنو گەردنکەچیی خۆتانی بۆ ساغ بکەنـەوە، ستـایش بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانەکان، -ئەی (محـمـد)- ﷺ بڵێ: مـن لـێم قەدەغـە کـراوە ئەوانـەی ئێـوە لـە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، کە بیانپەرستم، دوای ئەوەی، کە لەلایەن خواوە بەڵگەی ڕوونو ئاشکرام بۆ هاتوون (کە هەر خوا جل شأنە پـەروەردگارو بەدیهێنـەرو ڕۆزیـدەرو ژیێنەرو مرێنەرەو هەر ئەو بەرز دەکاو نزم دەکاو هەموو شتێکی بەدەستە) وە فەرمانم پێکراوە کە گەردنکەچ بم بۆ پەروەردگاری جیهانەکان.

وەك دەبیـنین، لـە ئایـەتی یەکەمـدا خـوای کاربـەجێ باسـی بەدیهێنەرایـەتی پەروەردگاریێتی خۆی دەکاتو ئەوەش دەکاتە بناغەو بەڵگە لەسەر تـەنیا پەرستراویێتی خـۆی، بۆیـە لـە ئایـەتی دواتـردا باسـی پەرسـتراویێتی خـۆی دەکـات، ئنجـا باسـی

گەردنکەچیی دەکات، کە لە بەندایەتی کردندا بۆ خوا بەرجەستە دەبێ، وە بەندایەتی کردنەکەش لە پابەندیی بەشەریعەتی خوا لەژیانی تاکیی و کۆمەڵایەتی و خێزانییدا، کەواتە: کە باسی خواو بەیەکگرتن دەکەین، زیاتر مەبەستمان لە بەیەکگرتن، پەرستن و پەرستراوێتی (ألوهیـة)ی خوایە، ئەگەرنا لە بەدیهێنەرایەتی و (خالقیـة) پەروەردگارێتی (ربوبیـة)ی خوادا مشتومڕ نەبووە.

## دووەم: پێغەمبەرایەتی (النبوّة):

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓاْ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ﴾ فصلت، واتە: تۆ بڵێ (ئەی محمد ﷺ) بێگومان من ئینسانێکم وەکو ئێوە، کە لەلایەن خواوە وەحی و پەیامم بۆ دێ -لە ڕێگای فریشتەکانەوە- کە پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە -ئەویش خوا یە- جا خۆتان بەرەو خوا ڕاست بکەن و ڕاستە شەقامی ئەو بگرن، وە داوای لێبوردنیشی لێ بکەن- کە لە ڕابردوودا لارو خوار بوون- سزای سەختیش بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرانە.

## سێیەم: ڕۆژی دوایی (الیوم الآخر):

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ ﴾ لقمان، واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لە پەروەردگارتان بکەن، وە لەڕۆژێك بترسێن، کە هیچ باب و دایکێك لە فریای ڕۆڵەکەی نایە، هەروەها هیچ ڕۆڵەیەکیش دادی باب و دایکی نادات، بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، با ژیانی دونیا فریوتان نەدات، وەبا فریودەر فریوتان نەدات.

زۆر لە زانایان (فریودەر) بە شەیتان لێکدەدەنەوە، یان هەر شتێك كە ئینسان هەڵدەخەڵەتێنێ، لە پارەو سامانو دەسەڵاتو نەسەبو..هتد.

بەڵێ پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- لەسەر ئەم سێ بنچینەیە لەگەڵ دوژمنو ناحەزانیاندا تێككگیراون.

ئێستاش دوای باسكردنی هەرسێك بنچینەی: (خوا بەیەككگرتنو پێغەمبەرایەتیو دوارۆژ)، دێینە سەر باسی هەڵوێستی خراپی كافران بەرانبەر ئەو سێ بنچینەیە بەم شێوەیە:

## یەك: هەڵوێستی خراپی كافران لەبواری خوا بەیەككگرتندا:

كافرەكانی مەككەو شارەكانی دیكەی نیوە دورگەی عەرەبییش، وەك تێكڕای خەڵكی سەرزەوی لەوكاتەداو لە هەركاتو سەردەمێكی دیكەشدا، كێشەو مشتومڕیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا لەسەر بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگاریێتی خوا نەبووە، بەڵكو لەسەر پەرستراوێتی خوا بووە، بۆیە گیرۆدەی هاوبەش بۆ خوا دانان بوون، واتە: وێڕای دانهێنانیان بە بەدیهێنەرایەتی خوادا، شەریكیان بۆ خوا داناوە لە پەرستراوێتیداو، بتو شتی دیكەی وەك: ڕۆژو ئەستێرەو مانگو شەیتانو جندو فریشتەیان، پەرستوە.

ئەمەش چەند ئایەتێك، كە ڕەخنەی بێبڕوایان لە خوا بەیەككگرتنو داكۆكی كردنیان لەسەر هاوبەش دانان بۆ خواو، وەڵامی خوای پەروەردگار بۆیان، دەردەخەن:

خوای زانا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الزخرف، واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی: كێ دروستی كردوون؟ دەڵێن: خوا، كەواتە بۆ لادەدرێن؟، واتە: مادام خوا دروستی كردوون، بۆ شتێكی دیكە دەپەرستنو ئیختیاری ڕاستو عاقڵانەی خۆیان لەدەست دەدەن؟!

www.alibapir.com


هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾﴾ لقمان، واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوون؟! دەڵێن خوا، بڵێ: ستایش بۆ خوا بەڵکو زۆربەیان نازانن، واتە: زۆربەیان نازانن، کە مادام خوای پەروەردگار (جل شأنه) تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارە، دەبێ هەر ئەویش تاکە پەرستراو بێ، چونکە عەقڵ وا دەخوازێ، وە هاوبەش پەیداکەران بۆ بەردەوام بوونیان لەسەر کوفرو پەرستنی غەیری خوا، چەند پاساوێکیان هێناونەوە کە زۆر بێهێزو نامەنتیقین، وەك لەوبارەوە خوای تاك دەفەرموێ: ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ ... ﴿٣﴾﴾ الزمر، واتە: ئاگادار بن ملکەچیی ساغ -لێرەدا (دین) بە مانای (طاعەت)و ملکەچیی دێت- تەنیا شایستەی خوایە، یاخود خوای بەرز مەزن تەنیا ملکەچیی ساغو بێ خلتەی شایستەیە، {واتە: بەندایەتی، کە بۆ خوا دەکرێ نابێ خلتەی پێوەبێ وە (طاعەت)ێك کە دەکرێ نابێ بەشی غەیری خوای پێوەبێ} ، وە ئەوانەی کە لەجیاتی خوا دۆستو پشتیوانان دەگرنو دەیانپەرستن، (جا چ بتو صەنەم بن، چ ئەستێرەو مانگو خۆر بن، چ طاغووتو فیرعەون بن، چ هەواو ئارەزوو بن، چ پارەو سامان، ئەوانە پاساویان چیە؟!)، دەڵێن: ئێمە ئەوانە ناپەرستین، مەگەر بۆ ئەوە نەبێ، کە لە خوامان نزیك بخەنەوە!!

هەڵوێستێکی دیکەی کافرەکان لە بەرانبەر خوا بەیەکگرتندا لە (سەر سوڕمان)دا بەرجەستە بووە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَعَجِبُوا أَن جَاءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَٰذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾

﴿مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ ۝٧﴾ ص، واتــــە: وە ســــەریان سوڕما کاتێك، کە لەخۆیان ئاگادارکەرەوەیەکیان بۆ هات، وە کافرەکان گوتیـان: ئـەوە جادووگـەرێکی زۆر درۆزنـە، ئایـا هـەموو پەرسـتراوەکانی کردنـەوە بەیـەك!! (چـونکە دەیانگوت ئێمە (٣٦٠) بتمان لە (کعبـة)دا دانـاوە فریامـان ناکـەون وەڵامـی هـەموو پرسیارەکانمان بدەنەوە، پەرستراوێك چۆن فریای هەموان دەکەوێت)؟!

دەیانگوت بەڕاستی ئەوە شتێکی زۆر سەیرە، بەڵام هی خۆیانیـان پـێ سـەیر نـەبوو دارو بەردێك بپەرستن کە لە خوار خۆیانەوە بـوو یـاخود ئینسـانێك بپەرسـتن، کـە هـەر وەکو خۆیانە، بەڵام هی (مـحمد الـمصطفى)یان پێ سەیر بـوو ﷺ، کـە دەیفـەرموو: پەروەردگارێك بپەرستن کە بۆ خۆتـان دەڵـێن: پـەروەردگارو بەدیهێنـەرمانـە، ﴿وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ . مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ﴾، (الْمَلَأُ)، واتـە: زلـە زلـەکان، ئەشـڕافەکان ئەوانـەی، کـە هەمیشـە بەرژەوەنـدییان لەوەدایـە، کـە خـەڵك بتپەرسـت بـێ، چـونکە ئەگـەر خـەڵك خواپەرست بێ، ئەوان ناتوانن خۆیان لە خـەڵکی بکەنـە پەرسـتراوو پـەروەردگار، بۆیـە (مـلأ) هەمیشـە پشـتگیریی بتپەرستیین‌و دژی خوا بەیەککگرتن‌و خواپەرستییـن.

واتـە: خۆ بەزلگرەکانیان دەستبەکاربوون‌و گوتیـان: بەردەوام بن‌و خـۆڕاگر بـن لەسـەر پەرسـتـراوەکانتان، ئەوەی کە دەیڵێ ئەوە بەس پیلانێکە -کە دەیـەوێ زیـان لـە ئێمـە بدا- ئێمە لەمەوپێش شتی وامـان نەبیستوە، بێگومـان ئەوە شتێکە کە بۆخـۆی هـەڵی بەستوەو دروستی کردوە.

شایانی باسیشە ئەوانەی، کە لەجیاتی خوا دەیانپەرسـتـن، دارو بـەردو شـەیتانەکان‌و جندو فریشتـەکان بوون، وەك لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ۝١٠٠﴾ الأنعام، واتـە: وەچـەند هاوبەشـێکیان لـە (جـن) بـۆ خـوا دانـاوە،

www.alibapir.com


هەرچەندە خواش خولقاندوونی، وە چەند کوڕو کچێکیان بە نەزانیی بۆ داناوە، (دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕی خوان) وە فریشتەش کچی خوان، پاکیی‌و بێگەردیی بۆ خوا لەوەی، کە ئەوان خوای پێ وەسف دەکەن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾ الصافات، واتە: نەسەب‌و ڕەچەڵەکیان قەراردا لەنێوان خواو (جن)دا، بەڵام (جن) زۆر چاك دەزانن، کە ڕۆژی قیامەت ئامادە دەکرێن -بۆ لێپرسینەوە-.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الزخرف، واتە: ئەو فریشتانەی، کە بەندەی هەڵبژێردراوی خوان بە مێینەیان لەقەڵەم دان (خوا دەفەرموێ) ئایا دیتوویانن کاتێك کە من دروستم کردوون (تا بزانن داخوا نێرن یان مێ؟)، ئەو شایەتییەی، کە داویانە دەنووسرێ‌و پاشان لێشیان دەپرسرێتەوە.

تەماشا بکەن لە دینە شێوێنراوەکانی ڕابردوودا هی بابل‌و کلدان‌و ئاشوورو میسرو یۆنان‌و... زۆربەی پەرستراوەکانیان لە شێوەی مێینەدا بوون، کە زۆربەی مێژوونووسان دەڵێن: ئەوە لەو ئەفسانەیەوە هاتوە، کە پێیان وابووە فریشتە کچی خوان (سبحانه وتعالى).

ئێستاش بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو قسەو بیرۆکانە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دەخەینە ڕوو:

١ - یەکێك لە بەرپەرچدانەوەکان ئەوەیە کە خوای زانا دەفەرموێ: خوا -عزّوجلّ- خاوەن‌و سەرچاوەی ڕەهای هەرکام لە بەدیهێنان‌و فەرمان (خلق وأمر)یشە، وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَاءَكُمُ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا

www.alibapir.com


مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾فاطر، واتە: ئایا ئەو هاوبەشانەتان، کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە پیشانم بدەن چییان لە زەوی دروست کردوە، یان لە دروستکرانی ئاسمانەکاندا بەشدارییان هەیە؟ کەواتە: مادام نە لە دروستکرانی زەویدا نە لە هی ئاسماندا شوێن دەستیان نیە، کەواتە بەشیان بەدروستکردنو بەدیهێنانی هیچ شتێکەوە نیە، ئەی بزانین ئەمریان هەیە! ﴿أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ﴾، واتە: ئایا کتێبمان پێ داونو بەڵگەیان لەو کتێبەدا هەیە -کە بت بپەرستن-؟ دەی مادام خەلقو ئەمریان نەبێ، کەواتە: ئەوانە شایستەی پەرستران نین، بۆیە دەفەرموێ: ﴿بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴾، واتە: بەڵکو ستەمکاران تەنیا بەڵێنی فریودەر بەیەکدی دەدەن.

٢- ئنجا دەربارەی ئەوە کە (بەدیهێنان) وە (سەرخستن)یش تەنیا تایبەتن بە خواوە، خوای پاك دەفەرموێ: ﴿ ...فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ ﴾ الأعراف، واتە: بەرزیی بۆ خوا لەوەی، کە دەیکەن بە هاوبەشی خوا، ئایا شتێك دەکەن بە هاوبەشی خوا کە بەدیهێنانی بەدەست نیە؟! بەڵکو خۆشیان دروست کراون! وە ناتوانن یارمەتیشیان بدەنو سەریشیان بخەن، بەڵکو ناتوانن خۆشیان سەر بخەن؟! کەواتە: چۆنیان دەپەرستن، کەسێك ژیانی خۆی بەدەست نەبێ، چۆن هی تۆی بەدەستە، وە کەسێك خۆی سەر نەخات چۆن تۆ سەر دەخا؟.

٣- ئنجا دەربارەی ئەوە کە (کوڕو کچ)یان پاڵداوەتە لای خوا، خوای پەروەردگار وەڵامێکی زۆر ددانشکێنیان دەداتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ

www.alibapir.com


وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾ الأنعام، واتە: پەیداکەری ئاسمانەکانو زەوی، بەشێوەیەك، کە شێوەیان نەبووە، {چونکە (بديع) واتە: بەدیهێنانی شتێك کە شێوەی نەبووبێ} چۆن ڕۆڵەی دەبێ، کە هاوسەری نەبێ، وە هەموو شتێکی دروست کردووەو بەهەموو شتێکیش زانایە؟.

کەواتە لەبەرئەوەی، کە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە نابێ هیچ شتێك نە لق (فرع)ی خوا بێت نە بنەچە (أصل)ی بێ، وەك لە ئایەتی (٣)ی سوورەتی (الإخلاص)دا دەفەرموێ: ﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴾ واتە: کەسی لێ نەبووە، وە لەکەسیش نەبووە، دیسان لە سوورەتی (الفرقان) لە ئایەتی (٣)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ﴾، واتە: وە لە جیاتی خوا (جل شأنه) چەند پەرستراوێکیان پەرستوون کە هیچ شتێکیان دروست نەکردوە، بەڵکو خۆشیان دروستکراون، تەنانەت زەرەرو قازانجی خۆشیان بەدەست نیە، چ جای ئەوانەی، کە دەیانپەرستن، هەروەها نە ژیانیان بەدەستە، نە مردن، نە زیندووکردنەوەشیان بە دەستە، (کەواتە: ئەوانە شایستەی پەرستن نین).

٤- موشریکەکانی مەککە زۆرجار پەنایان بردۆتە بەر چەواشەکارییو گاڵتەکردن بە وشە، بۆ پاساودانەوەی بیروبڕوای پووچی خۆیان، بۆ وێنە:[1] ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوە دەکات، کە نابێ جگە لە خوا کەس بپەرسترێ، یەکێکیان دەڵێ: ئێمە فریشتان دەپەرستینو، نەصرانییەکان عیسا دەپەرستنو، یەهوودییەکان عوزەیر دەپەرستن، تۆش دەڵێی ئەوانەی کە لە جیاتی خواش دەپەرسترێن دەچنە دۆزەخ،

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص١٢٤٩.

www.alibapir.com


یانی فریشتەو عیساو عوزەیریش دەچنە دۆزەخ؟!! خوای زاناو توانا لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾﴾ الزخرف، واتە: کاتێ (عیسی)ی کوڕی مەریەم بە وێنە هێنرایەوە، گەلەکەت کردیان بە هەڵاّو گوتیان: ئایا پەرستراوەکانی ئێمە چاکترن، یاخود عیسا؟! واتە: مادام ئەو بسووتێنرێ، با ئەوانی ئێمەش بسووتێنرێن، ئەوەش لە کاتێکدا ئەوەیان گوت، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾﴾ الأنبياء، واتە: ئێوە خۆتانو ئەوانەی، کە دەیانپەرستن دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ، خوای کاربەجێش لە وەلامی ئەو قسە چەواشەکارییەیاندا فەرمووی: ﴿...مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ... ﴿٥٨﴾﴾ الزخرف، واتە: تەنیا وەك شەڕە قسە ئەو نموونەیان هێناوەتەوە، ﴿...بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ... ﴿٥٩﴾﴾ الزخرف، واتە: بەڵکو ئەوانە کەسانێکن، کە حەزیان لە شەڕە قسەیە، ئەو (عیسی) یەکێکە لەو بەندانەمان، کە چاکەمان لەگەڵدا کردوە، دیارە چاکە لەگەڵ کرانی عیساش لەلایەن خواوە، ئەوە بووە، کە خوای پەرستوەو خوای دادگەرییش بەهەشتی پێ بەخشیوە، هەروەها خوای زانا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾﴾ الأنبياء، واتە: ئەوانەی لەلایەن ئێمەوە چاکەیان بۆ پێشکەوتوە -واتە خوای بەبەزەیی هیدایەتی داون بۆ بەندایەتیکردنی خۆی- ئەوانە لە دۆزەخ دوور خراونەوە.

٥- شتێکی دیکە، کە موشریکەکان دەیان کرد بە پاساو بۆ شیرك‌و بتپەرستی خۆیان ئەوە بوو کە دەیانگوت: هەر شتێك، کە خوا بیەوێ دێتەدی، ئێمەش ئێستا، کە بت دەپەرستین، دیارە خوا ویستوویەتی ئێمە بت پەرست بین، مادام خوا ویستبێتی، کەواتە بەدەست خۆمان نیە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ... ﴿١٤٨﴾﴾ الأنعام، واتە: ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار داوە دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای نەئێمەو نە باب‌و باپیرانمان هاوبەشمان بۆ خوا بڕیار نەدەدا، وە هیچ شتێکیشمان لە خۆمان قەدەغە نەدەکرد، (کەواتە: لەبەرئەوەی ئێستا هەندێك شتمان بۆ خۆمان حەڵاڵ‌و هێندێکی دیکەمان لە خۆمان حەرام کردوە، تووشی شیرك بووین، ئەوە ویستی خوایە، بۆیە نابێ کەس گلەییمان لێ بکا)، خوای پەروەردگار ئاوا وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿... كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ... ﴿١٤٨﴾﴾ الأنعام، واتە: ئەوانەی پێش ئەوانیش ئاوا پێغەمبەرانی ئێمەیان بە درۆ دەزانین، هەتا ئازاری ئێمەیان چێشت، ﴿قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ﴾، واتە: پێیان بڵێ: ئایا هیچ زانیارییەکتان لەلایە بۆمان دەربخەن؟ (کە خوا ویستوویەتی‌و پێی خۆشە، کە ئێوە هاوبەش پەیداکەر بن)، بەڵێ هەموو شتێك بەویست‌و ئیرادەی خوایە، بەڵام مەرج نیە هەر شتێك، کە بە ویست‌و ئیرادەی خوا بێ ڕەزامەندیی خوای لەسەر بێ، چونکە ڕەزامەندیی خوا لەگەڵ جێبەجێکردنی شەریعەتەکەیدایە، بەڵام ئیرادەو ویستی خوا لەگەڵ هەموو شتێکدایەو، کابرا کافر دەبێ بە ئیرادەی خوا کافر دەبێ، کە ئیمان دێنێ، بە ئیرادەی خوا ئیمان دێنێ، بەڵام بەپێی شەریعەتی خوا بۆمان دەردەکەوێت، کە ئایا خوا لەو شتە ڕازییە، یان ڕازی نیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ

﴿إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾، واتە: ئێوە تەنیا بە دوای گومان دەکەونو تەنیا درۆ دەکەن لەوەدا، کە دەیڵێن.

﴿قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾﴾ الأنعام، واتە: خوا بەڵگەی هەرە تەواوی لەسەر ئێوە هەیە، ئەگەر ویستبای هیدایەتی هەمووتانی دەدا، (واتە: خوا نەیویستوە زۆرتان لێبکاو ویستوویەتی ئازاد بنو سەرپشکتان بکاو، ویستوویەتی بە هەڵبژاردنی خۆتان ئیمان بێنن، یان کافر بن، کەواتە مادام وای ویستوە، بە ویستی خۆتان کافر بوون، بە ویستی خۆشتانو بەبێ شەریعەتی خوا شتتان بۆخۆتان حەلاڵو حەرام کردوە، بۆیە لەسەریشی سزا دەدرێن).

هەروەها خوای کاربەجێ لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾﴾، واتە: وە ئەوانەی هاوبەشیان بڕیار داوە بۆ خوا گوتیان: ئەگەر خوا ویستبای نە ئێمەو نە بابو باپیرانمان غەیری خوا شتێکی دیکەمان نەدەپەرست، وە هیچ شتێکیشمان قەدەغە نەدەکرد، ئاوا بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەوانیش هەر وایانکرد، ئایا لەسەر پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- بێجگە لە ڕاگەیاندنی ئاشکرا چی دیکە هەیە؟! بێگومان ئێمە لە هەر ئۆممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە، وە پێمان گوتوە، کە بە خەڵکەکە بڵێ: خوا بپەرستن وە خۆتان لە (طاغووت) بەدوور بگرن، جا هەیانبووە خوا ڕێنمایی کردوە، هەشیان بووە گومڕایی لەسەر چەسپیوە، بە زەویدا

بڕۆن و سەرنج بدەن داخۆ سەرەنجامی ئەوانەی، کە پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ زانیوە چۆن بووە.

ئەوەی کە لێرەدا پێویستە هەڵوەستەی لە بەرانبەردا بکەین ئەوەیە، کە خوای کاربەجێ دوو جۆرە عیبادەتی دیاری کردوە، عیبادەت بۆ خوا (جل شأنه) وە عیبادەت بۆ (طاغووت) وە دەفەرموێ: هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە مەگەر پێغەمبەرێکمان تێدا ڕەوانە کردوە کە بە خەڵکەکەی ڕاگەیاندوە: ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ بەندایەتی بۆ خوا بکەن و خۆ لە (طاغووت) بەدوور بگرن وەدوایی دەفەرموێ: ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ﴾ هەیان بووە خوا هیدایەتی داوە و هەرخوای پەرستوە، هەشیان بووە گومڕایی لەسەر چەسپیوە و (طاغووت)ی پەرستوە.

وشەی (طاغووت) لە قورئاندا لە (٨) شوێندا هاتوە:

١) ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾ البقرة.

٢) ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ ... ﴿٢٥٧﴾﴾ البقرة.

٣) ﴿... أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ ... ﴿٥١﴾﴾ النساء.

www.alibapir.com

٤) ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ ... ﴿٦٠﴾﴾ النساء.

٥) ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ ... ﴿٧٦﴾﴾ النساء.

٦) ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾﴾ المائدة.

٧) ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ ... ﴿٣٦﴾﴾ النحل.

٨) ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ ... ﴿١٧﴾﴾ الزمر.

لە سەرجەم ئەم ئایەتانەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە (طاغووت) شتێکە لە بەرامبەر خوای پەروەردگاردا، کەواتە وەکو ئیمان بە خوا هەیە، ئیمان بە (طاغووت)یش هەیە، وەکو چۆن عیبادەت بۆ خوا هەیە، عیبادەت بۆ (طاغووت)یش هەیە، هەروەها وەك چۆن گەڕانەوە بۆلای خوا (التوبة) هەیە بەهەمان شێوە گەڕانەوە بۆلای (طاغووت)یش هەیە، وەکو چۆن (تحاکم) بۆلای خوا هەیە (تحاکم) بۆلای (طاغووت)و بەرنامەی (طاغووت)یش هەیە، وە (طاغووت) لە ئەسڵدا لە وشەی (طغی)وە هاتوە، یانی لە

www.alibapir.com


سنوور دەرچوو، وە (طاغووت)یش کەسێکە کە لە سنوور دەرچێ، توێژەرەوانی قورئان بۆ پێناسەی وشەی (طاغووت) گوتویانە -بەتایبەت (أبو جعفر الطبري) کە بە (إمام المفسرين) مەشهوورە- دەڵێ: {الطاغوت كل معبودٍ سوى الله}، واتە: طاغووت بریتیە لە هەموو پەرستراوێك جگەلە خوا.

بەڵام من لە سەرنجدانی ئایەتەکانو بەراورد پێکردنیان بۆم دەرکەوتوە کە (طاغووت) وشەیەکە بەکاردەهێنرێ بۆ ئەوانەی کە بەرنامە بۆ خەڵك دادەنێن، وە حوکمڕانییان بەسەردا دەکەن، بەپێی ڕێبازو بەرنامەیەك کە بە هەواو ئارەزووی خۆیان دایدەنێن، کەواتە (طاغووت) بە سەرکردەکانی کوفر دەگوترێ کە بە غەیری شەریعەتی خوا حوکمڕانیی بەسەر خەڵکدا دەکەن، وە بە(شيطان)یش دەگوترێت چونکە ئیرادەو هەستو شعووری هەیە، وەك چۆن سەرکردەکانی کوفر ئیرادەو هەستو شعووریان هەیە، بەکورتی: وشەی (طاغووت) تەنیا بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنرێت کە لە جیاتی خوا -جل شأنە- دەپەرسترێنو پەیڕەویی لە بەرنامەو یاسایان دەکرێ، کە ئەوانەش یان دەبێ (ئینسان) بن، یان دەبێ (جند) بن، بەڵگەش لەوبارەوە ئەم ئایەتەیە کە خوای بەرزومەزن دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ ...﴿٦٠﴾﴾ النساء، واتە: سەرنجی ئەوانە نادەی کە پێیان وایە ئیمانیان بەوە هێناوە، کە بۆتۆ نێردراوەتەوە خوار وە بەوەش کە لە پێش تۆدا نێردراوەتە خوار (ئیددیعای ئەوە دەکەن، کە ئیمانیان بە کتێبەکانی خوا هەیە) کەچی ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ دەیانەوێ دادوەریی خۆیان بگێڕنەوە بۆ لای (طاغووت)، لە هۆیەکانی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکاندا بەتایبەتی لە (أسباب النزول)ی (سيوطي)دا ئەم ڕیوایەتە دێنێ کە (ابن أبي حاتمٍ والطبراني) لە (عبدالله بن عباس)ەوە ڕیوایەتیان کردوە: {كان أبو برزة الأسلمي كاهناً يقضي بين اليهود فيما يتنافرون فيه...}، واتە: (أبو برزة الأسلمي) کە دوایی مسوڵمان بووەو بۆتە هاوەڵێکی بەڕێز، لە سەردەمی

نەفامییدا کاهین بووەو دادوەریی و قەزاوەتی دەکرد لە نێوان جوولەکەکاندا لەو شتانەدا کە تێیاندا دەکەوتنە کێشەوە، ئیدی ئەم ئایەتە لەوبارەوە هاتۆتە خوار.

هەروەها هەر لەبارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەو چەند ئایەتێکی دواییشدا هاتوە، کە مسولمانێکی مونافیق لەگەڵ جوولەکەیەك بوو بە کێشەیان؛ جوولەکەکە گوتی بابچین بۆ لای (محمد) ﷺ، بەڵام مسولمانەکە گوتی: نا با بچین بۆ لای (كعب بن الأشرف) بۆ ئەوەی ئەو دادوەرییمان لەبەیندا بکات، جا بەو بۆنەیەوە خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار[١]، کەواتە: لێرەدا (طاغووت) کەسێکە کە حوکم دەکات لە نێوان خەڵکیدا بەبێ گەڕانەوە بۆ شەریعەتی خوا، وە لە ئایەتەکانی دیکەشدا ئەگەر سەرنج لە سیاقەکان بدرێ هەر ئەوەیان لێ وەردەگیرێت، کە ئەوە مانای ڕاستەقینەی وشەی (طاغووت)ە، هەرچەندە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: هەموو پەرستراوێك غەیری خوا بە (طاغووت) لەقەڵەم دەدرێ، لەو ڕووەوە، کە لە سنووری خۆی براوەتەدەر، بەڵام ئەگەر بەوردیی سەرنجی ئایەتەکان بدەین، خوای کاربەجێ (طاغووت) زیاتر بەوە پێناسە دەکات کە خاوەنی ئیرادەو عەقڵ و شعوورە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ ... ﴿٢٥٧﴾﴾، لێرەدا خوای بێ وێنە وەك چۆن دەربازکردنی ئەهلی ئیمانی لە تاریکییەوە بەرەو ڕۆشنایی کردوە بەوەسفی خۆی بەهەمان شێوە؛ هێنانەدەری شوێنکەوتووانی (طاغووت)یشی لە ڕۆشناییەوە بەرەو تاریکاییەکان کردوە بە پێناسەو وەسفی (طاغووت)، کە دیارە ئەوەش وەسفێکە بۆ کەسێك بەکار دێت، کە عەقڵ و ئیرادەو هەستی هەبێ.

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب ابن كثير)، ص ٣٠٤.

## دوو: دژایەتیکردنی کافران لە بواری بڕوابوون بە ڕۆژی دواییدا:

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە بڕوا بوون بە خوا، ڕاستەوخۆ داخوازیی ئەوە دەکا، کە بڕواشت بە ڕۆژی دوایی بێ، چونکە ڕۆژی دوایی ئەو ڕۆژەیە، کە تۆ بەدیداری خوا -جل شأنە- دەگەیەوەو دەچیە بەر دادگای خوا، بۆ ئەوەی لێت بپرسێتەوە، کە چیت کردوەو چۆن ژیاوی؟ بۆیە بڕوا نەبوون بە ڕۆژی دوایی لە بڕوا نەبوون بە خوا -جل شأنە- وە سەرهەڵدەداو هەرکەسێك ئیمانی بە خوا نەبێ ڕاستەوخۆ ئیمانیشی بە ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەو بەهەشتو جەهەننەم نابێ.

جا خوای تاكو پاك لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی هەڵوێستی فیکریی کافرەکان دەکات لەبارەی بڕوا نەبوونیان بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەوە! بۆ وێنە: دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ٢٩﴾ الأنعام، واتە: وە کافرەکان گوتیان ئەوە هەر ژیانی دونیایە، وە زیندوو ناکرێینەوە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ٧ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ٨﴾ سبأ، واتە: وە ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: ئایا پیاوێکتان پیشان بدەین کە هەواڵێکی سەیرتان پێ دەدا! دەڵێ هەرکاتێك مردنو پارچەپارچە بوون دووبارە زیندوو دەکرێنەوە بە دروست بوونەوەیەکی تازە، ئایا بەناوی خواوە بوختان دەکا یان شێتە؟!، بەڵکو ئەوانەی بڕوا ناهێنن بەڕۆژی دوایی لەسزاو سەرگەردانییەکی دووردان، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ ...٢٤﴾ الجاثیة، واتە: وەبێ بڕوایەکان گوتیان: هەر ئەم ژیانە دنیایەمان هەیە، دەمرینو دەژینو تەنیا ڕۆژگاریش لەنێومان دەبات، دیارە ئەوانە بڕوایان بە خواش نەبووە -جل شأنە- کە وەك هاوبەش

پەیداکەرەکان، کە بڕوایان بە بوونو بەدیهێنەرایەتی خوا هەبێو وێڕای ئەوە شتێکی دیکەش بپەرستن، بەڵکو بێ بڕوابوون، لە زاراوەی زانایانی پێشینماندا بە (ملاحدة)یان گوتوە (الدهريون) ئەوانەی کە تەنیا بڕوایان بەوە بووە، کە ڕۆژگار خەڵکی دەمرێنێو دەژێنێ، یانی: خوایەك سەرپەرشتی بوونەوەر ناکات، کە ئەوە بیرێکی زۆر ڕیزپەڕو دەگمەن بووە.

خوای پەروەردگاریش وەڵامی قسەکانیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَا يَبْعَثُ اللَّهُ مَن يَمُوتُ ...﴿٣٨﴾﴾ النحل، واتە: کافرەکان بە جەخت لەسەر کردنەوە سوێندیان خواردوە ئەوەی، کە دەمرێ خوا زیندووی ناکاتەوە، جا خوای پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوەو چەند بەڵگەیەکیش دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا﴾، واتە: با خوا بەڵێنی داوەو بەڵێنی خواش هەقەو دەبێ بێتە دی، (مادام خوا -جل شأنه- لەڕێی وەحیو پێغەمبەرانییەوە فەرموویەتی کە من زیندووتان دەکەمەوەو لێتان دەپرسمەوە فەرمانو بەڵێنی خوا دێتە دی)، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾، واتە: بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، (واتە: هەر خوا ناناسن وە بە وەحیو پەیامی خوا ئاگادار نین، بۆیە نکوولیی دەکەن لە زیندووبوونەوە!) ئەوە بەڵگەی یەکەم، پاشان بەڵگەی دووەم دەخاتە ڕووو دەفەرموێ: ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ ...﴿٣٩﴾﴾ النحل، واتە: بۆ ئەوەی ئەوە کە تێیدا کەوتوونە مشتومڕو ڕاجیایی یەوە بۆیان ڕوون بکاتەوە، (کە دەبێ ڕۆژێك بێت بێ بڕوایان لێیان مەعلووم بێت بەهەڵەدا چووبوون)، دوایی بەڵگەی سێیەم دەخاتە ڕووو دەفەرموێ: ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ﴾، واتە: وە بۆ ئەوەی کە بێبڕوایان بۆیان دەرکەوێ کە درۆیان دەکرد -کە دەیانگوت زیندوو نابینەوە-، ئنجا بەڵگەی چوارەم دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ النحل﴾، واتە: ئێمە ئەگەر بمانەوێ شتێك ببێ، کە

پێی بڵێین ببە دەبێ، (توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا مەبەست لەوە نیە، کە خوای باڵادەست بە شتەکە بفەرموێ: ببە، واتە: کاتێك ئیرادەو ویستی خوا -جل شأنه- ڕوو بکاتە هەر شتێك پەیدا دەبێ).

خوای باڵادەست لە سوورەتی (یس)دا کۆمەڵێك بەڵگەی دیکە باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّـٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾ یس، واتە: ئایا ئینسان نابینێ -نازانێ- کە ئێمە لە تۆویلکە (نطفة)یەك دروستمان کردوە، کەچی ئێستا بۆتە مشتومڕکەرێکی ئاشکرا، نموونەیەکی بۆ ئێمە هێنایەوەو دروستکرانی خۆی لەبیر چۆوە، دەڵێ: کێ ئێسقان زیندوو دەکاتەوە دوای ئەوەی، کە پرواوە، تۆ (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: ئەو کەسە زیندووی دەکاتەوە کە یەکەمجار دروستی کردوە، ئەو خوایەی لە درەختی سەوز ئاگری بۆ دروست کردوون (لێرەدا ئیعجازێکی زانستی هەیە، چونکە درەختی سەوز کاتێك بەهۆی کرداری ڕۆشنە پێکهاتنەوە لە ڕێگەی گەڵا سەوزەکانییەوە ڕووناکیو وزە لە خۆر وەردەگرێ، هەر هەمان وزەیە کە لەکاتی سووتانیدا دەیداتەوەو ئاگری لێ دروست دەبێ، واتە ئەو پەروەردگارەی ئاگرو ئاوی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە) ئایا ئەو زاتەی ئاسمانەکانو زەوی هێناونە دی ناتوانێ هی وەکو ئەوان دروست بکات؟ با خوای توانا زۆر بەدیهێنەرو زۆریش زانایە، {وە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (غافر)یش دا

www.alibapir.com


دەفــــــەرموێ: ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی زۆر گەورەترە لە دروستکردنی خەڵکی بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن} ، پاشان لەکۆتاییدا دەفەرموێ: فەرمانی خوا کاتێك بیەوێ شتێك دروست بکات، ئەگەر پێی بڵێ ببە، دەبێ، پاکیی بۆ ئەو کەسەی، کە موڵکی هەموو شتێکی بەدەستە، وە هەر بۆلای ویش دەگێڕدرێنەوە.

لەم چەند ئایەتەشدا هەڵوێستی خراپو نەفامانەی ئەهلی کوفر سەبارەت بە ڕۆژی دواییو زیندووبوونەوە دەرکەوت، کە چۆن بڕوایان پێی نیەو گاڵتە بە ئایەتەکانی خواو قسەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکەنو خوای پەروەردگاریش بەوجۆرەی، کە دیتمان وەڵامی گومانو قسەکانیان دەداتەوە.

لە هۆیەکانی هاتنە خوارەوەی قورئاندا هاتوە[١]، کە یەکێك لە کافرەکان دەچێت بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو ئێسقانێك دەپروێنیو خۆڵەکەی لەسەر لەپی دەستی دادەنیو ڕووەو پێغەمبەر ﷺ فووی لێدەکاتو تۆزوخۆڵەکە بە دەموچاوی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێ، وە پێی دەڵێ: دوای ئەوەی ئاوام لێهات -واتە بووم بە تۆزو خۆڵ- خوا دەتوانێ جارێکی دی زیندووم بکاتەوە؟! خوای پەروەردگاریش بەو شێوەیەی باسکرا وەڵامی دەداتەوە.

هەروەها خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ ص، واتە: وە ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لە نێوانیاندایە بەبێ هۆو بێهوودە

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب ابن كثير)، ص ١١٤٨.

www.alibapir.com


دروستمان نەکردوە، ئەوە گومانی بێبڕوایانە (کە ئێمە ئەوانەمان بەبێ هۆو بە هەوەنتە خولقاندبێ، وە مادام بوونەوەر بەگاڵتە نەخولقابێ کەواتە زیندووکرانەوە ڕاستە، چونکە دونیا شانۆی تێدا تاقیکرانەوەیە، وە کە تێشیدا تاقی کرایەوە دەبێ قۆناغێکی دیکەش بێ کە ئەنجامی تاقیکرانەوەی تێدا وەربگیرێتەوە)، وە سزای بە ئێش و توندی ئاگر بۆ ئەوانەی کافرن.

چۆن دەبێ ئێمە ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە وە کردەوەی باشیان کردوە، وەك خراپەکاران لە زەویدا مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، یاخود پارێزکاران وەکو تاوانباران، (واتە: چۆن دەبێ سەرەنجامی کەسێك کە هەموو ژیانی بە پاکیی و چاکیی و بەپێی بەرنامەی خوا بەڕێ کردبێ، وەك سەرەنجامی کەسێك بێت کە هەموو ژیانی لە پیسیی و تاواندا بردۆتە سەر، ئەگەر زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە نەبێ وەك یەك دەردەچن، ئەوەش زوڵمە، خوای پەروەردگاریش دادگەرەو زوڵم لە کەس ناکات).

هەروەها لە سوورەتی (المؤمنون) دا بەهەمان شێوە دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: ئایا پێتان وایە بەگاڵتە ئێوەمان خولقاندوەو ناگێڕرێنەوە بۆ لامان؟! کەواتە: ئەگەر ئینسانەکان نەگێڕرێنەوە بۆ لای خوای کاربەجێ، وە بە چاکەکان نەڵێ چاکتان کردو بە خراپەکانیش نەڵێ خراپتان کرد، مانای وایە گاڵتەی پێکردن، خوای پەروەردگاریش کاربەجێیە وە شتی بێجێ ناکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: ئێمە ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتە نەخولقاندوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنون، واتە: بەرزە خوای پادشای هەق، جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نین، وە پەروەردگاری بارەگای ڕێزو حورمەتە.

وە بەڵگەیەکی دیکەش کە خوای بێهاوتا لە چەند جێیەکی قورئاندا هێناویەتەوە، بریتیە لە بەراوردکردنی ژیانی ئینسان لەگەڵ ڕوانی گژوگیاو دارو درەخت، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرۡسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَىۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابًا ثِقَالًا سُقۡنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الأعراف، واتە: خوا -جل شأنه- ئەو زاتەیە، کە بایەکان دەنێرێ موژدەدەرن لە پێش ڕەحمەتی خۆیەوە، (لێرەدا مەبەست لە ڕەحمەت بارانە، چونکە باران بەرجەستەکەری ڕەحمەتو بەزەیی خوایە بۆ ژیاندارو زیندەوەرو ڕووەك)، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابًا ثِقَالًا﴾، واتە: هەتا کاتێك، کە ئەو بایانە هەورێکی قورسیان هەڵگرت، (واتە: هەوری موتوربەکراو ئەوانەی کە بارانیان هەڵگرتوە)، ﴿فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾، واتە: ئنجا ئاوی پێدا دەنێرینە خوارێ، وە هەموو جۆرە بەروبوومێك لەو زەوییە وشكو قاقڕو دێمەکارەی پێ دەردەهێنین ﴿كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، واتە: هەر بەو شێوەیەش مردووان جارێکی دی دەردێنینەوە، لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە (ابو هريرة) گێڕاویەتیەوە، کاتێ خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا دەیەوێت مردووان زیندوو بکاتەوە بارانێك دەبارێنێ هەرکەسەو لە ئێسکی (کلێنجە)[1]ی دروست دەبێتەوە، دوای ئەوەی کە لاشەکە دروست بۆوە ڕووحەکەشی بەبەردا دەکرێتەوە لەلایەن خوای زیندووکەرەوەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {... **ثم يُنَّزل الله من السماء ماءً فينبتون كما تنبت البقل، ليس من الإنسان شيء**

١) ئێسکی کلێنجە ئێسکێکە زۆر بچوکە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی بڕبڕەی پشت.

**إلاّ يُبْلى إلا عظماً واحداً وهو عَجْبُ الذَّنَبِ وَمنه يركَبُ الخلق يوم القيامة}** رواه البخاري(١)،.

بەڕێـــزان!

ئەگەر سەرنج بدەین زۆربەی قورئان لە مەککە هاتۆتە خوار، وە پێغەمبەر ﷺ لە ماوەی ئەو (١٣) ساڵەی کە لە مەککەدا بووە بەپێی وەحیو فەرمایشتی خوای زاناو توانا زۆر جەختی کردوە لەسەر ئەو سێ بابەتە: خوا بەیەکگرتن، ڕۆژی زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە، پێغەمبەرایەتیو (وەحی).

چونکە ئەو سێ شتە سێ کۆڵەکەو سێ کوچکەی هەموو ئیسلامەتیین، جا بۆیە پێویستە ئێمە پەند وەربگرینو بزانین کە هەرکاتێك ئینسانێك یان کۆمەڵێك بیەوێ دینداریيەکی ڕاستەقینە بکات، دەبێ بەو سێ ئەسڵو بنەمایانەوە دەست پێبکات، هەروەها ئەگەر بویستڕێ گۆڕانکاریی لە ژیانی میللەتێکدا بکرێ، دەبێ لەو سێ بنەمایانەوە دەست پێبکرێ، ئەو سێ بنەمایەش دووەمیان لە یەکەمیانەوە پەیدا دەبێتو سێیەمیشیان لە دووەمیان، چونکە کاتێك کە خوات ناسیو بڕوات پێی هەبوو، بڕواشت بەوە دەبێ کە خوا زیندووت بکاتەوە، وە هەرکاتێکیش بڕوات بە پەروەردگاریێتی خواو ڕۆژی دوایی هەبوو، بڕواشت دەبێ بەو هیدایەتو بەرنامەیەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی و دواشی دەکەوی.

## سێ: دژایەتیکردنی کافران لە بەرانبەر پێغەمبەرایەتیو وەحیدا :

سێیەمین کۆڵەکەی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی بریتیە لە ئیمان هێنان بە پێغەمبەرایەتیو وەحی بەگشتیو بەتایبەت پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، وە ئەو وەحیو پەیامەی، کە خوای کاربەجێ بۆی ناردوە، چونکە بڕواهێنان بە

---

١) صحیح البخاري: ٤٩٣٥، لە (صحیح مسلم)یشدا هاتووە بە ژمارە : (٧٣٤١).

www.alibapir.com


پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ داخوازیی ئەوە دەکات کە ئینسان ئیمان بێنێت بە هەموو پێغەمبەرانی دیکەش، وە لەڕاستیدا ئێمە لەڕێی پێغەمبەری خۆمانەوە ﷺ دەزانین، کە پێغەمبەرانی دیکەش هەبوون، جا ئەوانەی کە لە قورئاندا ناویان هاتوە، پێویستە ئیمانمان بەخۆیانو کتێبەکانیان هەبێ، وە ئەوانەشی کە ناویان نەهاتوە، بەشێوەیەکی گشتی بلێین: ئیمانمان بە پێغەمبەرانی خوا هەیە -علیهم الصلاة والسلام-.

کافرەکان وەك چۆن سەبارەت بەخوا بەیەککگرتن بەتایبەت لە بواری پەرستراندا شەریکیان بۆ بڕیار داوە، یان هەر بڕوایان پێ نەبووە!! هەروەها لە بواری بڕوابوون بە دوارۆژیشدا باسمان کرد، کە بڕوایان بەویش نەبووەو پێیان شتێکی قورس بووەو گوتوویانە: کە ئینسان چۆن زیندوو دەبێتەوە؟!!

بەهەمان شێوە لە بواری پێغەمبەرایەتیشدا تێبینیو گومانیان هەبووە هەم لەبارەی شەخصی پێغەمبەرەوە ﷺ وە هەم دەربارەی ئەو وەحیو پەیامەش کە بۆی هاتوە، بەتایبەت قورئان، ئێستاش با سەرنجێکی ڕەخنەکانیان بدەین داخۆ سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ چییان گوتوە:

خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٤﴾ ﴾ الإسراء، واتە: وە هیچ شتێك ڕێی لە خەڵك نەگرت کە ئیمان بێنن، دوای ئەوەی کە ڕێنمایی خوایان بۆ هات ئەوە نەبێ کە گوتیان: ئایا خوا ئینسانێکی کردۆتە ڕەوانەکراوی خۆی؟!

کەواتە: گەورەترین کۆسپو پەرچ لەڕێی کافرەکاندا کە ئیمان بە پێغەمبەری خوا بێنن ئەوە بووە کە پێیان وا بووە ئینسان شایستەی ئەوە نیەو لێی ناوەشێتەوە کە ببێتە پێغەمبەرو پەیوەندی هەبێ بە خواوە -جل شأنه- وە گوتوویانە چۆن خوا ئینسانێك دەکاتە نێرراوی خۆی؟

١) خوای زاناو توانا لەسەر زاری کافرەکان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ٧ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ٨﴾ الفرقان، واتە: بێبڕواکان گوتیان: ئەوە چییە؟ ئەو پێغەمبەرە! خواردن دەخواو لە بازاڕی دێو دەچێ! دەبووایە فریشتەیەك دابەزێتە سەری لەگەڵیدا خەڵك بترسێنێو ئاگادار بکاتەوە، یاخود خەزنەی لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێ، یاخود بەهەشتێکی هەبێ لێی بخواو پێویستی بەکارو کەسابەت نەبێ، ئەو ستەمکارانە گوتیان ئێوە تەنیا بەدوای پیاوێك دەکەون کە جادووی لێکراوە.

لەو دوو ئایەتەی ڕابردوودا ئەوە دەرکەوت کە کافرەکان تێبینییان هەبووە لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو بڕوایان پێی نەبووەو گوتوویانە: چۆن دەبێ پێغەمبەر ﷺ ئینسان بێ؟ هەروەها دەربارەی شەخصی موحەممەدیش ﷺ گومانو تێبینییان هەبووە.

٢) وەك دەفەرموێ: ﴿أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ ... ٨﴾ ص، واتە: ئایا لەنێو ئێمەدا قورئان بۆ وی هاتۆتە خوار؟!، واتە: ئێمە هەموو ئەو گەورە پیاوانە هەین چۆن خوا پەیامی خۆی بۆ موحەممەد ﷺ دەنێرێ؟!، دیارە کافرەکان خۆیان پێ زل بووەو پێوانەی ئەوان بۆ چاکییو خراپییو شایستەیی ئینسانەکان بۆ هەر شتێك، جیاواز بووە لە پێوانەی خوای پەروەردگار بۆ ئەوشتانە، ئەوان وایان زانیوە هەرکەسێك خزمو عەشیرەتو پارەو سەروەتو سامانی زیاتر بووبێو دەسەڵاتدارتر بووبێ، ئەو زیاتر شایستەی ئەوە بووە، کە خوا ڕێزی لێبنێو پلەی پێغەمبەرایەتی بداتێ!.

www.alibapir.com


٣) هەروەها خوای بێهاوتـا دەفـەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾﴾ الزخرف، واتە: وە گوتیان دەبووایە ئـەو قورئانـە دابەزیبایـە سەر یەکێك لە پیاوە گەورەکانی دوو شارەکان -واتە (ولید بـن المغـیرة) لـە مەککـە یان (عروة بن مسعود الثقفي) لـە طـائیف[1]- دیـارە ئەوکاتـە ئـەو دوو کەسـە دوو پیاوی زۆر ناودار بوون لە طـائیفو لـە مەککـە بـە هـۆی دەوڵەمەندییانـەوە، بۆیـە پێیان وابووە کە هیچـکەس جگـە لـەو دوو کەسـە شایسـتەی پێغەمبەرایـەتی نیـەو (مـحمـد بن عبدالله) -علیە الصلاة والسلام- ، کە بە هەتیوی گەورە بووەو هەژارو نەدارە، شایستەی ئەوە نیە!.

٤) هـەروەها خـوای بەخشـندە کۆمـەڵێك گرفتـی دیکـەی کافرەکـان لـەوبارەوە بـاس دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْۖ أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ ..... بَلْ قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾﴾ الأنبيـــاء، واتــە: ئەوانــەی کــە ستــەمیان کــرد -کــافرو موشــریکەکان- بەپەنهانیی لەنێوخۆیاندا قسەیان کردو گوتیان: ئایا ئەم (موحەممەد)ە جگـە لـەوەی، کـە ئینسـانێکە وەکـو خۆتـان هیچـی دیکـە هەیـە؟ ئایـا دەچـن بـۆلای ئینسـانی جادووگـەرو گـوێ لـە جادوەکـەی دەگـرن، لـە حاڵێکـدا کـە ئێـوە خـاوەن عـەقڵن‌و دەبینن؟!... بەڵکو شتێکی دیکەشیان گوت: گوتیان ئـەو قسـانەی کـە ئـەو (ﷺ) دەیانکات، (واتە: قورئان) خەونی تێکەڵ‌و پێکـەڵن‌و قسـەی زینـدە خەونانـە (واتـە: کەسێك کە بەدەم خەوەوە بێدار دەبێتەوە) یاخود قسەیەك کە خۆی هەڵی دەبەستێ، یاخود قسەکەی شیعرەو خۆشی شاعیرە، با مـوعجیزەو بەڵگەیـەکی ئاشـکرامان بـۆ بێنێ، وەك چۆن پێغەمبـەرانی پێشـوو بەڵگـەو مـوعجیزەی بەرهەسـت‌و ئاشـکرایان

---

١) بڕوانە: (تفسیـر ابن کثیـر)، ج٤، ص(١٢٦-١٢٧).

هەبووە، (کە دیارە مەبەستیان موعجیزەکانی مووسایە کە گۆچانەکەی‌و دەستی موبارەکییەتی کە درەوشاوەتەوە، وە موعجیزەکانی عیسایە کە بە ئیزنی خوا مردووی زیندوو کردوونەوەو کوێرو لاڵی زگماکی چاککردوونەوەو...هتد.).

هەروەها خوای تاك‌و پاك باسی دوو تۆمەتی دیکە دەکات کە لە لایەن کافرەکانەوە پاڵ درابوونە لای پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێ: ﴿أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾﴾ الدخان، واتە: کەی وەخەبەر دێن‌و بێدار دەبنەوە، پێغەمبەرێکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرایان بۆ لا هاتوە (کە هیچ کەس لەو پاکترو چاکترو ڕەوشت بەرزتر نیە، وە لەو خاوەن عەقڵتر نەبووە) دوایی پشتیان تێکردو گوتیان: ئەوە فێرکراوەو شێتە، (دیارە ئەم دوو قسەیەش پێچەوانەی یەکترن، چونکە کەسێك کە شێت بێ ناگونجێ فێر بکرێ).

٥) هەروەها لە سوورەتی (الفرقان) دا دوو تۆمەتی دیکە باس دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾﴾، واتە: وە کافرەکان گوتیان: ئەم قورئانە تەنیا قسەیەکی هەڵبەستراوەو هەڵی بەستوەو کەسانێکی دیکەش هاوکارییان کردوە، وە گوتیان: ئەوە ئەفسانەی پێشینانە داوای کردوە بۆی بنووسرێتەوە، دوایی بەسەریدا خوێندراوەتەوە بەیانیان‌و ئێواران تا لەبەری کردوە.

جا بەڕێزان!

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین هەموو ئەو ئیشکالانەی کە کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ باسیان کردوون، هەر ئەو ئیشکالانەن کە ئێستا باس دەکرێن، وە

ئەوەی کە ئێستا دەیڵێن هیچی قسەی تازە نیە، بەڵکو هەمووی قسەی دووبارە کراوەی ئەو سەردەمەیە.

## وەڵامی خوا عزّ وجلّ بۆ ڕەخنەو تۆمەتی کافرەکان

ئێستاش چەند ئایەتێك دەخەینە ڕوو، کە خوای پەروەردگار بەرپەرچی ئەو تۆمەتو درۆو گومانەیان دەداتەوە، وە پێغەمبەری خۆی ﷺ فێردەکات، وەڵامی ئەو تۆمەتانە بداتەوە:

١- خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾﴾ الإسراء، واتە: (ئەی موحەممەد) ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر لەسەر زەوی فریشتە هەبوونایەو بەئارامیی بەسەر زەویدا ڕۆیشتبان، لە ئاسمانەوە ڕەوانەکراوێکی فریشتەمان دەنارده لایان، (بەڵام لەبەرئەوەی ئەهلی سەر زەوی ئینسانن‌و فریشتەش پێکهاتەی جسمیان بەو شێوەیە نیە کە لەسەر زەوی بژین، بۆیە فریشتەی نەناردوە، خەڵکی سەر زەوی کە ئینسانن دەبێ پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرێ لە شێوەی خۆیان بێ، نەك ڕەوانەکراوێکی فریشتە، تا دوایی نەڵێن: جا خۆ ئەوە فریشتەیە، ئێمە چۆن وەکو ئەومان بۆ دەکرێت؟!

جا لەبەرئەوە دەبێ ڕەوانەکراوێك بێت، کە وەکو خۆیان ئینسان بێت‌و هەست‌و نەستێکی بەشەریی هەبێت، تا لێیان تێبگات، هەروەها وەکو ئەوانیش لەسەر زەوی بژیت، بۆ ئەوەی بتوانن شوێن پێی هەڵگرن‌و بیکەنە بەسەر مەشقی خۆیان لەهەموو لایەنەکانی ژیانیاندا).

٢- وە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ ... ﴿٢٠﴾﴾ الفرقان، واتە:

(ئەی موحەممەد) لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر ئەوانیش وەکو تۆ خواردنیان خواردوەو بەبازاڕیشدا ڕۆیشتوون (وکڕینو فرۆشتنیان کردوە، واتە: تۆ شتێکی تازەو داهێنراو (بدعة)یك نی لەنێو پێغەمبەراندا، بەڵکو پێغەمبەرانی پێش تۆش هەموویان وەکو تۆ بوون،) وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ... ﴿٩﴾ ﴾ الأحقاف، واتە: من داهێنراو نیم لەنێو پێغەمبەراندا -عليهم الصلاة والسلام-

٣- وە خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَـٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴿١٠﴾ ﴾ الفرقان، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) سەرنج بدە! چۆن وێنەت بۆ دەهێننەوە -بەجۆرەها شێوە باست دەکەن- ڕێیان لێ تێکچووەو ناتوانن بێنەوە سەر ڕاستەشەقام، بەرزییو شکۆمەندیی بۆ خوایەك، کە ئەگەر ویستبای لەوە چاکتری پێ دەدای، کە ئەوان وەسفی دەکەن، چەندان باغی پێ دەدای کە ڕووباریان بەبندا بڕوات، وە چەندان کۆشكو تەلاری پێ دەبەخشی -(واتە: لە دونیادا، بەڵام ئەوانەی بۆ دواڕۆژ بۆ هەڵگرتوە).

٤- دەربارەی خودی پێغەمبەریش ﷺ کە موشریکەکان پێیان وابوو شایستەی ئەوە نیە ببێتە پێغەمبەری خوا، خوای کاربەجێ ئاوا وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ... ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ... ﴿١٢٤﴾ ﴾ الأنعام، واتە: خوا بۆ خۆی زاناترە، کە پەیامی خۆی لەکوێ دادەنێ، واتە: کێی بۆ هەڵدەبژێرێ؟!

کەسێکی بۆ هەڵبژاردوە، کە دوایی هەموو بەشەرییەت شایەدیی چاکێتی بۆ دەداو لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوە، کابرایەك بە ناوی (مایکل هارس)، کە بابایەکی دیانە، چەند ساڵێك لەمەوبەر کتێبێکی داناوە بە ناوی (المائة الأوائل)

(سەدە یەکەمەکان)، کە ئەو کتێبە تەرجەمە کراوە بە عەرەبی‌و باسی سەد ئینسانی هەڵکەوتووی کاریگەر دەکا لە مێژووداو موحەممەدی ﷺ بە یەکەم کەس داناوەو دەڵێ: ئەو سەد نەفەرەشم بەو پێیە ڕیز کردوون، کە کێیان زیاتر کاریگەریی باشتری هەبووە لەسەر مرۆڤایەتی، ئەوم لەپێشتر داناوەو دەڵێ: (محمد)ی کوڕی (عبدالله) لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تاکە ئینسانێکە، کە گەورەترین کاریگەریی چاکی هەبووبێ‌و بەرنامەیەکی هینابێ بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی بووبێ‌و، باس لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیان بکات‌و ئینسانەکان بۆ بەختەوەریی بانگ بکات.

٥- وە لە ئایەتی (٣٢)ی سووڕەتی (الزخرف)یش خوای پەروەردگار هەر وەڵامی ئەو ئیشکالەیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ ﴾، واتە: ئایا ئەوان ڕەحمەت‌و بەزەیی خوا دابەش دەکەن؟! (کە پێغەمبەرایەتی بدەن بەهەر کەسێك، کە ئارەزوویان لێبێ، ئەوان نەك هەر ئەوە ناتوانن) بەڵکو ژیانی دونیاشیان ئێمە بۆیان دیاری دەکەین.

٦- وە لە وەڵامی ئەوەشدا کە کافرەکان دەیانگوت (موحەممەد) شاعیرە یان کاهینە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الحاقة، واتە: نەخێر وانیە! سوێند دەخۆم بەوەی، کە دەیبینن وە بەوەشی کە نایبینن ﴿ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴾، واتە: ئەو قورئانە قسەی نێردراوێکی زۆر بەڕێزە، (کە (جبریل)ە عليه السلام و خوا ناردوویەتی، کە ئەو فەرمایشتە بگەیەنێتە لای باشترین بەندەی خۆی لەسەر زەوی، کە (موحەممەد)ە ﷺ ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: وە قسەی شاعیر نیە کەمێکتان ئیمان دێنن، یاخود مەبەست ئەوەیە کە کەمێکیش ئیمان ناهێنن، چونکە بۆخۆشیان دانیان پێداناوەو گوتوویانە: ئەوە شیعر نیە، شیعر

www.alibapir.com


وەزنو قافیەی هەیە، بەڵام ئەوە هیچی وەك شیعر ناچێ ﴿وَلَا بِقَوۡلِ كَاهِنٖۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾، واتە: وە قسەی (کاهن[1])یش نیە زۆر بەکەمی بیردەکەنەوە، ﴿تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ الحاقة (٣٨-٤٣) واتە: لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە نێردراوەتە خوار.

٧- ئنجا لە وەڵامی ئەوانەشدا، کە دەیانگوت موحەممەد ﷺ بۆخۆی قورئان دەڵێو هەڵیدەبەستێ! خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ٤٤ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ٤٥ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ٤٦ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ٤٧﴾ الحاقة، واتە: وە ئەگەر موحەممەد ﷺ هەندێك قسەی بەدەم ئێمەوە هەڵبەستبایە، قۆڵی ڕاستیمان دەگرتو، ڕەگی ملیمان دەپچڕاند، هیچ کەسیش نەیدەتوانی ڕێگەمان لێ بگرێ، (جا ئەگەر خوای زاڵ لە پێغەمبەر ﷺ قبووڵ نەکات قسەیەك بەناوی خواوە هەڵبەستێو هەڕەشەی توندی لێ بکات، چۆن دەتوانێ هەموو قورئان لە خۆیەوە بڵێو هەڵیبەستێ! واتە خوای پەروەردگار قبوڵ ناکات یەك قسەش بەناوی ئەوەوە بکرێت ، چ جای ئەو هەموو قورئانە).

٨- هەروەها خوای پەروەردگار وەڵامێکی دیکەی زۆر ددانشکێنی ئەو تۆمەتەیان دەداتەوەو، دەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥۚ بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ ٣٣﴾ الطور، واتە: یان دەڵێن: موحەممەد هەڵیبەستوە، بەڵکو ئیمان ناهێنن ﴿فَلۡيَأۡتُواْ بِحَدِيثٖ مِّثۡلِهِۦٓ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ ٣٤﴾ الطور، واتە: (کە دەڵێن موحەممەد هەڵیبەستوە) با ئەوانیش ئەگەر ڕاست دەکەن قسەیەکی وەکو ئەوە بێنن!

---

١) کاهن: واتە فاڵچی، یان کتێب گرەوە، ئەوەی کە قسە لە شتی داهاتوو دەکات.

٩- هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (١٣) فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا أُنزِلَ بِعِلْمِ اللَّهِ وَأَن لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ (١٤)﴾ هود، واتە: ئایا دەڵێن: موحەممەد بۆخۆی قورئانی هەڵبەستوە، بڵێ: ئێوەش دە سووڕەتی وەك قورئان بێنن -ئەگەر دەتوانن-، وە هەرچی لەتواناتاندا هەیەو دەستتان دەیگاتێ غەیری خوا هەمووان بانگ بکەن با هاریکارییتان بکەن، بەڵام ئەگەر وەڵامیان نەدانەوە (واتە: ئەوانەی، کە داوایان لێدەکەن نموونەیەکی وەکو قورئان بێننو نەیانتوانی بەدەنگتانەوە بێن- ئەوە بزانن، کە ئەو قورئانە بە زانیاری خوا دابەزیوە، (خواش عزّوجلّ خاوەنی زانیارییەکی بێسنوورە، لەبەرئەوە کەسێك دەتوانێ شتێکی وەکو قورئان بڵێ کە عیلمێکی بێسنووری هەبێ وەك خوای بێوێنە) ﴿وَأَن لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، واتە: وەجگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە نین ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾، واتە: ئایا ئێوە مسوڵمانن؟

١٠- دوای ئەوەی خوای بەرزو مەزن لە سووڕەتی (الفرقان)دا قسەی کافرەکان باس دەکات کە قورئان بەقسەی هەڵبەستراوی موحەممەد ﷺ دەزانن‌و دەڵێن: خەڵکێك یارمەتی داوە بۆ هەڵبەستنی ئەو قورئانەو وشەی ئەفسانەی پێشینان دەدەنە پاڵ قورئان، لە ئایەتی (٦)ی هەمان سووڕەتدا وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا (٦)﴾ الفرقان، واتە: بڵێ کەسێك قورئانی ناردۆتە خوار، کە نهێنییەکانی ئاسمانەکان‌و زەوی دەزانێ، بێگومان خوا زۆر تاوان پۆشەو زۆر بەبەزەییە، (واتە: ئەگەرنا

هەرکەسێك تۆمەتی وا بۆ قورئان هەڵبەستێ ئەگەر خوای پەروەردگار زۆر بەبەزەیی‌و لێبوردە نەبووایە، یەکسەر لەنێوی دەبرد).

کەواتە: قورئان نهێنی ئاسمانەکان‌و زەوی تێدایە، چونکە باسی دروستبوونی ئادەمیزاد دەکات، وە باسی دروستبوونی بوونەوەر بەگشتی دەکات، کە سەرەتا دووکەڵ (دخان) بووەو باسی ئاسمانەکان‌و زەوی دەکات، کە یەك پارچە بوون‌و باسی نهێنیەکانی ژێر دەریاو ژێر زەوی دەکات، کە هەموو ئەوانە تازە زانیاری هەندێکیانی کەشف کردوە، باشە پێغەمبەر ﷺ ئەو شتانەی چۆن زانی ئەگەر فەرموودەی پەروەردگار نەبوایە؟ هەر بۆیە زۆر لە زانا ئەورووپیی‌و ئەمریکیەکان، کە ئەو ئایەتانەی ئیعجازی عیلمییان تێدایە بینیویان‌و تێیانگەیشتوون، ئیمانیان بەخواو بە قورئان هێناوە، بۆ وێنە: یەکێك لەوانە ئەو زانایەی، کە لە بواری دەریادا زۆر شارەزا بوو کە ناوی (کۆستۆ)یە، بەهۆی ئەو ئایەتەی سوورەتی (النور)ەوە ئیمانی هێنا، کە خوای زانا تێیدا دەفەرموێ: ﴿أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ... ﴿٤٠﴾﴾ النور، ئەوکاتەی کە (ژێر دەریایی – غوّاصة) دۆزرایەوە چونە ژێر دەریا ئنجا بۆیان دەرکەوت، کە دەریا وەك چۆن شەپۆڵی ڕووکەشیی‌و دەرەکی هەیە، بەهەمان شێوەش شەپۆلی ژێریشی هەیە، ئەو زانایە گوتی: موحەممەد لە سەحرادا ژیاوەو، ئەوکاتەش (ژێر دەریایی) نەبووە، چۆن ئەمەی زانی؟ کەواتە: ئەو قورئانە لەلایەن خوایەکەوە نێرراوە، کە ئەوکاتەی ناردوویەتی، زانیویەتی لەژێر دەریادا چ باسە!

١١- ئنجا ئەو تۆمەتەی، کە گوتوویانە:[1] کابرایەکی دیکە قورئانی فێری موحەممەد کردوە، وەك لە (أسباب النزول)دا هاتوە دەڵێ: کابرایەکی (عەجەمیی) هەبووە،

١) وەك (ابن جرير) لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتی، بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص٧٤٥.

www.alibapir.com


کە ئاسنگەر بووەو ناوی (بلعام) بووە، گوتوویانە ئەو کابرایە قورئان فێری پێغەمبەر ﷺ دەکات!! خوای پەروەردگار لە وەڵامی ئەو تۆمەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ...﴿١٠٣﴾﴾ النحل، واتە: ئێمە دەزانین کە ئەوان دەڵێن: نەفەرێك قورئانی فێر دەکات! ﴿... لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ النحل، واتە: زمانی ئەو کەسەی، کە ئاماژەی پێ دەکەن (قورئانی فێری موحەممەد کردوە) ئەعجەمییە، بەڵام ئەو قورئانە زمانێکی عەرەبی زۆر ئاشکراو ڕوونە، (کە ئەگەر هەموو عارەبی زانەکان کۆببنەوە ناتوانن شێوەی سوورەتێکی بچووکی وەك سوورەتی (الكوثر) بێنن، ئەدی عەجەمیی چۆن توانی ئەو قورئانە پاراوو ڕێکو پێکە بێنێ‌و فێری موحەممەدی بکا ﷺ ؟!!).

١٢ - هەروەها وەڵامێکی دیکەشیان دەداتەوە لە سوورەتی (یونس) ئایەتی (١٥ و ١٦)داو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ ۙ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾﴾، واتە: کاتێك کە ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندرێنەوە، ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین دەڵێن: قورئانێکی دیکە بێنە یاخود بیگۆڕە! تۆ بڵێ (ئەی موحەممەد ﷺ) بۆم نیە بیگۆڕم لەلایەنی خۆمەوە، من تەنیا شوێنی ئەوە دەکەوم کە بۆم دەنێررێت، من ئەگەر سەرپێچی پەروەردگارم بکەم،

مەترسی ئازاری ڕۆژێکی گەورەم هەیە، پێیان بڵێ: ئەگەر خوا ویستبای بەسەرتاندا نەخوێنمەوە، نە بەسەرمدا دەخوێندنەوە نە ئێوەم فێر دەکرد، تەمەنێك لەنێو ئێوەدا ژیاوم پێش ئەوەی باسی پێغەمبەرایەتی بکەم، بۆچی عەقڵتان نیە؟! (چونکە هەرکەسێك کە پرۆژەیەکی هەبێ لەکاتی هێزو تواناو گەنجیەتیو پێش تەمەنی (٤٠) ساڵی مشووری خستنە ڕووی پرۆژەکەی دەخوات، موحەممەد ﷺ تا تەمەنی لە (٤٠) ساڵی تێنەپەڕیوە باسی قورئانو وەحی بۆ هاتنی نەکردوە، کەواتە هی خۆی نیە).

١٣- دیسان هەر لەوبارەوە خوای پەروەردگار لە وەڵامی بێبڕوایاندا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَـٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) پێش قورئان هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە، وەهیچ شتێکیشت بەدەستی ڕاستت نەنووسیوە — واتە: نەخوێندنەوەت هەبووە نە نووسین- ئەگەرنا ئەهلی باطیل دەکەوتنە گومانەوە (بەڵام ئەهلی کوفر ئێستا هیچ قسەیەکی بەڵگەدارو ڕاستیان پێ نیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ، کە نەخوێندەوار بووە، بەهۆی (وحي)یەوە بۆتە پێغەمبەر نەك بەهۆی خوێندەوارییەوە)، وەك مەولەویی شاعیر دەڵێ:

**هەتیو وەئەدەو ئومـمی عەللامە**

**لەمە موعجیز تر موعجیزە کامە**

کەواتە پێغەمبەر ﷺ هەرچەندە بێ باب‌و دایکیش بووە، بەڵام ئەو ئەدەب‌و ڕەوشتێکی زۆر بەرزی هەبووە کە دوژمنانیشیان شایەدییان بۆ داوەو نەخوێندەواریش بووە، کەچی دوایی بووە بە عەللامەیەك کە هەرچی زانایان‌و پێشەوایان هەن شانازیی بەوەوە دەکەن، کە بڵێن شاگردو قوتابی پێغەمبەرین -علیه الصلاة والسلام- ئایا موعجیزە لەوە گەورەتر دەبێ چی بێ؟!

١٤- هەروەها لە وەڵامی ئەو تۆمەتەدا کە پێیان گوتوە شاعیرە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾﴾ یس، واتە: ئێمە شیعرمان فێر نەکردوەو بۆشی نەبووە فێری بێت، بەڵکو تەنیا ئەوە وەبیرهێنانەوەیەکەو قورئانێکی ئاشکرایە، بەڵێ پێغەمبەر ﷺ نەیتوانیوە شیعر بڵێ، چ پێش پێغەمبەرایەتی‌و چ لەکاتی پێغەمبەرایەتییدا، بۆیە لە درێژایی تەمەنیدا دێڕە شیعرێکی لێ ڕیوایەت نەکراوە[1]، هەربۆیەش لەکاتی تێکشکانی مسوڵمانان لە جەنگی (حنین)دا دەفەرموێ: **{أنا النبيّ لا كَذِبَ أنا ابن عبدالمُطَّلِبْ}** بەشێوەیەك فەرموویەتی، کە نەبۆتە (سجع) بەمەرجێك عارەب بەوە بەناوبانگ بوون، کە شاعیریان زۆر لەنێودا بوون‌و هەرکەسێك دوو قسەی زانیبان شیعری دەگوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کە پێغەمبەر ﷺ زمان پاراوترین کەس بووە لەنێو هەموو عارەبدا، کەچی نەیتوانیوە تەنانەت دێڕە شیعرێکیش بڵێ، ئەوەش لەبەرئەوە بووە تا مەجالی تۆمەت‌و بیانوو بۆ هیچ کەسێك نەمێنێتەوە.

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير...)، ص(١١٤٧)، کە دەڵێ: (ولهذا ورد أنه ﷺ كان لا يحفظ بَيْتاً على وزن منتظم...).

١٥- هەروەها خوای بەرز کۆمەڵێك تۆمەت ڕەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ٥﴾ القلم، واتە: سوێند بە قەڵەمو بەو دێڕەی، کە بە قەڵەم دەنووسرێ، تۆ بەهۆی چاکەو نیعمەتی پەروەردگارتەوە (کە پێغەمبەرایەتییە) شێت نی، وە تۆ پاداشتێکی نەبڕاوەت هەیە، وە تۆ لەسەر ڕەوشتێکی بەرزو گەورەی، (ڕەوشتە مەزنەکەت بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە تۆ پێغەمبەری خوای، وە تۆ شێتو کاهینو جادووگەر نی) لەمەودواش تۆش دەبینیو ئەوانیش دەبینن.

١٦- وە لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار تەحەددای هەموو بەشەرییەت دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤﴾ البقرة، واتە: (ئەی خەڵکینە!) ئەگەر گومانتان هەیە لەوەی، کە ناردوومانەتە خوار بۆ سەر بەندەی خۆمان، ئێوەش سوورەتێکی وەکو ئەو بێنن، وە هەرکەسێکیش کە شایەدییتان بۆ دەداو هاوکارییتان دەکات، هەموویان بانگ بکەن (با هەموو هاوکارییتان بکەن) جا ئەگەر نەتانتوانیو نەتانکرد، وە دڵنیاش بن کە ناتوانن، خۆتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی بەردو خەڵکە، بۆ کافران ئامادە کراوە (کەواتە: کافر مەبن بۆ ئەوەی تووشی ئەو سزایە نەبن، وە ئیمان بێنن بە قورئان لەبەرئەوەی کە قورئان ئاوا تەحەدداتان دەکات، وە ئێوەش ناتوانن وەڵامی تەحەددایەکەی بدەنەوە).

ئاوا خوای تاكو پاكو پەروەردگار لە قورئانی خۆیدا پێغەمبەری خۆیو شوێنکەوتوانیشی فێرکردوە کە بەرگریی بکەن لە پێغەمبەرایەتییەکەیو لەو پەیام (وحي)یەی کە بۆی ناردوە.

# چەند شێوازێکی دیکەی بێبڕوایان لە دژایەتیکردنی پەیامو بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺو پەیڕەوانی دا

هەڵوێستی کافرەکانو دژایەتی کردنیان لەو سێ بوارەدا، کە باسمان کردن بە شێوازێکی فیکریی بوو، وە لەوبارەوە باسی بەرپەرچدانەوەی قورئانیشمان کرد، کە چۆن وەڵامی ئەو تۆمەتو گومانانەی دایەوە، خوا پشتیوان بێ لێرەشدا باسی چەند شێوازێکی دیکەی ئەهلی کوفر دەکەین، کە گرتوویاننە بەر لە دژی پێغەمبەر ﷺو ئەو پەیامو بانگەوازەی لەلایەن خواوە پێی ڕاسپێردرابوو:

## یەکەم: شێوازی دیبلۆماسییو گفتوگۆ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ:

یەکێك لەو شێوازانەی بێبڕوایانی مەککەو دەوروبەری پەنایان بردە بەر بۆ دژایەتیو پێشگیریی کردن لە پەیامو بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ، وە بەرەنگاربوونەوەی، شێوازی دیبلۆماسییو ڕێی گفتوگۆو وتووێژ بوو لەگەڵ (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر ﷺو گەورەی (بني هاشم)دا، کافرەکان هەوڵیاندا (أبو طالب) ڕازی بکەن، کە واز لە پشتگیرییکردنی (محمد) ﷺ بێنێتو پشتی بەربدات، بۆ ئەوەی بانگەوازەکەی سەر نەکەوێو نەتوانێ پەیامەکەی بڵاوبکاتەوە، ئەوەی لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەردا هاتوە، بەتایبەت لە (سيرة ابن هشام)دا، بێبڕوایان چوار جار گفتوگۆو وتووێژیان بووە لەگەڵ (أبو طالب)دا بۆ ئەوەی ڕازی بکەنو قەناعەتی پێ بێنن کە پشتی (محمد) ﷺ بەربدات، جا خوا پشتیوان بێت ئێمە لێرەدا هەر چوار هەوڵەکەی بێبڕوایان باس دەکەینو هەڵوێستی هەر یەك لە پێغەمبەری خوا ﷺو (أبو طالب)ی مامیشی لەوبارەوە دەخەینە ڕوو:

## جاری یەکەم:

ابن هشام لەوبارەوە دەڵێ: {فلما بادى رسولُ الله قومَهُ بالإسلام وصَدَعَ به كما أمره الله، لم يبعد منه قومه ولم يردّوا عليه -فيما بلغني- حتى ذكر آلهتهم وعابها، فلما فعل ذلك أعظموه وناكروه وأجمعوا خلافَهُ وعداوتَهُ إلا من عصم الله تعالى منهم بالإسلام وهم قليل مستخفون، وحَدَب على رسول الله عَمُّهُ أبو طالب ومنعه وقام دونه، ومضى رسول الله ﷺ على أمر الله مُظْهِراً لأمره لا يرده عنه شيء، فلما رأت قريش أن رسول الله لا يعتبهم عن شيء أنكروه عليه من فراقهم وعيب آلهتهم، ورأوا أن عمه أبا طالب قد حدب عليه وقام دونه فلم يُسْلِمْهُ لهم، مشى رِجالٌ من أشراف قريش إلى أبي طالب: عتبة وشيبة ابنا ربيعة ابن عبد شمس بن عبد مناف، وأبو سفيان وأبو البختري، والأسود بن المطلب وأبو جهل (عمرو بن هشام) والوليد بن المغيرة ونبيه ومُنَبِّه ابنا الحجاج بن عامر، والعاص بن وائل أو من مشى منهم فقالوا: يا ابا طالب ان ابن أخيك قد سب آلهتنا وعاب ديننا وسَفَّه أحلامَنا وضَلَّل آبائنا، فأما ان تَكُفَّه عنا وأما أن تُخَلِّيَ بيننا وبينهُ فإنك على مثل ما نحن عليه من خلافه، فنكفيكه! فقال لهم أبو طالب: قولاً رقيقاً وردّهم رداً جميلاً فانصرفوا عنه[1]}، واتە: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ ئیسلامی بۆ قەومەکەی ئاشکرا کرد، وە بە دەنگێکی زوڵاڵ ڕایگەیاند وەك خوا پێی فەرموو بوو -وەکو پێم گەیشتوە- لە سەرەتاوە قەومەکەی زۆر دوورییان لێ نەکردو بەرپەرچیان نەدایەوە، هەتا گەیشتە ئەوەی کە پەرستراوەکانی ئەوانی باسکردو ڕەخنەی لێگرتن (پەرستراوەکانی ئەهلی مەککەو غەیری ئەهلی مەککەش هەرچەندە بە ڕواڵەت صەنەمو بت بوون کە بە دەستی خۆیان دایان دەتاشین، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتیاری بتەکانیش بوون، ئەوانیش هەر لە ئاستی پەرستراوێتی دابوون، چونکە ئەگەر کەسێك

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(٣٢٧).

www.alibapir.com

کێشەیەکی هەبووایە چووە بۆ لای بتەکانو لەگەڵ یەکێك لە بتەکاندا باسی کردوە (سادن)[1] لە پشتی بتەکەوە جوابی داوەتەوە، جا یان گوتوویەتی ئاوات بۆ دەکەین، یان ئاوا بکە یان ئاوا بڕۆ!!

کەواتە لێرەدا لە باسی پەرستراوەکاندا هەم بتو صەنەمەکان وە هەم ئەو (سادن)انەش دەگرێتەوە،) (ابن هشام) دەڵێ: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ باسی پەرستراوەکانی ئەوانی کردوە بە ئاشکرا، پێیان شتێکی زۆر گەورە بوو، وە دەستیان کرد بە ڕەخنە لێگرتنی، وە هەموویان کۆك بوون لەسەر دژایەتیکردن بەرەنگاربوونەوەی پێغەمبەر ﷺ جگە لەوە کە خوا پاراستنی بەهۆی مسوڵمانەتیی ئیمانیانەوە، کە ئەوانیش ڕێژەیان کەم بوو وە خۆشیان دەشاردەوە.

(أبو طالب)ی مامی پێغەمبەریش ﷺ خۆی بۆ پێغەمبەر کردبوو بە چەپەرو بەرگری لێکردو پشتگیری لێکرد، وە پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی، کە خوا (جل شأنە) فەرمانی پێکردبوو ڕایگەیاند، وە هیچ شتێکیش ڕێی پێ نەگرتو بەرپەرچی نەدایەوە.

کاتێك کە قورەیشییەکان تەماشایان کرد –مەبەست زلە زلەکانی قورەیشییە- پێغەمبەر ﷺ شتێکی هێناوە جیایە لەوەی کە ئەوان لەسەرینی، وە قسەی دەگوت بە پەرستراوەکانیان، وە پێغەمبەر ﷺ قسەی ئەوانی قبووڵ نەبوو وە گوێی نەدەدا بەوەی کە ئەوان دەیانگوتو لۆمەو سەرکۆنەیان دەکرد، (واتە: دەستبەرداری پەیامەکەی نەبوو) وە (أبو طالب)ی مامیشی پشتگیریی لێدەکاتو تەسلیمی ئەوانی ناکاتو بەرگریی لێدەکات، کۆمەڵێك لە زلەزلەکانی قورەیش چوون بۆ لای (أبو طالب) کە ئەمانە بوون: (عتبة وشيبة)ی کوڕانی (ربيعة) و (ابو سفيان) و (أبو البختري)و (اسود بن المطلب) و (أبو جهل) کە ناوی (عمرو بن هشام)ەو (وليد بن

---

١) سادن: بە کەسێك گوتراوە، کە خزمەتکار یاخود سەرپەرشتی بتەکانی کردوە، وە کۆیەکەشی (سَدَنَة)ەیە.

المغيرة) (نبيه و منبه)ی كوڕانی (حجاج) وە (العاص بن وائل)و كۆمەڵێكی دیكەش، پێیان گوت: ئەی (أبو طالب) وەك خۆت ئاگاداری برازایەكەت (محمد ﷺ) جنێو بە پەرستراوەكانمان دەدا، وە ڕەخنە لە دینی ئێمە دەگرێ وە ئێمە بە نەزان دەزانێ، وە باب‌و باپیرانمان بە گومڕا لەقەڵەم دەدا، جا یان دەبێ وابكەی، كە دەست هەڵبگرێ لەو شتانە، یان دەبێ لێمانگەڕێی ئێمەو ئەو لەیەكی دەركەین -واتە حەقی خۆمانی لێ بستێنین- چونكە تۆش لەسەر ئەو دینەی، كە ئێمە لەسەرینی، وە تۆش وەكو ئێمە لەگەڵ ئەودا ڕاجیاییت هەیە، لێمانگەڕێ ئێمە هەق‌و حیسابی خۆمانی لەگەڵدا دەكەین.

(أبو طالب)یش ئەمجارەیان قسەیەكی نەرمی لەگەڵ كردن، وە بە شێوەیەكی جوان وەڵامی دانەوەو بەڕێی كردن ئەوانیش ڕۆیشتن.

## جاری دووەم:

بۆ جاری دووەم كافرەكان هەوڵیاندا بۆ ئەوەی بەهەر شێوەیەك بێ كاربكەنە سەر پێغەمبەر ﷺو بانگەوازەكەی‌و بەرلەو چالاكیی‌و كارە خێرەی بگرن، كە (ابن هشام) ئاوامان بۆ باس دەكات‌و دەڵێ: (ومضى رسول الله ﷺ على ما هو عليه، يُظهِرُ دين الله ويدعو إليه ثم شَرَى الأمْر بينه وبينهم حتى تباعد الرجال وتضاغنوا وأكثرت قريش ذكر رسول الله ﷺ بينها فتذامروا فيه وحض بعضهم بعضاً عليه، ثم انهم مشوا إلى أبي طالب مرة أخرى فقالوا له)، واتە: پێغەمبەر ﷺ لەسەر كارەكەی بەردەوام بووو پەیامی خوای ڕاگەیاندو، خەڵكی بۆ بانگ دەكرد، وە ئەو بارودۆخەی نێوان پێغەمبەر ﷺو كافرەكانی قوڕەیش پەرەی سەندو وردەوردە خەڵكەكە لەیەك وەدووركەوتن‌و كەوتنە دژایەتیكردنی یەكدی، وە لەنێو قوڕەیشدا زۆر باسی پێغەمبەر ﷺ دەكراو دژایەتییان دەكردو، هەندێكیان هەندێكیانی هاندەدا لە دژایەتی پێغەمبەر ﷺ، دوایی بۆ جارێكی دیكە چوون بۆ لای (أبو طالب)و پێیان گوت: (يا أبا طالب! ان لك سِنّاً ومنزلة وشرفاً فينا، وإنا قد استنهيناك من ابن أخيك فلم

تنهه عنـا، وانا والله لا نصبـر علـى هـذا مـن شـتم آباءنـا وتسـفيه أحلامنـا وعيـب آلـهتنا حتى تكفـه عنـَا أو ننازله وإياك فـي ذلك حتى يهلك أحـد الفريقيــن، أو كمـا قالوا له ثم انصرفوا عنـه)، واتـه: ئەی (أبو طـالب)! تۆ لەنێو ئێمەدا تەمـەنێکت هەیەو پلەو پایەو ڕێزو کەسـایەتییەکی تایبـەتیت هەیـە، وە ئێمـەش داوامـان لێکـردی، کـە برازاکەت قەدەغە بکەی لەوەی، کـە دەیڵـێ‌و ئێمـە لێـی بەڕەخنـە دەگـرین، بـەڵام تـۆ هیچت لەوبارەوە نەکرد، سوێند بەخوا ئێمە چی دیکە ئارام ناگرین لەسـەر ئـەو قسـەو جنێوانەی وا بە بـابو باپیـرانــمان دەیڵـێ‌و، بـە نەزانــمان لەقەڵـەم بـداو، ڕەخنـە لـە پەرسـتراوەکانمان بگـرێ، یـان دەسـتی پـێ هـەڵبگرە، یـان ئێمـە هـەموومـان دەچـینە سـەنگەرێکەوەو ئـەتۆو ئـەویش لـە سـەنگەرێك دا بـن، هـەتا یـەکێکمان یـەکێکمان دەفەوتێنین، دوایی ڕۆیشتـــن).

{فعظم على (أبي طـالب) فراق قومهِ وعداوتهم ولـم يطـب نفسـاً بإِسـلام رسـول الله ﷺ لـهم ولا خذلانه}، واتە: (أبو طـالب) زۆر لەسەر دڵی قورس بوو، لەلایەکـەوە قەومـەکەی ئاوا لێی دوور بکەونـەوەو دوژمنایـەتییان بکـات، بـەڵام دڵیشـی ئاسـوودە نەدەبوو بەوەی، کە پێغەمـبەر ﷺ تەسلیمی ئەوان بکاتو پشتی بەربدات.

(ابن إسحاق) دەڵێ: کاتێك، کە وایان بە (أبو طالب) گوت: (أبـو طالـب) لـە دوای پێغەمبەر ﷺی ناردو پێی گوت: {يا ابن أخـي! إن قومـك قـد جـاءوني فقـالوا كـذا وكذا –للّذي كانوا قالوا له- فـأبقِ عَلـيّ وعلـى نفسـك ولا تُحَمِّلْني مـن الأمـر مـالا أُطيقـ}، واتە: ئەی برازام! قەومـەکەت نوێنەریان بۆ لا ناردوومو ئاواو ئاوایـان گوتـوە، ئێستاش ڕەچاوی تواناو تاقەتی مـن بکە، وە خۆشتو منیش مەخە ژێر بارێکەوە، کـە لە تواناماندا نەبێ، {فظـن رسول الله ﷺ أنه قـد بـدا لعمـه فيـه بـداءٌ، وأنَّـه خاذِلُـهُ ومُسْلِمُهُ وأنه قد ضَعُفَ عـن نُصْرَته والقيـام معه، قال: فقـال رسـول الله ﷺ}، واتـە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وابوو مـامی بۆچـوونێکی نـوێی بـۆ پەیـدا بـووە، وە پشـتی بـەردەداو تەسـلیمی دەکـات، وە دەسـەڵاتی نیـە چـی دیکـە بـەرگریی لــێ بکـاتو پشـتگیریی بکات، بۆیە پێغەمـبەر ﷺ فەرمووی: **{يا عم والله لو وضعوا الشمس**

**في يميني والقمر في يساري على أن أترك هذا الأمر حتى يظهره الله أو أهلك فيه، ما تركته}**، واتە: دە ئەی مامە گوێت لێبێ! سوێند بە خوا ئەگەر خۆر لە لای ڕاستم دابنێن، وە مانگیش لەلای چەپم دابنێن، بەوەی واز لەم کارەم بێنم، وازی لێ ناهێنمو دەستی لێ هەڵناگرم، تاکو یان دەبێ ئەو دینە دەرکەوێو ئاشکرا بێو سەرکەوێو بە خەڵك ڕابگا، یان من لە ڕێیدا بفەوتێم.

**{ثم استعبر رسول الله ﷺ فبكى ثم قام}**، واتە: دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو گریاو ڕۆیشت، (فلما ولّى ناداه أبو طالب فقال: أقبل يا ابن أخي، قال: فأقبل عليه رسول الله ﷺ، فقال: اذهب يا ابن أخي، فقل ما أحببت فوالله لا أُسْلِمُك لشيءٍ أبداً[1])، واتە: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ ئاوای کردو ڕۆیشت (أبو طالب) بانگی کردو پێی گوت: وەرە برازای خۆم چیت پێخۆشە وا بڵێ، سوێند بە خوا تەسلیمی کەست ناکەمو پشتت بەرنادەم.

دیارە کە (أبو طالب) فشاری خراوەتە سەر ئەویش فشاری خستۆتە سەر پێغەمبەر ﷺ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرئەوەی، کە لەلایەن خواوە ڕەوانەکراوەو لەسەر یەقینە، بۆیە بە ئەندازەی تاڵە موویەکیش لەوبارەوە نەرمکێشیی نەنواندوەو لەپێناو سەلامەتیو ئیسراحەتی خۆیدا تەنازولی نەکردوەو، ڕەزامەندییو بەجێهێنانی فەرمانی پەروەردگاری لە سەرووی هەموو شتێکەوە داناوە[2].

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٣٣).

٢) شایانی باسە، کە (شيخ ناصرالدين الألباني) لەجیاتی ئەو دەقەی سەرێ، ئەم دەقەی هێناوە، کە دەڵێ: (روى البخاري في (التأريخ) والبيهقي عن الحاكم من حديث عقيل بن أبي طالب قال:

جاءت قريش الى أبي طالب فقالوا: إن ابن أخيك هذا قد آذانا في نادينا و مسجدنا، فانهه عنا.

فقال: يا عقيل! انطلق فأتني بمحمد. فانطلقتُ فاستخرجته من كنس، أو خنس – بيت صغير- فجاء به في الظهيرة في شدة الحر، فلما أتاهم قال: إن بني عمك هؤلاء زعموا أنك تؤذيهم في ناديهم ومسجدهم، فانته عن آذاهم. فحلّق رسول الله ﷺ ببصره الى السماء، فقال: **{ترون هذه الشمس؟}**، قالوا: نعم.

قال: **{فما أنا بأقدر أن أدع ذلك منكم على أن تستعلوا منها بشعلة}**.

www.alibapir.com

## جاری سێیەم:

بۆ جاری سێیەم دیسان کافرەکان هەوڵیان دایەوە وەك (ابن هشام) دەڵێ: کاتێك قورەیش بینییان (أبو طالب) پشتی برازاکەی بەرنادات‌و تەسلیمی ئەوانی ناکات‌و دەستبەرداری نابێ، کوڕێکیان لەنێو قورەیشدا هێنا بە ناوی (عمارة بن الوليد)، کە گەنجێکی زۆر بەرچاوو جوان بوو، ئەو گەنجەیان لەگەڵ خۆیان بردو چوون بۆ لای (أبو طالب)و پێیان گوت: {يا أبا طالب هذا عمارة بن الوليد أَنْهَدُ فتى قريش وأجمله، فخذه فَلَكَ عقله ونصره واتخذه ولداً فهو لك، وأسْلِمْ إلينا ابن أخيك هذا الّذي قد خالَفَ دينك ودينَ آبائك وفَرَّق جماعة قَومِكَ وسَفَّه أحلامهم فنقتله فإنما هو رجل برجلٍ!}، واتە: گوتیان: ئەی (أبو طالب)! ئەوە (عمارة بن الوليد)مان بۆ هێناوی بۆتۆ بێ، جوانترین‌و بەشان‌و شەوکەتترین گەنجە لەنێو قورەیشدا، تۆش ئەو برازایەی خۆتمان تەسلیم بکە، ئەو کەسەی، کە پێچەوانەی دینی تۆو باب‌و باپیرانت جووڵاوەتەوە، وە کۆمەڵگای ئێمەی کردۆتە دوو بەشەوە وە بە بێعەقڵمان دەزانێ، ئێمە دەیکوژین ئەوەش پیاوێك بە پیاوێکە!، {فقال والله لبئس ما تسومونني أتعطونني ابنكم أُغَذُّوه لكم وأُعطيكم ابني فتقتلونه، هذا والله ما لا يكون أبداً، أفلا تعلمون ان الناقة إذا فقدت ولدها لم تحن إلى غيره[1]}، (أبو طالب) وەڵامێکی زۆر جوامێرانەی دانەوەو گوتی: وەڵڵاهی ئەوە خراپترین سەودایە لەگەڵ مندا دەیکەن، ئایا ئێوە کوڕی خۆتان دەدەنە من بۆتان بەخێوکەم‌و پەروەردەی بکەم‌و خزمەتی بکەم‌و، منیش کوڕی خۆمتان بدەمێ بیکوژن؟! سوێند بە خوا قەت شتی

---

فقال أبو طالب: والله ، ما كذب ابن أخي قط، فارجعوا).

پاشان گوتوویەتی (وأما حديث **{ياعم! لو وضعوا الشمس في يميني..}** فلم أورده هنا، لضعفه، على شهرته وقد بينت ذلك في (الضعيفة) رقم: ٩١٣.

بڕوانە (صحيح السيرة النبوية) بقلم محمد ناصرالدين الألباني، ط١، ص(١٤٣، ١٤٢٨، ٢٠٠٧) مكتبة: المعارف للنشر والتوزيع.

١) (السيرة النبوية لأبن هشام)، ج١، ص(٣٣٣).

وا نابێ‌و هەرگیز مل بۆ شتی وا نادەم -دوایی وێنەیەکی بۆ هێنانەوە-و گوتی: ئەی ئێوە نازانن کاتێك حوشتر بەچکەکەی لێ دەفەوتێ، دڵی بە هیچ بەچکەیەکی دیکەدا ناچێ!، کەواتە: (أبو طالب) ئەمجارەش بەم شێوەیە بەرپەرچی دانەوە.

## جاری چوارەم:

(ابن هشام) دەڵێ: قورەیش لە بەینی خۆیاندا کەوتنە مشتومڕەوەو هەرکەسێك لە هەر تیرەیەك مسوڵمان بووبایە تیرەکەیان لێ هاندەدا، کە ئازارو ئەشکەنجەی بدەن، وە دەڵێ: {فوثبت كل قبيلة على من فيهم من المسلمين يعذبونهم ويفتنونهم عن دينهم}، واتە: هەر تیرەیەك ئەوەی لەنێو خۆیدا مسوڵمان بووبوو، دەیگرت‌و ئەشکەنجەی دەدا، وە پێیان دەگوت دەبێ لە دین هەڵگەڕێنەوە، بە نسبەت پێغەمبەرەوە ﷺ، دەڵێ: {ومنع الله الرسول بعمه أبي طالب} وە خوا پێغەمبەری ﷺ سەلامەت کرد، ئەویش بەهۆی مامییەوە، (کە خوا بۆی کردبوو بە بەلاگێڕەوە، هەرچەندە ئەویش هەر ئەزیەتدراوە، وەك لە دواییدا باسی دەکەین)، پاشان (ابن هشام) دەڵێ: {وقد قام أبو طالب حين رأى قريشاً يصنعون ما يصنعون في بني هاشم وبني المطلب، فدعاهم إلى ما هم عليه من منع رسول الله ﷺ والقيام دونه، فاجتمعوا إليه وقاموا معه وأجابوه إلى ما دعاهم إليه، إلا ما كان من أبي لهب عدو الله الملعون...[1]}، واتە: (أبو طالب) کاتێك کە، تەماشا دەکا هەموو سەرانی قورەیش ئەوە دەکەن کە دەیکەن، خزمانی خۆی کۆکردنەوە لە (بني هاشم و بني المطلب) وە گوتی: من بڕیارم داوە، کە بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، وە قبووڵ ناکەم هیچ کەس خراپەی لەگەڵ بکا، وە من پشتگیریی لێدەکەم، ئێوەش هەمووتان دەبێ ئەو هەڵوێستەتان هەبێ، ئەوانیش هەموویان یەك دەنگ بوون لەسەر جێبەجێکردنی ئەوەی، کە داوای لێکردبوون، (بەڵام وەکو

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(٣٣٣).

عەشیرەت، چونکە ئەوانەی بەڵێنیاندا بە (أبو طالب) مسوڵمان نەبوون، بەڵکو هەر لەسەر کوفرو شیرك بوون).

ئاوا بەو شێوەیە کافرەکان بە شێوازی جۆراو جۆری دیبلۆماسیی، واتە: گفتوگۆ، لەگەڵ (أبو طالب) ڕووبەڕووبوونەوە، بۆ ئەوەی پشتی پێغەمبەر ﷺ چۆڵ بکاتو کارێك بکەن (أبو طالب) یارمەتی پێغەمبەر ﷺ نەداو لێی دوور بکەوێتەوە.

جا با سەرنج بدەین!

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە بۆ خوا دەستی کردوە بە ڕاگەیاندنی دینو جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە گەورەو گرنگە، نەیزانیوە کە مامی چ هەڵوێستێکی دەبێ، ئایا پشتی دەگرێ یان نا؟ بەڵکو بە ئەرکێکی خوایی زانیوەو بۆ ڕەزامەندیی خوا دەستبەکار بووە، وەك لە هەڵوێستەکانی پێغەمبەر ﷺ وادیارە، کە ئەگەر (أبو طالب)یش نەبووایەو پشتی نەگرتبایە، پێغەمبەر ﷺ هەر کۆڵی نەدەدا، بەڵام خوای پەروەردگار هۆکاری سەرکەوتنی بۆ ساز کردوەو پشتگیرییەکی باشی بۆ ڕەخساندوە، نەك کاری پێغەمبەر لەسەر ئەو وەستا بێت! بەڵکو سوودی لێ بینیوە، هەر بۆیە وەك دەبینین دوای مردنی (أبو طالب)یش پێغەمبەر ﷺ هەر بەردەوام بووەو درێژەی بە کارەکەی داوەو، مردنی ئەو نەبۆتە هۆی ساردبوونەوەی پێغەمبەر ﷺو وازهێنانی.

خوای کاربەجێ لە سەرەتاوە، کە کۆمەڵەکەیان ساوا بووە (أبو طالب)ی مامی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕەخساندوە، کە ئەوەش مەعنەوییەتێكو هێزێکی دیکەی داوە بە مسوڵمانان، وە کە بینیویانە کەسێکی ناسراوی وەك (أبو طالب) بەرگری لێ دەکات، زیاتر ورەیان پەیدا بووە.

دوایی بە یارمەتی خواو بەردەوامیی پێغەمبەر ﷺو یارانی لەسەر بانگکردن بۆ دینی خوا، هێزو پێزیان زیاتر بوو، وە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ لە بەرەو پێشچوون دابوون.

هەرچەندە هەر یەك لە (أبو طالب)ی مامیو (خدیجة)ی خێزانی بە شێوەیەكو لە ئاستێكو سەنگەرێكەوە هاوكارو پشتگیری پێغەمبەر ﷺ بوون، (أبو طالب) لە دەرەوەی ماڵو لەنێو مەككەو خەڵكی مەككەداو، (خدیجة)ش لەنێو ماڵو لە نزیكەوە، لە یەك ساڵیشدا وەفاتیان كردو دەوری پێغەمبەریان چۆڵ كردو پێغەمبەر ﷺ زۆر نیگەران بوو، وە مێژوونووسان لە كتێبەكانی (سیرة)دا بە ساڵی ماتەمینی (عام الحزن) بۆ پێغەمبەریان ﷺ ناو بردوە، بەلام بە وەفاتی ئەوانو هیچ كەسێكی دیكەش، پێغەمبەر ﷺ لە كارەكەی سارد نەبۆتەوەو پاشەكشەی نەكردوە، چونكە ئەو پەیامو بانگەوازە پەیوەندی بە خواوە بووەو پێغەمبەریش ﷺ ئەو بەسەرهاتەو ئەوانەی دیكەش، كە بەسەری هاتوون بە تاقیكردنەوەیەكی داناونو لەلایەن خواوەو سەبرو ئارامی گرتوەو، چەسپیوو بەردەوام بووەو لەگەڵ هەموو بەسەرهاتەكاندا بەپێی فەرمانو ڕەزامەندیی خوا هەڵسوكەوتی لەگەڵدا كردوون، وە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{يُبْتلى الرجل على حسب دينه فان كان في دينه صلابة زيد له في البلاء}** رواه الترمذي واحمد وصححه ابن كثير، واتە: ئینسان لەقەدەر دینو ئیمانی تاقی دەكرێتەوە، تا ئیمانی باشترو بەهێزتر بێ، تاقیكردنەوەكەشی قورسترو سەختتر دەبێ، ئێمەش پێویستە لەو ڕووەوە پەندو عیبرەت لە بەلاو موسیبەتو لەو ناڕەحەتییانەی بەسەر پێغەمبەرماندا هاتوون، وەربگرین.

خوای بە بەزەیی، كە خاوەنی ئەوپەڕی سۆزو بەزەییو میهرەبانییە، جاری وایە چ وەك تاك چ وەك كۆمەڵ، بەلاو ناڕەحەتییەكیان بەسەر دێنێو تاقییان دەكاتەوە، تاكو ئیمانەكەیان بەهێزتر بكات، چونكە ئینسان هەتا بە ناڕەحەتیی زیاتردا تێپەڕێت، بە پلەكانی ئیماندا زیاتر سەردەكەوێ، بەڕاستی ئەو گیروگرفتو ناڕەحەتییانەی دێنە سەر ڕێی ئینسان، وەك مەشقو تەدریبنو ئینسان پێیان بەهێز دەبێ.

www.alibapir.com

من لە کاتێکدا کە لە زیندانی (کرۆپەر)ی ئەمریکیەکان دابووم‌و ماوەی (٢٢) مانگ بە زوڵم گرتیانم، کە نامەم بۆماڵەوە دەناردەوە، دەمگوت: ئێستا هەست دەکەم، کە لە مەشق دام وە خوای کاربەجێ دەیەوێ ئیمانەکەم بەهێزتر بکاو زیاتر شارەزام بکات لە دینەکەی خۆی.

مەبەستم لێرەدا ئەوەیە، کە ئێمە دەبێ بزانین خوای بەخشەر لەگەڵماندا بە بەزەیی‌و میهرەبانە، لەکاتێکدا کە ئیمانەکەمان زۆر بەهێز نیە، ناهێڵێ فشارمان زۆر بکەوێتە سەر، وە هەرکاتێك کە ئیمانەکەمان بەهێزتر بوو فشاری زیاترمان دەکەوێتە سەر، بۆئەوەی ئەو فشارو تاقیکردنەوانە ببنە هۆکاری زیاتر بەهێزبوونی ئیمانمان.

دیارە کەسێکیش بیەوێ چێشتێك بکوڵێنێ ئاگری بۆ زیاد دەکات، ئیمانیش لەڕاستیدا لە بۆتەی تاقیکردنەوەو نارەحەتییەکاندا قاڵ دەبێتەوەو ساغ دەبێتەوە، وە ئینسان لە کڵ دەردێ، وەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە دەفەرموێ:(١) ئینسان بە تاقیکرانەوەو نارەحەتییەکاندا دەڕوات تا وای لێدێ ئیمانەکەی وەکو تاشە بەردی سپی لێدێ، کە هیچ شتێك کاریگەریی لەسەری نابێت.

## دووەم: شێوازی دیبلۆماسیی‌و گفتوگۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ

لێرەدا سێ هەڵوێستی بێبڕواکان باس دەکەین، کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کەوتوونە وتووێژو گفتوگۆوەو بێگومان ئەو وتووێژو گفتوگۆیانەی، کە لەلایەن ئەهلی کوفرەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کراون، ئێستاش هەر ئەو شێوە گفتوگۆو وتووێژانە دەکرێن لەگەڵ ئەهلی ئیمان‌و کەسانێکدا، کە دەیانەوێ بەڕێی

---

١) بڕوانە: (صحیح مسلم): ٣٦٧.

پێغەمبەردا ﷺ هەنگاو بنێن‌و، کۆمەڵگاکانی خۆیان بگۆڕن‌و بەوشێوەیەی لێ بکەن، کە خوای پەروەردگار پێی ڕازییە:

**یەک:**

هەوڵدانی یەکەم بۆ دانوستان (مفاوضات)و وتووێژی کافرەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ (ابن هشام) لە (السيرة النبوية)دا[1] بەم شێوەیە بۆمانی دەگێڕێتەوە:

(قال ابن اسحاق: وحدَّثني يزيد بن زياد عن محمد بن كَعْب القرظي، قال: حُدِّثْتُ أن عتبة بن ربيعة وكان سيداً، قال يوماً وهو جالسٌ في نادي قريشٍ، ورسول الله ﷺ جالسٌ في المسجد وحده: يامعشر قريش! ألا أقومُ الى محمدٍ فأُكَلِّمَهُ وأَعرِضَ عليه أُموراً لعلَّه يقبل بَعْضها فَنُعْطِيَهُ أَيّها شاءَ ويكفَّ عنّا؟ وذلك حين أسْلَم حمزة ورأوا أصحاب رسول الله ﷺ يزيدون ويكثرون، فقالوا: بلى يا أبا الوليد قُمْ اليه فكلِّمْهُ، فقام اليه عتبة حتى جلس الى رسول لله ﷺ فقال: يا ابن أخي! انك مِنّا حيث قد علمت من السِّطة في العشيرة والمكان في النَّسَب وانك قدأتيت قومك بأمرٍ عظيمٍ، فَرَّقْتَ به جماعتهم وسفَّهْتَ به أحلامهم وعِبت بِه آلهتهم ودينهم وكفَّرت به مَنْ قضى من آبائهم، فاسمع مِنّي أعرِضُ عليك أموراً تنظرفيها لعّلك تقبل منها بعضها.

قال: فقال له رسول لله ﷺ: (قل يا أبا الوليد أسْمَعْ)

قال: يا ابن أخي! إنْ كنت انّما تريد بما جئت به من هذا الأمر مالاً جَمَعْنا لك من أموالنا حتى تكون أكثرنا مالاً، وان كنت تريدُ به شَرَفاً سَوَّدْناك عليها، حتى لانقطعُ أمراً دونك، وانْ كنت تريد مُلكاً ملَّكْناك علينا، وان كان هذا الذي يأتيك رئيّاً تراه لا تستطيعُ رَدَّه عن نفسك طَلَبْنا لك الطب وبذلْنا فيه أموالنا حتى نُبرْئك منه، فأنه ربَّما غَلَبَ التابِعُ على الرجل حتى يُداوى منه، أو كما قال له)، حتى اذا فَرَغ عتبة، ورسولُ الله ﷺ يستمع منه.

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٤٦-١٤٧)، ط١ دار ابن الهيثم.

قال: أَقَدْ فَرَغت يا أبا الوليد؟

قال نعم.

قال: فاسمع مِني.

قال: أفْعَل.

فقال: ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ ﴾ فصلت، ثم مضى رسول الله ﷺ يقرؤها عليه: فلما سَمِعها منه عتبة أنصت لها وألْقى يَدَيْهِ خَلْف ظَهْرِهِ معتمداً عليها يستمع منه، ثم انتهى رسول الله ﷺ الى السجدة منها، فَسَجَد، ثم قال: (قد سمعت يا أبا الوليد ما سمِعت فأنت وذلك).

فقام عتبة الى أصحابه، فقال بعضهم لبعضٍ: نَحْلِفُ بالله لقد جاءكم أبو الوليد بغير الوجه الذي ذَهَب به، فلما جَلَسَ اليهم قالوا: ما وراءك يا أبا الوليد؟

قال: ورائي أنيِّ قد سمعتُ قولك والله ماسَمِعْتُ مثله قط، والله ماهو بالشعر، ولا بالسحِّر ولا بالكهانة، يامعشر قريشٍ أطيعوني واجعلوها بي، خَلُّوا بين هذا الرجل وبين هو فيه فاعتزلوه، فوالله ليكونن لقوله الذي سمعتُ منه نبأ عظيمٌ، فأنْ تُصبْهُ العَرَبُ فقد كُفيتموهُ بغيركم، وانْ يظهر على العرب فمُلْكُهُ مَلككُمْ وعِزُّهُ عِزُّكُمْ، وكنتم أَسْعَدَ الناس به، قالوا: سحرك والله يا أبا الوليد بلسانِهِ، قال: هذا رأيي فيه، فاصنعوا مابدا لكم.).

واته: (ابن اسحاق) گوتوویەتی: (يزيد بن زياد) له (محمد بن كعب القرظي)یەوە هێناویەتی، که گوتوویەتی: (عوتبەی کوڕی ڕەبیعە)، کە سەرۆك تیرەیەك بووە،

ڕۆژێکیان لە دیوەخانی قوڕەیش دانیشتوەو، لەوکاتەش پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەنیا لە مزگەوت بووە، گوتوویەتی: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش، ئەرێ نەچم قسە لەگەڵ موحەممەد بکەمو هەندێك شتی بۆ پێشنیار بکەم، بەڵکو هەندێکی قبووڵ بکاتو ئێمەش چی ویست بۆی بکەینو، ئەویش وازمان لێ بهێنێ؟

دیارە ئەوەش لەو کاتەدا بوو، کە حەمزە مسوڵمان بووبووو، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ یان دەبینی، کە گەشە دەکەنو زۆردەبن، گوتیان: با، ئەی بابی وەلید! بچۆ لایو قسەی لەگەڵ بکە.

ئیدی عوتبە هەڵساو چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتو گوتی: ئەی برازام! خۆت دەزانی، کە تۆ لە تیرەو ڕەچەڵەکدا چ پلەو پایەیەکت هەیە، تۆ لەنێو گەلەکەتدا شتێکی نوێت پەیداکردوە: کۆمەڵیانت پێی پەرتەوازە کردوەو عەقڵیانت پێی بە سووك داناوەو، ڕەخنەت پێی لە پەرستراوەکانیانو لە ئاینیەکەیان گرتوەو، بەهۆیەوە بابو باپیرانی پێشوویانت بە کافر داناوە! جا گوێم بۆبگرە چەند شتێکت بۆ پێشنیار دەکەم بەڵکو هەندێکی قبووڵ بکەی!

دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی بابی وەلید، بڵێ گوێ دەگرم!

گوتی: ئەی برازام! ئەگەر مەبەستت لەوەی کە هێناوتە ماڵو سامانە، ئەوە هێندەت لە سامانی خۆمان بۆ خڕدەکەینەوە، کە سامانی تۆ لە هی هەموومان زیاتربێ، ئەگەر گەورەییت دەوێ، ئەوە دەتکەینە گەورەی خۆمان، ئەگەر پادشایەتیت دەوێ، دەتکەینە پادشای خۆمان، ئەگەر ئەوەی دێتەلات جندێکەو ناتوانی لەخۆتی دوور بخەیتەوە، پزیشکت بۆ دێنین سامانی خۆمانی تێدا خەرج دەکەین، هەتا چاکت دەکەینەوە، چونکە جاریوایە جند بەسەر پیاودا زاڵ دەبێ، هەتا پێویستی بە چارەسەر دەبێ! یان شێوەی ئەوەی گوت.

جا کاتێك عوتبە لێبۆوە، پێغەمبەری خواش ﷺ هەر گوێی گرتبوو، فەرمووی: ئەی بابی وەلید! تەواو بووی؟

www.alibapir.com

گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دەجا گوێم بۆ بگرە!

گوتی وا دەکەم، فەرمووی: بەناوی خوای بەبەزەییو بەخشندە، حا، میم، نێردراوەتە خوار لە (خوایەکی) بەبەزەیی بەخشندەوە کتێبێکە ئایەتەکانی ڕۆشن کراونەوە، قورئانێکی عەرەبییە بۆ کەسانێك کە بزانن، مـوژدەدەرو ترسێنەرە، جا زۆربەیان پشتیان هەڵکردو نابیستن، گوتیان: دڵمان بەرانبەر بەوەی بۆمانی بانگ دەکەی لە کیف وەرپێچراوەو لەنێوان ئێمەو تۆدا پەردەیەك هەیە، جا تۆ چیت لەدەست دێ بیکەو، ئێمەش چی پێمان بکرێ دەیکەین!

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بوو لەسەر بەسەردا خوێندنەوەی، عوتبەش پاش بیستنی گوێی بۆ هەڵخستو، هەردووك دەستیشی لەدوای پشتییەوە دانابوونو سەنگی خۆی دابووە سەریان، گوێی بۆ دەگرت، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە شوێنی سەجدە بردن لەو سوورەتەداو، سەجدەی برد، پاشان فەرمووی: ئەی بابی وەلید! ئەوی بیستت بیستت، ئیدی خۆت سەرپشك بە!

عوتبەش هەڵسا بەرەو لای هاوەڵەکانی، هێندێکیان بە هێندێکیان گوت، سوێند بەخوا دەخۆین بابی وەلید بە ڕووێکی جیاواز لەوەی پێی چووە لای، گەڕایەوە لاتان!

جا کاتێك لایان دانیشت، گوتیان، ئەی بابی وەلید! چیت پێیە؟

گوتی: ئەوەی پێمە: بەخوا قسەیەکم بیست هەرگیز شتی وام نەبیستوە، بە خوا نە شیعرە، نە جادوویە، نە فاڵچێتییە، ئەی کۆمەڵی قورەیش بەقسەم بکەنو بیخەنە ئەستۆم، لەو پیاوەو لە کارەکەی بگەڕێنو هەقتان بەسەریەوە نەبێ، بە خوا ئەو قسەیەی لێم بیست هەواڵێکی مەزنی دەبێ، جا ئەگەر عەرەب (واتە: غەیری ئێوەی قورەیش) فەوتاندیان، ئەوە بەهۆی غەیری خۆتانەوە لەکۆڵتان بۆتەوە، بەڵام ئەگەر بەسەر عەرەبدا سەرکەوێ، ئەوە موڵکی ئەو هی ئێوەیەو دەستەڵاتی وی هی ئێوەیە، وە ئێوە بەهۆیەوە بەختەوەرترین کەس دەبن.

گوتیان: ئەی بابی وەلید! بەخوا بەزمانی جادووی لێکردووی!

گوتی: ئەوە ڕای منە لەبارەیەوەو خۆشتان چی پێتان باشە وابکەن!

www.alibapir.com

**دوو:**

هاوبەشدانەرانی مەککە جارێکی دیکە هەوڵێکی دیکەیاندا بۆ دانوستان‌و گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺو بۆ ئەو مەبەستە ڕۆژێکیان دوای خۆر ئاوابوون: {عتبة بن ربيعة و شيبة بن ربيعة و أبو سفيان والنضر بن الحارث وأبو البختري، والأسود بن المطلب وزمعة بن الأسود والوليد بن المغيرة وأبو جهل بن هشام والعاص بن وائل ونبيه ومنبّه ابنا الحجاج وأمية بن خلف}، کە نوێنەری قوڕەیش بوون لە نزیك کەعبە کۆبوونەوە، یەکێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەرو پێی گوت: کە ئەو چەند کەسە کۆبوونەوەو دەیانەوێ سەبارەت بەو کارەی تۆ قسەت لەگەڵ بکەن، پێغەمبەریش ﷺ بەپەلە چوو بۆ لایان کە ئەویش زۆر مەبەستی بوو ئەو زلەزلانە ببێنێ بۆ ئەوەی قسەیان بۆ بکات، کە پێغەمبەر ﷺ هاتە لایان پێیان گوت: {يا محمد أنا قد بُعِثْنا إليك لنكلمك وانا والله ما نعلم رجلاً من العرب أدخل على قومه مثل ما أدخلت على قومك، لقد شتمت الآباء وعبت الدين وشتمت الآلهة وسفّهت الأحلام وفرقت الجماعة... فإن كنت انما جئت بهذا الحديث تطلب بهِ مالاً جمعنا لك من أموالنا حتى تكون أكثرنا مالاً، وان كنت إنّما تطلب به الشرفَ فينا فنحن نسوّدك علينا، وان كنتُ تريد به ملكاً ملكناكَ علينا، وان كان هذا الّذي يأتيكَ رَئياً تراه قد غلب عليك -وكانوا يسمون التابع من الجن رِئيّاً- فربّما كان ذلك، بذلنا لك أموالنا في طلب الطِّبِّ لك حتى نبرئك منه أو نُعْذرَ فيك[1]}، واتە: ئەی موحەممەد! ئێمە نوێنەرین نێرراوین بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی قسەت لەگەڵدا بکەین، وە ئێمە بە خوا هیچ کەسێك شك نابەین لەنێو عارەباندا شتێکی پەیدا کردبێ وەك ئەوەی تۆ پەیدات کردوە، تۆ عەیب لە دینمان دەگری‌و، ڕێو شوێنی پێشینانمان بەهەڵە دەزانی‌و، جنێو بە پەرستراوەکانمان دەڵێی‌و، ئێمەت پێ بێ عەقڵ‌و نەفامەو، کۆمەڵگای

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، (ص١٤٧- ١٤٨).

www.alibapir.com


ئێمەت پەرتەوازە كردوەو... جا ئەو قسانەی، كە تۆ دەیانكەی ئەگەر مەبەستت پێی ماڵو سامانە ئەوە ماڵو سامانت بۆ كۆدەكەینەوە تا لە هەموومان دەوڵەمەندتر دەبی، وە ئەگەر دەتەوێ بتكەین بەسەرۆكی خۆمان ئەوا دەتكەینە برا گەورە، وە ئەگەر دەتەوێ ببی بە پادشا دەتكەین بە پادشا، یان ئەگەر ئەوەش نیەو (جند)ێك بەسەرتدا زاڵ بووە، ئەوە پارەو سامانی خۆمان خەرج دەكەینو دكتۆرت بۆ پەیدا دەكەین تاكو چاكت دەكەینەوە، جا یان چاك دەبی یا ئەوكات ئێمەش خاوەن عوزرین، چونكە هەرچی پێمان كراوە كردوومانە.

پێغەمبەر ﷺیش وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: **{مابي ما تقولون، ما جئت بما جئتكم به أطلب أموالكم، ولا الشرف فيكم، ولا المُلك عليكم، ولكن الله بعثني إليكم رسولاً، وأنزل عليّ كتاباً وأمرني أن أكون لكم بشيراً ونذيراً، فبلّغتكم رسالات ربي ونصحت لكم، فإن تقبلوا مني ما جئتكم به فهو حظكم في الدنيا والآخرة، وان تَردوه عليّ أصبر لأمر الله حتى يحكم الله بيني وبينكم أو كما قال[1]}**، واتە: ئەوەی ئێوە دەیڵێن ئەوەم نیە (سەرەتا نەفی ئەوە دەكا كە شێت بێ)، وەئەوەی كە من بۆ ئێوەم هێناوە مەبەستم پێی ماڵ كۆكردنەوە نیە، وە مەبەستم پێی سەرۆك خێڵایەتیو گەورایەتی نیە، هەروەها مەبەستم پێ پادشایەتییش نیە من پێغەمبەری خوام، بۆ لای ئێوەی ڕەوانە كردووم، وە كتێبێكیشی بۆ لا ناردووم، وە فەرمانی پێ كردووم، كە موژدەتان پێ بدەم (بە بەهەشت ئەگەر بەندایەتی بۆ خوا بكەن)، وە بتانترسێنم (بە دۆزەخ ئەگەر بەندایەتی بۆ خوا نەكەن) ئەوە من پەیامی خوام پێ ڕاگەیاندن، وە دڵسۆزییم بۆ نواندن، ئەگەر لێم وەربگرن، ئەوە بەشو پشكێكی باشتان لە دنیاو دوارۆژدا هەیە، ئەگەر بەسەریشم دابدەنەوە، ئەوە سەبر دەگرم بۆ فەرمانی خوا، تا خوا حوكم لە بەینی منو ئێوەدا دەكات.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٤٨).

ئاوا بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دووەم هەوڵی کافرەکانی دایەوە، کە هاتبوون دانوستان (مفاوضة)ی لەگەڵدا بکەن.

**سێ:**

جارێکی دیکەش وەك دوایین هەوڵ، قورەیشییەکان بۆ گفتوگۆو ڕێککەوتنو دانوستان (مفاوضات): {الأسود بن عبدالمطلب والوليد بن المغيرة وأمية بن خلف والعاص بن الوائل}یان ناردە لای پێغەمبەر ﷺو پێیان گوت: {يا (محمد)! هلم فلنعبد ما تعبد وتعبد ما نعبد، فنشترك نحن وأنت في الأمر، فإن كان الّذي تعبد خيراً مما نعبد، كنا قد أخذنا بحظنا منه، وان كان ما نعبد خيراً مما تعبد، كنت قد أخذت بحظك منه![(١)]}، واتە: ئەی موحەممەد! وەرە ئەوەی تۆ دەیپەرستی ئێمەش لەگەڵ تۆ دەیپەرستین، ئەوەی کە ئێمەش دەیپەرستین تۆش بیپەرستە، جا ئەگەر ئەوەی تۆ دەیپەرستی باشتر بوو لەوەی ئێمە، ئەوە لەو خێرەی کە تۆ لەسەری ئێمەش تێیدا بەشدار دەبین، وە ئەگەر پەرستراوەکانی ئێمەش باشتر بوون، ئەوە تۆش لە خێری ئەوەی ئێمەدا بەشداری، (چ سەودایەکی عەجایبو سەیرە!).

لێرەدا خوای پەروەردگار لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ الكافرون﴾.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٨٧).

www.alibapir.com


ئەوەی لێرەدا زۆر جێی سەرنجو ڕامانە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ پێغەمبەری خۆی بووەو ڕێنمونی کردوە، وەك لێرەدا خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ وەلامیان بدەوەو بڵێ: ئەی بێبڕواینە! ﴿لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، (چونکە ئەوان بە ڕواڵەت بتو صەنەمو لەڕاستیدا ئەوانەیان دەپەرست کە لەپشت بتو صەنەمەکان بوون، وەك (أبو جهل)و (وليد بن المغيرة) باقی زلەزلەکانی قوڕەیش، کە حەلاڵو حەرامیان دیاری دەکرد بۆ خەڵك، وەخۆیان لێ کردبوون بە پەرستراوو پەروەردگار، هەر بۆیەش ئەوانە قەڵس دەبوون بەو پەیامەی، کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، چونکە کاتێك (خوا بەیەکگرتنو خوا پەرستیی) هەبێ، خەڵك هیچ کەسو هیچ شتێکی دیکە ناپەرستێو عەبدایەتی بۆ ناکاتو جگە لە خوا ناپەرستێ) دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ وە ئەوەی کە من دەیپەرستم، (کە خوایە) ئێوە نایپەرستن (یانی: من تا خوا پەرست بم خوا پەرستییەکەم ڕێگەم نادات کە بتو صەنەم یان طاغووتو فیرعەونێك بپەرستم، وە ئێوەش تا بت پەرستو طاغووت پەرست بن، بەکەڵکی خواپەرستی نایەن، ئەگەرچی بە ڕواڵەت نوێژێکیش بکەن، بەلام مادام پێتان وایە خوا هاوبەشی هەنو وەك چۆن بەقسەی خوا دەکەن بەقسەی غەیری خواش دەکەن، وە وەك چۆن لە خوا دەترسێن لە غەیری خواش دەترسێن، یان وەك چۆن خوای پەروەردگارتان خۆش دەوێ ئەوەندە یان زیاتریش شتێکی دیکەتان خۆش دەوێ، یان وەك چۆن خواتان لەلا گەورەیە ئەوەندە یان زیاتریش شتێکی دیکەتان پێ گەورەیە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە ناتوانی بڵێی: خوام پەرستوە، چونکە خواپەرستی کاتێك ڕاستە کە غەیری خوا نەپەرستی) پاشان دەفەرموێ: ﴿وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ﴾، واتە: وە ئەو شێوە پەرستنەی، کەئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، ﴿وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا

www.alibapir.com


﴿ أَعۡبُدُ ﴾، واتە: وە ئێوەش ئەو شێوە پەرستنەی مـن دەیپەرستم ئێـوە نایپەرستــن، وە لەکۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴾، واتە: دینی خۆتان بۆ خۆتـانو دینـی خۆشم بۆخـۆم.

لێرەدا دوو حەقیقەتو ڕاستی گەورەمـان دەست دەکەون:

أ- (الكافرون) (ال)ی (جنس)ی لەسەرە، کەواتە هـیچ کافرێـك نیـە ئـەم دەستـەواژەیە نەیگرێتەوە، وە ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢﴾، کەواتە هیچ کافرێك نیە کە شتێك نەپەرستێ، کـافر خـوا ناپەرستێ، بەڵام شتێکی دیکە دەپەرستێ، جا هەر شتێك بـێ: دار، بـەرد، حیـزب، دەوڵەت کەسێك، بەرنامـەیەك... یان وەك هیندۆسییەکان مـارو دوپشـك، یـان وەك هەندێ خەڵکی ئەفریقـی درەخـت، یان وەکـو خەڵکی دی هــەواو ئـارەزووی خـۆی، یان پارەو پوول، بۆیە ئینسـان یان دەبێ خوا پەرست بـێ، یـان دەبـێ شـتێکی دیکـە هەر بپەرستێ.

ب- لە کۆتاییشدا کە دەفەرموێ: ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴾ کەواتە: ئەوە کە کافرەکـان غەیری خوا شتێکی دیکـە دەپەرستــن، ئـەوەش هـەر دینـە، طـاغووت پەرستـییو فیرعـەون پەرستیش هەر دینەو هەر فیکرەو پەیڕەوو بەرنامـەیەکیش غەیری ئیسـلام، کە خەڵکی لەسەری بڕۆن، ئەوەش دینە، بەڵام دینی دانراوو باطـڵ.

کەواتە: وەك چۆن خواپەرستیی دینە، بەڵام دینێکی هەقە، بەهەمـان شـێوە غـەیری خواپەرستییش هەر دینە، بۆیە دەبـێ ئـەوە لـە مێشـکماندا زۆر ڕۆشـن بـێ کـە ئێمـە لەگەڵ کافرەکان هەردووکمان هەر دەپەرستین، بـەڵام جیاوازییەکـەی ئەوەیـە کـە ئێمـە

خوا دەپەرستین‌و ئەوانیش غەیری خوا دەپەرستن، هەروەها هەردووکمان دینمان هەیە، بەڵام ئێمە دینێکی هەقمان هەیە کە ئیسلامە، ئەوانیش دینێکی باطڵ، کە غەیری ئیسلامەو لەو حاڵەتەشدا ئەوکەسەی غەیری ئیسلامی کردبێتە دینی خۆی، ناتوانێ بڵێ مسوڵمانم، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦۚ ...﴿٤﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: خوا دوو دڵی لەنێو هەناوی هیچ پیاوێکدا نەخوڵقاندوە.

ئەو دڵەش یان دەبێ خوای پێ بپەرستێ‌و بەدوای بەرنامەی خوا بکەوێ، یان دەبێ غەیری خوای پێ بپەرستێ‌و بەدوای بەرنامەی غەیری خوا بکەوێ، کەواتە: هەرکەسێك بەدوای بەرنامەی غەیری ئیسلام بکەوێ، جا لە هەر شوێنێکەوە هاتبێ، مادام ئەو بەرنامەیە حەڵاڵ‌و حەرام‌و ئەمرو نەهی‌و، ڕێکخستنی ژیانی خەڵکی تێدابێ، ئەوە دینە، جا ناوی سۆسیالیزم بێ، یان کۆمۆنیزم، یان کاپیتالیزم، یان لیبرالیزم، یان ناسیۆنالیزم یان عەولەمە...هتد، گرنگ ئەوەیە غەیری ئیسلام، هەمووی بە دین لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام دینێکی باطڵ‌و پووچ، بۆیە هەرکەسێك کە بیەوێ خواپەرست بێ، دەبێ بە دین‌و بەرنامەی خواوە پابەند بێ، وەهەر کاتێك، کە ئینسان لەدین‌و شەریعەتی خوا لایدا، بەتەئکید ئەوکاتەی کە لایداوە، لەخوا پەرستیشی لاداوە.

## سێیەم:- شێوازی پروپاگەندەو هێرشی ڕاگەیاندن

کافرو بێبڕوایەکان لەئەنجامی ئەوەدا کە لەمەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەی فیکریی‌و بەڵگە هێنانەوەدا شکستیان خواردوە، خۆیان ناچار بینیوە، کە پەنا بەرنە بەر شێوازی

پڕوپاگەندەو هێرشی ڕاگەیاندن، ئاشکراشە کەسێك کە بەرنامەیەکی ڕوونو ئامانجێکی ڕاستو ڕەوانی هەبێت، پەنا ناباتە بەر پڕوپاگەندەو شێواندنی پەیامو فیکری بەرامبەر، بەڵکو بەشێوەی مەنتیقیو بەبەڵگە لەگەڵیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، ئێستاش هێندێك لەو هەوڵانەی بێبڕوایەکان دەخەینە ڕوو، کە لە بازنەی پڕوپاگەندەو هێرشی ڕاگەیاندندا کۆدەبنەوە:

## یەك:

(ولید بن المغیرة) -کە پێشتریش چەند جارێك ناوی هاتوەو یەکێك بووە لەوانەی، کە لەنێو قورەیشدا قسەزان کابرایەکی بەتەمەن بووە، ڕۆژێك لەنێو کۆمەڵێك لە سەرانی قورەیش دەڵێت[1]: {یا معشر قریش قد حضر هذا الموسم وان وفود العرب ستقدم علیکم فیه، وقد سمعوا بأمر صاحبکم هذا فأجمعوا فیه رأیاً واحداً ولا تختلفوا فیکذب بعضکم بعضاً ویردّ قولکم بعضه بعضاً، قالوا: فأنت یا أبا عبد شمس فقل وأقم لنا رَأْیاً نقول بِه: قال: بل أنتم قولوا اسمع}، واتە: ئەی کۆمەڵی قورەیش ئەوە ئەمساڵیش کاتی حەج هاتو وەفدەکانی عەرەب دێن بۆ زیارەتی (کابە) (بە حیسابی خۆیان چونکە عارەبەکان خۆیان لەسەر دینی (إبراهیم) -علیە الصلاة والسلام- لەقەڵەم داوە) دێن وە هەواڵی ئەو برادەرەی ئێوەشیان بیستوە، جا هەمووتان لەسەر یەك بۆچوون کۆببنەوەو ڕای جیاجیاتان نەبێ، هەندێکتان هەندێکتان بەدرۆ بیننەوە، وە قسەکانیشتان با هەندێکی هەڵنەوەشێنێتەوە (یەکێك بڵێ شێتە، ئەوی دی بڵێ نەخێر شاعیرە-!!) ئەوانیش پێیان گوت: ئەی (أبا عبدالشمس) تۆ ڕایەکمان پێ بڵێ ئێمەش ئەو قسەیەی تۆ دەکەین، لەوەڵامدا گوتی: نا ئێوە بڵێن گوێم لێیە بزانم ئێوە چیتان پێ چاکە؟!!

{قالوا: نقول کاهن!}، گوتیان دەڵێین کاهینە، (واتە: فاڵچیی).

---

١) بڕوانە: (السیرة النبویة لابن هشام)، ج١، ص(١٣٥)، ط١ دار ابن الهیثم.

www.alibapir.com

{قال: لا والله ما هو بكاهنٍ لقد رَأَيْنا الكهان فَما هو بزمزمة الكاهن ولا سجعه} گوتی: نەخێر سوێند بە خوا ئەو کاهین نیە، ئێمە کاهینەکانمان بینیوە قسەکانیشی نە سرکە سرکو نە سەرواداره، وەك هی کاهینەکان.

{قالوا: فنقول: مجنون!}، گوتیان: دەڵێین شێتە!.

{قال: ما هو بمجنون لقد رأينا الجنون وعرفناه، فما هو بخنقهِ ولا تخالجه ولا وسوستهِ} گوتی: نەخێر شێتیش نیە، چونکە شێتیشمان بینیوە، وە دەزانین شێت چۆنە، ئەو نە وەك شێتان تووشی تەنگە نەفەسییو پشوو سوار بوون دێت، وە نە دەست دەوەشێنێت و نە وەسوەسەشی هەیە.

{قالوا: فنقول: شاعر!}، گوتیان: دەڵێین شاعیره!.

{قال: ما هو بشاعر، لقد عرفنا الشعر كله رجزه وهزجه وقريضه ومقبوضه ومبسوطه، فما هو بالشعر}، گوتی: شاعیریش نیە! چونکە هەموومان شیعر دەناسین، هیچ کام لە جۆرەکانی شیعر نیە.

{قالوا: فنقول: ساحر}، گوتیان: باشە دەڵێین جادووگەره!.

{قال: ما هو بساحرٍ لقد رأينا السّحارَ وسحرهم فما هو بنفثهم ولا عقدهم}، گوتی: نەخێر جادووگەریش نیە، چونکە جادووگەرانمان بینیون، نەفوو لێکردنی جادوگەرانە، وە نەگرێ لێ بەستنی جادووگەرانە (چونکە جادووگەر کاتێك، کە جادوو دەکات، گرێ لە شتێك دەداتو پاشان فووی پێدا دەکات).

{قالوا: فما نقول يا أبا عبدالشمس!}، گوتیان: ئەدی چ بڵێین ئەی (أبا عبد الشمس؟).

{وقال: والله أن لقوله لحلاوة وان أصله لَعَذْق وان فرعه لجناة، وما أنتم بقائلين من هذا شيئاً إلاّ عُرِفَ أنه باطل، وان أقرب القول فيه لأن تقولوا ساحر، جاء بقول هو سحر يفرِّق به بين المرء وأبيهِ وبين المرء وأخيهِ، وبين المرء وزوجتهِ وبين

www.alibapir.com



المرء وعشيرتهِ، فتفرقوا عنه بذلك فجعلوا يجلسونَ بِسُبُل الناس، حين قدم الموسم لا يمرّ بهم أحدٌ إلاّ حَذّروه إياهُ وذكروا لَهُمْ أمره!}، واته: -وەلیدی کوڕی موغەیره- گوتی: لە ڕاستیدا قسەکەی شیرنایەتییەکی زۆر تایبەتی هەیە، وە بناغەی قسەکەشی وەکو بنکی دار خورما وایە، وە لقو پۆپەکانی قسەکەشی وەکو درەختی میوەدار وایە، وە ئێوە هیچ کام لەو قسانە نالێن، کە باستان کردن، هەموو کەس دەزانێ، کە ئەو قسانە پووچن، بەلاّم بەناچاریی نزیکترین قسە، کە خەڵك لێمان بسەلمێنێ، ئەوەیە کە بڵێین: موحەممەد جادوو گەرە! چونکە قسەکەی (واتە: قورئان) جادوویەو باب‌و کوڕی پێ لەیەکتر جیا دەکاتەوە، براو برای پێ لێك جیا دەکاتەوە، هەروەها ژن‌و مێرد لێك جیا دەکاتەوەو، ئینسان لەگەڵ عەشیرەتەکەی لێك دەترازێنێ، بەو جۆرە کاتێك کە مەوسیمی حەج هات لەسەر ڕێی خەڵكی دادەنیشتن، وە هەرکەسێکیان دەبینی ئاگاداریان دەکردەوە کە ئەو کابرایە جادووگەرە!!.

ئنجا خوای کاربەجێ لەوبارەوە ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ
وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾
ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِآيَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ
وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ
﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ
﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾
عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ النَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ... ﴿٣١﴾ ﴾ المدثر.

ئەم ئایەتانە هەموویان دەربارەی وەلیدی کوڕی موغەیرە هاتوونە خوار کە دڵنیابوو موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام بۆ تێکنەچوونی بەرژەوەندی خۆیو زلەزلەکانی دیکەی قوڕەیش، ئاوا پێغەمبەری ﷺ تۆمەتبار کردوە بەوە کە جادووگەرە، بۆیە خوای پەروەردگار لە وەڵامیدا دەفەرموێ:

﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴾، واتە: (ئەی موحەممەد) لێم گەڕێ بۆ تۆڵەستاندنەوە لە کەسێك کە بەشێوەیەکی تایبەت دروستم کردوە (یاخود کە دروستم کردوە بێکەسو بێدەر بووە، بەڵام دوایی چەندان نیعمەتم بەسەردا ڕشتوون)، ﴿ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴾، واتە: وە ماڵو سامانێکی دورو درێژم پێداوە، ﴿وَبَنِينَ شُهُودٗا﴾، واتە: وە کوڕانێك کە لە کۆڕو مەجلیسدا لەگەڵیدا ئامادە دەبن، ﴿وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا﴾، واتە: وە لە هەموو کارێکی دونیاییدا زەمینەسازییم بۆ کردوە، ﴿ثُمَّ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ﴾، واتە: ئێستاش بەتەمایە بۆی زیادکەم، ﴿كَلَّآۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴾، واتە: نەخێر ئەو نەسەلمێنە بۆ ئایەتەکانمان، ﴿ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ﴾، واتە: لەمەودوا تووشی حاڵێکی ناخۆشو زەحمەتی دەکەم، ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴾، واتە: ئەو بیری کردەوە، زۆریش شتەکەی بەراورد کردو لێی ورد بۆوە، نەفرینی لێ بێو بەکوشت چێ، چ جۆرە بەراوردییەکی کرد،دوایی بەکوشت چێ چ جۆرە لێکدانەوەو بەراوردییەکی کرد، ﴿ ثُمَّ نَظَرَ ﴾، واتە: دوایی سەرنجیدا، ﴿ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾، واتە: دوایی ڕووی خۆی گرژو تاڵ کرد، (چونکە هەرچەندە سەرنجی قورئانیدا عەیبی بۆ لێ نەدۆزرایەوەو ڕەخنەی ڕاستەقینەی پێ لێ نەگیرا)، ﴿ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾، واتە: دوایی پشتی تێکردو خۆی بە زل گرت (دوای ئەوەی، کە زانی قورئان هەقە)، ﴿ فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ﴾، واتە: وە گوتی: ئەوە جادوویەکە، کە

www.alibapir.com


خەڵك لە یەكدی دەگێڕێتەوەو فێری یەكتری دەكەن، ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ﴾، واتە: گوتی: ئەوە جگە لە قسەی بەشەر هیچی دیكە نیە!

ئنجا خوای زاڵ هەڕەشەی لێدەكاتو دەفەرموێ: ﴿سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ٢٦ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ٢٧ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ٢٨ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ٢٩ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ﴾، واتە: لەمەودوا دەیخەینە نێو سەقەڕەوە، دەزانی سەقەڕ چییە؟ هەرچی بخرێتە نێوی هیچی لێ ناهێڵێ، نەیسووتێنێ، لەگەڵ یەكەمین بڵێسەی بە دەموچاوی ئینسان دەكەوێ، هەمووی دادەماڵێ، نۆزدە فریشتەی لەسەرن.

لەكاتێكدا كە ئەم ئایەتانە هاتنە خوار، (أبو الأشدين)، كە گوایە پیاوێكی یەكجار پاڵەوانو بەهێز بووە، دەڵێ: ئەی كۆمەڵی قوڕەیش دووان لەو نۆزدە فریشتەیە عایدی ئێوەو حەڤدەشیان بۆمن لێگەڕێن[1]!!

بۆیە دوایی خوای باڵادەست فەرمووی: ﴿وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗ ...﴾، واتە: دۆزەخەوانەكانمان هەر فریشتەن، بەڵام فریشتەیەك كە خوای گەورە توانای تایبەتیو زۆری پێداوە.

**دوو :**

دیسان (ابن هشام) لە كتێبەكەی خۆیدا[2] هەڵوێستی دووەممان بۆ باس دەكات، كە هەڵوێستی (نضر بن الحارث)ەو ئەویش یەكێك لەپیاوە بلیمەتەكانی قوڕەیش بووەو زانیویشیەتی، كە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، كە دەڵێ:

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(١٤٦١).
٢) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص١٥٠، ط١، دار ابن الهيثم.

**((يا معشر قريش! انه والله قد نزل بكم أمرٌ ما أتيتم له بحيلة بعد، قد كان (محمد) فيكم غلاماً حَدثاً أرضاكم فيكم وأصدقكم حديثاً وأعظمكم أمانة، حتى إذا رأيتم في صدغيه الشِّيبَ وجاءكم بما جاءكم به قلتم ساحر، لا والله ما هو بساحر، لقد رأينا السحرة ونفثهم وعقدهم، وقلتم: كاهن لا والله ماهو بكاهن... وقلتم: شاعر، لا والله ماهو بشاعر... وقلتم: مجنون، لا والله يا معشر قريش! فانظروا في شأنكم فإنه والله لقد نزل بكم أمر عظيم))**، واتە: ئەی کۆمەڵی قورەیش! بەڵایەکتان بەسەر هاتوە، کە تا ئێستا هیچ چارەسەرێکتان بۆ نەدۆزیوەتەوە، موحەممەد لەنێو ئێوەدا گەنجێك بوو، کە لە هەمووتان پەسندتر بوو، وە لە هەمووتان ڕاستگۆتر بوو، وە لە هەمووشتان ئەمیندارترو دەست پاکتر بوو، هەتاکو کاتێك کە لە لاجانگەکانی مووی سپی دەرکەوتن -واتە کەوتە سەرووی تەمەنی چل سالییەوە- وە ئەو هاتە لاتانو پەیامی بۆ هێنان گوتتان جادووگەرە، نەخێر بە خوا جادووگەر نیە، جادووگەرمان بینیوە، کە چۆن فوو لەشت دەکەنو گرێ لەشت دەدەن، دوایی گوتتان کاهینە! نەخێر بەخوا کاهین نیە، دوایی گوتتان شاعیرە، نەخێر بەخوا شاعیر نیە، دوایی گوتتان شێتە، نەخێر بە خوا شێتیش نیە! (دوایی پێیان دەڵێ) ئەی کۆمەڵی قورەیش! باش سەرنجی کاری خۆتان بدەن بەڕاستی بەڵایەکی گەورەتان بەسەر هاتوە، چارەسەرێکی بۆ بکەن!.

دیارە (نضر بن الحارث) کە دوژمنێکی سەرسەختی پێغەمبەر ﷺ بووە بەدوای چارەسەرو دانانی بەربەستدا دەگەڕێ، وەك (ابن هشام) ئاوامان بۆ دەگێڕێتەوە[١]: {وكان النضر بن الحارث من شياطين قريش وممن كان يؤذي رسول الله ﷺ وينصب له العداوة، وكان قد قدِم الحيرة وتعلم بها أحاديث ملوك الفرس وأحاديث رستم واسبنديار، فكان إذا جلس رسول الله مجلساً فذكّر فيه بالله وحذّر قومه ما

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

أصاب من قبلهم من الأمم من نقمة الله، خَلَفَهُ في مجلسه إذا قام، ثم قال: أنا والله يا معشر قريش أحسن حديثاً منه، فهلم إليّ فأنا أُحدّثكم أحسن من حديثه، ثم يحدّثهم عن ملوك فارس ورستم واسبنديار، ثم يقول بماذا (محمد) أحسن حديثاً مني؟}، واتە: (نضر بن الحارث)، کە یەکێك بوو لەوانەی زۆر ئازاری پێغەمبەری دەداو دوژمنایەتییەکەی لەگەڵدا خەست کردبۆوە، وەچوو بوو بۆ (حيرة) -پایتەختی دەوڵەتی غەساسینەکانی ڕۆم لە نزیك شام- جا لەوێ هێندێك شت لە بەسەرهاتی پادشاکانی فارس وەکو ڕۆستەمو ئەسبەندیار...هتد فێرببوو، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دادەنیشت باسی خوای بۆ خەڵکی دەکرد وە باسی بەسەرهاتی میللەتانی پێشووی بۆ دەکردن، کە خوا چی بەسەر هێناونو ئەگەر ئیمان نەهێنن هەمان چارەنووس چاوەڕێتان دەکات، (نضر بن الحارث) لەدوای پێغەمبەر ﷺ دەچوو بۆ هەمان کۆڕو مەجلیس دادەنیشتو لەدژی پێغەمبەر ﷺ قسەی دەکردو بەرپەرچی قسەکانی دەدایەوەو دەیگوت: وەرن ئەی کۆمەڵی قورەیش، من قسەی باشترم لایەو بەسەرهاتی باشترتان بۆ دەخوێنمەوەو، بەسەرهاتی پادشاکانی فارسو حیکایەتی ڕۆستەمو ئەسبەندیاری بۆ دەخوێندنەوە، دوایی دەیگوت: بەچی حیکایەتو بەسەرهاتی موحەممەد لە هی من خۆشترن؟!.

جا (ابن هشام)[1] دەڵێ: ئەم ئایەتەی سوورەتی (الأنعام) لەبارەی ئەوەوە هاتەخوار، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾الأنعام.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

www.alibapir.com

خوا –جل شأنە- باسی سێ جۆرە کەس دەکاو دەفەرموێ: کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی کە درۆ بەناوی خواوە هەڵبەستێ، یان بڵێ: وەحییم بۆ هاتوەو وەحیشی بۆ نەهاتبێ، یان کەسێك بڵێ: من شتێك ڕێك دەخەمو دەنێرمە خوارێ وەکو ئەوەی، کە خوا ناردوویەتە خوار؟! وە ئەگەر تۆ ستەمکاران ببینی لەکاتی سەرەمەرگدا، کە فریشتەکان دەستیان ڕاکێشاون، وە پێیان دەڵێن: ڕووحتان دەربێنن (ئەو ڕووحە پیسەتان) ئەمڕۆ دەبێ ئازاری ڕیسواکەر بچێژن، بەوەی لەسەر خوا شتی ناحەقتان دەگوت، وە لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا خۆتان بەگەورە دەگرت.

## سێ :

(ابن إسحاق)، کە (ابن هشام) لە کتێبی (السيرة النبوية)دا[1] لێی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: {ثم إن قريشاً اشتد أمرهم للشقاء الّذي أصابهم في عداوة رسول الله ومن أسلم معه منهم، فأغروا بهِ سفهائهم فكذبوه وآذوه ورَمَوْهُ بالشعر والسحر والكهانة والجنون ورسول الله ﷺ مظهر لأمر الله لا يستخفي بهِ مُبادِؤهم بما يكرهون عن عيب دينهم، واعتزال أوثانهم، وفراقهِ إياهم على كفرهم}.

دیارە (ابن هشام) هەمیشە لە (ابن إسحاق)ەوە نەقڵ دەکات، بەڵام جارجار هەندێك ڕیوایەتی خۆیشی دەخاتە نێو سیرە، ئەگەرنا (السيرة النبوية) لە ئەسڵدا هی (ابن إسحاق)ە، کە یەکەمین کتێبی ژیاننامەی پێغەمبەرە ﷺ نووسرابێتەوە، جا دەڵێ: دوایی قوڕەیش زیاتر بەد بەختییو ماڵ وێرانیی ملی گرتن، بەهۆی دژایەتیکردنی پێغەمبەر ﷺو ئەوانەی لەگەڵی مسوڵمان بووبوون، نەفامو بێعەقڵەکانی خۆیانیان لە پێغەمبەر ﷺ بەردەداو، قسەی ناخۆشیان پێ دەگوتو درۆیان دەدایە پاڵو ئەزیەتیان دەداو، تۆمەتباریان دەکردو پێیان دەگوت: شاعیرەو قسەکەشیان بە شیعر دەدایە قەڵەم، پێیان دەگوت: جادووگەرو فاڵچی (کاهن)و

١) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص(١٤٤).

پێشیان دەگوت شێت، (جا بۆ ئینسانێکی پاك‌و بەڕێزی وەك پێغەمبەر ﷺ، کە هەمیشە خۆی پاراستوە لە شتی نزم‌و پەست‌و خراپ، ئازاری دەروونیی‌و قسە پێگوتران، زۆر ناخۆشەو ناخۆشترە لە لێدان‌و ئەشکەنجەی جەستەیی، هەرچەندە خوای پەروەردگار بۆ ئازاردانی جەستەیی سنووری بۆ دانابوون‌و، ئەگەر ویستبایان زیادە ڕۆیی بکەن، پێغەمبەری دەپاراست، بەڵام بێگومان جاری وا هەیە، کە قسەیەك دەکرێ لە خەنجەرێك، یان لە تیرێکی ژەهراوی زیاتر، لە دەروونی ئینسانی خاوەن ڕێزو کەرامەت‌و حورمەتدا کار دەکات، ئەگەرنا وەکو گوتراوە: ئینسانی سووك بێڕێزیی، بە ئاسان لەسەری دەگوزەرێ، چونکە برینی مردوو ئازاری نیە:

**ومن يهن يسهل الهوان عليه وما لِجُـرْحٍ بِمَيِّتٍ إيـــــلامُ**

دیارە کەسێك، کە ڕووحیکی شەرەفمەندانەی نەبێ ئازاری پێ ناگات، بەڵام پێغەمبەری ئێمە ﷺ سروشتەکەی ئەوەندە پاك‌و چاك بووەو، ڕەوشتی ئەوەندە بەرزو جوان بووە، کە تەنانەت لە سەردەمی نەفامییشدا، کافرەکان دانیان بەڕەوشتی بەرزی ئەودا هێناوە، ئینسانێك، کە ئەوەندەی خۆپاراستوە لە شتی نزم‌و پەست، کاتێك کە تۆمەتبار دەکرێ بە شتی ناخۆش‌و پێی دەگوترێ: تۆ شێتی! بێگومان زۆر لەسەر دڵی قورس بووە، وەك دواییش باس دەکەین، کە پێغەمبەر ﷺ چۆن باسی لەو ئێش‌و ئازارەی کردوە، بەڵام ئایا ئەو تۆمەتانەی کە لەلایەن کافرەکانەوە دەدرانە پاڵ پێغەمبەر ﷺ هیچ کاریان تێ دەکرد لە سستی نواندن لە گەیاندنی بانگەوازەکەیدا؟

بێگومان نەخێر، وەك (ابن هشام) دەڵێ: {و رسول الله ﷺ مُظْهِـرٌ لأمـر الله لا يستخفي به مُبادؤهم بما يكرهون}، واتە: بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەر دینی خوای بڵاودەکردەوە، ئاشکرای دەکردو پەنهانی نەدەکرد، چی ئەوان پێیان ناخۆش بوو، ئەوەی باس دەکرد، (نەك لەبەر ڕق هەستاندنی ئەوان، بەڵکو ئەو لەکاتێکدا، کە باسی پەرستراوەکانی بێبڕوایانی دەکرد، لە هەموو شت زیاتر ڕقیان پێ هەڵدەستا،

لەکاتیکدا کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بتپەرستیی شتێکی پووچە، چونکە غەیری خوا، یان لە خوار خۆتەوەیە، یان وەك خۆتە، کەچی بەرنامەی ژیانت بۆ دادەنێ، بۆیە هەرچۆن بێت پەرستنی غەیری خوا شتێکی پووچە، جا، کە پێغەمبەر ﷺ وای دەفەرموو، بێبڕوایەکان ئەوەیان بەجنێو دەزانی)، بۆیە پێویستە ئاگادار بینو بەهەڵە تێنەگەین، کە لە ڕیوایەتەکاندا گوتراوە: {یشتم آباءنا، یشتم آلهتنا} مەبەست ئەوە بووە، کە ڕەخنەی مەنتیقی لێیان گرتوە، ئەگەرنا وەنەبێ پێغەمبەر ﷺ جنێوی دابێ، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ ڕووحم بەقوربانی بێ، ئەوەندە بەڕێزو زمان پاك بووە، کە هەرگیز وشەی ناشیرینی نەزانیوە، بەلام کافرەکان ئەوەیان پێ سەیر بووە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو دارو بەردەی، کە ئێوە دەیانپەرستن هیچ نین، چونکە خۆتان لەو پەرستراوانەتان گەورەترن، ئێوە ئینسانن، کە خوا ڕێزی لێناون، بەلام ئەوانە دارو بەردێکن، کە خوا بۆ خزمەتی ئێوەی دروست کردوون، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثیة، واتە: وەئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، خوا لەلایەن خۆیەوە هەمووی بۆ ئێوە مەیسەر کردوە..

بەڵێ، بێبڕوایەکان لە بەرانبەر ڕەخنەی پێغەمبەر ﷺ لە تێڕوانینو پەرستراوەکانیاندا، ئازارو ئەشکەنجەی پێغەمبەر ﷺ یان دەدا، لەڕووی نەفسییو ڕاگەیاندنەوە، بەو شێوەیەی باسمان کرد، کە بێگومان ئەوەی باسکرا مشتێکە لە خەرواریكو لوێچێکە لە جەواڵێك، ئەگەرنا لە کتێبەکانی (سیرة)دا زۆر لەوبارەوە باسکراوەو، تەنانەت ئەوانیش نەیانتوانیوە ئەوەی، کە بووەو ڕوویداوە، هەمووی بنووسن.

چونکە پێغەمبەر ﷺ لەماوەی ئەو (١٣)ساڵەی، کە لە مەککەدا بانگەوازی کردوە، لەلایەن کافرەکانەوە تووشی چەندین گرفتو ئەزیەتو ئازارو ناڕەحەتی کراوەو،

بە خراپترین شێوەو چەندین شێواز، ویستوویانە پەرچو لەمپەر لەڕێی بانگەوازەکەیدا دروست بکەنو، هەوڵی ئەوەیان داوە شکست بەکارەکەی بێنن، بەڵام خۆیو ئەوانەی پەروەردەی کردبوون، لەپێناو ڕەزامەندیی خواو جێبەجێکردنی فەرمانی پەروەردگارو سەرکەوتنی بانگەوازی ئیسلامیدا، ئارامیان گرتو بە حیکمەتو لێزانینەوە درێژەیان بە کارو خەباتداو، بە ئیمانێکی بەهێزو چەسپاوەوە، لە بەرانبەری هەموو جۆرە هەوڵێکی ناحەزانەی نەیارانیاندا وەستان.

پێغەمبەر ﷺ لەژێر ڕۆشنایی تەوجیهاتو وەحی خوای پەروەردگاریدا، درێژەی بە کارەکانیداو دەورو کاریگەریی، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زیاتر دەدرەوشایەوەو، هەوڵو کاری کافرەکانیش هەمووی بێ بەرهەمو نەزۆك دەرچوو.

لەوەی ڕابرد دەرکەوت، کە ئەگەر بانگەوازی موحەممەد خوایی نەبوایەو، بۆ دنیاو دەسەڵاتو سامان بوایە، ئەوە هەر لە سەرەتاوە کافرەکان ئەو شتانەیان بۆ پێشنیار کردبوو، بەڵام ڕاستیی پەیامی خواو پێغەمبەرایەتی موحەممەد، هەموو ئەو شتانەی کافرەکانی بەدرۆ خستەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## چوارەم:- ئازاردانی دەروونیو جەستەیی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن بێبڕواکانەوە:

بەڕێزان!

لێرەدا شەش نموونە دێنینەوە بۆ چۆنیەتی ئازاردانی دەروونییو جەستەیی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن کافرەکانەوە، بۆ ئەوەی پەرچو لەمپەر بخەنە بەردەم بانگەوازەکەیو دەستی پێ هەڵبگرن لەو پەیامو بەرنامەو بانگەوازەی کە خوای پەروەردگار پێیدا ناردوەو، فەرمانی پێ کردوە کە ڕایبگەیەنێ:

**یەک:**

**{عن أبي هريرة، قال: قال أبو جهل: هل يُعَفِّرُ (محمد) وجهه بين أظهركم؟ قال فقيل: نعم، فقال: واللات والعزى لئن رأيته يفعل ذلك لأطأن على رقبته، أو لأعفرن وجهه في التراب، قال: فأتى رسول الله ﷺ وهو يصلي، زعم ليطأ على رقبته، قال: فما فجئهم منه إلا وهو ينكص على عقبيه ويتقي بيديه، قال: فقيل له: ما لك؟ فقال: إن بيني وبينه لخندقا من نار وَهوْلاً وأجنحة، فقال رسول الله ﷺ: (لو دنا مني لاختطفته الملائكة عُضوًا عُضوًا)}** رواه مسلم[1]، واتە: ئەبوو هورەیرە- خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێت: ڕۆژێك ئەبووجەهل لە کۆڕو مەجلیسی خۆیاندا دانیشتوە گوتوویەتی: ئەوە موحەممەد لە پێش ئێوە دەموچاوی خۆی بەخۆڵ دەکات؟! (تەعبیرێکی ناڕێکی بەکارهێناوە مەبەستی ئەوە بووە، کە سەجدە دەبات لەنێو مزگەوتی حەرام لەلای کەعبە)، گوتیان: بەڵێ، (دێت لێرە نوێژێ دەکات) ئەویش سوێند دەخواتو دەڵێ: سوێند بە (لات)و سوێند بە (عوززا) ئەگەر ببینم سەجدە بەریو نوێژ بکات، پێ لەسەر ملی

---

١) صحيح مسلم: ٦٩٩٦.

www.alibapir.com


دادەنێم‌و دەموچاوی لەنێو خۆڵێ وەردەدەم، ئیدی ئەبوو جەهل هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتێکدا کە نوێژی دەکرد، بۆ ئەوەی لەکاتی سەجدە بردنیدا پێ بخاتە سەر ملی موبارەکی، بەڵام کافرەکان هەر ئەوەندەیان زانی ئەبوو جەهل پاشەو پاش لەسەر پاژنە پێیان دەکشێتەوە بەدەستەکانی بەرگری لەخۆی دەکات‌و خۆی لە شتێك دەپارێزێت، چوونە لای‌و، گوتیان: ئەوە بۆ وادەکەی؟! ئەویش گوتی: لە نێوان من‌و موحەممەددا یەك چاڵی ئاگرین هەبوو، وە مەخلووقێکی زۆر سامناك هەبوو، کە باڵی گەورەی هەبوون‌و زۆر ترساندمی، پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی، کە نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ئەگەر ئەبووجەهل لێم نزیك بووبایەوەو پێی خستبایە سەر ئەستۆم، فریشتەکان دای دەهاتنێ‌و پارچە پارچەیان دەکرد.

لەوکاتەدا ئەم ئایەتانەی تەواوکەری سوورەتی (العلق) هاتنە خوارێ، کە لە ئایەتی (٦ تا ١٩)یە، وە سەرجەم ئایەتەکانی ئەم سوورەتە (١٩) ئایەتن بە ژمارەی پیتەکانی ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ وە سەرەتای ئەم سوورەتە یەکەمین ئایەتێك بوون کە بە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتن، وەك پێشتر باسمان کردوە، باقیەکەی دیشی لەم قۆناغەدا هاتنە خوارێ، کە قورئان هەمووی بەو شێوەیە، کەم سوورەت هەیە هەمووی بەیەکەوە هاتبێتە خوار، بەڵکو هەر کۆمەڵە ئایەتەو بە بۆنەیەکەوە هاتوونە خوار، وە ئەم کۆمەڵە ئایەتەش هەمووی دەربارەی ئەبووجەهل هاتوون،[1]

دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴾، واتە: نەخێر ئینسان یاخی دەبێ، (ئینسانێك کە پەیامی خوای پێ نەگەیشتوە یان پێی گەیشتوەو پشتی تێکردوە) یانی: ئینسانی کافر یاخی دەبێ، ﴿ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴾، واتە: کاتێك کە ببینێ بێ‌نیازو دەوڵەمەندەو دەسەڵاتی هەیە، (ئینسانی کافر یاخی دەبێ، بەڵام ئینسانی ئیماندار هەرچەندە

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(١٥٢٠)، کە گوتوویەتی: رواه أحمد ومسلم والنسائي وابن ابي حاتم، وە (صحيح مسلم):٦٩٩٦.

دەسەڵاتو سامانی هەبێ، بە هی خوای دەزانێ)، ﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ﴾، واتە: بێگومان گێردرانەوە بۆلای پەروەردگارتە، ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ۝٩ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ﴾، واتە: ئایا ئەو کەسەت بینی کە قەدەغە دەکات لە بەندەیەك، کە نوێژ بکات (ئەویش موحەممەدە ﷺ) ﴿أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ۝١١ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ﴾، واتە: ئایا دەبینی ئەگەر ئەو کەسە لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست بووایەو فەرمانی بە پارێزکاریی بکردبایە باشتر نەبوو، ﴿أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾، واتە: ئایا دەبینی ئەو ئینسانە (کە -أبو جهل-ە) دینی خوا بەدرۆ دەزانێو پشتی تێدەکا، ﴿أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ﴾، واتە: ئایا نازانێ، کە خوا دەبینێ؟، ﴿كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾ با وازبێنێ! ئەگەر واز نەهێنێ بە قژی پێشەوەی سەری ڕایدەکێشین، {(ناصیة) بەو تووکە سەرەی پێشەوەی نێوچاوانی ئینسان دەگوترێ} ﴿نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ﴾، واتە: تووکە سەری نێوچاوانێکی درۆزنی گوناهبار، ﴿فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ﴾، واتە: با ئەو هاوار لە دارو دەستەکەی خۆی ببەستێ، ﴿سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ﴾، واتە: ئەوکات ئێمەش ئەوانەی بۆ بانگ دەکەین، کە بەسەر دۆزەخ ڕادەگەن، {(الزبانیة) واتە: دۆزەخەوان،} ﴿كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب﴾، واتە: نەخێر (ئەی موحەممەد ﷺ) بەقسەی مەکەو زیاتر بۆ خوا کڕنووش ببەو لە خوا نزیك بەوە، چونکە ئینسان لەکاتی سەجدەدا لە هەموو کاتێك لە خوا نزیکترە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **{أقرب ما يكون العبد من ربّه وهو ساجد فأكثروا الدعاء}**، رواه مسلم[1].

---

١) صحيح مسلم: ١٠٨٣.

بەڵێ بێگومان تا ئینسان زیاتر کڕنووش بۆ خوا بەرێ، زیاتر لە خوا نزیک دەبێتەوە، وەتا لەخواش نزیکتر بێ، خوای پەروەردگار زیاتر پشتی دەگرێ.

**دوو:**

{(عن ابن مسعود) ﷺ: أن النبّي ﷺ كان يصلي عند البيت وأبو جهل وأصحاب له جلوس، إذ قال بعضهم لبعض أيكم يجيء بسلا جزور بني فلان فيضعه على ظهر (محمد) إذا سجد، فانبعث أشقى القوم (وهو عقبة بن أبي معيط) فجاء به فنظر حتى إذا سجد النبّي ﷺ وضعه على ظهره بين كتفيه وأنا انظر لا أُغيِّر شيئاً، لو كان لي منعة، قال: فجعلوا يضحكون ويحيل بعضهم على بعض، ورسول الله ﷺ ساجد لا يرفع رأسه، حتى جاءته فاطمة فطرحت عن ظهره، فرفع رأسه ثم **قال: اللّهم عليك بقريش ثلاث مرات، فشقّ ذلك عليهم إذ دعا عليهم، قال: وكانوا يرون أن الدعوة في ذلك البلد مستجابة، ثم سمّى اللّهم عليك بأبي جهل وعليك بعتبة بن ربيعة، وشيبة بن ربيعة، والوليد بن عتبة، وأميّة بن خلف، وعقبة بن أبي معيط...، قال فوالذي نفسي بيده لقد رأيتُ الذين عدّ رسول الله ﷺ صرعى في القليب، قليب بدر**[1]} رواه البخاري، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود - خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوەو، دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لای کەعبە نوێژی دەکرد، ئەبووجەهلو هێندێك لە برادەرەکانیشی لەوێ دانیشتبوون، هێندێکیان بەوانی دیکەیان گوت: کێ دەچێ ورگو ڕیخۆڵەی وڵاخێکی سەربڕاو بێنێو کە موحەممەد چۆ سەجدەوە بیخاتە سەر ملی؟، (عقبة بن أبي معيط)، کە لە هەموویان خراپترو بەدبەختتر بوو چوو هێنایو چاوەڕوانی کرد تا پێغەمبەر ﷺ چۆ سەجدەوەو شتەکەی خستە سەرشانو ملی پێغەمبەر ﷺ، عەبدوڵڵا دەڵێ: منیش تەماشام دەکردو توانام نەبوو نەهێڵم وای لێ بکرێ، ئەوانیش سەیری یەکترییان دەکردو

---

١) صحيح البخاري: ٢٤٠ .

www.alibapir.com


دڵخۆش بوونو پێ دەکەنینو بەلای یەکدیدا خوار دەبوونەوە (لەبەر زۆر پێکەنین)، پێغەمبەریش ﷺ لە سەجدەدا بوو سەری بەرز نەدەکردەوە، تا (فاطمة)ی کچی هات شتەکەی لەسەر شانو ملی لابردو، پێغەمبەریش ﷺ سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: خوایە تۆڵە لە قورەیش بستێنی، سێ جاران ئەوەی دووبارە کردەوە، کە ئەوە لەسەریان ناخۆش بوو، وە دەیانزانی ئەو دووعایەی پێغەمبەر لەم شوێنەدا گیرا دەبێ، دوایی پێغەمبەر ﷺ ناوی هێندێکیانی هێناو گوتی: (خوایە تۆڵە بستێنی لە ئەبوو جەهل، خوایە تۆڵە لە (عتبة و شَيْبة و وليد و أميّة و عقبة) بستێنی، (ابن مسعود) دەڵێ: سوێند بەوکەسەی نەفسی منی بەدەستە، ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ دووعای لێکردن لە غەزای بەدردا هەموویان لەنێو چوونو فڕێدرانە نێو چاڵێکەوە لە بەدر، کە پێیان دەگوت (قليب بدر).

پێغەمبەر ﷺ ئا بەو شێوەیەشو **زیاتریش** ئازاری دەروونییو جەستەیی بینیوەو، لەپێناو دینی خواو بانگەوازی هەقدا ناخۆشی چێشتوە.

**سێ:**

وەك پێشتر باسمان کرد (أبو لهب) ناوی (عبد العُزّى) بووە، وە هەتا بڵێی پیاوێکی بەدفەڕو خراپ بووە، خێزانەکەی ناوی (أم جميل) بوو، کە ئەویش ئافرەتێکی زۆر بەدڕەفتارو دوژمنی پێغەمبەر ﷺ بووە، زۆرجار دڕكو داڵی هێناوەو لەسەر ڕێو لەبەردەم ماڵی پێغەمبەری داناوە بەمەبەستی ئازاردانی، وە ژنێکی زمان درێژ بووەو درۆو دەلەسەی زۆری بۆ پێغەمبەر هەڵبەستوەو ئاگری فیتنەی هەڵکردوە، (بخاري) لە (صحيح)ی خۆیدا لەوبارەوە دەڵێ: کاتێك سووڕەتی (المسد) هاتەخوار، کە باسی ژنەکەی (أبو لهب) (أم جميل) دەکا، (أم جميل) هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە ئەوکات لەگەڵ (أبو بكر) -خوا لێی ڕازی بێ- لە نزیك (کەعبە)وە دانیشتبوون، بەردێکی پێبوو پانو تیژ بوو ئەوکاتە بۆ شت بڕین بەکاریان دەهێنا، بە (أبو بكر)ی گوت: ئەی (أبو بكر) کوا هاوڕێیەکەت (کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بووە)

بیستوومە کە قسەی پێگوتووم، بەخوا ئەگەر بیبینم بەم بەردە لە دەمو ددانی دەدەم دەمو ددانی دەشکێنم، بۆئەوەی جارێکی دی نەتوانێ قسەم پێ بڵێ، دوایی ڕۆیشت.

(أبو بكر)یش کە لە تەنیشت پێغەمبەرەوە ﷺ دانیشتبوو لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا پێتوایە تۆی نەبینی؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{لقد أخذ الله ببصرها عني}**، واتە: خوا چاوی ئەوی گرت لە بەرانبەر مندا، جا دەڵێ: ئەو ئافرەتە لەکاتی ڕۆیشتنیدا ئەو سروودەی دەگوت: {مُذَمَّماً عَصَينا، وأمْرَهُ أبينا، ودينَهُ قَلَيْنا}، واتە: ئێمە بەقسەی پیاوی زەمکراو ناکەین، وە بە کارو قسەکانی نارازینو، ڕقمان لە دینەکەشیەتی.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ دڵی خۆش دەبوو کاتێك، کە قورەیشییەکان قسەو جنێویان بە (مُذَمَّم)(1) دەگوت، وە دەیفەرموو: **{ألا تعجبون يصرف الله عني شتم قريش ولعنهم! يشتمون ملمماً ويلعنون ملموماً وأنا (محمد)}** رواه البخاري(2)، واتە: ئایا سەرتان سوڕ نامێنێ کە چۆن خوا جنێوو نەفرەتی قورەیشییەکان لەمن دوور دەخاتەوە! ئەوان جنێو بە (مذمم) دەڵێنو نەفرەت لە (مذمم) دەکەنو من ناوم (محمد)ە، واتە: من ستایش کراوم، بەڵام ئەوان قسە بە کەسێکی زەمکراو دەڵێن، کە من ئەو نیم.

هەروەها (ابن أبي شيبة) لە کتێبی (السيرة النبوية)دا گوتوویەتی(3): {وقد بلغ من أمر أبي لهب أنه كان يتبع رسول الله ﷺ في الأسواق والمجامع ومواسم الحج ويُكَذِّبُهُ}، واتە: (أبو لهب) عادەتی وابوو، کە هەمیشە بەدوای پێغەمبەرەوە بوو ﷺ لە شوێنە گشتییەکانو بازاڕو کاتەکانی حەجو...هتددا، دەیگوت: هەرچییەك، کە ئەو پیاوە دەیڵێت وانیەو ڕاست ناکات، بۆ وێنە کاتێك، کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خەڵکێکدا قسەی دەکردو بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، ئەو

---

١) مُذَمَّم: واتە: کەسێکی زەمکراو، پێچەوانەی مانای (محمد)ە، کە مانای (ستایشکراو)ە.
٢) صحيح البخاري: ٣٥٣٣ .
٣) رواه أحمد، بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(١٥٣٩).

www.alibapir.com


دەهاتو دەیگوت: ئەوە برازای منەو، شێتەو لە قسەکانیدا ڕاست ناکاتو من ڕیش سپیم وە فلانی کوڕی فلانم بەقسەی مەکەن، جا بۆیە خوای دادگەر لەنێو هەموو دوژمنەکانی پێغەمبەردا ﷺ هەڕەشەی لە (أبو لهب) کردوە لە سوورەتی (مسد)دا بەو (کنية)یەی، کە پێی مەشهوور بووە، ئەگەر نا خۆی ناو (عبد العزى) بووە، ئەگەر سەرنج بدەین لێرەدا زۆر شت دەفامرێتەوە:

أ) بۆئەوەی کە بزانرێ ئەبوو لەهەب لە هەموو کەس زیاتر ئازارو ئەشکەنجەی پێغەمبەری داوە ﷺ.

ب) بۆ ئەوەی بزانرێ لە ئیسلامدا ڕەچەڵەكو تیرەگەریتیو خاترو خوایش نیەو، مامی پێغەمبەر ﷺ لەبەرئەوەی، کە زۆر ئازارو ئەشکەنجەی پێغەمبەری ﷺ داوە خوای کاربەجێ ڕقی لێیەتیو دەیبوغزێنیو خێزانەکەشی بەهەمان شێوە.

جا لێرەدا ئیعجازێکی مێژوویی هەیە ئەویش ئەوەیە، کە خوای زاناو شارەزا نەفرینی کردوە لە (أبو لهب)و زانیویەتی، کە ئیمان ناهێنێو، بێگومان لەسەر بێبڕواییش مردوە، شێوازی مردنەکەشی وەك لە کتێبەکانی (سیرة)دا باسکراوە، دەڵێت: پێش مردنی دەردێکی تووش بوو عارەب پێیان دەگوت (عَدَسَة)، کە دەردێکی درم بوو، بەهۆی ئەو دەردەوە سێ ڕۆژان مایەوەو، لەنێو بەرگەکەی خۆیدا بۆگەنی کردو ئەستوور بوو، خزمو کوڕەکانی لەبەر عەیبە، چاڵێکیان بۆ هەڵکەندو خستیانە نێوی، نەوێران بیشیشۆن، دەیانگوت نەوەك ئێمەش ئەو نەخۆشییە بگرینەوە.

ج) ئەو هەڕەشەیەی خوای بەرزو مەزن لە (أبو لهب)و خێزانەکەی، ئەوە دەگەیەنێ، کە خوای پەروەردگار پشتو پەنای بەندە ڕاستەقینەکانی خۆیەتیو بەرگرییان لێدەکاتو، ئەو شتە لە ئیمانداران حاڵی دەکات، هەروەها بۆ ئەوەی ناحەزانی پێغەمبەرو ﷺ ئیسلام ئەوە بزانن، کە خوای توانا دژیان دەوەستێو پشتیان دەشکێنێ.

**چوار:**

(ابن هشام) گوتوویەتی: {اجتمع أشراف قريش يوماً في الحجر فذكروا رسول الله ﷺ فقالوا: ما رأينا مثل ما صبرنا عليه من أمر هذا الرجل قط: سفَّه أحلامنا وسبَّ آلهتنا لقد صبرنا منه على أمرٍ عظيم... فبينما هم في ذلك اذ طلع عليهم رسول الله ﷺ... فوثبوا وثبة رجل واحد وأحاطوا به يقولون: أنت الذي تقول كذا وكذا لما كان يقول من عيبٍ آلهتكم ودينهم، فيقول: نعم أنا الذي أقول ذلك فلقد رأيتُ رجلاً منهم أخذ بمجمع ردائه، قال: فقام أبو بكر دونه فهو يبكي ويقول: أتقتلون رجلاً أن يقول ربّي الله؟![1]}، واتە: ڕۆژێك زلەزلەكانی قوڕەیش كۆدەبنەوە لە (حجر)[2]دا، باسی پێغەمبەر دەكەن، وە دەڵێن: بەڕاستی ئێمە سەبرێكی زۆر گەورەمان گرتوە لەسەر ئەو كابرایە، كە هەرگیز هێندە خۆڕاگرو بەسەبر نەبووین، ئێمە بەبێ عەقڵ دەزانێ‌و قسە بە پەرستراوەكانمان دەڵێ، وە ئێمەش سەبرمان لێ گرتوە لەسەر شتێكی زۆر گەورە... لە درێژەی بەسەرهاتەكەدا دەڵێ: كاتێ: كە ئەوان لە مشتومڕو قساندا بوون (كە دەیانگوت نابێ چی دی سەبری لێ‌بگرین‌و لێی قبوڵ ناكەین دەبێ زەبرێكی لێ‌بدەین) لەوكاتەدا پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای (كەعبە) (دیارە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەشدا، كە زۆر ئازارو ئەشكەنجە دراوە، بەڵام طاعەت‌و عیبادەتەكانی خۆی هەر بردوونە لای كەعبەو دەستبەرداری ماڵی خوا نەبووە، بۆیە دەبێ ئێمەش لەوەشدا شوێن پێی پێغەمبەر ﷺ هەڵبگرین‌و هەڕەشەو ئازار ساردمان نەكاتەوە لە خواپەرستیی) لە درێژەی بەسەرهاتەكەدا، دەڵێ: كاتێك كە پێغەمبەر ﷺ دەركەوت هەموویان بۆی هەستان وەك هەستانی یەك ئینسان، وە دەوریان لێداو یەخەیان گرت‌و كراسەكەیان ڕادەكێشاو پێیان دەگوت: تۆی ئاوا بە پەرستراوەكانی ئێمە دەڵێی؟

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٤٤-١٤٥)، ط١، دار ابن الهيثم.

٢) (حجر) بەو پاردۆكەیە دەڵێن: كە لە لای كابەوە كراوە -حجر إسماعيل-.

www.alibapir.com

فەرمووی: بەڵێ منم! (بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە حەقێك، كە گوتوویەتی پاشگەز نەبۆتەوە هەر لەبەرئەوەی، كە یەخەی كراسەكەیان ڕاكێشاوە).

دوایی ئەبوو بەكر، كە پێغەمبەر ﷺی لەو حاڵەدا بینی چۆ نێوان بێبڕواكانو پێغەمبەرەوە ﷺو گریاو گوتی: ئایا ئێوە پیاوێك دەكوژن هەر لەبەرئەوەی، كە دەڵێ: پەروەردگارم بەس خوایە؟ لە هەندێك ڕیوایەتی دیكەدا هاتوە، كە لەكاتێكدا (أبو بكر) ئەو قسەیەی كرد، كافرەكان وازیان لە پێغەمبەر ﷺ هێناو كەوتنە گیانی (أبو بكر)و زۆریان لێدا[1].

## پێنج:

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ باسی ئازاردرانی خۆی دەكات لەلایەن بێبڕواكانەوە، كە دەفەرموێ: **{لقد أُخفتُ في الله عزّ وجلّ وما يُخاف أحد، ولقد أُوذيت في الله وما يؤذى أحدٌ، ولقد أتت علي ثلاثون من بين يوم وليلة ومالي وبلال طعام يأكله ذو كبد إلا شيء يواريه أبط بلال}**، رواه الترمذي[2]، واتە: لەپێناوی خواو لەڕێی خوادا ترسێنراوم بەشێوەیەك، كە هیچ كەسێك ئەوەندە نەترسێنراوە، وە لەپێناوی خوادا بەشێوەیەك ئازاردراوم، كە هیچ كەس ئەوەندە ئازار نەدراوە، (یاخود كاتێك، كە لەسەر خوا ترسێنراومو ئازار دراوم هیچ كەس نەترسێنراوەو ئازار نەدراوە) جاری وا هەبووە سی(٣٠) ڕۆژو شەو منو بیلال شتێكمان پێ نەبووە، كە ئینسان بیخوا مەگەر ئەوەی، كە بیلال لەبن هەنگڵیی ناوە، (واتە: ئەوەندە كەم بووە، كە لەبن هەنگڵی بیلالدا جێی بۆتەوە، ئایا ڕۆژی چەند پاروویەكی كەمیان خواردبێ یا نا).

---

١) ڕێژەی ئازاردانی (أبو بكر) رضي الله عنه لە بەشی ئەشكەنجەدانی هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر ﷺدا باس دەكەین.

٢) رواه الترمذي: ٢٤٧٢، وصححه الألباني.

**شـــەش:**

هەرکام لە (السيوطي) لە (لُباب النقول في أسباب النزول)، وە (النيسابوري) لە (أسباب النزول)داو، باقی زانایانی دی، کە لەبارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان قسەیان کردوە،[1] بۆمان دەگێڕنەوە، کە قوڕەیش عادەتیان وابووە نازناوێکی ناخۆشیان بەسەر پێغەمبەردا ﷺ بڕیوە، وەك جەنگێکی دەروونییو پێیان دەگوت: (أبتـر)، لە زمانی عارەبیدا (أبتـر) بەکەسێك دەگوترێ، کە کوڕی نیێو منداڵی نێری لەدوا بەجێ نەمێنێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ کوڕەکانی هەمووی بە نەباڵغیی مردوون -ئەوەش لەبەر چەند حیکمەتێك، کە خوای پەروەردگار بۆخۆی دەیزانێ- بێگومان پێغەمبەر ﷺ پێی دڵتەنگ بووە کە کوڕەکانی بە نەبالغیی مردوون، قورەیشیش پێیان دەگوت (-أبتـر- دوابڕاو)، بەڵام خوای کاربەجێ لە پشت پێغەمبەر ﷺو هەر ئیمانداریکی دیکەشەو دیفاعی لێدەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... ﴿٢٥٧﴾﴾ البقرة، واتە: خوا دۆستو پشتیوانی بڕوادارانە، بۆیە خوای کاربەجێ لە وەڵامی ئەو قسەیەی کافرەکانی قوڕەیشدا سووڕەتی (الكوثر)ی نارده خوار، کە دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾﴾، واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، ئێمە (کوثر)[2]مان بەتۆ بەخشیوە، بۆ پەروەردگارت نوێژ بکەو قوربانیش هەر بۆ ئەو سەربڕە، بێگومان ئەوکەسەی، کە ناحەزی تۆیەو توانجو پلارت تێ دەگرێ، هەر ئەو دوابڕاوەو بێ پاشەوارە.

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص(١٥٣٦).

٢) کوثر: خودی وشەکە یانی خێرێکی زۆر، جا هێندێك دەڵێن: مەبەست قورئانەو هەندێك دەڵێن: مەبەست پلەی پێغەمبەرایەتییە، یان ڕووبارێکە، یان حەوزێکە لە بەهەشت.

www.alibapir.com


بەڵێ پێغەمبەر ﷺ کوڕی نین، بەڵام ئۆممەت هەمووی خۆی نەك هەر بە کوڕ بەڵکو بە خزمەتکارو قوتابی ئەو دەزانێ، بەڵکو ئۆممەت هەمووی شانازیی بەوەوە دەکا، دیارە کەسایەتییەکی ئاواش بێ پاشەوار نیەو ئۆممەتی ئیسلامیی هەمووی لەخزمەتی دایە، بەڵام دوژمنەکانی پێغەمبەر ﷺ چییان لێ هات؟ (ولید بن المغیرة)، کە یازدە کوڕی هەبوونو (أبو جهل)و...هتد، کوان؟ لە کوێن؟ چییان لێهات؟!

بێگومان ئەوانە کەوتنە زبڵدانی مێژووەوە، چونکە ئینسانانی خراپ، یان هەر باسیان ناکرێ، یان ئەگەر باسیشیان بکرێ بە خراپە باس دەکرێنو نەفرینیان لێدەکرێ.

ناحەزانی پێغەمبەر ﷺو ئیسلام لە ڕابردوودا هەرچەندە هێزو تواناو فرتو فێڵیان زۆر بوو، بەڵام بەهۆی یارمەتیو هیدایەتی خواوە بۆ پێغەمبەر ﷺ نەیانتوانی بەئاوات بگەنو سەرەنجامیان شومو دۆڕاندن بوو.

ئێستاش کەسانێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبوغزێننو قسەی ناشیرینی بەرانبەر دەکەن، خۆیان پێی سووكو ڕیسوا دەبنو ئەو هەڵوێستەیان کەمو کووڕیی نەزانییو داخ لەدڵیی خۆیان دەگەیەنێو، سەرەنجامی ئەمانەش هەروەك ئەوانی پێشوو دەبێو ئیسلام چرایەکە بەهەوڵو فووی دەمی کەس ناکوژێتەوەو ڕێبازی پێغەمبەریش ﷺ هەر ئاوەدانو قەڵەباڵغ دەبێ.

خوای پەروەردگار بمانگێڕێ لەوانەی خۆیان بەشاگردو قوتابیو شوێنکەوتووی ڕاستەقینەی پێغەمبەر ﷺ دەزاننو، هەموو شتێك لەڕێی خوادا لە خۆیان دەگرنو ڕەزامەندیی خواو سەرکەوتنی ئیسلام تاکە مەبەستی سەرەکییانە.

# ئــازارو ئەشــكە نجەدرانی هاوەڵانی پێغــەمبــەر ﷺ

ئەگەر بمانەوێ بەتێرو تەسەلی باسی ئەو ئازارو ئەشكەنجانە بكەین، كە كافرەكان دژی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێی هەستاون، چ پیاویان چ ئافرەتیان، بێگومان پێویستی بە پانتاییەكی زۆر دەكات، بەڵام ئێمە لێرەدا گوڵبژێرێكیان لێدەكەین، بۆئەوەی بزانین وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕاگەیاندنی ئەم بانگەوازو پەیامە، زۆر ئازار دراوەو نارەحەتیی و ئەشكەنجەی بینیوە، بەهەمان شێوە هاوەڵانی بەڕێزیشی زۆر ئازاریان بینیوەو، پێویستە بزانی/

ن، كە ئەم ئیسلامە بەئاسانی بڵاونەبۆتەوەو ڕانەگەیەندراوەو، بەئاسانیش نەگەیشتۆتە دەستی ئێمە.

## ١- أبو بكر الصديق:

كە یەكەم كەس بووە لەدەرەوەی ماڵی پێغەمبەر ﷺ ئیمانی هێناوە، (ابن كثیر)[1] لە كتێبی (السیرة النبویة)دا هێناویەتی، كە (عائیشە) -خوا لێی ڕازی بێ- ئاوا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی -خوا لێیان ڕازی بێ-، كە سەرجەم ژمارەیان (٣٨) كەس بوو، كۆببوونەوە، ئەبووبەكر -خوا لێی ڕازی بێ- زۆر داوا لە پێغەمبەر دەكا ﷺ، كە بچن مسوڵمانێتی خۆیان ئاشكرا بكەنو بە ئاشكرا لە مزگەوتی حەرام دا نوێژ بكەن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەی ئەبووبەكر! ئێمە ژمارەمان كەمە با وانەكەین، بەڵام ئەبووبەكر -خوا لێی ڕازی بێ- زۆر جەختی لێ دەكا، ئنجا دەچن بۆ مزگەوتو نوێژ دەكەنو دووعا دەكەن، ئەبووبەكر -خوا لێی ڕازی بێ- هەڵدەستێ وتار دەدا، كە پێغەمبەر ﷺ لەوكاتەدا دانیشتبوو، (كەواتە: ئەبووبەكر یەكەمین وتاربێژ (خطیب)بووە لەدوای پێغەمبەر ﷺ

---

١) (السیرة النبویة لابن كثیر)، ج١، ص(٤٣٩-٤٤٤).

www.alibapir.com


کە خەڵکی بۆلای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ کردوە)، کە بێبڕواکانی مەککە ئەوە دەبینن لێیان ڕادەپەڕن، زۆریان لێدەدەنو ئازاریان دەدەن، بەتایبەتی ئەبووبەکر -خوا لێی ڕازی بێ- زۆر ئازار دەدرێ، بەشێوەیەك کە (عتبة بن ربیعة) دەچێتە سەر سینگیو بەهەردوو نەعلەکانی لە دەموچاوی دەدات، تاوای لێدێ چاوو برۆو لووتی بریندار دەبن، ئەبوو بەکر لە تیرەی (بنو تیم)ە، موشریکەکانی (بنو تیم) بەپەلە دێنو ئەبووبەکر لەژێردەستی (عتبة)و کافرەکانی دی دەردێنن، بەڵام ئەبووبەکر توانای ڕۆیشتنی نەبوو، بۆیە لە پێخەفێکدا بردیانەوە بۆ ماڵی خۆیو بەشێوەیەك لێی درابوو گومانیان وابوو کە دەمرێ.

بابی ئەبووبەکر (کە ناوی -أبو قحافة-یەو دایکی (کە ناوی -أم خیر-ە) زۆر لەگەڵی خەریك دەبن تا بەهۆش خۆی بێتەوەو قسە بکا، بەڵام بەهۆش خۆی نایەتەوە تا نزیك ئێوارێ، دواتر کە بەهۆش خۆی دێتەوە، لێی دەپرسن: وەزعت چۆنە؟ ئەویش یەکەمین قسە، کە دەیکا ئەوەیە کە دەڵێ: دەنگوباسی پێغەمبەری خوا ﷺ چییە؟!! خزمەکانیشی کە هەموویان موشریك دەبن، کاتێك ئەوەی لێدەبیستن، لێی تووڕە دەبنو زۆر قسەی پێ دەڵێنو بە تووڕەیی بەجێی دەهێڵن، وە بە دایکی دەڵێن خواردنو خواردنەوەی مەدەیە با بمرێ، دایکی زۆری لەگەڵ خەریك دەبێ، بەڵام ئەبووبەکر دەڵێ: وەڵڵاهی دایە نە خواردنێ دەخۆم نە ئاوێ دەخۆمەوە، تا هەواڵێکی پێغەمبەر ﷺ نەزانم، دایکی دەڵێ ڕۆڵە من نازانم موحەممەد دەنگوباسی چییە، دیارە دایکیشی تا ئەوکاتە هەر کافر بووە، ئەبووبەکر دەڵێ: دەی باشە بچۆ بۆ لای (أم جمیل)ی خوشکی (عمر بن خطاب)، کە مسوڵمان بووە ئەو دەزانێت، ئەویش دەچێ بۆ لای (أم جمیل) دەڵێ: دەنگوباسی موحەممەد چییە؟!

(أم جمیل) لە وەڵامدا دەڵێ: بۆچی؟

(أم خیر) دەڵێ: من ئەبووبەکر ناردوومی.

(أم جمیل) دەڵێ: نە ئەبووبەکر دەناسم، نە موحەممەدیش دەناسم!!!

(أم خیر) دەڵێ: ئەبووبەکر منی ناردۆتە لای تۆ تا هەواڵی موحەممەد لە تۆ وەرگرم!؟

(أم جمیل) دەڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەی بابچین کوڕەکەت ببینم بزانم کێیەو چۆنە؟ (دیارە هەر لەبەر لایەنی ئەمنیی (أم جمیل) وای گوتوە، ئەگەرنا زۆر چاك ئەبووبەکری ناسیوە)، کە دەچێ بۆ لای ئەبووبەکر لە (أم جمیل) دەپرسێ: پێغەمبەر ﷺ چۆنە؟

ئەویش دەڵێ: سوپاس بۆ خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامەتە.

ئەبووبەکر دەپرسێ: ئێستا لە کوێیە؟

ئەویش دەڵێ: لە ماڵی (ئەرقەم)ە.

ئەبووبەکر دەڵێ: من سوێندم خواردوە، کە نان‌و ئاو نەخۆم تا نەیبینم‌و بزانم سەلامەتە یان نا؟!، بۆیە کە شەو دادێ، هەریەك لە (أم جمیل)و (أم خیر) دەچنە بن قۆڵەکانی (ئەبووبەکر)و دەچن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی (ئەرقەم)، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبووبەکر بەو شێوەیە دەبینێ، زۆر پەرۆشی دەبێ‌و ماچی دەکات، ئەو مسوڵمانانەشی، کە لەوێ دەبن زۆر بەزەییان بە ئەبووبەکر دادێ- خوا لێی ڕازی بێ-.

ئەبووبەکر دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە دایکمە، کە لەگەڵم هاتوەو زۆریش لەگەڵم چاکە، تۆش پێغەمبەری خوای‌و موبارەکی داوای بۆ لە خوای پەروەردگار بکە، کە هیدایەتی بداو لە ئاگر ڕزگاری بێت، پێغەمبەریش ﷺ بانگی دایکی ئەبووبەکر دەکات‌و دووعای بۆ دەکات‌و هەر لەوێ مسوڵمان دەبێ.

www.alibapir.com

## ٢- بیلالی حەبەشی:

(عبدالله بن مسعود) -خوا لێی ڕازی بێ-، وەك (إمام أحمد) لێی دەگێڕێتەوە بە سەنەدێکی ڕاست لە موسنەدی خۆیدا[1] دەڵێ:

{أول من أظهر الإسلام سبعة: رسول الله ﷺ وأبو بكرو عمار وأمه سميّة وصهيبو بلالو المقداد ﷺ، فأما رسول الله ﷺ فمنعه الله بعمه أبي طالب، وأما أبو بكر فمنعه الله بقومه، وأما سائرهم فأخذهم المشركون فألبسوهم أدراع الحديد، و صهروهم في الشمس فما منهم من إنسان إلا وقد واتاهم على ما أرادوا، إلا بلال فإنه هانت عليه نفسه في الله وهان على قومه فأعطوه الولدان وأخذوا يطوفون به شعاب مكة وهو يقول: أحدٌ أحد}، واتە: یەکەمین کەس، کە مسوڵمانێتی خۆیان ئاشکرا کرد، حەوت کەس بوون :

١) پێغەمبەر ﷺ.
٢) ئەبووبەکر.
٣) عەممار.
٤) سومەییە.
٥) صوهەیب.
٦) بیلال.
٧) میقدادی کوڕی ئەسوەد.

خوا (أبو طالب)ی بۆ پێغەمبەر ﷺ کردبوو بە بەلاگێڕەوە، ئەبووبەکریش عەشیرەتەکەی ببوونە بەلاگێڕەوە بۆی، بەڵام ئەوانی دی، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان گرتیانو زرێی ئاسنیان لەبەرکردن، وە لەبەر خۆر ڕایاندەگرتن (عبدالله) دەڵێ: هیچ کامیان نەبوو، کە شتێك نەڵێ بۆئەوەی موشریکەکان ئەشکەنجەی لەسەر سووك

---

١) بڕوانە: مسند الإمام أحمد: ٣٨٣٢.

بکەن‌و لەکۆڵی ببنەوە، جگە لە بیلال کە لەپێناوی خوادا خۆی لەلا کەم بوو، بۆیە ئەوانیش ئەویان لەلا کەم بووو دابوویانە دەست منداڵ‌و هەرزەکارەکانی مەککە، کە بەنێو شیوو دۆڵەکانی مەککەدا دەیانگێڕاو ئەزیەتیان دەدا، ئەویش دەیگوت: خوا تاکە، خوا تاکە.

بیلال کۆیلەی (ئومەییەی کوڕی خەلەف) بووەو ڕۆژێکیان، کە ئومەییە خەریکی ئەشکەنجەدانی بیلال بوو، لەسەر ئەوەی ئیمانی هێنابوو، ئەبووبەکر – خوا لێی ڕازی بێ- بەلایدا تێدەپەڕێ‌و ئەم وتووێژە لە نێوانیاندا ڕوودەدات:

{ألا تتقي الله في هذا المسكين حتى متى ؟!
قال: أنت الذي أفسدته فأنقذه فيما ترى !

فقال أبوبكر: أفعل، عندي غلام أسود أجلد منه وأقوى على دينك أعطيكه به!

قال: قد قبلت، فقال: هو لك، فأعطاه أبو بكر الصديق غلامه ذلك وأخذه فأعتقه[1]}، واتە: ئەبووبەکر دەڵێ: باشە لە خوا ناترسێی تاکەی وا لەو کابرا فەقیرە دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: تۆ تێکت داوە، دەربازی بکە لەو حاڵەی کە تێیدایە، ئەبووبەکریش دەڵێ: باشە، من غوڵامێکی ڕەشم هەیە، کە لە بیلالیش بەهێزترەو لەسەر دینی خۆشتە، ئەوت دەدەمێ‌و تۆش بیلالم بدەیە، ئومەییە دەڵێ: باشە قبووڵم کرد، بەو شێوەیە ئەبووبەکر – خوا لێی ڕازی بێ- بیلال دەهێنێتە لای خۆی وە پاشان ئازادی دەکات، هەربۆیەش (عمر) - خوا لێی ڕازی بێ- دەیگوت: (أبو بکر سیدنا، وأعتق سیدنا)، واتە: ئەبووبەکر گەورەی ئێمەیەو گەورەی ئێمەی ئازاد کردوە، ئەبووبەکر – خوا لێی ڕازی بێ- جگە لە بیلال چەند کۆیلەیەکی دیکەشی ئازاد کردوون، (ابن هشام) لەوبارەیەوە گوتوویەتی:

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٦١).

{ثم أعتق أبو بكر ﷺ ست رقابٍ بلال سابعهم، عامر بن فهيرة، وأم عبيس، و زنيرة، وأعتق النهدية وبنتها، ومر بجارية بني مؤمل حي من بني كعب وكانت مسلمة وعمر بن الخطاب يعذبها لتترك الإسلام، فابتاعها أبو بكر فأعتقها[1]}، واتە: ئەبووبەکر -خوا لێی ڕازی بێ- شەش کۆیلەی دیکەی ئازاد کردن، کە بیلال حەوتەمیان بوو، کە ئەمانە بوون: عامر بن فهيرة و أم عبيس و زنيرة و نهدية و کچەکەی‌و کەنیزەکی (بني مؤمل)، کە لە (عمر بن الخطاب)ی کڕیەوەو ئازادی کرد، چونکە ئەشکەنجەی دەدا تاکو واز لە ئیسلام بێنێ.

جا کە ئەبووبەکر – خوا لێی ڕازی بێ- ئەو خەڵکە ڕەش‌وڕووتەی ڕزگار کرد، (أبو قحافة)ەی بابی ئامۆژگاری کردو پێی گوت[2] : {يا بني: اني أراك تعتق رقاباً ضعافاً فلو انك إذا ما فعلت اعتقت رجالاً جلدا يمعنك ويقومون دونك! فقال أبو بكر: يا أبت انّما أريدما أُريد لِلّهِ -عزّ وجلّ- فأنزل الله: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الليل، واتە: ئەی ڕۆڵەم! من دەبینم خەڵکی کۆیلەی بێ‌خێر ئازاد دەکەی، باشتر وایە پیاوی بەهێز ئازاد بکەی، بۆئەوەی دوایی بەرگرییت لێ بکەن، لەوەلامدا ئەبووبەکر -خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: بابە گیان! ئەوەی کە من دەمەوێ ئەوە نیە، کە ئەو خەڵکە بکەم بەدەستەو جەماعەتی خۆم، بەڵکو دەمەوێ خوای پەروەردگار ڕازی بکەم، کە لەوەدوا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتانەی سوورەتی (الليل)ی ناردنە خوار ئایەتی (٥ تا ٢١)، کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴾، واتە: کەسێك، کە ماڵی خۆی ببەخشێت و پارێزکار بێت، بڕواشی بە وشەی

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە .

٢) سەرچاوەی پێشوو.

هەرە چاك بێ {کە وشەی خوا بەیەکگرتن (كلمة التوحيد)ە} ئەوە ئاسانی دەکەین بۆ گرتنی ڕێی ئاسان -کە ڕێی خواپەرستییە- لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿... وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾، واتە: وە چاکەی هیچ کەسێکی بەسەرەوە نیە تاکو پاداشتی بدرێتەوە، بەڵکو تەنیا مەبەستی ڕووی (ڕەزامەندیی) پەروەردگاری بەرزیەتی، وە لەمەودوا ڕازی دەبێ، کە ئەوە مەدحێکی زۆر گەورەیە بۆ (أبو بكر الصديق) -خوا لێی ڕازی بێ-، وە زانایانی توێژەرەوەی قورئان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەم ئایەتانە لەبارەی ئەبووبەکرەوە هاتوونە خوارێ -خوا لێی ڕازی بێ-.

## ٣- بنەماڵەی یاسر :

(یاسر) کە هاوسەرەکەی ناوی (سومەییە) بووە، کوڕێکیان هەبوو ناوی (عەممار) بوو، کە لەئەسڵدا قوڕەیشی نەبوون، بەڵکو لە یەمەنەوە هاتبوون، وە هاوپەیمان بوون لەگەڵ (بنو مخزوم)دا، بەڵام دوای ئەوەی کە هەرسێکیان مسوڵمان بوون (بنو مخزوم)، زۆر ئەشکەنجەو ئازاریان دان، کە (ابن هشام) ئاوامان بۆ باس دەکات:

{وكانت بنو مخزوم يخرجون بِعَمَّار بن ياسر وبأبيه وأمه وكانوا أهل بيت إسلام، إذا حميت الظهيرة يعذبونهم برمضاء مكة، فيمر بهم رسول الله ﷺ فيقول فيما بلغني: **{صبراً آل ياسر فإنّ موعدكم الجنّة}**، أما أمه فقتلوها وهي تأبى إلاّ الإسلام[١]}، واتە: (بنو مخزوم) عەممارو باب‌و دایکیان دەبرد بۆ بیابانی مەککە، لەسەر لمو چەوی گەرم ڕایان دەخستن بەردیشیان دەخستە سەر سنگیان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەلایاندا تێپەڕ دەبوو دەیفەرموو: ئەی بنەماڵەی یاسر!

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص١٦١-١٦٢، ط١، دار ابن الهيثم.

خۆڕابگرن لە بەهەشت پێك دەگەینەوە، جا هەرچی سومەییە بوو لەژێر ئەشکەنجەدا کوشتیان، دوای ئەوەی جگە لە ئیسلام هیچ شتێکی قبووڵ نەکرد.

دیارە دوایی (یاسر)یش هەر لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گیانی سپاردو شەهید بوو، عەممایش - خوا لێی ڕازی بێ- زۆر ئازارو ئەشکەنجە دەدرێت، هەتا دێتە حاڵی سەرەمەرگ، ڕۆژێکیان دوای ئەوەی، کە زۆر ئازارو ئەشکەنجە دەدرێت، دەچێت بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش لێی دەپرسێ دەنگوباس چییە؟! عەممار لە وەڵامدا دەڵێ:

{شر والله، ما تركني المشركون حتى نِلْتُ منك وذكرت آلهتهم بخير، **قال: كيف تجد قلبك؟** قال: مطمئناً بالإيمان، **قال النبيّ** ﷺ: **إنْ عادوا فعُدْ!** وفي ذلك أنزل الله: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ النحل[1]}، واتە: بە خوا دەنگوباسم زۆر خراپە، موشریکەکان وازیان لێنەهێنام، هەر ئازارو شەکەنجەیاندام، هەتا ناچاریان کردم، کە قسە بەتۆ بڵێم، هەتاکو پەرستراوەکانی ئەوانیشم بە چاکە باسکردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دڵت چۆنە؟! ئەویش گوتی: دڵم بە ئیمان ئارام گرتوویە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوان دووبارە ئەشکەنجەیان دایەوە، تۆش دووبارە ئەوقسانە بکەوە (بۆئەوەی لەکۆڵ خۆتیان بکەیەوە،) دوایی خوای کاربەجێ ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ

---

١) رواه أحمد، كما رواه الهيثمي في مجمع الزوائد، ج١ ص(٢٩٣)، بڕوانە: (المصباح المنير...) ص(٧٤٦).

إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ ﴾، واتە: هەرکەسێك کوفر بکا بەخوا دوای ئەوەی ئیمانی هێناوە مەگەر زۆری لێ بکرێ‌و دڵیشی بەئیمان ئارامگرتووبێ، ﴿وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا ﴾، واتە: بەڵام کەسێك کە دڵی گوشادبێ بە کوفرو بە دڵخۆشییەوە کوفر بکا، ﴿فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، واتە: ئەوە ئەوانە تووڕەبوونی خوایان لەسەرە وەعەزاب و ئەشکەنجەیەکی مەزنیشیان بۆ هەیە، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾، واتە: ئەوەش چونکە ژیانی دونیایان هەڵبژاردوە بەسەر دوارۆژدا بەدڵ، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، واتە: وە چونکە خوا ڕێنمایی کافران ناکات.

کەواتە: پێویستە بزانین کە لە ئیسلامدا وەك چۆن ئیشکردن بە عەزیمەت هەیە، کە ئامادە بی، هەر هەق بڵێی‌و دان بە ناحەقییدا نەهێنی هەتا لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گیان دەسپێری، وەك ئەوەی کە یاسرو سومەییە کردیان، ئیشکردن بە مۆڵەت (رخصة)یش هەیە، وەك عەممار کردی، وە پێغەمبەریش ﷺ نەك لۆمەی نەکرد، بەڵکو فەرمانیشی پێ‌کردوە لەکاتی پێویستدا، کەواتە: ڕوخسەت هەیە، بەڵام لەشوێنی خۆیداو بەمەرجی خۆی، نەك هەر خۆت لێ تووڕە بکەن، یەکسەر شتێك بڵێی کە ئەهلی کوفر پێیان خۆش بێت، بەڵکو دەبێ وەکو عەممار بی -خوا لێی ڕازی بێت-، وە بەرپرس‌و برا گەورەش پێویستە زیاتر بە (عزيمة) ئیش بکات.

## ٤- سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص:

یەکێکی دیکە لەوانەی تووشی جۆرێکی دیکەی سەختیی‌و ناڕەحەتیی بوون، (سعد بن أبي وقاص) بووە -خوا لێی ڕازی بێ-، وەك (مسلم) لە (صحيح)ی خۆیدا ئاوامان بۆ دەگێڕێتەوە:

www.alibapir.com


{ان أم سعد حلفت ان لا تكلمه أبداً حتى يكفر بدينه ولا تأكل ولا تشرب وقالت: زعمتَ ان الله وصاك بوالديك وأنا أمك وأنا آمرك بهذا، قال فَمَكَثَتْ ثلاثاً حتى غشي عليها من الجهد، فقام ابن لها يقال له (عمّارة) فسقاها فجعلت تدعو على سَعْدٍ، فأنزل الله عزّ وجلّ في القرآن الكريم هذه الآيات: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ لقمان[1]}، واتە: دایکی سەعد (کە زۆر سەعدی خۆشویستوەو بەهەمان شێوە ئەویش دایکی زۆر خۆشویستوە) سوێندی خوارد گوتی: قسەت لەگەڵ ناکەم، وە ناخۆمو ناخۆمەوە تاکو دەمرم، یان دەبێ کوفر بە خوا بکەی! وە دایکی پێی گوت: ئەتۆ دەڵێی خوا تۆی ئامۆژگاری کردوە، کە لەگەڵ بابو دایکت چاك بی، وە منیش دایکتمو فەرمانت پێ دەکەم بەوە، ئیدی دایکی سێ ڕۆژان بەبێ خواردنو خواردنەوە مایەوە، هەتا لەهۆش خۆی چوو، یەکێك لە کوڕەکانی کە ناوی (عَمّارة) بوو، ئاوی بە گەروویدا کرد تا بەهۆش خۆی هاتەوە، دوای ئەوەی، کە هاتەوە هۆش خۆی دووعای لە سەعد دەکرد، خوای کاربەجێش ئەم ئایەتانەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ئێمە ئامۆژگاریی ئینسانمان کردوە، کە لەگەڵ دایکیو بابی چاك بێ، دایکی لە سکی خۆیدا هەڵی گرتوە، ئازار لەسەر ئازاری پێوە بینیوە، ئنجا دوایی دوو ساڵان شیری پێداوە، بۆیە ئینسانمان ئامۆژگاریی کردوە، کە سوپاسی من بکاو سوپاسی دایكو بابیشی بکات، گەڕانەوەش بۆ لای منە، بەڵام ئەگەر هەوڵیاندا هاوبەشێکم بۆ پەیدا بکەی، کە زانیاریت پێی نیە، (چونکە خوا هیچ هاوبەشی نین، تاکو ئینسان زانیاری دەربارەیان هەبێ) ئەوە بەقسەیان مەکە، بەڵام لەدنیادا بەچاکە لەگەڵیاندا مامەڵە بکە، بەدوای ڕێبازی ئەوانە بکەوە، کە

---

١) (صحيح مسلم): ٦١٨٨.

www.alibapir.com


بۆلای من گەڕاونەوە، بۆ لای من دەگەڕێنەوەو دواییش هەواڵتان پێ دەدەم بەوەی، کە دەیکەن.

کەواتە ئیمان لە سەرووی هەموو شتێکەوەیەو لەبەر خاتری هیچ کەس نابێ دەستبەرداری بین، بەڵام دایكو باب ئەگەر کافریش بن، پێویستە لە دنیادا ڕەفتارمان لەگەڵیاندا هەر باش بێ وەك لە هەندێك سەرچاواندا هاتوە، کە سەعد بە دایکی گوت: دایە هیچ خۆت ماندوو مەکە، بەخوا ئەگەر سەد ڕووحت هەبن هەموویان یەك لەدوای یەك دەرچن بۆ ئەوەی کافر ببمەوە، ئەوە کافر نابمەوە، جا گەر حەز دەکەی نان بخۆی، بخۆ، گەر حەزیش ناکەی، مەیخۆ، دوایی، کە دایکی لێی نائومێد بوو، دەستی کردەوە بە خواردنو خواردنەوە[1]!

## ٥- موصعەبی کوڕی عومەیر:

یەکێکی دیکە لەوانەی، کە ئەشکەنجە دراون (مصعب بن عمیر) بوو - خوا لێی ڕازی بێ- کە ناز پەروەردەترین گەنجی مەککە بووە، وەك پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {**ما رأيت بمكة أحداً أحسن لمة ولا أدق حلة ولا أنعم نعمة من مصعب بن عمير**[2]}، واتە: لە مەککە هیچکەسم لە موصعەبی کوڕی عومەیر قژ جوانترو، پۆشاك ناسکترو نازپەروەرتر نەبینیوە، بەڵام دوایی لەسەر ئیسلام دایكو بابی لە ماڵ دەریانکرد، جا (سعد بن أبي وقاص) دەڵێ: {لقد رأيته في الإسلام جهد جهداً شديداً حتى لقد رأيت جلده يتحشف تحشف جلد الحية عنها...[3]}، واتە: دوایی ئەو گەنجە قۆزو ناز پەروەردەم دیت لە ئیسلامدا، لەبەرئەوەی کە بێناز کەوتبوو، وە ئەوەندە تووشی نارەحەتیی دەبوو، پێستی لێ هەڵدەبوو، وەك چۆن مار کیف لە بەدەنی فڕێ دەدا.

---

١) تفسير ابن كثير (٣/٤٤٦) لە ئایەتی (١٥)ی سورەتی لوقمان.
٢) الطبقات الكبرى، لابن سعد، ج٣، ص(١١٦).
٣) السير والمغازي لابن إسحاق، ص(١٩٣).

www.alibapir.com


## ٦- خەبـبابی کوڕی ئـەڕەت:

یـەکی دی لەوانـەی کـە لـەپێناو خـوادا ئەشـکەنجەو ئازاریـان چێشـتوە (خبـاب بـن أرت)ە، کە دەڵـێ: ڕۆژێك چووم بۆ خزمـەت پێغەمبەر ﷺ، کـە لـە سـێبەری کەعبـە پاڵی دابۆوەو پێم گـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! بۆچـی بۆمـان لـە خـوا ناپـاڕێیەوەو داوای یارمــەتیمان بـۆ لـە خـوا ناکـەی؟ کـە قسـەکەم تـەواو کـرد، پێغەمبـەر ﷺ دانیشـتو دەموچاوی موبارەکی سـوور بـۆوەو تـووڕە بـوو، دوایـی فـەرمووی: لـەپێش ئێوەدا پیاویـان هێنـاوە چـاڵیان بـۆ هەڵکەنـدوەو خسـتوویانە نێوی، پاشـان مشـاریان هێنـاوە لەسـەر سـەریان دانـاوەو کردوویانـە بـە دوو لەتـەوەو لـە دینەکـەی خـۆی هەڵنەگەڕاوەتەوە، وە ئینسـانیان هێناوە بە مشاری ئاسن، دەمـارو ئێسـكو گۆشـتیان لێك جیاکـردۆتەوەو لە دینەکـەی خـۆی هەڵنەگەڕاوەتەوە، دوایی فەرمووی: بەخوا خوا ئەم دینە دەچەسپێنێ هەتا وای لێدێ لە (صنعاء)ەوە خـەڵك دەچـێ بـۆ (حضـرموت) جگە لە خوا لە کەس ناترسێ، مەگەر مـەترسـی گـورگی هـەبێ لـە مـەڕەکـەی، بـەڵام ئێوە پەلە دەکەن، ئەگەر نا خوا ئەم دینە تەواو دەکاو دەیچەسپێنێ. رواه البخاري[1].

ئێستاش با بزانیـن ئەشکەنجە درانی (خەبباب) چۆن بووە؟

(عومـەر) -خـوا لێـی ڕازی بـێ- لـە سـەردەمی حـوکمڕانیی خۆیـدا لـە خـەبباب دەپرسێ، کە چۆن ئەشکەنجەیان داوە؟ ئەویش دەڵێ: کافرەکان لەسەر ئاگریان دادەنـامو بە گەرمی ئاگرەکە دەیانبـرژاندم، جاری واش هەبوو دەیان خسـتمە سـەر ئـاگرو پێیـان دەخستە سەر سینگم، تا ئاگرەکە بە بەزی پشتم دەکوژایەوە!.

## ٧- عـەبـدوڵڵای کوڕی مەسـعـود:

یەکەمین کەس، کە لە مـەککەدا دوای پێغەمبـەر ﷺ قورئـانی خوێنـدوە (عبـدالله بن مسعود) بـووە، کـە ڕۆژێکیـان هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ کۆدەبنـەوەو دەڵـێن: تـا

---

١) صحيح البخاري: ٣٦١٢.

www.alibapir.com


ئێستا قورەیش قورئانیان بەدەنگی بەرز بەگوێدا نەدراوە، خۆزگە کەسێك هەبوایەو سوورەتێکی قورئانیان بەدەنگی بەرز بۆ بخوێنێت.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، کە لەنێویاندا بوو گوتی: من دەچم!

ئەوانیش پێی دەڵێن: تۆ کەست نیە، ئێمە بەکەسێك دەڵێین کە خزمو عەشیرەتی هەبێت، ئەگەر تۆ بچی شەرمت لێناکەنو، ئەوەی پێیان بکرێ لە دژت دەیکەنو زۆرت لێ دەدەن، ئەویش دەڵێ: من دەچم وە خوای باڵادەستیش دەمپارێزێ، ئیدی لەکاتی چێشتەنگاوێدا دەچێتە لای مەقامی (ابراهیم) ئەوکاتانەی کە قورەیشیەکان تێیدا لە مەجلیسی خۆیان (دار الندوة)دا دادەنیشن، لەوێ دەوەستێو دەست دەکات بە قورئان خوێندن بەدەنگی بەرزو سوورەتی (الرحمن) بەدەنگی بەرز دەخوێنێت:

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٱلرَّحْمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ۝٢ ﴾

موشریکەکانی مەککە دەڵێن: ئەوە (ابن أم عبد) (کە کونیەی عەبدوڵلا بووە) دەڵێ چی؟ کە لێی ورد دەبنەوەو سەرنج دەدەن، دەڵێن ئەوە هەندێك لەو قسانە دەکات، کە موحەممەد دەیانکاتو دەڵێ لەلایەن خواوە بۆم هاتوە، ئیدی بۆی دەچنو زۆری لێدەدەن، بەڵام ئەو قورئانەکەی نابڕێتو هەر بەردەوام دەبێت لە خوێندنی، هەتا ئەو شوێنەی، کە خوا ویستوویەتی، بەڵام کافرەکان زۆریان لە دەموچاوی دابوو، پاشان گەڕایەوە نێو هاوەڵانی -خوا لێیان ڕازی- بێت، هاوەڵان گوتیان: ئەوەبوو کە ئێمە لێی دەترساین، ئەویش گوتی: بەخوا ئێستا دوژمنانی خوام زۆر لەلا سووکترە لەکاتی پێش لێدانەکەم، ئەگەر دەڵێن سبەینێش دەچم بۆیان دەخوێنم! گوتیان: نا بەسە تۆ بەئاشکرا بانگی خوات بەگوێ دادان[1].

## تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانیو چەند ڕاستیەك

١) (السيرة النبوية ابن هشام)، ج١، ص(١٥٨-١٥٩)، ط١، دار ابن الهيثم.

**یەك: تاقیكردنەوە (ابتلاء) یەكێكە لە سوننەتو یاساكانی خوا بۆ بەندەكانی:**

خوای پەروەردگار ڕایگەیاندوە، كە ئینسان لەژیانی دنیادا تاقی دەكاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ ... ﴿٢﴾﴾ الملك، واتە: ئەو خوایەی كە مردن و ژیانی دروست كردن تاكو تاقیتان بكاتەوە، (تاكو دەركەوێ كام لە ئینسانەكان كردەوەی باشترە) دیارە خودی ژیانی ئینسانیش دەرفەتە بۆ تاقی كرانەوە، وەك خوای بێ وێنە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾﴾ الكهف، واتە: ئێمە دنیامان ڕازاندۆتەوە تاكو ئینسانەكان تاقی بكەینەوە كامەیان كردەوەی باشترە! (یانی: كامەیان بەئەندازەی پێویستی ژیانی دونیا سوود لە خۆشییەكانی دنیا دەبینێو باوەشی پێدا ناكاتو ناپەرستێو خواپەرستیی لەبیر ناچێتەوە، وە كامەشیان بۆ ژیانی دنیا خۆی دەدۆڕێنێو خواو قیامەتی لەبیر دەچنەوە)، هەروەها دەربارەی ئەهلی ئیمان دەفەرموێ: ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾﴾ العنكبوت، واتە: ئایا خەڵك پێیان وایە هەر بەوەندەی، كە دەڵێن ئیمانمان هێنا، وازیان لێ دەهێنرێو تاقی ناكرێنەوە!

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾﴾ العنكبوت، واتە: ئێمە بەتەئكید ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقی كردۆتەوە، كە بێگومان خوا دەزانێ كێ ڕاست دەكاو درۆزنانیش دەناسێ، واتە: وەنەبێ خوا نەیانناسێ، بەڵام بۆ ئەوەی خۆیان خۆیان بناسن، وە دوایی كەس بیانووی نەبێ لەسەر خواو بڵێ: خوایە ئەگەر تاقیت كردبامەوە چاكەم دەكردو لە ئیمتیحان دەردەچووم، ئەگەر تاقیت كردبامەوە داخۆ چ مسوڵمانێك دەبووم؟

بەڵام دوای تاقی کرانەوە هەرکەسە لەخۆی حاڵی دەبێ‌و کەس قسەی نامێنێ، دیسان خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ ﴿٢١٤﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئایا پێتان وایە شایستەی چوونە بەهەشت دەبن پێش ئەوەی ئەو شتانەتان بەسەربێ، کە بەسەر ئەوانەی پێش ئێوە هاتوون؟ نەدارییان تووش بوو، وە نەخۆشیی‌و نارەحەتییان تووش هات پێکەوە هەژێنران، تا ئەو پێغەمبەرەی، کە پێشەوایان بووەو ئەو ئیماندارانەی، کە لە خزمەتیدا بوون گوتیان: دەبێ یارمەتی خوا کەنگێ بێ؟ ئاگادار بن یارمەتی خوا نزیکە.

کەواتە: سوننەتی خوا وایە، کە ئینسان بەگشتی‌و ئیمانداران بەتایبەتی، دەبێ بەچەندین شێوە تاقی بکرێنەوە لە ژیانیاندا.

## دوو: تاقیکردنەوەی خوا جۆراو جۆرە:

تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی جۆراوجۆرەو بەزۆر شێوەیە، وەك لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿ ...وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ ...﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: بەخۆشییان‌و بەناخۆشییان تاقیتان دەکەینەوە، وە دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ ﴿١٥٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: بێگومان تاقیتان دەکەینەوە -ئەی مسوڵمانان- بەشتێك لە ترس، (ترس لەڕێگەی خوادا؛ کە دوژمنانی دین لەسەر ئیسلام هەڕەشەت لێ بکەن، بێگومان کاتێکیش لەوبارەوە هەڕەشەت لێ دەکرێ، کە تۆ جێی هەڕەشە بیت بۆ بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی ئەوان) وە بە برسیەتی‌و، بە لەدەستدانی ماڵ‌و سامان‌و خۆشەویستان‌و بە لەدەستدانی بەروبووم، بە هەموو ئەوانە تاقیتان دەکەینەوە، هەروەها لە

www.alibapir.com


سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٨٦)دا دەفەرمووێ: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِيٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا ... ﴿١٨٦﴾﴾، واتە: تاقی دەکرێنەوە لەماڵو سامانو نەفسی خۆتاندا، وە لەوانەی کە کتێبیان پێدراوە لەپێش ئێوەدا، وە لە کافرەکانیش ئازاری زۆر دەبیستن، (پڕوپاگەندەتان بۆ دەکەن، قسەتان پێ دەڵێن ناوو ناتۆرەتان بەدوا دەخەن)، کەواتە: تاقیکردنەوەی خوا جۆراو جۆرە، بۆیە لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبێ ئیماندار سەبرو ئارامیی هەبێو بەپێی فەرمانی خوا بەرەو ڕووی ببێتەوەو هەر حاڵەتە بەشێوەی پێویستو گونجاوی خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکات.

**سێ: بەبێ تاقیکرانەوەو دەرچوون لێی، دەسەڵات پەیدا نابێ:**

خوای کارزانو شارەزا بەبێ تاقیکردنەوەو لێ دەرچوونی، جڵەوی حوکمڕانییو پیادەکردنی شەریعەتو بەرنامەی خۆی ناداتە دەست خەڵك، بەڵگەشمان ئەوەیە کە خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة، واتە: وە کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقی کردەوە بەچەند فەرمانێك، کە هەمووی جێبەجێ کردن (لە هەموو تاقی کردنەوەکانی خوا دەرچوو، وە لە کڵ هاتەدەر) ئەوکاتە پێی فەرموو: دەتکێرم بە پێشەوا بۆ خەڵکی، (واتە: ئێستا شایستەی ئەوەی، کە پێشەواو چاوساغی خەڵك بی بۆ دینداریی، چونکە لە تاقی کردنەوەکانی خوا دەرچوویو سەلماندووتە، کە تۆ ئیمانداڕو خواناسی تەواوی، وە خوات لە هەموو شتێك لەلا گەورەترو بەڕێزترو خۆشەویستترە، وەگەردن کەچی بۆ خوا، بۆیە ئێستا شایستەی ئەوەی کە دینداریی و خواناسیی فێری خەڵك بکەی)،

گـوتی: ئـەدی لـە وەچـەکەم (پێشـەوایان پەیـدا دەکـەی؟) فەرمـووی: سـتەمکاران پەیـمانی مـن نایانگرێتەوە.

## چوار: تاقـیکردنـەوەی خـوای -عزّوجلّ- بۆ ئەهلی ئیمـان بە ئەنـدازەی ئیمـانو دینـیانـە:

پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە فەرموودەیـەکی ڕاسـت (صـحیح)[1]دا دەفـەرموێ: **{...يُبتَلى الرجل على حسب دينه، فإن كان في دينه صلابة زيد له في البلاء}** رواه الترمذي وأحمد وصححه ابن كثير، واتـە: ئینسـان بـە ئەنـدازەی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە، تا ئیمانو دینی بەهێزتر بێ تاقیکردنەوەکەشی قورسـترە، ئەم فەرموودەیە ئەوەی لـێ وەردەگیـرێ کاتێك، کە ئێمە تووشی نارەحەتی زۆر دەبیـن لەسەر خوا، دەبێ دڵمـان پـێی خـۆش بـێو بڵێیـن (إن شـاء الله) ئیمـانێکی بـەهێزو باشـمان هەیە، هەربۆیە دەبینیـن هـاوەڵانی پێغەمبـەر -ڕەزای خوایـان لـێ بـێ- بـە چەندین شێوەی ناخۆشو سەخت لەلایەن کافرەکانەوە ئـازار دراونو لەسـەر ئیسـلام بـە ناخۆشـییەکان تاقی کراونەوە، جا ئەگەر ئیمانێکی بەهێزو پتەویـان نەبووایـە، خۆیـان لە بەرانبەر ئەو هەموو ئازاردرانەدا ڕانەدەگرت، بـەڵام دیـارە ئیمانەکـەیان زۆر بـەهێز بووە، بۆیە تاقی کردنەوەکانیش زۆرو سەخت بوون، وە سەرەنجام لێشی دەرچوون.

### حیکمـەتو سوودەکانی تاقیکردنەوە

ئەم باسە بابەتێکی زۆر گرنگە، چونکە ئینسان ئەگەر لـە حیکمـەتو نهێنییـەکانی تاقی کرانەوەی خوا بۆ بەندەکانی تێنەگات، لەوانەیە زۆر جار لەژێر فشاری سـەختییو نارەحەتیی تاقی کرانـەوەدا، جۆرێك لـەگومانو دوو دڵـی بـۆ پەیـدا بێـت، بەتایبـەت

---

١) واتە: ڕاست (صحیح) بەپێی پێوەری زانایانی فـەرموودەناس، ئەگـەرنا بێگومـان هەرچی پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرموویێتی هەر ڕاستو (صحیح)ە!

www.alibapir.com

کاتێك کە تووشی زیندانو ئیهانەو سووکایەتی پێکران دەبێت، بۆیە پێویستە زۆر باش سەرنجی ئەم بابەتە بدەین، کە ئایا حیکمەتو سوودی تاقی کرانەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییە؟ وە بۆچی خوای بەبەزەیی بەندەکانی خۆی تووشی سەختییو نارەحەتییو دژوارییی دەکات.

جا بۆ چاکتر ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە لە چەند خاڵێکدا باسی دەکەین:

## ١- لەخۆ حاڵی بوون لەسەر ئاستی تاكو کۆمەڵ:

لەخۆ حاڵی بوونو خۆ ناسین زۆر گرنگە، ئەوکەسەی کە لەخۆی حاڵی نەبووە وەك کەسێك وایە، کە دەچێتە بازاڕو نازانێ پارەی چەند لە گیرفانێ دایە، شتی زۆر گەورە سەودا دەکات، دوایی کە تەماشا دەکا پارەکەی دەریناهێنێو تێیدا تووشی عەیبداریی دەبێ، بۆیە ئینسان دەبێ لەخۆی حاڵی بێ، ئنجا لەقەدەر خۆی هەنگاو هەڵێنێو قسە بکات، بۆ وێنە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾﴾ محمد، واتە: وە تاقیتان دەکەینەوە هەتا ئەوانەتان دەناسین، کە موجاهیدو تێکۆشەرن، وە خۆڕاگرن لەپێناوی خوادا، وە هەواڵو دەنگوباسەکانتان تاقی دەکەینەوە، ئینسان کە دەڵێ ئیمانم هێناوە یان مسوڵمانم، ئەوە هەواڵێکە لەبارەی خۆیەوە داویەتی، یان کە دەڵێ: خوام لەهەموو کەس خۆشتر دەوێ، ئەوە خەبەرێکە داویەتی، دەبێ ئەو خەبەرە لە مەحەك بدرێو، بزانرێ ئایا ڕاستە یان نا؟ وە لە مەیدانی کردەوەدا دەرکەوێ.

## ٢- لەبێژینگ درانی ئیمانداران:

یەکێکی دی لە حیکمەتەکانی تاقیکرانەوە، ئەوەیە کە ئینسان بەهۆی تاقیکرانەوە وە لەبێژینگ دەدرێو پوختە دەبێو ژەنگی پێوە نامێنێ، ئەگەر خۆی تێدا ڕابگرێ، لەوبارەوە خوای پاكو تاك دەفەرموێ: ﴿وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا ...﴿١٤١﴾﴾ آل عمران، واتە: وە بۆ ئەوەی خوا ئیمانداران بپاڵێوێ، (تمحیص) واتە پاڵاوتنو

لەبێژینگ دانو پاكو پیس لێك جیاكردنەوە، چونكە جاری وا هەیە ئینسان خاڵێكی لاوازی هەیە، بۆ وێنە: (ترسنۆكیی) بەڵام، كە كەوتە نێو نارەحەتییان، ترسی دەشكێو بەغیرەت دەبێ، یان ئینسانی وا هەیە چرووكی هەیەو ناتوانێ ماڵی خۆی ببەخشێ، بەڵام كە پێویستی كردو ماڵی خۆی لە پێناوی خوادا بەخشی، دوایی ڕادێت وە سیفەتی سەخاوەتی بۆ پەیدا دەبێ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكی (صحیح)یدا دەفەرموێ: **{إنّما العلم بالتعلّم وإنّما الحلم بالتحلّم}** رواه أحمد والطبراني، واتە: زانیاریی بە فێربوونەو ئارامییش بە خۆڕاهێنانە لەسەر ئارامیی، هەروەها لە فەرموودەیەكی دیكەدا دەفەرموێ: **{ومن يتصبّرْ يُصَبِّره الله، ومن يَستغْنِ يُغْنِه الله، ومن يستعففْ يُعِفَّه الله}** متفق عليه، واتە: هەركەسێ خۆی لەسەر سەبر ڕابهێنێت خوا سەبری پێدەدا، وە هەركەسێك خۆی لەسەر بێنیازیی ڕابهێنێ، خوا بێنیازیی دەكات، وە هەركەسێكیش خۆی لەسەر پاكیی ڕابێنێت، خوا جل -شأنە- پاكیی دەكات، یەكی دی لەو بەڵگانەی كە مسوڵمانان دەپاڵێورێن ئەوەیە كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ... ﴿١٧٩﴾﴾ آل عمران، واتە: خوا -جل شأنە- لە ئیمانداران ناگەڕێ بەو شێوەیەی كە ئێوە لەسەرینی، هەتاكو پاكو پیستان لێك جیا نەكاتەوە، جا بە لێك جیاكرانەوەی كەسانی پاكو پیس، ئینسان لە خۆی حاڵی دەبێ، كە چەندەی بەكەڵكی خوا دێو چەندەی پێچەوانەی دینی خوایە، وە هەم مسوڵمانان لە كۆمەڵیشیاندا لە خۆیان حاڵی دەبن، كە كێیان لاوازەو كێیان بەهێزە؟ وەك ڕووداوەكەی جەنگی (ئوحود) لەكاتێكدا، كە پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەیدانی شەڕ چوو، سێیەكی جەیشەكەیان بەسەركردایەتی (عبدالله بن أبيّ) -سەرۆكی مونافیقەكان- گەڕایەوە، كە مەرج نیە هەموویان هەر مونافیق بووبن بەڵكو لەوانەیە هەندێكیان ئیمانیان لاواز بووبێ، دیسان لە گەرمەی جەنگەكەشدا، هەندێكیان كە دەستكەوتەكانیان خۆشدەویست، فەرمانی پێغەمبەر ﷺ یان شكاند،

www.alibapir.com

جا لە میانەی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەو ترسو تەماعو سەختییانەدا ئینسان لەخۆی حاڵی دەبێو پاڵفتەش دەبێ!.

### ٣- دین زیاتر لەلا خۆشەویست بوون:

یەکی دی لە حیکمەتەکانی تاقیکرانەوە، ئەوەیە کە هەر کاتێ ئینسان بە ناخۆشیان تاقی کرایەوەو لەبەر خوا گرفتو کێشەی هاتنەڕێ دینی لەلا خۆشەویستترو شیرینتر دەبێ، چونکە سوننەتی خوا وایە هەرکەسێك بە شتێکەوە زۆر ماندوو بوو، وە ئەزیەتو ئازاری لەڕێدا چێشت، ئەوە لەلای خۆشەویست دەبێو، بۆی بە خەم دەبێ، وە شتێکیش کە بە ئاسانیی دەست بکەوێ، بە ئاسانییش لەدەست دەچێ.

### ٤- تێگەیشتنی زیاتر لە نێوەڕۆکی پەیامی خوا:

حیکمەتێکی دیکەی تاقیکرانەوە ئەوەیە، کە خەڵك لە نێوەڕۆكو جەوهەری ئەو بانگەوازو پەیامە حاڵی دەبن، کاتێك دەبینن شوێنکەوتوانی ئەو دینە خۆڕاگرنو بوێرو لەخۆبوردوونو فیداکاریی لەپێناودا دەکەن، دینو بەرنامەو پەیڕەوێك، کە شوێنکەوتوانی ئاوا بن، بەتەئکید سەرنجی خەڵك ڕادەکێشنو لەلایان شیرین دەبێتو بەدوایدا دەچنو لێی نزیك دەبنەوەو دەیانەوێ زیاتر لێی حاڵی بن، وەك لە باسی مسوڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتتابدا باسی دەکەین، یەکێك لەو شتانەی کە سەرنجی ڕاکێشا، ئەوە بوو کە ئافرەتێکی مسوڵمانی بینی کۆچی دەکرد بۆ (حبشة) پێی گوت، ئێرە بەجێ دێڵی؟! ئافرەتەکەش گوتی: بەڵێ بۆتان بەجێ دێڵین، چونکە ناهێڵن خواپەرستیی تێدا بکەین.

### ٥- ناسینی دۆستو دوژمن:

حیکمەتێکی دی لە حیکمەتەکانی تاقیکرانەوە، ئەوەیە کە ئینسان لە ناخۆشیو گیروگرفتەکاندا دۆستو دوژمنی خۆی دەناسێو، خەڵکی بۆ دەردەکەوێ، کە تا چەندە ئیمانی بەهێزەو ئامادەیە، چونکە ئینسان تا لێی نەقەومێ نازانێ کێی

دۆستەو کێی دوژمنــە، وە هەڵوێستی کاتی لێقەومانو تاقی کرانەوەکان گرنگەو حیسابی تەواوی لەسەر دەکرێ.

## ٦- هەڵبژاردنی هێندێك لە ئیماندارا ن بۆ پلەی شەهیدیی:

یەکێکی دی لە حیکمەتەکانی تاقیکرانەوە ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار لە ئەنجامی ئەو ناڕەحەتییانەدا پلەی شەهیدیی بە هەندێك لە ئەهلی ئیمان دەبەخشێ، وەك دەفەرموێ: ﴿...وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ... (١٤٠)﴾ آل عمران، واتە: بۆ ئەوەی شەهیدانتان لەنێودا هەڵبژێرین، وە جگە لە شەهیدییش بەهۆی تاقی کرانەوەوە ئینسانی ئیماندار پلەی بەرزدەکرێتەوەو گوناهی لێدەسڕێنەوە، وە لە خوای بە بەزەیی نزیك دەکەوێتەوەو پاداشتی خۆی بەتەواوی دەدرێتەوە، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿...وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ (١٥٥) ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ (١٥٦) أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ (١٥٧)﴾ البقرة، واتە: وە مژدە بدە بە خۆڕاگران، ئەوانەی کە لەکاتێکدا بەڵاو ناڕەحەتییەکیان تووش دێ، دەڵێن: ئێمە هی خواین، وە ئێمە بۆلای ویش دەگەڕێینەوە، ئەوانەی کە هەڵوێستیان ئاوایە (بەرانبەر تاقیکردنەوەی خوا) لەلایەن پەروەردگاریانەوە سەڵەواتیان لێ دەدرێ (-صلاة- لێرەدا، واتە: پلە بەرزکردنەوە)، وە بەزەییەکی تایبەتی پەروەردگاریشیان بۆ هەیە، وە ئا ئەوانەن ڕێ پێشاندراوانی ڕاستەقینە.

بەڕاستی خۆڕاگرتن لە تاقیکردنەوەکانی خوای پەروەردگارو لە سەختییو ناڕەحەتییەکاندا، لەسەر خواو ئیسلام، شتێکی زۆر گەورەیە، وە خوای بەرزو مەزن بەو هۆیەوە مرۆڤ دەباتە ڕیزی ئەوانەوە کە بۆخۆی سەڵاواتیان لێ دەدات.

www.alibapir.com


دایکمان عائیشە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{ما يصيب المؤمن من شوكةٍ فما فوقها إلا رفعه الله بها درجةً و حط عنه بها خطيئةً}** رواه مسلم[١]، واتە: هیچ شتێك تووشی ئیماندار نایەت لەپێداچوونی دڕکێك هەتا زیاتر، مەگەر خوا بەو ئازارە پلەیەك بەرزی دەکاتەوەو گوناهێکی لێ دەکاتەوە.

دەگونجێ زۆر شتی دیکەش بگوترێ دەربارەی سوودو حیکمەتەکانی تاقیکردنەوەکانی خوای پەروەردگار بۆ بەندەکانی، بەڵام ئەوانەی کە باسمان کردن تەنیا گوڵبژێرێك بوون.

لەکۆتاییدا دەڵێم: زێڕنگر کە بیەوێ لەو زێڕەی، کە لەبەردەستی دایە خشڵێك دروست بکات، دەیقاڵێنێتەوە، یاخود ئاسنگەر کە بیەوێ شتێك لە ئاسنەکەی دروست بکات، لە کورەدا گەرمی دەکات، پاشان بە چەکوش لێی دەدا تا ئەو شتەی کە دەیەوێ لێی دروست دەکات، بەهەمان شێوە هەرکەسێك، کە خوای کاربەجێ بیەوێ خزمەتی دینی خۆی پێ بکات، چ وەکو تاك چ وەکو کۆمەڵ، تووشی گرفتو نارەحەتییانی دەکاتو تاقی دەکاتەوە، وە ئیماندار تا لە کورەی تاقی کردنەوەکاندا قاڵ نەبێتەوە، بەکەڵکی ئەوە نایەت کە خوای بە بەزەیی ئیماندارێکی باشی لێ دروست بکاو خزمەتی دینی خۆی پێ بکات، بەتایبەتی ئەوانەی، کە دەیانەوێ خزمەتی دینی خوا بکەنو، خەڵك بەرەو ئیسلامو ئیمان بێننو، واقیعی خوارو خێچو دوور لە ئیسلام بگۆڕن بە کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی ملکەچ بۆ بەرنامە خوا.

کەواتە: کاتێك کە لەسەر خواو لەسەر ئیسلام تووشی نارەحەتییان دێین، با دڵمان بەخۆمان خۆش بێت، کە ئێمەش ڕێی پێغەمبەرو هاوەڵانیمان گرتوەو، دەمانەوێ بەرنامەی خوا بە خەڵکی ئاشناو، خەڵکی بە بەرنامەی خوا شارەزا بکەینو، لەو ڕێیەدا تووشی نارەحەتییو ئازار دەبین.

---

١) صحيح مسلم: ٦٥٠٧

من لە زیندانی ئەمریکیەکاندا، کە بیستو دوو مانگ بە ناهەق گیرام، زۆر جار سەجدەی شوکرم دەبردو دەمگوت: خوایە سوپاس بۆ تۆ، دیارە دەتەوێ لێم خۆش بیو شتێکم لێ دروست بکەی، کە بگونجێم خزمەتی دینی تۆ بکەم، بۆیە ئەگەر تووشی گیرانو دەرکران، یان قەرزدارییو هەڕەشە لێکردنو نەداریی بووین، ئەگەر پڕوپاگەندەمان بۆکراو زوڵممان لێکراو مەحرووم کراین، ئەوە با بەدڵنیاییەوە بزانین، کە خوای پەروەردگار خۆشی دەوێین، وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{إذا أحب الله قوماً ابتلاهم...}** رواه أحمد وابن ماجه والطبراني، واتە: هەرکاتێك خوا کەسانێکی خۆشویست تاقییان دەکاتەوە.

خوا یاربێ ئێمە لەوانە دەبین، کە لە کاتی تاقیکردنەوەدا لە خوا ڕازی دەبینو، خواش لە ئێمە ڕازی دەبێ.

لە ڕێی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - کوردي - English
کەناڵی
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

# کەوتنـە گومانی سـەرانی کوفـرو گوێگـرتنیان بۆ قورئان خوێندنی پێغـەمبـەر ﷺ و پرس‌و ڕاوێژکـردنیان بە جوولەکـەکانی مەدینـە

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانی بەڕێزی - خوا لێیان ڕازی بێ- لـە پێناوی خوادا تووشـی ئـازارو ئەشـکەنجەی دەروونیـی‌و جەسـتەیی زۆر بـوون بەدەست ئەهلی کوفرەوە، بەتایبەت بەدەستی سـەرانی کـوفر لـە شـاری مـەککـەو دەوروبـەری‌و ئەوانیش خۆڕاگرو ڕاوەستاو بوون، ئـەوە وای لـەدوژمن‌و ناحـەزانیان کـرد کـە بکەونـە گومـانـەوە بەرانبـەر بەبیـری بتپەرسـتیی خۆیـان، وە بکەونـە جۆرێك لەچـاو بـەخۆدا گێڕانەوە، من لێرەدا سـێ نـموونە دێنمـەوە کـە سـەرانی کـوفر لـە مـەککـەو شـوێنی دیکەش کەوتوونـە گومـانـەوە لـە بیری بتپەرستییانەی خۆیـان، وە لـە ڕاسـتیی بیری یەکتاپەرستیی پێغەمبەر ﷺ، ئەو نـموونانەی کە باسیشیان دەکەین دەکەونە ساڵانی (٥و٦)ی پێغەمبەرایەتییەوە:

## یـەك: بەپەنهانیـی گوێڕاگـرتنی سـەرانی کـوفر بـۆ قـورئان خوێنـدنی پێغـەمبـەر ﷺ:

(ابن هشام) لە (ابن إسحاق)ەوە دەگێڕێتـەوەو، دەڵـێ: {أن أبـا سـفيان بـن حـرب وأبا جهل بن هشام والأخنَس بن شـريق الثقفي خرجوا ليلـة ليسـتمعوا مـن رسـول الله وهو يصلي من الليـل فـي بيتـه فأخذ كل رجلٍ مـنهم مـجلسـاً يسـتمع فيـه وكـلٌّ لا يعلم بـمكان صـاحبه، فبـاتوا يسـتمعون لـه حتـى إذا طلـع الفجـر تفرقـوا فجمعهـم الطـريق فتلاوموا، وقال بعضهم لبعض ولا تعودوا فلو رآكم بعـض سـفهاءكم لأوقعتُم

فـي نفسه شـيئاً ثـم انصـرفوا[١]}، واتـە: (ئـەبوو سـوفیانو ئەبووجـەهلو ئەخنەسـی کوڕی شەریق) سێ کەس بوون لە قسە بەدەستانی مەککـە، شـەوێك دەچـن بـۆ ئـەوەی گوێ بگـرن لـە قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەر ﷺ تـاکو بزانـن ئـەوەی، کـە دەیڵـێو خـەڵك وردە وردە ئیمانی پێ دێنن چییە؟! لەکاتێکدا، کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە مـاڵی خۆیـدا سەرگەرمی شـەونوێژە[٢]، جا هەرکامێکیان لـە شـوێنێك دانیشـتوونو گوێیـان هەڵخستوە، کـە بـزانن دەڵـێ چـی؟ هیچیـان بـە شـوێنی ئـەوی دیکـەی نـەزانیوە، تـا سپێدەی بەیانی گوێیان هەڵخسـتوەو، دوایـی بـۆ ئـەوەی ئاشـکرا نـەبن ڕۆیشـتوونەوە، بەڵام کە لەڕێگادا یەکتـریان بینیوە، هەرکامێکیان لۆمـەو سـەرکۆنەی ئـەوی دیکـەی کردوە، وە بەیەکتـریان گوتوە: با جارێکی دیکە شـتی وا دووبـارە نەکرێتـەوە، چـونکە ئەگەر بێتو بێ عـەقڵەکانـمان بەو شتە بزانن، گومـان دەکەوێتە دڵیانـەوەو وا دەزانـن، کە ئێمـەش لـەژێر کاریگـەریی موحەمـــەد دایـن، دوایـی دەڕۆن، دیسـان بـۆ شـەوی دووەمو سێیەمیش ئەوە دووبارە دەکەنەوەو، لەکۆتاییدا لە بەرەبەیانی شەوی سـێیەمدا پەیـمان لەگەڵ یەکتـر دەبەسـتن، کە جارێکی دی ئەوە دووبارە نەکەنەوە[٣].

کەواتە لەم ڕووداوە ئـەوە وەردەگیـرێ، کـە سـەرانی کـوفر هێنـدێکیان لـە گومـان دابوون لە ڕاستییو گەورەیی قورئانو، ویستوویانە بگەنە یەقیـن.

---

١) (السيـرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٥٩)، ط١، دار ابن الـهيثم.

٢) سونەتە کە ئینسان لەکاتی شەونوێژدا بایی ئەوەندە، کە خۆیو ئـەو کەسـەی، کـە لـە تەنیشتیشـیەوە دەوەستێ، دەنگی بەرز بکاتەوە بە پێچەوانەی نوێژی ڕۆژەوە.

٣) سەرچاوەی پێشوو.

www.alibapir.com

## دوو: مشتومڕی نێوان سەرانی کوفر:

نموونەی دووەمیان بریتیە لە مشتومڕی (الأخنس بن شریق)، لەگەڵ هەریەك لە (أبو جهل) و (أبو سفیان)، کە (ابن هشام) ئاوا بۆمان دەگێڕێتەوە:

{فلما أصبح الأخنس بن شريق أخذ عصاه ثم خَرج حتى أتى أبا سفيان في بيته، فقال: أخبرني يا أبا حنظلة عن رأيك فيما سمعت من (محمد ﷺ)؟ فقال: يا أبا ثعلبة! والله لقد سمعتُ أشياء أعرفها وأعرف ما يراد بها، وسمعتُ أشياءَ ما عرفت معناها ولا ما يراد بها، قال الأخنس: وأنا والذي حلفت به[١]}، واتە: (الأخنس بن شریق) گۆچانەکەی دەست دەداتیو دەچێ بۆلای (أبو سفیان) لە ماڵی خۆی پێی دەڵێ: هەواڵم پێ بدە ئەی (أبو حنظلة) ڕات چییە دەربارەی ئەوەی کە لە (محمد)ت بیست؟! ئەویش دەڵێ: (أبو ثعلبة) سوێند بەخوا هەندێ شتم بیست تێی گەیشتمو مەعناشم زانی، وە دەزانم مەبەستی پێ چییە، وە هەندێك شتیشم بیست کە تێی نەگەیشتمو نەشمزانی مەبەستی پێ چییە؟! (أخنس) دەڵێ: سوێند بەوەی کە تۆ سوێندت پێ خوارد منیش بەهەمان شێوە.

{قال ثم خرج من عنده حتى أتى أبا جهل، فدخل عليه في بيته فقال: يا أبا الحكم! ما رأيك فيما سمعت من (محمد)؟ فقال: ماذا سمعت؟ تنازعنا نحن وبنو عبد مناف الشرفَ، أطعموا فأطعمنا، وحملوا فَحَملنا، وأعطوا فأعطينا، حتى إذا تَحاذَيْنا على الرُكَبِ وكُنَّا كَفَرسي رهانٍ، قالوا: منا نَبِيٌّ يأتيه الوحي من السماء، فمتى ندرك مثل هذه ! والله لا نؤمن به أبداً ولا نصدقهُ، فقام عنه الأخنس وتركهُ[٢]}، واتە: دوایی (أخنس) لەلای (أبو سفیان) هەڵدەستێو دەچێ بۆلای (أبو جهل) لە ماڵی خۆیدا، وە پێی دەڵێ: (أبو الحکم) تۆ ڕات چییە دەربارەی ئەوەی کە لە (محمد)ت بیست؟! (أبو جهل) دەڵێ: جا ڕام چی بێت؟

---

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

www.alibapir.com


ئێمەو (بنو عبد مناف) لەسەر برا گەورایەتیو قسە ڕۆیشتوویەتی پێشبڕکەمان بووە، ئەوان خواردنیان بەخشیوە ئێمەش خواردنمان بەخشیوە، وە ئەوان یارمەتی لێقەوماوانیان داوە ئێمەش یارمەتیمان داون، وەئەوان ماڵیان بەخشیوە بەهەمان شێوە ئێمەش وامان کردوە، هەتا کاتێك وامان لێهات، کە ئێمەو ئەوان هاوسەنگ بین، وەك دوو ئەسپ کە پێشبڕکەیان پێ دەکرێ، لەیەك ئاست دانو هیچ کامیان پێش ئەوی دی ناداتەوە، (بنو عبد مناف) گوتیان: ئێمە پێغەمبەرێکمان هەیە وەحی لە ئاسمانەوە بۆ دێتە خوار، جا ئێمە پێغەمبەرێکی وا لەکوێ بێنین؟ سوێند بە خوا هەرگیز باوەڕی پێناهێنینو بەڕاستی نازانین، (واتە: لەبەرئەوەی کە ئەگەر ئێمە ئیمانی پێ بێنین، دەبێ بکەوینە دوای عەشیرەتی (عبد مناف)، وە لە پێشبرکێکەدا دوا دەکەوین، کەواتە لەبەرئەوە باوەڕی پێ ناهێنین، بۆ ئەوەی دوا نەکەوین، نەك لەبەرئەوەی کە بەڕاستی نازانین،) دوایی (أخنس) هەڵدەستێو (أبو جهل) بەجێ دەهێڵێت.

## سێ: پرسیارکردنو ڕاوێژکردنی سەرانی کوفر بە جوولەکەکانی شاری (یثرب) دەربارەی (محمد) ﷺ:

وەك پێشتر باسمان کرد (نضر)ی کوڕی (حارث)، کە یەکێك لە قسە بەدەستەکانی قوڕەیشو پیاوێکی بلیمەتیش بووە، وە واش پێدەچێ کە قەناعەتی هاتبێ بەوە، کە (محمد) ﷺ پێغەمبەری خوایە، وەك (ابن هشام) دەڵێ: ڕۆژێك بە قوڕەیش دەڵێ:

{یا معشر قریشٍ! فانظروا في شأنكم فأنه والله لقد نزل بكم أمر عظيم![1]}، واتە: ئەی خەڵکی قوڕەیش! سەرنجی کاری خۆتان بدەنو تەگبیرێك لە حاڵی خۆتان بکەن، چونکە کارێکی گەورە ڕووی تێکردوون! دوای ئەوە، کە (نضر) ئەوەی بە قوڕەیشییەکان گوت، قوڕەیشییەکان پێیان گوت: ئەی (نضر) تۆو (عقبة بن أبي

---

١) هەمان سەرچاوە، ج١، ص(١٥٠).

معـیط) دەنێـرین بـۆلای زاناکـانی جوولەکـە لـە (یثـرب) بـۆ لێکۆڵینـەوە لـەبارەی موحەممەدەوە، ئنجا بەمـجۆرە ئاراستەیان کردن[1]:

{سلاهم عن (محمد) وصِفا لـهم صفته وأخبـراهم بقوله فأنهم أهـل الكتـاب الأول وعندهم علمٌ ليس عندنا من علم الأنبياء...}، واتە: بچن پرسیار بکەن لـە زاناکـانی جوولەکەو دەربارەی موحەمـمەد وە شێوەو هەڵسوکەوتییان بـۆ بـاس بکـەن، وە باسـی ئەو قسانە بکەن، کە دەیانڵێ (مەبەست لە قورئانە) واتـە: هەنـدێك لـە قورئانیـان بـۆ بـخوێننەوە)، چونکە ئەوان خـاوەنی کتێبـی یەکـەمن، وە ئـەو زانیيارییـەی کـە ئـەوان لایانە دەربارەی پێغەمبەران لای ئێمە نیـە.

جـا (نضـر) و (عقبـة) دەچـن بـۆ (یثـرب)و کۆبوونـەوە دەکـەن لەگـەڵ زاناکـانی جوولەکە، وە باسـی پێغەمبـەریان بۆ دەکـەن، وە هەنـدێك قورئانیـان بـۆ دەخـوێننو دەڵێن ئەوەی، کە دەڵێ لەلایەن خـواوە بـۆم هـاتوە، ئـەوە نـموونەیەکیەتی، زاناکـانی جوولەکەش پێیان دەڵێـن:

{سـلوه عـن ثـلاث نـأمركم بهـنَّ، فأن أخبَـركم بهـنَّ فهـو نبِـيّ مرسـل، وإن لـم يفعل فالرجـل متقـوِّل فَرُوا فيه رأيكم:

١) سـلوه عـن فتيـة ذهبـوا فـي الدهـر الأول ماكـان أمرهم؟ فأنـه قد كان لـهم حـديث عـجب !.

٢) وسـلوه عـن رجلٍ طوّاف قد بلغ مشارق الأرض ومغاربها، مـاكان نبـأه ؟.

٣) وسـلوه عـن الروح ما هي ؟.

فإذا أخبـركم بذلك فاتبعوه فـانه نبّـي، وانْ لـم يَفعَل فهـو رجـل متقـوِّلٌ فاصـنعوا فـي أمره ما بدالكم}، واتە: پرسیاری لـێ بکەن لەبارەی ئـەو سـێ شـتەوە کـە پێتـان دەڵـێین، جـا ئەگـەر وەڵامـی دانـەوە ئـەوە دیـارە پێغەمبـەرە، وە ئەگـەر وەڵامیشـی

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص(١٥١) .

نەدانەوە، ئەوە دیارە کابرایەکە هەر لەخۆوە قسەیەکی هەڵبەستوەو ئەوکاتە بۆخۆتان چیتان پێ چاکە ئاوا بکەن:

١- پرسیاری لێ بکەن دەربارەی کۆمەڵە گەنجێك، کە لە ڕۆژگاری زوودا ڕۆیشتوون‌و سەری خۆیان هەڵگرتوەو چوونە شوێنێك، بەسەرهاتێکی سەرسوڕ هێنەریان هەیە.

٢- پرسیاری لێ‌بکەن دەربارەی کابرایەك، کە زۆر گەڕاوەو، بەدەسەڵات بووەو گەیشتۆتە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژ ئاوای دنیا، ئایا چۆن بووە؟

٣- پرسیاری لێ بکەن دەربارەی ڕووح داخۆ چییە؟

جا ئەگەر وەڵامی ئەو پرسیارانەی دایەوە، ئەوا پێغەمبەرەو شوێنی بکەون، بەڵام ئەگەر وەڵامی نەدانەوە، ئەوا هەر قسەیەکەو کردوویەتی، بۆخۆتان چی لەبارەوە دەکەن بیکەن.

(نضر بن الحارث)و (عقبة بن معيط) دەچنەوە بۆ مەککەو بەقوڕەیشییەکان دەڵێن: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش! بەڕاستی هەواڵێکمان دەربارەی موحەممەد ﷺ بۆ هێناون، کە بەتەواویی بەرچاومان ڕوون دەبێتەوە، زانایانی جوولەکە پێیان گوتووین سێ شتی لێ بپرسین، ئەگەر وەڵامی ئەو سێ پرسیارەی دایەوە، ئەوە دیارە پێغەمبەری خوایە، ئەگەر وەڵامیشی نەدایەوە ئەوە پێغەمبەر نیە.

ئنجا دەچن بۆ لای پێغەمبەر ﷺو پرسیاری لێ دەکەن‌و، دەڵێن: کۆمەڵە گەنجێك بوون لە زەمانی زوودا ڕۆیشتوون، سەری خۆیان هەڵگرتوە، بەسەرهاتێکی سەیریان هەیە بۆمان باس بکە؟.

هەروا کابرایەك زۆر گەڕاوەو چۆتە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای دنیا، ئەویش هەواڵی چۆنەو کێ بووە؟.

سێیەم پرسیاریشمان ئەوەیە پێمان بڵێ ڕووح چییە؟!

(ابن هشام) ئاوا باسی هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ دەکات:

**{فقال لهم رسول الله ﷺ أخبركم بما سألتم عنه غداً؟ ولم يستثنِ فانصرفوا عنه، فمكث رسول الله فيما يذكرون خمس عشرة ليلة لا يُحْدِثُ الله إليه في ذلك وحياً ولا يأتيهِ جبريل حتى أرجف أهل مكة، وقالوا: وعدنا (محمد) غداً واليوم خمس عشرة ليلة قد أصبحنا منها لا يخبرنا بشيء مما سألناه عنه، حتى أحزن رسول الله مكث الوحي عنه وشق عليه ما يَتكلم به أهل مكة، ثم جاءه جبريل من الله عزّ وجلّ بسورة أصحاب الكهف فيها معاتبتهُ إياه على حزنه عليهم وخبر ما سألوه عنه من أمر: الفتية والرجل الطواف والروح}**(١)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون سبەی وەڵامی ئەو پرسیارانەتان دەدەمەوە، بەبێ ئەوەی (إن شاء الله) بکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پازدە شەوان مایەوە، خوا وەحی بۆ نەناردو (جبريل)یشی بۆ لا نەنارد، هەتا کافرەکانی مەککە لەنێو خۆیاندا کردیان بە پڕوپاگەندەو بڵاویان کردەوەو گوتیان: موحەممەد ﷺ هەواڵی پێداین بۆ بەیانی، بەڵام ئەمڕۆ پازدە شەوە! هیچ وەڵامی نەداینەوە (واتە: دەرکەوت کە – محمد- پێغەمبەری خوا نیە!) دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵتەنگ بوو، وە زۆر لەسەر دڵی قورس بوو، چونکە ئەوەی، کە ئەهلی مەککە دەیانگوت، هۆکارێکی پڕوپاگەندەیی گەورە بوو.

جا (جبريل) سەلامی خوای لێبێ لەلای خوای بەرزو مەزنەوە هات بۆلای پێغەمبەر ﷺو، سوورەتی (الكهف)ی بۆ هێنا، کە لەو سوورەتەدا خوا سەرکۆنەی پێغەمبەر ﷺ دەکا، کە ئەوەندە بە خەم کافرەکانەوەیە بۆچی ئیمان ناهێننو، وەڵامی هەر سێ پرسیارەکانیشی تێدایە.

جا (ابن إسحاق)(٢) دەڵێ: بۆم باسکراوە، کە کاتێك (جبريل) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر پێی فەرموو: ئەی (جبريل)! ئەوەندە دواکەوتیو نەهاتی بۆ لام، هەتا گومانی خراپم بەدڵدا هات، (وەك ئەوە کە ئایا دەبێ خوا لێم توورە بووبێ؟).

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە، وە بڕوانە: (المصباح المنير...)، ص٧٩١.

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٥١-١٥٢.

(جبریل)یش ئاوا وەڵامی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوە، کە خوا پێی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ مريم﴾، واتە: ئێمە بەفەرمانی پەروەردگارت نەبێ دانابەزین، وە داهاتوو ڕابردووشمان وە ئەوەی، کە دەکەوێتە نێوانیشیانەوە هەمووی بەدەست پەروەردگارتە، وە پەروەردگارت شتی لەبیر ناچێ، (واتە: تۆی لەبیر ناچێ، وە دەشیزانی تۆ هەر چاوەڕێی وە حیکمەتیشی تێدایە، کە بۆچی ئەو وەڵامە دواکەوت).

دیارە سووڕەتی (الکهف) وەڵامی دوو لە سێ پرسیارەکانی تێدایە، لە ئایەتی (٩ تا ٢٦) وەڵامی پرسیاری یەکەمی تێدایە، کە باسی (أصحاب الكهف) دەکات، وە لە ئایەتی (٨٣ تا ٩٨) وەڵامی پرسیاری دووەمی تێدایە، کە باسی (ذوالقرنین) دەکات، بەڵام پرسیاری سێیەم وەڵامەکەی لە سووڕەتی (الإسراء)دا دراوەتەوە لە ئایەتی (٨٥)دا.

ئەمەش سەرەتای سووڕەتی (الکهف)ە: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ
بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا
حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا
﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِءَابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن
يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا
ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ
عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾

ئه‌م ئایه‌تانه پێشه‌کی سووره‌تی (الكهـف)ن وه له‌دواییـدا دێتـه سـه‌ر وه‌ڵامدانـه‌وه‌ی پرسیاره‌كان، كه ماناكانیان به‌م شێوه‌یه‌یه:

به‌ناوی خوای به‌به‌زه‌یی به‌خشنده، ستایش بۆ ئه‌و خوایه‌ی كه له‌سـه‌ر به‌نـده‌ی خـۆی كتێبێكی دابه‌زانـدوه، كـه هـیچ نـاڕێكی تێـدا نیـه، ڕێـكو ڕاسـته بـۆ ئـه‌وه‌ی خـه‌ڵك بترسێنێ له كاره‌ساتێكی زۆر سـه‌خت كـه له‌لایـه‌ن خۆیـه‌وه دێ، وه مـوژده بـدات بـه ئیمانـداران، ئه‌وانـه‌ی كـه كـرده‌وه‌ی بـاش ده‌كـه‌ن كـه پاداشـتێكی چـاكیان هه‌یـه، وه به‌هه‌میشه‌یی تێیدا ده‌مێننه‌وه، وه‌ئه‌وانه بترسێنێ كه ده‌ڵێن خوا ڕۆڵه‌ی هه‌یـه، بـه‌بێ ئه‌وه‌ی كه خۆیانو بابو باپیرانیان زانیارییـان بـه‌وه هـه‌بێ، كـه ئه‌مـه قسـه‌یه‌كی زلـه به‌زاریانداد‌ێو له خۆوه ده‌یكـه‌ن، وه جگـه لـه درۆ شـتێكی دیكـه نـاڵێن، (دوایـی بـه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ) ڕه‌نگـه خـۆت بفـه‌وتێنی ئه‌وه‌نـده خه‌فـه‌تیان لـێ ده‌خـۆی (لێره‌دا جۆرێك له سه‌ركۆنه‌كردن هه‌یه له‌لایه‌ن خواوه بۆ پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه ئه‌وه‌نده‌یان خه‌م لـێ مـه‌خۆ كه ئیمان ناهێنن) ئێمه زه‌ویـیمان ڕازاندۆته‌وه‌و وامـان هه‌ڵخسـتوه كـه هه‌موو جۆره خۆشییه‌كی تێدایه بۆ ئه‌وه‌ی كـه خـه‌ڵكی تێـدا تـاقی بكه‌ینـه‌وه كامیـان كرداری باشتره! وه ئێمه دوایی هه‌رچی له‌سه‌ریه‌تی وه‌ك په‌ریزێكی ڕووتی لێده‌كه‌ین.

ئنجا به نسبه‌ت وه‌ڵامی پرسیاری یه‌كه‌م له‌باره‌ی (أصـحاب الكهـف)ه ئـاوا ده‌ست پێده‌كاو ده‌فه‌رموێ:

﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ ...﴾ الكهف-٩- ١٠ تاكو ٢٦-، واته: ئایا واتزانـی كـه هـاوه‌ڵانی ئه‌شـكه‌وتو ئـه‌و به‌رده‌ی ناویانی تێـدا نووسـرابوو له‌نیشـانه‌كانی ئێمـه‌دا سه‌رسوڕهێنه‌ر بـوون، كاتێـك كۆمه‌ڵـه گـه‌نجێك پـه‌نایان بـرده به‌رئه‌شـكه‌وت، وتیـان ئـه‌ی پـه‌روه‌ردگارمـان له‌لایـه‌ن خۆته‌وه ڕه‌حمه‌تێكمان پێ ببه‌خشه‌و سه‌رڕاستیمان له‌كاره‌كه‌ماندا بۆ فه‌راهه‌م بێنه..

وه سه‌باره‌ت به وه‌ڵامی پرسیاری دووه‌میش ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴾... الكهف ٨٣-تا ٩٨﴾، واتە: کە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی (ذي القرنين) بڵێ: بەسەرهاتی ئەوتان بۆ دەخوێنمەوە...

وەڵامی پرسیاری سێیەمیش لە سوورەتی (الإسراء)دا دەداتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی (ڕووح) بڵێ: ڕووح شتێکە پەیوەندی بە کاری پەروەردگارەوە هەیە، کەمێکیش نەبێ زانیارییتان پێ نەدراوە.

وە دەتوانیین بڵێین: حیکمەتی دواکەوتنی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانو هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو لە:

**یەك:** بۆ ئەوەی بۆ هەموو خەڵکی دنیا بەگشتیو بەتایبەت کافرەکانی مەککەو غەیری مەککەش دەرکەوێ، کە قورئان قسەی موحەممەد ﷺ نیەو ئەو تۆزقاڵێك دەستی لە دانانی قورئاندا نیە، ئەوەتا پازدە ڕۆژ چاوەڕێی وەحی دەکات بۆ ئەوەی وەڵامی کافرەکانی پێ بداتەوە، بەڵکو ئیمان بێنن، کە زۆر زۆر پێویستی بە وەحی بووە، تاکو وەڵامی ئەوانی پێ بداتەوەو پەکی لەسەری کەوتوە، بەڵام خوای پەروەردگار وەحی بۆ نانێرێ بۆ ئەوەی دەرکەوێ کە موحەممەد ﷺ کەمو زۆر دەستی لە دانانی قورئاندا نیەو، هەمووی فەرمایشتی خوایەو بە فەرمانی خوا لە چ کاتێکدا بیەوێ بۆی دێت، جا چۆن دێتو چی تێدایە ئەوە شتێکە بە بڕیاری خوایە، خۆ ئەگەر هی خۆی بووایە زوو وەڵامی دەدانەوە، وە لە قورئاندا خوای پەروەردگار لە چەند شوێن ڕەخنە لە پێغەمبەر ﷺ دەگرێت، وەك: ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ ...﴿٤٣﴾ ﴾ التوبة، یان: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ ﴾ عبس، یان: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ ...﴿٦٧﴾ ﴾ الأنفال، کە ئەوەش حیکمەتێکی زۆر گەورەی تێدایە، بۆ ئەوەی خەڵکی بزانن، کە ئەو قورئانە هی خۆی

نیەو کەلامی خوایە، هەرکاتێك، کە خوا ویستی بۆی دەنێرێ، هەر کاتێکیش ویستی لەسەر نەبوو، لێی دەگرێتەوە.

**دوو:** حیکمەتی دووەمیش ئەوەیە، کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الكهف، واتە: بۆ هیچ شتێك مەڵێ سبەینێ ئەوە دەکەم، مەگەر بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ، ئەگەر لەبیریشت چوو، هەرکات بیرت هاتەوە، ناوی پەروەردگارت بێنەو بڵێ: بەڵکو پەروەردگارم لەمەی ئێستا باشتر سەرڕاستم بکات.

کەواتە: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبیری نەبوو بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ (إن شاء الله) وەڵامەکە دواکەوتو ئەو ڕاستییە جوان بۆ هەموو لایەك دەرەوشایەوە، کە هەرشتێك خوای کاربەجێ ویستی لەسەر نەبێ نایەتەدی، ئەمەش دەرسو پەندێکی زۆر گەورەی تێدایە، هەم بۆ پێغەمبەری خواو، هەم بۆ ئۆمەتەکەیشی.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## چەند ڕووداوێك كە زیاتر بوونە مایەی خۆگرتن و گەشەكردنی بانگەوازی ئیسلام

ئەو ڕووداوانەی كە لێرەدا باسیان دەكەین شەش ڕووداون، كە لەنێوان ساڵانی (٦) تا كۆتایی (١٠)ی پێغەمبەرایەتی (بعْـثَة) ڕوویان داوە، كە هێندێكیان ڕووداوی خۆش بوون بۆ مسوڵمانان، وە هێندێكیشیان بەپێچەوانەوە، بەڵام هەموو ڕووداوە خۆشو ناخۆشەكان، بوونە مایەی زیاتر پنج گرتنو قووڵبوونەوەی ڕەگو ڕیشەی ئیسلام و بانگەوازی ئیسلامیی بەدڵو دەروونو عەقڵو هۆشی خەڵكدا، وە زیاتر فراوانبوونی ئیسلامو گەشەكردنی، وە پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین كە ئینسانی ئیماندار هەرچی بێتە ڕێی دەبێتە مایەی زیاتر بەهێزبوونی ئیمانەكەی، خۆشیی بێ یان ناخۆشیی، وەك لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، كە دەفەرموێ: **{عجباً لأمر المؤمن ان أمرهُ كلّه خيرٌ لَهُ، وليس ذلك لأحد الاّ للمؤمن، إنْ أصابتهُ سَرّاءُ شكر فكان خيراً له وإن أصابته ضرّاءُ صبر فكان خيراً لـه }** رواه مسلم[1]، واتە: ئیشی ئینسانی ئیماندار سەیرە! ئیشەكەی هەمووی ڕووی لە خێرەو لە قازانجی دایە، وە ئەوەش بێجگە لە بڕوادار بۆ كەسی دیكە نیە، ئەگەر خۆشیی توش بوو سوپاسی خوای لەسەر دەكات، ئەوەش بۆ وی بەخێر دەگەڕێ، وە ئەگەر نارەحەتییو ناخۆشیشی تووش بوو سەبرو ئارامیی لەسەر دەگرێو، ئەوەش هەربۆی بە خێر دەگەڕێ.

كەواتە: ئیماندار لە هەردوو حاڵەتدا هەر بەهرەمەندو براوەیە، وە بەپێچەوانەشەوە ئینسانی كافر لە خۆشیاندا هەر دۆڕاوەو لە ناخۆشیانیشدا هەر دۆڕاوە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتانەی كە خوای زانا تێیاندا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا

---

١) صحيح مسلم: ٧٤٢٥.

www.alibapir.com

مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ ﴾ المعارج، واتە: ئینسان خۆڕانەگر خوڵقێنراوە، (ئینسانی کافر کە بەهرەمەند نەبووە لە ئیمانو هیدایەت) ئەگەر ناڕەحەتیی تووش هات زۆر پێی ناڕەحەت دەبێ، وە ئەگەر چاکەشی تووش بوو، لەخۆیدا کورتی هەڵدێنێو بەشی کەسی لێ نادات.

جا خوا پشتیوان بێ لێرەدا باسی شەش ڕووداو دەکەین، کە جۆراو جۆرنو بە خۆشو ناخۆشیانەوە، بوونە هۆی زیاتر بەرەو پێش چوونی کاری ئیسلامیی لەسەر دەستی مویارەکی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)و هاوەڵانی بەڕێزی بە پیاوو ئافرەتەوە، کە ئەمانەن:

## یەکەم: مسوڵمانبوونی (حَمْزة)ی کوڕی (عبدالمطلب) مامی پێغەمبەری خوا ﷺ:

چۆنیەتی مسوڵمانبوونی حەمزە وەك (ابن هشام) گێڕاویەتەوە[1]، بەم شێوەیەیە:

ڕۆژێك کە (أبوجهل) پێغەمبەر ﷺ دەبینێ لەلای کەعبە نوێژ دەکات، قسەی ناخۆشو جنێوی پێ دەڵێو، چەند جارێك دووبارەیان دەکاتەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ دەبێ، دوایی ئەبوجەهل دەچێتەوە نێو مەجلیسەکەی خۆیو دادەنیشێ، پێغەمبەریش ﷺ بە دڵ شکاویی و مەحزونیی دەچێتەوە ماڵێ، کەنیزەکێکی ئازادکراوی (عبدالله بن جدعان) ئاگادار دەبێو گوێشی لەو قسانە دەبێ، کە (أبو جهل) بە پێغەمبەری ﷺ گوتوون، لەوکاتەدا حەمزەی مامی پێغەمبەر لە ڕاو دەگەڕێتەوە، کە پیاوێکی زۆر پاڵەوانو بە شانو شەوکەتو ئازا بووەو عادەتی وابووە کە هەر کاتێك لە ڕاو دەگەڕایەوە، پێش ئەوەی بچێتەوە ماڵێ حەوت جار تەوافی کەعبەی دەکرد، کە هەندێ شوێنەواری دینی ئیبراهیمیان بۆ مابۆوە، کە ئەوەش یەکێك بوو لەوانە، بەڵام ئەمجارەیان ئەو ئافرەتە کەنیزەکە دەچێتە سەر ڕێگەی

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص١٤٥-١٤٦، ط١، دار ابن االهيثم.

حەمزەو بەسەرهاتو ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، دوای ئەوەی کە بۆی باس دەکات (أبو جهل) چۆن قسەی بە پێغەمبەر ﷺ گوتوەو پێغەمبەریش چۆن بە دڵشکاویی چۆتەوە ماڵێ، (ابن هشام) دەڵێ[١]:

{فلما دخل المسجد نظر إليه في القوم فأقبل نحوه حتى إذا قام على رأسه دفع قوسه فضربه بها فشجَّه شَجّةً منكرة، ثم قال: أتشتمه وأنا على دينه أقول ما يقول: فَرُدَّ عليَّ ذلك ان استطعت! فقامت رجال من بني مخزوم إلى حمزة لينصروا أبا جهل، فقال: دعوا أبا عمارة فإني والله قد سببت ابن أخيه سباً قبيحاً، وتم حمزة على إسلامه، فلما أسلم حمزة عرفت قريش أن رسول الله ﷺ قد عز وامتنع وان حمزة سيمنعه فكفُّوا عن بعض ما كانوا ينالون منه}، واتە: حەمزە دەچێتە مزگەوتو[٢] تەماشا دەکات (أبو جهل) دانیشتوە لەگەڵ ئەهلی نادییەکەی خۆی، یەکسەر دەچێتە سەری ڕادەوەستێو بە کەوانەکەی لە سەری ڕادەکێشێو زۆر خراپ سەری دەشکێنێو خوێنی پێدا دێت، وە پێشی دەڵێ: ئایا تۆ جنێو بە موحەممەد دەڵێی لەکاتێکدا، کە دەزانی من لەسەر دینی ئەوم، وە ئەو چ دەڵێ منیش وا دەڵێم ! (دیارە تا ئەوکاتەی، کە ئەو قسەیەشی کردوە مسوڵمان نەبووبوو، لە زۆر لە کتێبەکانی سیرەدا هاتوە، کە حەمزە لە ڕقان مسوڵمان بووەو خزمایەتی هۆکار بووە بۆ مسوڵمانبوونی، بەڵام خوای پەروەردگار گەر ویستی هیدایەتی کەسێك بدات هۆکاریشی بۆ ساز دەکات، لێرەدا گرنگ هۆکارەکە نیە، بەڵکو گرنگ سەرەنجامو ئەنجامەکەیەتی)، ئنجا حەمزە دەڵێ: ئەگەر دەتوانی بەرپەرچم بدەوە، کۆمەڵێك لە پیاوانی بەنی مەخزووم هەڵدەستن، کە یارمەتی (أبو جهل) بدەنو شەڕ بکەن لەگەڵ حەمزەدا، بەڵام ئەبووجەهل تەماشا دەکات عاقیبەتی کارەکە

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٦.

٢) دیارە مەبەست لێرەدا مزگەوتی حەرامە.

www.alibapir.com


خراپ دەبێ، بۆیە دەڵێ: لە (أبو عمارة[١]) بگەڕێن، چونکە من جنێوێکی خراپم بە برازایەکەی داوە، دوایی حەمزە مسوڵمانێتیەکەی تەواو دەبێو دەچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش ئیسلامو ئیمانو (عقیدة)ی لێ حاڵی دەکات، دوای مسوڵمانبوونی حەمزە قورەیشییەکان دەزانن، کە لەمەودوا حەمزە زیاتر دیفاع لە پێغەمبەری خوا دەکات، بۆیە لەو قسەو کردارە ناشیرینانەی کە پێشتر دژی پێغەمبەر ﷺ دەیانکرد کەم دەکەنەوە.

## دووەم: کۆچکردنی یەکەمو دووەمی مسوڵمانان بۆ حەبەشە:

(ابن هشام) لە (ابن إسحاق) دەگێڕێتەوەو دەڵێ[٢]:

{فلما رأى رسول الله ﷺ ما يصيبُ أصحابه من البلاء وما هو فيه من العافية بمكانه من الله ومن عمه أبي طالب وأنه لا يَقْدِرُ أنْ يَمنعهم مما هم فيه من البلاء قال لهم: لو خرجتم إلى أرض الحبشة فإن بها ملكاً لا يُظْلَمُ عنده أحدٌ وهي أرض صدقٍ، حتى يجعل الله لكم فرجاً مما أنتم فيه}، واتە: کاتێك، کە پێغەمبەر ﷺ بینی هاوەڵانی بەڕێزی بە چەندان شێوە نارەحەت دەکرێنو خۆشی لە جۆرێك لە سەلامەتی دایە، بەهۆی ئەوە وە کە خوا دەیپارێزێ لە هەندێك شت کە لایەقی پێغەمبەر نیە کە بەسەری بێت، وە بەهۆی (أبو طالب)ی مامییەوە کە بەرگریی لێکردوە، وە ناتوانێ بەرگریی بکات لە هاوەڵانی بەڕێزی لەو بەڵاو نارەحەتییانەی، کە بەسەریان دێت، لەلایەن کافرو بێبڕواکانەوە، لەبەرئەوە پێشنیارێکی بۆ کردنو فەرمووی: ئەگەر بچن بۆ سەرزەمینی حەبەشە، چونکە پادشایەکی لێیە هیچ کەس لەلای وی ستەمی لێناکرێ، وە پیاوێکی دادگەرو باشە وە شوێنێکی باشیشە، هەتا خوای بە بەزەیی دەرووێکتان لێ دەکاتەوە لەو حاڵە ناخۆشەی کە تێیدان.

---

١) لەنێو عارەباندا وا باوبووە، کە ئەگەر ڕێزیان لە هەرکەسێك گرتبایە بە(كنية) بانگیان دەکرد وەك لێرەدا (أبو جهل) وایکردوە.

٢) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص١٦٢.

چونکە مسوڵمانان لە ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دابوون لەلایەن کافرو بێبڕواکانەوە لە هەموو ڕوویێکەوە، بۆ وێنە[1]: لەڕووی داراییەوە یەکێك لەوانە (خەبابی کوڕی ئەڕەت)، دەڵێ: من ئاسنگەر بووم کەڵوپەلم بۆ (عاص بن وائل السّهمي) دروست کردبوو، ئەویش مەبلەغێك پارە قەرزدارم بوو، چەند جارێك چووم داوای قەرزەکەم لێکرد، بەڵام ئەو دەیگوت دەبێ کوفر بکەی بە موحەممەد، ئنجا پارەکەت دەدەمەوە، منیش پێم گوت: وەڵڵاهی هەتا دەژیو دەمریو زیندووش دەکرێیەوە، کوفر بە موحەممەد ﷺ ناکەم، ئەویش گوتی: باشە لەبەرئەوەی، کە تۆ دەڵێی دوای مردن زیندوو دەکرێینەوە، هەرکات، کە زیندووکراینەوە وەرە بۆ لام، چونکە بێگومان ئەوکات من سەروەتو سامانم دەبێت، کە هاتی پارەکەت دەدەمەوە!! بەو شێوەیە قەرزەکەی نەدایەوەو، خوای پەروەردگار لە وەڵامی (عاص بن الوائل)دا ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار:

﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾ مريم، واتە: ئایا سەرنجی ئەو کەسەت داوە، کە بڕوای بە ئایەتەکانمان نەکرد، وە گوتی: (لە ڕۆژی دواییدا) سامانو مندالم دەدرێنێ! ئایا پەنهان دەزانێ، یان لای خوای بە بەزەیی بەڵێنی هەیە؟! نەخێر، ئەوەی دەیڵێ تۆماری دەکەین، وە ئازاری بۆ درێژ دەکەینەوە، وە ئەوەی دەیڵێ بەمیراتی دەگرینو بەتەنیاش دێتە لامان.

بۆیە لە ئەنجامی ئەو زوڵمو زۆرو ستەمەدا پێغەمبەر فەرمان بە هاوەڵانی دەکات کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، وەك (ابن إسحاق) دەڵێ:

---

١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص(١٨٤).

{فكان جميع من لحق بأرض الحبشةِ وهاجر إليها من المسلمين سوى أبناءهم الّذين خرجوا بهم معهم صغاراً وولدوا بها، ثلاثة وثمانين رجلاً، إنْ كان عَمَّار بن ياسر فيهم وهو يُشكُّ فيه[1]}، واتە: هەموو ئەوانەی کە کۆچیان کرد بۆ سەر زەمینی حەبەشە (٨٣) پیاو بوون، ئەگەر (عمار بن یاسر)یان تێدا بێ، کە گومانی تێدایە ئەو بووبێ، دیارە ئەو ژمارەیە هی هەردوو کۆچەکەیەو لێرەدا تەنیا ژمارەی پیاوانیان حیساب کردوە، ئەگەرنا کۆچکەران بەگشتی بەلای کەمەوە نزیکەی چواریەکیان ئافرەت بوونە، بەڵام لێرەدا (ابن إسحاق) هەردوو کۆچەکەی تێکەڵ کردوون ئەگەرنا دوو جار کۆچیان کردوە، چونکە (ابن إسحاق) هەر بۆخۆی لە شوێنێکی دیکەی کتێبەکەیدا گوتوویەتی:

{وبلغ أصحاب رسول الله ﷺ الّذين خرجوا إلى أرض الحبشة، إسلامُ أهل مكة فأقبلوا لما بلغهم ذلك، حتى إذا دنوا من مكة بلغهم أنَّ ما كانوا تحدثوا به من إسلام أهل مكة كان باطلاً، فلم يدخل منهم أحد إلا بجوار أو مستخفياً... فجميع من قدم عليه مكة من أصحابهِ من أرض حبشة، ثلاثة وثلاثون رجلاً[2]}، واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێت، ئەوانەی کە چووبوون بۆ حەبەشە، هەواڵیکیان پێ گەیشت، کە ئەهلی مەککە مسوڵمان بوون، کە ئەوەیان بیست بەرەو مەککە بەڕێ کەوتن، کە نزیکی مەککە بوون بۆیان دەرکەوت هەواڵەکە درۆیە، بۆیە هیچ کامیان نەیانتوانی بێنەوە نێوشاری مەککە مەگەر ئەوانە نەبێ کە کەسێك یان سەرۆك عەشیرەتێك پەنای دابوون، {ئەم یاسایە هەبووە لەنێو عارەبەکاندا، وە پێیان گوتوە: (جوار)} یاخود ئەوەی کە بە پەنهانیی هاتبێتەوە ماڵێ، هەندێکیشیان هەر

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٦٧)، ط١ دار ابن الـهيثم.

٢) هەمان سەرچاوە، ج٢، ص(١٨٨-١٩٠).

لەوێوە گەڕانەوە، پاشان (ابن اسحاق) دەڵێ: جا سەرجەم ئەو هاوەڵانەی لە حەبەشەوە هاتنەوە بۆلای لە مەککە (٣٣) پیاو بوون.

بەڵام وادیارە کاتێك بۆ جاری دووەم کافرەکان ئازارو ئەشکەنجەی مسوڵمانانیان زیاتر کردوە، ژمارەیەکی زیاتر کۆچیان کردوە، بۆیە وایێ دەچێ ئەوەی کە (ابن إسحاق) دەڵێ: ژمارەی پیاوانیان (٨٣)کەس بوون، هی هەردوو کۆچەکە یاخود هی کۆچی دووەم بووبێ.

ئەوەی کە بە پێویستی دەزانم لەبارەی ئەم دوو کۆچەوە قسەی لێ بکەم، چەند شتێکە:

**یەك:** پێغەمبەر ﷺ زۆر دووربین بووە، پاراستنی گیانی هاوەڵانی بەرێزی زۆر لەلا مەبەست بووەو هەوڵی بۆ داوە، وە زۆر لە خەمیاندا بووەو بەئازاری ئەوان زیاتر لە هی خۆی نارەحەت بووە، چونکە ئینسان کە شتێکی بەسەر دێ، دەڵێ ئەوە لەبەر خوا بەسەرم هاتووەو سەبری لەسەر دەگرێ و کەم پێی نارەحەت دەبێ، بەڵام کە شتێك بەسەر کەسێك دێت، کە لە پەنای ئەودایە زۆری پێ نارەحەت دەبێ و دەڵێ ئەوە لەسەر من وایلێهاتوە، لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ، کە پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتەنگ هاوەڵە بەرێزەکانییەوە بووە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

**دوو:** پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتەنگ چارەنووسی ئیسلامەوە بووەو کە بینیویەتی هاوەڵانی ئەشکەنجەو ئازار دەدرێن، لەپێناو پاراستنی گیانیانو مانەوەیان بۆ داهاتووی ئیسلام، فەرمانی کردوە کە هێندێکیان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، ویستوویەتی هێزێکی ئیحتیاتو بنکەیەکی دیکەی مسوڵمانان دروست بکاتو بۆکاتی پێویست لەوێ بەسەلامەتی بمێننو بژین، هەرکاتێکیش فەرمانیان پێ بکرێ بەگەڕانەوە، بگەڕێنەوە.

**سێ:** دیارە پێغەمبەر ﷺ زۆر شارەزاو ئاگاداری بارودۆخی سیاسی دونیاش بووە، چونکە کە دەفەرموێ: بڕۆن بۆ حەبەشە لەوێ پادشایەکی لێیە زوڵم لەکەس ناکات، دیارە شارەزای ئەوێو شارەزای ڕۆمو فارسو میصریش بووە، بەڵام حەبەشەی هەڵبژاردووەو دیاری کردوە، بۆ هاوەڵانی بەڕێزی، چونکە زانیویەتی کە تەنیا لەوێ دەحەوێنەوەو ئەوێ گونجاوە کە کۆچی بۆ بکەن.

**چوار:** پێغەمبەر ﷺ هەر کارێکی کردبێ بە پێی بەرنامە پلانێکی تۆکمەو داڕێژراو بووەو ناردنی هاوەڵانیشی بۆ حەبەشە حیکمەتی زۆری تێدا بووە، کە لەپێناو بەرەوپێش چوونی کارەکەیو سەرکەوتنی بانگەوازو سەلامەتی مسوڵمانانو ڕۆشنترو مسۆگەرتر بوونی ئایندەی ئیسلامو، وەك سوننەتێکیش بۆ ئوممەتو مسوڵمانانی دوای خۆی کە بۆ هەر کارێك پێویستە هۆکارەکەی لە سنووری شەرعدا ڕەچاو بکرێ، بەو کارە هەستاوە.

## سێیەم: هەوڵدانی کافرەکان بۆ گێڕانەوەی کۆچکەرانی حەبەشە بۆ مەککە:

ئەمەش ڕووداوێکی زۆر گرنگ بووە لە مێژووی ئیسلامدا، کە (ابن إسحاق) ئاوا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ[1]:

{فلما رأت قريش ان أصحاب رسول الله ﷺ قد أمِنوا واطمأنوا بأرض الحبشة وأنهم قد أصابوا بها داراً وقراراً، ائتمروا بينهم ان يبعثوا منهم رجلين من قريشٍ إلى النجاشي فيردهم عليهم ليفتنوهم في دينهم ويخرجوهم من دارهم التي اطمئنوا بها وأَمِنوا فيها، فبعثوا (عبدالله بن أبي ربيعة وعمرو بن العاص بن وائل) وجمعوا لهما هدايا للنجاشي ولبطارقته ثم بعثوهما إليه فيهم}، واتە: کافرەکانی

١) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص(١٦٩).

قوڕەیش (کە زۆرو سەرسەختو عینادو دوژمنی پێغەمبەر ﷺ بوون)، کە تەماشایان کرد هەندێك لە هاوەڵانی[1] پێغەمبەر ﷺ لە حەبەشە قەراریان گرتوەو نیشتەجێ بوونو وەزعیان باشە، لەنێو خۆیاندا ڕاوێژو تەگبیر دەکەن، کە دوو پیاوی قسەزانو زیرەك لە قوڕەیشدا بنێرن بۆلای (نەجاشیی) بۆ ئەوەی ئەو مسوڵمانانەی (کە بەقسەی ئەوان) ڕایان کردوە لە چەنگیان، بیانگێڕنەوە بۆ مەککە، تاکو ئەشکەنجەیان بدەنو هەڵیانگێڕنەوە لە دینەکەیان، ئەو دوو پیاوەش کە دەیانێرن: (عبدالله بن أبي ربيعة)و (عمرو بن العاص)دەبن، (کە دوو پیاوی قسەزانو بلیمەتو دیپلۆماسییو جەربەزە بوون، وەك لە بەسەرهاتەکەشیان دەردەکەوێ)، وە کۆمەڵێك دیارییو خەڵاتیش بەواندا بۆ نەجاشییو (بطريق[2])ەکانی دەنێرن، (أم سلمة)[3] دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك کە ئێمە چووین بۆ حەبەشە گوزەرانمان زۆر چاك بوو، نەجاشیی زۆر ڕێزی لێگرتینو زۆر هاوکاری کردین، وەڕێی دینداریمان لێ نەگرتین، دوای ئەوەی ئێمە لەوێ نیشتەجێ بووین، قوڕەیشییەکان ئەو وەفدەیان ناردو دیارییشیان هێنابوو، پێش ئەوەی لەگەڵ نەجاشیدا دابنیشنو قسە بکەن، دیارییەکانیان بەسەر هەموو (بطريق)ەکاندا دابەشکرد، چونکە دوایی نەجاشیی پرسو ڕاوێژیان پێ دەکات، (بۆیە لە سەرەتاوە (بطريق)ەکانیان بەرتیل خوارد کردوون، چونکە ئەوە بەرتیل بوو، بەڵام ئەوان ناویان لێنابوو دیارییو (هدية)، کە

---

١) لە هەندێك شیکردنەوەی مێژووییانەی سیاسییانەدا هاتوە، کە ئەوانەی نێردراون بۆ حەبەشە خەڵکی کەم دەست بوون، بەڵام وانیە، چونکە (عثمان بن عفان)یان لەنێودا بووە لەگەڵ (رقية)ی کچی پێغەمبەر کە خێزانی بووە، وە (عبد الرحمن بن عوف وجعفر بن أبي طالب)یان لەنێودا بوون، وە مەرج نیە تەنیا ئەوەی تێدا ڕەچاو کرابێ، کە سەلامەت بن، بەڵکو ئەوەشی تێدا ڕەچاو کراوە، کە بنکەیەکی دیکەی مسوڵمانان لەوێ دروست بکەن، وە هەموو هێلکەکان لە سەبەتەیەکدا نەبن، ئەگەر کەوتە خوار هێلکەکان هەموو بشکێنو نەمێنن.

٢) بطريق: ناوی پلەیەکە، کە دەدرێ بە زاناو شارەزایانی نەصرانیی.

٣) (أم سلمة) -خوا لێی ڕازی بێ- دواتر کە هاوسەرەکەی دەمرێ، دەبێتە دایکی بڕواداران.

www.alibapir.com

شتی زۆر چاكو نایابو گران قیمەتیان بۆ بردبوون، وە دابەشیان كردن بەسەر ئەوانەدا كە دوایی لە مەجلیسی نەجاشییدا دادەنیشنو نەجاشیی ڕاوێژیان پێ دەكات)، جا كە وەفدی قوڕەیش چووە لای نەجاشیی پێیان گوت: ئێمە كۆمەڵێك گەنجو خەڵكی بێعەقڵمان هەن كە لە دینەكەمان هەڵگەڕاونەوەو نەچوونە نێو هیچ دینێكی دیكەش، تەنانەت نەهاتوونە نێو دینەكەی تۆشەوە، بەڵكو لەخۆوە دینێكی تازەیان داهێناوە، ئێستاش ئەوانە هێندێكیان هاتوون بۆ لای تۆ، بۆیە ئێمە داوات لێدەكەین كە ئەوانەمان تەسلیم بكەیەوە، بۆئەوەی بیانگێڕینەوە لای خۆمانو ئاقڵیان بكەین، نەجاشییش (كە پیاوێكی زۆر ئاقڵو ژیر دەبێ) پێیان دەڵێ: با من بیانبینمو قسەیان لەگەڵدا بكەمو بزانم دەڵێن چی؟ وە دینەكەیان چۆنە؟ ئەوانیش دەڵێن پێویست ناكات بیانبینی، چونكە ئەوان پیاوی مەجلیس نینو خەڵكی نەزانو نەفامن، بەڵام نەجاشیی داكۆكیی لەسەر بینینیان دەكاو دەڵێ هەر دەبێ بیانبینم، (بطريق)ەكانی نەجاشیی دەڵێن: جەنابی پادشا پێویست ناكات بیانبینیو ئەو وەفدە ڕاست دەكەن، بەڵام ئەو بەپێویستی دەزانێ كە بیانبینێو لەدوایان دەنێرێ.

(أم سلمة) -خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت: كە نەجاشیی لەدوای ناردن مسوڵمانەكان ڕاوێژیان كرد كە لەلای نەجاشیی چ بڵێن؟ سەرەنجام هاتنە سەر ئەوە كە خوا چی فەرمووەو پێغەمبەر ﷺ چی فێر كردوونو فەرمانی پێكردوون ئەوە لەگەڵ نەجاشیی بڵێنو بەڕاستیی‌و ساغیی وەڵامی بدەنەوە، كە دەچن نەجاشیی پرسیاریان لێ دەكات، دەڵێ: ئەو دینەی كە پەیداتان كردوە چییە؟! (جعفر بن أبي طالب) (وەڵامێكی زۆر ئاقڵانەی دەداتەوەو بەكورتی باسی ئیسلامی بۆ دەكاتو لە چەند خاڵێكی كەم داو) دەڵێ: ئەی پادشا ئێمە كۆمەڵێك بووین كە لە نەفامییدا ڕۆچووبووین، بتمان دەپەرستو مردارەوەبوومان دەخواردو هەرچی كاری خراپو ناقۆڵایە دەمانكرد، پەیوەندی خزمایەتییمان دەپچڕاند، لە دراوسێیەتییدا خراپ بووین، كێمان بەهێز بووایە بێهێزی هەڵدەلووشی، ئێمە لەسەر ئەو حاڵە خراپە بووین،

تا خوا لەنێو ئێمەدا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین کە ڕەچەڵەکیو ڕاستگۆیی، ئەمینیو پاکیی دەناسین، کە بۆ لای خوا بانگی کردین، کە خوا بەتاك بگرینو تەنیا ئەو بپەرستین، وەئەو بتانەی بابو باپیرانمان دەیانپەرست فڕێیان بدەین، وە فەرمانی پێکردین کە قسەمان ڕاست بێو ئەمانەت پارێز بین، وە پەیوەندی خزمایەتی نەپچڕێنینو لەگەڵ دراوسێماندا باش بین، واز لە گوناهو تاوان بێنین، وەخوێنی یەکتر نەڕێژین، هەروەها کاری دزێوو ناقۆڵای لێ قەدەغە کردین، (أم سلمة) دەڵێ: ئاوا هەرچی (کە تا ئەوکاتە هاتبوونە خوارێ) بۆی باس کرد، لە کۆتاییدا جەعفەر دەڵێ: ئێمەش وەڵامی بانگەوازەکەی ئەومان دایەوەو بەڕاستمان زانیو ئیمانمان پێی هێنا، خوای پەروەردگارمان بەتەنیا پەرستو هاوبەشمان بۆ پەیدا نەکرد، وە ئەوەی کە خوا قەدەغەی کرد، لەخۆمان قەدەغە کردو، ئەوەشی کە خوا حەڵاڵی کردبوو حەڵاڵمان کرد، بەڵام قەومەکەمان ئەشکەنجەو ئازاریان داین، وە زوڵمیان لێکردین، بۆ ئەوەی لە دینەکەمان هەڵمانگێڕنەوەو بمانگێڕنەوە بۆ بت پەرستییو سەر ئەو شتە پیسانەی، کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئێمەی لێ دەرباز کردبوو، دوای ئەوەی کە زوڵمیان لێکردینو چەوساندیانینەوەو وەزعیان لێ وەتەنگ خستینو ڕێگەی دینداریی‌یان لێ گرتین، ئێمە هاتین بۆ وڵاتی تۆ، وەتۆمان بەسەر هەموو پادشاکاندا هەڵبژارد، چونکە بیستوومانە کە زوڵم قبووڵ ناکەیو پیاوێکی باشو دادپەروەری.

نەجاشیی گوتی: لەو قسانەی، کە تۆ دەڵێی ئەو پێغەمبەرەتان لە خواوە بۆی هاتۆتە خوار، هیچت پێیە؟!

جەعفەر دەڵێ: بەڵێ.

نەجاشیی گوتی: بۆم بخوێنە!

(جەعفەر زۆر ژیرو لێزان بووە) چەند ئایەتێکی لە سەرەتای سووڕەتی (مریم)ی بۆ خوێند، کە باسو مەدحی (عیسی)و (زکریا) و(مریم)ی تێدایە.

ئومــمو سەلەمە دەڵێ: کاتێـك، کـە نەجاشـیی ئـەو ئایەتانـەی بیســتن، خۆیشــیو ئەسقەفەکانیشــی هێنــدە گریــان، هــەتا ڕیشــیان تــەڕبوو، کتێبــەکانی بەردەستیشــیان تەڕبوون، ئنجا نەجاشیی گوتی: ئەوەی ئێوە دەیڵێنو ئـەوەی (عیســی) پێـی هــاتوە لەیەك سەرچاوە هاتوون، سوێند بەخوا ئێوە تەسلیمی قوڕەیشییەکان ناکەمــەوەو، مــن نامەوێ چیایەك لە زێڕم هەبێو ئازاری ئێوە بـدەم، بـەڵکو ئێـوە تـا لێـرە بــمێننەوە، ئازادنو لەخۆتان ئـەمین بـن، دوایـی بـە دەوروبەرەکـەی گـوت: کـە ئەوشـتەی وەفـدی قوڕەیش هێنابوویان وەکو دیاریی (هدية) بیاندەنەوە، سەرەنجام بە ڕسـوایی‌و دۆڕاویـی، وەفدی قوڕەیش گەڕایەوە بـۆ مەککـەو، مســولڵمانەکانیش بـە ســەربەرزیی‌و براوەیـی‌و ڕێزەوە لەوێ مانەوە[1].

ئەمــەش هــەوڵێکی دیکــەی نــەزۆکی کــافرانی مەککــە بــوو دژی مســولڵمانانو بانگەوازی ئیسلامیی، کە پەنایان برد بـۆ ڕیشـوەتو درۆو قسـەی هەڵبەسـتراو، بـەڵام سەرەنجام هەقو ڕاستی سەرکەوتو، ئەوانیش شەرمەزار بوون.

## ئــەو ڕووداوەو چــەند پــەندێــك

بەپێویســتی دەزانم دەربــارەی ڕووداوی وتوویــژی نێــوان (جعفــر بــن أبــي طالــب) بەنوێنــەریی ئــەو مســولڵمانانەی کــە لــە حەبەشــە بــوون، لەگــەڵ نەجاشــیی پادشــای حەبەشە، هەڵوەستەیەك بکەم:

### ١) ڕاوێــژکــردن:

یەکەم دەرسو پەند، کە لەم ڕووداوە وەردەگیرێت ئەوەیە، کە ئەو مسولڵمانانە -خوا لێیان ڕازی بێت-، لەنێوان خۆیاندا ڕاوێـژیان کـردوە، چ جـاری یەکـەم کـە نەجاشـیی لەدوای ناردن، وە چ جاری دووەمیش کـە نەجاشـیی پرسـیاری دەربـارەی (عیســی)ی

١) بڕوانە: (السيـرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٦٩-١٧١)، ط١ دار ابن الـهيثم.

کوڕی (مریم) لێکردن، وەك (ابن هشام) هێناویەتی: {فلما جاءهم رسوله اجتمعوا ثم قال بعضهم لبعضٍ، ما نقول للرجل}[١] دوای ئەوە نوێنەری نەجاشی هات بۆ لایان، هەندێکیان بەهەندێکیان گوت چی بەو پیاوە بڵێین‌و چی وەڵام بدەینەوە؟، هەروەها بۆ جاری دووەم کە دەربارەی (عیسى) لێیان دەپرسێ؟ دەڵێ: {فاجتمع القوم ثم قال بعضهم لبعض ماذا تقولون؟!...}[٢] کەواتە: پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەرەتاوە هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی لەسەر ئیش‌وکار بە ڕاوێژ کردن، پەروەردە کردوە‌و ڕاهێناوە.

## ٢) مەبدەئیی بوون:

لەو گفتوگۆیە ئەوە وەردەگیرێت، کە ئەو هاوەڵە بەڕێزانە، چەندە مەبدەئیی بوون، واتە: پابەندیی بەو پرانسیپ‌و بنچینانەی، کە لەسەریان بوون‌و پابەندیی بە شەریعەتەوە، ئەوەش لەو هەڵویستانەدا دەردەکەوێت، کە دوای ڕاوێژکردنیان لە جاری یەکەمدا، کە نەجاشیی لەدوایان دەنێرێ، دەڵێن: {نقول والله ما علمنا وما أمرنا به نبينا كائناً في ذلك ما هو كائن}[٣]، واتە: وەڵلاهی هەر ئەوە دەڵێین، کە دەیزانین، وە پێغەمبەرمان ﷺ فەرمانی پێکردووین، جا چی لەسەر ئەوە دەقەومێ بابقەومێ، بۆ جاری دووەمیش کە (عَمرو بن العاص) دەڵێ: تەڵەیەکم بۆ داناون، کە سەریان بەفەتارەت دەبا: بە نەجاشییم گوتوە: کە ئەوان -مسوڵمانەکان- دەڵێن (عیسى) بەندەی خوایە، وە نەصرانییەکانیش (عیسى) بە پەرستراو (إلـه) دەزانن! مسوڵمانەکان لەجاری دووەمیشدا گوتیان: {نقول والله ما قال الله وما جاءنا به نبينا كائناً في ذلك ما هو كائن}[٤]، واتە: سوێند بە خوا هەر ئەوە دەڵێین، کە خوا فەرموویەتی‌و پێغەمبەرمان ﷺ بۆی هێناوین‌و فێری کردووین، جا هەرچی

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٧٠).
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٧١).
٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٧٠).
٤) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٧١).

www.alibapir.com

دەقەومێ با بقەومێ! کەواتە: ئینسانی مسوڵمانو کۆمەڵی مسوڵمانان دەبێ پابەند بن بە شەریعەتو بەرنامەی خواوەو لێی لانەدەنو حەق بڵێن، با لەسەر ئەو حەق گوتنە هەرچی بەسەریان دێ بەسەریان بێ، چونکە لەوکاتو شوێنەدا کە پێویستە ئایینو مەبدەئی خۆت دەربخەی، ئەگەر شاردتەوەو پەنهانت کرد، خەڵك سەری لێ دەشێوێو نازانێ تۆ چیو چیت پێیەو چیت دەوێ.؟!

## ٣) قسەی پوختو ڕوونو گشتگیر:

دەرسو پەندی سێیەم ئەوەیە کاتێك، کە ئینسان قسە بۆ خەڵك دەکات، بەتایبەتی لە شوێنی گرنگدا، لای پادشاو خەڵکی دەسەڵاتدار، کە کاریان زۆرەو کاتیان کەمە، پێویستە بە کورتییو پوختییو بە ڕوونیی قسە بکات.

با تەماشا بکەین (جعفر بن أبي طالب) – خوا لێی ڕازی بێت-، چەند بە پوختییو بە ڕوونیی قسەی کردوە، کە سەرجەم قسەکانی لە سێ تەوەراندا بوون، بەشێوەیەك کە لە تەوەرەی یەکەمدا باسی وەزعی پێشوویانی کردوە لە سایەی جاهیلییەتدا، وە لە تەوەرەی دووەمدا باسی پێغەمبەری کردوە ﷺ، کە (محمد) کێیە؟ وە بۆچی ئیمانیان پێ هێناوە؟! وە لە تەوەرەی سێیەمو کۆتاییدا پێناسەی ئیسلامی کردوەو هەر سێ تەوەرەکەی زۆر بە پوختییو بە ڕوونیی باس کردوونو نەچووە بە شتی لاوەکییو لقو پۆپاندا بچێتە خوارو درێژەی پێ بدات، وە واز لە ئەسڵو بنچینەو شتە گرنگەکان بێنێ.

<u>**تەوەری یەکەم:**</u> دەربارەی وەزعی پێشوویان ئاوای گوتوە[١]:

{كنا قوماً أهل جاهليةٍ: نعبد الأصنام، نأكل الميتة، نأتي الفواحش، نقطع الأرحام، نُسيء الجوار، يأكل القويُّ مِنَّا الضعيف}، واتە: ئێمە خەڵکی سەردەمی نەفامیی بووین:

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص١٧٠.

١/ بت و صەنەمــمان دەپەرست.

٢/ مردارەوەبوومان دەخوارد.

٣/ كاری ناقۆڵامان دەكرد.

٤/ پەیوەندی خزمایەتییمان دەپچڕاند.

٥/ لە دراوسێیەتییدا خراپ بووین.

٦/ ئەوەمان كە بەهێز بوو ئەوەی دەخوارد كە بێهێز بوو.

لێرەدا بەشێوەیەكی زۆر پوخت چەند دیمەنێكی زینـدووی سـەردەمی نـەفامیی خستۆتە بەرچاوی نەجاشیی.

**تەوەرەی دووەم:** لە باسی پێغەمبەردا ﷺ زۆر بەڕوونیی‌و بەكورتیـی‌و پوختیی دەڵـێ: {حتى بعث الله إلينا رسولاً مِنّا: نَعرِف نَسَبه، وصدقه، وأمانته وعفافه، فدعانا إلى الله}[1]، واتە: هەتا خوا (جل شأنه) پێغەمبەرێكی بۆ ڕەوانەكردین لەخۆمان:

١) ڕەچەڵەكی دەناسین.

٢) ڕاستگۆیی دەناسین.

٣) داوێن پاكیی‌و چاكیی دەناسین.

٤) دەست پاكیی دەناسین.

٥) وە بانگی كردین بۆ لای خوا.

ئاوا زۆر بە پوختییش پێناسەی پێغەمبەر ﷺ دەكا.

**تەوەرەی سێیەم:** ئنجا دێتە سـەر پێناسـەی ئیسـلام، كـە ئیسـلام لـە چەند خاڵێكی كورت‌و پوخت‌و جەوهەرییدا پێناسە دەكات‌و دەڵێت:

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٧٠.

{فدعانا إلى الله لنوحده ونعبده، ونخلع ما كنا نعبد نحن وآباؤنا من الحجارة والأوثان، وأمرنا بصدق الحديث، وأداء الأمانة، وصلة الرحم، وحق الجوار، والكف عن المحارم والدماء، ونهانا عن الفواحش وقول الزور، وأكل مال اليتيم، وقذف المحصنات}[1].

لە سەرەتاوە لە سێ خاڵی سەرەکیدا باسی ئەسڵو بناغەی ئیسلامەتیی دەکاتو دەڵێ:

١- ئێمەی بانگ کرد بۆ ئەوەی خوا بەیەك بزانینو هاوبەشو هاوەڵی بۆ دانەنێین.

٢- وە بیپەرستینو تەنیا بەندایەتیی بۆ ئەو بکەین.

٣- وە ئەوەی کە بابو باپیرانمانو خۆمان لە ڕابردوودا لە بتو صەنەم پەرستوومانن، وازیان لێ بێنین.

وە فەرمانی پێ کردووین بە:

٤- ڕاست گۆیی.

٥- ئەمانەت پارێزیی.

٦- گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی.

٧- جێبەجێکردنی حەقی دراوسێ.

٨- دەست هەڵگرتن لە گوناحو تاوان.

٩- دەست هەڵگرتن لە خوێن ڕێژییو زوڵم.

١٠- شتی ناقۆڵای لێ قەدەغە کردین.

١١- قسەی درۆی لێ قەدەغە کردین.

١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

١٢- خواردنی ماڵی هەتیوی لێ قەدەغە کردین.

١٣- بوختان کردن بەئافرەتانی پاکی لێ قەدەغە کردین.

وە دواتریش مەبەستی وەفدی قورەیشی بۆ نەجاشیی بە کورتیی ڕوونکردۆتەوە، کە ئەوانە دەیانەوێ بمانگێڕنەوە سەر دینی خۆیانو نایانەوێ کۆمەڵگاکەیان ئازادو خاوێن بێ.

کەواتە: ئێمەش دەبێ فێرببینو دەرسو پەند وەربگرین کاتێك، کە قسە دەکەین بۆ خەڵك، پێویستە ئەو حاڵو مەقامە ڕەچاو بکەین، کە قسەی تێدا دەکەین، کە چ قسەیەك دەخوازێ! وە بە ڕوونییو کورتییو پوختیی قسە بکەین.

## ٤) حیکمەتو دانایی (جعفر) -خوا لێی ڕازی بێ-:

با تەماشا بکەین!

لە سێ شتاندا بۆمان دەردەکەوێت کە (جعفر) -خوا لێی ڕازی بێ- زۆر شارەزاو دانا بووە، لەکاتێکدا کە نەجاشیی داوای لێ دەکاتو دەڵێ: هەندێك لەو قورئانەم بۆ بخوێنە کە پێغەمبەرەکەتان دەڵێ لەلایەن خواوە بۆم هاتوە؟! (جعفر) لە وەڵامدا سەرەتای سوورەتی (مریم)ی بۆ دەخوێنێت، کە لە سەرەتای سوورەتی (مریم)دا دوای ئەوەی باسی بەسەرهاتی (زکریا)و (یحیا) دەکات، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾﴾.

ئاوا باسی (مریم) دەکات، کە پەردەیەکی گرتەوە لە ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنەی، کە قەومەکەی لێی نیشتەجێ بوون (بۆ ئەوەی کە خۆی بشوا) ئنجا دەفەرموێ: ئێمە ڕووحی خۆمان (کە -جبریل-ە) ناردمان بۆ لایو بۆی چۆ سەر شکڵی پیاوێکی

تەواو، مەریەمیش گوتی: ئەگەر تۆ پارێزکاری مـن پـەنات لـێ بـەخوای بە بـەزەیی دەگرم، ئەویش گوتی: من نێـردراوی پـەروەردگارتم بـۆلای تـۆ، بـۆ ئـەوەی منـداڵێکی چـاکت پـێ ببەخشـم...تا دوایـی (عیسـی)ی دەکەوێتـە سـك بەفـەرمانی خـوای پەروەردگار، وە پاشان (عیسی)ی دەبێت، دیـارە خوێنـدنی ئـەم ئایەتانـە زۆر سـەرنجی نەجاشییو ئەو زانا ئاینیانەی کە لەدەوری نەجاشیی بوون، ڕاکێشاوە.

سەرنج بدەن!

یەکەمجارەو ئایەتێکی وای بۆ نەخوێندنەوە کە سوودی لـێ نـەبینن‌و پێـی تـووڕەبن، وەك ئایـــەتی: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ... ﴿٧٢﴾ ﴾ الـمائدة، واتـە: بێگومان کافرن ئەوانەی کە دەڵێن: خوا بریتیە لـە مەسـیحی کوڕی مەریەم، یان: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ... ﴿٧٣﴾ ﴾ الـمائدة، واتە: وە بێگومان کـافرن ئەوکەسـانەی دەڵـێن: خـوا یەکێکـە لـە سـێیەکان، یاخود نەچووە ئەو ئایەتەیان بۆ بخوێنـێ، کـە دەفـەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذْنَا مِيثَٰقَهُمْ فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ الـمائدة، واتـە: ئەوانـەی کـە گوتیـان: ئێمـە نەصرانییـن پەیمانـمان لـێ وەرگرتن، بەڵام بەشێك لەوەی کە ئامۆژگاری پێکرا بوون فەرامۆشیان کرد، ئێمەش دوژمنایەتی‌و کینـەمان لـەنێودا پەیـداکردن تـا ڕۆژی قیامـەت، وە خـوا لەڕۆژی دواییدا هەواڵیان پێ دەدات بەو کردەوە خراپانەی کە دەیانکرد.

چونکە ئەگەر هەرکامێك لەو سێ ئایەتەی بـۆ خوێندبانـەوە بەتەئکیـد سـەرو دڵـی دەگرتن، بەڵام شوێنێکی بۆ خوێندنەوە کە هەم هەقیش بوو، وە ئەوانیش پێیـان خـۆش

بوو ئەگەر نا هەقی دیکەش هەیە، بەڵام ئەوان پێیان ناخۆش دەبوو، هەروەها لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەشدا، کە نەجاشیی دەڵێ: لەبارەی (عیسی)وە چ دەڵێن؟

دانایی‌و لێزانیی (جعفر)مان بۆ دەردەکەوێ، کە دەڵێ[1]: {نقول: الذي جاءنا به نبينا هو عبدالله ورسوله وروحه وكلمته ألْقاها إلى مريم العذراء البتول}، واتە: ئێمە دەربارەی عیسا ئەوە دەڵێین، کە پێغەمبەرمان ﷺ بۆی هێناوین، کە بەندەی خوایەو ڕەوانەکراوی خوایەو ڕووحی خوایەو وشەی خوای پەروەردگارە خستوویەتە نێو منداڵدانی (مریم)ەوە، کە ئەویش کچێکی پاك داوێن بووە.

دیارە جوولەکەکان بوختان بە مەریەم دەکەنو دەڵێن: عیسا زۆڵە، بەڵام خوای پەروەردگار لێرەدا ئەو بوختانەی جوولەکەکان بەدرۆ دەخاتەوەو پاکیی‌و پلەوپایەی مەریەمیش باس دەکات، ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە، کە جەعفەر چەند وشەیەکی وا دەڵێ کە هەق بن، وە ئەوانیش دڵیان پێ خۆش بێت.

دیسان حیکمەت‌و دانایی جەعفەر لە شوێنێکی دی دەردەکەوێ، ئەویش لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە نەجاشیی لێی دەکات، کە بەو شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: {خرجنا إلى بلادك واخترناك على من سواك ورغبنا في جوارك ورجونا ان لا نُظْلَمَ عندك أيها الملك}[2]، واتە: ئەی پادشا! ئێمە هاتین بۆ، وڵاتی تۆ، وە تۆمان هەڵبژارد بەسەر هەموو پادشاکانی دیکەدا وە پێمان خۆش بوو لەتۆ نزیك بین وە ئومێدمان وابوو، کە لەلای تۆ زوڵممان لێ نەکرێ، وەك دەبینین چەند قسەیەکی جوانو ڕێكو پێكو سەرنج ڕاکێشو هەست بزوێن دەکات، بۆیە نەجاشییش کەوتۆتە ژێر کاریگەریی قسەکانییەوە.

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٧١)، ط١، دار ابن الهيثم.
٢) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص(١٧٠).

**چوارەم: مسوڵمانبوونی (عمر بن الخطاب) -خوا لێی ڕازی بێ-:-**

(السيوطي) لە کتێبی (تأريخ الخلفاء)دا هێناویەتی کە، دەڵێ: عومەر لە مانگی (ذي الحجة) ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی مسوڵمان بوو، کە ئەوکاتە تەمەنی (٢٧) ساڵ بوو[١]، چۆنیەتی مسوڵمانبوونەکەشی ئاوا بوو[٢]:

ئافرەتێك بەناوی (أم عبدالله) کچی (أبي حثمة) بۆمان دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئێمە کاتێك بەتەمای کۆچو بار بووین بەرەو حەبەشە، (عامر)ی هاوسەرم چووبوو بۆ هەندێك ئیشو کار، عومەر هات، لەسەرمان ڕاوەستا -کە ئەوکات هەر کافر بوو- گوتی: ئەی (أم عبدالله) ئەوە دیارە سەفەر دەکەنو دەڕۆن؟

منیش گوتم: بەڵێ سەفەرەو دەڕۆینو ئەو وڵاتەتان بۆ بەجێ دێڵین، زۆرتان زوڵم لێ کردینو زۆر ئەزیەتتان داین، بەسەر زەمینی خوادا دەڕۆین، بەڵکو خوای پەروەردگار دەرووێکمان لێ بکاتەوە.

(أم عبدالله) دەڵێ: عومەر گوتی: (صَحِبَكُم الله) خوا لەگەڵتان بێ.

(أم عبدالله) دەڵێ: نەرمییەکم بە عومەرەوە بینی، کە قەت ئەو نەرمییەم پێوە نەبینیبوو، وە هەستم کرد زۆر خەفەتی خواردو پێی ناڕەحەت بوو، کە ئێمەی ئاوا بینی.

(أم عبدالله) دەڵێ: دوایی کە هاوسەرەکەم (أبو عبدالله) هاتەوە پێم گوت: ئەگەر عومەرت دەبینی، کە چەند نەرمو بەڕەحم بوو و چەندە بۆمان بەپەرۆش بوو!

ئەویش گوتی: بۆ بەتەمای مسوڵمان بێ؟

منیش گوتم: بەڵێ ئومێدم وایە مسوڵمان بێ.

---

١) بڕوانە: لاپەڕە (١٣٧).

٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج١، ص(١٧٤-١٧٨).

ئەویش گوتی: بەخوا مسوڵمان نابێ تاکو گوێ درێژەکەی ماڵی (خطاب) مسـوڵمان نەبێ، دیـارە (أبو عبدالله) زۆر لێی نائومێد دەبێ، چـونکە عومـەر -خـوا لێـی ڕازی بێ- لە سەردەمی جاهیلییدا زۆر توند بووە، وەك چۆن لە سەردەمی ئیسلامیشـدا زۆر بە جیددیی مسوڵمانێتی گرتوە.

چۆنیەتی موسڵمانبوونەکەشی، وەك (ابن هشام) بۆمـان دەگێڕێتـەوە، بـەم شـێوەیە بووە، کە من لێرەدا بە کورتی تەنها پوختەکەیتان بۆ باس دەکەم:

عومـەر -خوا لێی ڕازی بێ- خوشکێکی هـەبوو بـەناوی (فاطمـة)و هاوسەرەکەشـی بەناوی (سعید بن زيد) لە عەشیـرەتی (بني عدي) بووەو هەردووکیان مسوڵمان بـوون، وە (فاطمـــة)ی خوشـــکی عومـــەر کەســـایەتییەکی زۆر بـــەهێزی هـــەبوو، دوای مسوڵمانبوونی کاریگەریی لەسەر هاوسەرەکەی دانابوو ئەویش دوایی مسـوڵمان بـوو، بـەڵام هـەردووکیان (فاطمـة و سـعید) مسـوڵمانێتی خۆیـان لـە عومـەر شـاردۆتەوە، چـونکە لێـی ترسـاون (خبـاب بـن الأرت)یش چۆتە ماڵیـانو قورئـانی بـە (فاطمـة)و هاوسەرەکەی گوتوە، کابرایەکی دیکەش، کە لە (بني عدي) بووە بـە نـاوی (نُعَـيْم بـن عبدالله) مسوڵمان بووبوو، بەڵام مسوڵمانەتییەکەی خۆی پەنهان کردبوو، قەومەکەشـی پێیان نەزانی بوو، ڕۆژێك کە دەبینێ عومەر شـمشێرەکەی لە کالانـێ دەرهێنـاوەو بـە پەلە دەڕوا، (نعيم بن عبدالله) کە خزمی عومەرە، دەڵێ: عومەر ئەوە بۆ کوێ؟

عومـــەریش دەڵـــێ: دەچـم ئـەو کابرایـە بکـوژم، کـە لـە دینـی بـابو بـاپیران هەڵگەڕاوەتـــەوە، وە جیـــاوازیی خســـتۆتە نێـــو کاروبـــاری قورەیشـــەوەو قســـە بـــە پەرستراوەکانیان دەڵێو بە نەفام لە قەڵەمیان دەداو سووکیی پاڵدەداتە لای دینەکەیان!

(نُعَيْم) دەڵـێ: تۆ ئەگەر ئەوە بکەی پێت وایـە دوایـی بـەنی هاشـم وازت لێبـێنن ئاوا بە سەلامەتی بژی؟! دیارە ویسـتوویەتی لـە سـەرەتاوە عومـەر لـەکۆڵ پێغەمبـەر ﷺ بکاتەوە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، کە پیاوێکی ژیرو حەکیم بـووە، ئیـدی پێـی دەڵێ: تۆ بڕۆ چارەسـەری ماڵی خۆت بکە !

عومەر دەڵێ: بۆچی؟ماڵی خۆم چیەتی؟!

ئەویش دەڵێ: (فاطمة)ی خوشکتو سەعیدی زاوات مسوڵمان بوونو هەر ئاگاشت لێ نیە؟!

عومەر کە ئەوە دەبیستێ، یەکسەر دەچێتە ماڵیانو، کە نزیك ماڵێ دەکەوێتەوە دەنگێك دێتە بەر گوێی، دەزانێ شتێك دەخوێننەوە، ئەوانیش کە دەزانن عومەرە خەبباب خۆی دەشارێتەوە، عومەر کە دەچێتە ژوورێ دەڵێ: ئەوە چی بوو ئەو دەنگە دەنگە تان دەهات؟!

ئەوانیش دەڵێن؟ هیچ نەبوو.

دەڵێ: نا پێم بڵێن چی بوو؟!

دیارە (فاطمة) ئەو پەڕەی قورئانەکەی تێدا نووسرابوو، دەیخاتە بن باڵی خۆیو دەیشارێتەوە.

عومەر دەڵێ: بیستوومە ئێوەش مسوڵمان بوون، ئیدی لە سەعیدی زاوای دەدا، (فاطمة)ش دەچێ لەسەر مێردەکەی بکاتەوە، بەڵام عومەر لەویش دەدات.

دوایی خوشکەکەی دەڵێت: بەڵێ ئێمە مسوڵمان بووینو چیشت لە دەست دێ بیکە!! کە عومەر تەماشا دەکا خوشکەکەی خوێنی پێدا دێتو زاواکەشی بەهەمان شێوە، سەری سوڕدەمێنێ کە ئەو ئیسلامەی (فاطمة) باوەڕی پێهێناوە، هێندە بەهێزبێو وا لەگەڵ دەروونیی تێکەڵ بووبێ، خۆی بە قوربان بکاتو عەقیدەیەکی ئەوەندە بەهێزی بۆ دروست بکات!.

دواتر دەڵێ: باشە ئەو شتەی کە دەتانخوێند با تەماشای بکەم ؟

(فاطمة) دەڵێ: ئاخر تۆ پیسیو قورئانیش نابێ ئینسانی پیس بیخوێنێتەوە، بچۆ خۆت بشۆ.

عومەر دەچێ خۆی دەشواو دێتەوە دەڵێ: دە وێم بدەن با بزانم موحەممەد چی هێناوە؟

دیارە ئەو شوێنەی، کە ئەوکاتە خەبباب پێیان دەڵێ: سەرەتای سوورەتی (طـه) دەبێ، کە دەفەرموێ: ﴿طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾﴾، (عومەر) دەڵێ: (انه لقول مبارك) ئەو قسەیە قسەیەکی زۆر بەرزو پیرۆزە، پێم بڵێن موحەممەد لە کوێیە؟! دەڵێن: بۆچی؟

دەڵێ: دەمەوێ مسوڵمان بم!!

خەببابی کوڕی ئەڕەتیش، کە ئەوە دەبیستێت لەو شوێنەی، کە خۆی لێ پەنهان کردبوو دێتەدەرێو (الله اكبر) دەکاتو، دەڵێ: ئەی عومەر! ئومێد دەکەم تۆ موژدەی پێغەمبەرت ﷺ بەسەردا بچەسپێ، کە دوێنێ دووعای کردو فەرمووی: **{أللّهم أيدّ الإسلام بأبي الحكم بن هشام، أو بعمر بن الخطاب}**، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی خوایە ئیسلام بەهێز بکەی بە (أبي الحكم) یان (عمر بن الخطاب)[1]، دیارە (أبو الحكم) کونیەی (أبو جهل)ە.

عومەر دەڵێ: دەی کوا موحەممەد لەکوێیە؟!

ئەویش پێی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە خانووی: (ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەمە) لای (صفا).

---

١) **{عن ابن عمر قال: قال رسول الله ﷺ اللّهم اعز الاسلام بأحب الرّجلين اليك: عمر بن الخطاب أو بأبي جهل بن هشام}** رواه الترمذي، واتە: ئەی خوایە! کام لەو دوو پیاوەت لەلا خۆشەویستترە ئیسلامی پێ بەهێز بکە: بە عومەری کوڕی خەتتاب، یان ئەبوو جەهلی کوڕی هیشام.

www.alibapir.com

عومەر دەچێت نزیك دەبێتەوە، مسوڵمانەكان لە كەلێنی دەرگاوە تەماشا دەكەن دەڵێن: ئەوە عومەرە هاتو شمشێرەكەشی بەدەستەوەیە.

حەمزەش لەوێ دەبێ، دەڵێ: لێی گەڕێن بابێت ئەگەر خێرێكی پێوەبێ زۆر چاكە، ئەگەر خێریشی پێوە نەبێ، بە شمشێرەكەی خۆی دەیكوژین، كە دێت دەرگای لێ دەكەنەوە، پێغەمبەر ﷺ یەخەی دەگرێتو پێی دەڵێ: ها كوڕی خەتتاب بۆچی هاتووی؟ كاتی ئەوە نەهاتوە مسوڵمان بی؟ لەوە ناترسی، كە خوا هەورە تریشقەیەكت بۆ بنێرێتە خوار، یاخود ئایەتێكت لەسەر بنێرێتە خوار، وەك ئەبوو جەهلو ئەو زلە زلانەی دی؟!

عومەر دەڵێ: با ئەی پێغەمبەری خوا، من هاتووم مسوڵمان بم، ئیدی یەكسەر شایەتمانی هەق دێنێو پێغەمبەر ﷺ (الله أكبر) دەكاو، مسوڵمانەكانیش (الله أكبر)ێكی بەرز دەكەن، كافرەكان لەو سەری مەككە گوێیان لێ دەبێو دەڵێن: دیارە شتێك قەوماوە؟!

بەم شێوەیە عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- مسوڵمان دەبێ، (عبدالله بن عمر) لە باببیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: كە عومەر مسوڵمان بوو، گوتی: كێ لەنێو قوڕەیشییەكاندا قسان بە خێرایی بڵاودەكاتەوە؟!

گوتیان: (جمیل بن معمر الجمحي) هەرچییەكی بكەوێتە بەرزاری بڵاوی دەكاتەوە، ئینجا عومەر -خوا لێی رازی بێ- چوو بۆلایو گوتی: فلان كەس دەزانی مسوڵمان بووم، یەكسەر (جمیل) عەباكەی خۆی راكێشاو هاواری كردو گوتی: عومەر لە دین هەڵگەڕاوەتەوە، عومەریش گوتی: نەخێر درۆ دەكەی بەڵكو مسوڵمان بوومو چوومە نێو دینی حەقەوە، ئنجا هێندەی پێ نەچوو كافرەكانو زلەزلەكانی قوڕەیش بۆی هاتنو، ئەوانو عومەر لێكیاندا تا دەوروبەری نیوەڕۆیە، ئنجا عومەر ماندوو بوو، دانیشتو گوتی: هەرچی دەكەن بیكەن، بەڵام وەڵڵاهی ئەگەر (٣٠٠) كەس دەبووین یان دەرمان دەكردن، یان دەرتان دەكردین.

ئنجا یەکێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان هاتو گوتی: ئەوە بەتەمان بیکوژن؟ ئیشی وا نەکەن، چونکە دوایی (بني عدي) لێتان خۆش نابن!

گوتیان: ئاخر هەڵگەڕاوەتەوە.

گوتی: دیارە بۆخۆی دینێکی دیکەی بە دڵە لێی گەڕێن، ئەوانیش وازیان لێهێنا، ئەو پیاوەش (العاص بن وائل السَّهمي) بووە.

یەکی دیکە لە هەڵوێستەکانی عومەر -خوا لێی ڕازی بێت- کە لە هەرکام لە (حلیة الأولیاء)[1] وە (صفة الصفوة)[2]دا هاتوە، ئەوەیە کە دەڵێن: دوای ئەوەی عومەر مسوڵمان بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا ئەگەر ئێستا بژین یان بمرین لەسەر حەق نین؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{بلى والّذي نفسي بيده إنكم على الحق إنْ مِتمْ وانْ حَييتُمْ}**، واتە: با سوێند بەو زاتەی، کە نەفسی منی بەدەستە، ئێوە لەسەر حەقن ئەگەر بمرن یان بژین.

عومەر گوتی: ئەدی بۆچی خۆ دەشارینەوە؟! سوێند بەوەی، کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە دەبێ بڕۆینە دەرێ، ئنجا عومەر لە ڕیزێکەوەو حەمزەش لە ڕیزێکی دیکەوەو مسوڵمانان بە دوو ڕیز لە خانووی ئەرقەمەوە بەڕێکەوتن، کە ئەوە یەکەم خۆپیشاندانی مسوڵمانان بووە، دەڕۆیشتنو زۆر بەتوندی پێیان لە زەوی دەدا تا خۆڵی بن پێیان وەك ئارد ورد دەبوو، ڕۆیشتن تا گەیشتنە (کابە)، کە موشریکەکان مسوڵمانانیان بینیو زانییان عومەرو حەمزەیان لە پێشەوەن، زۆر نارەحەت بوون بە ئەندازەیەك کە قەت نارەحەتیی وایان نەبینی بوو، لەو ڕۆژەوەش پێغەمبەر ﷺ ناوی لە عومەر نا (الفاروق) یانی: لەیەك جیاکەرەوەی هەقو ناهەق.

---

١) حلية الاولياء، لـ(إبراهيم اصفهاني) .
٢) صفة الصفوة لـ(إبن الجوزي) .

## پێنجەم : دەنگ لێوەرگرتن‌و دابڕینی سیاسیی‌و كۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و نووسینی پەیماننامەیەكی زاڵمانە:-

یەكی دیكە لەو ڕووداوانە ئەوەیە، كە لە كتێبەكانی (سیرە)دا بە (المقاطعة) هاتوە، واتە: (دەنگ لێوەرگرتن) جا لە هەندێك لە كتێبە هاوچەرخەكاندا بە (المقاطعة الإقتصادية) هاتوە، بەڵام لە ڕاستییدا هەر ئابووریی نەبووە، بەڵكو هەموو لایەنەكانی گرتوونەوە: سیاسی، ئابووریی كۆمەڵایەتیی، وە موشریكەكانی مەككە بە هەموو شێوەیەك پەیوەندییان لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵە بەڕێزەكانی‌و هەركەسێكی دیكەش كە لەگەڵیان بووە لە (بني هاشم)، پچڕاندوە، دیارە ئەوەش ڕووداوێكی گرنگ بووە لە مێژووی مسوڵمانانداو، هەرچەندە مسوڵمانان زۆر تێیدا نارەحەت بوون، بەڵام هۆكارێكی گەورەش بوو بۆ گەشەكردنی ئیسلام‌و دەرخستنی ڕاستێتی ئیسلام بۆ خەڵكی دیكە، چونكە لەو ڕووداوە ئەوە دەردەكەوێ كە مسوڵمانەكان خەڵكێكی مەبدەئیی‌و چەسپاون‌و هەموو شتێك لەپێناو دینەكەیاندا لە خۆیان دەگرن‌و ئازارو هیجرەت‌و مەینەتیی‌و برسیەتی‌و دەنگ لێدابڕان لە لایەن موشریكەكان‌و هەموو شتێكی دیكەش لەپێناو سەرخستنی دیەنەكەیاندا لەبەرچاو دەگرن‌و ڕەزامەندیی خوایان لە سەرووی هەموو شتێكەوە داناوە.

(ابن هشام) دەربارەی ئەو دەنگ لێوەرگرتنە گشتگیرەی قورەیش دەڵێ: (فلما رأت قريش أن أصحاب رسول لله ﷺ قد نزلوا بلداً أصابوا أمناً وقراراً وأن النجاشي قد منع من لجأ اليه منهم، وان عمر قد أسلم فكان هو وحمزة بن عبدالمطلب مع رسول الله ﷺ وأصحابه وجعل الاسلام يفشو في القبائل: اجتمعوا وأتمروا ان يكتبوا كتاباً يتعاقدون فيه على بنيٍ هاشم وبني المطلب، على ان لا ينكحوا اليهم ولا ينكحوهم ولا يبيعوهم شيئا ولا يبتاعوا منهم، فلما اجتمعوا لذلك كتبوه فيٍ صحيفةٍ ثم تعاهدوا وتواثقوا على ذلك، ثم علقوا الصحيفة في جوف الكعبة توكيداً على أنفسهم... فلما فعلت ذلك قريش انحازت بنو هاشم وبنو المطلب الى أبي

طالب بن عبدالـمطلب فَدَخلوا معه فـي شعبهِ واجتمعوا اليه، وخـرج مـن بـني هاشـم ابولـهب عبـد العُزّى بـن عبدالـمطلب الى قـريش فظـاهرههم)[١]، واتـه: کاتێـك کـه قورەیشییەکان بینییان لـە لایەکـەوە پێغەمبـەرو ﷺ هـاوەڵانی بـەرێزی بـەردەوام‌و نەلەخشـاو دامـەزراون لەسـەر کـاری خۆیـان، وە لـە لایـەکی دیکـەوە هەنـدێك لـە مسوڵمانان کۆچیان کردوە بۆ حەبەشەو نیشتەجێ بوون، وە نەجاشیی پێشـوازییەکی باشی لێکردوون، وە ئەو پیلانەی کە قورەیشییەکان دایاننابوو پوچەڵ بۆوە (ئەوە کە بە دیاریی‌و خەڵات نەجاشیی ڕازی بکەن، بەوەی کە مسوڵمانەکان تەسلیم بکاتـەوە) وە لە لایەکی دیکەوە دوو پاڵەوانی وەکو عومەرو حەمزە مسوڵمان بوون، وە ئیسـلام ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەچێتە نێو دڵ‌و دەروونی خەڵکەوە.

قورەیشییەکان بیـریان کردەوە لە چارەسەرێك‌و بۆ ئـەم مەبەسـتەش لـەنێو خۆیانـدا ڕێککـەوتن‌و پەیماننامـەیەکیان نووسی دژی تیـرەی (بنو هاشم)و (بنو عبدالـمطلب)، وە پەیـماننامـەکە بریتی لەوە کە:

دەبێ ئافرەتیان نەدەنێ وە ئافرەتیان لـێ نەهێنن، وە شتیان لـێ نـەکڕن‌و شتیشـیان پێ نەفرۆشن، ﴿جا هەرچەندە (إبن هشام) لێرە تەنیا ئاماژەی بـەو دوو لایەنـە کـردوە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا وەك دەردەکـەوێ، دەنـگ لێوەرگرتنەکـە گشتگیـر بـووەو هـەموو لایەنەکانی ژیانی گرتۆتەوە، کە بەم شێوەیەش ویستوویانە زیـاتر کاریگـەریی خـراپ لەسەر پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانانی دیکە دابنێن﴾.

دوایی لەسەر ئەو پەیـماننامـەیە ڕێککـەوتن‌و لـە لاپەڕەیەکـدا نووسـییان کـە پێـی دەگوترا (صحیفة)و پەیـمانیان لەسەرداو سوێندیان لەسەر خـواردو دوایـی لـەنێو کابـەدا هەڵیانواسی، بۆ زیادە جەخت لەسەر کردنەوە، جا کاتێك کـە قـورەیش وایـانکرد (بنـو هاشـم)و (بنـو عبدالـمطلب) (واتـە: هـەموو خزمـەکانی پێغەمبـەر ﷺ بـە کـافرو

---

١) (السيـرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(١٨١)، ط١، دار ابن الـهيثم.

مسوڵمانەوە) لەوان جیابوونەوەو چوونە شیوەکانی (أبو طالب) جگە لە (أبو لهب) (عبدالعُزّى بن عبدالمطلب) کە لەگەڵ قورەیش مایەوەو پشتگیریی ئەوانی کرد.

شایانی باسیشە ئەو دەنگ لێوەرگرتنو دابڕانە، کە (٣) سێ ساڵانی خایاندوە، کارێکی بەزەحمەتو ڕووداوێکی قورس بووە بۆ پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانەکان ئەوانەش، کە بەهۆی خزمایەتیو عەشیرەتەوە لەگەڵیان بوون.

هەڵبەتە ئەوەش هەوڵێکی دیکەی کافرەکانی مەککە بوو، بۆ دروستکردنی بەربەستو پەرچ لە ڕێی بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، کە ڕۆژانە مسوڵمانان بەو هۆیەوە تووشی نەخۆشیو مردن دەبوون لە برسان، بەتایبەت منداڵەکانیان، دیارە هەوڵو کاری دوژمنانی ئیسلام لەپێناو مەبەستی خۆیاندا سنووری نیەو، پەنایان بۆ هەرشتێك بردوە کە زانیبیان زیانی هەیە بۆ سەر پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانان.

ئنجا وەك دەردەکەوێ هەبوونی خزمو عەشیرەتی پێغەمبەرو ﷺ باقی مسوڵمانانی دیکە، کە مسوڵمانیش نەبوون لەو بەرەیەدا، مایەی بەهێزیی ئەو بەرەیە بووەو پاڵنەری خزمایەتی زۆر دەوری بینیوە لەو مەسەلەیەداو سوودی بە مسوڵمانان گەیاندوە، وە سەرەنجام کافرانی مەککە لەو هەوڵەشیاندا شکستیان هێناو نەیانتوانی بە مەرامەکەیان بگەنو پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانان لە بانگەوازو کاری خۆیان سارد بکەنەوە، بەڵکو ڕۆژ بۆ ڕۆژێ لە بەرەو پێشدابوون، هەڵبەتە هەڵوێستی ناحەزانی دیکەی ئیسلامیش لە هەموو چاخو سەردەمێکدا ئاوا بووەو هەموو شێوازێکیان دژی مسوڵمانان بەکارهێناوە، بەڵام پێویستە مسوڵمانانیش وێڕای شتەکانی دیکە، لەمەشدا شوێن پێی پێغەمبەر ﷺ بگرنو هیچ ئەزیەتو ئازارێك کار لە مسوڵمانەتییەکەیان نەکاتو پاشەکشەیان پێ نەکاتو سەبرو ئارام لەسەر ناخۆشییەکان بگرن.

## شەشەم: دڕاندنی پەیمـاننامە (صحیفة) کـە :-

ئەو پەیـماننامـەیەی کە تا کۆتایی سـاڵی (١٠) دەیـەمی پێغەمبەرایـەتی خایانـدو هەنـدێك لـە قورەیشـییەکان پێـی ڕازیو هێندێکیشـیان پـێی نـاڕازیی بـوون، (ابـن هشام)(١) باس دەکات، کە چۆن ئەو پەیـماننامـە ستەمکارانەیە دڕێنراوە، دەڵێ: پێـنج پیاوی خاوەن ویژدان لەسەرانی قورەیش، کە هەمـووشیان هاوبەش بۆ خوا دانـەر بـوون، بەڵام دیارە جۆرێك لە شەهامـەتو جوامێرییان هەبووە، چونکە مـەرج نیە هەرکەسـێك کـە کـافر بـوو لـە هـەموو سـیفەتێکی بـاش داڕنرابـێ، ئـەو پێـنج کەسـەش کـە ئـەو هەڵوێستەیان هەبوو ئەمانە بوون:

١- هشام بن عمرو بن ربيعة .

٢- زهير بن أبي أمية .

٣- مطعم بن عدي .

٤- أبو البختري بن هشام .

٥- زمعة بن الأسود .

ئەوانە لەسـەر نەهێشتـنو دڕانـدنی پەیـماننامـەکە ڕێککـەوتنو سـەرەتا (هشـام) دەچێ بۆلای (زهیـر)، وە لـەگەڵ ئەودا دەچـن بۆلای (مطعم)و ئنجا هەرسێکیان دەچـن بۆلای (ابو البختـري)و دواییش دەچـن بۆلای (زمعـة)و بەیەکـەوە کۆدەبنـەوەو دەڵـێن: ئەوە چ ویژدانێکە ئەوانە هەمـوو مردن لەو دۆڵو شیوانە، بـا بچـین ئـەو (صـحیفة) یـە بدڕێینـین، وە (بني هاشم) بە کافرو مسوڵمانەوە بێنەوە بۆ نێو شاری مەککە.

ئنجا دوای ئەوەی وتووێژیان کردو شتەکەیان ڕێك خست، چوون بـۆ (کابـە)، یەکـەم کەس کە قسەی کرد (زهیـر) بـوو، کـە پێشتـر بەرنامـەیان وا دانـابوو، گـوتی: چۆن دەبێ ئەو خەڵکە لە برسان بـمرن، لە کاتێکدا خزمی خۆمانن؟! نابێ بەوە ڕازی بیـنو

---

١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(١٩٣-١٩٤).

www.alibapir.com

پێویستە ئەو (صحیفة)یە بدڕێنیـن، (أبو جهل) کە لە سووچێکی مزگەوت دانیشـتبوو دەڵێ: نەخێر درۆت کرد، کەس ناتوانێ ئەو (صحیفة)یە بدڕێنێ.

(زمعة بن الأسود) دەڵێ: نەخێر تۆ درۆت کرد، دەبێ بیدڕێنیـن، چونکە ئێمـە ڕازی نەبووین کاتێك ئەوە نووسرا.

(أبو البختـري)یش دەڵێ: ڕاست دەکا، ڕازی نابیـن بـەوەی تێیـدا نووسـراوەو دەبـێ بدڕێنـرێ.

(مطعـم)یـش دەڵـێ: قسـەی ئێـوە ڕاسـتەو، ئـەوی دیکـە درۆیـەو دەبـێ بـدڕێنرێ، (هشام)یش بەهەمان شێوە قسەی کرد.

ئنجا (أبو جهـل) دەڵێ: (هذا أمر قُضي بليل تشوورَ فيه بغيـر هذا الـمكان) واتـە: ئەوە شتێکە بە شەوێ تەگبیـری بۆکراوەو لە جێیـەکی دیکە ڕێکخراوە.

ئنجا (مطعـم بن عـدي) چوو پەیـماننامەکەی دەرهێنـا بـۆ ئـەوەی بیـدڕێنێ، کـە تەماشای کرد مۆرانە هەمووی خـواردبوو، جگە لـە وتـەی (باسـمك اللّهـم) واتـە: بـە نـاوی تۆ ئەی خوایە!

(إبـن هشـام) دەڵـێ(١): پێغەمبـەر ﷺ بـە (أبـو طالـب)ی مـامی گـوت: مامـە پـەروەردگارم هـەواڵی پێـداوم، کـە مۆرانـەی بەرداوەتـە ئـەو پەیماننامـەیـە زاڵمانەیـەو هەمووی خواردوە، بێجگە لەو وشانەی کە ناوی خوان.

(أبو طالب)یش گوتی: ئایا خوایەکەت ئەو هەواڵەی پێداوی؟

گوتی: بەڵێ.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢ ص(١٩٤).

دوایی (ابو طالب) گوتی: قوڕەیشییەکان وەرن! موحەممەدی برازام شتێکی وا دەڵێ، ئەگەر قسەکەی ڕاست بوو با پەیماننامەو دەنگ دابڕانە، کە کۆتایی پێ بێنن‌و، بیدڕێنن‌و ئەگەر ڕاستیش نەبوو با هەر لە شوێنی خۆی بێ، کە تەماشایان کرد مۆرانە هەموو پەیماننامەکەی خواردبوو، جگە لە وشەی (باسمك اللّهم)، جا ئەم دوو ڕیوایەتە هەردووکیان هەن‌و دەگونجێ سەرەتا خوای پەروەردگار وەکو موعجیزەیەك ئەوەی پیشانی پێغەمبەر ﷺ دابێ، دوایی (أبو طالب) چووبێ‌و ئەو پێنج کەسەش پشتیان گرتبێ.

بەهەرحاڵ بەو شێوەیە پەیماننامەکە هەڵوەشێنرایەوەو پێغەمبەرو ﷺ ئەوانەی لەگەڵی بوون لە شیوی (ابو طالب) هاتنەدەرێ‌و دەربازیان بوو.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# ساڵی ماتەمینیو پەژارەی یەك لە دوای یەك بۆ پێغەمبەر ﷺ

بەڕێزان!

لە کۆتایی ساڵی دەیەمو سەرەتای ساڵی یازدەیەمدا، کە لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ بە ساڵی ماتەمینی (عام الحزن) بەناوبانگە، چەند ڕووداوێك ڕوویان داوە، کە زۆر سەختو گران بوون بۆ سەر دڵو دەروونی پێغەمبەر ﷺ، وە تاقیکردنەوەی گەورەگەورە بوون بۆی، دیارە ئینسانی گەورەش بە شتی گەورە تاقی دەکرێتەوەو، بێگومان کەسیش لە پێغەمبەر ﷺ گەورەتر نەبووە، کە سەروەری پێغەمبەرانەو گەورەی هەموو بەشەرە، ڕووداوەکانیش بریتین لە:-

## ١- کۆچی دوایی (أبو طالب) :-

وەك پێشتر باسکرا (ابو طالب) پشتیوانو پاڵپشتێکی زۆر باشو پتەو بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ، وەك (بخاري) لە عەبباس ڕیوایەت دەکات کە بە پێغەمبەری ﷺ گوتوە: (کان یحوطك ویغضب لك)[١]، واتە: (أبو طالب) لەسەر تۆ تووڕە دەبوو، وە پارێزگاریی لێدەکردی!

بەڵێ (أبو طالب) وەکو پەرژینێك وابوو بۆی، بەرگریی لێدەکردو سەری دەخستو خەڵك لەبەرئەو نەیدەتوانی هەموو شتێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکا، جا (أبو طالب) لە کۆتایی ساڵی دەیەمو پاش دەرچوون لە شیوەکانی (أبو طالب) کۆچی دوایی کردوە، وەکو مێژوونووسان دەڵێن: (أبو طالب)و (خدیجة) هەردووکیان زیاتر لە ئەنجامی کارتێکرانیان بەو برسیەتیو نارەحەتییەی کە لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا کە لە شیوی (أبي طالب) بوون، نەخۆش کەوتوونو وەفاتیان کردوە.

---

١) صحیح البخاري: ٣٨٨٣.

(مسلم) لە (أبو هريرة) دەگێڕێتەوە: {**قال رسول الله ﷺ لعمه (قل: لا إله الا الله أشهد لك بها يوم القيامة)، قال: لولا أن تعيِّرني قريش، يقولون انما حمله على ذلك الجزَعُ لأقررتُ بها عينك، فأنزل الله:** ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾﴾ القصص[1]}.

لەکاتی سەرەمەرگی (ابو طالب)دا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بڵێ: جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، (لا اله الا الله) بۆ ئەوەی، کە بەڵگەیەکم بەدەستەوە بێ‌و شاهیدیت بۆ بدەم‌و دیفاعت لێبکەم لە ڕۆژی قیامەتدا (دیارە پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بووە ئەگەر لە کۆتایی ژیانیشی دابێ -أبو طالب- ئیمان بێنێ).

(أبو طالب) گوتی: ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە، کە قورەیش بڵێن: ترسی مردن وای لێکردوە، کە ئەو وشەیە بڵێ، دڵی تۆم بەو وشەیە خۆش دەکرد (بەڵام با ڕەخنەم لێ نەگرن‌و بڵێن ئەوە لە مردنێ ترساوە).

ئنجا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾، واتە: بێگومان ئەی موحەممەد! تۆ ئەو کەسەی کە حەز دەکەی هیدایەت وەربگرێ‌و ئیمان بێنێ ناتوانی هیدایەتی بدەی، بەڵام خوا هەر کەسێك بیەوێ هیدایەتی دەدا، وە خواش بەوانە کە هیدایەت وەردەگرن شارەزاترەو زاناترە، (واتە: ئەو دەزانێ کێ شایستەیە کە هیدایەتی بدات) (بخاري)، هێناویەتی کە (عباس بن عبدالمطلب) پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوەو گوتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا مامت، کە هێندە بۆ تۆ باش بوو وە سەنەدو پشتیوانت بوو، هیچ سوودی پێ دەگەیەنی بۆ قیامەت؟

---

١) صحيح مسلم: ١٣٤.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: **{هو في ضحضاح من نّار، ولولا أنا لكان في الدرك الأسفل من النار}**[١]، واتە: بەڵێ لە ئاگرێکی تەنك دایە (لە جەهەننەم)داو ئەگەر شەفاعەتی من نەبووایە لە بنەوەی ئاگردا دەبوو.

(ابو سعيد الخدري)یش دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو کاتێك، کە باسی مامی دەکرد، دەیفەرموو: **{لعله تنفعه شفاعتي يوم القيامة، فيجعل في ضحضاح من النّار يبلغ كَعْبَيه يَغْلي منها دماغه}** رواه البخاري[٢]، واتە: بەڵکو تکای من بۆ ئەو لە ڕۆژی دواییدا سوودی پێ بگەیەنێو بخرێتە نێو ئاگرێکی تەنکەوە، کە هەتا گوێزینگانی بێو مێشکی لەگەڵ بکوڵێ.

## ٢- کۆچی دوایی (خديجة):-

(ابن اسحاق) دەڵێ: ( ثم ان خديجة بنت خويلد و ابا طالب هلكا في عام واحد فتتابعت على رسول الله ﷺ المصائب بهلك خديجة وكانت له وزير صدق على الاسلام يشكو اليها... وذلك قبل مهاجره بثلاث سنين....)[٣]، واتە: دوایی (خديجة بنت خويلد) و (أبو طالب) لە ساڵێکدا کۆچی دواییان کرد، بەو شێوەیە بەڵا لەسەر بەڵا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بوو، کە خەدیجە وەزیرێکی[٤] زۆر چاك بوو بۆی، زۆر جار پێغەمبەر ﷺ دەردە دڵی خۆی لای خەدیجەی خێزانی دەکرد، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی خدیجەوە دەفەرموێ: **{خير نسائها**

١) صحيح البخاري: ٣٨٨٣ .
٢) صحيح البخاري: ٣٨٨٤.
٣) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢١٤).
٤) وزير، واتە: پاڵپشتو سەنەد.

**مريم وخير نسائها خديجة}** رواه البخاري[١]، واتە: چاكترين ئافرەتانی رۆژگاری خۆی مەریەم بووە، وە خەدیجە چاكترینی ئافرەتانی رۆژگاری خۆیەتی.

زانایانی دەروونناسیش دەڵێن: ئینسان كاتێك دڵی زۆر توند دەبێ‌و تووشی خەفەت‌و نارەحەتیی دێ، ئەگەر دۆست‌و دڵسۆزێك، یان كەسێكی زۆر نزیكی هەبێ، دڵی خۆی بۆ بكاتەوەو ژان‌و ئازارەكەی خۆی بۆ باس بكا، كەمێك ئۆخژنی بۆ دێ‌و، ئەوە جۆرێكە لە هەناسەدانی دەروونیی‌و خەم‌و پەژارەكانی لادەچن، پاشان (ابن إسحاق) دەڵێ: وە كۆچی دوایی (أبو طالب)و وەفاتی (خديجة) بە سێ ساڵ پێش كۆچ كردن بۆ مەدینە بوو.

## ٣- زیادكردنی ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ:-

دوای كۆچی دوایی (ابو طالب) مامی‌و (خديجة)ی هاوسەری، ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن كافرەكانەوە زۆر زیادی كردو زۆر شتی لەگەڵدا دەكرا، كە پێشتر لەگەڵیدا نەكرابوو، یەكێك لەوانە: وەك (ابن هشام) هێناویەتی دەڵێ[٢]: ورگ‌و ڕیخۆڵەو پسدانی حەیوان‌و مەڕو بزنیان فڕێ دەدایە سەر شان‌و ملی موبارەكی پێغەمبەر ﷺ لەكاتی سەجدەو ڕكووع بردندا، دوایی كە نوێژەكەی تەواو دەكرد، بە دارێك لای دەبردو دەیگوت: **{يا بني عبد مناف! أي جوار هذا ؟!}**، واتە: ئەی (بني عبدالمناف) ئاوا دەبێ پەنادان‌و دیفاع لێكردن؟! (دیارە دڵی بەخۆی سووتاوە ڕووحم بەقوربانی بێ)، شتێكی دیكە، كە دەیانكرد ئەوەبوو: لە كاتێكدا كە خەدیجە یان كچەكانی -خوا لێیان ڕازی بێت- چێشت‌و خواردنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ لێدەنا، كافرەكان دەچوون ورگ‌و ڕیخۆڵەی حەیوان‌و شتی پیسان لەنێو مەنجەڵەكەی دەكردو خواردنەكەیان لێ تێكدەدا.

---

١) صحيح البخاري: ٣٨١٥ .

٢) (السيرة النبوية...)، ج٢، ص(٢١٤)، ط١، دار ابن الهيثم.

www.alibapir.com


جارێکیان یەکێك لە قورەیش، چەنگە خۆڵێکی لەسەر سەری پێغەمبەر ﷺ ڕۆکرد، پێغەمبەریش ﷺ چۆوە ماڵێو خۆڵەکەشی هەر لەسەرسەری بوو، یەکێك لە کچەکانی بە گریانەوە خۆڵەکەی لەسەری دەکردەوەو سەری دەشۆردەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: کچم مەگریە خوا بابت دەپارێزێ، ئنجا لەبەرخۆشیەوە دەیفەرموو: **{ما نالت مني قريش شيئاً أكرههُ حتى مات أبو طالب}**، واتە: قورەیش بەو شێوەیە لەگەڵ مندا ڕەفتاریان نەدەکرد، تا (أبو طالب) مابوو[1].

## ٤- چوون بۆ شاری (طائف)و گەڕانەوە بە دڵشکاویی:-

کاتێك پێغەمبەر ﷺ فشاری زۆری لەسەر دانرابووو، قورەیشییەکان زۆر لەگەڵی خراپ بوون، بیری کردەوە کە ئەو بانگەوازو پەیامە بەرێتە دەرەوەی مەککە، بۆیە لەگەڵ (زيد بن حارثة) کە کردبووی بە کوڕی خۆی بەرەو طائیف بەڕێ دەکەوێ بە پێ، هەڵبەتە بەدڵشکاویی‌و بە دڵێکی پڕخەمەوە، بەڵام بە دڵێکی خەفەتبارترەوە دەگەڕێتەوە بەرەو مەککە دوای ئەوەی کە لە طائیف (١٠) ڕۆژی پێدەچێ، وەك (ابن هشام)[2] ئاوا باس دەکات‌و دەڵێ: دوای ئەوەی (ابو طالب) وەفاتی کرد، قورەیشییەکان ئازارو ئەزیەتی پێغەمبەریان ﷺ زیادکرد لە ئەنجامدا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (زيد بن حارثة)دا ڕۆیشت بۆ طائیف بۆ ئەوەی داوای یارمەتی لە هۆزی (ثقیف) بکا، کە چیدی قورەیش زوڵمی لێنەکەن، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای سێ برایان کە ئەو کات ڕیش سپیانی طائیف بوون (عبد يا ليل بن عمرو بن عمير، مسعود بن عمرو بن عمير، حبيب بن عمرو بن عمير) پێغەمبەر ﷺ لەلایان دادەنیشێ، وە قسەیان لەگەڵدا دەکات‌و بانگیان دەکات بۆ ئیسلام، وە داوایان

---

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص(٢١٥).
٢) (السيرة النبوية...)، ج٢، ص(٢١٦-٢١٧)، ط دار ابن الهيثم.

لـێ‌دەکات، کـە یارمـەتی بـدەن‌و پشـتی بگـرن، بـەڵام وەڵامێکـی زۆر نەفامانـەی دەدەنەوە، یەکەمیان (عبد یا لیل)، کـە بـرا گەورەیـانە دەڵـێ: (هـو یـمرط ثیـاب الكعبـة، ان كان الله أرسلك!)، واتە: (مـن پـەردەی کابـەی بدڕێنـم، ئەگـەر خـوا تـۆی ناردبێ!) دیارە پەردەی (کـابە) دڕاندن لایان شتێکی زۆر گەورە بووە، واتـە: تـۆ ڕاست ناکەی‌و خوا تۆی نەناردوە!

هی دووەمیان دەڵـێ: (أما وَجَد اللهَ احداً يُرْسِلُهُ غيـرَكَ؟!)، واتە: (ئەوە خوا کەسـی دیکەی دەست نەکەوت بینێـرێ تۆ نەبێ؟!)، کە ئەمەش قسـەیەکی زۆر نـاخۆش بـوو، یانی: (تۆ لە هەموو کـەس خراپتـری)، هـی سـێیەمیشیان دەڵـێ: (والله لا أُكلمـك أبداً، لئن كنت رسولاً من الله كما تقول، لأنتَ أعظم خطراً مـن ان أردَّ عليـك الكـلام، ولـئن كنـت تكـذب علـى الله مـاينبغي لـي ان اكلمـك)، واتـە: (سـوێند بـەخوا یـەك کەلیمەش قسەت لەگەڵ ناکەم، چونکە لە دوو حـاڵان بـەدەر نیـە، یـان وەك بـۆ خۆت دەڵێی ڕەوانەکراوی خوای، ئەگەر ڕەوانەکراوی خواش بی تۆ لەوەی گەورەتری، کـە مـن قسەی تۆ بەرپەرچ بدەمەوە، ئەگەر بەناوی خواوە درۆ بکەی، ئەوە بـۆ مـن شـایسـتە نیە، کە قسە لەگەڵ کەسێك بکەم بەناوی خـواوە درۆ بکات)!

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: مادام واتان کردو وەڵامەکەتان ئـاوا بـوو (کـە ئـەوە هەر وەڵام نیـە)، با ئەوە هەر لەلای خۆتـان بێـت‌و باسـی مەکـەن، چـونکە پێغەمبـەر ﷺ، کـە لـە مەککـەوە هـاتوە، دوای لەدەسـتدانی هـەردوو پشـتیوانی دەرەکیـی‌و نێوەکیی (أبو طالب و خديجة)، وە لە دەسـت زوڵـم‌و سـتەمی قوڕەیشـییەکان هـاتوە بۆ (طائیف)، ئەگەر ئـەو هەواڵـە بگـاتەوە قـوڕەیش، زیـاتر دژایـەتی دەکـەن‌و پێـی دەڵێن تۆ لە هیچ شوێنێك قبووڵ ناکرێی‌و.... هتد، کەچـی ئەوانـە لـە جیـاتی ئـەوەی وەڵامەکـەیان بشـارنەوە، هـەموو خـەڵکیان لـەوە تێگەیانـدو منـداڵ‌و پـاڵ‌و خـەڵکی نەفامیان تێبەردا، کە بە دوای بکەون‌و جنێوی پێ بڵێن.

www.alibapir.com


لە ڕیوایەتێکی دیدا (زید) دەڵێ: بەردیان پێداداین، تا من خوێنم بینی لەنێو نەعلەکانی پێغەمبەردا ﷺ ڕاوەستابوو، هەرچەندە زۆریشم خۆ وەبەر بەردەکان دەدا بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەردی هەر پێ دەکەوت، دوایی پێغەمبەر ﷺ دەڕوات تا دەچێتە نێو باغێکەوە، کە هی (عتبة و شیبة)ی کوڕانی (ربیعة) بوو کە لەوێ دەبن، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دەچێتە نێو ئەو باغەوە، لە بن سێبەری دارمێوێك زۆر بە دڵ شکاویی دادەنیشێ‌و ئەو دووعایە دەکا (منیش لە زیندانی ئەمریکادا زۆر جار ئەو دووعایەم دووبارە دەکردەوە)، دەفەرموێ:[1] **{اللّهم اشكو اليك ضعف قوتي و قلة حيلتي وهواني على الناس، يا أرحم الراحمين! انت رب المستضعفين وانت ربي! الى مَنْ تكلني! الى بعيد يتجهّمني أم الى عدو ملّكته أمري؟ ان لم يكن بك عليَّ غضب فلا أبالي، ولكن عافيتك هي أوسع لي، أعوذ بنور وجهك الّذي أشرقت له الظلمات وصلح عليه أمر الدنيا والآخرة من أن تنزل بي غضبك أو يحل عليَّ سخطك! لك العتبى حتى ترضى ولا حول ولا قوة الاّ بك}**[2]، واتە: ئەی خوایە! سکاڵای کەم هێزیی خۆم لای تۆ دەکەم، وە سکاڵای بێچارەیی خۆم، لەلای تۆ دەکەم، وە سکاڵای بێ‌ڕێزییم لەلای خەڵکی کافر (کە ڕێزم لێ ناگرن) دێنمە لای تۆ، ئەی ئەو کەسەی لە هەموو کەس بە بەزەیی تری! تۆ پەروەردگاری چەوسێنراوانی، وە پەروەردگاری منیشی بە

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢١٧) .

٢) شیخ ناصرالدین الألباني لە کتێبی (تمام المنة)دا، سەبارەت بەم فەرموودەیە، دەڵێ: ئەم فەرموودەیە هەرچەندە لە کتێبەکانی (سيرة)دا، ئەوانەی ژیاننامەی پێغەمبەریان ﷺ نووسیوە باوە، بەڵام فەرموودەیەکی (ضعیف)ە. هەروا دکتۆر (العمري) لە کتێبەکەی(السيرة النبوية الصحيحة)دا (١٨٦/١) ئەم فەرموودەیەی بە (ضعيف) داناوە، بەڵام (ابراهيم العلي) لە کتێبەکەی خۆی (صحيح السيرة النبوية)، ص(١٣٦)دا بە (صحيح)ی داناوە، وە دکتۆر عبدالرحمن عبدالمجيد البر، کە مامۆستای فەرموودەو زانستەکانی فەرموودەیە لە زانکۆی ئەزهەر بۆچوونی وایە، کە فەرموودەکە بە هەردوو ڕێگەکەیەوە بەهێزو مەقبووڵە، بڕوانە کتێبەکەی (الهجرة النبوية المباركة) لاپەڕە (٣٨).

کێم دەسپێری؟ بە کەسێکی دوور (خزم نیەو دوورەو بێگانەیە) کە لە ڕوومدا ئاوا ترش و تاڵەو بە شێوەیەکی ناخۆش پێشوازییم دەکات، یاخود بە دوژمنێکم دەسپێری کە ئیشی منت خستۆتە دەستی وی، (واتە: دەسەڵاتی بەسەر مندا هەیە) ئەگەر تۆ لێم تووڕە نەبی، من گوێ نادەمێ، بەڵام سەلامەتییتم فراوانترە، پەنا دەبەمە بەر ڕووناکی ڕووی تۆ کە تاریکاییەکان ڕادەماڵێ، وە کاروباری دونیاو دوارۆژی پێ چاك دەبێ، پەنا دێنمە بەر تۆ، کە لێم تووڕە بی، یان لێم برەنجێی، وە داوای لێبووردن لە تۆ دەکەم هەتا تۆ ڕازی دەبی، وە لادان نیە لە گوناح و هێزیش نیە بۆ طاعەت مەگەر بە تۆ نەبێ.

کاتێك کە (عتبة و شیبة) ئاوا دەیبینن، بەزەیییان بۆ دەجووڵێ بە غولامەکەیان دەڵێن کە ناوی (عدّاس) دەبێ و خەڵکی نەینەوا بووە، ئەو هێشووە ترێیە بەرە با لێی بخوا، (عەدداس) دەچێ بۆلای و دەڵێ بخۆ، پێغەمبەریش ﷺ دەڵێ: (بسم الله)و ترێیەکە دەخوات.

(عەدداس) دەڵێ: تۆ قسەیەکت گوت، کە خەڵکی ئەم وڵاتە نایڵێن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی تۆ خەڵکی کوێی؟

عەدداس دەڵێ: من نەصرانییم و خەڵکی نەینەوام.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خەڵکی ئەو شارەی،کە (یونس)ی کوڕی (متَّى)ی لێبوو.

عەدداس دەڵێ: بۆ تۆ یونوسی کوڕی مەتتا دەناسی؟!

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بەڵێ، ئەو برامەو پێغەمبەری خوایەو منیش پێغەمبەری خوام.

عەدداس بە سەرسورمانەوە دەپرسێ: یانی تۆ پێغەمبەری خوای؟!

ئەویش دەفەرموێ: بەڵێ، یەکسەر عەدداس سەری موبارەکی و هەردوو دەست و هەردوو پێی ماچ دەکات.

لە دوورەوە، کە (عتبة و شيبة) دەیبینن، دەڵێن: بەخوا ئەو غولامەش هیچ! ئەویشی هەڵخەڵەتاند!!

کە عەدداس دەچێتەوە لێی دەپرسن: عەدداس ئەوە بۆ وات کرد؟!

ئەویش دەڵێ: ئەو ئینسانەتان نەناسیوە، ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ! نهێنییەکی پێبوو، کە پێم وابوو هیچ کەس نایزانێ (یونوسی کوڕی مەتتا) دەناسێ، کە پێغەمبەری خوایە، چونکە تەنیا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەو ڕاستییانە دەزانن.

ئەوانیش پێی دەڵێن: بەقسەی ئەو کابرایە نەکەی‌و دینەکەی خۆت چاکترە، هەڵتنەخەڵەتێنێ‌و نەچیتە سەر دینی ئەو.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (زید بن حارثة) بە دڵشکاویی دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، بەڵام خەڵکی مەککە خەبەری بۆ دێنن کە نابێ بێتەوە بۆ مەککەو قبووڵی ناکەینەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەچێتە ئەشکەوتی (حیراء)، ئینجا خەبەر دەنێرێ بۆ لای (الأخنس بن شریق) دەفەرموێ: پەنام بدە با بێمەوە، ئەویش دەڵێ: من هاوپەیمانم لەگەڵ قوڕەیشییەکان بۆیە توانای ئەوەم نیە، خەبەر دەنێرێ بۆ (سهیل بن عمرو) ئەویش دەڵێ: من لە (بني عامر)م، کە ناتوانن خەڵك پەنا بدەن لەسەر قوڕەیش‌و وەڵامەکەی ئەویش سەلبیی دەبێ، ئنجا دەنێرێ بۆ لای (مطعم بن عدي)‌و ئەو دەڵێ: باشە من پەنای دەدەم، ئنجا (مطعم) بە خزمەکانی خۆی دەڵێ: خۆتان بپێچنەوەو چەك هەڵگرن، وە یەکێك دەنێرێ، کە پێغەمبەر ﷺ بێنێ‌و، جاڕ دەدات بەنێو قوڕەیشداو، دەڵێ: من موحەممەدم پەنا داوە، هیچ کەس

ئـازاری نەدات! وە سەرەنجام پێغەمبەر ﷺ لەگـەڵ (زیـد بـن حـارثة)دا دێتــەوە نێـو شاری مەککە(١).

لێرەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناچار بووە بچێتە ژێـر بـاڵی کابرایـەکی کـافر، کـە دەشزانێ لەسەر باطڵو کوفریشە، ئەویش لەبەر خواو لەبەر کاری ئیسلامیی، ئەگـەرنا خزمەکانی پێغەمبەر ﷺ ئامادەبوون هـەموو شـتێکی بـۆ بکـەن، بـەڵام بەمــەرجێك دەست لە دینو بانگـەوازەکەی هەڵبگرێ، بەڵام ئەو ئامــادە نەبووە بـە ئەنـدازەی تاڵـە موویەکیش نەرمیی بنوێنێ لەوبارەوە.

کەواتە: دەبێ بزانیـن، کە ئێمەش زۆر جـار کـاری ئیســلامییو خزمــەت بـە دینـی خوای پەروەردگار، ناچارمـان دەکـا هەندێ شت بکەین، کە ئەگـەر هـەر خۆمــان بیــن وەکو تـاك (شـخص) قبووڵی ناکەین، بـەڵام هـەر شـتێك بەرژەوەندیــی دینـی خـــواو کــاری ئیســلامیی تێـدا بـێ لـەو پێنــاوەدا قبـووڵی دەکـەین، مــادام بەرژەوەنـدیی (مـصلحة)یێکی گەورەی کـاری ئیسلامیی بەوە تەحقیـق بێ، یان زیـــان (مفسـدة)یێکی گەورەتری پێ لاببـرێ.

بە پێویستی دەزانم ئـەو فەرموودەیـەی دایکـی مسـوڵمانان (عـائشــة) - خـوا لێـی رازی بێت-، بکەمـە کۆتایی بۆ ئەم قۆناغـەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ، وە ئـەو ســاڵەی، کە ناوی لێنراوە ساڵی ماتـەمینیو غـەمو پـەژارە: **{عن عائشة رضي الله عنها، زوج النبي ﷺ، أنها قالت للنبـي ﷺ: هل أتى عليك يوم كان أشد من يوم أحد؟**

**قال: (لقد لقيت من قومك ما لقيت، وكان أشد ما لقيت منهم يوم العقبة، إذ عرضت نفسي على ابن عبد ياليـل بن عبد كلال، فلم يجبني إلى ما أردت، فانطلقت وأنا مهموم على وجهي، فلم أستفق إلا وأنا بقرن الثعالب فرفعت**

---

١) بڕوانە: (تأريخ الأمـم والـملوك) للطبـري، ج٢، ص(٢٣١)، وە: (البداية والنهاية) لابـن كثيـر، ج٣ ص(١٥٩).

**رأسي، فإذا أنا بسحابة قد أظلتني، فنظرت فإذا فيها جبريل، فناداني فقال: إن الله قد سمع قول قومك لك، وما ردوا عليك، وقد بعث الله إليك ملك الجبال لتأمره بما شئت فيهم، فناداني ملك الجبال فَسلَّم علي، ثم قال: يا (محمد)، فقال، ذلك فيما شئت، إن شئت أن أطبق عليهم الأخشبين؟ فقال النبيّ ﷺ: بل أرجو أن يخرج الله من أصلابهم من يعبد الله وحده، لا يشرك به شيئا}** رواه البخاري[١]، واتە: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر – خوا لێی ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە، کە بە پێغەمبەری ﷺ گوتوە: ئایا هیچ ڕۆژان لە ڕۆژی ئوحود سەختتترت لێ گوزەراوە؟

فەرمووی: ئەوەی لە گەلەکەتەوە تووشم بوو تووشم بوو، وە سەختترین شت، کە لەوانە بەسەرم هات، ڕۆژی عەقەبە بوو، کە داوای پەنام لە (ابن عبد یالیل بن عبد کلال) کرد، بەلاّم وەلاّمی داوایەکەی نەدامەوە، منیش بە خەمباریی ڕۆیشتمو ملم نا لە (قرن الثعالب) هاتمەوە سەرحالّ، کە سەرم بەرزکردەوە، هەورێکم لەسەر بوو سێبەری لێکرد بووم، سەرنجمدا جیبریلی تێدابوو، بانگی کردمو، گوتی: خوا قسەو وەلاّمو بەرپەرچدانەوەی گەلەکەتی بیست، جا ئەوە فریشتەی شاخەکانی ناردۆتە لات تاکو چیت پێ باشە فەرمانی پێبکەی، ئنجا فریشتەی چیایەکان بانگی کردمو سەلامی لێکردمو، گوتی: ئەی موحەممەد! ئەگەر حەزدەکەی، کە دوو چیایەکانیان بەسەردا برووخێنم (واتە: بەسەر خەڵکی طائیفدا)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو هیوام وایە، کە خوا وەچەیەکیان لێ بخاتەوە، کە تەنیا خوا بپەرستێو هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی.

---

١) صحيح البخاري: ٣٢٣١ .

www.alibapir.com


## ٥- گەڕانەوە لە (طائف)و دیدار لەگەڵ وەفدی جندا:-

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە دڵشکاویی لە (طائف) گەڕایەوە، لە شوێنێك كە پێی دەگوترێ (نخلة) لە نیوەی شەودا نوێژی دەکرد، كە كۆمەڵێك لە (جن) بەلایدا تێپەڕین وە گوێیان ڕاگرت بۆ قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ، كە (إبن هشام)[1] دەڵێ حەوت كەس بوون، بەڵام سەرچاوەكانی دی گوتوویانە (٩) كەس بوون، وە ئەو جندانە خەڵکی (نصيبين) بوون، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژەكەی تەواوكرد، ئەوان گەڕانەوە بۆلای خەڵكەكەی خۆیان، وە ئەو پەیامو بانگەوازەی ئیسلامیان پێ ڕاگەیاندن، خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأحقاف) لە چوار ئایەتاندا ئایەتی (٢٩ تا ٣٢) ئەو ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە، كە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾﴾، واتە: یادی ئەو كاتە بكەوە كاتێك كۆمەڵێك لە (جن)مان ناردنە لات، جا كاتێك هاتنەلای (هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ) بەیەكتریان گوت: بێ دەنگ بن! (دیارە پێغەمبەر ﷺ كە شەونوێژی كردوە بە دەنگی بەرز قورئانی خوێندوە)، دوای ئەوەی كە قورئان خوێندنەكە تەواو بوو، گەڕانەوە بۆلای گەلو كۆمەڵەكەی خۆیانو ئاگاداریان كردنەوەو گوتیان: ئەی گەلەكەمان ئێمە گوێبیستی كتێبێك بووین لە دوای مووسا نێرراوەتە

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص(٢١٧).

www.alibapir.com


خوار (کە مەبەست قورئانە) هەموو کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ، خەڵك ڕێڕوونیی دەکات بەرەو حەق وە بەرەو ڕێبازێکی ڕاست، ئەی گەلەکەمان بەدەم بانگەوازکەر بۆلای خواوە بچن‌و ئیمانی پێ بێنن، لە گوناحەکانتان دەتانبوورێ‌و لە ئازارێکی بەئێشیش دەتانپارێزێ، وە هەرکەسێك بەدەم بانگەوازی خواوە نەچێت ناتوانێ خوا دەستەوەستان بکات (ناتوانێ دەربازی بێ لەژێر قەڵەمڕەوو ڕکێفی خوا) وە جگە لە خواش هیچ کەس نیە دۆست‌و پشتیوانی بێت‌و هاوکاری بکات، وە ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە، کە :

ئەو کۆمەڵە جندە -خوا لێیان ڕازی بێت- (کە دیارە ئەوانیش مسوڵمان بوون‌و بوونە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، چونکە لە دەمی موبارەکی ئەوەوە ئیمان‌و قورئان‌و ئیسلامیان وەرگرتوە) دوای ئەوەی شتێك لە پێغەمبەر ﷺ وەردەگرن، وە ئەوەی کە توانیویانە لێی گوێ بیست دەبن، یەکسەر گەڕاونەوە بۆلای گەلەکەیان بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەنەوەو بیانترسێنن، وە هۆشیاریان بکەنەوە، بەبێ دواکەوتن، ئنجا ئاوا دەستیان پێ‌کردوە:

سەرەتا باسی ئەوەیان کردوە، کە چییان بیستوە، گوتوویانە: ئێمە کتێبێکمان بیستوە کە لەلایەن خواوە هاتۆتە خوار لە دوای مووسا -علیە الصلاة والسلام- ئەو کتێبە هەموو کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ.

ئنجا نێوەرۆکی ئەو کتێبەیان پێ دەڵێن: ﴿يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ﴾، واتە: ئەو کتێبە خەڵك ڕێنمایی دەکات بەرەو حەق، لە هەموو بوارەکاندا عەقیدەیی‌و عیبادەت‌و ئەخلاق‌و هەڵس‌وکەوت‌و بواری حەڵاڵ‌و حەرام‌و حوکم‌و سیاسەت‌و لە هەموو بوارەکاندا خەڵك ڕێنمایی دەکات بۆ حەق، ﴿وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾، واتە: وە بۆ ڕێبازێکی ڕاست، ئنجا دوای ئەوەی بەرنامەکەیان بۆ ڕوون دەکەنەوە، سەرەتا سەرچاوەکەی، پاشان نێوەڕۆکەکەی، ئەوجارە داوا لە گەلەکەیان دەکەن، وەڵامی

بانگەوازی خوا بدەنەوەو ئیمانی پێ بێنن، بۆ ئەوەی لە گوناحەکانیان ببووری، وە لە عەزابی خۆی چەپاڵەیان بدات.

دوایی دەیانترسێنن، کە ئەگەر کەسێك بەدەم بانگەوازی خواوە نەچێ، ناتوانێ لە دونیادا لەژێر دەستەڵاتی خوا دەرچێو خوا دەستەوەستان بکات، وە هیچ کەسێك نیە هاوکاریی بکا، وە بە تەئکید لە دوارۆژیشدا لە سزای خوا قوتاری نابێ، وە بێگومان ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

(احمد ومسلم والترمذي) لە (علقمة)[1] دەگێڕنەوە، کە دەڵێ: بە (عبدالله بن مسعود)م گوت: (هل صحب النبّي ﷺ ليلة الجن منكم أحد؟! قال: ما صحبه منا احد، ولكنا فقدناه ذات ليلة فقلنا: استطير او اغتيل..)، واتە: ئەو جارەی، کە پێغەمبەر ﷺ چوو قسەی بۆ (جن) کرد، ئێوە هیچ کامتان لە خزمەتی دابوون؟! (عبدالله) دەڵێ: نەخێر ئەوشەوە هیچ کاممان لەگەڵی نەبووین، بەڵکو ئەو شەوە لێمان بزربوو، وە گوتمان: یان ڕفێنراوە، یان بە پەنهانیی کوژراوە، ئیدی ئەو شەوەمان بە خراپترین شەو لێ گوزەرا، کاتێك ڕۆژمان کردەوە، بینیمان پێغەمبەر ﷺ لەلای ئەشکەوتی (حیراء)ەوە دێتەوە، چووینە خزمەتیو پێمان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە تۆمان لێ بزر بوو، زۆریش بەدواتدا گەڕاین نەماندۆزیتەوەو بەو هۆیەوە خراپترین شەومان لێ گوزەرا!

پێغەمبەریش ﷺ بۆی باس کردینو فەرمووی: یەکێك لەلایەن (جن)ەکانەوە هاتو بانگی منی کردو، گوتی: ئێمە هەموو کۆبووینەوە لە فلان شوێن، وەرە قسەمان بۆ بکە، منیش چوومو قورئانم بۆ خوێندن، وە دوایی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵمان هاتو شوێنەوارەکانی پێنیشاندایںو، فەرمووی ئێرە شوێنی کۆبوونەوەکە بوو.

---

١) یەکێکە لە زانایانی تابعین.

ئنجا (ابن أبي حاتم) له (عكرمة) ەوه لەبارەی ژمارەیانەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (هم اثنا عشر ألفاً جاؤا من جزيرة الموصل)، واتە: ئەو جندانە (١٢٠٠٠) دوازدە هەزار کەس بوون، کە لە جەزیرەی (موصل)ەوە هاتبوون (واتە:- ناوچەی موصل-) ئەو ڕووداوەش ئەوە دەگەیەنێ، کە بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ گشتگیر بووە بۆ جنۆکەو مرۆڤ تایبەت نەبووە بە مرۆڤەوە، چونکە (جن)یش وەکو ئێمە موکەللەفن بەوەی، کە ئیمان بە پێغەمبەری ئێمە ﷺ بێنن، وە مسوڵمان بن، وە ئەوانیش کافرو مسوڵمانیان هەیە، وەك خوای پەروەردگار بە درێژی لە سوورەتی (الجن) باسیان دەکات.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## شـەوڕۆو بەرزبوونـەوە ( الإسـراء والـمعـراج ):

(الإسراء) واتـە: شـەوڕۆیی، (الـمعراج) یـان (العـروج) یـانی: بەرزبوونـەوە، دیـارە شەوڕۆیەکە لە (مەککە) وە بۆ (بیت الـمقدس) بـووە، وە بەرزبوونەوەکـەش لـە (بیـت الـمقدس)ەوە بۆ ئاسـمانەکانو پشت ئاسـمانەکان بووە، جا ئەو ڕووداوە گەورەو گرنگـە زۆربـەی لێکۆڵـەرەوان لەسـەر ئـەوە یـەك دەنگـن، کـە لـە سـاڵی (١١)یـەم یـاخود (١٢)یەمی پێغەمبەرایەتیدا بووە، واتە ساڵێك پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کـۆچ بکـا بۆ مـەدینە، وە ئەو ڕووداوە سەر سـوڕهێنەرو گرنگـە گـەورەترین ڕێـز لێگرتنـی خـوای پـەروەردگاری تێدایـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ ئـەو هەلومـەرجـە سـەختو ئـەو ئێش‌وژانەی، کە پێغەمبەر ﷺ لەو ماوەی پێشـووەدا چێشـتبووی بـۆ ئـەوەی خـوای بە بەزەیی دڵی بداتەوەو دڵی خۆش بکات، وە خوای بەرزو مـەزنیش زۆر کاربەجێیـەو هەر کاتێـك بینی یەکێـك لە بەندەکـانی خۆی تووشی ناڕەحەتییو ئێشو ژان دێ، بـە شتێك دڵی خۆش دەکـات، جـا بێگومـان ئـەو سـەفەرە گـەورەو سـەر سـوڕهێنەرە لـە لایەکەوە دڵخۆشـکەرێکی گەورە بووە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، وە لـە لایـەکی دیکەشـەوە وزە وەبەرخسـتـنو توانا تێدا پەیداکردنی زیاتر بووە بۆی تاکو بتوانـێ لـە قۆناغـەکانی دوایـیـدا دەوری زیـاترو کاریگـەرتر ببیـنـێ، چـونکە قۆناغەکـانی کـۆچ کـردن بـۆ مەدینەو پاشان دامـەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامییو ئەو هـەموو جـەنگو جیهـادە، کـە دوایی کردوویەتی، قۆناغی زۆر سەخت بوون، بۆیە خوای کاربـەجێ، کـە ئـەو سـەفەرە گەورەیەی بە پێغەمبەر ﷺ کردوە (کە یەکێکە لە -معجـزة- گەورەکان) بـۆ ئـەوەی زیاتر دڵخۆشبێ بەوەی، کـە خـوای پـەروەردگار ڕێـزی لـێ دەگـرێو، بـێ ڕێزیی کـافرو بێبڕوایەکان زۆر کار نەکاتە سەر دڵو دەروونی موبارەکی.

www.alibapir.com

ئنجا ئێمە سەرەتا بەکورتی لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکی قورئاندا باسی ئەو سەفەرە دەکەین، بە هەردووك قۆناغەکەیەوەو دواتریش لەبەرتیشکی چەند فەرموودەیەکدا زیاتر دەیتوێژینەوە: خوا –عزّوجلّ- لەبارەی شەوڕۆی پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١﴾ الإسراء، واتە: پاکیی بۆ ئەو کەسەی، کە شەوڕۆیی کرد بە بەندەی خۆی بە شەوێ لە مزگەوتی (حرام)ەوە بۆ مزگەوتی (أقصی)ی، کە پیتو پێزمان خستۆتە دەوروبەرەکەی بۆ ئەوەی لە نیشانە گەورەکانی خۆمانی نیشان بدەین بێگومان خوا بیسەرەو بینەریشە، ئەوە بەنسبەت قۆناغو بەشی یەکەمی ئەو سەفەرە بەفەڕو گرنگە، بەشی دووەمی سەفەرەکەش بریتی بوو لە بەرزبوونەوە (معراج)ی پێغەمبەر ﷺ لە (بیت المقدس)ەوە بەرەو ئاسمانەکانو پشت ئاسمانەکان، خوای بێوێنە لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ١ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ٢ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ٥ ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ٦ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٧ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ٨ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ٩ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ١٠ مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ١١ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ١٢ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ١٣ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ١٤ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ١٥ إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ ١٦ مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ١٧ لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ١٨﴾ النجم، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، سوێند بە ئەستێرە کاتێك ئاوا دەبێت (یان کاتێك، کە دەکەوێتە خوار لە ڕۆژی دواییدا، یاخود کاتێك کە ئەستێرەکان هەندێکیان لەبەین دەچنو هەندێکی دی

دروست دەبن) هاوەڵەکەتان نە ڕێی لێ ون بووە، نە سەرگەردانیش بووە، ئەوەیش کە دەیڵێ (قورئان کە بۆتان دەخوێنێتەوە وە ئەو فەرمایشتانەشی، کە وەك ڕاگەیاندنی دین دەیانفەرموێ) لە ئارەزووەوە نیە، بەڵکو پەیامێکە بۆی ڕەوانە دەکرێ (لەلایەن خوای پەروەردگارەوە) کەسێك (فریشتەیەك) فێری دەکات، کە زۆر بەهێزە، شکڵو دیمەنێکی زۆر جوانو پێکهاتنێکی زۆر تێرو تەواویی هەیە (یاخود -فَٱسۡتَوَىٰ- یانی: خۆی پێشانی موحەممەددا ﷺ) لەکاتێکدا کە لە ئاسۆی هەرەبەرزی ئاسمان بوو، دوایی شۆڕبۆوەو لێی نزیك کەوتەوە، ئەوەندە لێی نزیك کەوتەوە وەکو دوو کەوانی بەرامبەر یەك بەڵکو کەمتریش، ئنجا وەحی کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە خوا فەرمانی پێ کردبوو پێی ڕابگەیەنێ، عەقڵی (پێغەمبەر ﷺ) بەهەڵەدا نەچوو بوو لەوەدا کە بینی، (کە -جبریل-ی بینیوە لەسەر شێوەی خۆی) ئایا ئێوە لە گوماندان (یان شەڕەقسەی لەگەڵدا دەکەن) لەبارەی ئەوەوە کە دەیبینێ، وە جارێکی دی(جبریل)ی بینی لەسەر شکڵو شێوەی خۆی[1]، لەلای درەختی کۆتایی (کۆتایی هەموو مەخلوقات) لەلای ئەو درەختە بە هەشتی جێگەی تێدا حەوانەوەی (ئەهلی ئیمانی) لێیە، کە ئەو درەختە دادەپۆشێ ئەوەی کە دایدەپۆشێ (کە بەس خوا دەزانێ ئەو شتە چییە کە ئەو درەختە دایدەپۆشێ) چاوی (پێغەمبەر ﷺ) لای نەدا، وە لە ڕێش دەرنەچوو (واتە: ئەوەی کە بۆی دیاری کرابوو بیبینێ هەر ئەوەی بینی) وە سەرکێشیشی نەکرد، بێگومان ئەو (محمد ﷺ) لە نیشانە گەورەکانی خوای پەروەردگاری بینی.

---

١) یەکەم جار، کە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتە خوار (جبریل) لەسەر شێوەی ئینسانێك خۆی پێشاندا، بەڵام دوای ئەوە، کە (١٠) ڕۆژ وەحی پچڕا، دوای ئەو دەڕۆژە کاتێك، کە پێغەمبەر ﷺ لە (حیراء)ەوە دەچۆوە بۆ ماڵێ، جارێکی دی (جبریل)ی بینی، بەڵام ئەمجارەیان یەکەم جاری بوو، کە لەسەر شێوەی خۆی بیبینێ، لەم ئایەتەدا خوای کاربەجێ ئاماژە بەو جارەی دووەم دەکات، کە پێغەمبەر ﷺ جیبریلی لەسەر شێوەی خۆی بینیوە.

لێرەدا خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەکات، کە پێغەمبەر ﷺ دووجار (جبریل)ی بینوە لەسەر شێوەی خۆی، ئەگەرنا، دەیان جاری دیکە بینیویەتی، وەك (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێت- پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو دوو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴾ ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴾ دەڵێ[١]: (انا أول هذه الأمة سأل عن ذلك رسول الله ﷺ)، واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: من یەکەمینی کەسی ئەم ئۆممەتە بووم، کە دەربارەی ئەو ئایەتانە پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: **{انّما هو جبريل لَمْ أَرَهُ على صورته التي خلق عليها غير هاتين المرتين: رأيته منهبطاً من السماء ساداً عظيم خلقه ما بين السماء الى الأرض}**[٢]، واتە: ئەوە (جبریل)ە، کە بەو شێوە حەقیقیەی خوا خوڵقاندوویەتی لەسەری، ئەو دووجارە نەبێ نەمبینیوە، بینیم لە ئاسمان هاتەخوار شێوە حەقیقییەکەی ئەوەندە گەورە بوو، نێوانی ئاسمانو زەوی پڕ کردبوو، دوایی عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: (أو لم تسمع أن الله يقول: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعام.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە، کە (عبدالله بن مسعود) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (جبریل)ی بینیوە، کە (٦٠٠) باڵی هەبووە: **{أن رسول الله ﷺ رأى جبريل له ستمئة جناح}** رواه البخاري ومسلم[٣].

---

١) وەك (أحمدو بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوەو ئەوەی پرسیاریشی کردوە (مسروق) بووە، بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(١٣٢٩).

٢) بڕوانە: (صحيح البخاري): ٤٨٥٥، وە (صحيح مسلم): ٤٣٨.

٣) البخاري: ٣٢٣٢، ومسلم: ٤٣١.

بەڵام بەداخەوە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان لە تەفسیرو لێكدانەوەی ئەو ئایەتانەی سوورەتی (النجم)دا بەهەڵەداچوونو وایانزانیوە ئەوە، كە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴾ مەبەست پێی خوای بێوێنەیە! كە لەڕاستیدا ئەوە لەگەڵ گەورەیی‌و پاكیی‌و بێهاوتایی خوادا ناگونجێ، وە مەبەستیش پێی ئەوە نیە، وەك پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ڕوونی كردۆتەوە، لەكاتێكدا كە (عائشة) لێی دەپرسێ!

كەواتە: جارێك پێغەمبەر لەسەر زەوی جیبریلی دیوە لەسەر شێوەی خۆی، وە جارێكی دیكەش لە ئاسمان بینیویەتی، كە بەرزبۆتەوە بۆ ئاسمان.

ئنجا ئەوەی كە پێویستە لەوبارەوە بزانرێ، ئەوەیە كە شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ بە جەستەو ڕووح بووە، نەك تەنها بە ڕووح، وە ئەگەر تەنیا بە خەون بووایە، كافرەكان ئەوەندە ڕەخنەیان نەدەگرت (وەك دوایی باسی دەكەین) كە زۆر ڕەخنەیان گرتوە، گوتوویانە: چۆن بەیەك شەو موحەممەد لە مەككەوە چووە بۆ فەلەستین دوایی لەوێشەوە بەرزبۆتەوە بۆ ئاسمانەكان؟! ئەگەر فەرمووبای خەونم بینیوە، ڕەخنەیان لێ نەدەگرت، چونكە هەموو كەس دەتوانێ بە خەون بچێتە ئەوپەڕی دنیایە، هەروەها ئایەتەكانیش زۆر ڕوونن، كە دەفەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا ﴾، چونكە (عبد) ئەوەیە، كە لە جەستەو ڕووح پێك دێتو، بەندایەتی كردنیش بە ڕووحو جەستە هەردووكیان ئەنجام دەدرێ، یان لە سوورەتی (النجم)دا، كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴾، واتە: چاوی پێغەمبەر ﷺ لای نەدا لەو سنوورەی، كە بۆی دیاری كرابوو، ئەوانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ بە جەستەو بە ڕووح ئەو سەفەرە موبارەكەی كردوە، هەروەها (مسروق) دەڵێ: پرسیارم لە (عائشة) كرد -خوای لێی ڕازی بێ- دەربارەی ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ خوای بینیوە لە میانی شەوڕۆو بەرزبوونەوەیدا یان نا؟

www.alibapir.com

(عائشة) لە وەڵامدا گوتی: پاكیی بۆ خوا، مووەكانم وەستان (گرژ بوون) لە ئەنجامی ئەو قسەیەدا كە تۆ كردت! [1]

لە حەدیسێكی دیكەدا (مەسروق) دەڵێ: لە (عائشة)م پرسی ئەی بۆ خوای -عزّ وجلّ- دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰ إِلَىٰ عَبْدِهِ مَا أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ النجم، (عائشة) لە وەڵامدا گوتی: (إنما ذاك جبريل كان يأتيه في صورة الرجل، وإنه أتاه هذه المرة في صورته، التي هي صورته فسدَّ الأفق) رواه البخاري ومسلم[2]، واتە: ئەوە (جبريل)ە، پێشتر لەسەر شێوەی پیاو دەهاتە لای، بەڵام ئەم جارەیان لەسەر شێوە حەقیقییەكەی، كە خوا لەسەری خوڵقاندوە، هاتۆتە لای، كە هەموو ئاسۆی پڕ كردوە.

## چۆنیەتی شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ :-

پێشتر شتێكمان باسكرد دەربارەی شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ كە لە ئایەتی یەكەمی سوورەتی (الإسراء)دا باسی شەوڕۆی پێغەمبەر ﷺ دەكاتو، هەژدە ئایەتی سوورەتی (النجم)یش باسی بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ دەكەن، لەم فەرمایشتانەشدا، كە لە هەردوو (صحيح)ی (بخاري ومسلم)دا هاتوون، باسی چۆنیەتی ئەو سەفەرە موبارەكەی پێغەمبەر ﷺ كراوە، بە شەو لە مەككەوە بۆ قودسو پاشان بەرزبوونەوە لەوێوە بەرەو ئاسمانەكان: {قال أنس بن مالك كان أبو ذر رضي الله عنه يحدِّث أن رسول الله ﷺ قال: **(فُرِجَ سَقْفُ بيتي وأنا بمكة، فنزل جبريل فَفَرَجَ صدري، ثم غسله بماء زمزم، ثم جاء بطست من ذهب، ممتلىء حكمة وإيمانا، فأفرغها في صدري، ثم أَطْبَقَهُ، ثم أخذ بيدي**

---

١) صحيح مسلم: ٤٤٠، و (صحيح البخاري): ٤٨٥٥.

٢) صحيح البخاري: ٣٢٣٥، و(صحيح مسلم): ٤٤١

**فَعَرَجَ بِي إلى السماء....)**[١]، واتە: (أنس بن مالك) دەڵێ: (أبو ذر) باسی دەكرد، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە مەككە بووم سەقفی خانوەكەمان لێك بۆوەو (جبريل)ی لێهاتە خوار، سینەی لەت كردم، وە دڵو هەناوو سینەمی بە ئاوی زەمزەم شوردەوە، دوایی تەشتێكی زێڕی هێنا، كە پڕبوو لە حیكمەتو ئیمان، هەمووی لەنێو سینەی من كرد، دوایی سینەمی بەیەكەوە نووساندەوە، پاشان دەستی گرتم بەرەو ئاسمانەكان بەرزی كردمەوەو سەری خستم.

وە لە فەرموودەیەكی دیكەدا ئەنەس چۆنیەتی ئەو بەرزبوونەوەیە دەگێڕێتەوە: (عن أنس بن مالك، أن رسول الله ﷺ قال: **{أُتيتُ بالبُراق، وهو دابة أبيض طويل فوق الحمار، ودون البغل، يضع حافره عند منتهى طَرْفِهِ، قال: (فركبته حتى أتيت بيت المقدس)، قال: (فربطته بالحلقة التي يربط به الأنبياء)، قال: (ثم دخلت المسجد، فصليت فيه ركعتين، ثم خرجت فجاءني جبريل عليه السلام بإناء من خمر، وإناء من لبن، فاخترت اللبن، فقال جبريل ﷺ: اخترت الفطرة، ثم عُرِجَ بنا إلى السماء، فاستفتح جبريل فقيل من أنت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: وقد بعث اليه؟! قال: قد بعث اليه، فَفُتِحَ لنا فاذا أنا بآدم فرحَّب بي و دعا لي بخير، ثم عُرِجَ بنا الى السماء الثانية فاستفتح جبريل عليه السلام، فقيل: من أنت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: وقد بعث اليه؟ قال: قد بعث اليه، ففتح لنا، فإذا أنا بابني الخالة: عيسى بن مريم، و يحيى بن زكريا - صلوات الله عليهما- فرحَّبا بي ودعوا لي بخير، ثم عرج بنا الى السماء الثالثة، فاستفتح جبريل عليه السلام، فقيل: من أنت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: وقد بعث اليه؟ قال: قد بعث اليه، ففتح لنا فإذا أنا بيوسف وقد أعطي شطر الحسن، فرحَّب ودعا لي بخير، ثم عرج**

١) صحيح البخاري: ٣٣٤٢، وصحيح مسلم: ٤١٣، واللفظ للبخاري.

بنا الى السماء الرابعة، فاستفتح جبريل ﷺ، فقيل: من أنت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: وقد بعث اليه؟ قيل: قد بعث اليه؟ ففتح لنا فإذا أنا بأدريس، فرحَّب ودعا لي بخير: قال تعالى -عزّ وجلّ- ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾﴾ مريم، ثم عُرِجَ بنا الى السماء الخامسة، فاستفتح جبريل ﷺ، فقيل: من أنت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: وقد بعث اليه؟ قيل: قد بعث اليه، ففتح لنا فإذا أنا بهارون، فرحَّب ودعا لي بخير، ثم عُرِجَ بنا الى السماء السادسة، فاستفتح جبريل ﷺ، فقيل: من أنت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: وقد بعث اليه؟ قال: قد بعث اليه، ففتح لنا فإذا أنا بموسى، فرحَّب ودعا لي بخير، ثم عُرِجَ بنا الى السماء السابعة، فاستفتح جبريل ﷺ، فقيل: من انت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: وقد بعث اليه؟ قال: قد بعث اليه، ففتح لنا فإذا أنا بإبراهيم مُسْنِداً ظهره الى البيت المعمور واذا هو يدخله كل يومٍ سبعون الف ملك لايعودون اليه، ثم ذهب بي الى سدرة المنتهى، واذا ورقها كآذان الفيلة واذا ثمرها كالقلال، قال: فلما غشيها من امر الله ماغشى، تغيرت فما أحدٌ من خلق الله يستطيع ان ينعتها من حسنها فأوحى الله اليّ ما أوحى، ففرض عليّ خمسين صلاة في كل يوم وليلة، فنزلت الى موسى فقال: ما فرض ربّك على أمتك؟ قلت: خمسين صلاة، قال: ارجع الى ربّك فاسأله التخفيف، فأن أمتك لايطيقون ذلك، فأني قد بلوت بني اسرائيل وخبرتهم، فرجعت الى ربّي، فقلت يا ربّ خفّف عن أمتي! فحط عني خمساً، فرجعت الى موسى فقلت، حط عني خمساً، قال: إن أُمتك لا يطيقون ذلك فارجع الى ربّك فاسأله التخفيف، قال: فلم أزل أُراجع بين ربّي (تبارك وتعالى) وبين موسى ﷺ حتى قال: يا (محمد)! انهن خمس صلوات كل

**يوم وليلة، بِكُلِّ صلاة عشر فذلك خمسون صلاة، ومن هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة، فان عملها كتبت له عشراً، ومن هَمَّ بسيئة فلم يعملها لم تكتب له شيئاً، فأن عملها كتبت سيئة واحدة، قال: فنزلت حتى انتهيت الى موسى، فأخبرته فقال: ارجع الى ربّك فاسأله التخفيف، فقال: رسول الله ﷺ فقلت: قد رجعت الى ربّي حتى استحييت منه[1]}.**

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ چۆنیەتی سەفەرەکەیمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ: (بوراقیان بۆ هێنام، کە ئاژەڵێکی سپی درێژە، لە گوێدرێژ گەورەترە، وە لە ئێستر بچووکترە، سمی لە کۆتایی شوێنێك دادەنێ، کە حوکمی چاو دەگاتێ، (واتە: هەر بازێکی بە ئەندازەی بینینی چاوە، کە تەنها خوا دەزانێ چاوی چەندە حوکم دەکا)، سواری بووم هەتا هاتمە (بيت المقدس)، دوایی (بوراق)ەکەم بەستەوە بە ئەڵقەیەك، کە هەموو پێغەمبەران -عليهم السلام- پێیان بەستۆتەوە (دیارە هەموو پێغەمبەرانی دیکەش -عليهم السلام- ئەو سەفەرە ئاسمانییەیان هەبووە، بەڵام مەرج نیە هەموویان گەیشتبنە ئەو شوێنەی، کە پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشتوە) ئنجا چوومە مزگەوتی (الأقصى)، دوو ڕکات نوێژم تێدا کردو دوایی چوومە دەر، دوایی (جبريل) هات، قاپێك شەرابو قاپێك شیری بۆ هێنام، قاپە شیرەکەم هەڵبژارد، (جبريل) گوتی: ئەوەی، کە لەگەڵ سروشتی ساغدا دەگونجێ ئەوەت هەڵبژارد، دوایی بەرزکراینەوە بۆ ئاسمان، (پێغەمبەر ﷺ سواری بوراق بوو، بەڵام -جبريل- پێویستی بە سواریی بوراق نەبووە).

ئنجا جبریل داوای کرد، کە دەرگای بۆ بکەنەوە، گوتیان تۆ کێی؟

گوتی: (جبريل)م.

گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟!

---

١) صحيح مسلم: ٤٠٩، وكذلك رواه البخاري، بلفظ قريب منه.

گوتی: موحەمـــمەد.

گوترا: ئایا کراوەتە پێغەمبەر؟

گوتی: بەڵێ کراوەتە پێغەمبەر، دەرگامان بۆ کرایەوە، تەماشام کـرد لـە ئاســمانی یەکەم ئادەمە -سەلامی خوای لێبێ- بەخێری هێنام، وە دووعـای خێری بۆ کردم.

دوایی بەرەو ئاسـمانی دووەم بەرز کراینەوە.

(جبـریل) داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە.

گوترا: تۆ کێی؟

گوتی: (جبـریل)م.

گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟!

گوتی: موحەمـــمەد.

گوترا: ئایا کراوەتە پێغەمبەر؟

گوتی: بەڵێ کراوەتە پێغەمبەر.

دەرگاکـەمان بـۆ کرایــەوە دوو کـوڕە پوورەکانــم بینیـــن (ئەوانـەی، کـە دایکیـان خوشـکن) (عیسـی)ی کـوڕی (مـریم)و (یـحیي) کـوڕی (زکریـا) ئـەوانیش بـەخێریان هێنامو دووعـای خێریان بۆ کردم.

دوایی بەرزکراینەوە بۆ ئاسـمانی سێیەم.

(جبـریل) داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە.

گوترا: تۆ کێی؟

گوتی: (جبـریل)م.

گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟!

گوتی: موحەمـــمەد.

گوترا: ئایا کراوەتە پێغەمبەر؟

www.alibapir.com

گوتی: کراوەتە پێغەمبەر.

ئنجا دەرگامان بۆ کرایەوەو (یوسف)م بینی، کە نیوەی جوانیی پێدرابوو، ئەویش پێشوازیی لێکردمو دووعای خێری بۆ کردم.

دوایی بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی چوارەم.

(جبریل) داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە.

گوترا: تۆ کێی؟

گوتی: (جبریل)م.

گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟

گوتی: موحەممەد.

گوترا: ئایا کراوەتە پێغەمبەر؟

گوتی: کراوەتە پێغەمبەر.

دەرگامان بۆ کرایەوەو لەوێ (إدریس)م بینی، ئەویش پێشوازیی کردمو دووعای خێری بۆ کردم، کە خوای زاڵو شکۆدار لەبارەیەوە دەفەرموێ: (وە پلەوپایەمان بەرزکردەوە).

دوایی بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم.

(جبریل) داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە.

گوترا: تۆ کێی؟

گوتی: (جبریل)م.

گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟!

گوتی: موحەممەد.

گوترا: ئایا کراوەتە پێغەمبەر؟

www.alibapir.com

گوتی: کراوەتە پێغەمبەر.

ئنجا دەرگامان بۆ کرایەوە (هارون)م لەوێ بینی، پێشوازیی لێ کردمو دووعای خێری بۆ کردم.

دوایی بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی شەشەم.

(جبریل) داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە.

گوترا: تۆ کێی؟

گوتی: (جبریل)م.

گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟

گوتی: موحەممەد.

گوترا: ئایا کراوەتە پێغەمبەر؟

گوتی: کراوەتە پێغەمبەر.

ئنجا دەرگامان بۆ کرایەوە (موسی)م بینیو پێشوازی کردمو، دووعای خێری بۆ کردم.

دوایی بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم.

(جبریل) داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە.

گوترا: تۆ کێی؟

گوتی: (جبریل)م.

گوترا: کێت لەگەڵ دایە؟

گوتی: موحەممەد.

گوترا: ئایا کراوەتە پێغەمبەر؟

گوتی: کراوەتە پێغەمبەر.

دەرگامان بۆ کرایەوەو، (ابراهیم)م بینی پشتی بە (بیت المعمور)ە[1]وە دابوو، کە هەموو ڕۆژێ حەفتا هەزار فریشتە دەچوونە نێوی‌و نەدەگەڕانەوە بۆی، دوایی بەرەو (درەختی کۆتایی) بردرام، گەڵاکانی وەکو گوێی فیلان بوون، بەرەکەشی وەکو گۆزەو کووپە وابوون، کاتێك کە داپۆشی ئەوەی، کە داپۆشی بە فەرمانی خوا، ئەو درەختە بەشێوەیەك جوان بوو، کە هیچ کەس لە دروستکراوەکانی خوا ناتوانێ وەسفی جوانییەکەی بکات، دوایی خوا ئەوەی بە پێویستی زانی قسەی لەگەڵ کردم[2]، وە وەحی بۆناردم، وە پەنجا نوێژی لە شەوو ڕۆژێکدا لەسەر فەرز کردم، ئنجا دابەزیمە ئاسمانی شەشەم، گەیشتمە (موسی) عليه السلام، گوتی: پەروەردگارت چی لەسەر ئوممەتەکەت فەرز کرد؟ گوتم: شەوو ڕۆژی پەنجا نوێژ، گوتی: بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت، وە داوای لێبکە بۆت سووك بکات، ئۆممەتەکەت ئەوەندەیان بۆ جێبەجێ ناکرێ، چونکە من لەگەڵ (بني اسرائیل)دا ئێش‌و ژانی زۆرم بینیوەو شارەزایان بووم.

دوایی گەڕامەوە لای پەروەردگارم (ئەو شوێنەی کە جاری یەکەم قسەی لەگەڵ کردم)، وە گوتم: ئەی پەروەردگارم! لەسەر ئۆممەتەکەم سووك بکە، پێنج نوێژی لابردن، دوایی گەڕامەوە بۆ لای (موسی) گوتم: پێنج نوێژی لابردن، ئەویش گوتی: ئوممەتەکەت ئەوەندە ناتوانن داوا لە پەروەردگارت بکە لەسەرت سووك بکا، بەو شێوەیە لەنێوان خوا -تبارك وتعالی- (موسی)دا عليه السلام هاتم‌و چووم تا خوا فەرمووی: ئەی موحەممەد! ئەوانە پێنج نوێژن لە هەر شەوو ڕۆژێکدا، هەر نوێژێکیش بە دە نوێژە، ئەوە پەنجا نوێژ، وە هەرکەسێك بیەوێ چاکەیەك بکات‌و دڵی لەسەر بچەسپێ، ئەگەر چاکەکەش نەکات، چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، ئەگەر کردی بە دە چاکە بۆی دەنووسرێ، وە هەر کەسێکیش ویستی خراپەیەك بکات، بەڵام نەیکرد

---

١) (بیت المعمور) واتە:ماڵی ئاوەدان، پەرستگایەکە ڕۆژانە حەفتا هەزار فریشتە زیارەتی دەکەن.

٢) خوای پەروەردگار لێرەدا ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا کردوە، وەك چۆن ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ (موسی)دا کردوە.

ئەوە هیچی بۆ نانووسرێ، وە ئەگەر کردیشی یەك خراپەی بۆ دەنووسرێ، فەرمووی: ئنجا دابەزیم هەتا هاتمە لای (موسی)و هەواڵم پێدا، گوتی: بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت وە داوای لێ بکە بۆت سووك بکا، {دیارە (موسی) ﷺ لەگەڵ ئێمە زۆر دڵسۆز بووە، کە بێگومان هەموو پێغەمبەرانی دیش هەروان} منیش گوتم: ئەوەندە گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم وە داوام لێکردوە هەتا شەرمم لێکرد).

دیارە لەو هاتن‌وچوونەی پێغەمبەرو ﷺ کەمکردنەوەی نوێژەکان لەلایەن خوای بە بەزەییەوە، ڕێزلێنانی خوا بۆ پێغەمبەرو بەزەیی خوای پەروەردگار دەردەکەوێ، وە دڵسۆزی (موسی)ش بۆ پێغەمبەرو ﷺ ئۆممەتەکەی دەردەکەوێ، چونکە پێغەمبەران برای یەکتر بوون‌و وەك چۆن بۆ یەکتر دڵسۆزبوون، ئاواش بۆ ئۆممەتەکانی یەکتریش دڵسۆزن.

لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم، کە بۆچی (موسی) -سەلامی خوای لێبێ- لەو مەسەلەیەدا دەبێتە مامۆستاو چاوساغی (محمد) ﷺ لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەو گەورەی پێغەمبەران‌و هەموو بەشەرییەتە؟!

حیکمەتەکەی ئەوەیە کە (موسی) وەك بۆخۆی گوتوویەتی: (لقد بلوت بني اسرائيل) لە ریوایەتێکی دیدا دەڵێ: (لقد عالجت بني اسرائيل اشد المعالجة)، واتە: (موسی) قۆناغی دروستکردنی کۆمەڵگاو کیانی ئیسلامیی بینیوە، بەڵام موحەممەد ﷺ جارێ لە سەرەتای ئەم قۆناغە دابووە، واتە: (موسی) شارەزاییی‌و ئەزموونێکی هەبووە، کە موحەممەد ﷺ نەیبووە، ئنجا جێی سەرسوڕمانیش نیە پیاوێك گەورەتر بێ لە یەکێکی دیکە، بەڵام ئەو زانیارییەی لەلای ئەوەی دیکە دەست دەکەوێ، لەلای گەورەکە نەبێ.

## کاردانەوەی کافرەکان بۆ ئەم سەفەرەی پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا بۆمان باس دەکات، کە تووشی چی بووە لەکاتێکدا کە ئەو بەسەرهاتە بۆ قوڕەیشییەکان دەگێڕێتەوە: **{عن ابي هريرة** رضي الله عنه

**قال: قال رسول الله ﷺ لقد رأيتني في الحجر وقريش تسألني عن مسراي، فسألتني عن أشياء من بيت المقدس لم أثبتها، فكربت كربة ما كربتُ مثله قط، قال: فرفعه الله لي أنظر اليه ما يسألوني عن شيء الاّ أنبأتهم به وقد رأيتني في جماعة من الأنبياء... فحانت الصلاة فأممتهم فلمّا فرغت الصلاة قال قائل، يا (محمد)! هذا مالك صاحب النار فسلّمْ عليه، فالتفتُّ اليه فبدأني بالسلام}** رواه مسلم[1]، واته: (أبو هريرة) دەگێڕێتەوە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژێك لە (حجر)[2] بووم، قورەیش پرسیاریان لێکردمو (گوتیان: دەڵێی من چووم بۆ -بیت المقدس- و بەرزبوومەوە بۆ ئاسمانەکان، وەرە بۆمان باسی شاری -قودس-و مزگەوتی -الأقصى- بکە) هەندێك شتیان لێ پرسیم، کە نەمتوانی بوو لە مێشکی خۆمدا بیچەسپێنم، بۆیە بەشێوەیەك خەفەتم خوارد، کە قەد خەفەتی وام نەخوارد بوو، بەڵام خوا (بیت المقدس)ی هێنایە پێش چاوم، تەماشام دەکرد، ئەوانیش پرسیاریان لێ دەکردم کە فلان شتەی چۆنە، فلان چۆنە...؟! هتد، منیش بۆم وەسف کردن، وە هەر پرسیارێکیان دەکرد جوابم دەدانەوە، وە خۆم بینی، لە (بيت المقدس) لەگەڵ کۆمەڵێك لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کاتێك وەختی نوێژ هات پێش نوێژییم بۆ کردن (تاکو دەرکەوێ کە موحەممەد سەروەری هەموو پێغەمبەرانە، وە ئەو پەیامەش کە بەودا نێرراوە بەڕاست دانەرو تەواوکەری پەیامو بەرنامەی هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی... وە کاتێك نوێژەکە تەواو بوو، یەکێك بانگی کردم، وتی: ئەی موحەممەد! ئەوە (مالك)[3] سەرپەرشتیاری دۆزەخە سەلامی لێبکە، منیش ئاوڕم لێ دایەوە، پێش ئەوەی من سەلامی لێ بکەم ئەو سەلامی لە من کرد ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ باسی سەفەری شەوڕۆو بەرزبوونەوە (إسراء

---

١) صحيح مسلم، برقم: ١٧٢.

٢) (حجر) بريتيه لەو پاردۆكەيەى، كە لە نزيك كابەيە.

٣) (مالك) ئەو فريشتەيە كە بەسەر دۆزەخ ڕادەگات.

ومعراج)ی گێڕایەوەو موشریکەکان بیستیان، باوەڕیان پێ نەکردو بە درۆیان زانی، وە ئەو بەسەرهاتە مایەی تاقیکردنەوە بوو بۆ خەڵکی، وە هەندێك لەوانەی مسوڵمانیش بوون کەوتنە گومانەوە، بۆیە موشریکەکان هاتنە لای (أبوبکر) -خوا لێی ڕازی بێ- پێیان گوت: دەڵێی چی سەبارەت بەو قسەیەی برادەرەکەت کە دەڵێ: ئەمشەو شەوڕەوییم پێکراوە بۆ (بیت المقدس)؟!

ئەویش گوتی: ئاوا دەڵێ؟

گوتیان: بەڵێ.

گوتی: ئەگەر وا بڵێ ڕاست دەکات.

گوتیان: باشە تۆ باوەڕی پێ دەکەی کە ئەمشەو براوەتە (بیت المقدس)و پێش ئەوەی ڕۆژ ببێتەوە گەڕاوەتەوە؟

وتی: بەڵێ من باوەڕی پێ دەکەم، کە لەوەش زیاتر بڵێ، دیارە لەبەر ئەوەش ناوی لێنرا: (الصدیق)[١].

ئنجا ئایا پێغەمبەر ﷺ لە شەوی (الإسراء والمعراج)دا خوای پەروەردگاری بینیوە یان نا؟!

زانایان لەوبارەوە مشتومڕی زۆریان کردوە، بۆ وێنە: یەکێك لەوانەی، کە دەڵێ بینیویەتی (عبدالله بن عباس)ە، بەڵگەکەشی ئەوەیە دەڵێ: وەك چۆن (ابراهیم خلیل الله)یەوە (موسى كليم الله)یە پێغەمبەریش ﷺ خوای بەرزو بێوێنەی بینیوە، بەڵام (عائشة) وە زۆربەی زانایان بڕوایان وایە، کە نەخێر موحەممەد ﷺ خوای پەروەردگاری نەبینیوە، (مسروق) کە یەکێکە لە زانایانی (تابعين) دەڵێ: لای (عائشة) بووم، پێی گوتم فلان کەس: (ثلاث من تكلمٍ بواحدة منهن فقد أعظم على الله الفرية، قلت ماهن؟ قالت من زعم ان محمداً رأى ربّه فقد اعظم على الله

---

١) المستدرك (٣\٦) قال الحاكم هذا الحديث صحيح الاسناد، وأقره الذهبي.

www.alibapir.com


الفريـة، قال وكنت متكأً فجلسـت فقلت: يا أم الـمؤمنين أنظريني ولا تعجليني، ألـم يقل الله – عزّ وجـل-: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ ﴾ التكـوير، ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾ النجـم؟!! فقالت: أنا أول هذه الأُمة سأل عـن ذلك رسول الله، فقال: (انّما هو جبريل لـم أره على صورته التي خلق عليها غيـر هاتين الـمرتين...) فقالت أو لـم تسـمع ان الله يقـول: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعـام، أو لـم تسـمع أن الله يقـول: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ الشورى[1] ...)، واته: سێ شت هەن هەركەس یەكیان بڵێ، ئەوە بوختانی بەناوی خواوە كردوە، گوتم: ئەی دایكی ئیمانداران ئەو سێ شتانە چین؟

گوتی: هەر كەسێك پێی وابێ موحەممەد ﷺ پەروەردگاری خۆی بینیوە، ئەوە بوختانی كردوە، منیش كە لەوكاتەدا پاڵمدابۆوە هەڵسامەوەو دانیشتمو، گوتم: ئەی دایكی بڕواداران! پەلە مەكە، چاوەڕێم بكە پرسیارم هەیە! مەگەر خوای زاڵو شكۆدار نەیفەرمووە: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ ﴾ التكـوير، ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾ النجمله وەڵامدا گوتی: من یەكەمینی ئۆممەت بووم، كە لەوبارەوە پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كردوە، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوە (جبریل)ە... (وەكو پێشتریش باسمان كرد).

دوایی (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێ- بەڵگەی بۆ هێنامەوەو گوتی: مەگەر خوا نافەرموێ: چاوەكان نایبینن بەڵام خوا چاوەكان دەبینێ، وە خوا زۆر پەنهانكارەو زۆر شارەزایە، یاخود ئەوە، كە دەفەرموێ: هیچ بەشەرێك بۆی نیە، كە خوا بدوێنێو

---

١) صحيح مسلم: ٤٣٨، و (صحيح البخاري): ٤٨٥٥، واللفظ لـمسلم.

www.alibapir.com

قسەی لەگەڵدا بکات مەگەر لە ڕێی وەحی‌یەوە یاخود لە پشتی پەردەوە، یاخود ڕەوانەکراوێك بنێرێت بە فەرمانی خوا ئەوەی کە خوا دەیەوێ پێی ڕابگەیەنێ وەکو پەیامێك، بێگومان خوا بەرزەو کاربەجێیە)، (واتە: مادام خوای پەروەردگار وا دەفەرموێ کەواتە: هیچ کەسێك بۆی نیە خوای بێهاوتا ببینێ لە دونیادا).

شتی دووەم لەوانەی کە (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ هەرکەسێك بیانلێت بوختانی کردوە ئەوەیە کە: هەر کەسێك بڵێت پێغەمبەر ﷺ شتێکی شاردۆتەوە ئەوە درۆی کردوە، چونکە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧﴾ المائدة، واتە: ئەی پێغەمبەر! ئەوەی بۆت نێردراوەتە خوار لەلایەن پەروەردگارتەوە ڕای بگەیەنە، ئەگەر وانەکەی پەیامی خوات نەگەیاندوە).

شتی سێیەمیش ئەوەیە کە: هەر کەسێك بڵێ پێغەمبەر ﷺ دەزانێ سبەینێ چ دەقەومێ، ئەوە ئەوکەسە درۆی کردوە بەناوی خواوەو بوختانی کردوە، چونکە خوا -جل شأنە- دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ٦٥﴾ النمل، واتە: بڵێ نهێنی ئاسمانەکانو زەوی جگە لە خوا هیچ کەس نایزانێ، وە ئەوان هەست ناکەن چ کاتێ زیندوو دەکرێنەوە.

هەروەها ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ خوای نەبینیوە (جل شأنە): **{عن عبدالله بن شقيق عن أبي ذر، قال: سألت رسول الله ﷺ هل رأيت ربّك؟! قال: نورٌ أنّى أراه}** رواه مسلم[1]، واتە: (أبوذر) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام پرسی: ئایا پەروەردگاری خۆتت بینی (شەوی

---

١) صحيح مسلم: ٤٤٢.

www.alibapir.com


معراج) فەرمووی: (ڕووناکییە چۆنی ببینم!!)، هەروەها ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ خوای تاك و پاکی نەبینیوە، کە دەفەرموێ: **{ان الله – عزّ وجلّ– لاینام ولا ینبغي له أن ینام، یخفض القسط ویرفعه یرفع الیه عمل اللیل قبل عمل النهار، وعمل النهار قبل عمل اللیل، حجابه النور (وفي روایة أبي بكر: النار، لو كشفه لأحرقت سُبُحات وجهه ما انتهی الیه بصره من خلقه}** رواه مسلم[1]، واته: خوای زاڵ و شکۆدار ناخەوێ و ناشگونجێ بخەوێ، دادگەریی نزم دەکاو بەرز دەکات، کردەوەی شەوی بۆ بەرزدەکرێتەوە پێش ڕۆژێ، وە کردەوەی ڕۆژێشی بۆ لا بەرز دەکرێتەوە پێش شەوێ، وە ئەو پەردەیەی کە خوای پەنهان کردوە لە دروستکراوەکانی ڕووناکییە، {لە ڕیوایەتێکدا، کە ڕاوییەکەی ناوی (أبوبكر)ە دەڵێ: ئەو پەردەیە ئاگرە} ئەگەر ئەو پەردەیە لابدات، پڕشنگی ڕووی هەرچی دەکەوێتە بەر مەودای دیتنی خوا، لە دروستکراوەکانی دەسووتێ و لە بەین دەچێ، کەواتە: ڕای بەهێزتر (راجح) ئەوەیە کە نەیبینیوە.

بەڵام لە بەهەشتدا ئیمانداران خوا-جل شأنه- دەبینن و پێکهاتەی جەستەیی و ڕووحی ئەهلی بەهەشت جیایە لەوەی دونیایان، بەهەمان شێوە پێکهاتەی ئەهلی جەهەننەمیش جیایە لە هی دنیایان، وە پەروەردگار لەوێ بەجۆرێکی دی ئێمە دروست دەکاتەوە، بەشێوەیەك کە بتوانین خوای بێ هاوتا ببینین بێ ئەوەی کە بفەوتێین و لە بەین بچین، هەر بۆیەش کاتێك کە (موسی) -سەلامی خوای لێبێ- داوا لە خوای کاربەجێ دەکات کە بیبینێ، دەفەرموێ: ﴿... قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ ... ﴿١٤٣﴾﴾ الأعراف، واتە:

١) صحیح مسلم: ٤٤٤ .

www.alibapir.com

هەرگیز ناتوانی بم بینی (لە دونیادا) تەماشا ئەو شاخە بکە ئەگەر خۆی ڕاگرت، ئـەوا تۆش دەتوانی مـن ببینی، کاتێك پەروەردگاری خۆی پێشانی ئەو شاخەدا لـە ئەنجامـدا شاخەکە وردو خاش بوو وە مووساش لەهۆش خۆی چوو، دوایـی کـە بـە هـۆش خـۆی هاتەوە فەرمووی: پاکیی بۆ تۆ گەڕامەوە بۆلات...

کەواتە: لە دونیادا ناگونجێ کەس خوای پەروەردگار ببینێ، بەڵام لە بەهەشتدا هـەر کەسە بە ئەندازەی ئیمانی خـۆی خـوای پـەروەردگار دەبینـێ، وەك لـە بـەرگی دووەمو پێنجەمی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی‌دا باسـمان کردوە.

خـوای بەخشـــندە لـەو کەســانەمان بگێـڕێ، کـە لـە دیـداری خـۆی بەهرەمەنـدیان دەکات.

لە کۆتایی ئەم کورتە بـاسو لێکۆڵینەوەیەمانـدا دەربـارەی شـەوڕۆوو بەرزبوونـەوە، دەڵێیـن:

١ - شەوڕۆییو بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ڕووحو لاشە بووە، چونکە:

أ/ بەندایـەتی بـە هەردووکیانـەوە دەکـرێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا ۚ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾ الإسراء.

کەواتە: شـەوڕۆکردنی خـوا بـە (عبد)ەکـەی ناگونجـێ مـەبەسـت پێـی خـەونو ڕووح بێ!!

ب/ ئەگـەر بـە ڕووحو لاشـە نەبووایـە کافرەکـانی قـوڕەیش ئینکارییـان نـەدەکرد، چونکە هەموو کەس دەتوانـێ بـە ڕووحو خـەون بـۆ زۆر شـوێنی دوور بـڕوات لـە ماوەیەکی کەمدا.

٢- دوای ئەو هەموو ئێش‌و ئازارەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئیسلام چێشتی، خوای بەبەزەیی ویستوویەتی ڕێزێکی تایبەتی لێبنێ‌و شەوڕۆیی پێ بکاو بەرزی بکاتەوە بۆ ئاسمانەکان.

٣- گرنگی‌و گەورەیی مزگەوتی (أقصى) دەردەکەوێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوڕۆیی بۆ کردوەو لەوێوە بەرزبۆتەوە.

٤- بینینی پێغەمبەران (علیهم السلام)، یەك بوون لە عەقیدەو ڕێرەوی گشتی ئیسلامەتییدا دەگەیەنێ، لەنێوان هەموویاندا.

٥- پێش نوێژیی کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆیان گەورەیی‌و سەروەریی پێغەمبەرمان دەگەیەنێ.

٦- پێویستبوونی نوێژ لە ئاسمانەکان لەسەر پێغەمبەرو ﷺ ئۆممەتەکەی، نیشانەی گەورەیی‌و کاریگەریی نوێژە.

٧- هەڵبژاردنی (شیر) بەسەر (شەڕاب)دا لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ڕاستیی‌و پێغەمبەرو سرووشتیی بوونی بەرنامەی خوا، کە لە قورئان‌و سوننەتدا بەرجەستەیە، دەگەیەنێ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معکم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## گـەڕان و هـەوڵدانی پێغـەمبەر ﷺ بۆ دۆزینـەوەی پێگـەیەك:-

دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە شیوەکانی (أبي طالب) هاتەدەرو ئەو دەنگ دابڕینەی، کە (قریش) لەگەڵ (بني هاشم)دا کردبوویان کۆتایی پێ هات، پاش ماوەیەکی کەم هەرکام لە پشتیوانە دەرەکیی و ناوەکییەکەی پێغەمبەر ﷺ، واتە: (أبو طالب)ی مامیو (خدیجة)ی خێزانی -خوا لێی ڕازی بێ- وەفاتیان کرد.

دوای نەمانی (أبو طالب)، کە ڕیش سپیو کەسایەتییەکی گەورەی (بني هاشم) بوو، ئازارو ئەشکەنجەی پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵەکانی بەگشتی لەلایەن قوڕەیشییەکانەوە زیادی کرد.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەوە کەوتە خولیاو بیری ئەوەی، کە پێگەیەکی دیکە بۆ بانگەوازەکەی بدۆزێتەوە، وە ئەو بارودۆخو کەشو هەوایەی مەککە کە زۆر خنکێنەر بوو، بگۆڕێ، وە پێغەمبەر ﷺ ویستی ئەو بانگەوازو پەیامەی کە لە مەککە تەنگی پێ هەڵچنراوەو ئێچکی لێ وێك هێنراوەتەوە، بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی ئازاد، بۆ ئەم مەبەستەش دەستی کرد بە گەڕان، کە ئەمەش لە ساڵی (١١)یەمی پێغەمبەرایەتی دابووە، وەك (ابن اسحاق) دەڵێ:[1] پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە خۆڕانواندن لەسەر تیرەکانی عارەبو خۆی پێدەناساندنو مەبەستو بانگەوازەکەی خۆی تێدەگەیاندن، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە خەڵکەکە دەهاتو ئەو عیبادەتو خواپەرستییانەی خۆیان لە مەککەو دەوروبەری مەککە ئەنجام دەدا، پێغەمبەر ﷺ بانگی دەکردن بۆ لای خواو تێی دەگەیاندن، کە پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراوە لەلایەن خواوە، وە داوای لێدەکردن کە بەڕاستی بزانن وە بەرگریی لێ بکەن، وە (ابن اسحاق) دەڵێ: (حسین بن عبدالله بن عبیدالله بن عباس) پێی گوتم: گوێم لە

١) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٢، ص(٢١٩)، ط١ دار ابن الهیثم.

(ربيعة بن عباد) بوو، كە بابی بۆی گێڕابۆوە، گوتوويەتی: (إني لغلام شاب مع أبي بمنى ورسول الله ﷺ يقف على منازل القبائل من العرب، فيقول: **{يابني فلان اني رسول الله اليكم، يأمركم ان تعبدوا الله ولا تشركوا به شيئاً وان تخلعوا ما تعبدون من دونه من هذه الأنداد وان تؤمنوا بي وتصدقوا بي وتمنعوني حتى أبيّن عن الله ما بعثني به}**)، واتە: بابی (ربيعة) دەڵێ: من گەنجێك بووم، كە تازە دەگەیشتمێ لەگەڵ بابم بووم لە (مینا) پێغەمبەر ﷺ لەسەر مەنزڵگای تیرەكانی عارەب دەوەستاو دەیگوت: ئەی (بني فلان)، واتە: ئەی (فلان عەشیرەت) من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە، خوا -جل شأنە- فەرمانتان پێدەكا بیپەرستن، وە هیچ شتێك نەكەن بە هاوبەشی، وە ئەوانەی كە دەیانكەن بە هاوبەش بۆ خوا فڕێیان بدەن، وە ئیمانم پێ بێننو بەڕاستم بزانن، وە پشتگیریيم بكەنو بەرگرییم لێ بكەن، تاكو ئەوەی كە خوا منی پێ ڕەوانە كردوە ڕای بگەیەنم.

دەڵێ: وە هەمیشە پیاوێك لە دوایەوە دەڕۆیشت، كە ئینسانێكی دەمو چاو درەوشاوەو جوان بوو، دوو كەزیی هەبوون، بەرگێكی عەدەنیی لەبەر دابوو، دوای ئەوەی، كە پێغەمبەر ﷺ لە قسەكانی خۆی دەبۆوە ئەو كابرایە دەیگوت: (يا بني فلان: ان هذا انّما يدعوكم ان تسلخوا اللات والعُزّى من أعناقكم وحلفائكم من الجن من بني مالك بن أقيش الى ما جاء به من البدعة والضلالة، فلا تطيعوه ولا تسمعوا منه)، واتە: ئەی هۆزی فلان، ئەم كابرایە (محمد) بانگتان دەكا، كە (لاتو عوززا) لە گەردنی خۆتان دابڕنن، هەروەها پەیوەندی بپچڕێنن لەگەڵ هاوپەیمانەكانتان لە (جن) لە (بني مالك بن أقيش) (ئەوە تیرەیەكی ناسراوی (جن) بووە) وە بانگتان دەكا بۆ ئەوەی، كە خۆی هێناویەتی لە شتی داهێنراوو گومڕایی، بە قسەی مەكەن، وە گوێی بۆ مەگرن، دەڵێ: منیش بە بابم گوت: ئەو كابرایە كێیە، كە بەدوای پێغەمبەر ﷺ دەكەوێتو بەرپەرچی دەداتەوە؟

گوتی: ئەوە مامیەتی (عبدالعزى بن عبدالمطلب) کە (أبو لهب)ە[1].

هەروەها (ابن هشام) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ چەند تیرەیەك کردوە، کە باسی چوار لەو تیرانەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: سەرەتا پێغەمبەر ﷺ چۆتە لای عەشیرەتی (کندة) لە مەنزڵگاو هەوارگەی خۆیان، کە گەورەو سەرۆك هۆزەکەیان ناوی (ملیح) بووە، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردوون بۆلای خوای زاڵو شکۆدار، وە خۆی پێ ناساندوونو ئیسلامی بۆ باس کردوون، بەڵام لێیان وەرنەگرتوە.

دوایی پێغەمبەر ﷺ چۆتە لای تیرەی (بني عبدالله) لە هۆزی (کلب) لە مەنزڵگای خۆیانو خۆی پێ ناساندوونو باسی ئیسلامی بۆ کردوون وە پێی گوتوون: **(یا بني عبدالله ان الله -عزّ وجلّ- قد أحسن اسم أبیکم)**، واتە: ئەی وەچەی (عبدالله) خوای بەرزو مەزن ناوی بابتانی کردوە بە ناوێکی چاك! دوایی بانگی کردوون بۆ خواپەرستییو بەراستدانانی پێغەمبەرایەتی خۆیو ئیسلامی بۆ باس کردوون، بەڵام ئەوانیش ئەو بانگەوازەیان لێ وەرنەگرتوەو بەرپەرچیان داوەتەوە.

هەروەها چووە بۆلای (بني حنیفة) ئەوانیش هەر لە مەنزڵگای خۆیان، بانگی کردوون بۆ تەنیا پەرستنی خواو خۆی پێناساندوون، بەڵام لە عارەباندا هیچ کەس وەکو ئەوان وەڵامی توندو خراپو ناقۆڵای نەبووەو زۆر بەشێوەیەکی ناشیرین وەڵامی پێغەمبەریان ﷺ داوەتەوە.

ئنجا چووە بۆلای (بنو عامر بن صعصعة) ئەوانیشی بانگ کردوە بۆ لای خواو خۆی پێناساندوون، وە پیاوێك لەو هۆزە بەناوی (بیحرة بن فراس) گوتی: بە خوا ئەگەر ئەو گەنجەی قورەیش بگرم عەرەبی پێ دەگرم! (هەڵبەتە ئەو کابرایە بۆیە وایگوتوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بە شانو شەوکەت بووە لە ڕووی قەدو قیافەوەو لە ڕووی عەقڵو تێگەیشتنو قسەزانییو زمانپاراوییو ڕەوشت بەرزییو هتدەوە، کامڵ بووە) دوایی (بیحرة) بە پێغەمبەری گوت: (أرأیت ان نحن بایعناك

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢١٨).

على أمرك ثم أظهرك الله على مَنْ خالفك، أيكون لنا الأمر من بعدك؟)، واتە: ئایا ئەگەر ئێمە پەیمانمان بەتۆدا پاشان خوا تۆی سەرخست بەسەر ئەوانەدا کە نەیارتن، ئایا لە دوای ئەوەی کە تۆ دەمری، سەرۆکایەتی ئەو دینە بۆ ئێمە دەبێ؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {الأمر الى الله يضعه حيث يشاء}، واتە: ئەوە پەیوەندی بە خواوە هەیە بە قسمەت کێی کرد، بۆ وی دەبێ.

ئەویش گوتی: (أفنهدف نحورنا للعرب دونك فإذا أظهرك الله كان الأمر لغيرنا؟! لاحاجة لنا بأمرك)، واتە: ئێمە سینگی خۆمان بکەینە قەڵغان لە بەرانبەر عەرەبداو دوای ئەوەی، کە خوا تۆی سەرخست، ئەو زەعامەتو گەورەییە بۆ غەیری ئێمە بێت؟! برۆ ئیشمان بەکاری تۆ نیە، واتە: ئەوانیش وەڵامیان نەدایەوە(١).

بەڵێ پێغەمبەر ﷺ کە هەرکەسو تیرەو هۆزێکی بانگ کردبێ بۆ خواپەرستییو ئیمان هێنان بە پێغەمبەرو ئیسلام، بەمەرجی پێدانی بەرپرسیارێتیو پارەو پووڵو تەماع بانگی نەکردوونو ویستوویەتی خەڵك بە قەناعەتو لەبەر خوا، دوای ئیسلام بکەونو فەرموویەتی: بەندایەتیی بەس بۆ خوا بکەنو، ئەگەر بەندەی چاك بن، خوا -جل شأنه- دەتانخاتە بەهەشتو لە دۆزەخ دەتانپارێزێ، بێگومان کاری ئیسلامیی تەنیا بەکەسانێك دێتە بەرهەمو بەرگرییو پشتگیرییو پشتیوانیی لێ دەکرێ، کە قەناعەتیان پێی بێ، نەك بەهۆی تەماعی دونیاوە دوای کەوتبن، چونکە هەرکاتێك ئەو تەماعە نەما، پشتی دین بەردەدەن.

ئنجا (إبن إسحاق) ئاوا کۆتایی بە باسەکەی خۆی دێنێ: (فكان رسول الله على ذلك من أمره، كلّما اجتمع له الناس بالموسم أتاهم يدعو القبائل الى الله والى الإسلام ويَعْرِضُ عليهم نفسه وما جاء به من الله من الهدى والرحمة، وهو لايسمع بقادم يَقْدِمُ مكة من العرب له اسم و شرف، الاّ تصدى له فدعاه الى الله و عرض عليه

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص(٢١٩).

ما عنـده)[١]، واتە: ئنجا پێغەمبەر ﷺ لەسەر کاری خۆی بەردەوام بوو هـەر کاتێـك خەڵك لە کاتی حەجدا کۆدەبوونەوە، دەچوو بۆلایـانو هۆزەکـانی بـانگ دەکـرد بـۆلای خواو خۆی پێدەناساندن، وە ئەو هیدایەتەو ڕەحمەتەی کە پێی نێررابوو دەیـخستـەڕوو، وە هیچ کەسێك نەبوو لەوانەی، کە پلەو پایەو شەرەفێکیان هەبوو لەنێو عارەبدا، کـە دەهاتن بۆ مـەککە، نەچێ بۆ لایانو بانگیان نەکـات بـۆلای خـوا، وە ئـەوەی کـە پێـی بوو بۆی باس دەکردن.

بەڵام لە هەموو ئەو هەوڵانەدا پێغەمبەر ﷺ بە نائومێدیی گەڕاوەتـەوەو باوەڕیـان پێنەهێنـاوە.

وە لەوبارەوە (ابن کثیـر) لە مێژووەکەی (البداية والنهاية)[٢]دا، بەسەرهاتێکمان لە (علـي بن ابي طالـب)ەوە بۆ دەگێڕێتـەوە، عـەلی –خـوا لێـی ڕازی بـی- دەڵـێ: دوای ئەوەی خوای بەرزو بڵند فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی کرد، کە خـۆی ڕانوێنـێ لەسـەر تیـرەکانی عـەرەب، جـارێك مـنو (أبـو بکـر)ی لەگەڵـدا بـووین چـووینە یـەکێك لـە مـەجلیسەکان، کە ئارامییو ویقـارو ڕێزو حورمـەتی تێـدا دیـار بـوو (ابـو بکـر) پـێش کەوتو سەلامی کردو لێی پرسیـن ئێوە کێن؟

گوتیـان: ئێمـە (شـیبان بـن ثعلبـة)ین، (وەك پێشتـر باسـمان کـرد –أبـو بکـر- پیاوێکی ڕەچەڵەك نـاس بـووە) ئـەویش ئـاوڕی لـە پێغەمبـەر ﷺ دایـەوەو، گـوتی: بـابو دایکم بەلاگێڕت بن، ئەوانە خەڵکی زۆر بەڕێزو ناسراون.

عـەلی دەڵێ: یەکێك لەنێویاندا هـەبوو بـەناوی (مفـروق) هـەم قسـە زان بـوو، هـەم جوانو بە شـانو شەوکەت بوو دوو (پـرچ)ی[٣] بەسـەر سـنگیدا هاتبوونـە خـوارێ، وە شوێنەکەشی لەو شوێنەوە نزیك بوو، کە (أبوبکر) لێی دانیشتبوو.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢١٩).

٢) (البداية والنهاية)، ج٣، ص(١٦٦-١٦٧).

٣) ئەو کاتە دیارە لەلای پیاوانیش وا باوبووە، کە پرچیان هۆنیوەتەوە، پرچ (کـەزیی)یە.

(ابوبکر) لێی پرسی: ژمارەتان چەندە؟

(مفروق) گوتی: شەڕکەرمان لە (هەزار) کەس زیاترەو هەزاریش لەبەر کەمیان قەت تێکناشکێن.

(أبوبکر) لێی پرسی ئایا خۆڕاگریی‌و ئامڕازو هۆیەکانی جەنگتان چۆنە؟

(مفروق) گوتی: ئێمە، کە بە دوژمن دەگەین لە هەموو کاتان تووڕەترین، وەکاتێکیش، کە تووڕە دەبین لە هەموو کاتان توندترین، وە ئێمە (ئەسپ)مان پێ لە کوڕان چاکترە، وە (سیلاح)یشمان لەلا لە حوشترو مەڕو ماڵات چاکترە، وە یارمەتی هەر لەلایەن خواوەیە، جاری وایە سەرمان دەخات، وە جاری واش هەیە تێدەشکێین، ئنجا (مفروق) لێی پرسی ڕەنگە تۆ ئەو برایەی قوڕەیشیان بی[١]؟!

(أبوبکر) گوتی: ئەگەر هەواڵتان پێگەیشتوە، کە پێغەمبەری خوا پەیدابووە، ئەمە هەوە، ئیشارەی بە پێغەمبەر ﷺ کرد.

ئنجا (مفروق) ڕووی لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتی: ئەی برای قوڕەیشیان بۆ چ شتێکمان بانگ دەکەی؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{أدعوكم الى شهادة ان لا اله الا الله وحده لاشريك له، وإني عبدالله ورسوله، والى أن تؤوني وتنصروني فإن قريشاً قد تظاهرت على الله وكذّبت رسولَهُ واستغنت بالباطل عن الحق، والله هو الغني الحميد}**، واتە: بانگتان دەکەم، کە شایەتمان بێنن بێجگە لە خوا پەرستراوی دیکە نین، تاکەو هیچ هاوبەشی نین، وە کە منیش بەندەی خوام‌و ڕەوانەکراوی خوام، وە داواتان لێ دەکەم، کە پەنام بدەن‌و پشتم بگرن، چونکە قوڕیش (واتە: زۆربەیان)

١) لێرەدا ئەو کابرایە وایزانیوە کە (أبو بکر) -خوا لێی ڕازی بێ- پێغەمبەری خوایە، چونکە (أبو بکر) زووتر مووی لە سەری سپی بووە، وە بەتەمەنتریش دیار بووە لە پێغەمبەر ﷺ بۆیە زۆر جار وایانزانیوە، کە (أبو بکر) پێغەمبەرە، هەتا هەستاوە خزمەتی پێغەمبەری کردوە، ئنجا بۆیان دەرکەوتوە، کە ئەو نیە.

دژایەتی خوا دەکەن، وە پێغەمبەری خوا بەدرۆ دەزانن، وە (باطل)یان پێ لە حەق چاکترە، وە خواش بێنیازەو شایستەی هەموو ستایشێکە.

(مفروق) گوتی: ئەی برای قورەیشی بۆچی دیکەمان بانگ دەکەی؟ بەخوا تا ئێستا قسەی باشتر لەوەی تۆم نەبیستوە!!

ئنجا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ۖ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُم مِّنْ إِمْلَاقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾ الأنعام، واتە: ئەی موحەممەد! تۆ بڵێ: وەرن ئەوەتان بەسەردا بخوێنمەوە، کە پەروەردگارتان لێی قەدەغە کردوون: هیچ شتێك مەکەنە هاوبەش بۆ خودا، وە لەگەڵ باب‌و دایکیشتان چاك بن(١)، وە منداڵەکانتان لەبەر نەداریی مەکوژن‌و ئێمە ڕۆزیی ئێوەش‌و ئەوانیش دەدەین، وە توخنی کردەوە دزێو ناشیرینەکان مەکەون، چ ئەوەی ئاشکرایەو چ ئەوەی پەنهانە، وە ئەو نەفسەی کە خوا قەدەغەی کردوە بە حەق نەبێ مەیکوژن، ئا ئەوەتان خوا ئێوەی پێ ئامۆژگاری کردوە، بەشکم عەقڵتان هەبێ (یان: ئەگەر بفامن دەزانن، کە ئامۆژگاریی خوا چاکترین ئامۆژگارییە).

(مفروق) گوتی: بەخوا بە ڕەوشتی زۆر بەرزو کردەوەی زۆر چاك بانگی خەڵکی دەکەی، وە کەسانێك، کە تۆیان بە درۆزن لە قەڵەم داوە درۆیان کردوەو کەسانێك، کە دژایەتییان کردووی خراپەیان کردوە.

١) بۆیە نەیفەرمووە لەگەڵیان خراپ مەبن، چونکە خراپ نەبوون بەس نییە، بەڵکو دەبێ لەگەڵیان چاك بین.

دوایی (مفروق) بۆخۆی قسەی کۆتایی نەکرد، بەڵکو شتەکەی گەڕاندەوە بۆ (هانيء بن قبيصة)، وە گوتی: ئەوە (هانيء)ە شێخمانەو پسپۆڕی دیندارییمانە با ئەو قسەی لێ بکا.

(هانيء)یش گوتی: ئەی برای قورەیشی قسەکەتم بیست، بەڵام من پێم وایە، ئەگەر دینی خۆمان واز لێ بێنینو بەدوای دینی تۆ بکەوین، بە یەك دانیشتن، کە لەگەڵ تۆدا کردوومانەو نە پێشتر کۆبوونەوەی دیکەمان کردوەو، نە لە دوای وی کۆبونەوەی دیکە بکەین، ئەوە کەم عەقڵیی ئێمە دەگەیەنێ، وە مانای وایە ئێمە کورت بین بووین، کە بەتەئکید هەڵەش لە پەلەپەلێ دایە، بۆیە ئێمە پێمان باش نیە لێرە کۆتایی بە شتەکە بێنینو پەیمانت لەگەڵ ببەستین، بەڵکو تۆ بگەڕێوە بۆ شوێنی خۆتو ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆلای تیرەو هۆزی خۆمانو مەشوەرەتیان پێ دەکەین، ئینجا (هانيء) پێی خۆش بوو (مُثنَّی)ش بەشداریی لە قسەکاندا بکات، بۆیە گوتی: ئەوەش (مثنی)یە پیاوی جەنگاوەرمانە (واتە: بەرپرسی سەربازیی).

(مثنی)ش گوتی: گوێم لە قسەکەت بوو ئەی برای قورەیشیو هەمان وەڵامی (هانيء)ی دایەوە، بەڵام شتێکی دیکەی بۆ زیاد کرد (چونکە عەسکەرییانە بیری لێ کردۆتەوە) گوتی: ئێمە لەنێوان دوو ئاوەدانییان داین، یەکیان (اليمامة)یە ئەوەی دی (السماوة)یە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو دووانە چین؟!

(مثنی) گوتی: یەکیان سەرزەمینی عەرەبەو ئەوی دیکەشیان وڵاتی فارسو ڕووبارەکانی (کیسرا)[1]ن، جا بەنسبەت سەرزەمینی لای کیسڕاوە، ئێمە ناتوانین یارمەتیتان بدەین! چونکە پەیمانمان هەیە لەگەڵ کیسڕادا هیچ کەسێك پەنا نەدەین کە دۆست نەبێ، بەڵام بەنسبەت سەرزەمینی لای عارەبانەوە، بێ منەتین، ئنجا گوتی: ئەی برای قورێشی ئەو دینەی، کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی من پێم وایە

---

١) ئەو کاتە بە (دیجلەو فوڕات)یان گوتوە ڕووبارەکانی (کیسڕا)، چونکە عێراق لەو سەردەمەدا بەدەستی (فارس)ەوە بووە.

www.alibapir.com


پادشاو دەسەڵاتدارەکان ڕقیان لێی هەڵدەستێ[١]، جا ئەگەر حەز دەکەی ئەوە بەنسبەت لای عارەبەوە پشتگیرییت دەکەین!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {**ما أسأتم في الرد اذ أفصحتم بالصدق، وإنَّ دين الله عزّ وجلّ لن ينصره الاّ مَنْ حاطَهُ من جميع جوانبه، أرايتم أنْ لم تلبثوا الاّ قليلا حتى يورثكم الله تعالى أرضهم و ديارهم ويُفْرِشَكُمْ نساءهم، أتسبِّحون الله وتقدِّسونه؟!**}، واتە: وەڵامێکی خراپتان نەدایەوە چونکە ڕاستگۆیانە دوان، بەڵام بەرنامەی خوای زاڵو شکۆدار بەس کەسێك دەتوانێ سەری بخاو پشتگیریی لێ بکات، کە لە هەموو لایەکانەوە بۆی ئامادە بێ (نەك لایەکی بگرێو لایەکەی دی چۆڵ بکات)، ئنجا فەرمووی: ئایا ئەگەر پاش ماوەیەکی کەمی دیکە بینیتان، کە خوای بەرز سەرزەمینو خانووبەرەو ئافرەتەکانیانی کردە میراتی ئێوە، ئایا لەوکاتەدا خوا بەپاك دەگرنو بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن.؟!

لە کۆتاییدا (نعمان بن شريك) گوتی: بەڵێ سوێند بەخوا ئەگەر وابوو ئەوکاتە تەنیا خوا دەپەرستینو بۆمان دەردەکەوێ، کە تۆ پێغەمبەری خوای[٢].

وە لە (إمتاع الأسماع)ی (المقريزی)دا هاتوە: لەو چەند مانگەی ساڵی (١١)یەمی پێغەمبەرایەتیدا، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (١٥) تیرەو هۆزدا قسەی کردوەو باسی ئیسلامی بۆ کردوون، بۆیە پێویستە ئێمەش لەپێناو دینی خوادا خۆمان ماندوو بکەینو بچینە نێو خەڵكو بەزۆر شێواز ڕاستییەکانیان بۆ ڕوون بکەینەوەو پێیان ڕابگەیەنینو تانەو تەشەرو ناخۆشیەکانیش لەو پێناوەدا لەخۆمان بگرین.

---

١) لێرەدا (مثنى) زۆر چاك لێی حاڵی بووە، چونکە بنەمای ئەو دینە (لا الە الا الله)یەو جگە لە خوا نابێ کەس پەرستراو بێ، جا ئەگەر جگە لە خوا کەس پەرستراو نەبێ، ئەوە هەرچی طاغووتو فیرعەونو ئەوانەن، کە خۆ لە خەڵکی دەکەنە پەروەردگارو پەرستراو، بازاڕیان دەشکێ.

٢) دیارە ئەوەی (ابن كثير) هێناویەتی دوورو درێژەو ئێمە کورتمان کردۆتەوە.

(الـمقريزي) دەڵێ: {ثم عرض ﷺ نفسه على القبائل أيـام الـموسم و دعـاهم الى الإسـلام، وهم:

١- بنـو عامر.

٢- غسان .

٣- بنـو خرارة .

٤- بنـو حرة .

٥- بنـو سليم .

٦- بنـو نضر .

٧- بنـو عبـس .

٨- ثعلبـة بن عكـابة .

٩- كنـدة .

١٠- كلـب .

١١- بنـو الـحارث بن كعـب .

١٢- بنـو حنيفـة .

١٣- بنـو عـذرة .

١٤- قيـس بن خطـم .

١٥- أبو أنـس بن أبـي .

www.alibapir.com

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەرکامێکیان کە قسەی دەکرد، دەیفەرموو: **{مَنْ رجلٌ يَحْمِلُني الى قومه، فإن قريشاً قد منعوني أن أُبلّغ كلام ربي؟!}**، واتە: چ پیاوێك هەیە ڕێگەم پێ بداو لەگەڵ خۆیم بەرێ بۆ نێو تیرەو هۆزەکەی خۆیو پشتگیریم لێ بکات، بۆئەوەی پەیامی پەروەردگارم ڕابگەیەنم، چونکە قورەیشییەکان ڕێگەم لێ دەگرن، کە پەیامی پەروەردگارم ڕابگەیەنم؟!

(أبو لهب)یش، کە لە دوای دەڕۆیشت دەیگوت: (لاتسمعوا منه فأنه كذّاب) واتە: گوێی لێ ڕامەگرن ئەوە درۆزنە}[1].

ئنجا (أحمد) لە (مسند)ەکەیدا، وە (الطبراني) لە (المعجم الكبير)ی خۆیداو (البيهقي) لە (الدلائل)دا، لە (مدرك بن منيب)ەوە دەگێڕنەوە، کە ئەویش لە باییەوەو ئەویش لە باپیرییەوە گێڕاویەتەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە سەردەمی نەفامییدا دەیفەرموو: **{يا أيّها الناس قولوا لا الله الاّ الله تفلحوا}**، واتە: ئەی خەڵکینە! بڵێن جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین سەرفراز دەبن، جا کە پێغەمبەر ﷺ ئاوا بانگی دەکردن، خەڵکێك تفی لە دەموچاوی پێغەمبەر ﷺ دەکرد، هێندێکیش خۆڵیان پێدادەکرد، هێندێکیش قسەی ناشیرینیان پێ دەگوت، تا نیوەڕۆ پێغەمبەر ﷺ بەردەوام دەبوو، بەڵام ئەوان هەر بەرپەرچیان دەدایەوە، تا کچێك هات قاپە ئاوێکی پێبوو، پێغەمبەر ﷺ بە کچەکەی فەرموو: **{يا بُنية لاتخشى على أبيك غلبة ولا ذلة}**، واتە: ئەی کچم! لە بابت مەترسێ، کە ژێربکەوێ یاخود زەبوون بێ، منیش گوتم: ئەوە کێیە؟!

گوتیان: ئەوە زەینەبی کچی پێغەمبەرە ﷺ.

---

١) إمتاع الأسماع لـ(المقريزي)، ج١، ص(٣٠-٣١)، مسند الإمام أحمد بن حنبل وسنن الدارمي.

**لە کۆتایی ئەم باسەشدا ئاماژەیەکی خێرا بەچەند مەسەلەیەك و گەورەترین دەرس و پەندی گەڕانی پێغەمبەر ﷺ بەدوای پێگەی جەماوەرییدا دەکەین:**

١/ پێغەمبەر ﷺ بەزۆریی بە شەو لەگەڵ ئەو تیرانەدا دادەنیشت، بۆ ئەوەی قوڕیشییەکان پێی نەزانن و لێی تێك نەدەن.

٢/ خۆی دەچوو بۆ هەوارگەو مەنزڵگایان و قسەی بۆ دەکردن، نەك چاوەڕێ بێ ئەوان بێن بۆ لای! چونکە ئەوە وەك فریادڕەسێك خەڵکی ڕزگار دەکرد لە شەوەزەنگی گومڕایی.

٣/ بەتەنها نەدەچوو، بەڵکو کەسێك، یان دوو لە هاوەڵانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، بەتایبەتی (أبوبکر)، کە زۆر ڕەچەڵەك ناس بوو.

٤/ هەمیشە داکۆکیی لەسەر تواناو هێزی تیرەکان دەکرد، کە لە سەرەتاوە پێویستی بە هێزی زیاتر بوو، تاکو بتوانن بەرگریی لێ بکەن.

ئەو دەرس و پەندە گەورەیەش، کە لەم مەسەلەیە وەردەگیرێ ئەوەیە، کە بەبێ دروستکردنی بنکەی جەماوەریی و هێزو توانای پێویست، قەوارەو کیانی ئیسلامیی دروست نابێ و، پێویستە دروستکردنی بنکەی جەماوەریی، گرنگیی تەواوی پێبدرێ و، زۆر بەجیددی کاری بۆ بکرێ، دیارە هەر واقیع و هەلومەرجەش شێوازی خۆی دەوێ.

# قسەکردن لەگەڵ نوێنەرانی شاری (یثرب)و ئیمان هێنان و بەیعەت کردنیان

قسەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نوێنەرانی شاری (یثرب)-ئەوس و خەزرەج-دا بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

## قۆناغی یەکەم: سەرەتای دیدار:-

سەرەتای دیدارەکە لە کۆتایی ساڵی (١١)یەمی پێغەمبەرایەتیدا بووە، وە (ابن هشام) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ:[١] (فلما أراد الله – عزّ وجلّ- إظهار دينه وإعزاز نبيِّه ﷺ وإنجاز موعده له، خرج رسول الله في الموسم الّذي لقيه فيه النفر من الأنصار، فَعَرَض نفسه على قبائل العرب، كما كان يصنع من كل موسم، فبينما هو عند العقبة لقي رهطاً من الخزرج أراد الله بهم خيراً...

لما لقيهم رسول الله ﷺ قال لهم: من أنتم؟! قالوا: نفر من الخزرج، قال: أمِنْ موالي يهود؟ قالوا: نعم، قال: أفلا تجلسون أُكلمكم؟! قالوا بلى، فجلسوا معهُ فدعاهم الى الله – عزّ وجلّ- وعرض عليهم الإسلام وتَلا عَلَيهم القرآن)، واتە: کاتێك، کە خوای زاڵ و شکۆدار ویستی دینەکەی خۆی ئاشکرا بکاو پێغەمبەری خۆی ﷺ بە عیززەت بکات، وە ئەو بەڵێنەی کە پێی داوە بۆی بێنێتەدی، پێغەمبەر ﷺ لەکاتی (موسم)ی حەجدا، وەکو جاران دەستی کردوە بە خۆڕانواندن لەسەر هۆزو تیرەکانی عارەب، لە لای (عقبة) گەیشتۆتە کۆمەڵێك لە تیرەی (خزرج) کە خوا ویستی خێریان بێنێتە ڕێ (هەرکەسێك لە خزمەتی دینی خوا دابێ، بێگومان خوا خێری هێناوەتە ڕێ و دەبێ مەمنوونی خوابێ).

---

١) (السيرة النبوية...)، ج٢، ص٢٢١، ط١ دار ابن الهيثم.

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ پێیان گەیشت فەرمووی: ئێوە کێن؟! گوتیان: ئێمە کۆمەڵێکین لە (خزرج)، فەرمووی: لە هاوپەیمانەکانی جوولەکەن؟! گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: دانانیشن هەندێك قسەتان بۆ بکەم؟گوتیان: با، ئنجا لەگەڵی دانیشتن و، بانگی کردن بۆلای خواو ئیسلامی لەسەر ڕانواندن و قورئانی بۆ خوێندنەوە.

(ابن هشام)[1] دەڵێ: شتێك، کە خوا بۆ پێغەمبەری ﷺ کردبوو ئەوەبوو، کە جوولەکەکان لەگەڵ (ئەوس و خەزرەج) بوون لە ولاتی خۆیان (یثرب)، جوولەکەکان خاوەنی کتێب و زانیاری (وحي) بوون، بەلام (ئەوس و خەزرەج) هاوبەش بۆ خوا دانەرو بتپەرست بوون، (ئەوس و خەزرەج) بەسەر جوولەکەکاندا زاڵ بووبوون و دەسەلاتیان بەسەریاندا هەبوو، جا کاتێك، کە دەمەقاڵێ و ناکۆکییەکیان دەبوو، لەبەرئەوەی جوولەکەکان بە (ئەوس و خەزرەج) نەدەوێران، هەڕەشەیان دەکرد بە پێغەمبەری کۆتایی و ﷺ دەیانگوت: (ان نبيّاً مبعوث الآن قد أظلَّ زمانُهُ نَتَّبِعهُ فنقتلكم معه قتل عادٍ وإرمٍ)، واتە: پێغەمبەرێك دێ، کە ڕۆژگاری هاتنی نزیك بۆتەوە، شوێنی دەکەوین و لەگەڵ ئەودا لە دژی ئێوە دەجەنگین، وەکو چۆن (عاد)و (إرم) لە بەین چوون، ئاوا لەبەینتان دەبەین، ئنجا کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە پیاوەدا کرد، کە شەش کەس بوون لە خەزرەجییەکان، لەنێو خۆیاندا هەندێکیان گوتیان: (يا قوم! تعلموا والله إنه لَلْنَبِيُّ الذي تَوعَّدكم به يهود فلا تسبقنكم اليه)، واتە: ئەی خەڵکینە! بزانن سوێند بەخوا ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە، کە جوولەکەکان هەڕەشەی پێ دەکەن لە ئێوە، کەواتە ئازابن با ئەوان پێشتان نەکەون!

ئنجا دوای ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ بە درێژیی باسی ئیسلامی بۆکردن، ئەو شەش کەسە ئیمانیان پێ هێناو بەڕاستیان زانی، ئەو پەیام و بانگەوازەی، کە بۆی

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢٢١).

www.alibapir.com

خستبوونەڕوو، لێیان وەرگرتو مسوڵمان بوون، وە پێیان گوت[(١)]: {ئێمە کە هاتووین بۆ حەج ئەو خزمو تیرانەی خۆمانمان بەجێهێشتوون، شەڕو دوژمنایەتییەکیان لەنێواندا هەیە هەر خوا دەزانێ چۆنە! جا بەڵکو خوای بەرزو مەزن بەهۆی تۆوە کۆیان بکاتەوە، ئێمە دەچینەوە بانگیان دەکەین بۆ ئەو دینەی تۆ، وە باسی ئیسلامیان بۆ دەکەین، ئەگەر خوا ئەوان لەسەر دەستی تۆ کۆبکاتەوە، هیچ کەس لەتۆ بەعیززەتتر نابێ، ئنجا دوایی ئەو شەش کەسە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان دوای ئەوەی کە ئیمانیان هێناو پێغەمبەری خوایان بە ڕاست دانا}، ئەو شەش کەسەش بریتی بوون لە:

١- أسعد بن زرارة، لە (بني النجار).

٢- عوف بن الحارث، لە (بني النجار).

٣- رافع بن مالك بن العجلان، لە (بني زريق).

٤- قطبة بن عامر بن حديدة، لە (بني سلمة).

٥- عقبة بن عامر بن نابي، لە (بني حرام بن كعبة).

٦- جابر بن عبدالله، لە (بني عبيد بن غنم).

-خوا لە هەموویان ڕازی بێ-، وە دوای ئەوەی کە چوونەوە بۆ (يثرب) باسی پێغەمبەری خوایان ﷺ بۆ خەڵککە کردو، خەڵکەکەی خۆیان بانگ کرد بۆ ئیسلام بەشێوەیەك ئیسلامیان لەنێودا بڵاوبۆوە، کە هیچ ماڵێك لە ماڵەکانی (يثرب) نەما کە باسی پێغەمبەری ﷺ تێدا نەکرێو باسی ئیسلامەتی نەچووبێتە نێو[(٢)].

شایانی باسیشە نوێنەرانی (يثرب) لە قۆناغی یەکەمی دیداری پێغەمبەردا ﷺ هەموویان گەنج بوونو تەنیا (خەزرەج)یەکان بوون.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢٢٢).

## قۆناغی دووەم: پەیمانی یەکەمی (عقبة) :

(ابن اسحاق) وەك (ابن هشام) لێی دەگێڕێتەوە دەڵێ:[1] (ساڵی ئایندە -واتە: ساڵی دوانزەیەمینی پێغەمبەرایەتی- لەکاتی –موسم-ی حەجدا (دوازدە) پیاو هاتن، وە لەلای (عقبة) بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتن‌و لەوێ ئیمانیان پێی هێناو پەیمانیان پێدا، وە بەو پەیمانە دەگوترێ: (بیعة النساء)، واتە: (پەیماندانی ئافرەتان)، بۆیەش ئەو ناوەی لێنرا، چونکە پێش ئەوەی جەنگیان لەسەر پێویست بێ، ئەو پەیمانەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەست.

ئەو دوازدە کەسەش دەیان لە (خەزرەج) بوون‌و دووشیان لە (ئەوس) بوون، کە (خەزرەج)یەکان (پێنج)یان پێشتریش لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کۆبووبوونەوەو، کە هەموویان بریتی بوون لەمانە:

١- أسعد بن زرارة .
٢- عوف بن الحارث .
٣- رافع بن مالك.
٤- عقبة بن عامر .
٥- قطبة بن عامر .
٦- معاذ بن الحارث .
٧- ذكوان بن عبدالقيس .
٨- عبادة بن الصامت .
٩- يزيد بن ثعلبة .
١٠- العباس بن عبادة بن نضلة .
١١- أبو الهيثم بن التيهان .
١٢- عويم بن ساعدة .

تەنیا ئەو دووەی کۆتایی لە (ئەوس) بوون.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٢٢-٢٢٣).

ئەو دوازدە کەسە بە نوێنەرایەتی مسوڵمانانی مەدینە یەکەم پەیمانیان بە پێغەمبەردا ﷺ لە (عقبة)، دەقی پەیماننامەی یەکەمی عەقەبە، کە (عبادة بن الصامت) یەکێك بووە لەوانەی ئەو پەیمانەی بە پێغەمبەر ﷺ داوە بۆمان دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **{تعالوا بايعوني على أن لا تشركوا بالله شيئاً ولا تسرقوا ولا تزنوا ولا تقتلوا أولادكم ولا تأتوا ببهتان تفترونه بين أيديكم وأرجلكم ولا تعصوني في معروف، فمن وفّى منكم فأجره على الله، ومن أصاب من ذلك شيئاً فعوقب به في الدنيا فهو له كفارة، ومن أصاب من ذلك شيئاً فَستَرَه الله، فأمره الى الله إنْ شاء عاقبه وإن شاء عفا عنه، قال: فبايعناه على ذلك}** رواه البخاري[١]، واتە: وەرن پەیمانم پێبدەن، کە خوا بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن و دزیی نەکەن و زینا نەکەن و منداڵەکانی خۆتان نەکوژن و هیچ بوختانێك نەکەن لە نێوانی دەست و پێتاندا (واتە: کوڕ یان کچی خەڵکی دیکە نەکەن بە هی خۆیان) وە لە هیچ شتێکی چاکدا سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ نەکەن، جا ئەگەر یەکێکتان وەفای بەو پەیمانە کرد، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، وە لە دنیادا لەسەری سزادرا، ئەوە بۆی دەبێتە سڕانەوە، وە هەرکەسێك گوناهێکی لەوانە کردو، خوا پۆشی، وە ئەگەر یەکێك لەو گوناحانەتان کرد، کە پەیمانتان داوە نەیانکەن، ئەوە کارتان دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ئەگەر ویستی سزاتان دەدا، یاخود لێتان دەبووریّ[٢].

(ابن اسحاق) دەڵیّ:[٣] (دوای ئەوەی، کە ئەو دوازدە کەسە گەڕانەوە بۆ (يثرب) پێغەمبەر ﷺ (مصعب بن عمير)[٤]ی لەگەڵ ناردن، وە فەرمانی پێکرد، کە

---

١) صحيح البخاري،: ٣٨٩٢ .

٢) چونکە ئەو کات سزا شەرعییەکان نەهاتوونە خواریّ.

٣) سەرچاوەو بەرگی پێشوو، ص(٢٢٣).

٤) یەکێك لەوانەی، کە لەسەرەتاوە ئیمانیان هێناوە، وە یەکەمین بانگەوازکار بووە بۆ لای خوا، (مصعب بن عمير) بووە.

قورئانیان بەسەردا بخوێنیو ئیسلامیان تێبگەیەنیو لە دین شارەزایان بکات، بۆیە لە (یثرب)دا پێیان دەگوت (المقریء) یانی: (قورئان پێ خوێن)، واتە ئەو کەسەی کە قورئان بە خەڵکی دەخوێنیو فێریان دەکات، مەنزڵگاکەشی لەلای (أسعد بن زرارة بن عدس) بوو، کە (کنیة)ی (أبي أمامة) بووە، (ابن اسحاق) دەڵێ: (مصعب بن عمیر) پێش نوێژیشی بۆ دەکردن، چونکە (ئەوسو خەزرەج) هیچ کامیان ئامادە نەبوون، کە نوێژ لە دوای یەکترەوە بکەن[1].

## قۆناغی سێیەم : پەیمانی دووەمی (عقبة) :

قۆناغی سێیەمی دیداری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نوێنەرانی شاری (یثرب) لە ساڵی (١٣)یەمی پێغەمبەرایەتی دابوو، (ابن هشام) لەوبارەوە دەڵێ:[2] دوای ئەوەی کە (مصعب بن عمیر) بۆ ماوەی یەك ساڵ لە (یثرب) دەمێنێتەوە، لە ساڵی داهاتوودا و لەکاتی (موسم)ی حەجدا دەگەڕێتەوە بۆ مەککە لەگەڵ ئەو مسوڵمانانەی کە لەسەر دەستی ئەو مسوڵمان بوو بوون، بەڵام کە لە (یثرب)ەوە بەڕێ دەکەون خۆیان لە کافرەکانی ئەوێ جیاناکەنەوەو بەیەکەوە دێن، بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبنو زیانیان پێ نەگەیەنن، کە دەگەنە مەککە کاتو شوێنێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دادەنێن بۆ یەکتر بینین لەلای (عقبة) لە نێوەڕاستی ڕۆژەکانی تەشریق (أیام التشریق)دا، {واتە: ١١-١٢-١٣/ی (ذی الحجة)}، (کعب بن مالك)، کە یەکێکە لەوانەی ئامادەی ئەو پەیمانە بووە، دەڵێ:[3] دوای ئەوەی کە لە (حەج) بووینەوە ئەو شەوەی، کە قەرار بوو پێغەمبەری ﷺ تێدا ببینین سەرەتای شەوێ لەگەڵ موشریکەکان لەلای مەنزڵگاو بارەکانی خۆمان خەوتین هەتا سێیەکی شەو ڕۆیشت، دوایی ئێمە بە پەنهانی هەستاینو لە مەنزڵگاکەی خۆمان هاتینە دەرو بە پەنهانی

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٢٤).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٢٦).

٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢٢٧-٢٢٨.

www.alibapir.com


ڕۆیشتین تا شیوەکانی (عقبة) لەوێ هەموومان کۆبووینەوە کە (حەفتاو سێ) پیاوو (دوو) ئافرەت بووین، دوو ئافرەتەکەش یەکێکیان (نسیبة بنت کعب) کە (کنیة)کەی (أم عمارة) بوو، ئەوەی دیکەیان (أسماء بنت عمرو) کە (کنیة)کەی (أم منیع) بوو، (کعب بن مالك) دەڵێ:[1] لەوێ پێغەمبەر ﷺ قسەی بۆ کردین و قورئانی بۆ خوێندینەوەو بانگی کردین بۆ ئیسلام، پاشان فەرمووی: **{أبايعكم على أن تمنعوني ممّا تمنعون منهُ نسائكم وأبنائكم}**، واتە: پەیمانتان لەگەڵ دەبەستم، کە بەرگرییم لێ بکەن و پشتگیرم بن وەکو چۆن پشتگیریی و بەرگریی دەکەن لە هاوسەرو منداڵەکانی خۆتان، (کعب) دەڵێ: (براء بن مالك) لە پێش هەموواندا دەستی پێغەمبەری گرت ﷺ، وە گوتی: بەڵێ سوێند بەو زاتەی، کە تۆی بە حەق ناردوە، تۆ دەپارێزین لە هەموو شتێك، کە ناموس و ماڵ و منداڵی خۆمانی لێ دەپارێزین.

(کعب) دەڵێ: گوتمان ئەی پێغەمبەر ﷺ پەیمانمان لەگەڵ ببەستە سوێند بەخوا ئێمە کوڕی شەڕو ئامڕازی جەنگین، لە باب و باپیرانەوە بە میراتمان گرتوە (وە نەبێ تازە فێری شەڕ بووبین).

(کعب) دەڵێ: کاتێك کە (براء بن مالك) قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەکرد (أبو الهيثم بن التيهان) قسەکەی پێ بڕی و، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانی ئێمەو جوولەکەکاندا پەیمان و بەڵێن هەیە، ئێمە کە دوای تۆ بکەوین دەبێ ئەو پەیمانە هەڵوەشێنینەوە، جا ئایا کاتێك ئێمە وامان کردو خواش تۆی سەرخست، دوایی تۆ دەگەڕێیتەوە بۆنێو قەومەکەت (قورەیش) و ئێمە بەجێ دێڵی و (پشتمان بەردەدەی لە بەرانبەر ناحەزانماندا).

(کعب) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی هاتی و فەرمووی: **{بل الدم الدم والهدم الهدم، أنا منكم وأنتم مني، أُحارب من حاربتم وأسالِمُ من**

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢٢٨.

**سالمتم}**[(١)]، واتە: بەڵکو خوێنم لەگەڵ خوێنتانەو ماڵ لێ تێکچوونیشم لەگەڵ ماڵ لێ تێکچوونتانە، من لە ئێوەمو ئێوەش لە منن لەگەڵ کێ شەڕ بکەن شەڕی لەگەڵ دەکەم، وە ئاشتیش لەگەڵ کێ بکەن ئاشتی لەگەڵدا دەکەم[(٢)].

(کعب) دەڵێ: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: **{أخرجوا الي منكم اثني عشر نقيباً ليكونوا على قومهم بما فيهم}**[(٣)]، واتە: دوازدە مشوورخۆر (نقیب)م لە نێو خۆتاندا بۆ هەڵبژێرن، بۆ ئەوەی هەرکامێکیان بەسەر تیرەکەی خۆیەوە برا گەورە بێ.

چونکە ناکرێ پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا لەگەڵ یەك یەکی مسوڵمانانداا قسە بکات، بۆیە پێویست بووە یەکێك ببێتە نوێنەری کۆمەڵێك، (کعب) دەڵێ: ئنجا ئێمەش دوازدە (نەقیب)مان لەنێوخۆماندا هەڵبژاردن، وە بە پێغەمبەرمان ناساندن، کە (٩)کەسیان لە (خەزرەج) بوونو (٣)شیان لە (ئەوس) بوون، بەم شێوەیە:

١- أسعد بن زرارة .

٢- سعد بن الربيع .

٣- عبدالله بن رواحة .

٤- رافع بن مالك بن العجلان .

٥- البراء بن معرور بن صخر .

٦- عبدالله بن عمرو بن حرام .

٧- عبادة بن الصامت .

٨- سعد بن عبادة .

٩- المنذر بن عمرو بن خنيس .

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٢٨).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٢٩).

٣) ابن هشام، ج٢، ص(٦٣).

١٠- أُسيد بن حضير .

١١- سعد بن حيثمة بن الحارث .

١٢- رُفاعة بن عبدالمنذر بن زبير[١].

(إبن اسحاق) دەڵێ: ئنجا پێغەمبەر ﷺ بە (نەقیب)ەکانی فەرموو: **{أنتم على قومكم بما فيهم كفلاء ككفالة الحواريين لعيسى بن مريم عليه السلام وأنا كفيل على قومي، يعني المسلمين؟ قالوا نعم}**[٢]، واتە: ئێوە هەرکامێکتان لەسەر قەوم‌و خزمانی خۆی سەرپەرشتیار دەبێ، وەکو چۆن حەوارییەکان کەفیل‌و وەکیلی عیسای کوڕی مەریەم بوون (علیه الصلاة والسلام)، وە منیش مشوورخۆرم بەسەر هەموو قەومەکەمەوە، یانی: مسوڵمانان، ئەوانیش گوتیان: بەڵێ.

(کعب) دەڵێ:[٣] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{إرفضّوا الى رحالكم}**، واتە: ئێستا بڵاوبن‌و بچنەوە بۆ لای بنەو بارگەکانتان (بۆئەوەی موشریکەکان هەستیان پێ نەکەن)، (کعب) دەڵێ: (عباس بن عبادة) بە پێغەمبەری ﷺ گوت: سوێند بەو خوایەی بە حەق ڕەوانەی کردووی، ئەگەر حەز دەکەی‌و پێت چاکە بەیانی بە شمشێرەکانمان لە موشریکەکان دەدەین!

پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: **{لَمْ نُؤْمَرْ بذلك ولكن إرجعوا الى رحالكم}**[٤]، واتە: جارێ فەرمانمان بەوە پێ نەکراوە، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ نێو بارگەکانی خۆتان، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ لای بنکەو بارەگاکانی خۆمان‌و خەوتین هەتا بەیانی.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص(٢٢٩، ٢٣٠).
٢) هەمان سەرچاوە، ص(٢٣٠).
٣) هەمان سەرچاوە، ص(٢٣١).
٤) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.

## بەندەکانی پەیمانی دووەمی (عقبة):-

(جابر بن عبدالله)، کە یەکێکە لەوانەی کە لەو پەیمانەدا بەشدار بووە، دەڵێ:[١] گوتمان ئێمە هەتا کەی بهێڵین پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاخەکانی مەککە دەربکرێت، وە بترسێنرێت، دەبێ بچین بیهێنینو لە شاری خۆمان لە خزمەتی دابین.

(جابر) دەڵێ: بۆیە لە مەوسیمی حەجدا حەفتا کەس رۆیشتین بۆ مەککە بەڵێنمان پێداو شوێنمان دیاریکرد، لە شیوەکانی (عقبة)، یەك یەكو دوو دوو چووین بۆ ئەوێ هەتا هەمووومان کۆبووینەوە، وە بە پێغەمبەرمان ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر چی پەیمانت پێ بدەین؟!

ئەویش فەرمووی: **{تبايعوني على: السمع والطاعة في النشاط والكسل، والنفقة في العُسْر واليُسْر، وعلى الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر، وأن تقولوا في الله لا تخافون في الله لومة لائم، وعلى أن تنصروني فتمنعوني اذا قدِمْتُ عليكم مما تمنعون منه أنفسكم وأزواجكم وأبنائكم، ولكم الجنّة}**[٢]، کەواتە: بەندەکانی پەیماننامەی دووەمی (عقبة)، بەم شێوەیە بوون: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون:

١) گوێم بۆ بگرنو فەرمان بەرییم بۆ بکەن، لەکاتی پێ خۆش بوونو پێ ناخۆش بووندا، یان لەکاتێکدا، کە لە قەلبتان خۆشەو لەکاتێکدا، کە لەسەر شانتان قورسە.

٢) ماڵی خۆتان ببەخشن لەکاتی سەغڵەتیی و ئاساییدا (لە کاتی گرانیی و هەرزانیی)دا.

---

١) بڕوانە: (البداية والنهاية) لابن كثير، ج٣، ص(١٨٤).

٢) رواه أحمد بإسناد حسن وصححه الحاكم وابن حبان، وە بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٣.

٣) فەرمان بە چاکە بکەن‌و ڕێ لە خراپـە بگرن.

٤) قسەی حەق بکـەن لەبـەر خـاتری خـوا، وە لـە حـەق گـوتن نەسـڵەمێنەوەو گـوێ نەدەنە لۆمـەی لۆمـەکاران.

٥) پشتم بگرن‌و بەرگریم لـێ بکەن‌و سەرم بـخەن، دوای ئەوەی کە دێمـە لاتـان بـۆ شاری (یثرب) وە بـمپارێزن لە شتێك، کە خۆتان‌و ماڵ‌و خێـزان‌و منداڵـەکانتانی لـێ دەپـارێزن، لە بەرامبـەریشدا بەهەشتتان هەیە.

(جـابر) دەڵێ: دوای تـەواوبوونی فەرمایشـتەکانی ئێمـەش هەڵسـاین‌و پەیمـانـمان پێدا، وە پەیـمانی لە ئافرەتەکانیش وەرگـرت، بەڵام پێغەمبـەر ﷺ دەسـتی نەخسـتە نێو دەستی ئافرەتەکانەوە، بەڵکو پاش ئەوەی پەیـمانـمان پێـدا فـەرمووی: **{إذهَبْـنَ فقد بايَعْـتكُـنَّ}** رواه أحـمد وصححه (شـعيب الأرنـاؤوط)، واتـە: بڕۆن ئەوە پەیـمانـم لێتـان وەرگرت.

بەڵـێ بەڕێـزان!

بـەم شـێوەیە پێغەمبـەر ﷺ بـەوەی، کـە لـە توانایـدا هـەبووە، بـە ئـەرکی خـۆی هەڵسـاوە، وە خوای پەروەردگـاریش بەڵێنی خۆی بۆ هێنـاوەتـەدی، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾ العنكبـوت، واتە: وە ئەوانەی لەڕێی ئێمەدا خۆیـان مانـدوو دەکـەن‌و تێدەکۆشـن، ئێمـە ڕێیـەکانی خۆمانیـان پێشـان دەدەیـن، وە بێگومـان خـوا لەگـەڵ چاکەکاراندایە، لێرەدا ئەگـەر سـەرنج بدەین خـوای بـە بـەزەیی نەیفـەرمووە: (سـبيلنا) بـەڵکو بـە کـۆ هێناویـەتی: (سُبُلَنا) ڕێگەکانـمان، چونکە ئینسان کاتێك کار بۆ ئیسـلام دەکـات، بـۆ هـەر جـۆرە ئیشـێك پێویسـتی بـە جـۆرە ڕێیـەکی ڕاسـت هەیـەو دەبـێ خـوای کاربـەجێ هـەموو ڕێیەکانی پێشان بدات، چونکە هەر قسەو ڕەفتارو هەڵوێستێك پێویستی بـە ڕێگایـەك هەیە بـۆ ئـەوەی نیشـانەی تێـدا بپێکـێ‌و ئامـانجی تێـدا وەدەسـت بێنـێ، ئاشکراشـە

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە بینینی نوێنەرانی شاری (یثرب)و قسە بۆکردنیانو ناردنەوەیان بۆئەوێ، دوای مسوڵمانبوونیان، ئەوە بووە کە ویستوویەتی پێگەو جێگەیەك فەراهەم بێنێ، کە بگونجێتو ببێتە بناغە بۆ دروستبوونی کیانو قەوارەی ئیسلامییو (یثرب)ی بە شوێنێکی گونجاو زانیوە، بەڵام دوای ئەوەی کە نوێنەرانی ئەوێ ئیمانیان پێ هێناوەو پەیمانیان پێداوە.

کەواتە: لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە بناغەی دروستبوونی دەوڵەتو کیانو قەوارەی ئیسلامیی بریتیە لە تێگەیاندنی خەڵكو پێگەیاندنیانو دروستبوونی ئیمانی ڕاستەقینە لە دڵو دەروونی خەڵکداو قەناعەت هێنانیانو پەیمان لێ وەرگرتنیان، نەك بە هێزو زەبرو زۆرو توندوتیژیی بویستڕێ ئیسلام بسەپێنرێ بەسەر خەڵکیدا، وە ئەوانەی وا بیردەکەنەوە کە دەگونجێ دەوڵەتی ئیسلامیی بە فەرزکردنو بەزەبرو زۆر بنیات بنرێ، ئەوە لە ئیسلام حاڵی نەبوون، وە پێغەمبەر ﷺ دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراندوە بێئەوەی یەك دڵۆپە خوێن بڕژێنێ، بەڵکو خەڵکی تێگەیاندوەو پێگەیاندوەو ئیسلامی بۆ ڕوون کردونەوەو ئیمانیان پێ هێناوەو، دوایی لەسەر شانی ئەو خەڵكو بنکە جەماوەرییە، کیانو دەوڵەتی ئیسلامیی بنیات ناوە.

## مۆڵەتدانی پێغەمبەر ﷺو فەرمانکردنی بە کۆچکردنی هاوەڵان بەرەو (یـثـرب) :-

فەرمانکردنی پێغەمبەرو ﷺ، مۆڵەتدانی بە هاوەڵانی، کە لە مەککەوە کۆچ بکەن بۆ (یثرب)، یان لە دوا دوای ساڵی سێزدەهەمینی پێغەمبەرایەتیدا بووە، یاخود لە سەرەتای ساڵی چواردەیەمینی پێغەمبەرایەتییەوە بووە، کە دوایی بەپێی فەرمانی (عمر) -خوا لێی رازی بێ-، لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا، دوای راوێژکردنی بە مسوڵمانان، ساڵی کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەرێزی بۆ (یثرب)، کراوە بە سەرەتای مێژووی ئیسلام، وە (١)ی (محرم)یش بەسەری ساڵی کۆچی دیاری کراوە.

جا ئێمە لە سێ خاڵاندا باسی چۆنیەتی کۆچکردنی هاوەڵان لە مەککەوە بۆ (یثرب) دەکەین:

### یەکەم: زەمینە سازکردن بۆ کۆچ کردن :-

دوو جۆرە زەمینەسازیی کراون بۆ کۆچی مسوڵمانان، وە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککەوە بۆ شاری (یثرب)، کە دوایی ناوی لێنراوە (مدینة).

### ١- پەیماننامەی یەکەمو دووەمی عەقەبە :

دیارە لە سەرەتاوە پێغەمبەر ﷺ رێگەی بەهاوەڵانی بەرێزی نەدا کە کۆچ بکەن بۆ (یثرب)، بەڵام دوای ئەوەی نوێنەرانی شاری (یثرب) لە هەردوو هۆزی (ئەوسو خەزرەج) هاتنو لە پەیمانی یەکەمو دووەمی عەقەبەدا پەیمانیان بە پێغەمبەر ﷺداو، گەڕانەوە بۆ (یثرب)و خەڵکێکی مسوڵمانی ئامادەو دانستە لەوێ پەیدا بوون، ئنجا فەرمانی کرد بە کۆچ کردن بەرەو (یثرب)، کە مێژوونووسان ناویان لە پەیمانی (عقبة)ی یەکەم ناوە (بیعة النساء)، ئەمەش مانای ئەوە نیە بە کەم سەیر کرابێ، بەڵکو زانایان وەکو زاراوەیەك بەکاریان هێناوەو ئەوەشیان لە ئایەتی پێش

کۆتـایی سـوورەتی (الممتحنـة) وەرگرتـوە، کـە دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٢﴾ الممتحنـة، جـا لەبەرئەوەی بڕگەکانی پەیماننامەی یەکەمی (عقبـة) هەمان ئەم فەرمانانەن، کە لـەم ئایەتانەدا هاتوون، بۆیە زانایان ناویان لـێناوە (بیعـة النسـاء)، خـوای زاڵو کاربـەجێ لـەم ئایەتـەدا بـۆ پێغەمبـەری ﷺ دیـاری کـردوە کـە کاتێـك پەیـمان لـە ئافرەتـان وەردەگرێ، پێیان ڕابگەیەنێ، کە بەو شێوەیە ڕەفتار بکـەنو خـۆ لـەو شـتانە بپـارێزن، کەواتە: زانایان لەبەرئەوەیە، کە ناویان لـە پەیـمانی یەکـەمی (عقبـة) نـاوە، پـەیمانی ئافرەتان (بیعة النساء)، پەیـمانی دوومی (عقبـة)شیان بۆیە ناو ناوە پەیـمانی جـەنگ (بیعة الحرب) لەبەرئەوەی کە لە یـەکێك لـە بڕگەکـانیدا پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: (کە هـاتم بۆ نێوتـان مـن بپـارێزن وەکـو چـۆن نەفـسو نـاموسو مـاڵو خێزانـی خۆتـان دەپارێزن).

بەڵێ وەرگرتنی ئەم دوو پەیـمانە بریتی بوون لە زەمینە سازیی یەکـەم، پێشتـریش باسـمان کرد کە بناغـەی پێکهێنانی کۆمـەڵگای ئیسلامییو بنیاتنانی کیانو دەوڵـەتی ئیسـلامییش بریتیـە لـە دروسـتکردنی بنکـەی جـەماوەرییو پەیـدابوونی خـەڵکێکی مسوڵمان کە باوەش بۆ ئەو بانگەوازە بگرنـەوەو پێشـوازیی لێبکـەنو ئامـادە بـن بـە سەرو ماڵ بیپارێزنو پشتگیریی لـێ بکـەن، جـا دوای ئـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ ئـەو بنکە جەماوەرییـەی لە (یثـرب) دروسـت کـردوەو زانیویـەتی بـەو ئەندازەیـە گەشـەی کردوە، کە بەکەڵکی ئەوە بێت بیکاتە بناغەی دەوڵەتو کیانی ئیسلامیی، ئـەو کاتـە مۆڵەتی داوە بە هاوەڵانی بەڕێزی، کە کـۆچ بکەن بۆ ئەوێ.

**٢- چەند ئایەتێکی قورئـان لەبارەی کۆچکردنەوە:**

زەمینە سازیی دووەم ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار چەند ئایـەتێکی ناردنـە خـوار، کە باسی کۆچ کردنو پاداشتی گەورەی ئەوانە دەکەن کە لە پێناوی خوادا مـاڵو حـاڵو نیشتمانی خۆیان بەجێ دێڵن، وە دڵی خۆش کردوون بەوە، کە خـوای بەخشـەر دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە، وە پاداشتێکی گـەورەیان دەبـێ، کـە بێگومـان ئـەوەش زەمینـە سازییەکی قورئـانیی بـوو بـۆ کـۆچ کـردن، دوای ئـەوەی کـە پێغەمبـەر ﷺ زەمینـە سـازییەکی سیاسـیو کۆمەڵایـەتیی بـۆ کـردوە، کـە دیـارە ئـەویش هـەر بـە وەحـی ئاراستەکردنی خوای زاناو شارەزا بووە، ئەمەش چەند ئایەتێك لەوبارەوە:

أ/ خـوای بەبـەزەیی دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الزمر، واتە: (ئەی موحەممەد! تۆ بەناوی منـەوە بـانگی بەنـدەکانم بکەو) بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم کە ئیمانتان هێناوە! پارێز لـە پـەروەردگارتان بکـەن، بۆ کەسانێك لە ئێوە، کە چـاکە دەکـەن لـە دونیـادا، چـاکە هەیـە لـە دوارۆژدا، وە سەرزەمینی خواش فراوانە (واتە: ئەگەر لە شـوێنێك دنیاتان لـێ وەتـەنگ هـات، وە ڕێگای دینداریی‌و خواپەرستییان لـێ گرتـن، ئەو شـوێنە بـەجێ بێڵـنو بچـن بـۆ شـوێنێکی دی، کـە خـوای پـەروەردگاری تێـدا لـە خۆتـان ڕازیـی بکـەن، وە شەریعەتی خوا لە ژیانی خۆتاندا جێبـەجێ بکەن)، بێگومان خۆڕاگران بێ حیسـاب پاداشتیان دەدرێتەوە.

ب/ وە خـوای بـێ هاوتـا دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ النحل، واتە: ئەوانەی کە لە پێناو خـوادا

کۆچیان کردوە دوای ئەوەی زوڵمیان لێکراوەو چەوسێنراونەوە، ئێمە هەر لە دونیا لە جێگایەکی باشدا نیشتەجێیان دەکەین، وە پاداشتی دوارۆژیش گەورەترە (لە دەرووڵێکرانەوەی دونیا) ئەگەر بزانن، ئەوانەی کە خۆڕاگرن، وە پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

ئەم ئایەتە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، کە بێگومان ئینسان بە بێ سەبرو خۆڕاگریی، وە بەبێ پشت بەستن بەخوا، ناتوانێ ماڵو حاڵو نیشتمانی خۆی بەجێ بێڵێو ڕوو لە غەریبیان بکاتو بەرگەی نەبوونییو نەدارییو خەمو پەژارەو ئازارو نارەحەتییو دووریی لە نیشتمانو کەسو کاری بگرێ.

ج/ خوای تاکو پاک دەفەرموێ: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: ئەی ئەو بەندانەم، کە ئیمانتان هێناوە! بێگومان سەرزەمینی من فراوانە، هەر من بپەرستن (واتە: لە هەر شوێنێك ڕێگای بەندایەتی کردنتان بۆ من لێ گیرا، ئەو شوێنە بەجێ بێڵن، چونکە ئینسان دەبێ بەندەی خوا بێ، نە بەندەی خاکەو نە بەندەی خەڵکە)، هەموو نەفسێك دەبێ مردنێ بچێژێ (جا ئەو مردنە لە ژیانی ژێردەستەییدا بیچێژێ یان لە ژیانی مەردایەتیو بەرەنگاربوونەوەی زۆردارانو ستەمکاراندا، بۆیە لە مردنێش مەترسن)، ئنجا دەفەرموێ: دوایی بۆ لای ئێمە دەگەڕێنرێنەوە، (کەواتە: وریابن بزانن چۆن دەگەڕێنەوە بۆ لامان، بەدەستی پڕی بەندایەتی یان بەدەستی خاڵیی! بۆیە دەبێ ئینسان هەوڵ بدات بە توێشووی بەندایەتییەوە بگەڕێتەوە)، ئنجا دەفەرموێ: وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە

باشەکان دەکەن لە بەهەشتێدا لـە کۆشـکە بەرزەکانـدا نیشـتەجێیان دەکـەین، کـە ڕووباریان بـە ژێـردا دەڕۆن، وە باشـترین پاداشـت پاداشـتی ئەوانەیـە، کـە بـۆ خـوا کاردەکەن، ئەوانەی کە خۆڕاگرن وە پشت بە پـەروەردگاریان دەبەسـتن، ئنجـا باسـی ڕۆزییان بۆ دەکـاو دەفـەرموێ: زۆر زینـدەوەر هەیـە ڕۆزییەکـەی خـۆی هەڵنـاگرێ، بەڵام خوا ڕۆزیی هەموویان دەدا، وە هی ئێوەش دەدا، وە خوا بیسەرەو زانایە.

**دووەم: فەرمـانـدان بە کۆچ کـردن:-**

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەهاوەڵـە بـەڕێزەکانی - خـوا لێیـان ڕازی بـێ-، کـە کۆچ بکەن بۆ (یثـرب)، لەوبارەوە دایکمان (عائشـة) -خـوا لێـی ڕازی بـێ- دەڵـێ[1]: (کاتێك ئەو حەفتا کەسەی، کە پەیـماننامەی دوومـی – عقبة-یـان لەگـەڵ پێغەمبـەر بەست) گەڕانەوە بـۆ شـاری – یثـرب-، پێغەمبـەر ﷺ بـەوە دڵـی زۆر خـۆش بـوو، چونکە خوای بەرزو شکۆدار قەڵایەکی بـۆ دروسـتکرد، وە کەسـانێك بوونـە پشـتیوانو پشـتگیریی کـە جـەنگاوەرو پیـاوی جـوامێر بـوون، ئنجـا دوای ئـەوەی موشـریکەکان زانیان، کە مسوڵمانەکان دەیانەوێ کۆچ بکەنو بـڕۆن، وە کەمێکیشـیان بیسـتبوویان، کە نوێنەرانی شـاری (یثـرب) لـە (ئـەوسو خـەزرەج) پەیـمانیان بـە پێغەمبـەر ﷺ داوەو مسوڵمان بوون، ئازارو ئەشکەنجەیان لەسەر بـڕواداران زیـاتر کـردو بەشـێوەیەك کەوتنە ئازاردانیان کە پێشتـر ئازاری وایان نـەدابوون، ئیـدی لـە ئەنـجامدا هـاوەڵانی بـەڕێزی پێغەمبـەر ﷺ داوای مۆڵـەتیان لـە پێغەمبـەر ﷺ کـرد، کـە کـۆچ بکـەن، (چونکـە هـاوەڵانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ بەبێ مۆڵـەت ئامادە نەبوون کارێکـی وا گرنگ بکـەنو نێو شـارەکە بـەجێ بێڵـن، ئەگـەر زیـاتریش لـەوە ئـازار درابـان)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی ئەوەدا فەرموی: **{إني أُريت دار هجـرتكم ذات**

---

١) طبقات ابن سعد، ج١، ص(٣٢٥).

**نخل بين لابتين، وهما الحرتان...}** رواه البخاري[1]، واتە: ئەو شوێنەی، کە کۆچی بۆ دەکەن پێشانم دراوە، شوێنێکە دارخورمای لێنو لەنێوان دوو بەرزاییدایە، کە بەردەکانی ڕەشن...).

(عائشة) دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ بە ڕوویەکی گەشەوە بە هاوەڵانی بەڕێزی فەرموو: **{قد أخبرتُ بدار هجرتكم وهي يثرب، فمن أراد الخروج فَلْيَخْرُجْ إليها}**[2]، واتە: هەواڵم پێ درا دەربارەی ئەو شوێنەی، کە کۆچی بۆ دەکەن، ئەویش (یثرب)ە، کێ دەیەوێ دەربچێ بۆی بچێ.

ئنجا مسوڵمانەکان دەستیان کرد بە کۆچکردنو هاوکاریی یەکدییان دەکرد، دوو دووو سێ سێ، ئەوانەی کە خزمی یەکدی بوون بە پەنهانی دەچوون بۆ (یثرب)، وە لەوێ پشتیوانەکان (الأنصار) هاوکاریان بوونو لە ماڵو حاڵی خۆیاندا حەواندیاننەوە، تا وای لێهات مسوڵمانان هەموویان لە شاری مەککە دەرچوونو دوای دوو مانگو چەند ڕۆژێك لە (بيعة العقبة الكبرى) کەس نەمایەوە لە مەککەدا جگە لە پێغەمبەر ﷺو (أبوبکر)و (علي) – خوا لێیان ڕازی بێ-، وە چەند کەسێك، کە موشریکەکان بەزۆر هێشتبیانەوە، یان یەکێك کە نەخۆشو پیرو پەککەوتە بوو نەیدەتوانی بەڕێدا بڕوا، واتە: بەس ئەوانەی، کە لەبەر هەر هۆیەك بێت نەیانتوانی کۆچ بکەن، ئەوانە لە مەککەدا مانەوە.

وە یەکەم کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەساڵێك پێش (پەیمانی عەقەبەی گەورە) کۆچی کردبوو بۆ مەدینە، (أبو سلمة بن عبدالأسد) بوو، وە دوای ئەو (عامر

---

١) صحيح البخاري: ٣٩٠٥، دیارە لە سەرەتادا بەخەون پێشانی دراوەو، دوای چەند ڕۆژێك خوای کاربەجێ لە ڕێگای وەحییەوە ناوی شوێنەکەی پێگوتوەو هەواڵی پێداوە.

٢) طبقات ابن سعد، ج١، ص(٣٢٥).

بـن ربيعــة)و خێزانەكــەی (ليلـی بنـت أبـي حثمــة)[1]، دووەمو سـێیەم كـەس بـوون كۆچيــان كرد.

## سـێیەم: هەڵوێسـتی كافـرانو ڕێگرییـان لە كـۆچ :-

لەبەرئەوەی كەسانی دەم ڕاستو زلەزلـەكانی مـەككـە زانيويانـە ئـەو كۆچـكردنەی مسوڵمانان بۆ شاری (يثرب) بە بەرنامـەيـەكی تۆكمـەو داڕێـژراوە بـووەو تـەنيا بريتـی نـەبووە لـە ڕاكـردنو خۆدەربـازكردن، وە زانيويانـە كـە ئـەوكارە نەخشـەيەكی سياسـی لەپشتەوەيەو شتی لەسەر بينا دەكرێو، سەرەنجام ئەوەی لە مـەككە بۆيان نەكراوە، لـە (يثرب) دەيكەنو هێزو پێز بنيات دەنێن، بۆيە بە هـەموو شـێوەيەك هەوڵيانـداوە كـە ڕێ لەو كۆچ كردنە بگرنو نەهێڵن خەڵكە مسوڵمانەكە مەككـە بـەجێ بـێڵن، بـۆ ئـەو مـەبەستەش چەند شێوازێكيان بەكارهێناوە، لەوانە:

## أ- ڕێ لێگـرتن:

وەكو لە بەسـەرهاتی (أم سـلمة)و (أبي سلمة)دا دەبينرێ، كە ژنو مێردێــك بـوون - خوا لێيان ڕازی بێـت-، وەك (أم ســلمة)[2] بۆمـان دەگێڕێتــەوە دەڵــێ[3]: كاتێـك سلمة) ويستی كۆچ بكا، حوشتــرەكەی هێنـاو منـی خسـتە سـەریو دوايـی ڕێشـمەی حوشتـرەكەی گرتو ويستی بكەوێتە ڕێ بەرەو (يثـرب)، كاتێك كـە خزمەكانــم (بـني مــخزوم) هەستيان پێكرد، هاتنە سـەر ڕێگـایو پێيــان گـوت: ئەگـەر خۆت دەڕۆی ئەوە دەسەڵاتی تۆمان نيە، بەڵام ئـەو ئافرەتـە هـی ئێمەيـەو قبـووڵ ناكـەين لەگــەڵت بێت، منيان بردەوە لای خۆيان، (بنو عبدالأسد)يش، كە خزمـانی (أبـو سـلمة) بـوون، گوتيــان: مــادام ئێـوە ئافرەتەكـەی لەگـەڵ ئيـزن نـادەنو لێـی دەسـتێننەوە، ئێمـەش

---

١) طبقات ابن سعد، ج١، ص(٣٢٥).
٢) (أم سلمة) — خـوا لێی ڕازی بێ- دوای مردنی هاوسەرەكەی، شووی بە پێغەمبەر ﷺ كردۆتەوە.
٣) بڕوانە: (السيـرة النبـوية...)، ج٢، ص(٢٤٢-٢٤٣).

ناهێڵین کوڕەکەمان لەلای ئەو ئافرەتە بێ‌و ئەوانیش کوڕەکەیان ڕاکێشا، بە جۆرێك خزمەکانی من‌و خزمەکانی (أبو سلمة) هەریەك لەلایەکەوە (سلمة)یان ڕادەکێشا تاکو قۆڵی (سلمة) لەجێ چوو، وە لە کۆتاییدا من لەلای خزمەکانم حەپس کرام، (سلمة)ی کوڕیشم لەلای خزمەکانی (أبو سلمة) مایەوە، وە (أبو سلمة)ش کۆچی کرد بۆ (یثرب)، وە نزیکەی ساڵێك من بەو شێوەیە مامەوەو زۆر دەگریام، (کە ئاوا بێ کوڕو مێرد ماوەتەوەو هەریەکەیان لە شوێنێکەو ئاگای لێیان نیەو خۆشی وەك دیل هێڵراوەتەوەو ناهێڵن کۆچ بکا) تاکو خزمەکانی خۆم بەزەییان پێدا هاتەوەو گوتیان: با واز لەو ئافرەتە بێنین، کە لە کوڕو مێردمان کردوە، ئنجا وازیان لێ هێنام‌و ڕێگایاندا، کە بڕۆم‌و لە ئەنجامی ئەوەدا خزمەکانی (أبو سلمة)ش کوڕەکەیان دامەوە، دوایی خزمەکانم ولاخێکیان دامێ‌و منیش لەگەڵ کوڕەکەم ملی ڕێم گرت بەرەو (یثرب) تاکو (تنعیم) چووم، لەوێ (عثمان بن طلعة)م بینی، کە تا ئەوکاتەش مسوڵمان نەبوو بوو.

گوتی: ئەوە بۆکوێ دەچی؟

گوتم: دەچم بۆ (یثرب).

گوتی: کەست لەگەڵە؟!

گوتم: نەخێر کەسم لەگەڵ نیە.

گوتی: ئەوە ناجوامێرییە، کە تۆ بەتەنیا بچی، بۆیە لەگەڵم هات هەتا گەیاندمیە ئەوێ (یثرب)، وە لەنێو عارەباندا پیاوی هێندە بەشەرم‌و بە ئەدەب‌و جوامێرم نەدیبوو[1]، لە پێشمەوە دەڕۆیشت، دوای ئەوەی، کە دەیزانی ماندوو بووم یان پێویستم بە دابەزین هەیە، ولاخەکەی بۆ یەخ دەدام‌و دادەبەزیم بۆخۆشی دەچوو

---

١) لە نێو عارەباندا هەندێك عادەت‌و ڕەوشتی جوامێرانە هەبوون، کە شەرع زۆر تەئکیدیان لەسەر دەکات، بۆ نموونە: ئەم هەڵوێستەی (عثمان بن طلحة).

بۆ شوێنێكی دوور، وه‌ ده‌یگوت ئه‌گه‌ر ئیشت ته‌واو بوو یان ئیسراحه‌تت كردو حه‌سایه‌وه‌ بانگم بكه‌، دوایی ده‌هاته‌وه‌و سواری وڵاخه‌كه‌ ده‌بوومه‌وه‌و ده‌كه‌وته‌وه‌ پێشم، به‌و شێوه‌یه‌ تا گه‌یشتینه‌ نزیك شاری (یثرب) گوتی: ئه‌وه‌ (یثرب)ه‌و ئه‌و له‌وێوه‌ گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ مه‌ككه‌و منیش چوومه‌ نێو شار.

## ب- ڕفاندن :-

یه‌كێكی دیكه‌ له‌ شێوازه‌كانی موشریكه‌كان بۆ ڕێگرتن له‌ كۆچكردنی مسوڵمانه‌كان، بریتی بوو له‌ (ڕفاندن)، واته‌: دوای ئه‌وه‌ی، كه‌ كابرا كۆچی كردوه‌ بۆ (یثرب)و گه‌یشتۆته‌ ئه‌وێ له‌ وێڕا بیهێننه‌وه‌، بۆ وێنه‌: به‌سه‌رهاتی (عیاش بن أبي ربیعة)، كه‌ كوڕه‌ مامی (أبو جهل) و (الحارث بن هشام) بووه‌و برای دایكیشیان بووه‌، (ابن هشام)[1] ده‌گێڕێته‌وه‌، كه‌ (عمر بن الخطاب) -خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویه‌تی: من‌و (عیاش بن أبي ربیعة) له‌گه‌ڵ (هشام بن العاص) هه‌رسێكمان بڕیارماندا، كه‌ به‌یه‌كه‌وه‌ كۆچ بكه‌ین، شوێنێكمان دیاری كرد، كه‌ له‌وێ یه‌كدی ببینینه‌وه‌، من‌و (عیاش) گه‌یشتینه‌ ئه‌وێ زۆر چاوه‌ڕێی هیشاممان كرد به‌ڵام نه‌هات، زانیمان كه‌ گیراوه‌، بۆیه‌ ئێمه‌ ڕۆیشتین، دوای ئه‌وه‌ی چووینه‌ (یثرب) چه‌ند ڕۆژێكی پێچوو، (أبو جهل)و (الحارث بن هشام) هاتن‌و به‌ (عیاش)یان گوت له‌به‌رئه‌وه‌ی، كه‌ تۆ دایكت به‌جێهێشتوه‌ سوێندی خواردوه‌، كه‌ نه‌ سه‌ری دابێنێ‌و نه‌ خۆی بشوا، نه‌ بچێته‌ به‌ر سێبه‌ریش، تا نه‌تبینێته‌وه‌، (عیاش)یش به‌زه‌یی پێدا هاته‌وه‌.

(عمر) ده‌ڵێ: منیش گوتم: (عیاش) ئاگات له‌ خۆت بێ! ئه‌وه‌ قه‌ومه‌كه‌ت ده‌یانه‌وێ له‌ دین هه‌ڵت بگێڕنه‌وه‌، به‌خوا ئه‌گه‌ر دایكت سه‌ری بخورێ‌و ئه‌سپێی تێبكه‌وێ، گوێ ناداتێ، سه‌ریشی ده‌شوا‌و شانه‌شی ده‌كات‌و ئه‌گه‌ر گه‌رمای مه‌ككه‌ش تینی بۆ بێنێ، ده‌چێته‌ به‌ر سێبه‌رێش.

---

١) سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ج٢، ص(٢٤٥-٢٤٧).

ئەویش گوتی: ئاخر هەردەبێ بچم، چونکە هەندێك ماڵو سامانم لەوێیە نەم هێناوە....

منیش پێم گوت: (عیاش)! من یەکێکم لە دەوڵەمەندەکانی قورەیش، نیوەی ماڵەکەم بۆ تۆ! بەڵام لەگەڵیان مەچۆوە.

گوتی هەر دەبێ بچم.

گوتم: مادام هەر دەچی، با ئەو حوشترەت وێ بدەم، حوشترێکە زۆر بە غارو چاکە، ئەگەر زانیت فێڵەو لێیان کەوتیە گومان، سواری بەو خۆت دەرباز بکە.

ئیدی (عیاش) لەگەڵیان دەچێو بەرلەوەی بگەنە مەککە، (أبو جهل) پێی دەڵێ: ئەی برازا! ئەو حوشترەی من سواربوونی زۆر ناخۆشە تۆزێك لەو حوشترەی تۆ لەدوای خۆتەوە سوارم ناکەی؟

(عیاش) دەڵێ: بەڵێو (أبو جهل) لە پشتیەوە سوار دەبێ، دوایی بە هەردووکیان (عیاش)ی دەگرنو، دەیهێننە خوارێو دەستو پێی دەبەستنو دەیبەن لە مەککە حەپسی دەکەن.

عومەریش – خوا لێی ڕازی بێ- حوشترەکەشی لەقیس چوو، بەڵام دوایی (الولید بن الولید بن المغیرة) بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی دەفەرموێ: **{من لي بعیاش بن أبي ربیعة، وهشام بن العاص}** ؟! و (ولید)یش دەڵێ: من، لە (یثرب)ەوە دەچێت بۆ مەککە، بۆ ئەوەی (عیاش)و (هشام بن العاص) دەرباز بکاو بە نهێنی دەچێ شوێنەکەیان دەبینێتەوە، کە تەماشا دەکات بە زنجیر بەستوویاننەوە، بەڵام بە شمشێرەکەی زنجیرەکە دەپسێنێو دەربازیان دەکات.

کەواتە یەکی دی لە شێوازەکانی موشریکەکان بۆ ڕێگرتن لە کۆچی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، بریتی بوو لە ڕفاندن (إختطاف).

## ج- بەندكردن:-

یەكێكی دیكە لە شێوازەكانی ڕێگریی كردن لە كۆچی مسوڵمانەكان بۆ (یثرب) بریتی بووە لە (حەپس) كردن، واتە هەر لە مەككە زیندانییان دەكردنو نەیاندەهێشت كۆچ بكەن، بۆ وێنە، بەسەرهاتی (هشام بن العاص بن وائل السهمي) – خوا لێی ڕازی بێ- كە یەكێك بووە لەو سێیانەی بڕیاریاندا كە بەیەكەوە كۆچ بكەن.

(هشام) هەر لە مەككەدا حەپس دەكرێو ناتوانێ كۆچ بكات، هەواڵ بە (عمر) - خوا لێی ڕازی بێ- دەگات، كە (هشام) زۆر ئازارو ئەشكەنجە دەدرێو گوایە هەڵگەڕابێتەوە، بۆیە چەند ئایەتێكی لە سوورەتی (الزمر) بۆ دەنێرێ، دیارە ئەو ئایەتانەش زۆر ئومێد بەخشنو لە ئومێد بەخشترین ئایەتەكانی خوای پەروەردگارن بۆ تاوانباران، وەك فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾﴾ الزمر، واتە: (ئەی موحەممەد بانگی بەندەكانم بكە) بڵێ: ئەی بەندەكانم، كە دەرحەق بەخۆتان زیادەڕەوییتان كردوە، لە ڕەحمەتو بەزەیی خوا نائومێد مەبن، خوا لە هەموو گوناهەكان دەبووری، وە بگەڕێنەوە لای پەروەردگارتانو بۆی ملكەچ بن بەرلەوەی سزاتان بۆ بێو پشتتان نەگیرێ، وە بكەونە شوێن چاكترین شتێك، كە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان نێرراوەتە خوار، بەرلەوەی كتوپڕو بێئەوەی هەست بكەن سزا (ئازار)تان بۆبێ.

عومەر دەڵێ: ئەو سێ ئایەتەم بەدەستی خۆم لەسەر چەرمێك نووسیو ناردم بۆ (هشام بن العاص)، (هشام)یش دەڵێ: كە ئەو نامەیەم بەدەست گەیشت، هەرچەندە دەمخوێندەوە تێیان نەدەگەیشتم، دوایی چوومە شوێنێكو گوتم خوایە ئەو ئایەتانەم

لـێ حاڵی بکە، دوایی خوای بە بەزەیی دڵی ڕۆشـن کردمـەوەو حـاڵی بـووم، کـە ئـەوە ڕێگاکردنەوەیە بۆ مـن، کە ئەگەر تووشی هەڵەو کەموکوڕییەکیش بووبم، خوا دەرگـای تۆبەی کراوەیە، بۆیە سـواری وڵاخەکـەم بوومو بەرێکەوتم بۆ (یثـرب).

## د - ماڵ لـێ زەوتکـردن:-

یەکی دیکە لە شێوازەکانی بێبڕوایان بۆ ڕێگـاگرتن لـە کۆچـی هـاوەڵانی بـەڕێز لـە (مـەککە) وە بۆ (یثرب)، بریتی بوو لە ماڵ لـێ زەوتکردن.

بۆ وێنە: (ابن هشام) دەڵـێ لـە (أبـي عثمـان النهـدي)یـەوە بـۆم گێڕدراوەتـەوە کـە گوتوویەتی لە (صهيب بن سنان)ەوە پێم گەیشتوە کـە کاتێـك ویسـتوویەتی هیجـرەت بکا بۆ (یثرب) کافرەکانی (مەککە) پێیـان گوتـوە تـۆ کـە هاتیـە نێومـان کابرایـەکی نەدارو هەژار بووی‌و هیچت نەبوو، ئێستاش دەتەوێ خۆت‌و ماڵ‌و سـامانەکەت دەربـاز بکـەی؟ سـوێند بـەخوا قبـوڵ ناکـەین بـڕۆی، (صـهيب)یش پێـی گوتـوون: ئایـا کـە ماڵەکەمتان بدەمێ ڕێم پێ دەدەن بڕۆم؟ گوتوویانە: بەڵێ، ئەویش ماڵەکەیان دەداتێ‌و کۆچ دەکات بۆ (یثرب).

پێغەمبەر ﷺ لە مـەدینەوە دەفـەرموێ: **{ربح صهيب، ربح صهيب}**، واتـە: صوهەیب قازانجی کرد، صوهەیب قازانجی کرد[1].

وە (عـکرمة) دەگێڕێتەوە، کە کاتێك (صهيب) ویسـتوویەتی کـۆچ بکـات، خـەڵکی مـەککە دوای کەوتوون‌و گرفتیان بۆ دروسـت کـردوە، ئـەویش بۆیـان دامـەزراوەو چـل تیـری لـە تیـردان دەرهێنـاوەو پێـی گوتـوون: ئەگـەر بتانـەوێ زیانـم پـێ بگەیـەنن ناتـوانن‌و بـە هـەر تیـرەی یـەکێکتان دەکـوژم، دوایـی هـەتا دەسـتم شـمشێر بگـرێ شـەڕتان لەگـەڵ دا دەکـەم، خۆتـان دەزانـن مـن مـەردم‌و لێتـان قبـووڵ ناکـەم، ڕێـم بـەربدەن، ئەو ماڵەی لە مەککە بەجێم هێشتوە با بۆ ئێوەبێ.

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٤٧).

www.alibapir.com

(عکرمة) دەڵێ: ئەم ئایەتە بەم بۆنەیەوە هات بۆ پێغەمبەر ﷺ ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٢٠٧ ﴾ البقرة، دوایی کە پێغەمبەر ﷺ بینی پێی فەرموو: **{یا أبا یَحْیی ربح البیع}**، واتە: ئەی ئەبوو یەحیا بازرگانییەکە قازانجی کرد)[1]، ئایەتەکەشی بۆ خوێندەوە، مانای ئایەتەکەش ئاوایە: لە خەڵکی هەیە، کە خۆی دەکڕێتەوە لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا (پارەکەی دەداتو خۆی دەکڕێ)، بێگومان خوا بەرامبەر بە بەندەکانی زۆر بەبەزەییو میهرەبانە.

بەو شێوەیە کافرەکان هەرچی هۆکارە بەکاریانهێناوە، بۆ ڕێگاگرتن لە کۆچو کۆچباری هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێت-، بەڵام ئەوان ئامادەبوون دەستبەرداری هەموو شتێك بن، لە پێناو بەجێهێنانی فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺدا.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئیمانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چەندە دامەزراوو نەلەخشاو بووەو، چەندە ژیانی خۆیان بە قوربانی دینی خوا کردوەو ڕەزامەندیی پەروەردگاریان مەبەست بووە، کە ماڵو سامانو خۆشی ماددییو مەعنەوییان لەو پێناوەدا وەلاناوەو، ژیانی دنیا چەندە لای کافرەکان شیرینو مەبەست بووە، ئەوەندەو زیاتر لە پێناو خوادا لای هاوەڵان کەم نرخو بێبایەخ بووە.

لە هەموو کاتو شوێنێکیشدا هەربەوجۆرە نەیارانی ئیسلام بەچەندین شێواز هەڕەشە دەکەنو چاو لە ئیمانداران سووردەکەنەوە لەپێناو هەڵگەڕانەوەو ساردکردنەوەیانو شێوازی جۆراو جۆر بۆ ئەو مەبەستە بەکار دێنن، بەڵام بەئاواتیان ناگەن، چونکە مسوڵمانانی ڕاستەقینە هەموو شتێكو تەنانەت گیانیشیان دەکەنە قوربانی ئایینەکەیانو مەبەستی هەرەبەرزیان ڕەزامەندیی خوایە.

---

١) رواه الحاكم، وقال: صحيح على شرط مسلم.

## کۆچکـردنی پێغـەمبـەر ﷺ لەگەڵ (أبوبكر)دا رضي الله عنه بـەرەو (يثـرب):

چۆنیەتی کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (ابو بكر) -خوا لێـی ڕازی بـێ- بـەرەو (يثـرب) لە دە خـاڵاندا دەخەینە ڕوو، بەم شـێوەیە:

**یەکـەم:-** (ابن اسحاق) دەڵـێ[1]: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوای ئـەوەی، کـە هـاوەڵانی بەڕێزی کۆچیان کـرد لـە مەککـەوە بـۆ (يثـرب)، چاوەڕێی دەکـرد مۆڵـەت بـدرێ‌و ئەویش کۆچ بکا، وە هیچ کەس لە مسوڵمانان لە مەککە نـەمابۆوە مەگـەر ئـەوەی کە حەپس کرابێ، یان لەژێر ئازارو ئەشکەنجە دامابێ، یان نەخۆش‌و پەککەوتە بـێ، جگە لە پێغەمبەر ﷺو (أبو بكر)و (علي) -خـوا لێیـان ڕازی بـێ- وە ئەبووبـەکر چەند جارێك داوای مۆڵەتی لە پێغەمبـەر ﷺ دەکـرد، کـە ڕێگـای بـدا کـۆچ بکـا، پێغەمبـەر ﷺ ئاوا وەڵامـی دەدایەوە **{لا تـعجل لعـل الله يـجعل لك صـاحـباً}**، واتـە: پەلە مەکـە بـەڵکو، خـوا هاوەڵێکـت بـۆ بڕەخسـێنێ، وە دەیفـەرموو: **{على رسلك، فإني أرجو أن يؤذن لي}** رواه البخـاري[2]، واتـە: ڕاوەسـتـە! ئومێـدم وایـە مۆڵـەت بـدرێم، دیـارە ئەبووبەکـریش ئومێـدی وابـوو ببێتـە هاوەڵـی پێغەمبـەری خوا ﷺ لە هیجرەتدا.

**دووەم:-** (ابن هشام) دەڵـێ[3]: کاتێك قورەیش زانییان، کە پێغەمبەر ﷺ بنکەیەکی جەماوەریی‌و قەڵایـەکی مەحکـەمی بـۆ دروسـت بـووەو هـاوەڵانی بـەڕێزی کۆچیـان کـردوە بـۆ (يثـرب)و ئـەویش هـەرکاتێك بیـەوێ دەچـێتە نێویـان‌و کـاری گـەورەی لەدەست دێ، وە دوای ئەوەی هەواڵیان پێ‌گەیشـت، کەوا مسوڵمانەکان لـە (يثـرب) لەلایـەن (ئـەوس‌و خـەزرەج)ەوە پێشـوازییان لێکـراوەو حەوێنراونـەوەو پشـتیوانیی

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢٤٨-٢٤٩).
٢) صحيح البخاري: ٣٩٠٥.
٣) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٤٩-٢٥٠).

www.alibapir.com


کراون، قورەیشییەکان ترسان، کە پێغەمبەریش ﷺ کۆچ بکا بۆ (یثرب)، وە لەوێ بڕیاری ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ بدات‌و ئەو قۆناغەی لاوازیی مسوڵمانان بەسەر بچێ‌و، مسوڵمانان بچنە قۆناغێکی دیکەی ئامادەیی جەنگ‌و قبووڵ نەکردنی ئەشکەنجەوە، بۆیە سەرانی قورەیش لە (دار الندوة)[1]، کە خانووی (قصي بن کلاب) بوو کۆبوونەوەو ڕاوێژیان کرد، کە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ چ بڕیارێك بدەن! لەوکاتەدا ئیبلیس لەشێوەی پیاوێکی ڕیش سپی بەتەمەندا[2] دێتە بەر دەرگای (دار الندوة)و پرسیاری لێ دەکەن تۆ کێی؟ دەڵێ: من پیاوێکی بەتەمەنم‌و خەڵکی (نجد)م، بیستوومە بۆ مەسەلەیەك کۆدەبنەوەو منیش ڕاو پێشنیارم هەیە لەوبارەوە بەڵکو سوودی لێ ببینن، شایانی باسیشە ئەوانەی لەو کۆبونەوەیەدا بەشداربوون لە زلەزلەکانی قورەیش بریتی بوون لە: (عتبة بن ربيعة، شيبة بن ربيعة، ابو سفيان بن حرب، طعيمة بن عدي، جبير بن مطعم، الحارث بن عامر، النضر بن الحارث، أبو البختري بن هشام، زمعة بن الاسود، حكيم بن حزام، ابو جهل بن هشام، نبيه ومنبه ابنا الحجاج، أُمية بن خلف)، ئنجا (أبو البختري بن هشام) ڕای خۆی دەردەبڕێ‌و دەڵێ: من ڕەئیم وایە، کە موحەممەد زیندانی بکەین، وە بە کەلەپچەی ئاسن دەست‌و پێی ببەستین‌و چاوەڕێ بکەین، تا لە ژوورێکدا دەمرێ، وەك چۆن شاعیرانی پێشوو وەك (زهير بن أبي سلمى)و (نابغة الذبياني) کە تووشی لادان بوون، بەو شێوەیە زیندانی کراون تا مردوون، پیرەمێردە (نجد)یەکە دەڵێ: ئەو پێشنیارە باش نیە، چونکە ئەوانەی، کە شوێنی کەتوون، دێن‌و هێرشتان دەکەنە سەرێ‌و لە زیندان دەریدێنن.

---

١) دار الندوة: خانووی (قُصَي بن كلاب) بووە، کە قورەیشییەکان بۆ هەر کارێکی گرنگ لەوێدا ڕاوێژیان دەکردو بڕیاریان دەدا!.

٢) ئەو پیاوە بەتەمەنە- ابلیس- شەیتانە، کە خۆی بردۆتە سەر شێوەی پیاوێکی –نەجد-یی.

ئنجا یەکی دیکەیان دەڵێ: با دووری بخەینەوەو لە نێوماندا نەمێنێو بۆ خۆی دەچێتە کوێ با بچێ، دووبارە کابرای نەجدیی دەڵێ: ئەو پێشنیارەش بەکەڵك نایەت، چونکە بۆخۆتان دەزانن، کە ئەو پیاوە ئینسانێکی چەندە قسەزانو سەرنج ڕاکێشەو کاریگەریی هەیە بۆ سەر ئەوانەی، کە قسەیان لەگەڵدا دەکات، بۆیە بچێتە هەر شوێنێك شوێنکەوتووانی زۆر بۆخۆی پەیدا دەکاو دوایی دێتو ئێشتان لەدەست دەردێنێو هەرچی بیەوێ پێتان دەکات.

(أبو جهل) دەڵێ: من ڕایەکم هەیە لەوانەیە تا ئێستا کەستان فکرتان پێ نەشکابێ، گوتیان ئەو ڕایە چییە؟ گوتی: لە هەر تیرەو هۆزێك گەنجێکی بەهێزو خاوەن نەسەبو ماقوولو دیار بێنینو، یەکی شمشێرێکی بڕەندەو تیژیان بدەینە دەستو شەو بچنە سەر موحەممەدو هەموویان پێکەوەو بەیەکجار شەبەیخوون بکەنە سەریو بە شمشێر لێی بدەنو بیکوژنو ڕزگارمان دەبێ، ئەگەر وایان کرد، خوێنەکەی بەنێو هەموو تیرەکانی عارەبدا بڵاو دەبێو ئەوکاتیش (بني هاشم) بەتەنیا هیچیان پێ ناکرێت.

پیرەمێردی نەجدیی دەڵێ: قسەی چاك ئەوەیە، کە ئەو پیاوە کردی، وە من جگە لەو پێشنیارە هیچ بۆچوونێکی دیکە پەسەند ناکەم، ئیدی سەرەنجام هەموویان لەسەر ئەوە ڕێککەوتنو بڵاوەیان کرد.

خوای باڵا دەست باسی ئەو سێ پێشنیارەی کافرەکان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنفال، واتە: وە (ئەی موحەممەد!) یادی ئەو کاتە بکەوە، کە ئەوانەی بێبڕوان پیلانیان دەگێڕا، کە زیندانییت بکەن، یان بتکوژن، یاخود دەرتبکەن، ئەوان پیلانیان دەگێڕاو خواش وەڵامی پیلانەکەی دانەوەو نەخشەی بۆ دەکێشای، خوا باشترین نەخشە دانەرە.

**سێیەم:-** (بخاري)[١] و (ابن هشام)[٢] لە (عائشة) دایکی بڕوادارانەوە - خوا لێی ڕازی بێ- هێناویانە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو، کە ئەگەر هاتبا پێش نیوەڕۆ، یان دوای نیوەڕۆ دەهات بۆ ماڵی بابم، بەڵام ئەو ڕۆژەی، کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا مۆڵەت درا، کە کۆچ بکا لە (مەککە) وە بۆ (یثرب) کاتی نیوەڕۆ، کە قەت عادەتی وا نەبوو لەو وەختانەدا بێ بۆ لامان[٣]، هات، کە (أبوبکر) پێغەمبەر ﷺی بینی، گوتی: دیارە شتێك هەیە بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەم کاتەدا دێت بۆ لامان، ئنجا کە هات (أبو بکر) جێگاکەی خۆی بۆ چۆڵ کردو فەرمووی لێکردو پێغەمبەر ﷺ دانیشتو فەرمووی: (أبو بکر) کێی لێیە با بچێتە دەرەوە چەند قسەیەکم هەن، (ابو بکر) گوتی: بە دایكو بابەوە بەقوربانت بم، تەنیا دوو کچەکەم (عائشة وأسماء)ی لێن، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا مۆڵەتی پێدام، کە کۆچ بکەم، (أبو بکر) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا منیش لە خزمەتدا دەبم لەو کۆچەدا؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، (عائشة) دەڵێ: سوێند بەخوا تا ئەوکاتەش نەمدەزانی، کە جاری واهەیە دەگونجێ ئینسان لە خۆشیان بگری، تا (أبو بکر)م بینی، کە لە خۆشیان فرمێسکی بەچاواندا هاتنە خوار، ئنجا (أبو بکر) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دوو حوشتری سوارییم هەن، کە بۆ ئەو مەبەستەم ئامادە کردوون، پاشان (أبو بکر) (عبدالله بن أرقط)ی بەکرێ گرت، کە پیاوێکی زۆر شارەزا بوو، بۆ ئەوەی ڕێگایان پێشان بدا، وە هەردوو وڵاخەکەی لەلا دانا، تاکو ئەو ڕۆژەی، کە ئاگاداری دەکەنەوە.

---

١) صحيح البخاري: ٣٩٠٥و ٤٠٩٣.
٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٥١-٢٥٢).
٣) چونکە پێغەمبەر ﷺ زۆر موراعاتی خەڵکی کردوەو لە کاتێکدا سەردانی نەکردوون، کە کاتی ئیسراحەتیان بێ.

**چوارەم:-** (ابن اسحاق)[1] دەڵێ: نەمزانیوە، کە هیچ کەس بەو کۆچکردنەی پێغەمبەری زانیبێ جگە لە (أبو بکر)و (علي)و دوو کچەکەی (أبو بکر) -خوا لە هەموویان ڕازی بێ-، وە پێغەمبەر ﷺ عەلی بەجێهێشت لە شوێنی خۆی بۆ ئەوەی ئەو ئەمانەتو ڕاسپاردانەی خەڵك کە لەلایان دانا بوو، دوای ئەوەی کە بەرەو (یثرب) کۆچ دەکات، ئەو ڕاسپاردانە بداتەوە دەست خاوەنەکانیان، چونکە هەرکەسێك لە (مەککە) شتێکی گرانبەهای هەبوو بایەو لە فەوتانی ترسابایە، لەلای پێغەمبەری دادەنا ﷺ، دیارە پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە ئەمیندارو جێی متمانەی خەڵك بووە، کە هەندێك لەوانەی باوەڕیشیان پێی نەبووە، شتی خۆیان لەلا داناوەو بە ئینسانێکی ڕاستو ساغو ئەمینداریان زانیوە، بۆیە پێویستە مسوڵمان لەگەڵ کافرانیشدا لەو ئاستە بەرزەی، کە ڕەوشتی ئیسلامیی دەیخوازێ، نەیەتە خوار، وە لەگەڵ هەموو کەسدا بە باشەو بەو شێوەیەی کە شەرع دەڵێ مامەڵە بکات.

**پێنجەم:-** (ابن هشام)[2] دەڵێ: ئەو شەوەی کە بڕیار بوو پێغەمبەر ﷺ مەککە بەجێ بهێڵێ (جبریل) هاتەلایو پێی گوت: (لا تبق هذه الليلة على فراشك الذي كنت تبيت فيه)، واتە: ئەمشەو لەسەر ئەو جێگایەی کە جاران تێیدا دەخەوتی مەمێنەوە، دوای ئەوەی کە شەو تاریك دادێ، کافرەکان کۆ دەبنەوەو چاوەڕێی دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، کە داخۆ کەی دەخەوێ بۆ ئەوەی شەبەیخوونی بکەنە سەرو پەلاماری بدەن، پێغەمبەر ﷺ، کە ئاوایان دەبینێ بە (عەلی) دەفەرموێ: **{نَمْ على فراشي وتسجَّ ببردي هذا الحضرمي الأخضر فنم فيه، فإنه لن يخلص إليك شيء تكرهه منهم}**، واتە: لەسەر جێی من بخەوەو، بەو پۆشاکە حەضرەمییە سەوزەی من خۆت داپۆشە، وە هیچ شتێك، کە پێت ناخۆش بێ لەوانەوە بە تۆ ناگات.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢٥٢).
٢) هەمان سەرچاوە، ج٢، ص(٢٥٠).

www.alibapir.com


**شەشەم:-** ئەو[(١)] شەوە پێغەمبەر ﷺ، کە لەماڵ چۆ دەر، چنگە خۆڵێکی هەڵگرتو بەسەر سەری کافرەکانی دا کرد، خوای زاڵو شکۆدار چاوی کافرەکانی لە ئاست ئەودا کوێر کرد، وە سەرەتای سوورەتی (یس)ی خوێند تاکو: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ یس، وە پێغەمبەر ﷺ کە ئەم ئایەتەی خوێند، هیچ کام لەوانە نامێنێت کە خۆیان بۆ مەڵاس دابوو، کە هەندێك خۆڵی نەکەوێتە سەری، دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەرباز دەبێ، یەکێك لە کافرەکان پێیان دەڵێ: ها، ئەوە چاوەڕێی چی دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن چاوەڕێی موحەممەد دەکەین، کابرا دەڵێ: بەدبەختینە موحەممەد ڕۆیی‌و دەربازی بوو، یەکێك لە کۆمەڵەکە دەچێت لە درزی دەرگاکەی ماڵی پێغەمبەرەوە تەماشا دەکات، دەڵێ نەخێر وانیە ئەو هەر لەسەر جێگەی خۆیەتی‌و نەهاتۆتە دەر، وە ئەوان تا بەیانی چاوەڕێ دەکەن، دوایی بۆیان دەردەکەوێ کە ئەوەی لە جێگاکە دێتە دەرێ (عەلی)یە -خوا لێی ڕازی بێ-.

**حەوتەم:-** (ابن هشام)[(٢)] دەڵێ: دوای ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوە دەچێ بۆ ماڵی (أبو بکر) لە دەرگای دواوەی ماڵی ئەبووبەکرەوە دەچنە دەر نەك لە دەرگای ئاساییەوە، وە لەوێوە پێکەوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەچن بۆ ئەشکەوتێك لە شاخی (ثور)، کە چیایەکە لە خوار مەککەوەو پێچەوانەی ئاڕاستەی شاری (یثرب)ە، بۆ سەرلێشێواندنی کافرەکان، وە لە کاتی دەرچوونیدا پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێك بەناوی (حزورة) وەستاو فەرمووی: **((والله انكِ لخير أرض الله وأحبُّ أرض الله الى الله، ولولا اني أُخرِجْتُ مِنْكِ ما خرجت))**[(٣)]، واتە: سوێند

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٢، ص(٢٥١).

٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢٥٢-٢٥٣).

٣) رواه الترمذي: ٣٩٢٥.

بەخوا تۆ باشترین سەرزەمینی خوای و خۆشەویستترین سەرزەمینی خوای لای خوا، وە ئەگەر لێت دەرنەکرابام، بۆخۆم بەجێم نەدەهێشتی.

پاشان (أبوبکر) دوای ڕاوێژکردنی بە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە نەخشەی کار دادەنێ :

١) فەرمان دەکات بە (عبدالله)ی کوڕی، کە ڕۆژێ لەنێو شاربێ و هەست ڕابگرێ داخۆ دەنگ و باس چییەو کافرەکان چی دەڵێن دەربارەی پێغەمبەر ﷺ ؟! وە دوایی ئەو هەواڵانەیان بۆ بەرێ.

٢) فەرمان دەکات بە (عامر بن فهیرة)، کە شوانی مەڕەکانی (أبوبکر) بووە، کە ئێواران مەڕەکان بەلای ئەواندا بەرێ بۆ ئەوەی سوود لە شیرەکەیان ببینن و ئەگەر پێویستیشی کرد، لێیان سەرببڕن، شوێن پێی ئەوانیش، یان هی (عبدالله)ش بسڕنەوە.

٣) وە فەرمانیش دەکا بە (أسماء)ی کچی، کە شەوانە خواردنیان بۆ بێنێت[1]، وە هەندێك جار بە پشتێنەکەی خۆی خواردنەکەی بەستوەو، جارێکیان بۆ ئەو مەبەستە کەرتی کردوە، بۆیە پێیانگوتوە خاوەن دوو پشتێن (ذات النطاقين)، وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە[2].

**هەشتەم:-** (ابن هشام)[3] دەڵێ: شەوێ، کە دەچنە نێو ئەشکەوتەکەوە، لەپێشدا (أبو بکر) دەچێتە نێوی دەگەڕێ و دەست بەنێو هەموو کونەکاندا دەگێڕێ، نەوەك دڕندەیەك، مارێك، شتێکی زیان بەخشی لێبێت، ئازار بە پێغەمبەر ﷺ بگەیەنێ و (أبو بکر) خۆی کردۆتە بەلاگێڕەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، چونکە هەموو جارێ، کە گوتوویەتی: (دایك و بابم فیدات بن!) (فداك أُمي وأبي) ئەوە هەر بەقسە

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢٥٣).

٢) (صحيح البخاري): ٣٩٠٧.

٣) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص(٢٥٢).

نەبووە، بەڵکو بە کردەوە ئامادە بووە خۆی بەفیدا بکات، ئنجا دوای ئەوەی، کە دڵنیا دەبێ ئەشکەوتەکە هیچی لێنیە، داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکا کە بچێتە ژووری، بەو جۆرە پێغەمبەر ﷺو (أبو بكر) سێ ڕۆژان لەو ئەشکەوتەدا دەمێننەوە، قورەیشییەکانیش کە دەزانن هەردووکیان لە مەککە دەرچوون (١٠٠) حوشتر دەکەنە خەڵات بۆ هەرکەسێك، کە پێغەمبەر ﷺو (أبو بكر) بە زیندوویی یان مردوویی بێنێتەوە بەردەستیان.

دیارە موشریکەکانی مەککە زۆر بە بایەخ پێدانەوە بەدوایاندا دەگەڕێنو دەکەونە پشکنینو گەڕانو پرسیار، وە هەندێکیان دەگەنە ئەشکەوتی (ثور)و دەوروپشتی، لەوبارەوە (أبو بكر) -خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوە: **((قلت للنبي ﷺ وأنا في الغار لو أن أحدهم نظر تحت قدميه لأبصرنا، فقال: ما ظنك يا أبا بكر باثنين الله ثالثهما))**؟ رواه البخاري[1]، واتە: تەماشام کرد پێیەکانیانم بینی لە کاتێکدا ئێمە لەنێو ئەشکەوتەکەدا بووینو ئەوانیش بەسەر سەرمانەوە بوون، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر یەکێکیان تەماشای بن پێی خۆی بکا ئێمە دەبینێ! ئەویش فەرمووی: ئەی (أبوبكر)! گومانت چۆتە بەرانبەر دوو کەس، کە سێیەمینیان خوا بێت؟! خوای پەروەردگاریش لەوبارەوە ئەو ئایەتەی ناردەخوار، کە دەفەرموێ:

﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾ التوبة، واتە: (ئەی مسوڵمانینە!) ئەگەر ئێوە پێغەمبەری خوا

---

١) صحيح البخاري: ٣٦٥٣.

سەرنەخەن‌و پشتی نەگرن، ئەوە بێگومان خوا سەری دەخات‌و پەکی ناکەوێ، کاتێك کە ئەوانەی بێبڕوان دەریانکرد لە شارەکەی، دووەمی دووەکان بوو لە ئەشکەوتەکەدا، کاتێك کە بە هاوەڵەکەی دەگوت: خەمت نەبێ خوا لەگەڵمانە، خواش ئارامیی خۆی ناردەسەری، وە بە کۆمەڵێك سەرباز پشتگیریی کردو یارمەتیدا کە ئێوە نەتاندەبینین، وە خوا وشەی ئەوانەی بێبڕوان سەرەوژێر کردو فێڵ‌و پیلانی ئەوانی وەبن خست، وە بێگومان هەر وشەی خواو نەخشەی خوا لە سەرەوەیەو بەتەئکید خوا بالادەستی کاربەجێیە.

**نۆیەم:-** (ابن هشام)[1] دەڵێ: دوای ئەوەی، کە سێ شەوەکان تێپەڕین، خەڵك وردەوردە ئارام بۆوە، ئەو کابرایەی کە بەکرێیان گرتبوو (عبدالله بن أريقط) کە تا ئەوکاتیش هەر موشریك بوو، حوشترەکانی بۆ هێنان، وە حوشترێکیشی بۆخۆی هێنابوو، ئنجا (أسماء)ی کچی (أبو بكر) - خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ-، خواردنی بۆ دەهێنان لە تێلەکەی ناندا (شتێك، کە نان‌و پێخۆری تێدەکەن)، بەڵام پەتی لەبیر چووبوو پێی ببەستێ، لەبەرئەوە پشتێنەکەی خۆی کردە دوو بەش، بەشێکیان دەمی سفرەکەی پێ بەست، بەشەکەی دیکەشی کردە پشتێن، وەك پێشتریش باسمان کرد.

بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (أبوبكر) بەڕێکەوتن بۆ (یثرب)و دوای بەڕێکەوتنیان چەند شتێك ڕوویاندا:

---

١) (السيرة النبوية)، ج٢، ص(٢٥٣).

١) (أسماء) دەڵێ[١]: (أبو جهل) هات بۆ ماڵمانو لێی پرسیم بابت لەکوێیە؟ گوتم: نازانم، هەر کە وامگوت یەك زللەی لێدام گوارەکەم لە گوێ پەڕی، دیارە کابرایەکی زۆر ناجوامێر بووەو زۆربەی کافرانیش هەروان.

٢) (أبو قُحافة)[٢] بابی (أبو بكر)، کە کوێر بووە، بە کچەکانی (أبوبکر) دەڵێ: باشە ئەرێ ڕۆڵە (أبو بكر) ڕۆیشتوە، هیچی بۆ بەجێهێشتوون؟! (أسماء) دەڵێ گوتم: بەڵێ باپیرە خەمت نەبێ، لەکاتێدا، کە هیچیشی بۆ بەجێنەهێشتبووینو هەموو ماڵەکەی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، کە پێنج هەزار یان شەش هەزار درەم بوو، بەڵام بۆئەوەی دڵی باپیرم (أبو قحافة) نارەحەت نەبێ، کۆمەڵێك بەردم هێناو لەو شوێنەم کرد، کە پارەی تێدا دادەنراو پەشتەماڵێکم بەسەرداداو دەستم گرتو، پێم گوت: ئەوەتا دەستی لێ بکوتە! ئەویش دەستی لێداو، گوتی: ئەگەر ئەوەندەی بۆ بەجێهێشتبن زۆر باشە.

٣) یەکێکی دی لەو ڕووداوانە ئەوەیە، کە (سراقة بن مالك) بەدوای پێغەمبەر ﷺو (أبو بكر) دەکەوێ، بۆئەوەی بیانگرێ، کە لە صحیحی بوخاریشدا هاتووە[٣]، جا هەرچەندە بەسەرهاتەکەی درێژە بەڵام بەکورتی سوراقە دەڵێ: کە بیستم پێغەمبەر ﷺو (أبو بكر) ڕۆیشتوون، وە قورەیش (١٠٠) حوشتریان کردوە بەخەڵات بۆ هەرکەسێك کە بیانگرێ، منیش زانیارییەکم پێگەیشتبوو، کە بەلای دەریای سووردا ڕۆیشتبوون، بۆیە بەدزی قورەیشییەکان ڕۆیشتم، کاتێك لێیان نزیك بوومەوە بینینم (أبوبكر) -خوا لێی ڕازی بێ- (عامر بن فهيرة)ەشی لە پشت خۆی سوار کردوە بۆ ئەوەی خزمەتیان بکا، سوراقە دەڵێ: تەماشام کرد دوو وڵاخ دیاربوون کە سێ نەفەریان بەسەرەوە بوون، نزیکیان بووم وڵاخەکەم سەر چنگێکی بردو کەوت،

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٢٥٣).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٥٤).

٣) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص(٩٦-٩٧)، صحيح البخاري: ٣٩٠٦ و ٣٩٠٨ .

دوایی هەڵسایەوەو دیسان کە نزیکتر کەوتمەوە بۆ جاری دووەم وڵاخەکەم کەوت، سەرم سوڕما!! دوایی هەستایەوەو کە نزیکتر کەوتمەوە بۆ جاری سێیەم وڵاخەکەم کەوتو پێیەکانی ڕۆچوون، وە دووکەڵێکیش کەوتە نێوان منو ئەوانەوە، زانیم ئەوە شتێکی خواییە، بۆیە ئەمانم خواستو گوتم: من (سراقة)و ئەگەر بگەمە لاتان هیچ زیانێکم بۆتان نابێ، پێغەمبەر ﷺ بە (أبو بكر)ی فەرموو: پێی بڵێ: چیت لێمان دەوێ؟! (أبو بكر)یش وایگوت، منیش گوتم: دەمەوێ نامەیەکم بۆ بنووسن، کە نیشانە بێ لەنێوانماندا ئیدی نامەکەیان لە ئێسقانێك یان لە چەرمێك، یان لە قوماشێکدا بۆ نووسیمو بۆی هەڵدام... پاشان سوراقە باس دەکات، کە چۆن پاش ئازادکردنی مەککە چۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە (الجعرانة)و نامەکەی پێشانداوەو مسوڵمان بووە.

**دەیەم:-** (ابن هشام)[١] دەڵێ: خەڵکی مەدینە گوتوویانە: ئێمە کە بیستمان پێغەمبەر ﷺ دەرچووە بەرەو مەدینە، هەموو ڕۆژێك لەدوای نوێژی بەیانییەوە، تا نیوەڕۆ چاوەڕێمان دەکرد، وە کە دنیا گەرم دەبوو دەچووینەوە ماڵێ، یان لەژێر سێبەری دارخورمایاندا چاوەڕێمان دەکرد، تا ڕۆژێکیان کابرایەکی جوولەکە هاواری کرد: ئەی نەوەی قیلە (بني قيلة): ئەو کەسەی کە چاوەڕێی دەکەن هات، وە ئێمەش هەموو چووینە دەرێو پێشوازییمان لە پێغەمبەر ﷺ کرد.

کە چووین پێغەمبەر ﷺ لە سێبەری دارخورمایەکدا دانیشتبوو، وە (أبو بكر)یشی لە خزمەتدا بوو، کە تەمەنی لە تەمەنی ئەو نزیك بوو، زۆربەشمان پێغەمبەری خوامان نەبینیبوو ﷺ بۆیە نەماندەزانی، کە کامەیان پێغەمبەرە! خەڵك زۆر کۆبوونەوە تا وای لێهات ئەو شوێنەی، کە پێغەمبەری لێبوو ﷺ هەتاوی هاتێ، (أبو بكر)یش هەستاو بە کراسەکەی خۆی سێبەری بۆ کرد، ئەوجار

---

٢) (السيرة النبوية...)، ج٢، ص(٢٥٦).

ناسیمان، ئەگەر نا پێشتر واماندەزانی (أبو بکر) پێغەمبەرە (لەبەر ئەوەی سەرو ڕیشی لە هی وی سپی تر بووە، -خوا لێی ڕازی بێت-)[1].

لە کۆتایی باس‌و لێکۆڵینەوەماندا دەربارەی کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ (یثرب)، ئاماژەیەکی کورت بە چەند مەسەلەیەك دەکەین:

١) تێکگیرانی حەق‌و ناحەق شتێکی حەتمییەو، نەیارانی بەرنامەی خوا هیچ کاتێك بانگەوازو پەیامی پێغەمبەرانیان قبوولْ نەبووەو، لە بەرانبەریان وەستاون‌و دژایەتییان کردوون‌و توندوتیژیی‌و، هەڕەشەیان لە بەرانبەردا بەکارهێناون.

٢) پێغەمبەر ﷺ بەرنامەیەکی تۆکمەی بۆ کۆچکردن لە مەککەوە بۆ (یثرب) داناوەو وردەکاریی زۆریی کردوە:

أ- ئامادەکردنی وڵاخی سواریی.

ب- دیاریکردنی (أبوبکر) وەك هاوڕێی سەفەر، کە ئەمەش ئەوپەڕی متمانەو باوەڕی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیەنێ بە (أبو بکر)و هەڵبەتە ژیانی ئەبوبەکریش -خوا لێی ڕازی بێ- دەریخست، کە بەڕاستی شایستەی ئەو متمانەو باوەڕپێبونەی خۆشەویستەکەی بووە!

ج- دەرچوون بە شەو.

د- دانانی (علي) لە جێگای خۆی‌و پێسپاردنی چەند ئەرکێك، وەك دانەوەی ئەو سپاردانەی، کە موشریکەکانی مەککە لەلای پێغەمبەری خوا موحەممەدی ئەمین‌و ڕاستگۆ دایاننابوون، بە خاوەنەکانیان، دیارە دیاریکردنی (عەلی)یش ڕەزای خوای لێبێ بۆ ئەو ئەرکە گرنگ‌و مەترسیدارە، کە ئەو کاتە تەمەنیشی کەمبوو ڕێزو خۆشەویستی پێگەی ناوازەی (عەلی) - رەزای خوای لێبێ- لای پێغەمبەر ﷺ پیشان دەدات.

---

١) صحیح البخاري: ٣٩٠٦.

هـ- دانانی (عبدالله) کوڕی (أبو بکر)، کـە دەنـگو باسـی شـاری مەککـەیان بـۆ بەرێ، تاکو ئاگاداری جمو‌جۆڵی نەیاران بن.

و- دیاریکردنی کەسێکی شارەزا بە ڕێگای سەفەر، بەناوی (عبدالله بـن أریقـط)، هەرچـەندە کـافریش بـووە، بـەڵام دیـارە جێـی متمانـە بـووە، ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنێ، کە لە ئیسلامدا دەستی مسوڵمانان کراوەیـە بـۆ سـوودوەرگرتن لـە توانـاو وزەو بـەهرەی هەرکەسـێك بـا مسـوڵمانیش نـەبێ، بەمـەرجێك جێـی متمانەو باوەڕ بێ

ز- ڕۆژانە نزیککردنەوەی ڕانە مەڕی (أبو بکر) بۆ خواردنی شیـرو بـە مەبەسـتی سڕینەوەی شوێن پێیەکانیـان.

ح- هێنرانی خواردن بۆ ئەشکەوتی (ثـور) لەلایەن (أسـماء)ەوە.

وەك دەبینین پێغەمبەری خـوا ﷺ ڕەچـاوی سـەرجەم هۆکـارو پێداویسـتییەکانی ئەو کارو سەفەرەی کردوە.

٣) کۆچ کردنو بەجێهێشتنی نیشـتمانو کـەسو خـزمو بەرژەوەندییـە دنیاییـەکان، گەورەیی ئامـانج دیاری دەکاو بەڵگەی قوربانیدانە لەپێناو ڕەزامەندیی خوادا.

٤) ڕوودانی چەند موعجیزەیەك بۆ پێغەمبەر ﷺ لەو سەفەرو کۆچەدا، وەك:

أ- تەونکردنی جاڵجاڵۆکـە لـە دەرگـای ئەشـکەوتەکەدا وەك لـە (مسـند الأمـام احـمد)دا هاتوە، بۆئەوەی کافرەکان گومـانیان نەبێ لەنێو ئەو ئەشکەوتە دان.

ب- کـەوتنو ڕۆچـوونی وڵاخی (سـراقة) لـە زەوی دا کاتێـك بـەدوای پێغەمبـەر ﷺ کەوت بۆ ئازاردانی.

ج- نـەبینرانی پێغەمبـەر ﷺ لەلایـەن کافرەکـانی مەککـەوە، لـەکاتی هاتنـە دەرەوەی لە ماڵو کۆچکـردنیدا.

# بنیاتنانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی

پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پەیماننامەی دووەمی (عقبة)ی لەگەڵ (ئەوس‌و خەزرەج) دوو تیرەی هەرە بەهێزی شاری (یثرب)دا بەست، وە بنکەی جەماوەریی پەیدا کرد، مۆڵەتی بە هاوەڵانی بەڕێزیدا کە کۆچ بکەن، بۆ ئەوەی لەگەڵ مسوڵمانانی شاری (یثرب)دا پێکەوە لەوێ کۆمەڵگای ئیسلامیی پێکبهێنن، دوایی خۆشی لەگەڵ (أبو بكر)دا -خوا لێی ڕازی بێ-، کۆچیان کردو لە ڕۆژی دووشەممەی مانگی (ربيع الأول) ساڵی (١٤)ی پێغەمبەرایەتی، بەرامبەر بە (٢٣)ی مانگی (ئەیلوول)ی ساڵی (٦٢٢)ی زایینی، گەیشتە نێو هۆزی (بني عمرو بن عوف)و لە ناوچەیەك كە پێی دەگوترێ: (قباء) لە ماڵی (كلثوم بن الهدم) دامەزرا، (إبن هشام)[1] دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی (كلثوم بن هدم) بووە، بەڵام کاتێك میوانی هاتوە، یان کۆبونەوەی لەگەڵ مسوڵماناندا کردوە، چۆتە ماڵی (سعد بن خيثمة) لەبەرئەوەی ماڵەکەی لە ماڵی (كلثوم بن الهدم) فراوانتر بووە، چەند ڕۆژێك لەو دوو ماڵەدا ماوەتەوە، (علي)یش -خوا لێی ڕازی بێ-، دوای ئەوان سێ ڕۆژ لە (مەککە) ماوەتەوە، دوایی لە (قباء) گەیوەتە پێغەمبەر ﷺ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ لەو شوێنەی، کە لێی دامەزراوە (قباء)، فەرمان دەکا مزگەوتێك دروست بکرێ، وەك خوا لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿...لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ...﴿١٠٨﴾﴾ التوبة، دیارە ئەو کاتە (قباء) نەکەوتبۆ نێو شاری (یثرب)،

١) (السيرة النبوية)، ج٢، ص(٢٥٧-٢٦٠).

بەڵکو لە لاپەڕی شار بوو، هەربۆیەش دوایی تەنیا بە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ گوتراوە: مزگەوتی (مەدینە)، بەڵام لە ئەنجامی فراوانبوونی شاری (مەدینە)دا، هەموو ئەو مزگەوتانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە دەوروبەری شار بوون، ئێستا کەتوونەتە نێو شاری مەدینەوە.

کەواتە: مزگەوتی (قباء) پێش مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بیناکراوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژانی دووشەممەو سێشەممەو چوارشەممەو پێنج شەممە لە ناوچەی (قباء) بوو، لەو دووماڵەی ئاماژەمان پێکردن، دوایی ڕۆژی جومعە بەرەو نێو شاری (یثرب) بەڕێکەوت، کە گەیشتە ئەوێ خەڵکی هەموو چوون بۆ پێشوازییو هەموو تیرەو هۆزەکان ئامادەیی خۆیان دەربڕیو هەریەکە داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد بچێتە لای ئەو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ولاخ (حوشتر)ەکەم گەڕێن، فەرمانی پێکراوە لە کوێ بوەستێو لابدا، ئیدی حوشترەکەی دەڕوا تا دەگاتە شوێنێك پێی گوتراوە: (دار بني مالك النجار) لەوێ حوشترەکەی دەوەستێو پاڵ دەکەوێ، ئەو شوێنەی کە حوشترەکەشی تێدا یەخ دەبێ جێخوون (مربد)ێك (ئەو شوێنەی کە خورمای لەسەر کۆدەکرێتەوەو پاك دەکرێتەوە) دەبێو هی دوو منداڵی هەتیو دەبێو بەناوی: (سهل و سهیل) کوڕانی (رافع بن عمر)، دوای ئەوەی کە حوشترەکە لە جێ خەرمانەکە یەخ دەبێ، پێغەمبەر ﷺ لێی دێتە خوارێو فەرمان بە هاوەڵانی دەکات مزگەوتی خۆی لە شوێنی ئەو جێ خەرمانە بنیات بنێن[1]، لەو ڕۆژەشەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەگاتە (یثرب) ئەو شارە ناوی دەنرێ: شاری پێغەمبەر (مدینة الرسول)و دواتر هەر بە (مەدینە) ناودەبرێ.

---

١) دوای ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ ئەو جێخوونە لەو دوو منداڵە هەتیوە دەکڕێ، کە یەکێك لە هاوەڵان پارەکەی دەدا.

ئەو ماوەیەش تا مزگەوت دروست کرا، پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی (أبو أیوب الأنصاري) نیشتەجێ بوو، کە خانوویەکی دوو قاتی هەبوو، پێغەمبەر ﷺ بۆماوەی چەند ڕۆژێك لەوێ دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی کە مزگەوت بیناکراو چەند ژوورێکیش لە تەنیشت مزگەوتەکەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دروستکران، پێغەمبەر ﷺ کەلوپەلەکانی خۆی گواستەوە بۆ یەکێك لەو ژوورانە، کە ئەوکات پێیان گوتراوە: ژوورەکان (الحجرات)و سوورەتێکی قورئانیش بەوناوەوە ناونراوە، (حجرات) کۆی (حجرة)یە واتە ژوور، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆ هەریەکێك لە خێزانەکانی ژوورێکی سادەی لە تەنیشت مزگەوتەکەی خۆیەوە دروست کردبوو.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# بنەماكانی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی

## یەكەم: كۆچكەران و پشتیوانانی، تێگەیەنراوو پێگەیەنراو :-

یەكەمین بنەمای سەرەكی، كە پێغەمبەر ﷺ كۆمەڵگای ئیسلامیی لێ پێكهێناوە، ئەو ئیماندارانە بوون كە لە مەككەوە كۆچیان كرد بۆ مەدینەو ئەوانەش كە لە مەدینە بوونو هاوكاریی كۆچكەرانیان كردو پاڵپشتی ئیسلام بوون، واتە: (مهاجرون وأنصار)، كە ئەوكات مسوڵمانان یان كۆچكەران یان پشتیوانان بوونو، تێگەیشتووو پێگەیشتووش بوون، وەك خوای پەروەردگار زەقترینو دیارترین سیفەتو پێكهاتەكانی كۆچكەرو پشتیوانانمان بۆ باس دەكاتو سەرەتا دەربارەی كۆچكەران دەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿٨﴾﴾ الحشر، لە پێش ئەو ئایەتەدا باسی دابەشكردنی (فـيء)[1] دەكاو دەفەرموێ: بۆ ئەو كۆچكەرانەیە كە لە ماڵو سامانی خۆیان دەركراون، ئەوە كە دەیخوازن لە پەروەردگاری خۆیان بریتییە لە ڕەزامەندییو بەخششی ئەو (یانی: ئەوەی پاڵی پێوەناون ماڵو حاڵو بەرژەوەندییو خاكی خۆیان بەجێ بهێڵن، ئەوەیە كە خوا پاداشتیان بداتەوە كە بەهەشتە، وە لێشیان ڕازی بێ، كە بێگومان ڕەزامەندیی خوا گەورەترە لە بەهەشتەكەی، وەك دەفەرموێ: ﴿...وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾﴾ التوبة، ئنجا دەفەرموێ: ﴿...وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ... ﴿٨﴾﴾ الحشر، واتە: خواو پێغەمبەری خوا سەردەخەن (یانی: ئەو دینەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن خواوە هێناویەتیو

---

١) (فـيء) ئەو دەستكەوتەیە، كە بەبێ جەنگ لە ئەهلی كوفر دەگیرێ.

ڕایگەیاندوە، سەری دەخەنو پشتی دەگرن) ﴿... أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾ الحشر، واتە: ئەوانەن ڕاستان، (یانی: ئەوانەن کە لەگەڵ خوادا ڕاست دەکەن، چونکە (صدق) بریتیە لەوەی، کە ئینسان ڕاست بێ واتە: عەقیدەو ئیمانو دڵو زمانو کردەوەو...هتدی ڕاست بێ، لەگەڵ خواو خۆیو دەرووبەریدا).

ئنجا دەربارەی پشتیوانانیش دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾ الحشر، واتە: وە ئەوانەی، کە لەپێش ئەواندا (لە پێش کۆچکەراندا) نیشتەجێ بوون لە مەدینەداو کردیان بە بارەگای ئیمان (بێگومان کۆچکەران پێش پشتیوانان ئیمانیان هێنا بوو، بەڵام پشتیوانان لە پێش کۆچکەراندا مەنزڵگاو هەوارگەیان بۆ ئیمان بنیاتنا) ئەوەی کۆچی کردوە بۆ لایان خۆشیان دەوێن، (واتە: نەك هەر پێی قەڵس نین کە دەچنە سەر ماڵو حاڵیان، بەڵکو زۆریشیان پێ خۆشە) وە لە دەروونی خۆیاندا هەست بە هیچ پێویستییەك ناکەن لەوەی کە بە کۆچکەران دەدرێت، وە بەسەر خۆیاندا هەڵیاندەبژێرن ئەگەر بۆ خۆشیان پێویستیان پێ بێ، {(إیثار) ئەوەیە کە خەڵك بەسەر خۆتدا هەڵبژێری لە چاکەو بەخشیندا، پێچەوانەکەشی (أَثَرة) یانی: خۆت بەسەر خەڵکیدا هەڵبژێری} ، وە هەرکەسێك خۆ لە ڕژدیی نەفسی بپارێزێ، ئائەوانە سەرفرازن، (یانی: ئەوانە هیچ جۆرە ڕژدییو چرووکییەکیان لە دەروونـدا نیە بەڵکو سەخاوەتو بەخشندەییو دڵفراوانییەکی زۆریان هەیەو پێیان خۆشە هەموو خێرو خۆشییەك بۆ ئەو خوشكو برا موحتاجو کۆچکەرانەیان بێ)، ئاوا خوای پەروەردگار بە زەقترین وە بە دیارترین وەسفەکانیان، باسی ئەو دوو کۆمەڵە مسوڵمانە دەکات، کە ئەوکات کۆمەڵگای ئیسلامییان پێکهێنا بوو.

ئنجا ئەوەی، کە لێرەدا پێویستە هەڵوێستەی لەبەردەمدا بکەین، ئەوەیە کە بزانین چۆن ئەو دوو کۆمەڵە مسوڵمانە بەو شێوەیە تێگەیشتنو پێگەیشتن، کە خوای پەروەردگار ئاوا (مەدحیان بکات، کە بە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ کۆتایی بە وەسفکردنی کۆچکەران دێنێ، وە بە: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ کۆتایی بە وەسفی پشتیوانان دێنێ، کە ئەوە گەورەترین مەدح کردنە؟!

بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بێ هۆ نەبوونە شایستەی ئەو وەسفو پێ هەڵاگوتنەی خوای کاربەجێ، بەڵکو قورئانێکی زۆر هاتۆتە خوار تا ئەوەندە مسوڵمانە بەرهەم هاتوونو تێگەیشتوونو پێگەیشتوونو پەروەردە بوونو پێغەمبەریش ﷺ مامۆستاو چاوساغی جێبەجێکردنی ئەو قورئانەو ئاڕاستەکەریان بووە.

دیارە پێغەمبەر ﷺ تەنیا قورئانی کردۆتە بناغە بۆ پێگەیاندنو تێگەیاندیانو پەروەردکردنو ڕاهێنانی هاوەڵانی، وە هاوەڵانی بەڕێزی بەشێوەیەك پێگەیاند کە دوایی بتوانن، نەك تەنیا ببنە بناغەی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو ببنە بناغە بۆ ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی سەردەمی چوار خەلیفە ڕاشیدەکانو دوای ئەوانیش تاکو ئێستا، وە هەرچی بیناکراوە لەسەر شانی ئەوان هەڵچنراوەو لە ڕاستیدا ئەوان ڕێیان شکاندوە، بۆیە دوایی خەڵك توانیویەتی پێیدا بڕوا.

لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ: **{مَنْ دلَّ على خير فله مثل أجر فاعله}** رواه مسلم[1]، واتە: کەسێك ببێتە هۆ بۆ چاکەیەك، ئەوە هەرکەسێك لەدوای ئەو ئەو چاکەیە بکات، لە پاداشتی هەموو ئەو چاکەکارانەدا بەشدارە، چونکە ئەو ڕێگاکەی شکاندوەو سەرەتا چاکەکەی کردوە، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو چاکەو خێری ئۆممەتیدا بەشدارە، چونکە هەموومان

---

١) صحیح مسلم: ١٨٩٣.

www.alibapir.com

بەهۆی پێغەمبەرەوە ﷺ هیدایەتمان وەرگرتوە، وە بەهەمان شێوەش هاوەڵانی بەڕێزیشی لە چاکەو خێری ئۆمەتەکەیدا بەشدارن.

جا بۆئەوەی بزانین داخۆ پێغەمبەر ﷺ چۆن هاوەڵانی بەڕێزی پەروەردە کردوە، دەبێ تەماشای قورئانی (مەککی) بکەین، کە بەزۆری باسی ئەم سێ بنەڕەتە سەرەکییەی کردوە:

**یەکەم:**- باسی خوا (جل شأنه)و ناوە چاکەکانیو سیفەتە بەرزەکانیو باسی بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگارێتی خوا، وە باسی پەرستراوێتیو خاوەندارێتی خوا بۆ هەموو شتێك، هەروەها باسی دروستکراوەکانی خوا ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی کە لە نێوانیاندایەو...هتد.

**دووەم:** باسی پێغەمبەرایەتیو وەحیو کتێبەکانی خواو پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)و بەسەرهاتەکانیان لەگەڵ گەلەکانیاندا، کە نزیکەی سێیەکی قورئانی لەخۆگرتوە، چونکە هەرچی بەسەرهاتەکانی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) تێکڕا لە (مەککە) هاتوونە خوار، وە هاوەڵانی بەڕێزیش بەو بەسەرهاتو سەرگوزشتانە پەروەردە کراونو تێگەیەنراون کە ئەو پەیامە خواییە یانی چی؟! وە لێیان حاڵی کراوە، کە پەیامو بەرنامەی ئیسلامو پەیامو بەرنامەی تێکڕای پێغەمبەرانی خوایەو ڕەگو ڕیشەکەی بە قووڵایی مێژوودا دەچێتە خوار، هەر لە ئادەمەوە هەتا خاتەم، هەروەها تێگەیشتوون، کە دوژمنانی ئیسلامیش هەموو ئەو خوانەناسو ستەمکارو زلەزلانەن کە لە درێژایی مێژوو دژلا پێغەمبەران (علیهم السلام)و پەیامی خوا بوون هەر لە (قابیل)ەوە، کە (هابیل)ی برای کوشتوە، تا زلەزلەکانی سەردەمی: نووحو هوودو صالحو شوعەیبو مووسا (علیهم الصلاة والسلام)و دواتریش وەك (أبو جهل)و (أمية) و... هتد.

www.alibapir.com


**سێیەم:-** مەسەلەی دوارِۆژو پاداشتی خواو گەیشتن بە دیداری خوای پەروەردگارو گەیشتن بەو رِۆژەی لێپرسینەوەی خوای دادگەری تێدا ئەنجام دەدریٚو چاکان بۆ بەهەشت دەبردرێنو خراپەکانیش بۆ جەهەننەم رەپێچەك دەدرێن.

بەو شێوەیە لەسەر ئەوسێ بنەرِەتە سەرەکییە، پێغەمبەر ﷺ ئەو هاوەڵە مسوڵمانانەی خۆی تێگەیاندوەو پێگەیاندوە.

## دووەم: دروستکردنی مزگەوت :-

وەکو باسمان کرد، پێغەمبەر ﷺ سەرەتا مزگەوتی (قباء)[1]ی دروست کرد، دوایی مزگەوتی خۆی لەنێو شاری مەدینەدا دروست کرد، لەوبارەوە (ابن هشام)[2] دەڵێ: دوایی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی (أبو أيوب) مایەوە، تا مزگەوتەکەی بینا کرا، وە جێگەو رِێگاش بۆوی ساز کرا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ کەلوپەلەکانی خۆی گواستەوە بۆ ئەویٚ، شایانی باسکردنە پێغەمبەر ﷺ خۆی وەك مسوڵمانانی دیکە ئیشی لە دروستکردنی مزگەوتدا دەکرد[3]، نەك وەکو بەرپرسو دەسەڵاتدارانی ئێستا، کە دەیانبینین تۆزێك چمەنتۆیان بۆ لە کاسەیەك دەکەنو، ئەوانیش کەمێکی لێ رِۆ دەکەن، دواییش لەکاتی تەواوبوونیداو بۆ جارِدانی تەواوبوونی کارەکە بە مەقەستێك شریتی کردنەوەکەی بیناو پرِۆژەکە دەبرِنو بێ ماندووبوون، خۆیان دەکەن بە دروستکەری شتەکە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ وەکو کرێکارێك ئیشی کردوەو بگرە جاری واش بووە لە هاوەڵانی زیاتر خۆی ماندوو کردوە، چونکە ئەو وەکو عیبادەت ئەو کارەی کردوە، نەك وەکو سەرنج رِاکێشانو پێش خەڵكو دونیا، خواو قیامەتی بینیوە.

---

١) لەو سەردەمەدا (قباء) ناوچەیەك بوو لە دەرەوەی مەدینە.

٢) (السيرة النبوية)، ج٢، ص٣٥٩.

٣) صحيح البخاري: ٣٩٣٢.

(ابن هشام) دەڵێ[١]: مسوڵمانان لەکاتی ئیشکردنیاندا لە (بیناکردنی مزگەوت) جارجار هەندێك شیعریان پێکەو دەگوتەوە، بۆ وێنە یەکێك لەو شیعرانە ئەوە بوو، کە دەیانگوت:

لا عيش الاّ عيش الآخرة          اللّهم ارحم الأنصار والمهاجرة

واتە: ژیان نیە جگە لە ژیانی دوارۆژ (یانی ژیانی دوارۆژ ڕاستەقینەیە، ئەگەرنا ژیانی دنیا کەمێکەو دێو دەڕوا) خوایە بە زەییت بێتەوە بە پشتیوانانو کۆچکەراندا.

هەروەها (علي بن ابی طالب)یش خوا لێی ڕازی بی دەیگوت[٢]:

لا يستوي من يعمر المساجد          يدأب فيه قائماً وقاعداً
ومن يُرى عن الغبار حائداً

واتە: وەکو یەك نین ئەوانەی، کە ئیش لە دروستکردنی ماڵی خوادا دەکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوە، لەگەڵ کەسانێك، کە ئیشی تێدا ناکەنو خۆیان لە تۆزو خۆڵ دەپارێزن.

جا ئەوەی، کە دەمەوێ لێرەدا هەڵوەستەیەکی کورتی لەبەردەمدا بکەم ئەوەیە، کە ئەو مزگەوتە زۆر بە سادەیی بینا کراوە، بەڵام بابزانین ئەو کاتە مزگەوت چ دەورێکی بینیوە؟

مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ پێش هەموو شتێك شوێنی نوێژو قورئان خوێندن بووە، قورئان خوێندن بەو مانایە، کە لێی فێر بنو لێی تێبگەن، هەروەها پێغەمبەر ﷺ وتارەکانی زۆریان بریتی بوون لە قورئان، بۆ وێنە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٥٩).
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

دەڵێ: من سوورەتی (ق)م لە دەمی پێغەمبەر ﷺ وەرگرتوە لەکاتی وتارەکانیدا، وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە.

هەروەها مزگەوت شوێنی کۆبوونەوەو یەکتر بینینی مسوڵمانانو ئاراستەکردنی مسوڵمانان بووە، هەروەها لە مزگەوتدا زانستی شەرعییو چەندان جۆرە زانیاری دی وەرگیراون، نەك هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەڵکو لەدوای ئەویش هەر وابووە، وە مزگەوت جێگای حەوانەوەی لێقەوماوان بوو، شوێنێك هەبوو لەنێو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ (صُفة)یان پێ‌گوتوە، کە سەقفی هەبووەو ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەر ﷺ، کە باڵغو زگورتی بوون بەتایبەت لە کۆچکەران، هەموویان لەوێ بوون، ئەوانە بۆ کاتی جەنگو جیهاد ئامادە بوون بەڵام دوایی بۆ حەوانەوەو ئیسراحەت چوونە ئەوێ، چونکەماڵو حاڵیان نەبووە، وە لە مزگەوتدا کاروباری جەنگیو ئامادەکردنی سوپا ئەنجام دراوە، هەروەها مزگەوت مەڵبەندێکی ڕووحییو فیکرییو عیلمییو عیبادییو سیاسییو کۆمەڵایەتییو... هەمەلایەنە بووە، وە مزگەوت شوێنی قەزاوەتو دادگایی بووە.

مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بەو شێوە بووە، وە بێگومان ئەوە مزگەوتی ڕاستەقینەیە، بۆیە ئێستا کە دەگوترێ مزگەوت تەنیا جێی عیبادەتەو نابێ سیاسەتی تێدا ئەنجام بدرێ، ئەوانە لە مانای عیبادەتو سیاسەت حاڵی نەبوون، ئەگەرنا سیاسەتی ئیسلامیشو ئەو شتانەی دیکەش کە باسم کردن، هەموویان عیبادەتنو ئیسلام دینێکی گشتگیرەو هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە، کەواتە لێرەدا گرنگی مزگەوت لە دەوڵەتی ئیسلامییو کۆمەڵگای ئیسلامییدا دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ ئاوا بایەخی پێداوە.

**سێیەم : برایەتی بەرپاکردن لە نێوان کۆچکەران و پشتیوانانددا:-**

(إبن هشام)[1] بۆمان باسی ئەو برایەتییە دەکات و دەڵێ: (وآخى رسولُ الله ﷺ بين أصحابه من المهاجرين والأنصار، فقال فيما بلغنا ونعوذ بالله ان نقول عليه مالم يقل: تآخوا في الله أخوين أخوين)، واتە: پێغەمبەر ﷺ برایەتی بڕیاردا لە نێوان هاوەڵانیدا لە کۆچکەران و پشتیوانان، بەو پێیەی کە پێمان گەیشتوە، وە پەنا دەگرین بە خوا شتێك بڵێین پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو بێ، فەرمووی: (برایەتی بکەن لەپێناو خوادا دوو دوو ببنە برای یەکدی).

لێرەدا لەوانەیە پرسیار بکرێ: مەگەر خوای زانا نافەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ...﴿١٠﴾ ﴾ الحجرات، بێگومان تەنیا بڕواداران برای یەکدین، پیاوانیان برای یەکدین، وە پیاوان و ئافرەتان خوشك و برای یەکدین، وە ئافرەتانیان خوشکی یەکدین، چونکە وشەی (إخوة) هەرسێ چەمك و ماناکە لە خۆی دەگرێ، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء)، کە دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِن كَانُوٓاْ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ...﴿١٧٦﴾ ﴾، واتە: ئەگەر (إخوة) بوون پیاوان و ئافرەتان ئەوا بۆ پیاوان هەیە، دوو ئەوەندەی کە بۆ ئافرەتان هەیە (لە میرات).

بەڵێ هەرچەندە مسوڵمانان بەهۆی ئیمانەوە هەموویان برای یەکترن، بەڵام ئەو برایەتییەی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان (کۆچکەران و پشتیوانان)دا دروستی کرد برایەتییەکی تایبەتی بوو، کە میراتیان لە یەکدی گرتوەو لەبەرئەوەش ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ ئەو برایەتییەی بڕیاردا، چونکە کۆچکەران هیچیان نەبووە، هەندێك لە کۆچکەران تەنیا خێزان و منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو، بەڵکو هی وا هەبوو

١) (السيرة النبوية)، ج٢، ص(٢٦٤).

www.alibapir.com


تەنانەت خێزانەکەشی لەگەڵیدا نەچووبوو، بۆ وێنە: عومەر -خوای لێی ڕازی بێت- دوو خێزانی هەبوون، هەردووکیان کافر بوون، هیچیان لەگەڵی نەهاتوون بۆ مەدینە، هەروەها (عبدالرحمن بن عوف) کە خێزانەکەی لەگەڵی نەهاتوەو...هتد.

بۆیە پێویستییان زۆر بە هاوکاریی و چاکە لەگەڵ داکردن هەبووە، وە بۆ ماوەیەکی دیاریکراوو کورت ئەو تایبەتمەندییە لەو برایەتییەدا هەبووە، دوایی خوای کاربەجێ ئەو برایەتییەی کە بۆ ئەو ماوە دیاریکراوە بڕیار درابوو، هەڵدەوەشێنێتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ۝٦﴾ الأحزاب، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە نەفسیان لە پێشترە بۆ ئیمانداران (یانی با لە خۆیانیان خۆشتر بوێ)، وە هاوسەرانی پێغەمبەریش ﷺ دایکیانن (دایکی ئیماندارانن)، وە خزمان هەندێکیان بە هەندێکیان خاوەن حەقترن، لە ئیمانداران و لە کۆچکەران لە کتێبی خوادا مەگەر کەسێك بیەوێ لەگەڵ دۆستەکانی خۆیدا چاکە بکا، ئا ئەو حوکم و بڕیارە پێشتر لە کتێبدا تۆمار کرابوو.

کەواتە: ئەو جۆرە برایەتییەی پێشێ بۆ قۆناغێکی کتوپڕ بووە، کە هاتۆتە پێش مسوڵمانان، بۆیە پێویستی بە چارەسەرێکی کتوپڕیش کردوە.

## چوارەم : دروشـمی مسـوڵمـانـان (بـانـگ):-

پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا مسـوڵمانان دروشـمێکیان هـەبێت بۆ بـانگ کردنیـان بـۆ نوێژو کۆبوونەوەی حەفتانەیان، کە ئەویش بریتی بوو لە بانگ (أذان)، (ابـن هشـام)[(١)] لەوبارەوە دەڵێ: مسوڵمانان پێش ئەوەی بانگ بکرێتە دروشـمیان، کە دەچوون بۆ نوێژ یەکتـریان بانگ دەکرد، دوایی بۆیان دەرکەوت، کە ئەوە ڕێگایەکی گونجـاو نیـە، بۆیـە بیـریان کردەوە کە وەسیلەیەکی گونجاو بەکاربێنن، هێنـدێکیان پێشـنیاریان کـرد، کـە (بــوق)[(٢)]ی جوولەکــەکان بــەکاربێنن، هەنــدێکی دیکــەیان گوتیــان باشــتر وایــە (ناقوس)[(٣)]ی نەصرانییەکان بەکار بێنیـن، پێغەمبەر ﷺ (بوق)ی جوولەکـەکانی پـێ ناخۆش بـوو، خـەریك بـوو (نـاقوس)ی نەصـرانییەکان هەڵبـژێرێ، بـە وەسـیلەیەك بـۆ کۆکردنەوەو بانگکردنی مسوڵمانان، لەوکاتەدا (عـبدالله بن زیـد) کـە یـەکێك بـوو لـە خەزرەجییەکان، هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺو گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ مـن ئەمشـەو خـەونێکم بینیـوە، لـەو خەونەمـدا پیاوێـك هـات بـۆ لام بـەرگێکی سـەوزی لەبەردابوو (ناقوس)ێکی پێ بـوو، منـیش گـوتم: ئـەی بەنـدەی خـوا ئـەو (نـاقوس)ەی نافرۆشـی؟ ئەویش گوتی: چـی لـێ دەکەی؟ گوتـم: مسوڵمانانی پێ بانـگ دەکەین بـۆ نوێژ، ئەویش گوتی: شتێکت پێ بڵێم لەوە چاکتـر بـێ؟ گوتــم: بـەڵێ، چییە؟ گـوتی: ئاوا بڵێ: **(الله أكبـر، الله أكبـر، الله أكبـر، الله أكبـر، أشهد أن لا اله إلاّ الله، أشهد أن لا اله إلاّ الله، أشهد أن محمـداً رسـولُ الله أشـهد أن محمـداً رسـول الله، حـيَّ علـى الصلاة، حيَّ على الصلاة، حيَّ على الفـلاح، حيَّ على الفـلاح، الله أكبـر الله أكبـر،**

---

١) (السيـرة النبوية)، ج٢، ص(٢٦٦-٢٦٧).

٢) دوو ئاسن لەیەك دەدرێن دەنگ دروست دەکەن.

٣) وەك زوڕنا فووی پێدا دەکرێ، بەڵام دەنگی جیاوازە.

www.alibapir.com


**لا إله إلاّ الله)** پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:[1] **{إنها لرؤيا حق إن شاء الله فقم مع بلال فألقِها عليه فليؤذن بها فأنه أندى صوتاً منك}**، واته: ئەوە خەونێکی ڕاستو حەقە ئەگەر خوا بیەوێ، هەڵسەو ئەو وشانە فێری بیلال بکە با پێیان بانگ بدا، چونکە ئەو دەنگی لەتۆ خۆشترەو تیژترە)، جا کاتێك بیلال بەو وشە گەورەو موبارەکانە بانگیدا (عمر بن الخطاب) لەوکاتەدا، کە لەماڵەوە بوو گوێی لێبوو، ئەوەندە بەپەلە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەباکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشاو گوتی: سوێند بەو کەسەی، کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە، منیش ئاوایان پێ گوتم، کە دەبێ ئاوا بانگ بدرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **{فلله الحمد على ذلك}**، واتە: ستایش بۆ خوا لەسەر ئەوە، مانای وایە ئەوە فەرمانی خوایە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا، کە (بخاري) گێڕاویەتەوە دەفەرمویٚ: **{الرؤيا الصالحة من الله والحلم من الشيطان...}** رواه البخاري[2]، واتە: خەونی چاك لە خواوەیەو خەونی خراپیش لە شەیتانەوەیە.

ئنجا ئەگەر تەماشای وشەکانی بانگ بکەین، دەبینین کورتنو هەوێنی ئیسلامەتییان تێدایە، سەرەتا چوار جار لەسەریەك (الله اكبر) دەگوترێ، واتە: (خوا گەورەترە) گەورەترە لە هەموو شتێك، گەورەترە بەو واتایەی، کە بۆخۆی شایستەیە، کەواتە: دەبێ گەورەیی خوای پەروەردگار (جل شأنه) لە مێشكو دڵی مسوڵمانان‌دا لە سەرووی هەموو شتێکەوە بێ، جا هەر کاتێك، کە خوا ئاوا بە گەورە زانرا، وە کە مسوڵمانان بە کردەوە دەریانخست، کە خوایان پێ لە هەموو شت گەورەترە، ئەو کاتە بێفەرمانیی خوا ناکەن، وە جگە لە بەرنامەی خوا ڕوو لە هیچ بەرنامەیەکی دیکە ناکەن، وە هیچ کاتێك فەرمانی هیچ کەسێکی دیکە بەسەر فەرمانی خوادا زاڵ ناکەنو هەڵنابژێرن، وە هیچ بەرژەوەندییەکی خۆیان بەسەر

---

١) رواه أبو اود والترمذي وأحمد وابن خزيمة.
٢) صحيح البخاري، برقم: ٦٩٨٦ .

www.alibapir.com


فەرمانی خوادا هەڵنابـژێرن، ئنجا دووجار (أشهد أن لا إلـه إلاّ الله) واتـە: شـایەتیی دەدەم، کـە هـیچ پەرستـراوێك نیـە جگـە لـە خـوا، کـە ئـەوەش بنـاغەو کاکڵـەو جەوهەری مسوڵمانەتییو دینداریيە، پاشان دووجار (أشهد أن محمداً رسول الله) واتـە: شـایەتیی دەدەم، کـە موحەممـەد ڕەوانـەکراوی خوایـە، کەواتـە: دەبـێ هەرچـی ئـەو فەرموویـەتی گوێڕایـەڵی بکـەین، وەك پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿... وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾﴾ الحشر، واتە: وە هەر شتێك پێغـەمبەر پێتـان دەدا لێـی وەربگـرن، وە ئەوەشـی کـە ئەو لێتان قەدەغە دەکـا، دەستی لـێ هەڵبگرنو پارێز لە خـوا بکـەن، بێگومـان خـوا تۆڵەی تونـدە.

کەواتە: شایەتـمان هێنان بە پەرستراوێتی خوا، کە تەنیا ئـەو دەبـێ پەرسـتراو بـێ، یانی دەبێ خوا (جل شأنه) لە دڵی تۆدا چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ، لە هـەموو شـتێك بەرزتـرو بەڕێزترو خۆشەویستتـرو گەورەتربێ، وە بەسەر هـەموو شـتێکدا هەڵیبـژێری، وە هەموو شتێکی فیدا بکەی، هەروەها شایەتـمان هێنانیش بە نێرراوێتـی موحەممـەد (علیه الصلاة والسـلام) یـانی دەبـێ پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ هـیچ سـەرکردەیەکی دی بەراورد نەکرێ، چونکە هەموو کەسێك قسەی لێ وەردەگـیرێو بەسـەری دادەدرێتـەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەرچی دەیفـەرموێ دەبـێ لێـی وەربگـیرێ بـەبێ چـەندو چـوون، چونکە بەنـاوی خواوە قسـە دەکـات، وەك خـوای تـاكو پـاك لـەوبارەوە دەفـەرموێ:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾﴾ النجم.

کەواتە: ئەگەر کەسێك شایەتـمانی بە پەرستراوێتی خـواو ڕەوانکراوێتـی موحەممـەد (علیه الصلاة والسلام)، هێنا، بەڵام دوایی لـە ژیـانی ڕۆژانەیـدا دەرکـەوێ، کـە شـتی دیکـەی لـەخوا پـێ گـەورەترە، وە فـەرمانی کەسـێکی دیکـە بەسـەر فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هەڵدەبـژێرێ، ئـەوا بێگومـان شایەتـمانەکەی هـەر قسـەیەکە کردوویەتیو هیچی دیکە نیە.

www.alibapir.com


ئنجا دووجار دەگوترێ: (حيَّ على الصلاة)، واتە: وەرن بۆ نوێژ، (حيَّ) یانی (أقبل) وەرە، دوایی دووجاریش دەگوترێ: (حيَّ على الفلاح)، واتە: وەرن بۆ سەرفرازیی، سەرفرازیی مسوڵمانانیش لەوەدایە، کە بەندایەتی بۆ خوا بکەن، کە نوێژەکەیان کۆڵەکەی بەندایەتی کردنیانە بۆ خوا – جل شأنه-، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: **{الصلاة عمود الدين}** رواه الترمذي، واتە: نوێژ کۆڵەکەی دینداریە، واتە: دینداریی تاکیی، ئنجا لە کۆتاییشدا دەگوترێ: (ألله أكبر ألله أكبر، لا اله إلا الله)، واتە: خوا گەورەترە، خوا گەورەترە، جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین.

## پێنجەم : وتاری جومعەو کۆبوونەوەی هەفتانە :-

پێغەمبەر ﷺ بەفەرمانی خوا هەفتانە وتاری جومعەی دانا، وە فەرمانی بە مسوڵمانان کرد، کە پێویستە هەر حەوت رۆژ جارێك لە مزگەوت کۆببنەوە، لەوبارەوە (ابن اسحاق)[1] دەڵێ: یەکەمین وتارێك، کە پێغەمبەر ﷺ دای، ئەوە بوو کە داکۆکی کرد لەسەر ماڵ بەخشین، چونکە ئەوکاتە مسوڵمانان لە هەموو شتێك زیاتر پێویستیان بە هاوکاریی‌و دەستگرۆیی یەکتر بووە، دیارە وتاری جومعەش هەم عیبادەتێکی رووحیی‌و هەم عیبادەتێکی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتییشە، وە وتارخوێن دەبێ لە وتارەکەیدا بابەتێك باس بکا، کە مسوڵمانان پێویستییان پێیەتی، وە دەبێ بابەتی وتارەکە بابەتێکی سەردەمیی بێ، واتە: لەوکات‌و سەردەمەدا چ شتێك باوەو پێویستە مسوڵمانانی لێ ئاگادار بکرێتەوە، ئەوە باس بکرێ.

وە بێگومان وتارەکانی پێغەمبەر ﷺ چ ئەوانەی، کە لە رۆژانی جومعەدا داونی، چ ئەوانەی لەکاتی خۆرگیران‌و جەژنەکاندا داونی‌و...هتد، دەوری زۆریان بینیوە، کە مسوڵمانان لە دینەکەیان تێبگەن‌و لە قورئان‌و سوننەتدا شارەزابن، وە پاشانیش

---

١) (السيرة النبوية)، ج٢، ص٢٦١-٢٦٢.

www.alibapir.com


ئاگایان لەیەكتر بێ، بۆ وێنە جاری وا هەبووە پێغەمبەر ﷺ لەكاتی جومعەدا یان دوای نوێژە فەرزەكان فەرموویەتی: فلان كەس بۆ دیارنیە؟ هاوەڵانی گوتوویانە نەخۆشە یان گرفتێكی هەیەو، دوایی بەدەمیەوە چوون، بۆیە ئەگەر مسوڵمانانی هەر گەڕەكێكو كۆڵانێك یان هەر گوندێك، شەوو ڕۆژ پێنج جار كۆببنەوە بۆ نوێژی جەماعەتو هەفتەی جارێك كۆببنەوە بۆ نوێژو وتاری جومعە، وە پاشان لەسەر ئاستی هەموو عالەمی ئیسلامیی ساڵی جارێك كۆببنەوە لەكاتی جێبەجێ كردنی حەجدا، ئەوە مسوڵمانان هەمیشە ئاگایان لە یەكدی دەبێ، وە بە كردەوە دەبنە ئەو ئوممەتە یەكڕیزەی، كە خوا دەیەوێ.

## شەشەم : نووسینی دەستوور (الصحیفة، الوثیقة) :-

ئەو دەستوورەش لە هەندێك سەرچاوەكانی مێژوودا بەناوی (الوثیقة) هاتوە، بەڵام لە خودی ئەو نوسخەیەدا، كە بەسەر زاری موبارەكی پێغەمبەردا ﷺ دا هاتوە (الصحیفة)یە.

لەوبارەوە (ابن اسحاق)[1] دەڵێ: (وكتب رسول الله ﷺ كتاباً بين المهاجرين والأنصار، وادع فيه اليهود وعاهدهم وأقرهم على دينهم وأموالهم، وشرط لهم واشترط عليهم)، واتە: پێغەمبەر ﷺ نووسراوێكی نووسی، لەنێوان پشتیوانانو كۆچكەراندا لەلایەكەوە چۆن بەیەكەوە مامەڵە بكەن، (لەلایەكی دیكەوە چۆن ئەو كۆمەڵگا ئیسلامیی یە لەگەڵ پێكهاتەكانی دیكەی خۆی، كە جوولەكەكانن مامەڵە بكات)، وە باسی جوولەكەكانیشی كرد، كە پەیمانی لەگەڵدا بەستن، وە دانی بۆ پێداهێنان، كە لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە، وە ماڵی خۆیان هی خۆیان بێ، وە هەندێك مەرجی پێدان، وە هەندێك شتیشی لێ بەمەرج گرتن، كەواتە: بەكورتی

١) (السيرة النبوية)، ج٢، ص(٢٦٢).

پێغەمبەر ﷺ دەستوورێکی دانا، ئەوەی کە ئێستا پێی دەگوترێ: یاسای بنەڕەتیی (القانون الأساسي) یان دەستوور.

وە پێغەمبەر ﷺ لەو دەستوورەدا هێڵە گشتییەکانی چۆنیەتی مامەڵەکردنی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی لەنێو خۆیداو لەگەڵ غەیری خۆشیدا هەموو باس کردوە.

ئەو دەستوورەش ئاوا دەست پێ دەکات:

(بسم الله الرحمن الرحيم، هذا كتاب من محمد النبيّ ﷺ بين المؤمنين والمسلمين من قريش ويثرب ومن تبعهم فلحق بهم وجاهد معهم، انهم امة واحدة دون الناس...)[1]، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەمە نووسراوێکە لە موحەممەد پێغەمبەرەوە لە نێو ئیمانداران‌و مسوڵمانانداندا لە قورەیش‌و لە (يثرب)، وە ئەوانەی کە پێیان دەگەن‌و جیهادیان لەگەڵدا دەکەن، کە ئەوان ئوممەتێکن جیا لە خەڵك...)، واتە: کۆچکەران‌و پشتیوانان، وە ئەوانەش کە لە دواییدا پێیانەوە پەیوەست دەبن، ئوممەتێکی سەربەخۆن، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ ﴾ الأنبياء.

**چەند سەرنجێك دەربارەی (الصحيفة) :-**

یەك :- لە ڕووی (سند)ەوە (د.أكرم ضياء العمري) لە کتێبی (السيرة النبوية الصحيحة)دا گوتوویەتی: ئەو سەنەدەی، کە ئەو (صحيفە)یەی پێ گێڕدراوەتەوە،

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص٢٦٢.

لە ڕیزی (سند)ی فەرمایشتە ڕاستەکانی پێغەمبەردایە ﷺ: (ترقى بمجموعها الى مرتبة الأحاديث الصحيحة)[1].

دوو :- لە ڕووی پانتایی‌و دابەشکردنی ماددەکانییەوە (٤٦) ماددەیە.

سێ :- لەڕووی نێوەڕۆکییەوە دەگونجێ زۆر شت باس بکرێ، بەڵام من پێم وایە لە پێنج تەوەرەدا بەرجەستە دەبێ:

١- پێناسەی مسوڵمانان: پێغەمبەر ﷺ دیاری کردوە، کە مسوڵمانان (ئۆممەت)ێکن، وەك لە ماددەی (٢)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: **{إنّهم أمة واحدة من دون الناس}**، واتە: مسوڵمانان (کۆچکەران‌و پشتیوانان‌و ئەوانەی، کە پێیانەوە پەیوەست دەبن) ئۆممەتێکن جیا لە خەڵك.

٢- دیاریکردنی سەرچاوەی بڕیار (مرجعية) بۆ مسوڵمانان: واتە: لایەنێك، کە لەکاتی گرفت‌و کێشەکانیاندا، بۆلای بگەڕێنەوەو بۆیان چارەسەر بکات، وەك لە ماددەی (٢٣)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: **((وانه مهما اختلفتهم فيه شيء فان مردّه الى الله والى محمد))**، واتە: ئێوە لە هەر شتێکدا کە کێشەو مشت‌ومڕێکتان بۆ پەیدا بوو، دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ لای خوا (جل شأنه) وە بۆ لای موحەممەد -عليه الصلاة والسلام-، کەواتە: سەرچاوەی بڕیار (مرجعية)ی باڵا بۆ مسوڵمانان: (قورئان‌و سوننەتە).

٣- پاراستنی ئاسایش‌و هێمنیی دەوڵەت: وەك لە ماددەی (٣٩)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: **{وان يثرب حرام جوفها لأهل هذه الصحيفة}**، واتە: وە خەڵکی ئەم نووسراوە (کە ئیمزای دەکەن) نابێ هیچ شتێك بکەن، کە پێچەوانەی بەرژەوەندیی ئاسایشی شاری (يثرب) بێ.

---

١) بڕوانە: بەرگی یەکەم: لاپەڕە: ٢٧٥، بۆ دەقی (الصحيفة)ش بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٦٢-٢٦٤)، هەروەها بڕوانە: (مجموعة الوثائق السياسية للمعهد النبويّ والخلافة الراشدة)، محمد حميد الله، ص(٥٧-٦٢)، الطبعة الثامنة: ١٤٣٠.

دیارە ئەوکاتە تەنیا (یثرب)یان بەدەستەوە بووە، ئەگەرنا دوایی کە فراوانتر بووە، ئەو دەقە هەموو دەوڵەتی ئیسلامیی گرتۆتەوە.

٤- مافەکانو ئازادییەکان: پێغەمبەر ﷺ لە چەندان (مادده)دا بەیانی کردوە کە خەڵك چۆن مافو ئازادییەکانیان بۆ دابین دەکرێت، بۆ وێنە لە مادده (٢٥)دا دەفەرموێ: **{وان يهود بني العوف أمة مع المؤمنين}**، واتە: وە جوولەکەکانی (بني عوف) ئۆممەتێکی سەربەخۆن لەگەڵ ئیمانداران.

وە لە ماددەی (٢٥) دەفەرموێ: **{لليهود دينهم وللمسلمين دينهم مواليهم وأنفسهم}**، واتە: جوولەکەکان دینی خۆیان هەیەو مسوڵمانانیش دینی خۆیان هەیە، هەم خۆیانو هەم ئەوانەی، کە لەگەڵیاندا هاوپەیمانن.

وە لە ماددەی (٤٥)دا دەفەرموێ: **{لا يكسب كاسبٌ الاّ على نفسه}**، واتە: هەرکەسێك شتێك بکات، تەنیا زیانی بۆ خۆی هەیە، یانی کەس بە تاوانی کەسەوە سزا نادرێ.

وە لە ماددەی (٣٨)یشدا دەفەرموێ: **{انه لا يأثم امرؤ بحليفه}**، واتە: ئەگەر کەسێك هاوپەیمانەکەی شتێکی کرد، ئەو بەهۆی ئەوەوە گوناهبار نابێ، وە هەر لەو ماددەیەدا لەبارەی پشتگیرییکردنی بابای زوڵم لێکراوەوە دەفەرموێ: **{وان النصر للمظلوم}**، واتە: وەبابای زوڵم لێکراو پێویستە یارمەتی بدرێ، (دیارە هەر جۆرە زوڵمێك بێ ئابووریی، سیاسیی، کۆمەڵایەتییو...هتد).

وە لە ماددەی (١٢)دا دەفەرموێ: **{وان المؤمنين لايتركون مفرحا بينهم ان يعطوه بالمعروف}**، واتە: مسوڵمانان نابێ لێبگەڕێن کەسێك لەنێو ئەواندا پەکی بکەوێ لە ڕووی ئابوورییەوە، بەڵکو دەبێ هاوکارییو دەستگرۆیی بکەن.

هەروەها لە ماددەی (١٣)دا دەفەرموێ: **{ان المؤمنين المتقين أيديهم على كل من بغى منهم أو ابتغى دسيعة ظلم...}**، واتە: ئیماندارانی

پارێزکار یەکدەستن لە بەرانبەر کەسێکدا ستەمی کردبێ یان بیەوێ ستەم بکات، هەروەها چەندان بڕگەی دی لەو شێوەیەی تێدان.

٥- بەرگرییکردنی هاوبەش:- وە لەو (صحیفة)یەدا هاتوە، کە دەبێ بە هەموو لایەك بەرگریی بکەن لە مەدینە، وەك لە ماددەی (٣٧)دا دەفەرموێ: **{وان على اليهود نفقتهم وعلى المسلمين نفقتهم وان بينهم النصر على من حارب أهل هذه الصحيفة وان بينهم النصح والنصيحة والبرُّ دون الإثم}**، واتە: جوولەکە نەفەقەی خۆیان دەکێشن، وە مسوڵمانانیش نەفەقەی خۆیان دەکێشن، وە دەبێ هاوکاریی یەکتر بکەن لە دژی هەرکەسێك، کە دژایەتی ئەهلی ئەم (صحیفة)یە دەکات، وە پێویستە پێکەوە دڵسۆزو ساغ بن‌و چاکەکار بن نەك خراپەکار.

هەروەها لە ماددەی (٤٣)دا دەفەرموێ: **{وان بينهم النصر على من دهم يثرب}**، واتە: وە دەبێ هەموویان پشتگیریی یەکتر بکەن لە بەرامبەر هەرکەسێکدا، کە هێرش دەکاتە سەر (یثرب)، دیارە هەر لەبەر ئەمەش بوو، کە پێغەمبەر ﷺ لە دواییدا سزای جوولەکەکانیدا، چونکە پێچەوانەی ئەو پەیمانەی خۆیان جوولانەوە، کە ئیمزایان کردبوو وە بەڵێنیان دابوو، کە بەرگریی لە (مەدینە) بکەن، بەڵام بە پێچەوانەوە کاتێك دوژمن هێرشی دەکردە سەر مەدینە، ئەوان دەستیان لەگەڵدا تێکەڵ دەکردو لەپشتەوە خەنجەریان دەوەشاند!

## حەوتەم: ئامادەسازیی بۆ جەنگ‌و جیهادو بەرگرییکردن لە دەوڵەت:-

پێغەمبەر ﷺ هەر لە سەرەتای قۆناغی مەککەوە مسوڵمانانی لەسەر گیانی فیداکاریی‌و بەرەنگاربوونەوەو زوڵم قبوڵ نەکردن بار هێناوە، نەك لەسەر گیانی مل نەوی کردن‌و قبووڵکردنی ژیانی زەلیلی.

بەڵام بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە پێی دەفەرموون: (صبراً)و هیچ مەکەن، وەدەستی دەگرتن، چونکە فەرمانی خوا وابووە، وەك خوای زاڵ دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ...﴿٧٧﴾﴾ النساء، واتە: تەماشای ئەوانە ناکەی، کە پێیان دەگوترا: دەست بگرنەوەو نوێژ بەرپا بکەن! دیارە ئەوکاتە هاوەڵان پێویستیان بەوە بووە پێیان بگوترێ دەست بگرنەوە، هەر بۆیەش کاتێك کە خوای دادگەر مۆڵەتی دان کە جەنگ بکەن هەریەکەیان شێرێك بوون لە بیشەیەك هاتبوونە دەر.

(أحمد وحاكم والترمذي) لە (إبن عباس) دەگێڕنەوە، کە گوتوویەتی: (خرج النبي من مكة، فقال أبو بكر: أَخْرَجوا نبيَّهم، لَيَهْلِكُنَّ، فأنزل الله: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ الحج، واتە: پێغەمبەر لە مەککە چووە دەر، ئەبووبەکریش گوتی: کافرەکانی قورەیش پێغەمبەریان ﷺ لە مەککە دەرکرد، لەبەین دەچن، یەکسەر خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار لەگەڵ کۆچکردنی پێغەمبەردا ﷺ، واتە: بەڕێوە بووە، کە ئەم ئایەتەی بۆ هاتەخوار، واتە: مۆڵەت درا بەوانەی، کە جەنگیان لەگەڵدا دەکرێو زوڵمیشیان لێ دەکرێ، وە بێگومان خوا لەسەر سەرخستنی ئەوان بەتوانایە، هەروەها (ابن هشام)[1]یش ئەوەی هێناوە، کە ئەم ئایەتە، وە سێ ئایەتەکەی دواشی هەموویان بەو بۆنەیەوە هاتنە خوار، کە پێغەمبەر ﷺ لە مەککە دەرکرا، کەواتە: لە سەرەتاوە تەنیا مۆڵەتیان پێدرا، کە جەنگ بکەن، بەڵام دوایی لەسەریان فەرز کرا.

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٤١-٢٤٢)، وە بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٢٧٦).

## دەستپێکردنی جەنگو جیهاد

وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد، پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی لە شاری مەدینەدا لەسەر چەند بنەمایەك بنیاتنا، کە یەکیان بریتیە لە ئامادەسازیی بۆ جەنگو فیداکاریی چونکە شتێکی بەڵگە نەویستە کە هەر کۆمەڵگاو کیانو دەوڵەتێك توانای بەرگریی لەخۆکردنی نەبێ، بێگومان ناتوانێ درێژە بە بوونی خۆی بداتو ئەو ئامانجانەش کە دەیەوێ بیانهێنێتە دی، بۆی نایەنە دی، جا لێرەدا من باس لە چوار خاڵی سەرەکی دەکەم، کە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ پلە بە پلەو وردە وردە دەستی کردوە بە جەنگو جیهاد.

## یەك: بەبێ هێزو توانا بەرگریی لە خۆ ناکرێو بە بێ بەرگریی لەخۆکردنیش هیچ ئامانجێك وەدی ناهێنرێ:-

خوای پەروەردگار لەوبارەوە لەچەند ئایەتێکدا باسی ئەو ڕاستییەی کردوە، کە مسوڵمانان پێویستە بەرگریی لەخۆیان بکەنو دەبێ هێزو پێزێکی وا دروست بکەن، کە ببێتە پەرژینو قەڵایەكو بوونی خۆیانی پێ بپارێزنو دوژمنو ناحەزانی خۆیانی پێ بترسێنن، تاکو تەماعیان تێنەکەن، بۆ وێنە خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠﴾ الأنفال، واتە: وە ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز بۆیان ئامادە بکەن (بۆ دوژمنانتان) وە لە ئەسپی بەستراوەو وڵاخی ئامادە

(کە لەم سەردەمەی ئێمەدا تانكو زرێپۆش شوێنی ئەسپی بەستراوە دەگرنەوە) بۆ ئەوەی دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن، کەسانێکی دیکەش ئێوە نایانزانن، بەڵام خوا دەیانزانێ واتە: (جگە لەو دوژمنە بەرچاوانەی، کە بەرەنگارتان دەبنەوە دوژمنانێکی دیکەش هەن لەپشت ئەوانەوە) هەر شتێکیش لە ڕێی خوادا ببەخشنو خەرجی بکەن، پاداشتەکەیتان بەتەواوەتی دەدرێتەوەو ستەمتان لێ ناکرێو، کردارو پاداشتەکەیتان بەزایە ناچێ.

کەواتە: لە ئیسلامدا هێز ئامادە کردن لەلایەن ئیماندارانەوە بۆ ترساندنی دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆیان پێویستە، چونکە (أَعِدّوا) (فعل الأمر)ە فەرمان (أمر)یش بۆ پێویست بوون (وجوب)ە، مەگەر بەڵگەیەك هەبێ، کە ئەو (أمر)ە لە مانای پێویست بوون (وجوب) لابدا بۆ پەسندییو ڕەوایی، (نَدْب وإباحة) لێرەشدا هیچ نیشانە (قرينة)یەکی بەو شێوە نیە.

هەروەها لە کۆتایی بەسەرهاتی (طالوت و جالوت)دا خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿...وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾﴾ البقرة، واتە: ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵكی بە هەندێکی دیکە، (ئیمانداران) پاڵ پێوە نەنابا، زەوی لێ پاك نەکردبانەوەو وای نەکردبا، کە ئەهلی کوفر بەرپەرچ بدرێنەوە، سەر زەوی تێکدەچوو، (دیارە سەر زەوییش هەمیشە بەوە تێکدەچێ، کە کەسانی بێبڕوای ستەمکار دەسەڵات بگرنەدەست، کە هەرچی نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار هەن، بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆیان بەکاری دێننو، خەڵکی لێ بێبەش دەکەنو خراپەکاریی لە زەوییدا بڵاودەکەنەوە) ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، واتە: بەڵام خوا خاوەن چاکەیە بەسەر جیهانییانەوە، کە ئەهلی ئیمان دەڕەخسێنێ بۆ ئەوەی خەڵکی ستەمکاری کافریان پێ پاڵپێوەنێو نەهێڵێ بەهۆی دەسەڵاتی ئەوانەوە

www.alibapir.com

جیهان پڕبێ لە فەسادو خراپە، کەواتە: لێرەشدا خوای بەرزو مەزن هێزو دەسەڵاتو توانایەك، کە بەدەست ئەهلی ئیمانەوەیەو ئەهلی ستەمو کوفری پێ پاڵپێوەدەنێن، بە نیعمەتێکی داناوە بۆ سەر هەموو مرۆڤایەتی.

هەروەها خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ...﴿٤٠﴾ الحج﴾، واتە: مۆڵەت درا بۆ کەسانێك، کە جەنگیان لەگەڵ دەکرێو ستەمیان لێکراوە، وە بێگومان خوا لەسەر یارمەتی دانیان بەتوانایە، کەسانێك کە لە ماڵو حاڵی خۆیان وەدەر نراون بە ناحەق، مەگەر ئەوە کە گوتوویانە پەروەردگارمان خوایە....

لەم چەند ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە بەبێ هێز بەرگریی لە خۆ ناکرێ، بەبێ بەرگریی لەخۆ کردنیش، بوون (وجود) ناپارێزرێو، هیچ ئامانجێکیش نایەتە دی.

## دوو: لە فەڕزکرانی جەنگو جیهاددا وەکو ئەرکە شەرعییەکانی دیکە، پلەپلەیی ڕەچاو کراوە :-

ئەمەش ڕاستییەکی دیکەیە، کە لە ژیانی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺدا ڕەنگی داوەتەوەو، ئەگەر تەماشای قۆناغەکانی بەرەنگاریيو جەنگو جیهاد بکەین کە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ئەنجام دراوە، پلەپلەیی (تدرج) دەبینینو دەتوانین بڵێین: جەنگو جیهادو بەرەنگاریی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بە چوار قۆناغی گشتیدا تێپەڕیوە :-

### ١- فەرمــان کردن بەدەسـت گرتنەوەو خۆڕاگــریی :-

خــوای باڵادەســت دەفــەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ...﴿٧٧﴾ ﴾ النساء، واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە پێیـان گوترا: دەستی خۆتان بگرنـەوەو نوێـژ بـەرپا بکـەن وە زەکـات بـدەن.... دوایـی خـوای پەروەردگار باسـی ئـەوە دەکـات کـە دوای ئـەوەی جـەنگیان لەسـەر پێویسـت کـراوە، هەندێکیان پاشەکشـەیان کردوە، یاخـود داوایان کردوە، کە دەبووایـە جـەنگو جیهـاد دوا خرابایە!

کەواتــە: لــە قۆناغێکـدا پێغەمبــەر ﷺ بەفــەرمانی خــوا هــاوەڵانی بــەڕێزی ئاگادارکردۆتەوە کە دەست بگرنەوە لە جەنگو لە بەرانبەر ئەهلی کوفردا هێـزو چـەك بەکار نەهێنن، بەڵکو ئارام (صبـر) بگـرنو خـۆڕاگربن، وەك لـە (طبـراني و حـاكم و بيهقي) هێناویانە، کە پێغەمبەر ﷺ بەلای خانەوادەی (یاسـر)دا تێپـەڕی کـە ئـازارو ئەشکەنجە دەدران، فەرمووی: **{صبـرا يا آل ياسـر موعـدكم الجـنّة}**، واتـە: ئـەی بنەماڵەی یاسر خۆڕاگربن لە بەهەشت پێك دەگەینەوە، واتە: خـۆڕاگر بـن لەسـەر ئـەو ئەشکەنجەدرانو نارەحەتکرانەو شتێکی دیکە مەکەن.

وە لە سیـرەی (ابـن هشـام)[1]دا هـاتوە کـە دوای ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ پەیـمانی دووەمی (عقبة)ی لەگەڵ نوێنەرانی (ئەوسو خەزرەج)دا بەست، (العباس بن عبادة بـن نضلة) گوتی: (والله الذي بعثك بالحق ان شئت لَنميلنَّ على أهل منى غـداً بأسـيافنا)، واتــە: (ســوێند بەوخوایــەی کــە تــۆی بەحــەق نــاردوە، ئەگــەر بتــەوێ بــەیانی بەشـمشێرەکانــمان پــەلاماری ئــەو کافرانــە دەدەیــن، کــە لــە مینـا کۆبوونەتـەوە)، پێغەمبەر ﷺیش فەرمووی: **{لـم نؤمر بذلك ولكـن إرجـعوا الــى رحـالكم}**،

---

١) (السيـرة النبوية)، ج٢، ص(٢٣١).

www.alibapir.com

واتە: ئێمە فەرمانمان بەوە پێنەکراوە، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ بارگەو هەوارگەکانی خۆتان، واتە: جارێ فەرمانمان پێ نەکراوە بە جەنگ، دیارە پێغەمبەر ﷺیش هیچ کارێکی بەبێ فەرمانی خوای کاربەجێ نەکردوە.

## ٢- مۆڵەت درانی جەنگ لەبەرئەوەی زوڵملێکراون :-

قۆناغی دووەم لە فەرزکردنی جەنگ و جیهاد بریتی بوو لە مۆڵەتدران بە جەنگ کردن بێ ئەوەی، کە لەسەریان فەرز بکرێ، وەکو خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ... ﴿٣٩﴾﴾ الحج، واتە: مۆڵەت درا بەکەسانێك، کە جەنگیان لەگەڵ دەکرێو ستەمیان لێکراوە... واتە: بۆیان هەیە جەنگ بکەن بەهۆی ئەو هەموو زوڵمەوە کە لێیان دەکرێ، کە جەنگیان لەگەڵ دەکرێو دەردەکرێن، واتە: لەم قۆناغەدا واجب نەکراوە، بەڵکم بۆیان هەبووە جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانەی، کە ستەمیان لێ دەکەن.

## ٣- فەرزکرانی جەنگ لەکاتی هێرشکرانە سەرو شەر پێ فرۆشتندا :-

خوای تۆڵەستێن دەفەرموێ: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ البقرة، واتە: (وە لە ڕێی خوادا بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا، کە لەدژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆش ناوێ)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿...فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾﴾ البقرة، واتە: وە هەرکەسێك دەستدرێژیی کردنە سەر، ئێوەش دەستدرێژیی بکەنەوە سەر وەکو خۆیو بەرپەرچی بدەنەوە، وە پارێز لە خوا بکەن، وە بزانن بێگومان خوا لەگەڵ پارێزکاراندایە، واتە: سنوور مەبەزێننو بەئەندازەی

دەستدرێژیی ئەوان وەڵامیان بدەنەوەو دەست پێشخەریی مەکەن‌و تا ئەوان شەڕتان لەگەڵدا نەکەن ئێوە مەیکەن.

### ٤- فەرزکرانی جەنگ بۆ نەهێشتنی چەوسێنرانەوەی مسوڵمانان‌و ڕێی دینداریی لێ گرتنیان :-

خوای توانا دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾﴾ البقرة، واتە: لەگەڵیاندا بجەنگن تاکو (فتنە)[1] نامێنێ، جا ئەگەر دەستیان هەڵگرت، نابێ دەستدرێژیی بکرێتە سەر هیچ کەس جگە لە ستەمکاران، لێرەدا خوای تاك‌و پاك نەیفەرموە: (الاّ علی الکافرین) بەڵکو فەرموویەتی: (الا علی الظالمین)، واتە: کافرێك کە زوڵم نەکاو بێ زیان دادەنیشێ، شەڕی لەگەڵدا ناکرێ لەسەر کافرایەتییەکەی، بەڵام کافرێك کە دەیەوێ کوفری خۆی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ، ئەوە ئەهلی ئیمان دەبێ دەستی بگرن‌و ئەو زوڵمەی لێ قبوولْ نەکەن، هەربۆیەش (ئەهلی کیتاب) شەریعەت سەرانەیان لێ وەردەگیرێ‌و بۆیان هەیە، کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بن‌و سەرو ماڵیان پارێزراوەو لەسەر بڕوا نەبوون جەنگیان لەگەڵدا ناکرێ، وە ڕای بەهێز ئەوەیە، کە لە غەیری (ئەهلی کیتاب)یش سەرانە وەردەگیرێ‌و لێیان قبوولْ دەکرێ، کە لەسەر دینەکەی

---

١) فتنة: واتە ئازاردان‌و ئەشکەنجەدانی مسوڵمانان، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: (فتنة) لێرەدا بەمانای (شرك) دێ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە هەڵەیە، چونکە خوا -جل شأنه- جیهادی لەسەر مسوڵمانان فەرز نەکردوە تاکو کوفر نەمێنێ، چونکە خوا ڕێگای نەگرتوە لە خەڵك کە (کافر) یاخود (مشرك) بن، وەك خوای بەرزو بێوێنە لە سوورەتی (التغابن)دا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ...﴿٢﴾﴾، واتە: خوا ئێوەی خولقاندوە، جا هەتانە کافرەو هەشتانە مسوڵمانە، کەواتە: لە ئیسلامدا ڕێگای کافربوون لە خەڵك نەگیراوە، بەڵام ڕێگای زوڵم کردنیان لێگیراوە.

خۆیان بمێننەوە، کە بەلای ئیسلامەوە دینێکی بەتاڵە، بەمەرجێك هەوڵنەدەن، کە کوفری خۆیان بەسەر مسوڵمانانندا بسەپێنن، وەك چۆن خوای پەروەردگار ڕێگای بە ئەهلی ئیسلامیش نەداوە کە ئیسلامی خۆیان بەسەر کەسدا بسەپێنن، وەك دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة، کەواتە: خەڵکی دەبێ لە دنیادا ئازاد بن، لەوەدا کە مسوڵمان دەبن یان کافر وە دوایی لە دوارِۆژدا هەرکەسەو پاداشت یان سزای خۆی وەردەگرێ، لەسەر مسوڵمان بوون یان کافر بوونەکەی[1].

وە ئەم جۆرەی چوارەم، کە باسمان کرد لە زاراوی شەرعزانانندا پێی دەگوترێ: جیهادی بەدوادا گەڕان (جهاد الطلب)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ ...﴿٧٥﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەوە بۆچی لە ڕێی خواو چەوسێنراواندا جەنگ ناکەن؟! کەواتە: لەهەرجێیەك کۆمەڵێك خەڵك بچەوسێنرێتەوە ئەگەر مسوڵمانیش نەبن، لەسەر ئیمانداران و ئیسلام پێویستە، مادام بتوانن، دیفاع و بەرگرییان لێ بکەن لەهەر شوێنێك بن.

## سێیەم: کاتی دەستپێکران و سەرەتای جیهاد :-

ئەو مێژوونووسانەی، کە مێژووی ژیانی پێغەمبەریان ﷺ تۆمار کردوە، دوو ڕایان هەن :-

هەندێکیان دەڵێن سەرەتای ساڵی دووەمی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ بە کردەوە دەستی بە جەنگ و جیهاد کردوە.

---

١) لە کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)و (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی...)دا بەدرێژیی باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوە.

هەندێکیش دەڵێن کۆتایی ساڵی یەکەمی کۆچی، واتە کۆتایی ئەو ساڵەی، کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا کۆچی کردوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، ئنجا وەك (إبن هشام) دەڵێ: بۆمان دەردەکەوێ، کە هەردوو بۆچوونەکان ڕاستن، ئەو دەڵێ: (قدم رسول الله ﷺ المدينة يوم الأثنين حين اشتد الضحاء و كادت الشمس تعتدل لثنتي عشرة ليلة مضت من شهر ربيع الأول، قال (ابن سحاق) ورسول الله ﷺ يومئذ ابن ثلاث و خمسين سنة، وذلك بعد أن بعثه الله بثلاث عشرة سنة فأقام بها بقيةٍ شهر ربيع الاول و ربيع الاخر وجمادين ورجباً وشعبان وشهر رمضان وشوالاً وذا القعدة وذا الحجة والمحرم، ثم خرج غازياً في صفر على رأس اثني عشر شهراً من مقدمه المدينة)[1]، واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی دووشەممە کاتێك کە ڕۆژ گەرم بووو هەتاو گەیشتۆتە نیوەڕاستی ئاسمان، (١٢) شەو ڕەت بوو بوون لەمانگی (ربيع الاول) چووە بۆ مەدینە، کە ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ تەمەنی (٥٣) ساڵ بووەو (١٣) ساڵ دوای ئەوە بووە، کە خوا ڕەوانەی کردوە وە لە مەدینە ماوەتەوە، ماوەی ئەو ئەندازەیەی کە ماوەتەوە لە مانگی (ربيع الأول و ربيع الثاني وجمادي الأولى و جمادي الثانية و رجب و شعبان و رمضان و شوال و ذوالقعدة و ذوالحجة و محرم)ی ساڵی دووەمیشو لە مانگی (صفر)ی ساڵی دووەم، پێغەمبەر ﷺ بۆ یەکەمین جار بۆ غەزا کردن لە شار دەرچووە، پاشان (١٢)مانگ دوای ئەوەی کە چۆتە (مەدینە).

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ مانگی کۆتایی ساڵی یەکەمی چوونی بۆ مەدینە دەستی بەیەکەمین جەنگو غەزا کردوە، کە دەکەوێتە مانگی دووەمی ساڵی دووی کۆچی ئەگەر وەکو ژمارەی مانگەکان لێکیبدەینەوەو لەوەدا هەردووك ڕایەکە ڕاست دەردەچن.

(محمد حميدالله) لە (الوثائق السياسية)[2]دا هێناویەتی، کە: پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی دەست بە یەکەمین چالاکی سەربازیی خۆی بکات، فەرمووی: **{اكعبوا**

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢١٨).

٢) ص ٦٥.

www.alibapir.com


**لـي مَنْ تَلَـفَّظَ بالإسلام من النـاس}**، واتە: هەمـوو ئەوانەم بۆ بنووسـن، کـە دانیـان بە ئیسلامدا هێناوە لە خەڵکی، دواتر سەرژمێریان کردن بـە پشـتیوانو کۆچـکەرانەوە (١٥٠٠) جەنگاوەر بوون، بێگومان پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی بێ حیسـابو کتـاب نەکردوە ئـەوەتا دوای سـەرژمێرکردن، فـەرمانی کردنـی یەکـەمین غـەزای داوە، بـەڵام جەنگو کوشتاری تێدا ڕوو نەداوە.

## حیکمەتو ئامانجەکانی جەنگ لە ڕێـی خـوادا:

١- پاراستنی ئازادی بیـروبڕوا: وەك خوای بێهاوەڵ دەفەرموێ: ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ... ﴿٣٩﴾﴾ الأنفال.

٢- پاراستنی پەرستگاکان: وەك خـوای بەتوانـا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾﴾ الحج.

٣- نەهێشتنی فەسادو ئاشـووب لە زەویدا: وەك خـوای دادگـەر فەرموویەتی: ﴿.... وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾﴾ البقرة.

٤- تاقیکردنەوەی بڕواداران: وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَاْ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾﴾ محمد.

٥- لە بێژینگدانو پاڵاوتنی بڕواداران: وەك خوا -عزّ وجلّ- فەرموویەتی: ﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... ﴿١٤١﴾﴾ آل عمران.

٦- ترساندنو زەبوونكردنی كافرانو پووچەڵكردنەوەی فێڵو پیلانەكانیان: وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾﴾ الأنفال. وە فەرموویەتی: ﴿قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾﴾ التوبة.

٧- دەركەوتنی مونافیقەكانو لێك هەڵاواردنی پاكو پیسان: وەك خوا -عزّوجلّ- فەرموویەتی: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾﴾ آل عمران.

٨- پیادەکردنی بەرنامەو حوکمی خوا لە زەویدا: وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿... وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾﴾ الحج.

٩- بەرگریی کردن لە دینی خواو مافی چەوساوانو نەهێشتنی دەستدرێژیی کافران: وەك خوای بالادەست فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾﴾ النساء.

## چالاکییە سەربازییەکانی پێش جەنگی بەدری گەورە :-

لە کتێبەکانی سیرەدا بۆ جەنگەکانی نێوان مسوڵمانو کافران دوو زاراوە بەکارهاتوون: (غَـزْوَة) و (سَرِيَّة):

(غَـزْوَة):- بەو جەنگانە دەگوترێ، کە پێغەمبەر ﷺ بەشداریی تێیدا کردوونو سەرپەرشتی کردوون، وەك: (بـدر و أُحُد و حُنَيـن و تَبوك).

(سَرِيَّة):- بەو چالاکییە سەربازییانە دەگوترێ، کە پێغەمبەر ﷺ بەشداریی تێدا نەکردوون، ئەگەر چی گەورەش بووبنو جەنگیان تێدا ڕوودابێت، جگە لە جەنگی (مؤتة)، کە مێژوو نووسان ناویان لێناوە (غزوة مؤتة)، چونکە هێزێکی زۆر لە مسوڵمانان بەشداریی تێدا کردوە، کە ژمارەی (٣٠٠٠) سێهەزار جەنگاوەر بووەو، سێ لە سەرکردەکانی جەنگی مسوڵمانانیشی تێدا شەهید

کراون: (زيد بن حارثة و جعفر بن أبي طالب و عبدالله بن رواحة) خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

پێغەمبەر ﷺ لەماوەی ساڵێك مانەوەو نیشتەجێ بوونی لە (مەدینە)دا ئیش‌و کاروبارە ئیداریی‌و سیاسیی‌و کۆمەڵایەتییەکانی ڕێکخستن‌و تەواو کردن، بەتایبەت دروستکردنی مزگەوت‌و، برایەتی نێوان کۆچکەران‌و پشتیوانان‌و، نووسینی دەستوور (الصحيفة) بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی‌و هەڵسوکەوتی مسوڵمانان‌و جوولەکەکان‌و، شاری (مەدینە)ی خستە قۆناغ‌و بارودۆخێکی تایبەتییەوە، بۆیە دوای ئەوانە پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە چالاکیی سەربازیی لە دژی نەیارەکانی، کە هەر لەپێش کۆچکردنیشیەوە بۆ مەدینە گرفت‌و کێشەو سەرئێشەی زۆریان بۆ دروست کردبوو.

چالاکییە سەربازییەکانی پێغەمبەر ﷺیش پێش جەنگی (بەدری گەورە) بریتی بوون لە هەشت چالاکیی، کە ئەمانەن:

## ١- غەزای (وەددان) یان (ئەبواء)[1]:-

کە ئەمە یەکەمین غەزا بووە پێغەمبەر ﷺ پێی هەڵساوەو لە ساڵی دووەمی نیشتەجێ بوونی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا ڕوویداوە، کاتەکەیشی کۆتایی مانگی (صفر)و بەشێکیش لە مانگی (ربيع الأول)ی گرتۆتەوە، کە دەکاتە کۆتایی ساڵی یەکەم‌و سەرەتای ساڵی دووەم، وە ژمارەی ئەو جەنگاوەرانەی کە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا بوون (٢٠٠) دووسەد کەس بوون، لە سوارو پیادە، وە ئەو چالاکییە کوشتاری تێدا نەبووەو پێغەمبەر ﷺ (موادعة)ی لەگەڵ (بني ضمرة)دا

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٣١٨).

کـردوە، (موادعـة)ش واتـە: واز لـە یەکـدیهێنانو بـێ لایـەنبوون، وە پێغەمبـەر ﷺ پەیـماننامـەیەکی لەگەڵ (بني ضمرة)دا بەست، کە ئەمـە دەقەکەیەتی[1]:

(بسم الله الرحمن الرحيم، هذا كتاب من محمد رسول الله لبني ضمرة بن بكر بن عبد المناة بن كنانة، بأنهم آمِنون على أموالهم وأنفسهم وأن لهم النصر على من داهمهم الا ان يحارَبوا في دين الله، مابلَّ بحرٌ صوفةً، وان النبِي اذا دعاهم لنصرة أجابوه، عليهم بذلك ذمة الله وذمة رسوله...)، واتـە: بـەناوی خـوای بـە بـەزەیی بەخشندە، ئەوە نووسراوێکە موحەممەد پێغەمبەری خواوە بۆ (بني ضمرة)، کـە دڵنیا دەکرێنەوە لەسەر ماڵو سامانو نەفسیان، وە هەرکەسێك دەستدرێژییـان بکاتە سـەر، پێویستە پێغەمبەر ﷺو مسـوڵمانان پشـتیوانییان بکـەن، مەگـەر دژایـەتی ئیسـلام بکەن، وە ئـەوانیش پشـتیوانی مسـوڵمانان بکـەن هـەرکات، ئەگـەر پێغەمبـەر داوای لێکردن، هەتاکو بەحـر خوری تـەڕ بکـات (واتـە: هـەتا هەتـایە)، لـەوبارەوە بـەڵێنی خـواو پێغەمبەرەکەیان لە گـەردن دایە.

لـەو غـەزوەیـەدا پێغەمبـەر ﷺ (سـعد بـن عبـادة)ی لـە مەدینـە لـە جێـی خـۆی جێهێشـتوەو مـاوەی (١٥) ڕۆژیـان پێچـووەو (حـمزة بـن عبدالـمطلب) ئاڵاکـەی هەڵگرتـوە.

## ٢- سـەرییـەی (عبـيدة بن الـحـارث)[2]:-

دووەم چالاکیی سەربازیی (سەرییە)یەك بووە، کـە پێغەمبـەر ﷺ بەشـداریی تێدا نەکردوە، بـەڵام (عبيـدة بـن الـحارث)ی کـردوە بـە فەرمانـدەی ئـەو (سـەرییە)، کـە ژمارەیان (٦٠ تا ٨٠) سـوار بـوو، هەمووشـیان لـە (کۆچـکەران)بوون، دوژمـنیش لـە هۆزی قورەیش بوو، کە ژمارەیان (٢٠٠) سوارو پیادە زیاتر بوو، بە سەرپەرشتی (أبـو سفيان)، بەڵام لەو چالاکییەشـدا کوشتار ڕووی نەداوە.

---

١) بڕوانە: (مـجموعة الوثائق السياسية للعهد النَّبوي والـخلافة الراشدة)، مـحمد حـميد الله، ص(٢٢٠).
٢) بڕوانە: (السيـرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٣١٩).

یەکەمین تیریش، کە هاویشتراوە لە لایەن (سعد بن أبي وقاص)ەوە بووە، وەك لە ژیاننامەی خۆیدا گوتوویەتی: (أنا أول مَنْ رمى سهماً في سبيل الله) کاتی ئەم جەنگەش دوای گەڕانەوە بووە لە (وەددان)، وە شوێنی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەش پێی دەگوترێ (ماء رابغ)، وە لەو (سرية)دا دوو پیاو لە لەشکری ئەوان هاتنە نێو لەشکری ئیسلامەوە، کە پێشتر لە مەککە ئیمانیان هێنابوو، بەڵام لەگەڵ لەشکری ئەوان هاتبوون، بۆ ئەوەی پەیوەندیی بکەن بە هێزی مسوڵمانانەوە کە بریتی بوون لە: (المقداد بن عمرو البهراني) و (عتبة بن غزوان المازني).

## ٣- سەرییەی (حمزة)[1]:-

پێغەمبەر ﷺ (٣٠) سوار لە مسوڵمانانی کۆچکەری ناردوە بۆ کەناری دەریای سوور، بەسەرکردایەتی (حمزة)، -خوا لێی ڕازی بێ- دوژمن ژمارەی (٣٠٠) سوار بووە، لە ئەهلی مەککە بەسەرکردایەتی (أبو جهل) بەڵام (مجدي بن عمرو الجهني) کەوتۆتە نێوانو کوشتار ڕووی نەداوە، کاتەکەشی دوای غەزای وەددان بووە.

## ٤- غەزای (بواط)[2]:-

لە مانگی (ربيع الأول)ی ساڵی دووەم، پێغەمبەر ﷺ بە سوپایەکی (٢٠٠) دووسەد کەسیی، بەمەبەستی گرتنی کاروانێکی قورەیشییەکان ڕۆیشتوە کە (أمية بن خلف) سەرقافڵەیان بوەو، ژمارەیان (١٠٠) سەد کەس بووە، وە هەزارو پێنج سەد حوشتریان پێبووە لە (بواط) لەلای (رضوى)، بەڵام ڕووبەڕووبوونەوەو کوشتار ڕووی نەداوە.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٢١).

٢) هەمان سەرچاوە، (٣٢٢).

## ٥- غــەزای (العشیــرة)[1]:-

بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئامـانج لـەم غەزایـەش ڕێگـاگرتن بـووە لـە کاروانێکی قوڕەیشییان، بەڵام فریایان نەکەوتن، هەر ئـەم کاروانـەش بـوو کاتێـك لـە شـام گەڕایـەوە پێغەمبـەر ﷺ بڕیاریـدا بیگـرێو سـەرەنجام جـەنگی بـەدری گـەورە بەوهۆیەوە ڕوویدا.

## ٦- سـەرییەی (سـعد بن أبی وقاص)[2]:-

شەشەم چالاکیی سەربازییش سەریەی (سـعد بـن أبـي وقـاص) بـووە، کـە ژمـارەی جـەنگاوەرانی مسـوڵمان (٨)کـەس بـووە، وەك (ابـن هشـام) دەڵـێ لـە کۆچـکەران، شوێنەکەشی (الـخرّار) بـووە لەسـەر زەمینـی (حیجـاز) بەمەبەسـتی ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ کاروانێکـی قوڕەیشـییەکاندا، بـەڵام کـە گەیشـتنە شـوێنەکە، کاروانەکـە دەرچوو بوو، بۆیە هیچ کوشـتار ڕووی نەداو گەڕانەوە.

## ٧- غـەزای بـەدری یەکـەم[3]:-

ئەم غـەزایە (١٠) شەو پاش غەزای (العشیـرة) بـووە بـە سـەرکردایەتی پێغەمبـەر ﷺو هۆکاری ئەم غـەزایەش، ئەوە بـووە کـە (کـرز بـن جـابر الفهـري) بـە هێزێکـەوە هەندێك مەڕو ماڵاتی مەدینەی بردبوو، پێغەمبەر ﷺیش بە حەفتا کەسەوە شـوێنی کەوتوەو ڕۆیشتوە تا شیوی (سَفْوان) بەڵام فریـای نەکـەوتوە، لـە ئەنجامـدا پێغەمبـەر ﷺ گەڕاوەتەوە بۆ (مـەدینە)و شەڕ ڕووی نەداوە، لەوەشـەوە نـاونراوە (غـەزای بـەدر) چونکە تا سەر ئاوی بەدر ڕۆیشتوون.

---

١) هەمان سەرچاوە، ص٣٢٢-٣٢٣.

٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٣٢٣.

٣) هەمان سەرچاوە، ص٣٢٤.

## ٨- سەرییەی (عبدالله بن جحش)[1]:-

چالاکیی هەشتەم‌و کۆتایی پێش ڕوودانی جەنگی بەدری گەورە، سەرییەی (عبدالله بن جحش) بووە، کە پێغەمبەر ﷺ ناردوویەتی بەسەرکردەیی (٨) کەس لە کۆچکەران‌و شوێنەکەشی پێی دەگوترێ: (نخلة) لە نێوانی (مكة و طائف)دایەو کاتەکەشی کۆتا ڕۆژی مانگی (رجب) بووە، وە ئەنجامەکەی گرتنی کاروانێك بوو بە سەرۆکایەتی (عمرو بن الحضرمي) وە بەدیل گرتنی (عثمان بن عبدالله و الحكم بن كيسان)، بەسەرهاتی ئەم چالاکییەش بەم شێوەیەیە :-

پێغەمبەر ﷺ نامەیەك بۆ (عبدالله بن جحش) دەنووسێ کە فەرماندەی ئەو (سَرِيَّة)یە، وە پێی دەفەرموێ: دوو ڕۆژان بەو ئاڕاستەیەدا بڕۆن، دوایی نامەکەم بکەوەو بیخوێنەوە، چی تێدا بوو جێبەجێی بکە، ئەویش بەو شێوەیە فەرمانەکەی جێبەجێ کردو، کە تەماشای نامەکەی کرد نووسرابوو: (اذا نظرت في كتابي هذا فامض حتى تنزل نخلة بين مكة والطائف فترصد بها عير قريش وتَعَلَّمْ لنا من أخبارهم)، واتە: ئەگەر تەماشای نامەکەمت کرد، بڕۆ تا دەگەیە (نخلة) لە نێوان (مكة و طائف)و بۆسە بۆ کاروانی قورەیشییەکان دابنێ‌و بزانە هەواڵیان چییەو ئاگادارمان بکەوە لە دەنگ‌و باسیان، جا کاتێك (عبدالله) نامەکەی خوێندەوە گوتی: گوێ ڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی دەکەم، وە بە هاوەڵەکانی خۆی گوت: پێغەمبەر ﷺ شتێکی ئاوای بۆ نووسیوم، کێ لەگەڵم دێ بە مەبەستی شەهیدیی با بێت‌و هەرکەسێکیش ناتوانێ با بگەڕێتەوە، ئنجا هەموویان لەگەڵیدا دەچن‌و، لە ئەنجامدا ئەو کاروانە دەگرن‌و یەکێکیان لێ دەکوژن‌و دووانیشیان لێ بەدیل دەگرن، بەڵام ئەو مسوڵمانانە نەیانزانیبوو، کە کەوتوونەتە مانگی (حەڕام)ەوە، بۆیە ئەو جەنگەیان کرد، دوایی کە گەڕانەوە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردن‌و کافرەکانیش زۆر ڕەخنەیان لە پێغەمبەر ﷺ گرت، کە چۆن لە مانگی (حەڕام)دا جەنگ دەکات؟!.

---

١) هەمان سەرچاوە، ص(٣٢٤-٣٢٧).

بۆیە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ ... ﴿٢١٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی (حەرام)دا؟ بڵێ: جەنگ کردن لە مانگی حەرامدا زۆر گەورەیە، بەڵام ڕێگاگرتن لە دینی خواو کوفر پێکردنیو ڕێگرتن لە مزگەوتی حەرام لای خوا زۆر گەورەترە، وە خەڵك هەڵگێڕانەوە لە دینی خوا گەورەترە لە کوشتارکردن لە مانگی حەرامدا...

لە بەسەرهاتی نێررانی سەرییەی (عبدالله بن جحش)دا، چەند پەندێك وەردەگرین، لەوانە:-

١- فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە (عبدالله) بەوە، کە نامەکەی نەکاتەوە تادوای دوو ڕۆژو، (عبدالله)ش لەهۆی نەکردنەوەی نامەکەی نەپرسیوەو فەرمانەکەشی جێبەجێ کردوە، کەواتە: پێویستە سەرکردە هەندێك جار ئەوپەڕی پەنهانکاریی بەکاربێنێ.

٢- گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی تەواویی (عبدالله) بۆ پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیەی پێویستەو جێبەجێکردنی فەرمانەکەی بەوشێوەیەی، کە فەرموویەتی، کە دیارە ئەمەش بەرهەمی باوەڕو متمانەی پتەوی سەربازو سەرکردەیە.

٣- تۆبزیی نەکردنو سەرپشککردنی (عبدالله) بۆ هاوەڵانی لەکاتێکدا، کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کافرەکان دەچوون، کەواتە: بەتۆبزیی جەنگو جیهاد ناکرێ.

٤- لەو ڕووبەڕووبوونەوەیەدا سەرکردەی بەرەی کافرەکان بە ناوی: (عمرو بن الحضرمی) کوژراوەو ئەوە یەکەم کەسی کافرەکان بووە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەدەستی مسوڵمانان کوژراوەو دوو کەسیشیان بەدیل گیراون، بەناوی: (عثمان بن عبدالله والحکم بن کیسان) کە ئەمانەش یەکەمین دیل بوون

www.alibapir.com

کەوتوونەتە دەستی مسوڵمانان، کەواتە: لە یەکەمین بەرەنگاربوونەوەدا کافرانی ستەمکار زەبری مسوڵمانانیان پێکەوتوە.

## هێندێک لە ئامانجەکانی ئەو (غزوة) و (سرية)یانە :-

١) ئەوانەی بەشداری ئەو غەزوەو سەرییانە بوون، هەموویان لە کۆچکەران بوون، ئەمەش بۆ زیاتر تۆڵەسەندنەوە لە کافرەکانی قورەیش، کە کۆچکەرانیان لە ماڵو نیشتمانی خۆیانیان دەرکردبوون.

٢) لاوازکردنی باری ئابووریی قورەیشییەکان.

٣) مەشق پێکردنی هاوەڵانی لەسەر هونەرەکانی جەنگو بەرەنگاربوونەوە.

٤) چاودێریی کردنی جموجۆڵی سوپای قورەیش.

٥) ئاگادارکردنەوەی نەیارانی ئیسلام لە مەدینەو دەوروبەریو ترساندنیان بەهۆی ئەو ڕووبەڕووبوونەوانەوەو دەرخستنی توانای مسوڵمانان.

٦) دیاریکردنی ئەندازەی هێزی دوژمنو دەمارگرتن، (جَسُّ النبض)یان.

وە سەرەنجام ئەو چالاکییانەی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی کاریگەریی زۆریان هەبوو لەسەر ڕانواندنی هەیبەتی مسوڵمانان لەسەر دەوروبەرو ڕاکێشانی سەرنجی هێندێك لە هۆزەکانو، بەرتەسککردنەوەی دەوری ناحەزانی ئیسلام.

www.alibapir.com


# دوژمنـــایەتی جوولەکە بۆ پێغەمبــەر ﷺ و هاوەڵانــی

هەر لە سەرەتای چوونی پێغەمبـەرەوە ﷺ بۆ (مەدینـە)، جوولەکـەکان دەسـتیان کردوە بە دوژمنایەتیی و ناحەزایەتیی خۆی و هاوەڵانی، وە بێگومان دژایەتی جوولەکـە بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام و مسوڵمانان، وە نەبێ هەر لەکاتێکی دیاریکراودا بووبـێ، بەڵکو هەتا دوادوای تەمەنی پێغەمبەر ﷺ هەر بـەردەوام بـوون لەسـەر ئـەو پـیلان و فێڵانەیان، (ابن اسحاق)[١] لەوبارەوە دەڵێت: (دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ چوو بـۆ (مەدینە) و لەوێ نیشتەجێ بوو، وە دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامیی بنیاتنا، زانایـانی جوولەکە دەستیان کرد بە دژایەتیکردنی پێغەمبـەر ﷺ، ئـەویش بەپاڵنـەر و هانـدەری ڕق و قیـن و حەسەدەوە، بەتایبەتی بەهۆی ئەوەوە، کـە پێغەمبـەر ﷺ لـەنێو عارەبدا هاتوە و لەنێو جوولەکەکاندا نـەهاتوە -چـونکە ئـەوان چاوەڕێ بـوون پێغەمبـەر لـەنێو ئەواندا بێ- وە هەندێك لە خەڵکی (ئەوس و خەزرەج) کـە لـە کـوفر و شـرکدا بەسـاڵدا چووبوون، پاڵیان دایە لای جوولەکەکان، کە هەرچەندە بەڕواڵـەت خۆیـان بـە مسـوڵمان نیشـان دەدا، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا بێبـڕوابوون، وە لەدواییـدا پێـڕی دووڕووەکانیـان پێکـهێنا، بەوپێیە مونافیقەکان لەگەڵ جوولەکەکاندا دەستیان کرد بـە دژایـەتیکردنی پێغەمبەر و مسوڵمانان، هەر لە سەرەتای نیشـتەجێبوونیانەوە لە مەدینەدا).

ئنجا (ابن هشام) باسی کۆمـەڵێك لـە سـەرانی جوولەکـە دەکـات لـە مەدینـەدا لـە تیـرەکانی: (بني النضيـر وبني قينقاع وبـني قريظـة وبـني زريـق وبـني حارثـة وبـني عمرو بن عوف وبني النجار)، وە دەڵێ: ئا ئەوانـە بـەزۆری دژایـەتی پێغەمبـەر ﷺ و مسوڵمانانیان لە مەدینەدا کـردوە، وەك دەڵـێ: (فهـؤلاء أحبـار اليهـود أهـل الشـرور والعداوة لرسول الله ﷺ وأصحابه وأصحاب المسألة والنصب لأمر الإسـلام ليطفـؤه،

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٦٩).

الا ماكان من عبدالله بن سلام و مخيريق)، واتە: ئا ئەوانە بوون لە سەرانی جوولەکەکان کە خراپەکار بوون‌و دژایەتی پێغەمبەر ﷺیان دەکرد، وە دەیانویست چرای ئیسلام خەفە بکەن‌و بیکوژێننەوە، جگە لە دووکەس لە سەرانی جوولەکە (عبدالله بن سلام) و (مخيرق)، کە هەردووکیان دوو زاناو پێشەوای جوولەکەکان بوون، بەڵکو (عبدالله بن سلام) لە هەموویان شارەزاترو زاناتر بووە.

چۆنیەتی مسوڵمانبوونی (عبدالله بن سلام)یش وەك (ابن هشام)[1] هێناویەتی، کورتەی بەسەرهاتەکەی بەم شێوەیە: (عبدالله بن سلام) دەڵێ: دوای ئەوەی کە من لە کتێبەکانی خۆماندا خوێندبوومەوە دەمزانی کە پێغەمبەری کۆتایی دێت، وە دوای ئەوەی کە موحەممەد ﷺ هات بۆ مەدینەو نیشتەجێ بوو، تەماشای هەڵوێست‌و نیشانەکانیم کرد، هەمووی دەقاودەق وەکو ئەوەبوو کە لە کتێبەکانی ئێمەدا باسکرا بوون، بۆیە ڕۆژێکیان چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتم: ئەی موحەممەد من دەزانم کە تۆ پێغەمبەری خوای وە ئیمانت پێ دێنم، بەڵام جوولەکەکان قەومێکی بووختانکەرن، ئەگەر بزانن من مسوڵمان بووم، ناوو ناتۆرەم بەدوا دەخەن، بۆیە پێش ئەوەی کە بزانن مسوڵمان بووم، بانگیان بکەو دەربارەی من پرسیاریان لێ بکە، ئنجا من چوومە ژوورێکی دیکەو پێغەمبەر ﷺ لەدوای سەرانی جوولەکەی ناردو دەربارەی من پرسیاری لێکردن‌و فەرمووی: (عبدالله بن سلام) چ پیاوێکە لەنێو ئێوەدا؟

ئەوانیش گوتیان: ئەو (عبدالله) زانای هەرە گەورەمانەو کوڕی زانای هەرە گەورەمانە، وە باشترین پیاوە لەنێوماندا‌و کوڕی باشترین پیاویشمانە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەو مسوڵمان بوو چی دەکەن؟

گوتیان: خوا پەنای بدات لەوە کە مسوڵمان بێ، هەرگیز شتی واناکات!.

---

١) (السيرة النبوية) ج٢، ص(٢٧٠-٢٧١)، هەروەها (بخاري)یش لە (صحيح)ەکەی خۆیدا بە ژمارە: ٣٩٣٨، هێناویەتی.

منیش لە ژوورەکە هاتمەدەرێو گوتم: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! پارێز لە خوا بکەنو ئەوەی کە لەخواوە بۆتان هاتوە قبووڵی بکەن، بەخوا ئێوە دەزانن، کە موحەممەد پێغەمبەری خوایەو لە تەوراتی بەردەستتاندا ناوو سیفەتەکانی نووسراون، بۆیە من شایەدیی دەدەم، کە پێغەمبەری خوایەو بڕوای پێ دێنمو بەڕاستی دەزانمو دەیناسم!

گوتیان: درۆ دەکەی! وە دەستیان کرد بە قسە پێگوتنم!

هەروەها بەسەرهاتی (مخیرق)یش وەك (ابن هشام)[1] هێناویەتی بەم جۆرەیە، دەڵێ: لەکاتی جەنگی (ئوحود)دا موخەیریق دەچێتە لای زاناکانی جوولەکەو پێیان دەڵێ: کوڕینە ئەو موحەممەدە پێغەمبەری خوایەو نیشانەکانی هەموو دیارن، با پشتگیریی بکەین، کە ئێستا لەگەڵ موشریکەکاندا ڕووبەڕوو بۆتەوە! جوولەکەکانیش زۆر قسەی پێ دەڵێن، ئەویش پێیان دەڵێ: ئێوە درۆزنن‌و تەنانەت لەگەڵ کتێبەکانی خۆشتاندا ڕاست ناکەن، وە وەسیەت دەکات، ئەگەر لەو جەنگەدا کوژرا ماڵو سامانەکەی هەموو بۆ مسوڵمانان بێ.

هەروەها بەسەرهاتی (صفية بنت حيي بن أخطب)[2] وەکو (ابن هشام)[3] هێناویەتی: ئەمە کورتەکەیەتی: (صفية) دەڵێ: بابم زۆری خۆشدەویستم، هەروەها مامیشم (أبو ياسر بن أخطب) زۆری خۆشدەویستم، ڕۆژێك بەرەبەیانێکی زوو، بابمو مامم گوتیان: با بڕۆین بزانین داخۆ ئەو کابرایە (موحەممەد) ئەو پێغەمبەرەیە، کە ئێمە لە کتێبەکانی خۆماندا نیشانەکانیمان خوێندۆتەوە؟! ڕۆیشتنو ئێوارە گەڕانەوە، کە هاتنەوە، ماڵێ مامم بە بابمی گوت: ئایا ئەو کابرایە ئەو پێغەمبەرەیە؟ بابیشم گوتی: سوێند بەخوا ئەو پێغەمبەرەیە، کە

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٢، ص(٢٧١).

٢) لە دواییدا بوو بە هاوسەری پێغەمبەرو دایکی مسوڵمانان، خوا لێی ڕازی بێ.

٣) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص(٢٧٢).

www.alibapir.com


پێغەمبەری کۆتاییە، مامم گوتی: ئایا هەڵوێستت چییە؟ بابم گوتی: بە خوا هەتا ماوم دوژمنایەتی دەکەم! منیش چوومە لای وامزانی وەکو جاران باوەشم بۆ دەگرنەوە، بەڵام هیچ گوێیان پێ نەدامو زۆر نارەحەت بوون بەوەی، کە پێغەمبەری کۆتایی لەنێو ئەواندا نەهاتوە.

لێرەدا مەبەستم ئەوە بوو، کە جوولەکەکان چاك زانیوایانە، کە موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) پێغەمبەری خوایە، چونکە ئێستاش نیشانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە (پەیمانی کۆن)دا هەر ماون، لەگەڵ دەستکارییو شێوێنرانیشیان، بەڵام وەکو ئاماژەم پێکرد، زانایانی جوولەکەش هەموویان بەرانبەر بە ئیسلام یەك هەڵوێستیان نەبووە.

خوای پەروەردگاریش باسی هەڵوێستی ئەوانەمان بۆ دەکات لە خاوەن کتێبەکان، کە ئەهلی ئیمانو خاوەن ویژدانن، دەفەرموێ: ﴿لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾﴾ آل عمران، واتە: (وەکو یەك نین،[1] لە ئەهلی کیتاب کۆمەڵێك هەن، شەوانە شەونوێژ دەکەنو ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوەو سەجدەی بۆ دەبەنو، ئیمان بەخواو ڕۆژی دوایی دێننو فەرمان بەچاکە دەکەنو ڕێگریی لە خراپە دەکەن، پێشبڕکە دەکەن لە چاکەکارییداو ئەوانە لە صاڵحانن، وە هەر چاکەیەك بکەن بەزایە نادرێ، بێگومان خوا بە پارێزکاران زانایە.

---

١) ئەم ئایەتانە زۆر شتیان لێوەردەگیرێ، بۆ نموونە: نابێ هەموو شوێنکەوتووانی حیزبو لایەنێك بەیەك چاو تەماشا بکەین، بۆ وێنە: خەڵکی ڕۆژئاوا (ئەورووپا) هەموو یەك حساب نین، یان ئەمریکا هەمووی یەك حساب نیە، بەڵکو ڕژێمەکەی جیایە لە خەڵكو میللەتەکەیو خەڵکەکەشیان خراپ و چاکیان تێدایە.

# چەند شێوازێکی دژایەتیکردنی جوولەکەکان بۆ پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان

## یەکەم: فیتنەنانەوە لە نێوان مسوڵمانان:-

خوای پەروەردگار لە چەند شوێنێك لە قورئاندا باسی هەڵوێستی جوولەکەکان دەکات کە هەمیشە دەیانەوێ هەراو فیتنە بنێنەوەو ئاشوبو ئاژاوە لەنێو مسوڵماناندا سازبکەن، لەوبارەوە بەسەرهاتێك هەیە کە چەند ئایەتێك لە سوورەتی (آل عمران) لەبارەی ئەو بەسەرهاتەوە هاتوونە خوار، بەسەرهاتەکەش بەکورتی[(١)] ئەوەیە کە کابرایەکی بەتەمەنی جوولەکە بەناوی (شَأْس بن قيس) ڕۆژێك بەلای کۆمەڵێك لە (پشتیوانان) لە (ئەوسو خەزرەج)دا تێدەپەڕێ، کە دەبینێ زۆر بەبرایانە پێکەوە دانیشتوونو ئایەت بۆ یەکتر دەخوێننەوەو باسی ئیسلام بۆ یەکتری دەکەن، زۆر نارەحەت دەبێ، بۆیە گەنجێکی جوولەکە بانگ دەکاتو دەڵێ: بچۆ جەنگی (بعاث)یان بخەوە یاد، وە ئەو شیعرانەیان بۆ بخوێنەوە کە (ئەوسو خەزرەج) لە دژی یەکدی گوتوویانن لە سەردەمی نەفامییدا، گەنجەکە دەچێتو شیعرەکان دەخوێنێتەوە، هەندێك شتی نەفامیی پێش ئیسلامیان دێنێتەوە یاد، ئەوانیش دڵیان گەرم دەبێو هەر لەوێ یەخەی یەکتر دەگرنو لە یەکتر دەدەن، وە وەعد دەدەن کە دوایی لە شوێنێکدا بەچەك لەگەڵ یەکدا جەنگ بکەن، کە پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەبیستێت، یەکسەر دەچێتو پێیان دەفەرموێ: **{يا معشر المسلمين! الله الله! أبدعوى الجاهلية وأنا بين أظهركم بعد أن هداكم الله للأسلام وأكرمكم به وقطع به عنكم أمر الجاهلية واستنقذكم به من الكفر وألّف به بين قلوبكم؟!}**، واتە: ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان! بۆ خاتری خوا! بۆ خاتری خوا! ئایا بانگەشەی

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص(٢٩٥-٢٩٧).

نەفامێتی لەنێو خۆتاندا زیندوو دەکەنەوە، لە کاتێکدا، کە من لەنێوتاندام‌و دوای ئەوەی، کە خوا هیدایەتی داون بۆ ئیسلام، وە بەهۆی ئیسلامەوە رێزی لێ گرتوون، وە ریشەی نەفامیی لەنێو ئێوەدا بڕیوەو بەهۆی ئیسلامەوە لە کوفر رزگاری کردوون، وە دڵی بەیەکەوە گرێداون -لەسەر بنچینەی ئیمان (ئێستا چۆن دەگەڕێنەوە بۆ نەفامێتیی)؟! ئنجا خوای بە بەزەیی ئەم چەند ئایەتەی ناردنە خوارێ لەبارەی (شأس بن قیس)ەوە، کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾﴾ آل عمران، واتە: بڵێ ئەی خاوەن کتێبەکان! بۆچی کوفر بە ئایەتەکانی خوا دەکەن لەکاتێکدا، کە خوا چاودێرە لەسەر ئەوەی دەیکەن، ئەی خاوەن کتێبەکان! بۆچی خەڵك لەرێی خوا لادەدەن، کە ئیمان بێنن، وە دەتانەوێ دینی خوا خواروخێچ بکەن لەبەرچاوی، خەڵك لە حاڵێکدا، کە شاهیدن‌و دەزانن (ئەوە دینی حەقی خوایە) وە خوا بێئاگانیە لەوەی، کە دەیکەن!.

وە سەبارەت بە (أوس بن قيظي)، کە لە (أوس) بوو وە (جبار بن صخر)، کە لە (خزرج) بووەو خەریك بوو شەڕێکی گەورە لە نێوانیان‌و نێوان عەشیرەتەکانیاندا ڕوو بدات‌و پێغەمبەر ﷺ ئاگری فیتنەکەی کوژاندەوەو دەستی پێ لە ملی یەکدی کردن، خوای پەروەردگار لەبارەی هەریەك لەو دوو کەسەوە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾ آل عمران، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ئەگەر فەرمانبەریی کەسانێك بکەن لە جوولەکەکان، ئەوە پاش ئەوەی، کە ئیمانتان هێناوە هەڵتان دەگێڕنەوەو کافرتان دەکەن، وەچۆن کافر

www.alibapir.com

دەبن لە کاتێکدا ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، وە پێغەمبەری خواتان لەنێودایە؟، وە هەرکەسێك دەست بە (بەرنامەی) خواوە بگرێ، ئەوە بێگومان ڕێنمایی کراوە بۆ ڕێیەکی ڕاست.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئایەتەکانی قورئان بەپێی ڕووداوو هەلو مەرجەکانو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان هاتوونە خوار، وە زانایانیش دەڵێن (ان خصوص السبب لايمنع شمول المعنى)، واتە: (تایبەتی بوونی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان، ڕێگا ناگرێ لە گشتگیریی مانای حوکمی ئایەتەکان)، واتە: کاتی خۆی، کە دوو کەس بۆتە ناخۆشییو شەڕیان بەهۆی کابرایەکی جوولەکەوە، مەرج نیە ئێستاش هەمان شت ڕووبداتەوەو کابرایەکی جوولەکە بێت ئاژاوەمان بۆ ساز بکات، بەڵام هەرشتێك سەر بکێشێ بۆ ناکۆکیی بەینی مسوڵمانان، ئەوە ئەو ئایەتانە دەیگرنەوە، وە بەتەئکید هەرکەسێك بیەوێ ئاشووب لەنێو مسوڵماناندا پەیدا بکا، ئەوە ڕەفتاری جوولەکانی ئەنجام داوە.

لە تەفسیرەکاندا هاتوە: لەکاتێکدا، کە پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتانە بۆ هاوەڵەکانی دەخوێنێتەوە هەموویان دەست دەکەن بەگریانو پەشیمان دەبنەوەو پەندێکی گەورەی لێ وەردەگرن، کە جارێکی دیکە گوێ بە قسەی هیچ جوولەکەو کافرو دەغەڵێك نەکەن، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژێكو دوو ڕۆژان نەبوونە ئەو کەڵە پیاوە، بەڵکو تووشی هەڵەو کەموکوڕییش بوون، بەڵام دوایی پەندیان لێ وەرگرتوەو چونکە لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا بەڕێوە چوون هەڵەکانی خۆیان ڕاست کردوونەوە.

کەواتە: ئێمەش وەکو فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵە نینو مەرج نیە تووشی هەڵەو کەموکوڕیی نەبین، بەڵام ئەگەر تووش بووین، گرنگ ئەوەیە دەرسو پەند لە هەڵەکانمان وەربگرینو، پەشیمان ببینەوەو نەچینەوە سەریان، وە تووشی هەر کێشەیەك بووین بێگێڕینەوە بۆ تەرازوی قورئانو سوننەتو شەریعەت بکەینە دادوەر.

## دووەم: بێڕێزییان بەرانبەر بە خوا:-

شێوازی دووەم لە دژایەتیکردنی جوولەکەکان بۆ ئیسلامو پێغەمبەر ﷺ، لە بێئەدەبیی بەرانبەر بەخوادا (جل شأنه) خۆی نواندوە، لەوبارەشەوە ئەم بەسەرهاتە بە نموونە دەهێنمەوە:

ڕۆژێك[1](ابو بكر الصديق) -خوا لێی رازی بێ-، دەچێ بۆ (مدراس)[2] زانایەکیان لەوێ دەبێ بەناوی (فنحاص)و، یەکی دیکەش بەناوی (أشيع)، (أبو بكر) پێیان دەڵێ ئیمان بێنن، بۆخۆتان دەزانن، کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، بۆچی ئیمانی پێناهێنن؟! لەکاتێکدا کە لە کتێبەکانتاندا ناوونیشانەکانی هەن، ئەوانیش دەڵێن: نەخێر وانیە!! جگە لەوەی، کە ئینکاریی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ دەکەن، (فنحاص) بێئەدەبییش دەکا بەرامبەر بە خواو دەڵێ: ئەو خوایەی کە موحەممەد باسی دەکا فەقیرە، ئێمە بە دەوڵەمەند دەزانێو داوای قەرزمان لێدەکا، بۆخۆی نەهی لە سوود (ربا) دەکاتو کەچی سوود (ربا) دەدا بە ئێمە، کە (فنحاص) ئەوە دەڵێ، (أبو بكر) زۆر تووڕە دەبێو مستێکی لە لووتی دەداو دەڵێ: چۆن بێئەدەبیی بەرامبەر خوا دەکەی؟! (فنحاص)یش بەدەمو لووتی خوێناوییەوە دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺو دەڵێ: ئەوە هاوەڵەکەت (أبو بكر) ئاوای لێکردووم، پێغەمبەر ﷺ بانگی (أبو بكر) دەکاو لێی دەپرسێ: بۆ وات کردوە؟ (أبو بكر) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا قسەی بە خوا گوتوە، دەڵێ: خوا فەقیرە! منیش لەسەر خوا تووڕە بووم، (فنحاص)یش نکووڵیی دەکاو دەڵێ: وامنەگوتوە، دوایی خوای بەرزو بێوێنە ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە (فنحاص) بەدرۆ دەخاتەوەو، قسەی (أبوبكر) بە ڕاست دادەنێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٩٨).

٢) ناوی قوتابخانەی جوولەکەکان بوو، کە (توراة)یان تێدا دەخوێند.

سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ آل عمـران، واتـه: خـوا قسـەی ئەوانـەی بیسـت کـە گوتیـان: خـوا هـەژارەو ئێمـە دەوڵەمەندین، ئەوەی کە گوتیان دەینووسین وە ئـەو پێغەمبەرانـەی، کـە کـاتی خـۆی بەناحەق کوشتوویانن ئەوانیشمان نووسیوە، وە پێیان دەڵێیـن بیچێژن سزای سووتێنەر.

واتـە: هەڵوێسـتە ناشـیرین‌و خراپـەکانیان بەرانبـەر بـە خـوا تـازە نـین، بـەڵکو پێغەمبـەرانی خواشـیان کوشـتوە، وەك لـە (پەیـمانی کـۆن)دا هـاتوە، یـەکێك لـە زاناکانیان سەرزەنشتی جوولەکەکان دەکـات‌و دەڵێـت: فـلان پێغەمبـەرەتان نەکوشـت؟ فلان پێغەمبەرەی دیکەشتان نەکوشت؟...هتد، ناوی کۆمـەڵێك لە پێغەمبەران دێنێ!! کەواتە: جوولەکەکان خۆشیان دان بەوەدا دەنێن کە پێغەمبـەرانیان کوشتوون:

هەروەها دەربارەی هەڵوێستی (أبوبكر) خوای زاڵ‌و شکۆدار ئەم ئایەتـەش دەنێرێتـە خـوار، کـە دەفـەرموێ: ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾ ﴾ آل عمـران، واتـە: ئێـوە لـە مـاڵ‌و سـامان‌و نەفسـی خۆشـتاندا تـاقی دەکرێنـەوە، وە لـە ئـەهلی کیتـاب‌و موشـریکەکانیش ئازاری زۆر دەبیستن، بەڵام ئەگەر سـەبر بگرن‌و پـارێز لـە خـوا بکـەن (ئەوە سـەرفراز دەبن) بەڕاسـتی ئـەوە لـەو شـتانەیە، کـە پێویسـتی بـە عـەزیـمەتی بەهێـز دەکات.

## سێیەم: ئینکاریی کردنیان کە خوا هیچ کتێبی ناردبن:-

ئەم هەڵوێستەشیان شێوازێکی دیکەی دژایەتیکردنیانە بۆ ئیسلام، وە خوای زاناو توانا ئەم ئایەتەی سەبارەت بەو هەڵوێستەیان ناردۆتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ ... ﴿٩١﴾﴾ الأنعام، واتە: وەك پێویست ڕێزی خوایان نەگرت، کە گوتیان: خوا هیچ کتێبێکی نەناردۆتە سەر هیچ بەشەرێك.

(ابن اسحاق)[1] دەڵێ: جوولەکەکان گوتیان ئەی موحەممەد! خوا هیچ کتێبێکی نەناردۆتە خوار لەدوای مووسا.

خوای پەروەردگاریش لە وەڵامی ئەم هەڵوێستەیاندا ئەم ئایەتانەی سووڕەتی (النساء)ی ناردنە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾﴾ النساء.

## چوارەم: ئینکاریی کردنیان لە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ:-

خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنۡهُمۡ لَيَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٤٦﴾﴾ البقرة، واتە: ئەوانەی کتێبمان پێداون موحەممەد ﷺ دەناسن وەکو چۆن کوڕەکانیان دەناسن، بەڵام هەندێکیان حەقێ دەشارنەوە، لە حاڵێکدا کە دەزانن موحەممەد پێغەمبەری خوایە.

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٣٠٠).

لە (أسباب النـزول)ی (السيوطي)دا هاتوە، کە: (عمر بن الخطاب) لە (عبدالله بن سلام)ی پرسی: خوا دەفەرموێ ئێوە موحەممەد ﷺ دەناسن وەك چۆن کوڕەکانی خۆتان دەناسن، ئەوە چۆنە؟!

(عبدالله بن سلام) گوتی: سوێند بە خوا لە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ زیاتر دڵنیام لەوەی، کە کوڕەکەم منداڵی خۆم بێت، چونکە خوای بەرزو شکۆدار لە قورئاندا باسی کردوەو بە (جبریل)ی ئەمیندا ناردوویەتی، کە موحەممەد پێغەمبەرە، وە لە کتێبەکەی خۆماندا هەیە، هەروەها مووساو پێغەمبەرانی دیکەی (بني اسرائيل) لەوبارەوە هەواڵیان پێداوین، بەڵام نازانم ئایا دایکی منداڵەکەم خیانەتێکی کردوە، یان نا، بەس دڵنیام، کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە!!.

## پێنجەم : بێڕێزیی جوولەکەکان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ :-

لە (صحيح مسلم)[1]دا هاتوە، کە: ڕۆژێك کۆمەڵێك لە جوولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺو گوتیان: (السام عليكم) (سام)یش یانی مردن، (عائشة)ش گوتی: (بل عليكم السام واللعنة)، واتە: بەڵکو ئێوە مردنو لەعنەتتان لێبێ، پێغەمبەر ﷺیش فەرمووی: **{يا عائشة ان الله يحب الرفق في الأمر كله}** رواه مسلم، واتە: ئەی عائیشە! خوا لە هەموو کارێکدا بەزەییو نەرمو نیانی خۆش دەوێ، (عائشة) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نابینی چی دەڵێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با، بەڵام ئایا تۆش نابینی چۆن وەڵامیان دەدەمەوە، دەڵێم: (وعليكم)، دیارە لێرەدا سەنگو ڕێزو ئەدەبی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێ، چونکە ئەو فەرموویەتی بەهەمان شت بۆخۆتان، جا ئەگەر چاك بێ بۆخۆتان چاکە، وە ئەگەر خراپیش بێ بۆخۆتان خراپە.

---

١) صحيح مسلم: ٥٦٢١.

وە لەوبارەوە خوای کاربەجێ ئەم ئایەتەی سوورەتی (المجادِلـةَ)ی ناردە خوارێ کە دەفـــەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ ... ﴿٨﴾ ﴾ المجادلة، واتە: ئایا تەماشای ئەوانە ناکەی، کە فسکەفسکیان لێ قەدەغەکراوە، پاشان ئەوەی لێیان قەدەغەکراوە دەگەڕێنەوە سەری؟!

## شەشەم: پەیوەندی ناڕەوای جوولەکەکان لەگەڵ مونافیقەکاندا:-

شێوازو تاکتیکێکی دیکەی جوولەکەکان بۆ دژایەتی ئیسلام بریتیی بوو لە پەیوەندی بەستن‌و کەین‌وبەینیان لەگەڵ مونافیقەکانداو بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی نهێنی‌و کەین‌وبەینیان لەگەڵ مونافیقەکاندا دەبەست‌و دەیانویست لەو ڕێیەشەوە زیان بە پێغەمبەر ﷺ‌و کیان‌و دەسەڵاتی ئیسلامیی بگەیەنن، خوای کاربەجێ لەم دوو ئایەتەدا ئاماژە بەو پەیوەندییە دەکات، کە مونافیقەکان هەیانبووە لەگەڵ جوولەکەکانداو دەفەرموێ: ﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ ﴾ النساء، واتە: مزگێنی بدە بەدەغەڵەکان، کە سزای بەئێشیان بۆ هەیە، ئەوانەی کافرەکان دەگرن بەدۆست‌و پشتیوانی خۆیان جیا لە ئیمانداران‌و ئایا دەسەڵات‌و زاڵبوونیان لێ‌دەخوازن؟، بێگومان دەسەڵات‌و زاڵبوون هەمووی هی خوایە.

www.alibapir.com

## حەوتەم: شایەتییدانی بەدرۆیان، کە موشریکەکان لە مسـولْمانەکان چاکتـرن :-

یـەکێکی دیکـە لـە کـارە نارەوایـەکانی جوولەکـەکان لـە مەدینـەدا، ئـەوەبوو کـە شایەدیی بەدرۆیان دەدا بۆ هاوبەش پەیداکەرەکان، کـە دیـنو پـەیڕەوی ئـەوان چـاکترو ڕاستترە لە دینی مسولْمانان، وەك خوای تاكو پـاك لـەوبارەوە دەفـەرمویْ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾﴾ النساء، واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە ئەندازەیەك کتێبیان پێدراوە، ئیمان بە (جبت)[١] و (طـاغوت)[٢] دێـنن، وە بەکافرەکان دەڵێن کە ئەوان ڕێگەیان ڕاست ترە لە ئیمانداران.

لێرەدا مەبەست لە ﴿ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ کۆمەڵێك لـە سـەرانی جوولەکەیـە وەك (كعـب بـن الأشـرف)و (حُيـي بـن الأخطـب) کـە لـە کاتێکـدا (مشرك)ەکانی مەککە پرسیاریان لێکردنو گوتیان: ئایـا دینـی ئێمـە ڕاسـترە یـاخود دینی موحەممەد؟! لە وەڵامدا گوتیان: دینی ئێوە ڕاستترە لە دینـی (مـحمـد)، بۆیـە خوای زاڵو زانا ئەم ئایەتانەی لەسەر ناردنە خـوار[٣].

لە ئۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/علی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/علی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

١) جبت: واتە: بتو صەنەم.
٢) طاغوت: واتە: هەرکەسێك لە غەیری خوا فەرمانبەرییی بۆ بکرێ بە موتڵەقی.
٣) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(٣٠٠).

# بەردەوام بوون لەسەر بنیاتنانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی و گەشەپێدانی لەڕووی فیکریی و ڕووحیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و ...هتد دەوە

لە ساڵی دووەمی کۆچیدا، واتە: دووەمین ساڵی نیشتەجێبوونی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا، چەند شتێك ڕوویان داوە، کە بە ڕووداوی گەورە دادەنرێن لە مێژووی ئیسلامدا، کە بریتین لە :-

## یەکەم: گۆڕدرانی قیبلە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (کعبة):-

دەربارەی ڕوو پێوەرسووڕانی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان لە ڕووگەی (بیت المقدس)ەوە بۆ ڕووگەی (کعبة)، وێڕای چەند ئایەتێکی سوورەتی (البقرة) چەند فەرموودەیەکیش هەن، لەوانە:

(مسلم)[1] لە (البراء بن عازب) -خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوەو دەڵێ: مسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆماوەی (١٦یان ١٧) مانگ ڕووەو (بیت المقدس) نوێژیان دەکرد، دوایی ڕوویان پێوەرسووڕێنرا بەرەو (کعبة).

هەروەها (ابن عمر) -خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (بینا الناس بقباء في صلاة الصبح اذ جاءهم آتٍ فقال ان رسول الله ﷺ قد أنزل علیه اللیلة قرآن، وقد أُمِرَ أن یستقبل الکعبة فاستقبلوها وکانت وجوههم الی الشام فاستداروا الی

١) صحیح مسلم: ١١٧٧.

الكعبة) رواه البخاري ومسلم[١]، واتە: مسوڵمانان لە مزگەوتی قوبا لە نوێژی بەیانی دا بوون یەکێك هاتو گوتی: ئەمشەو پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بۆ دابەزیوەو فەرمانی پێکراوە، کە ڕوو بکاتە (کەعبە) ئێوەش ڕوو لەوێ بکەن، ئەوکات ڕوویان لە (شام) بوو، ئەوانیش ڕوویان لە کەعبە کرد.

دیارە جوولەکەکانی مەدینە تا ئەوکاتەش پێیان خۆش بوو کە مسوڵمانان ڕوو بە (بیت المقدس) نوێژیان دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی ڕوویان پێوەرسووڕێنرا بەرەو (کعبة) پێیان ناخۆش بوو، بۆیە دەستیان کرد بەڕەخنەگرتنو یەکێك لە قسەکانیان ئەوەبوو کە دەیانگوت: موحەممەد وردەوردە دەگەڕێتەوە سەر دینی بابو باپیرانی (کە هاوبەش بۆ خوا پەیداکردنە) ئەمڕۆ قیبلەو سبەی شتێکی دیکە، وەك خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمۡ عَن قِبۡلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيۡهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٤٢﴾ البقرة، واتە: نەفامەکان لە خەڵکی (مەبەست جوولەکەکانە) دەڵێن: چ شتێك ڕووی پێوەرسووڕاندن لەو قبلەیەی، کە لەسەری بوون، پێیان بڵێ: ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا هەر هی خوان، (واتە: خوا خاوەنی هەردووك قیبلانە) وە خوا هەرکەسێك، کە بیەوێ بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنمونیی دەکات.

**لەم ڕووداوە چەند شتێکی گرنگ دەخوێندرێتەوە :-**

١) مسوڵمانان دەبێ (ڕووگە) قیبلەیەکیان هەبێ، کە ڕووی تێبکەن، وەك خوای پاكو تاك دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلّٖ وِجۡهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَاۖ ... ١٤٨﴾ البقرة، واتە: وە هەرکەسە ڕوویەك (ڕووگەیەك)ی هەیە، کە ڕووی تێدەکا، کەواتە: بۆ ئەهلی ئیمانیش دەبێ ڕووگەو جەمسەرێکیان هەبێ کە هەموویان ڕووی تێبکەن.

---

١) صحيح البخاري: ٤٠٣، و صحيح مسلم: ١١٧٨، واللفظ للبخاري.

٢) پێغەمبەر ﷺ ئەو (١٦ یان ١٧) مانگە، کە ڕووی لە (بیت المقدس) کردوە حیکمەتێکی سەرنج ڕاکێشانی خاوەن کتێبەکان بووەو دوای ئەوەی، کە ئەوان هەر لەسەر کەللەڕەقیی خۆیان بەردەوام بوون، بە فەرمانی خوا ئەو قیبلەیە گۆڕدراو هیچی دیکە لە نوێژدا ڕووەو (بیت المقدس) نوێژ نەکرا.

٣) ئەو ڕوو وەرسووڕێنرانە تاقیکردنەوەیەك بووە بۆ مسوڵمانان وەك خوای شارەزا دەفەرموێ: ﴿... وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ... ﴿١٤٣﴾﴾ البقرة، واتە: ئەوەیش قورس بوو، مەگەر لەسەر ئەوانەی، کە خوا هیدایەتی دابوون، واتە: ئەهلی ئیمان بوون.

ئنجا لەو ڕووگە گۆڕانەشدا گومان بۆ هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دروست بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەمان کە نوێژو طاعەتیان کردوەو مردوون، لە کاتێکدا کە هەر ڕوویان لە (بیت المقدس) کردوە!، ئێستا حیسابیان چۆن دەبێ؟! خوای بەبەزەیی هەر لە هەمان ئایەتدا ئەو ئیشکالە حەل دەکاتو دەفەرموێ: ﴿...وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٣﴾﴾ البقرة، کە زۆربەی زانایانو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە (إیمانكم) (صلاتكم)ە، واتە: وەناگونجێ خوا نوێژەکانتان بە زایە بدات، بێگومان خوا بەرانبەر خەڵکی بەبەزەییو میهرەبانە.

چونکە پێشتر، کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ڕوو لە (بیت المقدس) بکەن، دیارە ئەو نوێژانەی وەبەر ئەوێ کەوتوون دروست بوون، بەڵام لەمەودوا دروست نیە، چونکە ئەو فەرمانەی کە ئێستا هاتوە ئەوەی پێشیی هەڵوەشاندۆتەوە.

## دووەم: فەرزکرانی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:-

فەرزکرانی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە ساڵی دووەمی[1] کۆچیدا بووە بەر لە جەنگی بەدر، وەخوای بەخشندە لەبارەی مانگی ڕەمەزانو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانو چەند حوکمێکی کە بەو مانگەوە پەیوەستن، دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ... ﴿١٨٤﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕۆژوو گرتنتان لەسەر پێویست کراوە، وەکو چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوەش پێویست کرا بوو، بۆ ئەوەی پارێزکار بن، چەند ڕۆژێکن...

کەواتە: لە ئەنجامی ڕۆژوو گرتنەوە ئینسان پارێزکردن (تقوی)ی پەیدا دەبێ، هەروەها ڕۆژوو یەکێکە لە پێنج پایەکانی مسوڵمانێتی تاکیی، چونکە ئێمە بەهۆی ئەو پێنج پایانەوە، کە بریتین لە: (شایەتمانو نوێژو ڕۆژووو زەکاتو حەج) دەتوانین بزانین کە ئەو ئینسانە مسوڵمانە یان نا، چونکە ئیمانو عەقیدە لە (شایەتمان)دا دەردەکەوێ، وە پەیوەندی خۆیو خوا لە (نوێژ)کردندا دەردەکەوێ، وە پەیوەندی خۆیو خەڵك لە زەکات داندا دەردەکەوێ، وە لایەنی ڕووحیی لە ڕۆژووگرتنو حەج کردندا دەردەکەوێ.

بۆیە پێویستە بزانرێ کە زانایان دەڵێن ئیسلام پێنج پایەی هەن: (شایەتمانو نوێژو ڕۆژووو زەکاتو حەج)، واتە: ئەرکە تاکیی (شخصي)یەکان لە ئیسلامدا ئەو پێنجەن، ئەگەر نا ئەو پێنج ئەرکە ئیسلامییە پێنج پایەو بنەڕەتی هەموو ئیسلامەتی نین، بەڵکو پێنج پایەی بنەڕەتی مسوڵمانێتی تاکیی (شخصي)ین.

---

١) بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٢٩٠).

## سێیەم: فەرزکرانی زەکاتی سەرفترە (فطر)و زەکاتی ڕوکن:-

لەماوەی ئەم ساڵەدا (ساڵی دووەمی کۆچی) زەکاتی (فطر)و زەکاتی (رکن) فەرزکران، جا ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین دەبینین لە زۆر شوێندا نوێژو زەکات پێکەوە باسکراون، هەروەها لە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە نوێژو زەکاتی بە دوو پایەی بنەڕەتی مسوڵمانەتی (شخصي)ی داناون.

چونکە ئینسان وەك چۆن لە ڕووح و جەستە پێکدێ، بەهەمان شێوەش دیندارییەکەی دوو ڕووی هەن، ڕوویێکی ڕووحیی و ڕوویێکی ماددیی، هەروەها ئینسان پەیوەندی هەیە بە خواوەو پەیوەندیشی هەیە بە خەڵکەوە، پەیوەندی ئینسان بە خوا لە نوێژدا دەردەکەوێ و، پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا لە زەکات و بەخشینی بەشێك لە ماڵی خۆیدا دەردەکەوێ.

(عبدالله بن عمر) لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (ان النبي ﷺ أمر بزكاة الفطر قبل خروج الناس الى الصلاة) رواه البخاري[1]، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە زەکاتی (فطر) پێش چوونی مسوڵمانان بۆ نوێژی جەژن، هەروەها (قيس بن سعد بن عبادة)ش -خوا لێی رازی بێ- لەوبارەوە دەڵێ: (أمرنا رسولُ الله ﷺ بصدقة الفطر قبل ان تنزل الزكاة ثم نزلت الزكاة فلم يأمرنا ولم ينهنا ونحن نفعله)[2]، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین بە زەکاتی (فطر) پێش ئەوەی زەکاتی ڕوکن پێویست بێ، بەڵام دوای ئەوەی زەکات پێویست کرا، پێغەمبەر ﷺ نە فەرمانی پێکردین بە زەکاتی (فطر)و نە ڕێگریشی لێکردین، وە ئێمە زەکاتی (فطر)یشمان هەردەدا.

---

١) صحيح البخاري: ١٥٠٩.

٢) رواه ابو داود: ٢٥٠٦، وصححه الألباني.

www.alibapir.com

هەروەها زۆربەی زانایان ڕایان وایە، کە ساڵی دووەمی کۆچی لە مەدینە زەکات فەرزکراوە[1]، کەواتە تا ساڵی دووەمی کۆچی هەریەك لە: (شایەتمانو نوێژو ڕۆژووو زەکات) پێویست کراونو تەنیا (حەج) ماوەتەوە، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان حەجیش لە ساڵی دەیەمی کۆچیدا پێویست کراوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەوکاتە بۆی لواوە، کە حەج بکات، وە خوای پەروەردگار، کە زۆر حەکیمو کاربەجێیە ئەرکێك ناخاتە سەر مسوڵمانانو لەسەریان پێویست ناکا، کە توانای جێبەجێکردنییان نەبێو هەلومەرجی جێبەجێکردنی نەڕەخسابێ، هەر بۆیەش حەجی لەسەر پێویست نەکردوون لە کاتێکدا، کە شاری (مەککە) لەبەردەستی کافرو موشریکەکاندا بووەو نەگونجاوە پێی بگەن.

## چوارەم: نوێژی جەژنەکان:-

هەر لە ساڵی دووەمی[2] کۆچیدا نوێژی جەژنەکان بۆ مسوڵمانان دانراونو زۆر لە زانایان نوێژی جەژنەکانی قوربانو ڕەمەزان بە پێویست دەزانن، جا هەندێکیان بە پێویستی خودیی (فرض العین) وە زۆریشیان بە پێویستی بریکاریی (فرض الکفایة)یان دەزانن، وە بەشێکیش بە سوننەتیان دادەنێن، بۆیە کە دەگوترێ: نوێژی جەژنەکان سوننەتن، وەنەبێ قسەی هەموو زانایان بێ، بەڵکو زۆربەیان بە پێویست (فرض)یان دەزانن، بەلای کەمەوە (فرض الکفایة)[3].

---

١) بڕوانە: (البدایة والنهایة)، ج٣، ص(٢٩١).

٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

٣) فرض الکفایة: ئەو ئەرکەیە، کە ئەگەر هەندێك لە مسوڵمانان پێی هەڵسن لەسەر هەموویان لادەچێ، بەڵام، ئەگەر کەس پێی هەڵنەستا هەموویان تاوانبارن.

فرض العین: ئەو ئەرکەیە، کە لەسەر هەموو مسوڵمانانێك پێویستە بەو ئەرکە هەڵسێو هیچ کەس بری کەس ناکەوێ.

(جابر بن عبدالله) لەمبارەوە دەڵێ: (شهدتُ مع رسول الله ﷺ الصلاة يوم العيد فبدأ بالصلاة قبل الخطبة، بغير أذان ولا إقامة، ثم قامَ متوكئاً على بلال، فأمر بتقوى الله وحَثَّ على طاعته، ووعظ الناس وذكَّرهم ثم مضى، حتى أتى النساء فوعظهن وذكَّرهُنَّ...) رواه مسلم [١]، واتە: من لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی جەژنم کرد، سەرەتا نوێژی کرد پێش ئەوەی کە وتار بدا، بەبێ بانگو قامەت خوێندن، دوایی هەستاو شانی خستە سەر بیلالو وتاریدا، فەرمانی کرد بە پارێزکردن لە خواو هانی مسوڵمانانیدا، کە فەرمانبەریی خوا بکەن، وە ئامۆژگاریی خەڵکی کردو ڕاستییەکانی بیرخستنەوە، ئنجا دوایی چوو بۆ لای ئافرەتەکانو ئامۆژگاریی کردنو ڕاستییەکانی ئیسلامی بیر ئەوانیش هێنایەوە....

شایانی باسیشە پێغەمبەر ﷺ نوێژەکانی جەژنی لە مزگەوتدا نەکردوون، بەڵکو لە نوێژگە (مُصَلَّى)و دەشتو بیابانو دەرەوەی مەدینە کردوونی، وە فەرمانی کردوە کە ئافرەتانیش بێنو تەنانەت ئافرەتانی بێنوێژیش، بەڵام ئەوان نوێژنەکەنو کەنار بگرنو تەنها گوێ لە قسەی خێرو ئامۆژگارییەکان بگرن [٢]، چونکە بێنوێژیی ڕێگا لە نوێژکردن دەگرێ، جا بابای بێنوێژ چ پیاو بێ، چ ئافرەت.

## پێنجەم: بوونی عائیشە بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ :-

لە مانگی شەووالی ساڵی یەکەمی کۆچیدا (عائشة)ی کچی (أبو بكر) خوا لێیان ڕازی بێ، بوو بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، کە ئەوکات (عائشة) کچێکی تازە پێگەیشتوو بوو و پێغەمبەریش تەمەنی (٥٤) ساڵ بوو [٣].

---

١) صحيح مسلم: ٢٠٤٥.

٢) صحيح البخاري: ٩٧١، و صحيح مسلم: ٢٠٢٥٠.

٣) بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٢٦٣).

# شێوازی پێغەمبەر ﷺ لە فێرکردن و پەروەردەکردنی مسوڵماناندا

وەك لە باسەکانی پێشووتریشدا ئاماژەمان پێکرد، پێغەمبەر ﷺ بەهۆی قورئانەوە مسوڵمانانی تێدەگەیاندن و پێی دەگەیاندن، جا ئێمە لە چەند بڕگەیەکداو لەبەر تیشکی چەند فەرموودەیەکدا باسی چۆنیەتی و شێوازی ئەو فێرکردن و پەروەردەکردنە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ مسوڵمانان دەکەین.

دیارە ئەو فەرمایشتانەش کە لێرەدا بە نموونە دەیانهێنمەوە چەند وێنەیەك لە شێوازی پێغەمبەر ﷺ دەردەخەن، لە تێگەیاندن و پێگەیاندندا، کە ئێمەش ئەگەر بمانەوێ خەڵك لە دین تێبگەیەنین و پێیان بگەیەنین دەبێ بەو شێوازەی پێغەمبەر کار بکەین:

**یەك :-** پێغەمبەر ﷺ زۆر بەڕوون و ڕەوانی قسەی بۆ هاوەڵانی کردوە، وە جاری واش هەبووە قسەیەکی سێ جار دووبارە کردۆتەوە، بۆئەوەی چاکتر لێی وەربگیرێ و فام بکرێ، (أنس بن مالك) -خوای لێی ڕازی بێ-، لەوبارەوە دەڵێ: (انه كان ﷺ اذا تكلم بكلمة أعادها ثلاثاً حتى تُفْهَم عنه...) رواه البخاري[1]، واتە: پێغەمبەر ﷺ، کە قسەیەکی دەفەرموو، سێجار دووبارەی دەکردەوە (ئەگەر پێویستی کردبایە) بۆ ئەوەی باشتر لێی فام بکرێ، هەروەها (عائشة)ش - خوا لێی ڕازی بێ- لەوبارەوە دەڵێ: (...ان رسول الله ﷺ لم يكن يسرد الحديث كسردكم) رواه البخاري[2]، واتە: پێغەمبەر ﷺ وەکو ئێوە خێرا خێراو بەپەلە

---

١) صحيح البخاري: ٩٥.

٢) صحيح البخاري: ٣٥٦٨.

www.alibapir.com


قسەی نەدەکرد)، شایانی باسیشە (بخاري) ئەم فەرمایشتەی (عائشة)ی لەوەوە هێناوە، کە دەڵێ: (عائشة) – خوا لێی ڕازی بێ- لە ژوورەکەی خۆیدا نوێژی دەکرد، یەکێك لە (تابعين) هاتو هەندێك فەرمایشتی زۆر بەخێرایی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕانەوە، دوایی کە (عائشة) نوێژەکەی تەواو کردو سەلامی دایەوە، بانگی یەکێك لە خوشکەزایەکانی خۆی کرد، کە (عروة بن زبير)بوو، گوتی: ئەرێ ڕۆڵە تۆ فلاّن کەست نەبینی چۆن قسەکانی ڕیزکردنو بەخێرایی کردنی! ئنجا گوتی: پێغەمبەر ﷺ کە فەرمایشتی دەفەرموو، وەکو ئێوە قسەی ڕیز نەدەکردن بە خێرایی، بەڵکو دانە دانە فەرمایشتی دەفەرموو، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: ئەگەر کەسێك ویستبای دەیتوانی قسەکانی بژمێرێ، ئەوەندە بە ڕوونییو ڕەوانیی فەرمایشتەکانی دەفەرموو.

**دوو :-** پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابووە لەکاتی قسەکردندا وێنەی هێناوەتەوەو مەبەستێکی مەعنەویی لە دیمەنێکی بەرجەستەدا وێنە کێشاوە، بۆئەوەی خەڵك لێی تێبگاو لەو مەبەستە مەعنەوییە حاڵی بێ، بۆ وێنە: با سەرنج بدەینە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ، کە (أبو هريرة) لێی دەگێڕێتەوە: **{أرأيتم لو أن نهراً بباب أحَدِكم يغتسل منه كل يوم خمس مرات، هل يبقى من دَرَنِهِ شيءٌ؟ قالوا: لايبقى من دَرَنه شيءٌ، قال: فذلك مثل الصلوات الخمس يمحو الله بِهِنَّ الخطايا}** رواه البخاري ومسلم[1]، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دەبینن، ئەگەر یەکێك لە ئێوە ڕووبارێك بەبەر دەرگای ماڵیدا بڕوا هەموو ڕۆژێك پێنج جاران خۆی لێ بشوا، ئایا هیچ چڵکی پێوەدەمێنێ؟ گوتیان: هیچ چڵکی پێوە نامێنێ، فەرمووی: ئەوە وێنەی پێنج نوێژە فەرزەکانە، کە بەهۆیانەوە خوا گوناحو تاوانەکان دەسڕێتەوە.

---

١) صحيح البخاري: ٥٢٨، وصحيح مسلم: ١٥٢٠.

www.alibapir.com


**سێ :-** پێغەمبەر ﷺ کات و شوێنی گونجاوی هەڵبژاردوە بۆ قسەکردن و واینەکردوە، کە خەڵك بێتاقەت و ماندوو بێ، لەوبارەوە (عبدالله بن مسعود) دەڵێ: (كان النبيُّ يتخوَّلُنا بالموعظة في الأيام كراهة السَّآمة علينا) رواه البخاري[١]، واتە: پێغەمبەر ﷺ بەین بەین ئامۆژگاریی دەکردین، بۆئەوەی ماندوومان نەکاو وەڕەزو بێتاقەت نەبین.

**چوار :-** هێندێك جار پرسیاری لە هاوەڵانی بەڕێزی کردوە، بۆئەوەی ئەوان وەڵام بدەنەوەو شتەکە باشتر لە مێشکیاندا بچەسپێ.

لەوبارەوە (ابو هريرة) ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **{ (أتدرون ما المفلس؟) قالوا: المفلس فينا من لا درهم له ولا متاع، فقال: إن المفلس من أمتي يأتي يوم القيامة بصلاة، وصيام، وزكاة، ويأتي وَقَدْ شتم هذا، وقذف هذا، وأكل مال هذا، وسفك دم هذا، وضرب هذا، فَيُعطى هذا من حسناته، وهذا من حسناته، فإن فَنِيتْ حسناتُهُ قبل أن يُقْضى ما عليه، أُخِذَ من خطاياهم فَطُرِحَتْ عليه، ثم طُرِحَ في النار}** رواه مسلم[٢]، لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ پرسیارێك ئاڕاستەی هاوەڵانی بەڕێزی دەکات وە دەفەرموێ: ئایا دەزانن بابای مایە پووچ و دەست بەتاڵ کێیە؟ ئەوانیش دەڵێن: بابای دەست بەتاڵ و مایە پوچ لای ئێمە کەسێکە، کە پارەو کەل وپەلی نەبێ، ئەویش دەفەرموێ: مایە پووچ لە ئۆممەتی من کەسێکە لە قیامەتێ بە نوێژو ڕۆژووو زەکاتەوە دێت، بەڵام جنێوی بەم داوەو، بوختانی (داوێن پیسی) بەم کردوەو، پارەی ئەوی خواردوەو، خوێنی ئەوی ڕشتوەو لەوی داوە، ئیدی چاکەکانی بەملاو ئەولادا دەدرێ بەو خاوەن حەقانە تا کاتێك کە چاکەکانی تەواو دەبن و پێش ئەوەی حەقی خاوەن حەقەکان تەواو بێ، ئنجا لە

---

١) صحيح البخاري: ٦٨.

٢) صحيح مسلم: ٦٥٢٢.

گوناحی خاوەن حەقەکان وەردەگیرێو دەخرێتە سەریو دوایی بە گوناحی ئەوانەوە دەخرێتە نێو ئاگر.

دیارە هەرکەسێك سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدات، زۆر خۆی دەپارێزێ لەوەی، کە حەقی خەڵکی بکەوێتە سەر، چونکە بەهۆی قەرزدارییو گوناهبارییەوە ئەو نوێژو طاعەتەی، کە ئومێدی پێهەیە ئەوەشی لەدەست دەچێ.

**پێنج :-** پێغەمبەر ﷺ وەسیلەی روونکەرەوەی بۆ مەبەستەکانی بەکاردەهێنا، لەوبارەوە (جابر بن عبدالله) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە هاوەڵانی لەگەڵدا بوونو بە بازارێکدا رەت بوو، کە کاریلەیەکی مردارەوەبووی گوێ بڕاوی لێکەوتبوو، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای کاریلەکەو دەستی دایە گوێ بڕاوەکەیو بە هاوەڵانی فەرموو، کامتان ئەم کاریلەی بە درهەمێك دەوێ؟!

ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسمان بە بەلاشیش نامانەوێ جا چی لێ بکەین!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناتانەوێ؟!

ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەك هەر بە مردوویی، بەڵکو ئەگەر زیندووش بایە لەبەرئەوەی، کە گوێیەکانی بڕاون نەماندەویست.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **{... فوالله للدنيا أهون على الله عليكم}** رواه مسلم[1] سوێند بەخوا دنیا لای خوا لەم کاریلەیە مردارەوەبووەش کەمترە!، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ نرخو بەهای ژیانی ماددیی دونیای زۆر چاك روونکردۆتەوەو لەبەرچاوی هاوەڵانی خستوە.

هەروەها (أبو موسى الأشعري) دەڵێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ باسی برایەتی مسوڵمانانی کرد، دوایی فەرمووی: **{المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه**

---

١) صحيح مسلم: ٧٣٤٤.

www.alibapir.com


**بعضاً، وَشبَّك بين أصابعهِ))**[١]، واتە: ئیماندار بۆ ئیماندار وەكو دیوار وایە هەندێكی هەندێكی مەحكەم دەكات، وە پەنجەی هەردوو دەستەكانیشی خستە ناویەك.

لێرەشدا پێغەمبەر ﷺ وەسیلەیەكی بەكارهێناوە، كە ئەو مانایەیان باشتر بخاتە مێشكەوە.

هەروەها (عبدالله بن مسعود) دەڵێ:[٢] ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هێڵێكی ڕاستی كێشاو فەرمووی: ئەوە ڕێبازی خوایە، ئنجا چەند هێڵێكی پچڕ پچڕو خواروخێچی لەملاو ئەولای ئەو هێڵەراستەوە كێشاو فەرمووی: ئەوانەش ڕێچكەكان (سبل)ن، وە لەسەر هەر ڕێچكەیەك لەو ڕێچكانەش شەیتانێكی لەسەرەو خەڵكی بۆ بانگ دەكات، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ الأنعام، واتە: وە ئەمە ڕاستە شەقامی منەو شوێنی بكەون، وە بەدوای ڕێچكەكان مەكەون، ئەگەرنا پەرتەوازە دەبن و سەرتان لێدەشێوێ.

**شەش:-** یەكێكی دیكە لە شێوازەكانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبووە، كە هانی ئینسانی چاكەكاریی داوەو مەدحی كردوە، وەكو (أبو موسى الأشعري) دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك پێی فەرمووە: **{لو رأيتني وأنا أستمع لقراءتك البارحة! لقد أوتيت مزماراً من مزامير آل داود}** رواه مسلم[٣]، واتە: ئەگەر دەتبینیم، كە دوێنێ شەوێ گوێم هەڵخستبوو بۆ قورئان خوێندنەكەت! تۆ ئاوازێك لە ئاوازەكانی بنەماڵەی داوودت پێدراوە، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ (أبو موسى)ی هانداوە بۆ زیاترو چاكتر قورئان خوێندن.

---

١) صحيح البخاري: ٢٤٤٦.
٢) رواه أحمد و صححه الحاكم، بڕوانە (المصباح المنير في تهذيب ابن كثير)، ص(٤٥٩).
٣) صحيح مسلم: ١٨٤٩.

**حەوت:**- یەكێكی دی لە شێوازەكانی پەروەردەو فێركردنی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە، كە ئەگەر پێویست بووبێ، تووڕەبووەو سەرزەنشتی ئەو كەسەشی كردوە كە هەڵەكەی كردوە، بۆ وێنە (جابر بن عبدالله) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ڕۆژێك (عمر) -خوای لێی ڕازی بێ- هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، كە نوسخەیەك لە تەوڕاتی پێبوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە نوسخەیەكە لە تەوڕات، پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگ بوو، (عمر)یش وردە وردە بۆی خوێندەوە، پێغەمبەریش ڕەنگی دەموچاوی گۆڕاو سوور بۆوە لە تووڕەییان، (أبوبكر)یش كە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو بە (عمر)ی گوت: سینگكوتەر سینگت بۆ بكوتن (واتە: بمریو بفەوتێی)، مەگەر نابینی پێغەمبەر ﷺ تووڕەبووە! (عمر) تەماشای دەموچاوی موبارەكی پێغەمبەری كرد ﷺو گوتی: **((أعوذ بالله من غضب الله وغضب رسوله))**، واتە: پەنا دەگرم بەخوا لە تووڕەیی خواو تووڕەیی پێغەمبەرەكەی ﷺ، ئنجا گوتی: **((رضينا بالله رباً، وبالأسلام ديناً، وبمحمد ﷺ رسولاً))**، واتە: ڕازین بە پەروەردگاریتی خوا، وە بە بەرنامێتی ئیسلامو، بە ڕەوانكراوێتی موحەممەد ﷺ، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{والّذي نفسه (محمد) بيده لو بدا لكم موسى فاتبعتموه وتركتموني لضللتم عن سواء السبيل ولو كان حياً وأدرك نبوتي لاتبعني}**[1]، واتە: سوێند بەوەی، كە گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر مووساتان بۆ دەركەوێو شوێنی بكەونو واز لەمن بێنن، لە ڕاستە شەقام دەترازێنو گومڕا دەبن، ئەگەر مووسا زیندووبووایەو فریای من كەوتبایە، بەدوای من دەكەوتو ئیمانی بە پێغەمبەرایەتی من دێنا.

---

١) رواه الأمام أحمد وصححه الألباني.

**هەشت:**- یەکێکی دیکە لە شێوازەکانی پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردەو فێرکردندا، ئەوەیە کە زۆر هێدییو مەندو لەسەرەخۆ بووە، وەك لە (صحيح مسلم)[1]دا هاتوە: ڕۆژێك کابرایەکی دەشتەکی دێتە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، لەنێو مزگەوتدا میز دەکا، هاوەڵان دەیانەوێ دەنگی بدەن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**لاتُزْرِمُوهُ، دَعُوهَ**...))، واتە: (میزەکەی لێ مەپچڕن، لێی گەڕێن...) دوای ئەوەی کابرای دەشتەکی میزەکەی تەواوکرد، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو ئامۆژگاریی کردو پێی فەرموو: ئێرە شوێنی میز لێکردنێ نیە، دوایی فەرمان بە هاوەڵان دەکات، کە دۆڵچەیەك ئاو بە شوێنی میزەکەیدا بکەن، (چونکە ئەرزی مزگەوتەکە چەوو لم بووەو، ئاوەکە پێیدا چۆتە خوارێو، بەوە پاك بۆتەوە).

**نۆ :**- پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، کە دینداریيەکی هاوسەنگ بکەن، وە بە هاوسەنگیی بەندایەتی بۆ خوا بکەنو دینداریيەکەیان بەمەلاولادا لاسەنگ نەکەن.

وەك (عبدالله بن عمرو بن العاص) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەدوای ناردمو فەرمووی: من بیستوومە، کە تۆ ڕۆژانە بێپسانەوە بەڕۆژوو دەبیتو شەوانیش هەموو شەوێ قورئان دەخوێنیو ناخەوی؟

گوتم: بەڵێ وایە! بەڵام هەر مەبەستم پێ خێرو چاکە بووە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەوەندەت بەسە، کە مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت، دوایی من داوام لێکرد، کە بۆم زیاد بکات، تا فەرمووی: هەموو ڕۆژێك نارۆژێك بەڕۆژوو بە، وە ئەوەندە شەونوێژ بکە دوایی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: **{فإن لزوجك عليك**

---

١) صحيح مسلم: ٦٥٩.

www.alibapir.com

**حقـاً، ولــزَوْرِك عليـك حقـاً، ولجسـدك عليـك حقـاً...))** رواه مسـلم[١]، واتـە: هاوسەرەکەت مـافی لەسەرتە، میوانت مافی لەسەرتەو، بەدەنیشـت مـافی لەسـەرتە، واتە: هەر خاوەن مافە مـافی خۆی پێبدەو دینداریيەکی هاوسەنگانە بکە.

بەڕێـزان!

ئەوانــەی ڕابــردن چــەند نــموونەیەك بــوون لــە شــێوازو چــۆنیەتی تێگەیانــدنو پــەروەردەکردنو پێگەیانــدنی پێغەمبــەر ﷺ بــۆ هــاوەڵانی بــەڕێزیو بێگومــان ئــەو بەڕێزانەش بەمجۆرە پـەروەردە کرابـوون بۆیـە پـەڕێزو بەرهـەمێکیان هەیـە کـە هـەموو مرۆڤایەتی پێی بەختـەوەرەو شانازیی پێوەدەکات.

لە ئۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

١) صحيح مسلم: ٢٧٢٢، وصحيح البخاري: ١٩٧٥، واللفظ لـمسـلم.

www.alibapir.com


# جەنگی بەدری گەورە

وەك لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ئاماژەم پێکردوە، لەم ژیاننامەیەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، هەوڵم داوە بە گوشراویی‌و کورتیی‌و پوختیی شتەکان باس بکەم، بۆیە لە (٢١) خاڵی کورتدا باسی جەنگی بەدر دەکەین:-

**یەکەم** :- وشەی (بدر) ناوی بیرێکە پیاوێك لە عەشیرەتی (غفار) لە تیرەی (بني النار) هەڵی کەندوە.

ئەم جەنگەش لە نێوان سوپای ئیسلام بەسەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺو کافرەکانی قورەیش بەسەرکردایەتی (أبوجهل) لە دەوروبەری ئەو بیرەدا ڕوویداوە، بۆیە ئەو جەنگە ناونراوە: (جەنگی بەدر).

**دووەم** :- (ابن هشام)[1] لە (ابن اسحاق) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بیستی لە شامەوە کاروانێکی گەورە، کە سەروەت‌و سامانێکی زۆری قورەیشییەکانی تێدایە دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، سەرقافڵەی کاروانەکەش (أبو سفیان بن حرب)ەو سی یاخود چل پیاو سەرپەرشتی ئەو کاروانە دەکەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هانی مسوڵمانانیدا، وە فەرمووی: **{هذه عير قريش فيها أموالهم فاخرجوا اليها لعلَّ الله يُنْفِلْكمُوها}**، واتە: ئەوە کاروانی قورەیشییەکانەو ماڵ‌و سامانی ئەوانی تێدایە، بۆی بچن بەڵکو خوا بیکاتە دەستکەوت (غنیمة)ی ئێوە.

ئنجا بێگومان لە سەرەتاوە، کە پێغەمبەر ﷺو سوپاکەی لە مەدینە وەدەرکەوتن مەبەستیان جەنگ نەبوو، بەڵکو مەبەستیان گرتنی کاروانی قورەیشییەکان بوو، ئەمەش، چونکە کافرانی قورەیش ماڵ‌و سەروەت‌و سامانی

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٣٢٧).

www.alibapir.com



زۆری مسوڵمانانیان لە مەککە داگیر کردبوو، هەربۆیەش وەك تۆڵەیەك ڕەوابوو دەست بگرن بەسەریدا.

پێش دەرچوونی سوپای ئیسلام پێغەمبەر ﷺ دووکەسی لە هاوەڵانی نارد بۆ (بدر) تا هەواڵی دروستی کاروانەکە بزانن‌و هەواڵەکەیان بۆ هێنایەوە[1].

**سێیەم**:- (أبو سفیان)[2] کاتێك کە دەبیستێ پێغەمبەر ﷺ بەخۆی‌و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەڕێزی هاتوون ڕێ بە کاروانەکەی بگرن، بەپەلە (عمرو بن ضمضم) دەنێرێ کە هاوار بەرێ بۆ مەککە، خۆیشی ڕێڕەوی کاروانەکە دەگۆڕێ، کە (عمرو بن ضمضم) نزیکی مەککە دەبێ، یەخەی خۆی دادەڕێ‌و ئەو حوشترەش کە سواری بووە لووتی دەبڕێ، ئنجا بەدەنگی بڵند هاوار دەکاو دەڵێ: ئەی خەڵکی قورەیش! بگەنە کاروانی سەروەت‌و سامانتان کە لەگەڵ (أبو سفیان)ەو موحەممەدو هاوەڵەکانی ڕێی پێ‌دەگرن، ئەگەر زۆر بەخێرایی نەڕۆن پێم وانیە فریای بکەون.

**چوارەم**:- پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی دووشەممە کە هەشت ڕۆژ تێپەڕی بوون لە مانگی ڕەمەزان لە ساڵی دووەمی کۆچیدا لەگەڵ (٣١٩) لە هاوەڵانی بەڕێزی دەڕۆن بەرەو ئەو شوێنە کە بە بۆچوونی ئەوان کاروانەکەی پێدا دێت، وە (عمر بن ام مکتوم) هێندێك دەڵێن (عبدالله بن أم مکتوم) دەکا بە ئیمام کە پێشنوێژیی بۆ مسوڵمانان بکا، دوایی (أبو لبابة)ش کە لە شوێنێك بوو بەناوی (الروحاء)، دەگێڕێتەوەو دەیکاتە سەرپەرشتیاری مەدینە[3].

**پێنجەم**:- پێغەمبەر ﷺ ئاڵایەکی گەورەی سپی، کە ئەوان بە ئاڵا گەورەکەیان گوتوە (لواء)، دەکاتە درووشمی ئەو غەزاو جەنگەو ئاڵایەکە دەداتە دەست (مصعب بن عمیر) -خوا لێی ڕازی بێ-، هەروەها دوو ئاڵای ڕەشیش لەپێش

---

١) بڕوانە: (البدایة والنهایة)، ج٣، ص(٢٩٨)، کە ناویان (بَسْبَس)و (عمرو)بوو.

٢) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٢، ص(٣٢٩).

٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٣١).

خۆیەوە دادەنێ، کە یەکێکیان بەدەستی (علي بن أبي طالب)ەوە دەبێ بەناوی (عقاب)وە ئەوەی دیکەش بەدەست کۆمەڵێك لە پشتیوانانەوە دەبێ[1].

**شەشەم** :- پێغەمبەر ﷺ خۆیو هەموو هاوەڵە بەڕێزەکانی (٧٠) حوشتریان پێ بووە کە سواریان بن، وە بەنۆرە سواریان دەبوون، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ خۆیو (علي بن أبي طالب ومرثد بن أبي مرثد الغَنوي) بە هەرسێکیان نۆرەیان لە حوشترێکی کردوە بۆ سواربوونی، (علي ومرثد) گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بەپێیان دەڕۆینو هەر تۆ سوار بە، پێغەمبەر ﷺیش فەرمووی: نەخێر نە ئێوە لە من بەهێزترن، وە نە منیش کەمتر لەئێوە پێویستیم بە پاداشت هەیە: **{ما أنتما بأقوى مني، ولا أنا بأغنى عن الأجر منكما}**[2].

هەروەها (أبوبكر وعمر وعبدالرحمن بن عوف)یش بەنۆرە سواری حوشترێك دەبوون، جاری واش بووە چواریان بەنۆرە سواری حوشترێك بوونو، ئەوە تاکە وەسیلەی سوارییان بووە[3].

**حەوتەم** :- کاتێك، کە (مشرك)ەکانی مەککە ئەو هەواڵەیان پێدەگا، زۆر تووڕەو ناڕەحەت دەبنو لەشکرێك ساز دەکەن کە ژمارەیان دەوری (١٠٠٠)کەس دەبێ، بە هەموو پێداویستییەکانی جەنگەوە، هەرچەندە (أبو سفيان) نەجاتی دەبێو هەواڵ دەنێرێ بۆ قورەیش لە مەککە، کە نەیەنو بگەڕێنەوە، بەڵام وەك وەڵامدانەوەیەکی توند بۆ سوپای ئیسلامو خۆ ڕانواندن لە بەرانبەر هۆزەکانی عەرەبدا، بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ڕێگای بازرگانییان، زۆربەی لەشکرەکە سووربوو لەسەر بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئیسلام، بۆیە قورەیشییەکان بە سەرکردایەتی (أبو جهل - عمرو بن هشام-) لە مەککە بەڕێ دەکەون بۆ ئەو

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٣٣١).
٢) رواه أحمد والنسائي، بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٢٩٧).
٣) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٣٣٢).

شوێنەی کە پێیان وایە پێغەمبەر ﷺ لەوێ ڕێ لە کاروانەکە دەگرێ، وەکاتێك کە پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەبیستێ، ڕاوێژ دەکا بە مسوڵمانان وە دەفەرموێ: ئەوە قوڕەیش بەمەبەستی شەڕ هاتوون، هەرچەندە ئێمە مەبەستمان شەڕ نەبووە، بۆ گرتنی کاروانێك هاتبووین، جا ڕاو پێشنیارتان چییە؟، سەرەتا (أبوبكر) -خوا لێی ڕازی بێ- کۆمەڵێك قسەی باش دەکات، پاشان (عمر)یش -خوا لێی ڕازی بێ- کۆمەڵێك قسەی باش دەکات، ئنجا (المقداد بن عمرو) قسە دەکاتو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕۆ بەرەو ئەوەی کە خوا فەرمانی پێ‌کردووی، سوێند بەخوا ئێمە ئەو قسەیەی (بني اسرائيل) بەتۆ ناڵێین کە بە (موسى)یان گوت: ﴿...فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ المائدة، واتە: بڕۆ خۆتو پەروەردگارت بجەنگن ئێمە لێرە دانیشتووین، بەڵکو ئێمە بەتۆ دەڵێین: (إذهب انت وربّك فقاتلا انا معكما مقاتلون...) تۆو پەروەردگارت بڕۆن بجەنگن ئێمەش لە خزمەتتاندا دەجەنگین...[1]، دوایی پێغەمبەر ﷺ دووبارە دەفەرموێ: **{اشيروا عليَّ أيها الناس}**، واتە: خەڵکینە پێشنیازی خۆتانم پێ بڵێن! کە لێرەدا مەبەستی پشتیوانەکان بووە، چونکە ئەوانەی لەسەرەتاوە قسەیان کرد، هەموویان کۆچکەران بوون، مەبەستی بووە خەڵکی مەدینەش قسە بکەن، چونکە: ئەوان زۆربەی سوپایەکەیان پێکدەهێناو مەبەستی بووە لە دەمی خۆیانەوە لەوان حاڵی بێ، هەروەها لەبەرئەوەی لە پەیماننامەی دووەمی عەقەبەدا پەیمانیان دابوو، کە لەنێو مەدینەدا پێغەمبەر ﷺ بپارێزن، وە باس لە دەرەوەی مەدینە نەکرابوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی پێ‌کردن بۆ ئەوەی بزانێ ئایا ئامادەن لە دەرەوەی مەدینەشدا لەگەڵیدا بنو لەدژی کافرەکان بجەنگن یان نا؟! جا کاتێك، کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو (سعد بن معاذ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێی مەبەستت ئێمەیە؟! دیارە لەسەرەتاوە

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص(٣٣٢)،(بخاري)یش بە ژمارە: (٣٩٥٢)و (٤٦٠٩) قسەی (مقداد)ی هێناوە.

www.alibapir.com


پشتیوانەکان ڕێزو ئەدەبیان نواندوەو گوتوویانە، تا (ابوبکر)و (عمر)، کە ڕیش سپی مسولمانانن‌و لە پێش ئەواندا دەوریان بینیوە، قسە نەکەن ئێمە قسە ناکەین، بەلام کە پێغەمبەر ﷺ فەرمایشتەکەی دووبارە کردۆتەوە، ئنجا قسەیان کردوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بەلێ مەبەستم پێ ئێوەیە، ئنجا (سعد بن معاذ) بەناوی هەموو پشتیوانانەوە کۆمەلێك قسەی زۆر جوان‌و مەردانەی بەم شێوەیە کردوە[1]: (فقد آمنّا بك وصدَّقناك وشهدنا ان ما جئت به هو الحق وأعطيناك على ذلك عهودنا ومواثيقنا على السمع والطاعة، فامض يارسول الله لما أردت فنحن معك فوالذي بعثك بالحق لو استعرضت بنا هذا البحر فخضته لخضناه معك ما تَخلَّف منّا رجلٌ واحد، وما نكره ان تلقى بنا عدونا غداً، انا لَصُبُرٌ في الحرب صُدُقٌ في اللقاء، لعل الله يريك منّا ماتَقرٌّ به عينُك، فَسِرْ بِنا على بركة الله، فَسُرَّ رسولُ الله ﷺ بقول سَعدٍ ونَشَّطهُ ذلك...)، واتە: ئێمە ئیمانمان پێ‌هێناوی‌و بەڕاستمان زانیوی‌و، شایەدییمان داوە ئەو پەیامەی، کە تۆ هێناوتە حەقە، هەروەها لەسەر ئەوەش پەیمانی پتەومان پێداوی، کە گوێت بۆ بگرین‌و بەقسەت بکەین، ئەی پێغەمبەری خوا ئێستاش برۆ بۆ هەرشتێك کە دەتەوێ، ئێمەش لە خزمەتت دادەبین، سوێند بەو کەسەی، کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە، ئەگەر بچیە نێو دەریا، ئێمەش لەگەل تۆدا دەچینە نێوی‌و یەك نەفەرمان لێ دواناکەوێت، وە پێشمان ناخۆش نیە کە سبەینێ لەگەل دوژمندا ڕووبەڕوومان بکەیەوە، چونکە لە شەڕێدا خۆڕاگرین‌و کە بەرەنگاری دوژمن دەبینەوە پیاوی ڕاستین، بەلکو خوا لە ئێمە شتێکت پێشان بدا کە تۆ پێی دلخۆش بی، پێشمان بکەوە لەسەر بەرەکەتی خوا، پێغەمبەریش ﷺ بەو قسانەی سەعد زۆر دلخۆش بوو، وە وزەو تینێکی دیکەی خستەبەر، ئنجا فەرمووی[2]:

**{سيروا وأبشروا فان الله تعالى قد وعدني احدى الطائفتين والله لكأنّي**

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٣٣) .

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٣٣) .

**الآن أنظر الى مصارع القوم}**، واتە: (بڕۆنو موژدەتان لێبێ خوا بەڵێنی یەکێك لە دوو کۆمەڵەکەی پێدام، -یان کاروانیان لێ دەگرین یان سوپاکەیان دەشکێنین- سوێند بەخوا وەکو ئەوە وایە، کە تەماشای شوێنی کوژرانی هەریەك لە زلە زلەکانیان بکەم).

**هەشتەم** :- هەندێك لە هاوەڵان یان زۆربەیان حەزیان لە بەرەنگاربوونەوەی (أبو جهل)و سوپا (٩٠٠ – ١٠٠٠) کەسە سەربازییەکەی نەدەکردو پێیان خۆش بوو لەبری جەنگ، کاروانەکەی (أبو سفیان) بگرن، خوای کاربەجێش لەوبارەوە ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الأنفال)ی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَـٰرِهُونَ ﴿٥﴾ يُجَـٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَـٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَـٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨﴾﴾، واتە: وەك چۆن پەروەردگارت لە ماڵی خۆت بەهەق بردیە دەرێ لە حاڵێکدا، کە دەستەیەك لە بڕواداران حەزیان نەدەکرد. لەوبارەوە موجادەلەیان لەگەڵ دەکرد وەك ئەوەی لەکاتێك لە هۆکارەکانی مەرگ دەبینن بەرەو مەرگ ببرێن.

کاتێك خوا بەڵێنی پێدان یەکێك لە دوو کۆمەڵەکان بۆ ئێوە بێت (یان کاروانەکەیان دەگرن یان سوپاکەیان دەشکێنن) وە ئێوە حەزتان دەکرد ئەوەی، کە دڕکی پێوە نیە بۆ ئێوە بێت (کاروانەکە) بەڵام خوا دەیەوێ بە وشەکانی هەق بچەسپێنێو کافران دوابڕاو بکات، تاکو حەقێ بچەسپێنێو (باطیل) بپووچێنێتەوە، هەرچەندە تاوانباران پێیان ناخۆش بێت.

www.alibapir.com


**نۆیەم** :- (أبو سفیان)[1]، کە دەبیستێ پێغەمبەر ﷺ بە سوپایەکەوە هاتۆتە سەر ڕێی، کاروانەکەی بەرەو کەناری دەریای سوور تاو دەدات‌و لەوێوە دەرباز دەبێ، وە خەبەر بۆ (أبو جهل) دەنێرێ، کە ئەوە کاروانەکە دەرباز بووەو بگەڕێنەوە، (أبو جهل)یش دەڵێ: وادیارە (أبو سفیان) سیپەلاکی ئاوساوە لە ترسی موحەممەد کە هەندێك خەڵکی ڕەش‌و ڕووتی کۆکردۆتەوە، چۆن دەبێ موحەممەد هەڕەشە لە ئێمە بکا، دەبێ بچین بۆ سەر ئاوی بەدر سێ ڕۆژانی لێ بمێنینەوەو ئاهەنگ بگێڕین‌و حەیوان سەربڕین‌و ئافرەتان گۆرانیمان بۆ بڵێن‌و شەراب بخۆینەوە، بۆ ئەوەی هەموو عارەب سوپاو هێزمان ببینێ‌و سام‌و شەرمان لێ بکەن.

**دەیەم** :- پێغەمبەر ﷺ عەلی‌و سەعدو زوبێرو هەندێك لە هاوەڵانی ناردن بۆ سەر ئاوی بەدر، بۆئەوەی بزانن لەوێ چ باسە، لەوێ دوو غولامی موشریکەکانیان گرتن بەناوی (اسلم و عریض أبو یسار)و هێنایانن، ئەوکاتە پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، لێیان پرسین ئێوە کێن؟ گوتیان: ئێمە ئاوکێشی قورەیشییەکانین، ناردوویانین ئاویان بۆ بەرین، بەڵام هاوەڵان بڕوایان پێ نەکردن‌و لێیان دان، تا ئازاریان پێگەیشت، پاشان گوتیان: ئێمە سەر بە (أبو سفیان)ین، پاشان پێغەمبەر ﷺ لە نوێژێ بۆوەو فەرمووی: کە لەگەڵتان ڕاستیان کرد، لێتاندان، کاتێك لەگەڵتان درۆیان کرد وازتان لێ هێنان! وە فەرمووی: ئەوانە سەر بە قورەیش‌و سوپاکەیانن، نەك سەر بە کاروانەکەی (أبو سفیان) ئنجا پێغەمبەر ﷺ لە دوو غولامەکەی پرسی سوپای قورەیشییەکان چەندن؟! گوتیان: زۆرن، فەرمووی: ژمارەیان چەند دەبێ؟ وتیان: نازانین، فەرمووی: ڕۆژێ چەند حوشتران سەردەبڕن؟ گوتیان: ڕۆژێك (نۆ)و ڕۆژێك (دە)، فەرمووی: کەواتە ژمارەیان (٩٠٠-١٠٠٠) کەسە[2].

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٣٥).

٢) هەمان سەرچاوە، ص(٣٣٤).

**یازدەیەم** :- ئنجا پێغەمبەر ﷺ لێی پرسین لەنێو سوپای قورەیشدا کێو کێ هەن لە زلەزلەکان؟ ئەوانیش گوتیان: (عتبة بن ربيعة و شيبة بن ربيعة، وأبو البختري وحكيم بن حزام ونوفل بن خويلد والحارث بن عامر بن نوفل وطعيمة بن عدي بن نوفل والنضر بن الحارث وزمعة بن الأسود وأبو جهل بن هشام وامية بن خلف ونبيه ومنبه ابنا الحجاج وسهيل بن عمرو وعمرو بن عبد ود).

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{هذه مكة قد ألقت إليكم افلاذ كبدها}**[1]، واتە: (ئەوە مەککەیە جگەرگۆشەکانی خۆی هەموو فڕێداوەتە مەیدانێ بۆ ئێوە)، واتە: هانی هاوەڵانیدا، کە کافرانی قورەیش لەوانە گەورەتریان نیەو، ئەگەر بەسەر ئەوانەدا سەرکەون، ئەوە کوفر لووتی دەشکێ.

**دوانزەیەم** :- شوێنو مەنزڵگەی مسوڵمانانو کافرەکان بەو شێوەیە بوو کە خوای کاربەجێ وێنای کردوە: ﴿ إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ وَٱلرَّكۡبُ أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ ... ﴿٤٢﴾ ﴾ الأنفال، پێغەمبەر ﷺو سوپای مسوڵمانان لەو قەد پاڵە بوون، کە لە مەدینەوە نزیك بووە، وە ئەبوو جەهلو سوپاکەشی لەو قەد پاڵە بوون کە لە مەدینەوە دوورو لە مەککەوە نزیك بووە، کاروانەکەش کەوتۆتە دامێنیانەوە.

**سێزدەیەم** :- دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەنزڵ دەگرێ، (الحباب بن المنذر) دەچێ بۆ خزمەتیو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئەو مەنزڵگایەی گرتووتە، خوا فەرمانی پێکردووی، کە لێرە بیو بۆمان نیە لێی لابدەین، یاخود پێشنیارو بۆچوونی خۆتەو تاکتیکی جەنگییە؟!

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بەڵکو بار لێ دێتنەوەو تاکتیکی جەنگە، ئنجا (حبَّاب) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئێرە باش نیەو وا باشترە ئێرە بەجێ بهێڵین‌و بچینە سەرێ‌و، گۆلاوێك دروست بکەین‌و ئەو گۆلاوانەی دیکە هەموو پڕدەکەینەوە، ئیدی ئێمە ئاومان دەبێ‌و ئەوانیش ئاویان نابێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{لقد أشرت بالرأي}**، واتە: (بەڕاستی ئاماژەت بە ڕاو سەرنجێکی باش کرد)(١).

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو داناییی‌و زانایی‌و گەورەییەی خۆشیدا گوێی گرتوە بۆ پێشنیازی هاوەڵانی‌و، کە بۆی دەرکەوتوە ڕاو پێشنیازی چاك‌و باشیان هەیە، لێی وەرگرتوون‌و سوودی لێ بینیون‌و بە قسەی کردوون.

**چواردەیەم**:- لەوکاتەدا (سعد بن معاذ) پێشنیازێك دەکا بۆ پێغەمبەر ﷺ‌و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! با کەپرێکت بۆ دروست بکەین‌و ولاخێکیشت بە زینکراوی بۆ ببەستینەوە، ئێمە جەنگ دەکەین، ئەگەر سەرکەوتین، ئەوە شتێکە کە هەموومان پێمان خۆشە، وە ئەگەر شکستمان خوارد، تۆ دەتوانی بگەڕێیەوە بۆ مەدینە، چونکە لەوێش خەڵکێکی زۆری لێیە، لەبەرئەوەی بەپەلە هاتووین فریا نەکەتوون بێن، وە وایانزانیوە، کە هەر کاروانەو پێویست ناکات، پێغەمبەر ﷺ پێشنیازەکەی پەسەند دەکات‌و دووعای خێری بۆ دەکات، وە لەو کەپرەدا تەنیا (أبو بکر) لە خزمەتیدا دەبێ‌و فەرمان بە ئەوانی دیکە دەکات، بڕۆن(٢).

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٣٣٦)، بەڵام (د. عائض القرني) لە کتێبی (قصة الرسالة: روائع من السيرة)، ص(١٤٩) دا لەبارەی ئەو وتووێژەی پێغەمبەری خوا ﷺ و (الحباب بن المنذر)ەوە گوتوویەتی (أخرجه الحاكم في المستدر، (٣/٤٢٦-٤٢٧) و سكت عنه، وقال الذهبي: حديث منكر. وانظر سيرة ابن هشام (٢/٣١٢-٣١٣) وأشار محققا السيرة الى ضعف الحديث).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.

**پازدەیەم** :- پێغەمبەر ﷺ ڕیزەکانی سوپاکەی ڕێك دەخات و هەر کۆمەڵەو کاری خۆیان پێ دەسپێرێ، دوایی دەگەڕێتەوە نێو کەپرەکەی، کە وەك گوتمان (أبو بكر)یشی لەخزمەت دادەبێ، ئنجا لە خوا دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: **{اللّهم ان تهلك هذه العصابة اليوم لاتعبد}**، واتە: (ئەی خوایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە بەدەستی ئەو کافرانە بفەوتێن، تۆ جارێکی دیکە ناپەرسترێی)، خوای پەروەردگار بەوبۆنەوە دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ الأنفال، واتە: وە یادی ئەوکاتە بکەنەوە، کە لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوەو هاوارتان تێدەبەست، (لە ڕیوایەتێکدا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە دەستی بەرز کردۆتەوە لەکاتی دووعاکردن و پاڕانەوەکەیدا، هەتا عەباکەی لەسەر شان کەوتۆتە خوارو (أبو بكر) عەباکەی بەسەر شانی داداوەتەوەو پێی گوتوە: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەندە خۆت ئەزیەت مەدە خوا بەڵێنێکی بەتۆی داوە جێبەجێی دەکات)[1] پەروەردگارتان وەڵامی دانەوە کە من بە هەزار فریشتەی یەك لە دوای یەك یارمەتیتان دەدەم، خوا هەر بۆ دڵخۆشیی ئێوە ناردنی، بۆئەوەی دڵتان ئارام بگرێ، ئەگەرنا سەرکەوتن هەر لەلایەن خواوەیە، بێگومان خوا باڵادەستی کاربەجێیە.

**شازدەیەم** :- کاتێك، کە بەرەنگاری یەك بوونەوە (أبو جهل) دووعای کرد، دیارە (أبو جهل)ی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خوای ناسیوە، بەڵام بەقسەی نەکردوە، بەڵام لەم سەردەمەی خۆماندا (أبو جهل)ی وا هەن خواش ناناسن)! بەڵێ (أبو جهل) لە خوا پاڕایەوەو، گوتی: (اللّهم أقطعنا للرحم وآتانا بما لا يعرف،

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٤٠).

فأحِنْـهُ الغداة)[1]، واتە: خوایە کامـەمان زیـاتر پەیوەنـدی خزمایـەتی پچـڕاندوەو، کامەمان زیـاتر شـتی خراپی پەیـدا کردوە، ئەمڕۆ لە بەینـی بـەرەو بیفـەوتێنـە، وە بەو موناسـەبەتەوە خوای کـاربەجێ ئەم ئایەتەی نـاردە خـوار، کـە دەفـەرموێ:

﴿ إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدْ وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ ﴾

الأنفـال، واتە: ئەگەر داوای دادوەریـی دەکـەن (کامتـان خراپـە خـوا بیفەوتێنـێ) ئەوە دادوەرییـتان بۆ هات، ئەگەر دەستیش هەڵبگـرن باشتـرە بۆ ئێـوە، وە ئەگـەر جـارێکی دیکـەش بگەڕێنـەوە بـۆ دژایـەتیکردنی ئیسـلام، ئێمـەش دەگەڕێینـەوەو کۆمـەڵی زۆرو زەوەنـدی ئێـوەش سـوودتان پـێ ناگـەیەنێ هـەرچەندە زۆربـێ، وە بێگومان خوا لەگەڵ ئیمانداراندایە.

**حەڤـدەیەم** :- کافرەکـان لـە مەککـەوە بـە تـەپڵو دەف کوتـانو گـۆرانی گوتنـەوە هاتنـەدەر، ئافرەتانیشـیان لەگـەڵ بـوون، کـە گۆرانیـان دەگـوت، یـەکێك لـەو گۆرانیانـەیان ئـەوەبوو، کـە دەیـانگوت: (ان تُقْبِلوا نُعـانق ونَفْـرش النَّمـارق أو تُدْبِروا نفـارق فـراق غيـر وامـق)، واتـە: ئەگـەر بـەرەنگاری دوژمـن بنـەوە، ئـەوا ئێمەش دەستتان لە ملی دەکەینو، فەرشو ڕایەخ ڕادەخەین (غـەریزەی جینسـییان دەجـوولاندن)، بـەلام ئەگـەر پشـت لـە دوژمـن بکـەن وازتـان لـێ دەهێـنین، وازهێنانێك، کە قەت گەڕانەوەی بۆ نەبێ.

لـەوبارەوە خـوای پەروەردگـار ئـەم ئایەتانـە لـە سـوورەتی (الأنفـال) دەنێرێتـە خوارێ، کە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتـە: ئـەی ئیماندارینە! ئێوە وەکـو ئەوانـە مـەبن (أبـو جهـل و سـوپایەکەی)، کـە بـە فیـزو

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص(٣٢٢).

کەشخەو ڕیابازییەوە هاتنە دەر لە ماڵو حاڵیان، ئامانجیشیان ئەوەبوو، کە خەڵك لەڕێی خوا لابدەن، وە خوا بەوشتانەی ئەوان دەیکەن دەورەدەرە.

کەواتە: هەر کام لە خۆ بەزلگریی‌و فیزو کەشخەو، ڕیابازیی‌و، هەوڵی لادانی خەڵکی لە ڕێی خوا، چەند سیفەتی خراپ‌و دزێوی (أبو جهل)و سوپای کافرانی قورەیش بوون، کە لە مەککەوە بەرێ کەوتن بەمەبەستی شەڕکردن لەگەڵ سوپای ئیسلامدا، بەسەرپەرشتی پێغەمبەر ﷺ.

**هەژدەیەم** :- پێش ئەوەی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕوو بدات، ڕووبەڕووبوونەوەی تاکە کەسی لە نێوانیاندا بەرپابوو، سێ کەس لە کافرەکان، کە بریتی بوون لە: (عتبة بن ربيعة) و (شيبة بن ربيعة) و (الوليد بن شيبة)، پێغەمبەریش ﷺ هەریەك لە: (علي بن أبي طالب) و (حمزة بن عبدالمطلب) و (عبيدة بن الحارث)ی بۆ دیاریکردن‌و سەرەنجام (علي بن أبي طالب) (وليد)ی کوشت‌و (حمزة)ش (شيبة)ی کوشت‌و دوایی (حمزة) و (علي) (عتبة)ش دەکوژن، بەڵام لەو موبارەزەیەدا (عبيدة بن الحارث) بە خەستی بریندار دەبێ‌و بەو برینانەی شەهید دەبێ[1]، ئنجا شەڕی دەستەویەخەی گشتی دەست پێدەکاو سەرەنجام حەفتا لە کافرەکان دەکوژرێ، کە زۆربەیان زلەزلەکانیان دەبن، وەك (أبو جهل عُتبة و شيبة و نضر بن الحارث وأمية بن خلف وأبو البختري و....هتد).

وە حەفتاشیان لێ بە دیل دەگیرێ[2]، چواردە کەسیش لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ شەهید دەبن، هەشتیان لە پشتیوانەکان‌و شەشیان لە کۆچکەران[3].

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص(٣١٧).
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣١٧).
٣) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٣٨٧).

www.alibapir.com


خوای باڵادەست لەوبارەوە ئەم دوو ئایەتەی ناردنە خوار، کە دەفەرموێ:
﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَاءً حَسَنًا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ الْكَافِرِينَ ﴿١٨﴾﴾ الأنفال، واتە: ئێوە نەتان کوشتن بەڵکو خوا کوشتنی (چونکە خوا دڵی ئێوەی بەهێز کردو ئەوانی ترساند) وە تۆ نەتهاویشت بەڵکو خوا هاویشتی (کاتێك کە تێکچڕژان دەستی پێکرد، پێغەمبەر ﷺ چەنگە خۆڵێکی هەڵگرتو بە کافرەکانی داکردو فەرمووی: ((شاهت الوجوه)) کەمیان هەبوو، کە لەو خۆڵەیان بەرنەکەوێو نەچێتە چاویانەوە)[١] وە بۆ ئەوەی خوا نیعمەتێکی چاك بدات بە ئەهلی ئیمانو بەهۆیەوە تاقییان بکاتەوە، بێگومان خوا بیسەرەو زانایە، وەبێگومان خوا پیلانی کافرەکان هەڵدەوەشێنێتەوە.

لەو جەنگەدا دروشمی مسوڵمانان (أَحَد، أَحَد) بوو، وە لەو شتانەی زیاتر بوو بەهۆی بەرزبوونەوەی وورەی مسوڵمانانو دڵخۆشییان بە سەرکەوتن ئەوە بوو کە گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾﴾ القمر، واتە: ئەو کۆمەڵە تێکدەشکێنرێو پشت هەڵدەکەنو هەڵدێن[٢].

**نۆزدەیەم** :- کە جەنگ تەواو بوو، مسوڵمانان سەرکەوتنو کافرەکان مەیدانی جەنگیان چۆڵ کردو بەشپرزەیی هەڵاتن، کێشە لەسەر دابەشکردنی دەستکەوتەکان لەنێو مسوڵمانان پەیدا بوو، کە گەنجەکان داوای پشكو بەشی زیاتریان دەکرد، بەوەی لەنێو جەرگەی جەنگەکەدا بوون.

ئەوانی دیکەش، کە لە دواوەی جەنگەکە بوون، بەهەمان شێوە داوایان دەکردو کێشەیان لەنێواندا دروست بوو.

---

١) (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٢٨٤)، وە (السيرة النبوية لإبن هشام) ج٢، ص(٣٤٠).
٢) (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٣١٥)، وە: (صحيح البخاري): ٣٩٥٣.

ئیدی خوای بەبەزەیی بەو بۆنەوە ئایەتی سەرەتای سوورەتی (الأنفال)ی ناردە خوارەوە، کە دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾﴾، واتە: دەربارەی دەستکەوتەکان پرسیار دەکەن؟ بڵێ: دەستکەوتەکان هی خواو پێغەمبەرن (واتە: ئەوان دەبێ دابەشی بکەن) پارێز لە خوا بکەن‌و پەیوەندیی نێوانتان چاك بکەن، وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بکەن، ئەگەر ئیماندارن(١).

بەم شێوەیە خوای پەروەردگار حوکمی دابەشکردنی دەستکەوتەکان دەنێرێتە خوارو فەرمانیان بە سێ شت پێ دەکات:

أ- پارێزکردن لە بێ فەرمانیی خوا.

ب- چاککردنی پەیوەندیی نێوانیان.

ج- فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا.

چونکە جیهاد لە ڕێی خوادا پێویستی بە پارێز لە خوا هەیەو، پەیوەندیی باش‌و چاککردنی نێوان مسوڵمانانیش نیشانەی تۆکمەیی‌و هێزەو، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەریش چارەسەرو یەکلاکەرەوەی کێشەکانە.

دواتر خوای زاناو شارەزا باسی چۆنیەتی دابەشکردنی دەستکەوت دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٣٦٣).

عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ ﴾ الأنفـال، واتـه: وه بزانن كه ئەوەی لە (جەنگدا بەدەستتان دەكەوێ‌و) بە (غنيمـة) دەیگرن ئەوە پێنج یەكی بۆ خوایەو بۆ پێغەمبەرو خزمانو هەتیوانو هەژارانو ڕێبوارانە، ئەگەر ئیمانتان بەخوا هەیەو بەوەی، كە دامانبەزاندۆتە سەر بەندەی خۆمان لە ڕۆژی لێك جیاكردنەوەی حەقو باتیل دا، ڕۆژی بەیەك گەیشتنی هەردوو كۆمەڵەكە (مسوڵمانانو كافران) وە خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.

**بیستەم** :- كاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە (مەدینە) دەربارەی دیلەكان ڕاوێژی بە هاوەڵە بەڕێزەكانی كرد، (أبوبكر) پێشنیازی كرد كە دیلەكان (فدية)یان لێ وەربگیرێ‌و ئازاد بكرێن، بەڵام (عمر) ڕای وابوو كە بكوژرێن، بەڵگەشی ئەوە بوو گوتی: ئەوانە گەورەو زلەزلەكانی ئەهلی كوفرن، وە ئێمەش كەم دەستەڵاتین، با بیانكوژین بۆئەوەی جارێكی دی تەماعمان تێنەكەن، پێغەمبەر ﷺ پێشنیازەكەی (أبوبكر)ی پەسند كردو (فدية)ی لێ وەرگرتن[(١)].

خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتانەی نارده خوارو تەئكیدی ئەو ڕایەی كرد، كە دەبووایە بكوژرێن، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَـٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَـٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنفـال، واتـه: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە دیلی هەبن، هەتا كافرەكان تەواو زەبوون نەكا لەسەر زەوی، ئێوە دەستكەوتێكی دنیاییتان دەوێ (لە بەرامبەر ئازادكردنیاندا وەك ((فدية)) دەستتان دەكەوێ) وە خوا دوارۆژی دەوێ، وە خوا بالادەستەو كاربەجێیە،

١) بڕوانه: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(٥٤٩).

ئەگەر لەبەرئەوەی نەبا، کە خوا پێشتر بڕیاری داوە (کە خوا بەندەکانی لەسەر هەڵەی ئیجتیهادیی سزا نادات) ئەوە بەهۆی ئەو (فیدیە وەرگرتن)ەوە سزایەکی گەورەتان تووش دەبوو، وە ئەوەی کە بە غەنیمەت گرتووتانە حەڵاڵەو بیخۆن، وە پارێز لە خوا بکەن بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە.

بەو پێیە هێندێك لە دیلەکان (فدیة)یان لێ وەرگیراو ئازاد کرانو، هێندێکیشیان، کە خوێندەوار بوونو پارەیان نەبوو، ئەوە دانرا، کە هەر یەکێکیان لە بری (فدیة) دە منداڵی مسوڵمانان فێری خوێندەواریی بکەنو ئازاد بن[1].

**بیستو یەکەم**:- خوای پەروەردگار نیعمەتی سەرکەوتنی مسوڵمانان لەو جەنگەدا (جەنگی بەدر) بەسەر کافرەکاندا دەخاتەوە بیری ئیمانداران، لەگەڵ ئەوەشدا کە کەم دەرامەتو نەدارو هەژار بوون، دەفەرمووێ: ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾﴾ الأنفال، واتە: وە یادی ئەو کاتە بکەنەوە، کە ئێوە کەمو چەوسێنراوە بوون لە زەمیندا دەترسان خەڵك بتان ڕفێنی، بەڵام خوا ئێوەی پەنا داو پشتی گرتنو سەری خستنو لە ڕۆزیی پاكو چاك پێی بەخشین بۆ ئەوەی شوکرانە بژێر بن.

هەروەها پێش ئەو نیعمەتە ئەوەشیان بیر دەخاتەوە، کە لە گەرمەی جەنگو تێکڕژاندا چۆن سووکە خەوێکی بەملدا هێناونو هێمنی کردوونەوەو بارانی بۆ باراندوون، وە بەهۆی فریشتەکانەوە سەری خستوون: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي

---

١) بڕوانە: (نظام الحكومة النبوية، المسمّى: التراتيب الإدارية) للكتّاني، ج١، ص(١٠٨).

www.alibapir.com


مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُواْ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ الأنفال، واتە: یاد بکەنەوە، کە (خوا) سووکە خەوێکی بەسەردا هێنان تاکو دڵتان بەهێزو ئارامبێت، وە بارانێکی بۆ ناردنە خوار، بۆئەوەی پێتان باشتر جێگیر بێ (چونکە شوێنی مسوڵمانان لمو خیز بوو، بەڵام شوێنی کافرەکان چاڵایی بوو بەهۆی بارانەوە لە قوڕێ دەچەقین) کاتێك، کە پەروەردگارت وەحی کرد بۆ فریشتەکان: من لەگەڵتانمو ئیمانداران پێ چەسپیو بکەنو، منیش ترسو بیم دەخەمە دڵی ئەوانەی کافرن، لە سەرووی گەردنیان بدەنو پەنجەکانیان بپەڕێنن.

بەڕێزان!

بێگومان جەنگی بەدر وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە مێژووی ئیسلامدا بەهۆی ئەو سەرکەوتنە سیاسیو مەعنەوییەی مسوڵمانان تێیدا وەدەستیان هێنا، کە بوو بەهۆی ئەوەی نەیارانی ئیسلام حیسابێکی تایبەتی بۆ هەیبەتو هێزو دەوڵەتی ئیسلام بکەنو لەنێوەوەو دەرەوەی مەدینەدا چاوێك بە هەڵوێستەکانیاندا بەرانبەر مسوڵمانان بخشێننەوە، ئەو جەنگە کە خوای زاڵو توانا بە (یوم الفرقان) واتە: ڕۆژی جیاکردنەوەی هەقو ناهەق، ناوی بردوە، بەشێوەیەك کافرەکانی قورەیش تێیدا دۆڕان کە زۆربەی زلە زلەکانی قورەیش لەو جەنگەدا کوژرانو ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل گیرا، وە ئەو جەنگە نەك هەر زیانێکی گەورە بوو بۆ ئەوان، بەڵکو کاریگەریی لەسەر دوژمنانی دیکەی ئیسلامیش دانا، وە بوو بە هۆی زیاتر چەسپینو فراژووبوونی کیانو دەسەڵاتی ئیسلامییو عیززەتو هەیبەتی مسوڵمانان.

وە بێگومان دەستکەوتەکانی جەنگەکە زۆر زیاترو گەورەتر بوون لە دەستکەوتەکانی کاروانەکە، چونکە سەرکەوتنەکە هەر بریتی نەبوو لە دەستکەوتی ماددییو بەس.

کەواتە: هەرکاتێ ئەهلی ئیمان تەنیا کار بۆ خوا بکەن و، دوای شەرعی خوا بکەون و، لەگەڵ بەرژەوەندیی دینی خوادا بن و، بە لێزانیی و بێ ترس هەنگاو هەڵبێنن، بێگومان خوای گەورەو زاڵ پشتیوانیانەو سەریاندەخاو خێرو چاکەی دونیاو دوارۆژیان بە نسیب دەبێ.

## چەند ڕووداوێك پێش جەنگی ئوحود:

ئەو ڕووداوانەی کە لێرەدا باسیان دەکەین لە کۆتایی ساڵی دووەم و سەرەتای ساڵی سێیەمی کۆچیدا ڕوویان داوە:

## یەکەم: هەوڵێکی نەزۆرك بۆ پەنهانکوژ (اغتیال)کردنی پێغەمبەرﷺ:-

یەکێك لەو ڕووداوە گرنگانە ئەوە بوو، وەك لە سیرەی (ابن هشام)دا هاتوە، کە (ابن اسحاق) دەڵێ[١]: (محمد بن جعفر) بۆی گێڕامەوە، کە (عروة بن زبیر) -خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ڕۆژێك (عمیر بن وهب الجمحي) لەگەڵ (صفوان بن أمیة)دا لەنێو (حجر)ی (اسماعیل)دا دانیشتوون و باسی کوژراوەکانی خۆیان لە جەنگی (بەدر)دا دەکرد، دیارە (عمیر بن وهب) یەکێك بوو لەوانەی کە زۆر ئازاری پێغەمبەرو هاوەڵانی بەڕێزی دابوو، بۆیە پێیان دەگوت: شەیتانێك لە شەیتانەکانی قوڕەیش (شیطان من شیاطین قریش).

لە درێژەی قسەکانیدا (صفوان) گوتی: ئەگەر کەسێك هەبووایە، چووبا (محمد)ی کوشتبا، تۆڵەی ئەو کوژراوانەی خۆمان دەکردەوەو یەکجاریی نەجاتمان دەبوو، (عمیر)یش، کە کوڕێکی لەگەڵ دیلەکانی قوڕەیش لە بەدر بەدیل گیرابوو، گوتی: من بیانووم هەیە بچم، بەڵام ئەگەر بکوژرێم ماڵ و خێزانم لەدوا بەجێدەمێنێ

---

١) (السیرة النبویة)، ج٢، ص(٣٦٠-٣٦١).

کێ بەخێویان دەکات؟! (صفوان) بەڵێنی پێداو، گوتی: من ماڵو خێزانەکەت لە ئەستۆ دەگرم، (عمیر) گوتی: باشە، بەڵام با نهێنی بێ، ئەویش وەعدی پێدا کە ئاشکرای نەکا.

(عمیر) شمشێرەکەی بە ژەهر ئاو دایەوەو خۆی ئامادە کردو چوو بۆ مەدینە، لەوێ عومەری کوری خەتتاب -خوا لێی ڕازی بێ- کە (عمیر)ی بینی، بە پێغەمبەری گوت ﷺ: ئەوە (عمیر)ە پیاوێکی زۆر خراپەکارەو (شیطان)ەو بۆ هیچی چاك نەهاتوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد، کە (عمیر) بچێتە ژووریێ بۆ لای، عومەریش ئەو لاسکەی کە (عمیر) شمشێرەکەی پێ لە خۆ قایم کردبوو لەملی کردو ڕای کێشاو هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، وە فەرمانی کرد بە هەندێك لە هاوەڵان، کە ئاگاداری بن، پێغەمبەر ﷺ لە (عمیر)ی پرسی: بۆچی هاتووی؟! گوتی: هاتووم بۆ ئەوەی پێتان بڵێم لەگەڵ ئەو کوڕەمدا چاك بن، کە لەلای ئێوە دیلە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی ئەو شمشێرە چییە پێتە؟! گوتی: جا کوا ئەم شمشێرە چ سودێکی پێگەیاندین لە جەنگی بەدردا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ڕاستم پێبڵێ بۆچی هاتووی؟! وتی: هەر بۆ ئەوە هاتووم کە باسم کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر بەڵکو تۆ لەگەڵ (صفوان) لای (حجر) دانیشتبوون، باسی کوژراوانی جەنگی بەدرتان دەکردو گوتت: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبا قەرزم لەسەرەو خێزانێکی زۆرم هەیە، دەچووم (محمد)م دەکوشت، (صفوان)یش قەرزو ژیانی خێزانەکەتی گرتە ئەستۆی خۆی بۆ ئەوەی من بکوژی، (عمیر) کە ئەوەی بیست سەری سوڕما!! وە یەکسەر گوتی: من شایەتی دەدەم، کە تۆ پێغەمبەری خوای، چونکە من پێم نەگوتووی‌و (صفوان)یش لە مەککەیە، کەواتە: خوا ئەوەی بەتۆ ڕاگەیاندوەو تۆی ئاگادارکردۆتەوە، بۆیە (عمیر) هەر لەوێ مسوڵمان بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی کرد، کە بیبەنو شارەزای ئیسلامی بکەن، وە کوڕەکەشی بۆ بەربدەنو ئەوانیش فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ جێبەجێ کرد.

لەم بەسەرهاتەدا ئەندازەی ڕق‌و قین‌و ویستی خراپی ناحەزانی ئیسلام دەدەکەوێ کە بۆ خامۆشکردنی بانگەوازی ئیسلام، هەردەم لە هەوڵی ئەوەدان کە سەرکردەو بانگخوازان بکوژن‌و لەنێویان بەرن‌و تەگبیرو ڕا دەگۆڕنەوە لەو پێناوەدا، وە بەرزی خووڕەوشت‌و هەڵوێستی جوانی پێغەمبەریش ﷺ دەردەکەوێ، لە کاتێکدا زانیویەتی کە (عمیر) بە نیازێکی خراپ‌و بۆ کوشتنی ئەو هاتوە، بەڵام عەفووی دەکاو چاکەی لەگەڵدا دەکات.

## دووەم: غەزای (ماء الكدر) لە ناوچەی (بني سليم):-

ڕووداوی دووەمی پێش جەنگی ئوحود بریتیە لە غەزای (بني سُليم) لە شوێنێك بووە بەناوی (ماء الكدر) وەك لە سیرەی (ابن هشام)[1]دا هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەوت شەو دوای گەڕانەوەی لە جەنگی بەدر، هەندێك زانیاریی‌و هەواڵی پێ دەگات کە (بني سليم) دەیانەوێ، چالاکیی سەربازیی لە دژی مسوڵمانەکان بکەن، پێغەمبەریش ﷺ دەستپێشخەریی دەکاو دەچێ، لە شوێنێك بەناوی (الکدر) کە سەرچاوەیەکی ئاوی لێ دەبێ، بۆماوەی سێ شەو دەمێنێتەوە، بەڵام هیچ ڕووبەڕووبونەوەو کوشتارێکی تێدا ڕوونادات‌و (بني سليم) پەرتەی لێ دەکەن‌و پێغەمبەریش دەگەڕێتەوە بۆ (مەدینە).

## سێیەم : غەزای (السویق) :-

یەکێکی دیکە لەو ڕووداوانە، غەزای (السويق)ە، کە لە مانگی (ذي الحجة)دا بووە، هۆی ڕوودانی ئەم غەزایەش ئەوەبوو کە: دوای ئەوەی قوڕەیشییەکان لە جەنگی بەدر تێك شکان، (أبو سفيان) سوێند دەخوا کە ئاو بە لەشی نەکەوێ‌و بەدەنی پاك

---

١) بڕوانە: ج٣، ص(٣-٤).

www.alibapir.com

نەكاتەوە لە لەش پیسیی، هەتاكو شتێك نەكا لـە دژی پێغەمبـەر ﷺو مسـولّمانان، هەر بۆیە شەوێك (أبو سفیان) بەخۆیو (٢٠٠) دووسـەد سـوارەوە هەڵدەكوتێتـە سـەر مەدینە، بە سوود وەرگرتن لە هەڵوێستی جوولەكـەكانی (بـني النضیـر)و دووكەسـی جوتیـار دەكـوژنو هەنـدێك ڕەزو بـاغیش دەسـووتێننو هەڵـدێن بـەرەو مەككـە، كـە پێغەمبەر ﷺ ئەو هەواڵـە دەبیستـێ، بـە سـوپایەكەوە دوایـان دەكـەوێ تـا شـوێنێك بەناوی (قرقرة الكُدْر) بەڵام نایانگاتـیو دەربازیان دەبێ، وە هۆی ناونانی ئەو غەزایەش بە (غزوة السـویق) ئەوەبووە كە (أبو سفیان)و سوپاكەی خواردنێكیـان پـێبووە بـەناوی (السویق) كە لە (ئاردو هەنگوینو ڕۆن دروست دەكرا)، بەڵام بۆ ئـەوەی باریـان سـووك بـێو چـاكتر ڕاكـەن، ئـەو خواردنـەیان هـەموو فـڕێ داوەو، مسـولّمانەكانیش كۆیانكردۆتەوەو سوودێكی باشیان لێ بینیوە[١].

## چـوارەم: غـەزای (ذي أمـر):-

پێغەمبەر ﷺ لە مانگی (محرم)دا پـاش گەڕانـەوەی لـە غـەزای (السـویق) دەچـێ بەرەو (نجد) بـۆ سـەر تیـرەی (غطفـان)، چونكە نیازیـان وابـووە هێـرش بكەنـە سـەر مەدینـە، پێغەمبـەر ﷺ مـانگی (صـفر) لـەوێ دەمێنێتـەوە، بـەڵام ئـەوان هیچیـان پێنـاكرێو بـڵاوەی لـێ دەكـەن، بۆیـە هـیچ جـەنگو كوشـتار ڕوونـادات و پێغەمبـەر ﷺیش دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە[٢].

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص(٣-٤).

٢) هەمان سەرچاوە، ص(٤).

## پێنجەم: غەزای (الفرع) لە (بەحران):-

پێغەمبەر ﷺ بە سوپایەکەوە دەچێ بۆ ئەوەی، کە گورزێکی سەربازی لە هێزەکانی قورەیش بدات لە شوێنێك بەناوی (الفرع)، بەڵام ئەوانی دەست ناکەوێ.

پێغەمبەر ﷺ مانگی (ربيع الثاني وجمادي الأولى)، واتە: دوو مانگان لەو شوێنە دەمێنێتەوە، دوایش بێ ئەوەی تووشی ڕووبەڕووبوونەوە ببن دەگەڕێنەوە بۆ مەدینە[١].

## شەشەم: سەرییەی (زيد بن حارثة) بۆ (القردة):-

پێغەمبەر ﷺ سەرییەیەك بە فەرماندەیێتی (زيد بن حارثة) بە سەد سوارەوە دەنێرێ بۆ شوێنێك بەناوی (القردة)[٢]، بەمەبەستی گرتنی کاروانێکی قورەیشییەکان، کە لە ئەنجامدا کاروانەکەو چاوساغی کاروانەکە دەگرن، بەڵام کەسی قورەیشییەکانیان چنگ ناکەوێ[٣].

## حەوتەم: پەیمان شکێنی جوولەکەکانی (بني قينقاع) و دەرکردنیان:-

یەکێکی دیکە لەو بەسەرهاتانە بریتییە لە بەسەرهاتی یەکێك لە تیرەجوولەکەکانی دەوروبەری (مەدینە) بەناوی (بني قينقاع)، دیارە پێشتر باسمان کرد، کە: (بني قينقاع) و (بني النضير)و (بني قريظة) سێ تیرەی سەرەکی جوولەکەبوون لە مەدینەدا، کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە پەیمانی لەگەڵ مۆرکردن، کە بە

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.
٢) القردة: ناوی کانیو سەرچاوەیەکە لە (نجد).
٣) السيرة النبوية، لابن هشام، ج٣، ص(٧).

www.alibapir.com


هەموویان بەرگریی لە مەدینە بکەن، وە هاوکاریی یەك بکەن لە شتی باشدا، بەڵام (بني قينقاع) چەند شتێکیان کرد، کە پێچەوانەی پەیمانەکە بوو، بۆیە ئەو پەیمانەیان هەڵوەشاندەوە، یەکێك لەو شتانە ئەوە بوو وەك (إبن هشام) گێڕاویەتەوە[1]، کە: پاش جەنگی بەدر ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لە بازاڕ خەڵکێکی لە تیرەی (بني قينقاع)ی کۆکردەوە پێی فەرموون: **{يا معشر يهود! احذروا من الله مثل ما نزل بقريش من النقمة وأسْلِموا، فأنكم قد عرفتم أني نبيٌّ مرسل، تجدون ذلك في كتابكم وعهد الله اليكم}**، واتە: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! لە تۆڵەی خوا بترسێن ، وەکو ئەوەی کە بەسەر قوڕەیشی هێناو، مسوڵمان بن، ئێوە دەزانن، کە من پێغەمبەری خوامو ئەوەش دەبینن لەو کتێبەدا، کە خوا بۆی ناردوون، ئەو پەیمانەی، کە لێی وەرگرتوون! ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: نەخێر تۆ پێغەمبەی خوا نیو ئیمانت پێ ناهێنینو، هەڕەشەی لێ دەکەنو پێی دەڵێن، ئەی موحەممەد تۆ بەوە هەڵمەخەڵەتێ، کە لەگەڵ کەسانێك جەنگێکت کردوە ئەزموونی جەنگیان نەبووە، ئەگەر لەگەڵ ئێمەدا شەڕ بکەی، ئنجا تێدەگەی، کە ئێمە پیاوی شەڕین، کەواتە: هەرچەندە بەڵێنو پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا هەبووە، کەچی هەڕەشەیان لێکردوە!

هۆکاری سەرەکی ڕووداوی دەرکرانی تیرەی (بني قينقاع) ئەوەبوو، کە ئافرەتێکی مسوڵمان دەچێ بۆ بازاڕی (بني قينقاع) بۆ ئەوەی شت بفرۆشێ، دوای ئەوەی، کە شتەکەی دەفرۆشێ، دەچێتە لای زێڕنگرێك دادەنیشێ، سەرەتا جوولەکەکان دەیانەوێت ئەو ژنە دەموچاوی دەربخات، ئەویش دەری ناخات، دوایی زێڕنگرەکە دامێنی کراسی ئافرەتەکە لە پشتەوەڕا، لە پشتی گرێدەداتەوە، بەبێئەوەی ئافرەتەکە بزانێو هەست پێبکا، کە ئافرەتەکە کارەکەی لای زێڕنگرەکە تەواو دەبێ، هەڵدەستێو ڕانی بەدەردەکەوێو، ئافرەتەکە زۆر ناڕەحەت دەبێو هاوار دەکاتو دەڵێ: ئەی مسوڵمانینە

---

١) (السيرة النبوية، لابن هشام) ج٣، ص(٤-٥).

فریام بکەون، ئەوانە سووکایەتییان پێکردم! پیاوێکی مسوڵمان لەوێ دەبێ جوولەکەکەی دەکوژێ، جوولەکەکانیش مسوڵمانەکەی دەکوژنو شەڕەکە گەورە دەبێ، کە هەواڵەکە دەگاتە پێغەمبەر ﷺ، بۆ وەڵامدانەوەی پڕ بەپێستیان پێغەمبەر ﷺ سوپایەك ئامادە دەکاتو دەچێتە سەریان، جا هەرچەندە ژمارەی شەڕکەرانی جوولەکەکانی (بني قینقاع) (٧٠٠) کەس دەبێ، بەڵام خوای تواناو زاڵ، ترس دەخاتە دڵیانەوەو، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆماوەی پازدە ڕۆژ دەورەیان دەگرێ، خۆیان تەسلیمی پێغەمبەر ﷺ دەکەن.

هەردوو ئایەتی (١٢و١٣)ی سووڕەتی (آل عمران) بەو بۆنەوە هاتوونەخوار، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾ ﴾،واتە: بەوانەی کە بێبڕوان بڵێ: بەتەئکید ئەگەر جەنگ بکەن تێدەشکێن وە دواییش بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوە، کە ئەوێش خراپترین جێگای تێدا حەوانەوەیە، بێگومان بۆئێوە نیشانەو بەڵگەیەك هەیە لە دوو کۆمەڵەکاندا کەبەیەك گەیشتن (کۆمەڵی مسوڵمانان بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ وە کۆمەڵی کافران بەسەرکردایەتی -أبو جهل-) کۆمەڵێکیان لەپێناوی خوادا دەجەنگین، وە ئەوەی دیکە کافر بوون، کە دوژمنەکانیان دووئەوەندەی خۆیان دەبینی (یاخود کافرەکان مسوڵمانانیان دوو ئەوەندەی خۆیان دەبینی بۆئەوەی ترسیان بکەوێتە دڵ) ﴿وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴾ خواش پشتی هەرکەسێك

دەگرێ، کە بیەوێ، بەیارمەتی خۆی، بێگومان لەوبەسەرهاتو ڕووداوەدا پەند هەیە بۆ ئەوانەی کە عەقڵیان شت دەرك بكات.

دیارە (بني قینقاع) هاوپەیمان بوون لەگەڵ (خەزرەجییەكان)دا، كە ئەوانیش دوو ڕیش سپییان هەبوون (عبادة بن الصامت) و (عبدالله بن أبي بن سلول)، كە ئەمەیان سەرۆكی (منافق)ەكانی مەدینە بوو، (عبدالله) دەچێ بۆلای پێغەمبەر ﷺو داوای لێدەكاتو دەڵێ: ئەوانە بەمن ببەخشە! لەكاتێكدا پێغەمبەر ﷺ بۆی هەبوو جەنگاوەرەكانیان بكاتە دیل یان بكوژێ، چونكە تەسلیم بووبوون، دوای ئەوەی (عبدالله) بۆ جاری دووەم داوای لە پێغەمبەر ﷺ كردو دەستی خستە بەرپشتێنیەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بەرمدە، ئەویش دەڵێ: ئاخر ئەوانە هاوپەیمانی من بوونو بەرگرییان لەمن كردوە، چوارسەد كەسی زرێدارو سێسەد كەسی بێ زرێ، داوات لێ دەكەم پێمیان ببەخشی، دوایی پێغەمبەر ﷺ بەدڵ نارەحەتییەوە دەفەرموێ: ئەوە بەتۆم بەخشین، جا لەكاتێكدا كە (عبدالله بن أبي بن سلول) چووە دیفاع لەو جوولەكانە بكات، (عبادة بن الصامت)یش دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا من لەگەڵ ئەوانەدا هاوپەیمان بووم، بەڵام ئەوە من دۆستایەتی خواو پێغەمبەری خواو ئەهلی ئیمان دەكەمو هەڵدەبژێرمو لە دۆستایەتی(بني قنیقاع) بەرییم، (چونكە خیانەتیان كرد لەو پەیمانەی بە پێغەمبەریان ﷺ دابوو)[1].

جا بەو بۆنەیەوە خوا -عزّ وجلّ- فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە جوولەكەو نەصرانییەكان مەگرن بە دۆستو پشتیوانی خۆتان، لە حاڵێكدا كە ئەوان هەندێكیان

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٥-٦.

www.alibapir.com



دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن وە هەرکەسێك لە ئێوە وابكا ئەوە لەوانە (لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەر) بێگومان خوا ڕێنمایی ستەمكاران ناكات)، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەوانەی، كە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، پەلە دەكەن لە دۆستایەتی كردنی جوولەكەكانداو دەڵێن: دەترسین بەلامان بەسەر بێ) {وەك (عبدالله بن أبي) بە پێغەمبەر ﷺی گوت: من پیاوێكم لە بەلایان دەترسێم، با ئەوانە بمێنن چاكە بۆ ئەوەی بەرگرییمان لێ بكەن} ، زۆر نزیكە خوا سەركەوتنێك بێنێ یان لەلای خۆیەوە شتێك بڕەخسێنێو ئەوانەش، كە لەدڵیاندا پەنهانیان دەكرد پەشیمان ببنەوە.

هەروەها دەربارەی هەڵوێستەكەی (عبادة بن الصامت)یش دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی ئیماندارینە! هەركەسێك لە ئێوە لە دینەكەی پاشگەز بێتەوە، {وەكو (عبدالله بن أبي)ە، كە ئەگەر ئیمانو دینیشی هەبوو بێ، بەوە كە دۆستایەتی گرتوە لەگەڵ جوولەكەو نەصرانییەكانداو كەینوبەینی لەگەڵیاندا هەبووەو پشتگیریی كردوونو بەتەنگیانەوە بووەو خۆشی ویستوون لە بازنەی ئیسلام چۆتەدەرو ئیمانەكەی هەڵوەشاوەتەوە} ئەوە خوا كەسانێك

دێنێ خۆشی دەوێن‌و خۆشیان دەوێ، لەگەڵ ئەهلی ئیمان نەرمونیان‌و لەگەڵ کافراندا توندن، لە ڕێی خوادا جیهاد دەکەن‌و، لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن، ئەوەش بەخششی خوایە، دەیدا بە هەرکەسێ، کە بیەوێ، بێگومان خوا خاوەنی بەخششی فراوانەو زانایە، بێگومان دۆست‌و پشتیوانی ئێوە تەنیا خوایە، پاشان پێغەمبەری خوایە، دوایی ئەهلی ئیمانە، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن‌و زەکات دەدەن‌و ڕکووع بەرن، هەرکەسێکیش دۆستایەتی خواو پێغەمبەری خواو ئەهلی ئیمان بکات، ئەوە حیزبی خوایە، بێگومان کۆمەڵی خواش زاڵ‌و سەرکەوتوون.

## هەشتەم: کوشتنی (کعب بن الأشرف):-

یەکێکی دیکە لەو ڕووداوانە، کوشتنی (کعب بن الأشرف) بوو، وەکو (ابن هشام و مسلم و بخاري[1]) هێناویانە، (کعب بن الأشرف) یەکێك بووە لە سەرکردەکانی جوولەکەو پیاوێکی زۆر خراپ بووە، هەرچەندە دڵنیابووە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام لەبەر ئیرەیی‌وکینە ئیمانی پێی نەهێناوە.

وە ئەو کابرایە چەند هەڵوێستێکی خراپی هەبوون، لەوانە دوای ئەوەی قورەیشییەکان لە جەنگی (بەدر) دا شکستیان خواردو تێکشکان، چوو بۆ مەککەو لەگەڵ قورەیشییەکان دانیشت‌و بۆیان گریاو دڵی دانەوەو هاوخەمیی لەگەڵ دەربڕین، پاشان هانیدان کەتۆڵەی خۆیان بکەنەوەو گوتی: ئێمەش هاوکارییتان دەکەین، بەوەندەش نەوەستا، بەڵکو دەستی کرد بە شیعر گوتن بەسەر ئافرەتانی مسوڵماناندا، وە شیعریشی بەسەر هەندێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺدا گوت، هەموو ئەو هەڵوێستانەش مایەی پەیمان شکاندنن لەلایەن (کعب)ەوە، بۆیە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{مَن لكعب بن الأشرف؟ فانه قد آذى الله ورسوله}**

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٧-١٢)، وە (صحيح مسلم): ٤٦٤٠،و (صحيح البخاري): ٤٠٣٧.

رواه البخاري، واتە: کێ هەیە کەعبی کوڕی ئەشرەفمان لەکۆڵ بکاتەوە، چونکە بەڕاستی خواو پێغەمبەری خوای ئازار داوە؟! واتە: شتێکی زۆر گەورەی کردوە، کە خواو پێغەمبەری خواپێیان ناخۆشە، (محمد بن مسلمة)[1]ش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەتەوێ بیکوژم؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، ئنجا (محمد بن مسلمة) کارەکە ئەنجام دەداو، فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە دەبێ، کە لە چوار کەسی دیکەش پێکدێتو، کە بریتی بوون لە:

١) أبو نائلة، (کە برای شیری – کعب بن الأشرف- بووەو ناوی (سلکان بن سلامة) بووە.

٢) عباد بن بشر بن وقش.

٣) الحارث بن أوس بن معاذ.

٤) أبو عبس بن جبر.

ئەو پێنج کەسە، کە لە (ئەوس) دەبن بۆی دەچنو دەیکوژن، کە کورتەو پوختەی چالاکییەکەش بەو شێوەیە بووە:-

ئەو چەند کەسە دەچن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ بوارمان پێ بدەی بۆ سەرکەوتنی بەرنامەکەمان قسەیەکی وا بکەینو

---

١) محمد بن سلمة: بەپرسی یەکەمین مەفرەزەبووە کە پێغەمبەر ﷺ ناردوویەتی بۆئەوەی کە یەکێك لە دوژمنانی ئیسلام لەنێوبەرێ لە جەنگێکی پەنهاندا، چونکە دوژمنایەتی خۆی ڕاگەیاندوە، کەواتە: ئەگەر کیانو دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێو کەسێك ئیعلانی دژایەتی لەگەڵدا بکاتو لە شەڕێکی ئاشکراشدا زەفەری پێ نەبرێ، ئەوە لە شەڕێکی پەنهاندا دەکوژرێ، بەمەرجێك، کە کیانو دەوڵەتێکی ئیسلامیی وە قیادەیەکی سەر ڕاستو شەرعیی هەبێ، ئەگەر نا هەرکەسە بۆی نیە لەخۆیەوە ئیجتیهاد بکاو بچێ یەکێك بکوژێ.

www.alibapir.com

شتێك بڵێین كە بتوانین بیكوژین، ئەویش فەرمووی بیڵێن، چونكە ئەگەر شتێكی وا نەڵێن متمانەیان پێ بكا زەفەری پێ نابەن.

ئەوانیش دەچن بۆ لای (كعب)و دەڵێن: (كعب) ئێمە فەقیرو نەدار كەوتووین، هاتووین، كە هەندێك زادو زەخیرەمان بدەیە!.

ئەویش دەڵێ: باشە، بەڵام خێزانەكانتان بێنن بارمتە (رهن) بن لای من!!

ئەوانیش دەڵێن: ئاخر چۆن دەبێ ئەوە عەیبە!!

دەڵێ: كورەكانتان بێنن.

دەڵێن: ئەوەش نابێ، چونكە دوایی عەرەب قسەمان پێدەڵێن‌و، دەڵێن كورەكانتان بارمتە (رهن) بوون لە بەرامبەر مستە جۆیەكدا!

(كعب) دەڵێ: ئەدی چی دێنن؟

دەڵێن: چەكەكانمان دێنین.

دەڵێ: باشە، ڕێكدەكەون‌و كاتێك بەیەكەوە دیاری دەكەن‌و، بەو شێوەیە هەڵ وەردەگرن‌و كارەكە ئەنجام دەدەن‌و دەیكوژن.

## نۆیەم: بوونی (حفصة)ی كچی (عمر) بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ‌و بەشوودانی (فاطمة) بە (علي):-

لەو ڕووداوانە، كە لەكۆتایی ساڵی دووەمی كۆچی‌و سەرەتای ساڵی سێیەمدا بوون، ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ (حفصة)ی كچی (عومەری كوڕی خەتتاب) -خوا لێیان ڕازی بێ-، مارەدەكات‌و دەیهێنێ، هەروەها (فاطمة)ی كچیشی بەشوو دەداو دەیدا بە (علي بن أبي طالب)ی ئامۆزای، -خوا لە هەموویان ڕازی بێ-.

پێغەمبەر ﷺ لەنێو هاوسەرەکانیدا کە هێناونی تەنها (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێ-، کچ بووە، ئەوانی دی هەموو بێوەژن بوون، یەك لەوان (حفصة)ی کچی عومەرە، خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ، کە پێشتر هاوسەری (خنيس بن حذافة السهمي) بوو، عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- سەرەتا (حفصة) پێشنیار دەکات بۆ (عثمان)، کە بیهێنێ، بەڵام (عثمان) عوزر دێنێتەوەو، دەڵێ: ئەوەی ڕاستی بێ نامەوێ ئێستا ژن بێنم، دوایی پێشنیاری دەکا بۆ (أبو بكر) ئەویش هیچ قسە ناکات، دوایی پێغەمبەر ﷺ لێی دەخوازێو دەیهێنێ، لە دواییدا (أبو بكر) بە (عمر) دەڵێ: پێدەچێ ئەو ڕۆژەی، کە (حفصة)ی کچت بۆ پێشنیار کردمو وەڵامم نەدایەوە پێت ناخۆش بووبێ؟! (عمر) دەڵێ: بەڵێ ئەوەی (عثمان)یشم پێ ناخۆش بوو، بەڵام هی تۆم پێناخۆش تر بوو، چونکە وەڵامت نەدامەوە، (أبو بكر) -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: لەبەرئەوەی لە پێغەمبەرم بیستبوو، کە باسی کردبوو، دەیویست بیهێنێو منیش نەمویست نهێنی پێغەمبەر ﷺ بدرکێنم، ئەگەرنا، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ نەیوستبا من سوپاسم دەکردیو دەمهێنا[1]، ئیدی بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ (حفصة)ی کچی عومەر دەخوازێ.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ (فاطمة)ی کچی دا بە (علي) ئامۆزای، -ڕەزای خوایان لێ بێ-، وە ئەو کەلوپەلەی کە لەگەڵ بووك دەبرێ، ئەوەی (فاطمة) بریتی بووە لە لێفەیەك، لەگەڵ مەشکەیەك، لەگەڵ سەرینێکی چەرم، کە نێواخنەکەی جۆرە گیایەك بووە بە ناوی (إذخر)، مارەیی یەکەشی زرێیەکی چوار درەم بایی بووە![2].

---

١) صحيح البخاري: ٥١٢٢.

٢) بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٣٩٤-٣٩٧).

www.alibapir.com

# جـەنـگـی ئوحـود

جــەنگی ئوحــود، کــە لــە نێــوان مســولْمانان بەســەرکردایەتی پێغەمبــەر ﷺو کافرەکـانی قـوڕەیش بـە سـەرکردایەتی (أبـو سـفیان)دا ڕوویـداوە، دووەمـین جـەنگی گەورەی نێوان کافرو مسولْمانانە.

بەڕێــزان!

خوا پشتیوان بێ لە (حـەقدە) خالآندا بە پوختییو گوشراویی بۆتـان باسـی جـەنگی ئوحود دەکەم:-

**یەکـەم:-** جەنگی ئوحود لەمـانگی (شـوال)ی سـاڵی سـێیەمی کۆچـیدا ڕوویـداوە[1]، بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە چونکە لە شەڕگەیەکدا ڕوویدا، کە دەکەوێتە دامێن چیای (ئوحود)ەوە، کە چیایەکی بەرزەو دەکەوێتە پشت شاری مەدینەوە.

**دووەم:-** هۆکارو سەرەتای دەستپێکردنی جەنگی ئوحود بەم شێوەیە بووە: پاش ئـەوەی کافرەکـانی مـەککـە لـە جـەنگی بـەدر بـە تێکشـکاوی گەڕانـەوەو حـەفتا کەسـیان لـێکوژراو حەفتایان لـێ بە دیل گیــرا، وە (أبوسـفیان)یش کاروانەکـەی بـۆ دەربـاز بووو گەڕایەوە، کۆمـەڵێك لەوانەی کە بابیان یـاخود خزمیـان لـە جـەنگی (بـەدر)دا کوژرابوو، لەوانە: (عبدالله بـن أبـي ربیعـة و عکرمـة بـن أبـي جهـل و صـفوان بـن أمیة)و کۆمـەڵێك خەڵکی دیکە، چون بۆ لای (أبوسـفیان)و هەنـدێ خـەڵکی دیکـە، کە بەشیان لەو کاروانەدا هەبووەو گوتیان: (یا معشر قریش! إِنَّ مـحمداً قـد وَتِـرَكُم وقَتَل خیارکم فأعینونـا بهـذا الــمال علـی حربـه)، واتـە: ئـەی کۆمـەڵی قـوڕەیش!

1) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٣، ص(١٣).

موحەممەد زەبرێکی گورچك بڕی لێداون و پیاوە چاکەکانتانی کوشتوون، بۆیە بە ماڵی ئەم کاروانە یارمەتیمان بدەن با جەنگ بکەین لە دژی[1].

بەوبۆنەوە خوای زاناو توانا ئایەتی (٣٦)ی سوورەتی (الأنفال)ی ناردە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان ماڵی خۆیان خەرج دەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی لە ڕێی خوا لابدەن، ماڵەکەیان خەرج دەکەن، بەڵام دوایی بۆیان دەبێتە مایەی خەمو پەژارەو سەرەنجام تێك دەشکێن، وە ئەوانەی بێبڕوان بەرەو دۆزەخ خڕدەکرێنەوە.

**سێیەم:-** ژمارەی سوپای کافرانی قوڕەیش سێ هەزار کەس بووەو دووسەد سواریان لەگەڵدا بووە، ئەوەی کە سەرکردەی لای ڕاستی (میمنة)ی سوپای سوارە بووە (خالد بن الولید)و سەرکردەی لای چەپ (میسرة)یش (عکرمة بن أبي جهل) بووە[2].

وەکافرەکانی قوڕەیش ئافرەتیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردوون، کە لەدوای پیاوەکانەوە دەفیان لێداوەو هانی پیاوەکانیان داوە بەرەو شەڕو تۆڵەسەندنەوە، یەکێك لەوانە، کە بە شیعر هانی پیاوانی دەدا، (هند)ی کچی (عتبة) بوو، کە خێزانی (أبو سفیان) بوو[3].

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٣).
٢) هەمان سەرچاوە، ص(١٧).
٣) هەمان سەرچاوە، ص(١٨).

**چـــوارەم:-** چـــەند هۆکـــارێکی ڕوودانـــی جـــەنگی ئوحـــود، کـــە قورەیشـــییەکان دەستپێشـخەر بوون بۆی:-

١/ **هۆکاریی فیکریی:** قورەیشیەکان هەردەم لە هەوڵی ئەوەدا بـوون، کـە کۆسـپو تەگەرە لە ڕێی بڵاوبوونەوەی ئیسلامو گەشەکردنیدا دروست بکـەن، وەك ئایـەتی (٣٦) سووڕەتی (الأنفال) باس دەکات.

٢/ **هۆکاری ئابـووریی:** ئەو مـەفرەزەو سـەرییانەی دەوڵـەتی ئیسـلامیی (مەدینـە) دەینـاردنـە دەرەوەو جـەنگی بـەدریش کـە ڕوویـدا بـوو، کاریگـەریی خراپییـان خسـتبوە سـەر ئـابووریی قورەیشـییەکانی مەککـەو هاتووچـوونی کـاروانی بازرگانییان بۆ شام، بۆیە قورەیشییەکان ویستیان بەو شەڕە ڕێگـای بازرگانییـان بکەنـەوە، تاکو بتوانن بەبێ باکیـی کاروانی بازرگانییان بێتو بچێ.

٣/ **هۆکـــاری کۆمەڵایـــەتی:** تێکشـــکانی قورەیشـــییەکان لـــە بـــەدرو کـــوژرانی زلەزلـەکانیان، کاریگـەرییـەکی نەفسـییو کۆمـەڵایـەتیی کردبـووە سـەر ئـەوانو خۆیـان بـەبێ دەسـەڵاتو زەبـوون دەهاتـە بەرچـاو، بۆیـە لـەپێناو هەسـتانەوەو هاتنەوە مەیدانو لابردنی تێکشـکانەکەیان، ویسـتیان جـارێکی دیکـە شـەڕ بـە مسـوڵمانان بفرۆشـنو تۆڵـەی خۆیـان بکەنـەوەو، بـۆ نێـو خۆیـانو دەوروبـەریش دەسەڵاتی خۆیان پێشان بدەنو ڕابنوێنن.

٤/ **هۆکاریی سیاسیی:** یەکێکی دیکە لە هۆکارەکان ئەوە بـوو کـە قـورەیش پایـەو شوێنی سـیاسـییان بەهۆی دۆڕانیـان لە جەنگی بەدردا، لەدەسـتدابوو، بۆیە بـۆ گێڕانەوەی ئەو پلەو پایە سیاسییە، هەوڵی هەڵگیـرسانی جەنگێکی دیکەیاندا.

**پێنجەم** :- (جبير بن مطعم) لە جەنگی بەدردا مامێکی بەناوی (طعيمة بن عدي) دەکوژرێ، بۆیە بۆ تۆڵە سەندنەوەی مامی خۆی غولامێکی خۆی بەکرێ گرت، کە ناوی (وحشي) بوو، وە پێی گوت: (حمزة)ی مامی موحەممەدم بۆ بکوژە لە تۆڵەی مامی خۆم، ئەگەر کوشتت ئازادت دەکەمو لە کۆیلایەتی ڕزگارت دەبێ، (وحشي) نێزە هاوێژێکی زۆر کارامە بووەو، کەم وابووە نێزە بهاوێو بەو ئامانجە نەکەوێ کە دەیەوێ، بەوجۆرە لەو جەنگەدا (وحشي) (حمزة)ی مامی پێغەمبەر ﷺی شەهید کرد، کە پێغەمبەر ﷺ زۆر پەرۆشی بوو[١].

**شەشەم**:- پێغەمبەر ﷺ کەدەبیستێ سوپای قورەیشییەکان بەرێ کەوتوە بە سێهەزار کەسەوەو دەیانەوێ بەسەر مەدینەدا بدەن، وەکو عادەتی هەمیشەیی خۆی هاوەڵانی کۆدەکاتەوەو ڕاوێژیان پێدەکات بۆ هەڵوێست وەرگرتن، دیارە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ڕای وابووە کە لە مەدینە نەچێتە دەرێو لەوێ بەرگری بکەن، هەروەها (عبدالله بن أُبي بن سلول)یش هەمان ڕای پێغەمبەری هەبووە لەو هەڵوێستەدا، بەڵام ئەوانەی کە لە جەنگی بەدردا بەشدارییان نەکردبوو وە هەندێکیش لە گەنجەکان کە خوێن گەرم بوون، گوتیان: چۆن دەبێ ئەوان بێن بۆسەر شارەکەمانو ئێمە بۆیان نەچینە دەرێ، دوایی ئەوان بەترسانو بێهێزی بۆمان لێکدەدەنەوە، وە ئەوانەی کە بڕیاریان وا بووە بچنە دەر ژمارەیان زیاتر بووە لەوانەی کە دەیانگوت لەنێو شار بمێنینەوە، پێغەمبەریش ﷺ لە شتێکدا کە وەحی لەسەر نەبووبێ، ڕێزی ڕای زۆرینەی گرتوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا بۆ ڕووبەڕووبونەوەی کافرەکان بچنە دەرەوەی شار، وە کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دەڕوا هێندێك لە هاوەڵان، کە ڕایەکەیان پێچەوانەی ڕایەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو، لەنێو خۆیاندا ڕاوێژ دەکەنو دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ڕای جیاواز بوو لەوەی ئێمە با

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٠،٢١)، وە (صحيح البخاري): ٤٠٧٢.

www.alibapir.com

لە قسەی خۆمان پاشگەز بینەوەو بچینە سەر قسەی ئەو، بۆیە دەچنە خزمەتی‌و پێی دەڵێن: (یا رسول الله استكرهناك ولم يكن لنا ذلك فأن شئت فاقعد صلى الله عليك!)، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە فشارمان بۆ تۆ هێناو ناچارمان کردی، ئەوەشمان بۆ نیە، بۆیە ئەگەر پێت خۆشە هەر لەنێو شاردا دەمێنینەوە سەڵات‌و سەلامی خوات لەسەربێ[(١)].

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{ما ينبغي لنبيّ اذا لبس لأمته أن يضعها حتى يقاتل}**[(٢)]، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە، کە بەرگی جەنگی پۆشی دایبنێ، هەتاکو جەنگ نەکات، واتە: تازە خۆم پێچاوەتەوە وە دەبێ بۆیان بچینە دەرێ، وەك چۆن لە هەڵوێستی یەکەمی (ڕاوێژ پێکردنیان)دا دەرس‌و وانەیەکی فێرکردن، بەهەمان شێوەش بە هەڵوێستی دووەمیشی ئەوەی فێرکردن، کە قیادە نابێ هەر ڕۆژە ڕایەك بڵێ، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿...وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ... ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران، واتە: ڕاوێژیان پێ بکە (دوای ئەوەی، کە ئەنجامی ڕاوێژەکەت وەرگرت) هەرکات بڕیارتدا پشت بە خوا ببەستەو جێبەجێی بکە.

__حەوتەم__ :- سوپای ئیسلام لەسەرەتادا کە بەرەو شەڕگە کە لە دامێنی چیای ئوحودە، بەڕێکەوتوە ژمارەیان هەزار جەنگاوەر بووە، بەڵام لە نیوەی ڕێگا (عبدالله بن أُبي بن سلول) بەخۆی‌و سێیەکی سوپایەکەوە پاشەکشە دەکاو پشتی پێغەمبەر ﷺ بەردەداو دەگەڕێتەوە مەدینە، بەبیانووی ئەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەقسەی ئەو خوێن گەرمانە دەکات‌و قسەی من دەشکێنی، نازانم لەسەر چی خۆمان

---

١) هەمان سەرچاوە، ص(١٥).

٢) رواه البخاري وأحمد وابن إسحاق، بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٥).

بەكوشت دەدەین؟ دەی خەڵكینە بابگەڕێینەوە! وە ئەوانەی كە دڵ نەخۆش‌و ئیمان لاواز بوون لە قەومەكەی لەگەڵی دەگەڕێنەوە[١].

خوای پەروەردگار لەبارەی ئەو هەڵوێستەی (عبدالله بن أُبي بن سلول) ئەم ئایەتانەی ناردنە خوار، كە دەفەرموێ: ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَاتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ (١٦٧) الَّذِينَ قَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُوا لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنْفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (١٦٨)﴾ آل عمران، باسی یەكێك لە حیكمەتەكانی جەنگی ئوحود دەكات‌و دەفەرموێ: (خوای زاناو شارەزا جەنگی ئوحودی بۆیە هێنایە پێشێ) بۆ ئەوەی ئەوانەی، كە دەغەڵن بناسرێن، كاتێك كە پێیان گوترا: وەرن لەڕێی خوادا بجەنگن، یان بەرگریی لە مەدینە بكەن، گوتیان: ئەگەر زانیبامان جەنگ دەكەن لەگەڵتان دەهاتین...

لێرەدا هەڵوێستی خراپ‌و دزێوی سەرۆكی مونافیقەكانی مەدینە (عبدالله بن أُبي بن سلول) دەردەكەوێ كە لەوكاتە ناسكەدا خۆی‌و خەڵكێكی زۆر گەڕانەوەو پشتی پێغەمبەر ﷺیان چۆڵ كردو پاشەكشەیان كرد.

بەڵام ئیمان‌و قەناعەتی تەواوی پێغەمبەر ﷺ‌و هاوەڵانی ڕاستەقینەی بەڕێزی بەئەندازەیەك چەسپاو‌و نەگۆڕ بوو، كە بە پاشەكشەی ئەوان ورەیان دانەبەزی‌و لە هەموو حاڵەتەكاندا مەبەستیان ڕەزامەندیی خوا بووەو لەو پێناوەشدا هەموو شتێكیان لەخۆیان گرتوە.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ص(١٥-١٦).

**هەشتەم:**- (ابن هشام)[1] دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هێزەکانی خۆی لە شیوەکانی چیای ئوحود دامەزراندو پشتی دایە چیاکەو ڕووی لە مەدینە کردوە، واتە: سوپای دوژمنی خستە نێوان خۆیانو مەدینەوە.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە (عبدالله بن جبیر)و لەگەڵ پەنجا کەس لە هاوەڵانی بەڕیزی لەپشت خۆیانەوەو لەسەر چیاکە دایینان، وە بەم شێوەیە ئامۆژگاریکردنو فەرمووی: **{انضح الخيل عنّا بالنّبل لا يأتونا من خلفنا إنْ كانت لنا أو علينا فاثْبُتْ مكانك لانؤتَيَنَّ من قِبَلِك}**، واتە: ئەگەر ئەسپ سوارەکان هاتن ئێوە بە تیر لێیان بدەن باپشتمان لێ نەستێننەوەو، ئەگەر ئێمە لە جەنگەکەدا سەرکەوتوو بووین، یان شکست خواردوو، تۆ شوێنی خۆت چۆڵ مەکە، وە لە شوێنی خۆت بمێنەوە با دوژمن لەلای تۆوە زەفەرمان پێنەبات.

**نۆیەم:**- پێغەمبەر ﷺ سوپایەکەی ڕێك دەخاتو ئاڵای گەورە (لواء) دەداتە دەست (مصعب بن عمیر)[2] -خوا لێی ڕازی بێ- کە لە هۆزی (بني عبدالدار) بووە.

وە پێغەمبەر ﷺ لەم جەنگەدا وەك ئامادەییەك بۆ جەنگو کوشتار دوو (زرێ) لەسەر یەك لەبەر دەکات، چونکە پێشبینی ئەوەی کردوە، کە جەنگەکە سەخت دەبێو کوشتاری تێدا ڕوودەداو تووشی برینداریو ئازاری زۆر دەبێ[3].

**دەیەم:**- یەکێك لەو هەڵوێستانەی پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحوددا، کە شایانی باسە، ئەوەیە شمشێرێك دەردەهێنێو دەفەرموێ کێ ئەم شمشێرەم لێ وەردەگرێ بەڵام حەقی خۆی بداتێ؟! کۆمەڵێك لە هاوەڵان دەچن دەڵێن: ئەی

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٣، ص١٧.

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

٣) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

پێغەمبەری خوا بیدە بە ئێمە، نایانداتێ، دوایی (أبو دجانة)، کە ناوی (سماك بن خرشة)یە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شمشێرە حەقەکەی چییە؟! دەفەرمووێ: حەقەکەی ئەوەیە پێی لە دوژمن بدەی تا دەچەمێتەوە، ئەویش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بە حەقی خۆی وەریدەگرم، لە ئەنجامدا پێغەمبەر ﷺ دەیداتێ.

جا (أبو دجانة)، کە شمشێرەکەی وەرگرت بە فیزو کەشخەوە ڕۆیشتو ئەم شیعرەی خوێندەوە:

انا الذي عاهدني خليلي ونحن بالسفح لدى النخيل
ان لا اقوم الدهر في الكيول اضرب بسيف الله والرسول

واتە: من، کە خۆشەویستەکەم پەیمانی لەگەڵ بەستم، کە ئێمە لە خوارێ بووین لای دارخورمایەکان، کە قەت لە ڕیزەکانی پشتەوەی جەنگ نەبم، وە بەشمشێری خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لەکافرەکان بدەم.

(ابن هشام) دەڵێ:[1] دوایی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بینی (أبو دجانة) بە فیز دەڕوا، فەرمووی: **{إنّها لمشية يبغضها الله الاّ في مثل هذا الموطن}**، واتە: ئەمە جۆرە ڕۆیشتنێکە، کە خوا ڕقی لێیەتی، مەگەر لە حاڵەتێکی ئاوادا نەبێ، واتە: لەکاتێکدا کە لە بەرامبەر دوژمندا دەوەستی، ئاساییە ئەگەر فیزو کەشخە بکەی، وەك جەنگی دەروونیی بەرامبەریان.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٨-١٩).

www.alibapir.com

**یازدەیـەم** :- کۆمـەڵێك گەنجی هەرزەکار، کە باڵغ نەبووبوون هاتن بۆئەوەی بەشـداریی بکەن لە جەنگدا، لەوانە: (عبدالله بن عمر، زید بن ثابت، أسامة بن زید، عمرو بـن حزم، البراء بن عـازب، وأسـید بـن ظهـیر)، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ نـەیبردوون بـۆ جەنگ‌و گێڕانیەوە لەبەرئەوەی کە باڵغ نەبوون جگە لـە (رافـع بـن خـدیج)، چـونکە تیـرهاوێژێکی زۆر دەسـت ڕاسـت بـوو، ئنجـا گوتیـان (سـمرة بـن جنـدب)یش بـە زۆرانبازیی بە (رافع) دەوێرێ، دوایی پێغەمبەر ﷺ ڕێگای بەویشدا کە بەشـداریی بکات لە جەنگی ئوحوددا[1].

**دوازدەیەم**:- سەرەنـجام جـەنگ دەسـتپێدەکاو پێغەمبـەر ﷺ تـەوجیهات دەنێـرێ‌و هەرکەسەی لە شوێنی خۆی دادەنێ، وە(حـمـزة)ی مـامی پێغەمبـەر ﷺ هـەر لـە سەرەتای جەنگدا دەورێکی گرنگ دەبینێ‌و ژمارەیەك لە سەرانی کوفر بەدەستی ئـەو دەکوژرێن، (وەحشی) دەگێڕێتەوەو دەڵـێ:[2]من تـەنها لەبـەر یـەك شـت بەشـداریی ئەو جەنگەم کرد، ئەویش کوشتنی (حمزة)بوو، چونکە بـەڵێنم پـێ درابـوو، ئەگـەر ئەو بکوژم لە کۆیلایەتی ڕزگارم بێ‌و ئازادم بکەن، کە جەنگ دەسـتی پێکـرد، مـن تەنها بەدوای حەمزەدا دەگەڕام، چونکە هەر ئەوم مەبەست بوو، بـەڵام کـە تەماشـام کرد ئەو بە شـمشێرەکەی بەڕاسـت‌و چـەپدا خـەڵکی دەدڕێ‌و ڕووی لـە هەرکەسـێك کردبایە خۆی بۆ نەدەگرت، منیش خۆم لـێ مەڵاسداو کەمینم لـێگرت، هـەتا خـۆم لەگـەڵ ڕاسـت کـرد، ئیـدی حەربەکـەمم بـۆ هاویشـت، لەپشـتم داو لـەلای زگیـەوە دەرچوو، حەمزە ئاوڕی لـێ دامـەوەو منی بینی بۆم هات، بەڵام دەرفەتی نـەبوو، لـە ئەسپەکەی کەوتە خوارێ‌و تەواو بوو.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ص(١٧).

٢) سەرچاوەی پێشوو، ص(٢٠-٢١).

**سێزدەیەم** :- (مصعب بن عمیر)یش، کە ئالای گەورە (لواء)ی جەنگەکەی هەڵگرتبوو، کاتێك کە شەهید بوو، پێغەمبەر ﷺ ئالاکەی دایە دەستی (عەلی کوڕی ئەبوو طالیب) -ڕەزای خوای لێبێ-.

دیارە سەرەتا سوپای دوژمن تێکشکان‌و شپرزە بوون‌و خەریکی هەڵاتن بوون، بەڵام زۆربەی ئەو تیرهاوێژانەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر بەرزاییەکە دایناببوون، کاتێك سەرکەوتنی مسوڵمانانیان بینی‌و چاویان بە غەنیمەت‌و تێکشاکانی کافرەکان کەوت، سەرپێچییان لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کرد، هەرچەندە برا گەورەکەیان (عبدالله بن جبیر) پێی گوتن، کە نەچنە خوارێ، بەڵام ڕۆیشتن‌و ژمارەیەکی کەم لەگەڵ (عبدالله) لەسەر بەرزاییەکە مانەوە، کە کافرەکان بەوەیانزانی، خالیدی کوڕی وەلید، کە ئەوکات مسوڵمان نەبوو بوو، بەهێزەکەیەوە بەهەلی زانی‌و پشتی لەو چەند کەسە کەمەی، کە بەسەر بەرزایەکەوە مابوون گرت‌و هێرشی کردە سەریان‌و بە شەڕ کوشتنی، بەو شێوەیە کاتێك کافرەکان ئەو سەرکەوتنەی خۆیان بینی، وەخۆهاتنەوەو خۆیان گورج کردەوەو بەرەنگاری مسوڵمانان بوونەوەو لەسەر بەرزایەکەشەوە هێرشی خەستیان کردە سەر مسوڵمانان‌و زەرەرێکی زۆریان بە سوپای ئیسلام گەیاند،[1] وەك خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ وَالرَّسُولُ

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٣، ص(٢٤-٢٥)، وە (البداية والنهاية)، ج٤، ص(٢٨-٣٣).

يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡۗ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٥٣﴾ آل‌عمران

، واتە: خوا بەڵێنی خۆی بۆ بردنە سەر، کە دەتانکوشتن بە فەرمانی وی هەتا کاتێك کە بێهێز بوون چونکە ناکۆکییتان کەوتە نێوانو سەرپێچییتان (لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ) کرد، (بێگومان ئەگەر بە قسەی پێغەمبەریان کردبایە ناکۆکییان نەدەکەوتە نێوانو بێهێز نەدەبوونو دوژمنیش زەفەری پێ نەدەبردن)، ئنجا ئاماژە بە ڕیشەی ئەو سەرپێچی کردنە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ﴾ دوای ئەوەی کە شتێکی پێشان دان کە حەزتان لێدەکرد (کە مەبەست دەستکەوتە) ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾ هێندێکتان حەزی لە دونیایەو هەشتانە دوارۆژی دەوێ، (یەکێك لە هاوەڵان دەڵێ: تا ئەو کاتەش نەمزانی، کە لەنێو هاوەڵانی پێغەمبەردا کەسێك هەیە، کە دونیای خۆشدەوێ) کەواتە: کاری بە کۆمەڵ تاکە کەسێکیش دەتوانێ زەرەری لێ بدا، مادام لە شوێنێکی گرنگو هەستیار دانرابێ) ئنجا خوای پەروەردگار شکستی مسوڵمانان وەك دیمەنێك دەخاتە بەرچاوو دەفەرموێ: ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ﴾ کاتێك هەر دەڕۆیشتنو ئاوڕتان لەکەس نەدەدایەوەو هەڵدەهاتن ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ﴾ پێغەمبەریش لەدواوە بانگی دەکردن، کە بگەڕێنەوە مەیدان....

لەوبارەوە (عبدالله بن الزبير) لە (زبير بن عوام)ی باییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: من تەماشام دەکرد خڕخاڵەکانی پێی (هند)ی خێزانی (أبو سفيان)و ئافرەتەکانی دیکەی قوڕەیشم دەبینی کە خۆیان هەڵکردبوو، بۆ هەڵاتن، زۆر بەئاسانی دەمانتوانی بیانگرین، بەڵام زۆری نەخایاند تیرهاوێژەکانی ئێمە هاتنە خوارو پشتیان چۆڵ کردینو کۆمەڵێك سواری کافرەکان پشتیان لێ گرتینەوە، لەو کاتەدا

یەکێك هاواری کردو[١] گوتی: ئاگادار بن موحەممەد کوژرا! کە مسوڵمانان ئەوەیان گوێ لێبوو، زۆر دڵگرانو نارەحەت بوون، وە هێندێك لە ئیمان لاوازەکان گوتیان: مادام پێغەمبەر کوژراوە، ئێمە چی بکەین لێرەو پاشەکشەیان کرد، بەڵام (أنس بن النضر) گوتی: ئەدی ئێمە دوای پێغەمبەر ﷺ ژیانمان بۆچییە؟ گوتی: خوایە ئەوەی ئەو ئیمان لاوازانە دەیڵێن من لێی بەریم، ئنجا خۆی پێچایەوەو دەستی کرد بە جەنگ تا شەهید بوو.

(زوبەیر) دەڵێ: دوای ئەوەی کە کافرەکان پشتیان لێ گرتین شیرازەمان تێك چوو لە ئەنجامدا ئەو شکستەمان بەسەر هات، کە هات[٢].

**چواردەیەم** :- لەو جەنگەدا پێغەمبەر ﷺ بریندار بووەو ددانی موبارەکی شکاوەو خودەکەی لە هەردوو لاوە چۆتەوە نێو ڕوومەتیو لێوی موبارەکی بە خوێندا هاتوە، وە لەوبارەوە فەرموویەتی: {**اشتد غضب الله على قوم فعلوا هذا بنبيه، يشير الى رباعيته**} رواه البخاري[٣]، واتە: خوا زۆر تووڕەیە لە کۆمەڵێك ئاوا لە پێغەمبەری خوا دەکەنو ئاماژەی بۆ ددانی کرد.

خوای پەروەردگاریش لەوبارەوە ئەو ئایەتەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾﴾ آل عمران واتە: هیچ شتێك عائیدی تۆ نیە (ئەی موحەممەد) -خوا لێیان خۆش بێ- یان عەزابیان بدا، ئەوانە ستەمکارن، دیارە کاتێك سوپای ئیسلام شپرزەبوو،

---

١) هەندێك دەڵێن ئەوە شەیتان بووە هاواری کردوە، هێندێکیش دەڵێن (ابن قمئة اللَّيثي) بووە، کە (مصعب بن عمير)ی ئاڵاهەڵگری مسوڵمانانی کوشتوەو وایزانیوە پێغەمبەرە ﷺ بۆیە گوتوویەتی: (ألا قد قتلت محمداً)، ئاگاداربن موحەممەدم کوشت!، بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٢٢).

٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٢٤).

٣) صحيح البخاري: ٤٠٧٣.

پێغەمبەریش ﷺ زۆر مەترسی کەوتەسەر، بەڵام خۆی لە مەیدان ورەی دەدایە هاوەڵانیو چەند کەسێکی کەمیش لە دەوری بوونو دیفاعیان لێدەکرد، ئەوەی بە پلەی یەکەم لەو ڕووەوە دەوری هەبوو (طلحة بن عبيدالله) بوو.

(ابن هشام) هێناویەتی لە (أبي سعيد الخدري)یەوە کە (عتبة بن أبي وقاص) ددانی خوارەوەی لای ڕاستی پێغەمبەر ﷺی شکاندوەو ڕوومەتو لێوی موبارەکی بەخوێندا هێناوە، ئەویش بەهۆی بەرد پێدادانەوە[1].

**پازدەیەم** :- دوای ئەوەی کە مسوڵمانان دەستیان کردە جەنازە کۆکردنەوە، پێغەمبەر ﷺ لە حەمزەی مامی دەگەڕا، کە تەماشای کرد جەنازەکەی کەوتبوو، ورگیان دڕی بوو، جەرگیان دەرهێنابوو وە هەردوو گوێو لووتیشیان بڕیبوو، کە (هند)ی خێزانی (ابو سفيان) دوای ئەوەی (حمزة) شەهید بوو بوو، بەو کارە خراپە هەستاو بوو، پێغەمبەر ﷺ لە بەرانبەر ئەو دیمەنەدا زۆر ناڕەحەت بوو، بۆیە فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر خوا بەسەر قوڕەیشدا سەرم بخات، سی کەسیان لێ وا لێدەکەمەوە، واتە: ورگیان دەدڕمو لووتو گوێیان دەبڕم! خوای بەرزیش لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾﴾ النحل، واتە: وە ئەگەر دوژمنانتان سزادان وەکو سزایان بۆ ئێوە سزایان بدەن، وە ئەگەر ئارام بگرن ئەوە بێگومان بۆ خۆڕاگران باشترە، وە ئارام بگرەو

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٢٥).

ئارامگرتنیشت تەنیا بە خوایە، وە خەفەتیان لێ مەخۆ، وە بەهۆی پیلانگێڕانیانەوە دڵتەنگ مەبە[1].

(حنظلة بن أبي عامر)یش کاتێك لە مەیدانی جەنگدا ڕووبەڕووی (أبو سفیان) بۆوەو لە ئەرزێی داو خستیو چۆ سەر سینگی، لەوکاتەدا (شداد بن الأسود) کە بینی (حنظلة) (أبو سفیان)ی بەزەویدا خستوە، لەپشتەوەڕا لێیداو (حنظلة)ی شەهید کرد، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فریشتەکان (حنظلة) دەشۆن، کە لە خێزانەکەیان پرسی، گوتی: (حنظلة) خۆشۆردنی جەنابەتی لەسەربووو لەبەر پەلەکردنی بۆ بەشداریی لەو جەنگەدا نەیتوانی خۆی بشوات[2].

(إبن هشام) دەربارەی ناشتنی شەهیدەکان دەڵێ[3] :-

دوایی هێندێك لە خەڵکەکە ویستیان جەنازەی کوژراوەکان بەرنەوە بۆ (مەدینە) بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{ادفنوهم حيث صُرِعوا}**، واتە: کوژراوەکان لەو شوێنە بنێژن، کە لێی کوژراون، ئنجا دوو دووو سێ سێ لە قەبرێکدا ناشتیانن‌و ئەوەی زیاتر قورئانی لەبەربووایە لەپێش ئەوانی دیکەدا دەیانخستنە گۆڕەوە، وە لەنێو کوژراوەکانی سوپای ئیسلامدا هەریەك لە: (حمزة بن عبدالمطلب ومصعب بن عمیر وحنظلة بن أبي عامر وسعد بن الربیع) هەبوون، کە پیاوانی بەرجەستەبوون، وە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی شەهیدانی ئوحوودەوە فەرموویەتی: **{أنا شهيد على هؤلاء يوم القيامة}** رواه البخاري[4]، واتە: من لەڕۆژی دواییدا شایەدیی بۆ ئەوانە دەدەم! دوایی فەرمانی کرد، کە بە خوێنی خۆیانەوە بنێژرێن‌و نوێژی مردووشی لەسەر نەکردن.

---

١) رواه الطبراني في الكبير، والبيهقي في الكبرى، هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٥).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢٣).

٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٣٦).

٤) صحيح البخاري: ٤٠٧٩.

**شازدەیەم** :- کە جەنگ تەواوبوو (أبوسفیان) بانگی کرد گوتی: (أنعمت فعال، ان الحرب سجال، یوم بیوم، أُعل هبل) واتە: کاری باشمان کرد، شەڕیش بەنۆرەیە، ڕۆژێك بەڕۆژێك (بەدر بە ئوحود) هوبەل بەرز بکەنەوە، پێغەمبەر ﷺ بە عومەری فەرموو: هەڵسە جوابی بدەوەو بڵێ **{الله أعلى وأجل، لاسواء قتلانا في الجنّة وقتلاكم في النّار}**[1]، واتە: خوا بەرزترەو بەشکۆترە، وەکو یەك نین، کوژراوەکانمان لە بەهەشتنو کوژراوەکانتان لە دۆزەخ دان، (أبو سفیان) دەڵێ: (لنا العُزَّى ولاعُزَّى لكم)، واتە: ئێمە عوززامان هەیەو ئێوە عوززاتان نیە، پێغەمبەریش دەفەرموێ بڵێن: **{الله مولانا ولا مولا لكم}**[2] واتە: خوا پشتیوانی ئێمەیەو ئێوە پشتیوانتان نیە، ئنجا (أبو سفیان) لە عومەر دەپرسێ: ڕاستم پێ بڵێ موحەممەد کوژراوە یان نا؟! ئەویش دەڵێ: نەخێر نەکوژراوەو زیندوویەو گوێشی لە قسەکانتە، دوایی (ابو سفیان) دەڵێ: ساڵێکی دی لە بەدر بەیەك دەگەینەوە، پێغەمبەر ﷺ بە یەکێك لە هاوەڵانی دەفەرموێ: (بڵێ: باشە لەوێ بەیەك دەگەینەوە)[3].

سەرەنجامی شەڕەکەش (٢٢) کوژراو لە کافرەکانو (٦٥) شەهید لە مسوڵمانان دەبێ، کە زۆربەیان مسوڵمانانی پشتیوانان بوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێ[4].

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٣٤).
٢) (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٣٢).
٣) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٣٤).
٤) سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ص(٥٦-٥٧).

**حەڤدەیەم** :- بۆ دەرسو پەندوەرگرتن لە جەنگی ئوحود -کە دواتر بە درێژیی باسی دەکەین- خوا -عزّوجلّ- لە سوورەتی (آل عمران) لە ئایەتی (٢١)ەوە تاکو ئایەتی (٨٠) لە چەند شوێنێکدا باسی ڕووداوەکانی ئەو جەنگە دەکات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾﴾ آل عمران، واتە: ئایا کاتێك بەڵایەکتان تووش بوو لە جەنگی ئوحود، کە ئێوە دووقاتی ئەوەتان تووشی دوژمن کردبوو {لە جەنگی (بەدر)دا (٧٠) کەستان لێ کوشتنو (٧٠)شتان لێ بەدیل گرتن} گوتتان ئەوەی تووشمان بوو لەکوێوە هات؟، بڵێ: ئەوە خەتای خۆتان بوو (واتە: دوژمن بەهۆی شکاندنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺەوە پێتان وێرا)، بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستە.

هەروەها خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ ... ﴿١٥٥﴾﴾ آل عمران، واتە: ئەوانەتان، کە پشتیان لە دوژمن کرد لە ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا، ئەوانە شەیتان هەڵی خەڵەتاندن بەهۆی هەندێك لە گوناحەکانیانەوە، کەواتە: ئەو گوناحو کەموکوڕییانەی، کە ئینسان هەیتی، لەکاتی دژواردا دەبنە هۆی شکستی، هەروەکو چۆن پارێزکارییو دینداریيو خواپەرستیش دەبێتە هۆی خۆڕاگرییو سەرکەوتنی ئینسان.

جا هەرچەندە مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا شکستیان خوارد، بەڵام ئەو دەرسو پەندانەی لە جەنگی ئوحود وەردەگیرێن، زۆر گەورەترن لەوەندە زیانو زەرەرەی، کە کردوویانە، هەرچەندە ئەویش هەر بردنەوەو قازانجە!

شایانی باسە لە جەنگی ئوحوددا ئافرەتانی مسوڵمان بەشدارییان کردوە، بە ئاو هێنانو ئامادەکردنی خواردنو تەداویکردنی بریندارەکانو گواستنەوەی جەنازەکان بۆ مەدینە، کە (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێ- یەکێك بووە لەوانە، وەك (رُبيّع بنت معوذ) دەڵێ: (كُنَّا مع النبِيّ ﷺ نَسْقي ونُداوي الجرحى ونَرُدُّ القتلى) لە ڕیوایەتێکی دیکەدا: (كنّا نغزو مع النبِي ﷺ فنَسقي القوم وَنَخْدُمهم وَنَردُّ الجَرْحى والقتلى الى المدينة)، وە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا: (كنّا نغزو مع رسول الله ﷺ نَسْقي القوم وَنَخْدُمهم وَنردُّ القتلى والجَرْحى والقَتْلى الى المدينة) رواه البخاري[١].

## حیکمەتو دەرسو پەندەکانی جەنگی ئوحود:-

خوای زاناو توانا لە سوورەتی (آل عمران)دا، (٦٠) ئایەتی بۆ باسکردنی ئەو جەنگە تەرخان کردوە، لە ئایەتی (١٢١) تا ئایەتی (١٨٠)، خوا (جل شأنه) لەم ئایەتانەدا چۆنیەتی ڕوودانی ئەو جەنگەو ڕووداوو کارەساتەکانی باس دەکات، کە چەندین پەندو حیکمەتیان لێ وەردەگیرێنو، ئێمە لێرەدا بیستو یەك حیکمەتو پەند باس دەکەین:-

### ١- ڕووبەڕووبوونەوەی حەقو ناهەق شتێکی مسۆگەرە:-

خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ آل عمران، لێرەدا خوای پەروەردگار یەکێك لە یاساو سوننەتەکانی خۆی لە

---

١) صحيح البخاري: ٢٨٨٢، و: ٥٦٧٩.

ژیـانی بەشـەردا دەخاتـە ڕوو، کـە بریتیـە لـە ڕووبەڕووبوونـەوەو بەرەنگاربوونـەوەی (حەق)ێك کە لە پەیامو ڕێبازی پێغەمبەرانو شوێنکەوتووانی پێغەمبەراندا بەرجەستە دەبێ، وە (باطل)ێك کە لە ڕێچکەکانی ئەوانەدا کە ناحەزو نەیارانی پێغەمبەرانن (علیە الصلاة والسلام) بەرجەستە دەبێ، ئەوە یاسایەکی خواییە، ئایەتەکە دەفەرموێ: لە پـێش ئێـوەدا زۆر یاسـا تێپـەڕیون، دەجـا بـە زەویـدا بـڕۆن (تەماشـای مێـژوو یـان شـوێنەواری پێشـینان بکـەن)، سـەرنج بـدەن سـەرەنجامی ئەوانـەی، کـە خـواو پێغەمبەرانییان بەدرۆ زانیوە چۆن بووە!! ئەم یاسا خواییە ڕوونکردنەوەیەکە بۆ خەڵكو ڕێنماییکەرو ئامۆژگارییشە بۆ پارێزکاران، کـە ئەمـە یەکەمیـن دەرسو پەندە لـە جـەنگی ئوحـود وەردەگـیرێ، وە ئـەوە شـتێکی زۆر گرنگـە کـە ئێمـە بزانیـن، بەرەنگاربوونەوەو بەگژداچوونی (باطل) بۆ (حق) یاسایەکی خوایە لە ژیـانی بەشـەردا، هـەر لـەو ڕۆژەوە، کـە ئـادەم (علیـە الصـلاة والسـلام) پـەیامو بەرنامـەی خـوای پەروەردگـاری هێناوە تا پێغەمبەری خاتەم (علیە الصلاة والسلام) وە تا دوا ئیماندارو کـافر لەسـەر ئـەم زەویـە دەژیـن، ئـەوە هـەر بەردەوامـە، لـە هـەر کـاتو سـەردەمو قۆناغێکدا بە شـێوەیەك.

## ٢- سـەرکەوتن بۆ ئەهلـی ئیمانـە :-

سەرکەوتنو زاڵبوونو بردنەوە بۆ ئەوانەیە، کە خاوەنی ئیمـانی ڕاسـتەقینەن، وەکـو خـوای پـەنهانزان دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾﴾ آل عمران، لێرەدا خوای زاناو شارەزا بە ئیمانداران دەفەرموێ، دیـارە سەرەتا بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە لەو جەنگەدا (٦٥) یانی لـێ شەهید بوون، وە کۆمـەڵێکیشیان لـێ بریندار بوون، پێغەمبەر ﷺ یـەکێکیان بـوو، پێیـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟﴾، واتە: مـەترسێن، بێهێـز مـەبن، چونکە (وهـن) هـەم بـەمانای ترسـان

www.alibapir.com

(جبـن) وە هـەم بـەمانای بێهێزیـی (ضـعف) دێ ﴿وَلَا تَحۡزَنُواْ﴾ وە غـەمو پـەژارەش دامـەگرن، ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ وە دڵنیا بن هەر ئێوە لەسـەرەوە دەبـن (براوە دەبن) ئەگەر خاوەن ئیمان بن، دیارە ئیمانی ڕاستەقینە مەبەستە، دەشـگونجێ مەبەست ئەوەبێ، کـە ئەگـەر لـە دنیاشـدا بەڕواڵـەت ژێـر بکـەون، لەقیامـەتدا هـەر سەرکەوتوو و سەرفرازن.

هـەروەها لـە شـوێنێکی دیکـەدا دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ﴿٧﴾﴾ محمـد، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ئەگەر خـوا سەربخەن (واتە: پێغەمبەری خوا، دینو پەیامو بەرنامەی خوا) بەتەئکیـد خـوا سـەرتان دەخاتو پێیەکانیشتان لە مەیداندا دەچەسپێنێ.

**٣و٤- کـافرانیش ئـازار دەبینن‌و سـەرکەوتنیش بەنۆرەیـە :-**

بێگومان ئەهلی کوفریش وەکو ئـەهلی ئیمـان ئازاریـان پێدەگـات، وە سـەرکەوتن‌و تێشکانیش بەنۆرەیە، کەواتە مەرج نیە ئەگەر کۆمەڵێك ئیماندار بـوون، هەمیشـە لـە جەنگەکانیاندا هەر سەرکەوتوو بن، بەڵکو هێندێك جار بەهۆی کەم‌وکووڕیی خۆیانـەوە شکسـت دێـنن‌و لـە جەنگـدا دەدۆڕێنـــن، کـە پێویســـتە پەنـدی لـێوەربگرن، بـەڵام سەرەنجام هەر بۆ ئەهلی ئیمانە، وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿...إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾﴾ هود، واتە: ئارام بگرە بێگومان سەرەنجام بۆ پارێزکارانە، جـا خـوا -عزّ وجلّ- ئەو دوو ڕاستییە دەخاتـەڕووو دەفـەرموێ: ﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ ... ﴿١٤٠﴾﴾ آل عمـران، واتە: ئەگەر ئێوە ئازارێکتان پێ گەیشتوەو برینێکتـان تـێبووە، ئـەوانیش وەکـو ئێـوە ئازاریان پێگەیشتوەو برینیان تێبووەو، ئەو ڕۆژانەش (کە سەرکەوتنیان تێـدا وەدەست

دێ) دەستاو دەستیان پێ دەکەین لەنێو خەڵکیدا، واتە: جارجار ئەهلی ئیمان سەردەکەونو، جارجاریش ئەهلی کوفر، بەڵام سەرەنجامو بردنەوەو سەرکەوتنی یەکجارەکی، هەر بۆ ئەهلی ئیمانە، هەروەها خوای پەروەردگار لەوبارەوە لە جێیەکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿...إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾﴾ النساء، واتە: ئەگەر ئێوە ئازارتان پێ دەگات (لەکاتێکدا، کە لەگەڵ ئەهلی کوفردا ڕووبەڕوو دەبنەوە) بێگومان ئەوانیش وەکو ئێوە ئازاریان پێدەگات، بەڵام ئێوە چاوەڕوانییەك لەخوا دەکەن کە ئەوان ئەو چاوەڕوانییەیان نیە، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە.

## ٥و٦- کاتە سەختەکان ئەهلی ئیمان دەردەخەنو خوای زاناو شارەزا شەهیدان هەڵدەبژێرێ:-

ئەهلی ئیمان لە ڕووبەڕووبوونەوەدا دەناسرێن، وە لە سەختییەکاندا لە مەحەك دەدرێن، کەسانێکیش کە خوای پەروەردگار پێیان ڕەوا ببینێ بە شەهید هەڵیان دەبژێرێ، وەك خوا -عزّ وجلّ- دەفەرموێ: ﴿...وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾﴾ آل عمران، واتە: ئەم جەنگە هاتە پێش، تاکو ئەوانەی ئەهلی ئیمانن خوا بیانزانێو بیانناسێو، کۆمەڵێك شەهیدیشتان تێدا هەڵبژێرێ، {(اتخاذ) یانی: هەڵبژاردنو گوڵبژێرکردن، چونکە هەموو کەس شایستەی ئەوە نیە، کە خوا لە پێناوی دینی خۆیدا پلەی شەهیدی پێ ببەخشێ} ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، وە بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێ.

www.alibapir.com

لەم ئایەتەدا کاتێك کە خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ مەبەستی ئەوەیە خوا ئیمانداران بە کردەوەی خۆیانو لە مەیدانی واقیعدا بناسێ، ئەگەرنا خوای پەنهانزان بە زانیاری بێسنووری خۆی هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام بۆئەوەی مسوڵمانان لە مەیدانی واقیعدا بەرجەستە ببنو بناسرێن، پێویستییان بە مەیدانێك هەیە کە تێیدا ڕووبەڕوو ببنەوە، بۆ ئەوەی ئیمانو عەزمو ئازایەتیو دڵسۆزییان لەو مەیدانی جەنگو جیهادو خوێنو فرمێسكو ترسەدا دەرکەوێ.

### ٧و٨- مسوڵمانان دەپاڵێورێنو کافران خەفە دەبن :-

خوای پەروەردگار ئەو دوو ڕاستییەی بەمجۆرە خستوونە ڕوو، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَيَمْحَقَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾﴾ آل عمران، واتە: تاکو خوا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بیانپاڵێوێو لەبێژینگیان بدا، وە ئەوانەش کە بێبڕواو کافرن بێهێز بکا، (محق) بریتیە لە خەفەبوونو کزبوونو لاوازبوونی شتێك، یانی خوای تاكو پاك نایەوێ کافران لەنێوبەرێ، چونکە ئەو دونیایەی وا هەڵخستوە، کە کافریشو مسوڵمانیشی تێدا هەبن، وە بوونی جەنگو جیهادیش حیکمەتەکەی ئەوەیە، کە مسوڵمانان بەهێزبنو کافرو بێبڕوایانیش بێهێز بن بۆئەوەی کافران نەتوانن کوفری خۆیان بەسەر مسوڵماناندا بسەپێننو ستەمیان لێ بکەن، چونکە مسوڵمانان ئەگەر بەهێزیش بن دینەکەیان ڕێیان لێ دەگرێ، کە خۆیان بەسەر خەڵکیدا بسەپێننو دینی هەق بەزۆر بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن، وە ڕێگای دینداریی بەتاڵ لە ئەهلی کوفر بگرن، بەڵام ئەگەر ئەهلی کوفر دەسەڵاتیان هەبێ، دینە بەتاڵەکەی خۆیان بەسەر ئەهلی هەقدا دەسەپێنن، وە ڕێگای دینداریيان لێ دەگرن.

www.alibapir.com


بۆیە یەکێك لە حیکمەتەکانی جەنگ‌و جیهاد ئەوەیە کە مسوڵمانان بتوانن ڕێگا لە ئەهلی کوفر بگرن کە دینی خۆیان بەزۆر بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن، تاکو دنیا ببێتە شوێنی تێدا تاقی کرانەوەو دوارۆژیش شوێنی ئەنجام وەرگرتنەوەیە.

هەروەها لەوبارەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْۗ ...﴿١٥٤﴾﴾ آل عمران، واتە: وە بۆ ئەوەی خوا ئەوەی لە سینەکانتاندا هەیە دەریبخات، وە ئەوەی کە لە دڵەکانتاندا هەیە، بیپاڵێوێ.

ئاشکراشە ئینسان، کە دەکەوێتە نێو سەختیی‌و نارەحەتییانەوە لەخۆی تێدەگاو غیرەت‌و ئازایەتیی دەردەکەوێ‌و، خۆیشی‌و خەڵکیش دەناسێ‌و هەڵدەسەنگێنێ.

لەوانەیە کەسی وا هەبێت بڵێ من شەهیدییم زۆر خۆشدەوێ‌و هەرکاتێك لەگەڵی ڕووبەڕووبوومەوە زۆر بە سینە فراوانییەوە باوەشی بۆ دەگرمەوەو لە مردنێ ناترسێم، بەڵام کە تووشی گرفت‌و شوێنی ترسناك بوو، ئنجا لە خۆی حاڵی دەبێ، کە ئایا ئەو بۆچوونەی ڕاستە یان نا؟!

بۆ وێنە من جارێك لەگەڵ برایەك کەوتینە حاڵەتێکی ناخۆشەوە، گرتیانین‌و هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردین، ئەو برایە حاڵەتی دەروونی تێکچووبوو، دوای ئەوەی کە نەجاتمان بوو پێی گوتم: فلان کەس، وەڵلاهی من وامزانی، ئەگەر لەگەڵ مردنێ ڕووبەڕووبوومەوە زۆرم پێخۆشە شەهید بم!، بەڵام ئێستا دەترسم ئیمانەکەم تەواو نەبێ، چونکە ئەوەی ڕاستی بێ ئەوکاتەی هەڕەشەیان لێکردین پێم ناخۆش بوو شەهید بم، منیش گوتم: ئینسان بەشێوەیەکی سروشتی مردنی پێخۆش نیە، بەڵام بەتەئکید تا ئیمانیشی بەهێزتربێ کەمتر لە مردنێ دەترسێ.

www.alibapir.com


**٩- بێ جیهاد بەهەشت وەدەست نایەت :-**

بەبێ جیهادو خۆڕاگریی لە مەیدانو چەسپین لە بەرانبەر ناخۆشیەکاندا، نابێ ئینسان بەهیوای چوونە بەهەشت بێ، چونکە هەرکەسێك خۆڕاگریی و تێکۆشانی نەبێ لەڕێی خواداو لە کاتێکدا، کە ئیسلام پێویستی پێیەتیو واجبی کردوە، بەتەمای بەهەشتیش بێ، ئەوە خەیاڵ پڵاوی کردوە، خوا تبارك وتعالى ئاوا ئەم حەقیقەتە دەردەخاتو دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾﴾ آل عمران، واتە: ئایا بەتەمان بچنە بەهەشتێ بەر لەوەی خوا بزانێ کامانەتانن ئەوانەی تێدەکۆشنو ئەوانەتان، کە خۆڕاگرن لە مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەدا؟! یانی: تا نەکەونە مەیدانی جەنگو جیهادو خۆڕاگرییەوە لەبەرانبەر گرفتاریی و نارەحەتییەکاندا، وە هەتا ئەو بڕوانامەیەتان پێ نەبێ، بەتەمای چوونە بەهەشتێ مەبن، چونکە لەم ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن شێوازی پرسیارکردنی نکوولّیکردن (الأستفهام الأنكاري) بەکارهێناوەو دەفەرموێ: من ئینکاریی دەکەم لەوەی بچنە بەهەشتێ، پێش ئەوەی ببنە موجاهیدو تێکۆشەرو جەنگاوەر لە ڕێی خواداو خۆڕاگربن لە مەیدانی ڕووبەڕووبونەوەدا.

**١٠- پەیوەست بوون بەخواوە، نەك بە هیچ کەسێك :-**

حیکمەتو پەندی دەیەم بریتیە لە پەیوەست بوون بەخواو دینی خواوە، نەك بە (شخص)ەوە، وەك خوای پەروەردگار ڕوو لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەکاتو لەگەڵ هەموو مسوڵمانانیشیەتیو دەفەرموێ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِي۟ن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًۭٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ آل عمران، واتە: موحەممەد ﷺ پێغەمبەرێکە، کە لەپێش ئەویشدا پێغەمبەرانی دیکە تێپەڕیون جا

ئایا کاتێك، کە ئەو وەفاتی کرد یان کوژرا دەبێ هەڵگەڕێنەوەو پاشگەز ببنەوەو لەسەر پاژنە پێتان بەرەو دواوە بچنەوە؟! هەرکەسێك لەسەر دوو پاژنە پێیانی بگەڕێتەوەو پاشگەز ببێتەوە، هیچ زیانێك بە خوا ناگەیەنێ، وە خوا پاداشتی شوکرانە بژێران دەداتەوە.

لێرەدا خوای کاربەجێ ئەو دەرسو پەندە دەدا بەئەهلی ئیمان، کە ئەگەر ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی فەرموو، یان کوژرا، نابێ هەڵبگەڕێنەوەو پەیوەست بن بە خودی پێغەمبەرەوە ﷺو بەهیچ کەسێکی دیکەشەوە، بەو مانایە کە ئەگەر ئەو کەسە نەما، یان شتێکی بەسەر هات، ئەوان سارد ببنەوە، وە ئەو ڕاستییەش مسوڵمانان زۆر سوودیان لێ بینی، چونکە کاتێ، کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، مسوڵمانان زۆر پەشۆکانو هەژان بەڵام (أبوبکر) -خوا لێی ڕازی بێ- هەڵوێستەکەی ڕاستکردەوەو گوتی: (من كان يعبد محمداً فان محمداً قد مات ومن كان يعبد الله فان الله حي لايموت) رواه البخاري[1]، واتە: هەرکەسێك موحەممەدی دەپەرست، ئەوە موحەممەد مردو وەفاتی کرد، بەڵام هەرکەسێك کە خوای دەپەرست، ئەوە خوا زیندووەو نامرێ، وە ئەم ئایەتەشی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾.

کەواتە: ئێمەش دەبێ پەیوەست بین بە خوای پەروەردگارو پەیامو بەرنامەکەیەوە، چونکە ئێمە بەندەی خواین، وە ئەو کەسەش کە لە نێوانماندایەو سەرپەرشتیان دەکاو دینی خوامان لێ حاڵی دەکاو پێشمان دەکەوێ، ئەوە بەرێی خوادا پێشمان دەکەوێو ئەگەر ئەویش نەما ڕێگاکە هەر دەمێنێ، وە خوای پەروەردگاریش هەر هەیەو نامرێ.

١) صحيح البخاري: ٤٤٥٣.

## ١١- ئەجەل دیاریکراوەو ئازایەتیی و ترسنۆکیی پێش و پاشی ناخات :

پێویستە هەموو کەسێك ئەو ڕاستییە بزانێ، کە نەمردن بەهۆی ئازایەتییەوە دێتە پێش و نە لە ئەنجامی ترسنۆکییشدا ئینسان سەلامەت دەبێ و تەمەنی درێژ دەبێ، چونکە ئینسانی وا هەیە، زۆر ئازاو جەربەزەیەو تەمەنێکی زۆریش بەڕێ دەکا، ئینسانی واش هەیە زۆر ترسنۆکە، بەڵام بە یەکێك لە هۆیەکان کە دێتە پێش دەمرێ و دونیا بەجێدێڵێ، خوای تاك و پاك ئەم ڕاستییەی ئاوا ڕوونکردۆتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ... ﴿١٤٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: هیچ نەفسێك بۆی نیە بمرێ (ئەگەر بشیەوێ بمرێ) مەگەر بە فەرمانی خوا، وە نووسراوێکی دیاریکراویشی هەیە، (واتە: مردن کاتێکی دیاریکراوە)، کەواتە: نە ترسنۆکیی ئینسان لە مردنێ دوور دەخاتەوەو، نە ئازایەتییش مردنێ وەپێش دەخات، بەڵام ئینسان لەسەر ئازایەتیی پاداشتی هەیە، وە لەسەر ترسنۆکییش سزای هەیە، دیارە ئازایەتییەك کە لە شوێنی خۆیدا بێ و هەڵەشەیی (تهوّر) نەبێ، چونکە خۆپێدادانێك کە پێوست نەبێ، ناپەسەندە، کەواتە: نە ترسنۆکیی و نە هەڵەشەیی، وە ئەوەی لە نێوەڕاستی ئەو دووەدایە، بریتیە لە ئازایەتیی.

## ١٢- ئەنجام بە پێی کارو تێکۆشانە:-

بێگومان ئەهلی ئیمان و ئەهلی کوفر هەرکاتێك بەئەندازەی ئەوە کە ڕەنج دەدەن و تێکۆشان دەکەن و بۆ مەبەستێك هەوڵ دەدەن، ئەنجامیان دەستگیر دەبێ، ئەوەش یاسایەکی خوایەو ڕاستییەکەو لەوبارەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ...وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: وە هەرکەسێك پاداشتی دونیای بوێ، لێی دەیدەینێ، وە

هەر کەسێکیش بەرهەمی دوارۆژی بوێ، لێی دەیدەینێ، وە پاداشتی شوکرانەبژێران دەدەینەوە.

کەواتە: ئێمە کە ئەهلی کوفر دەبینین دەسەڵاتو توانایان هەیەو بەرەو پێش دەچن، ئەوە سوننەتو یاسای خوایە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩ ﴾ النجم، واتە: وە بۆ ئینسان نیە مەگەر ئەو ئەندازەیەی، کە هەوڵدەداو تێدەکۆشێ، کەواتە: هەر ئینسانێك تێبکۆشێ، بە ئەندازەی تێکۆشانەکەی بەرهەمی دەستدەکەوێ، چ کافر بێ چ مسوڵمان.

## ١٣و١٤- ئەهلی ئیمان ئازاو چەسپیونو سەرکەوتنیان مسۆگەرە :-

ئەوانەی کە بۆ خوا یەکلابوونەوەو مسوڵمانانی ڕەببانین:-

١) ترسو بەزینو تەسلیم بوون نازانن‌و ئازاو بە ورەو چەسپیون.

٢) سەرکەوتنی دونیاو دوارۆژیان مسۆگەرە.

ئەم دوو ڕاستییەشمان لەم دوو ئایەتانەدا بۆ دەردەکەوێ، کە خوای زانا تێیاندا فەرموویەتی: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٦ ﴾ آل عمران، واتە: زۆر لە پێغەمبەران کەسانی ڕەببانی زۆر لەگەڵیاندا جەنگیان کرد، {(ربیون) واتە: (ربانیون) کەسانێك کەسەر بە پەروەردگار بن، وە خۆیان بۆ خوای پەروەردگار ساغو یەکلا کردبێتەوە} ﴿فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْ﴾ واتە: بەهۆی ئەو شتەی کە دەهاتە ڕێیان لە بەڵاو نارەحەتیی لەڕێی خوادا ترسیان تووش نەهاتو، وە بێهێز نەبوونو لاڵانەوەو پاڕانەوەشیان نەبوو لە بەرانبەر ئەهلی کوفردا، ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ وە خوا خۆڕاگرانیی خۆشدەوێ، ئنجا دەفەرموێ:

www.alibapir.com


﴿ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ ﴾ آل عمران، واتە: تەنها قسەشیان لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا ئەوەبوو، کە دەیانگوت پەروەردگارمان! لە گوناحەکانمانو زیادەڕۆیی کردنمان ببوورە، وە پێیەکانمان بچسپێنەو بەسەر کافراندا سەرمانخە. لە سەرەتاوە داوایان لە خوا کردوە، کە لە گوناحەکانیان ببووریّ، چونکە بەهۆی گوناحەکانیانەوە شکست دەخۆن، عومەری کوڕی خەتتاب -خوا لێی ڕازی بێ- لە کاتێکدا، کە سوپایەکی دەنارد بۆ شوێنێك پێی دەگوتن: ئاگاتان لە گوناحەکانتان بێ، سوێند بە خوا من لە گوناحەکانتان زیاتر دەترسێم، کە بەهۆیانەوە تووشی زیان بن وەك لە دوژمن، چونکە دوژمنەکەشتان بەهۆی گوناحەکانی خۆتانەوە پێتان دەوێری!

دیارە سوپای ئەهلی ئیمان هیچ کاتێك بە ژمارەو پێداویستی جەنگی، لەگەڵ ئەهلی کوفردا هاوتەرازوو نەبوونو، هەمیشە ئەهلی کوفر ژمارەیان زیاتر بووەو پێداویستی جەنگیشیان زۆرترو چاکتر بووە، بەڵام ئەهلی ئیمان بەهۆی ئیمانو فەرمانبەرییان بۆ خواو بەهۆی پارێزکارییانەوە، تاتەرازووی جەنگیان بەلای خۆیاندا شکاندۆتەوەو، بەسەر دوژمنانی ئیسلامدا زاڵ بوون، بۆیە ئەو ڕەببانییانە سەرەتا داوا لە خوای پەروەردگار دەکەن، کە لە گوناحو زیادەڕۆییان ببووریّ، ئنجا دەڵێن: خوایە پێیەکانمان بچەسپێنەو سەرمانخە بەسەر کافراندا، دوایی دەفەرمویّ: ﴿ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْءَاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾ ﴾ آل عمران، واتە: خوا پاداشتی دونیای دانەوەو، پاداشتی باشی دوارۆژیش، خوا چاکەکارانی خۆشدەوێت.

## ١٥- تێشکانو دۆڕان پەیوەندی بە ناخو نێوەوەی مرۆڤەوە هەیە :-

هۆکارەکانی شکست هێنان زیاتر پەیوەندییان بە خودی ئینسانو دڵو دەروونییەوە هەیە، نەك بەلایەنی دەرەکیی، لەبارەی ئەو حەقیقەتەشەوە خوای بێ وێنە دەفەرمویّ:

﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ... ﴿١٥٢﴾ ﴾ آل عمـران، واتـە: وەخـوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ ئێوەدا ڕاست بردە سەر، کە کافرەکانتان دەکوشت بە ئیزنو فەرمانی خوا، هەتا کاتێك کە تووشی فەشەلو تێشکان بوون، وە لەنێو خۆتاندا ناکۆکییتان هەبووو سەرپێچییتان کرد، دوای ئەوەی شتێکی پێشاندان کە خۆشتان دەوێ (واتە: دەستکەوت) هەتانبوو دنیای دەویست، وە هەتانبوو دوارۆژی دەویست، کەواتە: ئەو هۆکارە خودی (ذاتي)یانە بوونە هۆی شکستی ئێوە، هەروەها هەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ ... ﴿١٦٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: ئایا کە بەڵایەکتان تووش بوو (لە غەزای ئوحوددا) کە پێشتر دووقاتی ئەوەتان تووشی دوژمن کردبوو (لە غەزای بەدردا)، گوتتان ئەوە لەکوێوە بوو؟! بڵێ: ئەوە لە خۆتانەوە بوو، بەهۆی خۆتانەوە دوژمن زەفەری پێ بردن، نەك بەهۆی ئازایەتیی خۆیەوە.

## ١٦- سۆزو نەرمو نیانیی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا :-

وەك لەو جەنگەدا دەردەکەوێ پێویستە برا گەورە لەگەڵ شوێنکەوتووانی خۆیدا نەرمونیانو بەسۆز بێتو چاوپۆشی لە کەموکوڕییەکانیان بکاتو هەڵوێستێکی وایان لەگەڵ بەکار بێنێ، کە ببێتە مایەی بەخۆداچوونەوەو پەند وەرگرتن لە هەڵەکان، نەك بە سەرزەنشتو تووڕەبوون شوێنکەوتووانی یەکجاریی بڕووخێنێ، کەواتە: نەرمو نیانییو لێبوردەیی پێغەمبەر ﷺ لە بەرانبەر تیر هاوێژەکانو... هتد، مایەی پەندو دەرسن.

خــوای بەبــەزەیی دەفــەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمــران، واتــە: تــۆ (ئــەی موحەممەد) بەهۆی بەزەیی خواوە لەگـەڵیان نـەرم بـووی، وە ئەگـەر قسـە ڕەق‌و دڵـڕەق بوویای (ئەو هاوەڵە بەڕێزانـەت) لـە دەورەت دەپـڕژان، چـاو پۆشـییان لێ بکـەو داوای لێبوردنیان بۆ بکە لە خوا، وە ڕاوێژیشیان پێ بکە لە کاروباردا، ئەگـەر بڕیاریشـتدا وە دڵت چەسپی لەسەر شتێك، پشت بە خوا ببەسـتەو جـێ بـەجێی بکـە، بێگومـان خـوا ئەوانەی خۆش دەوێ، کە پشتی پێ دەبەستن.

## ١٧- سـەرکەوتن‌و ژێرکـەوتن هەردووکیان بەدەست خوان :-

خوای زاناو توانا لەوبارەوە دەفـەرموێ: ﴿ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾ آل عمران، واتە: ئەگەر خوا سەرتان بخات هیچ کـەس ناتوانـێ بەسـەرتاندا زاڵ بـێ، وە ئەگەر ئەو پشتتان بەردا، کێ دەتوانێ جگە لەو سەرتان بخا! دەبا بڕواداران پشـت هـەر بە خوا ببەستن، کەواتە: سەرکەوتن‌و ژێرکەوتن هەر لەخوا بزانن‌و خوای پـەروەردگاریش بـەهۆی ئـەوە سـەرتان دەخـا کـە پابەنـد بـن بـە بەرنامەکەیـەوەو هۆکـارە مـاددیی‌و مەعنەوییەکان کە خوا دیاری کردوون ڕەچاو بکەن، وە بەهۆی ئەوەشەوە ژێـر دەکـەون، کە لە بەرنامەکەی لابدەن‌و ناڕێکیی لە کارەکانتاندا هەبێ.

## ١٨- کـوژراوانی ڕێی خـوا نـەمردوون‌و زینـدوون :-

ڕاستییەکی دیکە ئەوەیە کە کوژراوانی ڕێی خوا زیندوون، وە لەلایەن خواوە ڕۆزیـی تایبەتییـان دەدرێتـێ، خـوای پەروەردگـار لەوبـارەوە دەفـەرموێ:﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ

ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتَۢاۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ آل عمران، واتە: پێتان وا نەبێ، کە ئەوانەی لە ڕێی خوادا کوژراون، مردوون، بەڵکو ئەوانە زیندوون وە لەلایەن خواوە ڕۆزی تایبەتییان دەدرێتێ، دڵخۆشن بەوەی کە خوا لە بەخششی خۆی پێیداون وە مژدەش دەدەن بەوانەی کە لەدوای ئەوانەوە دێنو جارێ پێیان نەگەیشتوون، کە ترسو غەمو پەژارەیان نابێو، دڵخۆشن بە چاکەو بەخششی خوا وە بێگومان خوا پاداشتی ئیمانداران زایە ناکا.

لەوبارەوە (ابن هشام)[1] هێناویەتی کە (ابن اسحاق) لە (ابن عباس)ەوە گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**لما أصيب إخوانكم بأحد جعل الله أرواحهم في أجواف طير خضر ترد أنهار الجنّة وتأكل من ثمارها وتأوي الى قناديل من ذهب في ظل العرش، فلما وجدوا طيب مشربهم ومأكلهم وحسن مقيلهم، قالوا: ياليت اخواننا يعلمون ما صنع الله بنا لئلا يزهدوا في الجهاد، ولا ينكلوا عن الحرب، فقال الله فاني أبلغهم عنكم، فأنزل الله على رسوله ﷺ الآيات** - وَلَا تَحْسَبَنَّ ...-}، واتە: دوای ئەوەی برایەکانتان لە جەنگی ئوحوددا کوژران، خوا ڕووحەکانییانی خستە نێو لەشی باڵندە سەوزەکانەوە، کە دەچنە سەر ڕووبارەکانی بەهەشتو لە میوەکەی دەخۆنو دەچنەوە نێو چەند تاقێکی زێڕین لە سێبەری عەرشدا، جا کاتێك ئەو خواردنو خواردنەوە خۆشو جێگاو ڕێگا پەسندەیان بینی، گوتیان: خۆزگە برایەکانمان زانیبایان خوا چی بۆ کردووین، تاکو جیهادکردنو جەنگ بەکەم نەگرنو پشتیان لێی سارد نەبێتەوە،

١) (السيرة النبوية لابن هشام) ج٣، ص(٥٢).

www.alibapir.com

خواش فەرمووی: من لەجیاتی ئێوە پێیان ڕادەگەیەنم، ئیدی ئەو ئایەتانەی ناردنە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ ... ﴾.

لێرەدا باس لە شەهیدانی ئوحود دەکات، کە لە نازو نیعمەتی خوادان لە بەهەشتو، بەئاوات دەخوازن برایانیان ئەو حاڵە خۆشەی ئەوان بزانن، بۆئەوەی تەمبەڵیی نەکەن لە جیهاددا.

**١٩ - لەکاتی سەختیی دا پاكو پیس لەیەك جیادەبنەوە :-**

بێگومان کە لە کاتی سەختییو جەنگو دژواریاندا، پاكو پیسی مسوڵمانان لێك جیا دەبنەوەو، ئەگەر ئەو جەنگەی ئوحود نەهاتبایە پێش، (عبدالله بن ٠ أبي)و ئەو هەموو خەڵکەی، کە لەگەڵیاندا بوون، چۆن لە مسوڵمانان جیا دەکرانەوەو، چۆن ئەو پاكو پیسە لەیەك هەڵدەوێردران، بۆیە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: خوا لە ئیمانداران ناگەڕێ وەکو ئەو حاڵەتەی ئێستایان (بەڵکو تاقییان دەکاتەوە) هەتا پاكو پیسیان لێك جیا دەکاتەوە (پاكو پیسی مسوڵمانانیش لەکاتی ڕوو بەڕوو بوونەوەیان لەگەڵ کوفردا دەردەکەوێ، کەکێ ئیماندارەو بەڕاستی خۆی بە خوا فرۆشتوە، وە کێش بە پێچەوانەوە یەو هەر بە ڕواڵەت مسوڵمانە)، وە خوا ئێوە لە پەنهانی خۆی ئاگادار ناکاتەوە، بەڵکو هەرکەسێك کە بیەوێ لە پێغەمبەرانی خۆی هەڵیدەبژێرێ، دەجا بڕوا بەخواو پێغەمبەرەکەی بێنن، وە ئەگەر بڕوا بێننو پارێز بکەن ئەوە پاداشتێکی مەزنتان هەیە.

کەواتە: لە کاتی سەختییو دژواریانداو لە مەیدانی ئەزموونو تاقی کردنەوەدا لێك حاڵی دەبنو لە خۆتان تێدەگەن، کە کێتان پاکەو ئەهلی ئیمانەو کێشتان پیسەو ئەهلی نیفاقە؟! خوای پەروەردگار ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە ئیمانەکەیان ئەوەندە بەهێزە لەکاتی تاقی کردنەوەدا دەردەچنو نەفسو ماڵیان بەخوا فرۆشتوەو بەس ڕەزامەندیی خوایان مەبەستە.

## ٢١,٢٠- شکاندنی فەرمانی برا گەورەو، هەڵبژاردنی دنیا بەسەر دوارۆژدا مایەی تێشکانو دۆڕانن :

بەڵێ شکاندنی فەرمانی برا گەورە مایەی تێکشکانو دۆڕانەو پەشیمانی لەدوایە، وەك لە هاتنە خوارێی زۆربەی تیرهاوێژەکانی سەر[1] بەرزایی ئوحوددا دەردەکەوێ، کە فەرمانی پێغەمبەریان ﷺ شکاندو سەرەنجام ئەو هەڵوێستەیان بوو بە مایەی تێشکانو زەرەرمەندی مسوڵمانان، وە خۆش ویستنی دونیاش بە شێوەیەك، کە بەسەر فەرمانی خواو پێغەمبەردا ﷺ هەڵبژێردرێ، بەهەمان شێوە مایەی تێکشکانە، کە لەو تیرهاوێژانە دیاریدا، کە بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگو شتی ماددیی شوێنی خۆیان چۆڵ کرد، ئەو دووانەش پەندو عیبرەتن بۆ مسوڵمانانو جێبەجێکردنی فەرمانی براگەورەو هەڵبژاردنی دوارۆژ بەسەر دونیادا، دوو هۆی سەرەکیین بۆ سەرکەوتنو، بە پێچەوانەشەوە سەرپێچیی لە فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺو هەڵبژاردنی دنیا دوو هۆی سەرەکیین بۆ ژێرکەوتن.

---

١) تیرهاوێژەکان لەسەر شاخۆلکەیەك بوون کە لەدامێن چیای ئوحودەوەیەو بە (جبل الرماة) ناسراوە، نەك خودی چیای ئوحود.

## کورتــە باسـێك دەربــارەی دیــاردەی نیــفاق و مونافیقــان

وەك لــە باســەکانی پێشــوودا ئاماژەمــان پێکــرد، ژمارەیــەك لــە هــەردوو تیــرەی (ئەوس‌و خــەزرەج)و هەنــدێك لــە جوولەکــەکانیش - دوای ئــەوەی پێغەمبــەر ﷺ لــە مەدینە نیشتەجێ بوو، وە دەوڵەت‌و کۆمەڵگای ئیسلامیی خــەملا، بەڕواڵــەت خۆیــان بە مسوڵمان نیشاندا، بەڵام لــە دڵ‌و دەروونــی خۆیانــدا کــافر بــوون، کــە ئەوانــە پێیــان دەگوترێ (منافق)ەکــان.

جا من لە پێنج خاڵاندا بە کورتی بۆتان باسی دیاردەی (نفاق)و مونافیقان دەکەم:

### یەکــەم: (نفــــاق) یــــانی چــــی؟!

زانایان دەڵێن: وشەی (نفــاق) لە دوو ڕیشەوە هاتوە، یان لە (نفــق)ەوە هاتوە، یا لــە (نافقـــاء)ەوە هاتوە، جا ئەگەر لە (نفــق)ەوە هاتبێ، (نفــق) بریتیە لە هەر کونێك دوو سەری هەبێ، (نافقـــاء)یش بریتیە لەو کونەی کــژە (جــرج) لــە بیابانــدا لێــی دەدا، وە ئەو کونەی، کە لێیەوە دێتە دەر جیایە لەو کونەی، کە لێیەوە دەچێتە ژوور، بەهــەمان شێوەش ئینسانی مونافیق شتێك دەردەخا جیایــە لــەوەی کــە پــەنهانی دەکــا، ئیســلام دەردەخــاو کــوفر پــەنهان دەکــا، هــەر بۆیــە هەنــدێ جار لــە کــوردەواری خۆمانــدا بــە مونافیقیــان گوتوە (دووڕوو)، کە باشتــر وایــە پێــی بگــوترێ (دەغــەڵ)، بەهــەر حاڵ وشەی (نفــاق) یا لە (نفــق)ەوە یان لە (نافقـــاء)ەوە هاتوە.

### دووەم: نیفــاق کــەی‌و بۆچــی ســەری هەڵــدا؟!

لــە ڕاســتیدا هــەر لەســەرەتای نیشــتەجێ بــوونی پێغەمبــەر ﷺ لــە مەدینــەداو پەیدابوونی هێزو دەسەڵاتی ئیسلام لە مەدینەو دەوروبەریدا، دیاردەی (نیفاق) دروست بووەو سەری هەڵداوە، کە لــە ســەرەتاوە بــە شێوەیەکی سادە بــوو، بــەڵام دواتــر ئــەو

www.alibapir.com


مەسەلەیە گەشەی کردو ئالۆز بوو، وە لە سەرەتاوە کە ئیسلام بێهێز بوو، زۆر لە کافرەکان خۆیان ناچار نەدەبینی بچنە حاڵەتی (نیفاق)ەوەو بێمنەت بوون لە ئیسلام، بۆ وێنە (عبدالله بن أبيّ)، کە جارێکیان پێغەمبەر ﷺ بە گوێدرێژێك بەلای مەجلیسەکەی (عبدالله بن أبيّ)دا تێپەڕ دەبێ‌و تۆزو خۆڵی بۆدەچێ، ئەویش خۆی دەمامك دەکاو دەڵێ:[١] ئەی کابرا ئەو دینەی، کە تۆ هێناوتە، ئەگەر حەقەو ڕاستە لە مەجلیسی خۆتدا دانیشەو خەڵك دێت‌و گوێت بۆ دەگرێ، بەڵام لە مەجلیس‌و جێگەو ڕێگای خۆماندا ئەزیەتمان مەدە، (عبدالله بن أبيّ) ئەو قسەیەی بە مەبەستێکی خراپ کردوەو ویستوویەتی پێغەمبەر ﷺ چالاکیی‌و جم‌وجۆڵی نەبێ‌و وەك چۆن بۆ ڕێنمایی خەڵك‌و ڕزگارکردنیان بەدوایاندا گەڕاوە، وا نەمێنی، وە ئەو قسەیەشی، کە کردوە بە ئاشکرا کردوویەتی‌و کاتێك بووە، کە کافرەکان شەرمیان لە ئیسلام‌و دەوڵەتەکەی نەکردوەو بەئاشکرا موشریك بوون.

بەڵام لە دواییدا خۆی‌و هەندێك لە هۆزو تیرەکەی، کە بینیان ڕۆژ بەڕۆژ ئیسلام بەهێز دەبێ، پەنایان بردە بەر دەغەڵیی‌و دووڕوویی، وە گوتیان: (هذا أمرٌ قد توَجَّه)، واتە: (ئەوە شتێکەو هاتوە)، کەواتە: پێویستە بزانرێ لە سەرەتادا کە ئیسلام کیان‌و دەوڵەتی نەبووە یان هەیبووە، بەڵام دەڵەمەو بێهێز بووە، کافرەکان بە ئاشکرا دژایەتی ئیسلامیان کردوەو مەبەست‌و هەڵوێستەکانیان دەرخستوە، بەڵام کە ئیسلام دەسەڵاتی پەیدا کردوە، نیفاق‌و دووڕوویی پەیدا بووەو کافرەکان کوفری خۆیان شاردۆتەوەو لەو ڕێیەوە زیانیان بە ئیسلام گەیاندوە.

ئێستاش‌و لەمەودواش نیفاق کاتێك پەیدا دەبێ، کە مسوڵمانان ئەندازەیەك دەسەڵاتیان هەبێ، ئەگەر نا لە کاتێکدا مسوڵمانان چەوسێنراوەو بێ دەسەڵات بن،

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٣١٦)، هەروەها بڕوانە: (صحيح البخاري): ٦٢٥٤، وە (صحيح مسلم): ٤٦٣٥.

www.alibapir.com

کەس ناچار نیە کوفرەکەی خۆی پەنهان بکات، بەڵکو بە ئاشکرا ئیعلانی کافرێتی خۆی دەکات.

وە هۆی پەیدابوونی نیفاقیش ئەوەبوو کە کافرەکان ویستیان زیانێکی زیاتر بە ئیسلام بگەیەنن، چونکە بابای موناڤیق زۆر لە بابای کافر بەزیانترە، چونکە مسوڵمان دەزانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ کەسانێك بکات، کە کوفرەکەی ئاشکرایەو دەزانێ چییە، بەڵام موناڤیق کافرێکی درۆزنو پەنهانەو شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵیدا بەزەحمەتەو، زۆرجار خەڵکی ساویلکەی مسوڵمانیش بەقسەو ڕەفتاری موناڤیقەکان هەڵدەخەڵەتێن!.

مەسەلەی نیفاقیش لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا لە مەدینە پەیدا بووە کاتێك کە دەوڵەتو کیانی ئیسلامیی دروست بووەو پەرەی سەندوە، ئەگەرنا لە مەککە کە کافرەکان بەهێزو باڵادەست بوون، دیاردەی نیفاقو موناڤیقان نەبووە.

## سێ: جۆرەکانی نیفاق :-

لە ڕاستیدا (نیفاق) یەك جۆری هەیە، وە وەکو زاراوەیەکی شەرعیی[1] بە کەسێك دەگوترێ: موناڤیق کە کافرێکی پەنهانبێ، بەڵام لە ئەنجامی هاتنی هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی نیفاقو موناڤیقەوە زانایان ناچار بوون بڵێن: دوو جۆر نیفاق هەیە، نیفاقی گەورەو نیفاقی گچکە، یان نیفاقی کردەیی‌و نیفاقی عەقیدەیی، مەبەستیشمان لە نیفاقی بچووك (نیفاقی کردەوە) ئەوەیە، کە کۆمەڵێك سیفەت، کە سیفەتی موناڤیقانن لە کەسێکدا دێنەدی، بەڵام کابرا لە دەروونی خۆیدا مسوڵمانەو کافر نیە، وەکو پێغەمبەر ﷺ لە چەند فەرمایشتێکیدا ئەو ڕاستییەی باسکردوە، یەکێك لەوانە دەفەرموێ: **{أربع من كن فيه كان منافقا خالصاً و**

---

١) موناڤیق: زاراوەیەکی شەرعییە، وە لە پێش ئیسلامدا ئەو زاراوەیە بۆ ئەو مەبەستەی، کە ئیسلام بەکاری هێناوە، بەکار نەهاتوە.

**إنّ كانت فيه خلّة منهن، كانت فيه خلّة من نفاق حتى يدعها: إذا حدّث كذب، وإذا عاهد غدر، وإذا وعد أخلف، وإذا خاصم فجر}** رواه البخاري ومسلم[1]، واتە: (چوار سیفەت لە هەرکەسێکدا هەبن ئەوا مونافقێکی تەواوە، وە هەر کەسێکیش یەکێك لەو سیفەتانەی تێدا بێ، ئەوە یەکێك لە سیفەتەکانی مونافیقانی تێدایە، تاکو دەستی لێ هەڵدەگرێ: (ئەو چوار سیفەتەش بریتین لەوەی کە) ئەگەر قسەیەکی کرد درۆ بکا، وە ئەگەر پەیمانیدا پەیمان بشکێنێ، وە ئەگەر بەڵێنیدا بەڵێنەکەی نەباتە سەر، وە لەکاتی مشتومڕو ناکۆکییدا سنوور ببەزێنێو تووشی گوناح بێت)، ئەو چوار سیفەتە لە هەر کەسێکدا هەبن مونافیقێکی تەواوە، وە هەر کەسێکیش یەکێکیانی تێدا بێت ئەوە بەشێك لە نیفاقی تێدایە، جا لەبارەی ئەوەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمایشتەیدا فەرموویەتی: مونافیقێکی تەواوە، زانایان گوتوویانە: یانی ئەوکەسە نیفاقی گچکەی بەتەواوی تێدا هاتۆتە دی، نەك بووبێتە ئەو مونافیقەی، کە بەشی بە ئیسلامەوە نەما بێت، چونکە هیچ کام لەو سیفەتانە پەیوەندی بە عەقیدەوە نیە، بەڵام هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: هەرکەسێك ئەو چوار سیفەتەی تێدا بێنە دیو لەسەریان بەردەوام بێت، ئەوە ئەو کەسە ئیمانی نەماوەو بۆتە مونافیقی تەواو، منیش وای بۆ دەچم هەر ئەم ڕایە ڕاست بێ، چونکە بێگومان هەرکەسێك درۆکردنو بێ بەڵێنیو پەیمان شکاندنو خراپەکاریی لەلا بووبێتە عادەتو نەریتێکی چەسپاو، ناگونجێ ئیماندار بێ!

نیفاقی گەورەش، یان مونافیقی گەورە چ پیاو بێ چ ئافرەت، ئەوەیە کە لە دەروونی خۆیدا کوفری هەڵگرتبێ، بەڵام بەڕواڵەت خۆی بە مسوڵمان پێشان بدات، کە ئەم جۆرەشیان زانایان (نیفاق)ی بیرو بڕوا (اعتقاد)ی پێ دەڵێن.

---

١) صحيح مسلم: ٢٠٧، وصحيح البخاري: ٢٤٥٩، واللفظ لمسلم، بەڵام لە (صحيح)ی (بخاري)دا لە جیاتی (خلـة)، (خصلة) هاتوە.

نیفاقی گەورە گەورەترین جۆری کوفرەو، بابای مونافیقیش لە هەموو جۆرەکانی کافران خراپترو بەزەرترەو، لە دوارۆژیشدا لە هەموویان ئەشکەنجەی سەختترە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾ النساء، واتە: بێگومان مونافیقەکان لە پلەی خوارەوەی دۆزەخدان، هیچ یارمەتی دەرێکیشت بۆ ئەوان چنگ ناکەوێ، وەکو چۆن بەهەشت (درجات)ی هەیە، دۆزەخیش (درکات)ی هەیە، (درجات) بۆ سەرکەوتنەو (درکات)یش بۆ شۆڕبوونەوەیە، جا مونافیقەکان لە (درك)ی خواری خوارێی دۆزەخدان.

## چوارەم: نیشانەکانی مونافیقەکانو هەڵوێستەکانیان:-

من کە سەرنجی قورئانم داوە، ئەو ئایەتانەی، کە باسی مونافیقان دەکەن، زیاتر لە (١٠٠) سیفەتو هەڵوێستی خراپیان باس دەکەن -کە ناگونجێ لێرەدا هەموویان باس بکەین-.

پێویستە ئەو حەقیقەتە بزانین، کە کوفری ئاشکرا ناسینی زۆر ئاسانە، چونکە دیارەو ئاشکرایە، بەڵام کوفری پەنهان (نیفاق) ناسینی بەزەحمەتە، هەر بۆیەش خوای پەروەردگار ئەوەندە بە وردی تیشکی خستۆتە سەر مونافیقەکان، چونکە ئەگەر زۆر لە سیفەتو شێوەو هەڵوێستەکانیان باس نەکرێ، زۆر کەس لە ناسینیاندا بەهەڵەدا دەچێ، هەربۆیەش خوای زاناو شارەزا لە (٢٠) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (البقرة)[1]دا، کە باسی ئیماندارو کافرو مونافیقەکان دەکات، لە (٥) ئایەتی یەکەمدا پێناسەی ئیماندارو پارێزکاران دەکات، وە لە (٢) ئایەتی دواتر باسی کافران دەکا، بەڵام لە (١٣) ئایەتی دوای ئەواندا باسی مونافیقان دەکات، واتە: دوو ئەوەندەی ژمارەی ئەو ئایەتانەی، کە تێیاندا باسی ئەهلی کوفرو ئەهلی ئیسلام کراوە،

١) کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینەو نیشتەجێ بوو ئەم سوورەتەی بۆ دابەزی، کە گەورەترین سوورەتی قورئانەو زۆرێك لە یاسا شەرعییەکانی لەخۆگرتوە.

www.alibapir.com


تەرخان کراوە بۆ پێناسەکردنی مونافیقان، هەروەها سوورەتێکیش هەیە بەناوی (المنافقون)، لە قورئاندا خوای کاربەجێ لە زۆر شوێندا باسی کردوون، بۆ وێنە: هەندێك لە زانایان بە سوورەتی (التوبة) دەڵێن: سوورەتی (الفاضحة) (ئابڕووبەر)، چونکە خوای باڵادەست لەو سوورەتەدا ئابڕووی مونافیقەکانی بردوە، ئێستاش با سەرنجێکی خێرا لە ژمارەیەك لەو ئایەتانەدا بدەین: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ ...﴿٢٠﴾ ﴾ البقرة، خوای پەروەردگار لێرەدا ئاوا دەست پێدەکات: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ توێژەرەوانی قورئان دەڵێن لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە ئەو دەستەواژەیە ئەوە دەگەیەنێ، کە لەنێو خەڵکیدا کەسانێك هەن نەناسراون، نامۆن و هەموو کەس نایانناسێ، ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾ لەنێو خەڵکیدا کەسانێك هەن، کە دەڵێن ئیمانمان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴾ ئیمانداریش نین بەخواو بە ڕۆژی دوایی، کە ئەوەش دەڵێن مەبەستیان ئەوەیە، کە: ﴿ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ دەیانەوێ خواو ئەوانەش کە ئیماندارن هەڵخەڵەتێنن، ﴿ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾، بەڵام بێجگە لەخۆیان هیچ کەس فریو نادەن و هەڵناخەڵەتێنن، بەڵام هەست ناکەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ لە دڵیاندا نەخۆشیی هەیە، ئنجا باسی سیفەتەکانی دیکەیان دەکات، کە چۆن بانگەشەی چاکەکاریی (اصلاح) دەکەن، وە ئەگەر پێیان بگوترێ خراپە مەکەن! دەڵێن: چاکەکار هەر ئێمەین، وە باسی ئەوە دەکات کە چۆن ئەهلی ئیمان بەبێ عەقڵ لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن: ﴿ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ﴾ تا کۆتایی سیفەتەکانیان، کە خوای زانا زۆر بەڕوونیی تیشکی خستۆتە سەریان.

وە لە شوێنێکی دیکەدا خوای پەروەردگار سیفەتێکی دیکەی زۆر بنەڕەتی مونافیقەکان باس دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ ﴾ النساء، واتە: مـوژدە بدە بە مونافیقەکان کە ئازارێکی بەئێشیان هەیە لە دوارۆژدا، ئەوانەی کە کافرەکان بەدۆست دەگرن لەجیاتی ئیمانداران، ئایا عیززەت‌و دەسەڵاتیان لێ داوا دەکەن (بەهۆی ئەو پەیوەندییەوە) بێگومان زاڵیی‌و پایەبەرزیی هەر هی خوایە.

هەروەها لەجێیەکی دیکەدا خوای بێوێنە تیشك دەخاتە سەر هەندێك لە سیفەتەکانی دیکەی مونافیقان‌و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾ ﴾ النساء، واتە: بێگومان مونافیقەکان وا ڕەفتار دەکەن، کە خوا فریو دەدەن، بە تەئکید خوا ئەوان فریو دەدات (کە لێ دەگەڕێ لە دونیادا وەك مسوڵمان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ‌و لە ڕاستیشدا پیسترین کافرن)، کەواتە:

سیفەتێکی زۆر زەقی مونافیقەکان ئەوەیە، کە دەیانەوێ خەڵکی هەڵخەڵەتێنن‌و چەواشەیان بکەن، ﴿ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ ﴾ وە کە هەڵدەستن بۆ نوێژ بە تەمبەڵییەوە هەڵدەستن، واتە: نوێژ دەکەن، بەڵام بە تەمبەڵیی، ﴿ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ بۆ خەڵك ڕازی کردن‌و بە ڕووپامایییەوە نوێژ دەکەن، وە بەدەگمەنیش نەبێ باسی خوا ناکەن.

دیارە ئەو دەگمەن باسکردنەشیان بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکە، ﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴾ واتە: لەو نێوانەدا دێن‌و دەچن نەبەلای ئەم لادا شکاونەوە (بەلای مسوڵمانانندا) نە بەو لادا (بەلای کافرەکاندا کە ئەمەش لەڕووی ڕواڵەتییەوەیە ئەگەر نا لەڕووی دەروونیەوە بەلای کوفردا شکاونەوە)، وە هەرکەسێکیش کە خوا سەری لێ تێکبدا (بەهۆی کردەوەکانی خۆیەوە شایستەی سەر لێ تێکچوونە) تۆ هیچ ڕێبازێکی بۆ نادۆزیەوە، کە دەربازی بکەی‌و هیدایەتی بدەی.

هەروەها خوای بەرزو مەزن ڕوو لە ئیمانداران دەکاو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ المائدة، ئەم سێ ئایەتە دەربارەی (عبدالله بن أبيّ بن سلول)و هاوشێوەکانی ئەو هاتوونە خوارو[(١)] هەموو ئەوانەشی، کە لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکان دۆستایەتی‌و کەین‌وبەینیان هەیە، بە بیانووی ئەوەی، کە بەرژەوەندی دونیایان دەست دەکەوێ، کەواتە: هەرکەسێك دۆستایەتی ئەهلی کیتاب (جوولەکەو نەصرانییەکان) بکاو لەدڵەوە خۆشی بوێ‌و حەز بە سەرکەوتنیان بکا، ئەوە بەتەئکید گیرۆدەی نیفاقە، هەرکەسێك حەز بە قازانج‌و سەرکەوتنی کوفر بکا، جا ئەمریکا بێ، یان هەر کەس‌و لایەنێکی دیکە،

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(٣٨٥-٣٨٦).

ئـەوە لەوانـەو کـافرە، هەرکەسـێکیش حـەز بـە شکسـتی مسـوڵمانان بکـا لەبـەر مسـوڵمانەتییەکەیان، ئـەوە کـافرە! چـونکە ئـەوە پێـی دەگـوترێ دۆسـتایەتی ڕەهـا (الـموالاة الـمطلقة)، بـەڵام ئەگـەر تـەنیا مـودارا کـردن بـێ‌و، لـە دەروونـەوە خۆشـی نەوێ‌و بە سەرکەوتنیان دڵخۆش‌و بە ژێرکەوتنیان نارەحەت نەبێ، ئەوە هەڵوێستەکەی بە کوفر دانانرێ‌و حوکمەکەی جیایە.

لە سـوورەتی (التوبـة)شـدا لـە ئایـەتی (١٠٧ تـا ١١٠) خـوای پـەروەردگار باسـی (مسجد الضرار)مان بـۆ دەکـات، کـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٠٧﴾ التوبـة، یـەکێك لـە نەخشەو پیلانەکانی مونافیقەکان بۆ دژایەتی کردنی ئیسـلام، ئەوەیـە، کـە لـە بـەرگی دیندا لە دین دەدەن! بۆ وێنە: مزگەوتێك دروست دەکەن، بەڵام مەبەستیان ئەوەیە، کە تێیـدا پـیلان بـۆ ئـەهلی ئیمـان دابنـێن، بۆئـەوەی خۆڵـەمێش بکەنـە چـاوی مسوڵمانانەوەو، وایان لـێ حاڵی بکەن، کە ئەوانیش بڕوایان بە دین هەیە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا تـەنیا مەبەسـتیان چاوبەسـتکردن‌و چەواشـەکردنی مسـوڵمانانە، (مسـجد ضرار)یش ئەو مزگەوتە بوو کە کۆمەڵێك لە مونافیقەکانی سەردەمی پێغەمبـەر ﷺ دروستیـان کردو لەوێدا کەین‌وبەینیان لەگەڵ ڕۆمەکان هـەبوو، پیلانیـان دادەنـاو ڕێیـان خۆش دەکرد بۆ ڕۆم، کە بێن‌و بەسەر مەدینەدا بدەن، بـەڵام خـوای شارەزا پێغەمبـەر ﷺی ئاگادار کردەوە، بۆیـە ئـەویش کـە لـە جـەنگی تـەبووك گەڕایـەوە هەنـدێك لـە هاوەڵانی نارد، ئەو مزگەوتەیان ڕووخاند[1].

---

١) بڕوانە: (الـمصباح الـمنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(٥٩٠-٥٩١).

لە شوێنێکی دیکەدا هەروەها خوا -عزّ وجلّ- باسی هێندێکی دیکە لە سیفەتی موونافیقەکانمان بۆ دەکاتو دەفەرمویٚ: ﴿ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾﴾ التوبة، واتە: پیاوانی موونافیقو ئافرەتانی موونافیق هێندێکیان لە هێندێکیانن (پشتی یەك دەگرن) فەرمان بەخراپە دەکەنو ڕێ لە چاکە دەگرن، {ئەگەر ئێستا بەتەنیا ئەم دوو سیفەتە بکەی بە تەرازوو زۆر کەس لە کۆمەڵگای خۆماندا سیفەت موونافیق دەردەکەون، کە لە کۆڕو سیمینارو ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا فەرمان بە خراپە دەکەنو ڕێ لە چاکە دەگرنو ئیباحییەت بڵاودەکەنەوەو دژی حەیاو حەشمەتو ئەدەبو ڕێز قسە دەکەن) ئنجا دەفەرمویٚ: ﴿وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ﴾ دەستی خۆیان دەگرنەوەو ئامادەنین یارمەتی لێقەوماوان بدەن، ﴿نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ ئەوان خوایان لەبیر چۆتەوە خواش ئیهمالی کردوون، بێگومان موونافیقەکان لاڕێن.

لە سووڕەتی (المنافقين)یشدا کە (١١) ئایەتە، باسی موونافیقەکان دەکاتو ئاوا دەست پێدەکات: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ...﴾ المنافقون، واتە: کاتێك کە موونافیقەکان هاتن بۆلات دەڵێن: شایەدیی دەدەین تۆ پێغەمبەری خوای، خوا دەزانیٚ کە تۆ پێغەمبەری ئەوی، بەڵام خوا شایەدیی دەدا کە موونافیقەکان درۆ دەکەن...

www.alibapir.com

**پێنجەم: پوختەی پێناسەی مونافیقەکان :-**

پێناسەی مونافیقەکان بە پوختیی‌و کورتیی ئەوەیە، کە مونافیقەکان حیزبی شەیطانن، لەوبارەوە خوای بەرز لە سووڕەتی (المجادلة) ئاوا باسی مونافیقەکان دەکات‌و دەفەرمویٚ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴿١٨﴾ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُولَٰئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿١٩﴾﴾ المجادلة، شایانی باسە خوای پەروەردگار لە قورئاندا دوو جار وشەی (حزب الشیطان)ی بەکارهێناوە، هەردووجاریش بۆ پێناسەی مونافیقەکانی بەکارهێناوە، دەفەرمویٚ: (تەماشای ئەوانە ناکەی، کە دۆستایەتی لەگەڵ کەسانێك دەگرن، کە خوا لێیان تووڕە بووە (واتە: جوولەکەکان) نە لە ئێوەن نە لەوانیشن (نە جوولەکەن نە مسوڵمان) سوێندیش بە درۆ دەخۆن‌و دەشزانن، کە دۆر دەکەن، ئنجا دوای ئەوەی، کە باسی سیفەتەکانیان دەکات...، دەفەرمویٚ: ئەوانە کەسانێکن، کە شەیطان سواری ملیان بووەو بەسەریاندا زاڵ بووەو کردوونی بە ولاخی سواریی بۆخۆی، یادی خوای لەبیر بردوونەوە، ئا ئەوانەن پێڕی شەیطان، ئاگادار بن پێڕی شەیطانن زەرەرمەندەکان، کەواتە: باشترین پێناسە بۆ مونافیقەکان، ئەوەیە، کە بڵێین: دەستەو پێڕو تاقمی شەیطانن.

هەروەکو خوای کاربەجیٚ دۆستایەتییکردنی خواو دۆستایەتیکردنی پێغەمبەر ﷺو ئەهلی ئیمانی، کردوە بە دیارترین سیفەتی (حیزبی خوا) (حزب الله)، کە ئەم

وشـەیەش سـێ جـار لـە قورئانـدا هـاتوە، دوو جـار لـە ئایـەتی (٢٢)ی سـوورەتی (الـمجادلة)داو، جارێکیش لە ئایەتی (٥٦) سـوورەتی (الـمائدة)دا، هەمووشـیان بـۆ کەسـانێك بـەکارهاتوون، کـە دۆسـتایەتی خـواو دۆسـتانی خـوا دەکـەن، کەواتـە: تایبەتـمەندمەترین سـیفەتی ئیمانـداران بریتیـە لـە دۆسـتایەتییکردن لەگـەڵ خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺو ئـەهلی ئیمانـدا، هـەروەها تایبەتمەنـدیترین سـیفەتی مونافیقەکانیش، بریتیە لە کەینو بەین هەبوونو دۆستایەتیکردنی کافران.

## سـێ ئاگـاداری دەربـارەی مونافیقـەکـان :-

١- لـەم رۆژگارەمانـدا پێویسـتە مونافیقـەکان چـاك بناسـین، دیـارە ئـەویش لـەڕێی سیفەتەکانیانەوە، کـە خـوای زانـاو شـارەزا لـە قورئانـداو پێغەمبـەرمان ﷺ لـە سوننەتدا بۆ ئێمەیان خستوونە ڕوو، بۆیە پێوستە زۆر لەو ئایەتانە وردبینەوە، کـە باسی مونافیقەکان دەکەن، چونکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا کەسانێکی زۆر هـەن، کـە بانگەشەی مسوڵمانەتی دەکەن، بەڵام بەکردەوە شتێکی دیکەنو سیفەتو ئاکـارو هەڵوێستیان، سیفەتو هەڵوێستی مونافیقانن.

٢- هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ مونافیقەکاندا، واقع بینییو دوور بینییو وریاییـەکی زۆری دەوێ، پێغەمبـەرمان ﷺ ئەوەنـدەی بەدەسـت مونافیقەکانـەوە تووشـی گرفتـارییو نارەحـەتیی بـووە، هێنـدە بەدەسـت کافرەکانـەوە تووشـی گرفتـارییو نارەحەتیی نـەبووە، وە هـەوڵی داوە ئەوپـەڕی حیکمـەتو لێزانیـی بـەکاربێنێ بـۆ هەڵسوکەوت کردن لەگـەڵ مونافیقەکانـدا، (بـخاري ومسـلم) هێناویانـە[١]، کـە جارێك عومـەر -خوا لێی ڕازی بێ- لەبارەی (عبدالله بن أبي سلول)ی مونافیقـەوە کە هەڕەشـەی لە مسـوڵمانان کردبوو، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ڕێگام بدە با لە ملـی ئەو مونافیقـە بدەم!

١) صحيح البخاري: ٤٩٠٧، وە (صحيح مسلم): ٦٥٢٦.

www.alibapir.com


پێغەمبەر ﷺیش دەفەرموێ: **{دعه، لايتحدث الناس أنّ محمداً يقتل أصحابه}**، واتە: وازی لێبێنە، چونکە دوایی خەڵك دەڵێن: موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێ، بەڵێ هەڵسوکەوت لەگەڵ مونافیقەکاندا بە زەحمەتەو لێزانیی‌و وریایی زۆری دەوێ، وە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە جیاوازی هەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامییدا سینگ فراوانیی‌و لێبوردنی زیاتری لەگەڵ مونافیقەکان ئەنجام داوە، بەڵام لە دوادوای تەمەنی موبارەکیدا زیاتر لەگەڵیان توندو سەختگیر بووە، وە خوای پەروەردگاریش لە سوورەتی (التوبة)و سوورەتی (التحريم)یشدا ئەم فەرمانەی بە پێغەمبەر ﷺ کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٩﴾﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر! دژی کافرو مونافیقەکان تێبکۆشەو لەسەریان توندبە....

هەروەها لە (السيرة النبوية)دا[1] هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ لە دوادوای تەمەنی موبارەکیدا، ڕۆژێك فەرمانی بە مسوڵمانان داوەو کۆمەڵێك لە مونافیقەکانی ناو هێناون‌و کردوونیە دەرێ، وە هەندێکیش لە مونافیقەکان مابوون کە ناوەکانی بە (حذيفة بن اليمان) فەرموون، -خوا لێی ڕازی بێ-، وە بۆیە پێی گوتراوە: خاوەنی نهێنی پێغەمبەر ﷺ (صاحب سر الرسول).

٣- مونافیقەکان دەگونجێ (تۆبە) بکەن، بەڵام مەرجەکانیان قورسترن لە (تۆبە)کردنی خەڵکی دیکە، وەك خوای پەروەردگار باسی مونافیقەکان دەکات، لە دواییدا باسی مەرجەکانی گەڕانەوەیان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢، ص(٢٧٧-٢٧٨).

﴿وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ١٤٦﴾ النساء، واتە: جگە لەوانەی کە دەگەڕێنەوە وە چاکەکاریی دەکەن، وە دەست بە ڕێنمایی خوا دەگرن، وە دیندارییەکی ساغیش بۆ خوا دەکەن، ئا ئەوانە لەگەڵ ئیمانداران دانو خواش لەمەودوا پادشتی گەورە دەداتە ئیمانداران، هەڵبەتە قورسترپوونی مەرجەکانی گەڕانەوە (توبة)ی مونافیقان شتێکی مەنتیقیی یە، چونکە ئینسان تا دەردەکەی سەختتر بێ، دەرمانەکەشی زیاترو ئاڵۆزتر دەبێ، نیفاقیش دەردێکی زۆر کوشندەیەو جۆرە کوفرێکی زۆر سەختە، بۆیە چارەسەریو پەشیمانبوونەوەش لێی، دەبێ چارەسەرێکی تێکەڵاو (مركّب) بێ، کە لە چوار شت پێکدێ:

أ- بەکردەوە بگەڕێتەوە بۆ لای خوا.

ب- دوای گەڕانەوە چاکەکاریی بکات.

ج- دەست بە دینو ڕێسمانی خواوە بگرێ.

د- کە تا ئێستا ڕیای هەبووە، لەمەودوا بۆ خوا ساغو یەکلاببێتەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵمانبن
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - كوردي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

# چەند ڕووداوێکی گرنگی دوای جەنگی ئوحود

هەرچەندە مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا تێشکان بەهۆی چەند کەموکورییەکی خۆیانەوە، بەڵام ئەو دەرسو پەندانەی، کە لەو جەنگەدا وەردەگیرێن وەك پێشتر گوتمانو زۆرێکیشمان لێ خستنەڕوو، زۆر گەورەترن لەو زەرەرو زیانانەی، کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەو جەنگەدا کردیان، وە لەدوای جەنگی ئوحود کۆمەڵێك ڕووداوی گرنگ ڕوویانداوە لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ، کە هەشتیان لێ دەخەینە ڕوو:-

## یەکەم: غەزای (حمراء الأسد):-

(حمراء الأسد) شوێنێکە هەشت میل لە مەدینەوە دوورە، (طبراني) بە سەنەدێکی (صحيح) لە (عبدالله بن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (لما رجع المشركون من أُحُد، قالوا لا محمداً قتلتم ولاكواعب أردفتم، بئس ما صنعتم ارجعوا...) واتە: کافرەکان (بە سەرکردایەتی –أبو سفيان-) دوای جەنگی ئوحود، کە گەڕانەوە بەرەو مەککە، لە بەینی خۆیاندا گوتیان: نە موحەممەدتان کوشت، وە نە کچانی تازە مەمك کردووتان بەدیل گرتن، خراپترین شتتان کرد، با بگەڕێینەوە سەریان...، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە، کە گوتوویانە: با بگەڕێینەوە سەریانو بەیەکجاریی بنبڕیان بکەین[1].

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٣٩).

جەنگی ئوحود لە ڕۆژی شەممەی (١٥)ی شەوالی ساڵی سێیەمی کۆچیدا ڕوویداوە، ئەو ڕۆژە، کە شەڕەکە کۆتایی پێهات قورەیشییەکان گەڕانەوە بەرەو مەککە، دواتر پێغەمبەر ﷺ بیستی (أبو سفیان)و سوپاکەی بەتەمان بگەڕێنەوەو هێرش بکەنەوە سەر مەدینە، بۆیە هەر ڕۆژی دواتر واتە ڕۆژی یەکشەممە (١٦)ی شەوال، پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا بەدوای دوژمن بکەوێ، بەڵام ڕایگەیاند: با هیچ کەس بۆ ڕاوەدوونانی دوژمن لەگەڵمان نەیەت، مەگەر کەسێك کە لە جەنگی دوێنێدا بەشداری کردوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ کە بۆخۆی بە چەند شوێن بریندار بوو، وە هاوەڵانی بەڕێزیشی زۆربەیان بریندار بوونو هی وایان هەبوو بەو ئەندازەیە برینەکەی سەخت بوو کە دەبووایە یەکێکی دیکە هاوکاری بکات بۆ ئەوەی سواری وڵاخ بێ یان بڕوا، بەڵام ویستیان فەرمانی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ بکەن، خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەو شوێنەی کە پێغەمبەر ﷺ مەبەستیەتی، بۆیە دوایی خوای پەروەردگار چەند ئایەتێکی ناردە خوار لە مەدحی ئەو کەسانەدا کە بە برینداریش ئامادەبوون فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێ بکەن، بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی ڕۆیشتن تا گەیشتنە (حمراء الأسد)، و (عبدالله بن أم مكتوم)ی بەسەرپەرشتیاری مەدینەی دانا، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژانی دووشەممەو سێشەممەو چوارشەممە لەوێ مایەوە[1].

لەوکاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ لەڕێ دابوو بەرەو (حمراء الأسد) گەیشتە (معبد بن أبي معبد الخزاعي) کە ئەوکاتە کافر بوو، بەڵام لە دواییدا ئیمانی هێناوە، سەرەخۆشی لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتی: بەڕاستی زۆرمان پێ ناخۆش بوو کە ئەو بەڵایەتان بەسەر هات، دوایی (معبد) کە لە پێغەمبەر ﷺ جیابۆوەو بەرەو لای مەککە ڕۆیشت، گەیشتە (أبو سفیان)و سوپاکەی لە شوێنێك بەناوی (الروحاء) کە بەرەو مەدینە دەهاتن، (أبو سفیان) لێی پرسی ئەی (معبد) دەنگو باس چییە؟!

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ص(٣٩، ٤٠)، وە (البداية والنهاية)، ج٤، ص(٦٠).

www.alibapir.com

ئەویش گوتی: گەیشتمە موحەممەدو هاوەڵانی کە بەرەو ئێرە دێن بە سوپایەکەوە، کە لە چەکدا خۆیان بزرکردوە، وەکو شێری بریندار، زۆر بە تووڕەیی بەرەو ڕووتان دێن!

(أبو سفيان) گوتی: بەڕاستتە؟

(معبد)یش گوتی: بەڵێ بەڕاستمەو ئەگەر پەلە نەکەی لەدەستیان دەربازتان نابێ، لەوکاتەدا کاروانێکی (عبد القيس) بەلایاندا تێپەڕی، (أبو سفيان) لێی پرسین: بۆ کوێ دەچن؟!

گوتیان: دەچین بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی زەخیرە بێنین.

(أبو سفيان) گوتی: من نامەیەکتان پێدا دەنێرم بۆ موحەممەد هەندێك قسەیە بیگەیەنن، دوایی کە هاتن بۆ مەککە باری وڵاخێك مێوژتان دەدەمێ لە بازاڕی (عكاظ)، لە پاداشتی ئەوەدا کە ئەو چەند قسەیەم بۆ بگەیەنن، ئەوانیش گوتیان: باشە قسەکان چین؟!

(أبو سفيان) گوتی: بە موحەممەد بڵێن: ئەوە سوپای قوڕەیش بەرەو ڕووتان دێن بۆ ئەوەی بەیەکجاریی بنبڕتان بکەن، ئنجا کاتێك کە ئەو کاروانە کاروانی (عبد القيس) گەیشتە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەڕێزیو ئەو ڕاسپاردەیەی (أبو سفيان)ی پێ ڕاگەیاندن، پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی لەوەڵامدا ئەم ڕستەیەیان فەرموو: ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾، واتە: (خوا بەسمانەو چاکترین کەسیش کە خۆمانی پێ بسپێرین خوایە) کە ئەمە پێش ئەوەبووە بگاتە (حمراء الأسد)، دوایی دەگەنە ئەوێو بۆ ماوەی سێ ڕۆژان لەوێ دەمێنێتەوە، بەڵام (أبو سفيان) ترساو نەیتوانی بۆیان بێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی دوای ئەو چەند ڕۆژە دەگەڕێنەوە، لە سەری گەڕانەوەیاندا بۆ مەدینە دەگەنە (أبو عزة الجمحي) کە کابرایەکی شاعیرو لە جەنگی بەدردا لەلایەن مسوڵمانانەوە بەدیل گیرا بوو، پێغەمبەر ﷺ بەبێ بەرامبەر ئازادی کردبوو، بەڵام دووبارە هاتبۆوە بۆ دژایەتی کردنو جەنگ کردن لەگەڵ مسوڵمانان، بۆیە هاوەڵان گرتیانو هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش پاڕایەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەی خوا ئەم جارەش ئازادم بکە جارێکی دیکە نایەمەوە بۆ دژایەتی تۆ، پێغەمبەر ﷺ

ئاوا وەڵامی دایەوە، فەرمووی: **{والله لا تمسح عارضيك بمكة بعدها وتقول خدعت محمداً مرتين، اضرب عنقه يا زبير}**، واتە: سوێند بە خوا بەرت نادەم، بچیەوە مەککەو دەست بە سمێڵاندا بێنیو بڵێی دوو جاران موحەممەدم هەڵخەڵەتاندوە، زوبێر لە ملی بدە! دوایی ئەم ڕستەیەی فەرموو، کە ئێستا بۆتە پەند: ((لا يُلدغ المؤمن من جحر مرتين))، واتە: (بڕوادار نابێ دوو جاران لە کونێکەوە بگەزرێ)[(١)].

دوای ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ چۆوە مەدینە ئەم ئایەتانەی بە بۆنەی (حمراء الاسد)ەوە بۆ هاتنە خوارێ، کە مەدحێکی زۆری لەلایەن خوای پەروەردگارەوە تێدایە بۆ ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە لەوکاتە سەغڵەتو نارەحەتەدا بە بریندارییەوە بەدەم بانگەوازی پێغەمبەرەوە ﷺ چوون، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ آل عمران، واتە: ئەوانەی کە بەدەم بانگی خواو پێغەمبەری خواوە چوون دوای ئەوەی کە برینیان تێبوو، بۆ ئەوانەیان کە چاکەکارنو ئەهلی پارێزن پاداشتێکی گەورە هەیە، ئەوانەی کە خەڵك پێیان گوتن (کاروانەکەی "عبد القيس") خەڵکی بۆتان کۆبوونەوە ("ابوسفيان"و سوپاکەی) لێیان بترسێن، بەڵام ئەو هەڕەشەیە ئیمانی زیاد کردن، (ئینسانی ئیماندار لە سەختییو نارەحەتییاندا ئیمانەکەی زیاتر ساغ دەبێتەوە، تیغی ڕەسەنیش هەتا زیاتر شتی پێ ببڕێ تیژتر دەبێ)، وە گوتیان: ﴿حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ خوا بەسمانەو ئەو چاکترین کارپێ سپێردراوە، وە

---

١) (البداية والنهاية)، ج٤، ص(٦١-٦٣)، وە (السيرة النبوية)، ج٣، ص(٣٩-٤١).

سەرەنجام بە نیعمەتو بەخششێکی زۆری خواوە گەڕانەوە، (چونکە لەوێ بازاڕی لێ بوو، کڕینو فرۆشتنیان کرد بە قازانجیشەوە گەڕانەوە) هیچ ئازارێکیان تووش نەبوو، بەدوای ڕەزامەندیی خوا کەوتن (کە لەوکاتەدا ڕەزامەندیی خوا لەوەدا بووە، وە کە بە برینداریی بڕۆن بەدەم بانگەوازی خواوە، چونکە هەمیشە ڕەزامەندیی خوا لە جێبەجێکردنی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوادایە) وە بێگومان خوا خاوەنی بەخششی گەورەیە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، واتە: ئەوە شەیتانە کە لە دۆستەکانی خۆی دەتانترسێنێ، لەوان مەترسێنو لەمن بترسێن ئەگەر ئیماندارن (واتە: ئەوەی ئیماندار بێ دەبێ ترسی هەرە زۆری تەنیا لە خوا بێ نەك لە غەیری خوا).

وەك باسمان کرد هەرچەندە مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، بەڵام چەسپینو ئازایەتی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی لە مەیداندا گوێ ڕایەڵیی و فەرمانبەریی هاوەڵانیشی، پاش ڕۆژێك لە جەنگەکە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەو هاوەڵانەی کە لە جەنگەکەدا بەشداربوو بوون، بۆ ڕۆیشتن بەرەو (حمراء الأسد)و بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای کافرەکان، ئەم هەڵوێستە ئەوپەڕی ئازایەتییو ئیمانی پتەوو دامەزراویی بۆ مسوڵمانان دەگەیەنێ، هەڵاتنو پاشەکشەکردنی سوپای کافرەکانیش بەسەرپەرشتی (أبو سفيان) بێ هێزو پێزیی خۆیو سوپایەکەی دەسەلمێنێ.

## دووەم: سەرییەی (أبو سلمة المخزومي):-

یەکی دی لەو ڕووداوانەی، کە لەدوای جەنگی ئوحود ڕوویان داوە لە مانگی (محرم)ی ساڵی چوارەمی کۆچیدا، ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی هەواڵی پێگەیشت، کە (بني أسد) بە فەرمانداندەیی (طلحة و سلمة ابني خويلد) دەیانەوێ بەسەر مەدینەدا بدەن، هێزێکی بە فەرماندەیی (أبو سلمة المخزومي)

ئامادەکرد، کە (١٥٠) جەنگاوەر بوو لە کۆچکەرانو پشتیوانان، وە پێی فەرموو: (سِرْ حتَّى تنزل أرض بني سعد، فأَغِرْ عليهم قبل ان تتلاقى عليك جموعهم)(١)، واتە: بڕۆ هەتا دەگەیە سەر زەمینی (بني سعد) دوایی شەبەیخوون بکە سەریان پێش ئەوەی لەسەرت کۆبنەوە، ئنجا (أبو سلمة) خۆیو جەنگاوەرەکان ڕۆیشتنو بەسەری دادانو مەڕو ماڵاتێکی زۆری لێ بەغەنیمەت گرتنو بەدەستکەوتەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، دیارە ئەو چالاکییەش دوای جەنگی ئوحود، نەبەزینو ئازایەتی هاوەڵان دەسلمێنێو پەرۆشییان بۆ دینی خوا دەردەخات.

## سێیەم: کوشتنی (خالد بن سفيان الهذلي) لەلایەن (عبدالله بن أُنيس)ەوە:-

(عبدالله بن أُنيس) کە هاوەڵێکی زۆر ئازاو چالاك بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بیستوومە (خالد بن سفيان الهذلي) دەیەوێ سوپا کۆبکاتەوەو بەسەر مەدینەدا بدا، ئێستا لە (عرنة)یە بچۆ بیکوژە، واتە: ئەو سەری مارەکەیە ئەگەر ئەوت کوشت، هەموو سوپاکەی پەرتەوازە دەبێو هیچیان بۆ ناکرێ.

(عبدالله) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ باسم بۆ بکە بۆئەوەی بیناسم، چونکە تائێستا نەمبینیوە، پێغەمبەریش ﷺ چەند نیشانەیەکی پێ دەڵێو دەفەرموێ: ئەگەر بینیشت موچڕکێکت پێدادێو دەلەرزی، (عبدالله) دەڵێ: دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نیشانەکانی پێگوتم، چووم بۆ (عرنة) لەوێ ئەو کابرایەم بینی بە نیشانەکانی ناسیمەوە، بەڵام ئەو منی نەناسی، لێی نزیك کەوتمەوە، گوتی: تۆ کێی؟

منیش گوتم: بیستوومە دەتەوێ سوپا کۆبکەیەوەو بەسەر موحەممەدو هاوەڵانی دابدەی، منیش هاتووم بۆ لات ئەگەر هاوکارییەکم پێبکرێ!!

ئەویش گوتی: بەڵێ، دەی زۆر چاکە، بەخێربێی!!

---

١) (زاد المعاد في هدي خير العباد)، ج٣، ص(٢٤٣)، ابن القيم.

منیش تۆزێك لەگەڵیدا ڕۆیشتمو دوایی بە شمشێر لێمداو کوشتم، کۆمەڵە ئافرەتێکی لە دەوروپشت بوون بەجێمهێشت، کە بەسەریدا بگرین، بۆخۆشم هاتمەوە[1].

بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ، کە بیستوویەتی دوژمن دەیەوێ هێزی بۆ کۆبکاتەوە، پێش ئەوەی دوژمن بەسەریدا بدات لێی نەگەڕاوەو خۆی دەستپێشخەری کردووەو بەرنامەی ئەوانی تێکداوەو نیازی خراپەکارانەیانی پووچەڵ کردۆتەوە، هەربۆیەش گوتراوە: (هێرش بردن هۆکاری بەرگرییە).

## چوارەم: کارەساتی (الرجیع) لەسەر دەستی (عضل و القارة):-

یەکێك لە ڕووداوە دڵتەزێنەکان، کە لە مانگی (صفر)ی ساڵی چوارەمی کۆچیدا ڕوویدا، کارەساتی (الرجیع) بوو، لە سەردەستی دوو عەشیرەت بەناوی (عضل و القارة)، کە هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺو گوتیان: ئەی موحەممەد هێندێك لە هاوەڵانی بەڕێزت بنێرە بۆ نێو ئێمە، چونکە خەڵکەکەمان پێیان خۆشە لە ئیسلام شارەزا بن!

پێغەمبەریش ﷺ(١٠)[2] دە کەس لە هاوەڵانی بەڕێزی لەگەڵدا ناردن، فەرماندەیان (عاصم بن ثابت بن الأفلح) بوو، لەگەڵیان چوون تاگەیشتنە شوێنێك بەناوی (عسفان) لەوێ، عەشیرەتێك بەناوی (بنو لحيان) لە هۆزی (هذيل) بە (١٠٠) جەنگاوەرەوە هەڵیان کوتایە سەریانو لە ئەنجامدا (٨)یان لێ شەهید کردنو دوو کەسیشیان لێ بەدیل گرتنو لەگەڵ خۆیان بردیانن بۆ مەککە لەوێ فرۆشتیانن بە قورەیشییەکان، بۆ ئەوەی ئەوانەی کە جەرگ سووتاو بوون لە تۆڵەی کەسوکاری خۆیاندا بیانکوژنەوە، ئەو دوو هاوەڵە بەڕێزەش (خبيب)و (زيد بن الدثنة) بوون،

---

١) التاريخ الإسلامي للحميدي، ج٦، ص(٢٣).

٢) بوخاریی دەڵێ: ژمارەیان (١٠) کەس بووەو لە حەدیسی ژمارە (٤٠٨٦)دا ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە، بەڵام (ابن هشام) دەڵێ ژمارەیان (٦)کەس بووە، بڕوانە: ج٣، ص(٧٨).

بەسەرهاتی جەنازەکەی (عاصم)یش بەم شێوەیە بووە: دوای شەهیدبوونی، قورەیشییەکان ویستیان پارچەیەك لە لاشەی (عاصم) بەرنەوە، بۆ ئەوەی بیناسنەوەو لێیان مەعلووم بێ، کە (عاصم)ەو کوژراوە، بەڵام بە فەرمانی خوا کۆمەڵە زەردەواڵەیەکی زۆر لە لاشەکەی ئاڵانو کەس نەیتوانی نزیکی ببێتەوەو نەیانتوانی پارچەی لێ بکەنەوە[1].

(خبیب)یش ماوەیەك لە (سجن)دا هێشتیانەوە، دوایی بڕیاریاندا بیکوژن، پێش ئەوەی بیکوژن داوای لێکردن مۆڵەتی بدەن دوو ڕکات نوێژ بکات، کە نوێژەکەی کردو سەلامی دایەوە گوتی: بەخوا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە بڵێن لە مردنێ دەترسێ، نوێژەکەم زیاتر درێژ دەکردەوە، دوایی گوتی (اللّهم احصهم عدداً، واقتلهم بدداً، ولا تُبقِ منهم أحداً)، ئنجا کوشتیان (عقبة بن الحارث) کوشتی، دوایی (أبو سفیان) بە (زید)ی گوت: پێت خۆش نیە موحەممەدمان دەست بکەوێو بیکوژینو تۆش لەنێو ماڵو خێزانت بی؟!

گوتی: نەخێر سوێند بەخوا نامەوێ من لەنێو خێزانم دا بە خۆشی بژیمو پێغەمبەریش دڕکێك بە پێیدا بچێ.

(أبو سفیان) گوتی: (مارأیتُ في الناس أحداً یُحبُّ أحداً کحب أصحاب محمدٍ محمداً) واتە: هیچکەسم لەنێو خەڵکدا نەدیوە کەسیان هێندەی هاوەڵانی موحەممەد موحەممەدیان خۆشدەوێ، خۆشبوێ، (زید بن الثدنة)ش (صفوان بن أمیة)کڕیو لە تۆڵەی بابیدا کوشتی[2].

---

١) صحيح البخاري: ٤٠٨٦.
٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٨٠).

## پێنجەم: کارەساتی (بئر المعونة):-

ئەم کارەساتەش لە مانگی (صفر)ی ساڵی چوارەمی کۆچیدا بوو[١]، وەك کارەساتی (الرجیع) دڵتەزێن بوو، کە بێگومان ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی لەو دوو کارەساتەدا شەهید بوون، لەڕێی بانگەوازدابوو، چونکە ئەوانە لە شەڕدا نەکوژران، بەڵکو دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ناردوونی بانگەواز بکەنو خەڵکێك بۆ ئیسلام بانگ بکەنو شەریعەتی خوایان لێ حاڵی بکەن، شەهیدیان کردوون.

کورتەی ڕووداوەکە بەم شێوەیەیە: کابرایەك بەناوی (أبو براء عامر بن مالك)، کە بە (ملاعب الأسنة) ناسرابوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش ﷺ داوای لێکرد کە مسوڵمان بێ، بەڵام مسوڵمان نەبوو، دواتر داوای لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتی: ئەگەر هێندێك لە هاوەڵانی خۆتم لەگەڵ بنێری بۆ لای خەڵکی (نجد)و بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، من پێم وایە بەدەم بانگەوازەکەتەوە دێن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: مەترسییم هەیە خەڵکی (نجد) غەدریان لێ بکەن، ئەویش گوتی: من پەنایان دەدەم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ (المنذر بن عمرو)و (٧٠)[٢] لە هاوەڵانی لەگەڵ نارد، لەوێ لە (بئر المعونة) یەکێك لە هاوەڵان کە ناوی (حرام بن ملحان) بوو، نامەی پێغەمبەری ﷺ برد بۆ (عامر بن الطفیل)، کە یەکێك بوو لە سەرانیان، بەڵام ئەو کابرایە پێش ئەوەی نامەکەی پێغەمبەر ﷺ بخوێنێتەوە، فەرمانی کردو (حرام بن ملحان)ی شەهید کرد، (حرام) کە خوێنی خۆی بینی پێش مردنی گوتی[٣]: (الله اکبر فزتُ ورب الکعبة)، دوایی (عامر) داوای لە (بني عامر)کرد، کە بچنو ئەو حەفتا هاوەڵەی پێغەمبەر ﷺ بکوژن، بەڵام ئەوان وەڵامیان نەدایەوەو ڕازی نەبوون

١) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٣، ص(٨٦-٨٨).
٢) صحیح البخاري: ٤٠٩٠، و: ٤٠٩١، بەڵام (ابن هشام) دەڵێ: (٤٠) کەس بوون.
٣) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٣، ص(٨٨).

www.alibapir.com

پەیمانی (أبو براء)[١] بشکێنن، بەڵام لە (بني سليم) سێ تیرە بەناوی (عصية، رعل، ذكوان) بە دەنگیەوە هاتنو لەو هاوەڵە بەڕێزانەیانداو شەڕیان لەگەڵ کردن تا هەموویان شەهید کردن جگە لە (كعب بن زيد)، کە بە بریندارییی دەربازی بووو دواتر لە جەنگی (خندق)دا شەهید بوو، دوایی (عمرو بن أمية الضمري)و (المنذر بن عقبة بن عامر)، کە لە دووری سەربازگەی هاوەڵانیان بوون، تەماشایان کرد باڵندەو قەلو داڵ لەو ناوچەیە بە ئاسمانیوەن کە چوون بینیان هاوەڵەکانیان هەموو لەوێ شەهید کراون، (المنذر) دەست دەکا بەشەڕ لەگەڵیان تا شەهید دەبێو (عمرو بن أمية)ش بەدیل دەگیرێ، ئنجا کە (عامر) زانی (عمرو) لە (مضر)ە، ئازادی کرد، دوایی (عمرو) بەڕێ دەکەوێ بۆ مەدینە لە ڕێگا دەگاتە دوو نەفەر لە عەشیرەتی (بني عامر)و هەردووکیان دەکوژێ، نازانێ کە هۆزی (بني عامر) پەیمانیان هەیە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، کە دەگاتە مەدینەو هەواڵەکە بە پێغەمبەر ﷺ دەگەیەنێ، کە هاوەڵان هەموویان شەهیدکراون پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵتەنگ دەبێ، دوایی (عمرو بن أمية) بە پێغەمبەر ﷺ ڕادەگەیەنێ، کە لە گەڕانەوە لە ڕێگادا دوو کەسی کوشتوون، کە هەردووکیان لە (بني عامر) بوون، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{لقد قتلت قتيلين لأدينهما}**، واتە: دوو کەست کوشتوون، کە دەبێ خوێنەکانیان بدەم! وە خوێنەکانیان دەدات[٢].

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵماندابن
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

١) عەشیرەتی (بني عامر) هاوپەیمان بوون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەبەرئەوەی وەڵامیان نەداوەتەوەو بەدەنگیەوە نەچوون.
٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ص(٨٧).

## شەشەم: (زینب)و (أم سلمة) بوون بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ:-

یەکێکی دیکە لەو ڕووداوانەی، کە لە دوای جەنگی ئوحود ڕوویانداوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دوو لە هاوسەرانی بەڕێزی هێناوە:

١- (زینب بنت خزیمة):- کە بە (أُم المساکین) ناسراوەو پێشتر خێزانی (عبدالله بن جحش) بوو کە لە جەنگی ئوحوددا شەهید کراوە، پێغەمبەر ﷺ لە مانگی (رمضان)دا مارەی کردۆتەوە، (٨)مانگ لەلای بووەو پاشان کۆچی دوایی کردوە[1].

٢- (أم سلمة):- کە پێشتر خێزانی (أبو سلمة) بووەو لە ئەنجامی چەند برینێکدا کە لە جەنگدا تێی بوون، کۆچی دوایی کردوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ (أم سلمة)ی مارە کردۆتەوە.

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ ناردیە لای (أم سلمة) کە مارەی بکاتەوە، گوتی: بە پێغەمبەری خوا بڵێن ﷺ کە تەمەنم زۆرەو منداڵم هەن، وە ئافرەتێکم زۆر (غَیْرة)م هەیە، یانی زۆر بە هەوێداریی نارەحەت دەبم، هەروەها هیچ کام لە خزمەکانیشم لێرە نین، پێغەمبەر ﷺ کەسێك[2] ڕادەسپێرێ‌و وەڵامی بۆ دەنێرێ: کە لەڕووی تەمەنەوە لەو بەتەمەن ترە، وە دەربارەی منداڵەکانیشی با لەگەڵ خۆیدا بیانهێنێ ئەو ئاگای لێیان دەبێ، لەبارەی هەوێدارییشەوە دووعا دەکا ئەو نارەحەتییەی نەمێنێ، وە خزمەکانیشی هیچ کامیان پێیان ناخۆش نیە کە ببێ بە هاوسەری ئەو، بەو جۆرە مارەی کردەوە،[3] بێگومان پێغەمبەر ﷺ بێ حیکمەت نەبووە کە خێزانی هێندێ لە شەهیدانی هێناوە، بۆ ئەوەی منداڵی ئەو شەهیدانەو خێزانەکانیان بێ سەرپەرشت

---

١) تفسير القرطبي ج٤ ص(١٦٦)، وە: (البداية والنهاية) ج٤، ص(١١٠).
٢) ئەو کەسە عومەری کوڕی خەتتاب دەبێ، خوا لێی ڕازی بێ، وەك لە سەرچاوەی پێشوودا هاتوە.
٣) بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٤، ص(١١٠).

نەبن، وە بۆ ئەوەی هاوەڵانی بەڕێزی چاو لەو بکەن، ئەوانیش خێزانی شەهیدان مارە بکەنەوە، وە بۆ ئەوەش کە هاوەڵان لە شەهیدبوون نەترسێنو بیر لە منداڵەکانیان نەکەنەوەو بڵێن: دوای شەهیدبوونمان خێزانو منداڵەکانمان بێسەرپەرشت دەمێننەوە، وە لە مارەکردنەوەو هێنانی هەرکام لە خێزانەکانیدا گەلێك حیکمەتی سیاسییو کۆمەڵایەتیی هەن.

## حەوتەم: دەرکردنی تیرەی (بني النضير) لە ساڵی چوارەمدا:-

جوولەکەکان بەردەوامو هەر لە سەرەتاوە کەوتبوونە دژایەتی ئیسلامو مسوڵمانانو فرۆفێڵو ئازاردانیان، دیارە بەبێ جەنگو کوشتارکردن، بەڵکو هەر بە پیلان نانەوە لە دژیان، هەرچەندە پەیمانیشیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەبوو!

هەڵبەتە دوای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ (بني قينقاع)داو کوژرانی (كعب بن الأشرف) ترسانو تۆزێك لە دژایەتیکردنیان گرتەوە، بەڵام دوای جەنگی ئوحود کەمێك ورەیان هاتەوەبەرو دەستیان کردەوە بە غەدرو فێڵ لە دژی مسوڵمانانو پەیوەندیی بەستن لەگەڵ مونافیقەکانی (مەدینە)و موشریکەکانی (مەککە)دا بە نهێنی.

وە دوای ڕووداوی دڵتەزێنی: (الرجيع و بئر المعونة)ش زیاتر دەستیان بە دژایەتی کرد، تا وای لێهات ویستیان پێغەمبەر ﷺ شەهید بکەن.

(ابن هشام)[1] لەوبارەوە دەڵێ: دوای ئەوەی (عمرو بن أمية الضمري) دوو کەسی (بني عامر)ی کوشت، کە پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ هەبوونو بڕیاریدا خوێنی هەردووکیانی بدات، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای (بني النضير) کە هاوکاریی بکەن بۆ دانی خوێنی ئەو دوو کەسە، چونکە (بني النضير) لەگەڵ (بني عامر)دا هاوپەیمان بوونو بەپێی ئەو پەیمانەش کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هەیانبوو پێویست بوو یارمەتی بدەن، ئەوانیش گوتیان: باشە هاوکارییتان دەکەین ئەی (أبا

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(٨٩-٩٠).

www.alibapir.com


القاسم)! دوایی کەوتنە هەوڵی فێڵو تەڵە نانەوە لە دژی پێغەمبەر ﷺ و لەنێو خۆیاندا گوتیان: قەت موحەممەدمان بەو شێوەیە دەست نەکەوتوە، کێ دەتوانێ سەرکەوێتە سەر ئەو بانەو تاشە بەردێك بەسەر پێغەمبەردا بەرداتەوەو بیکوژێو نەجاتمان بێ لەدەستی، (عمرو بن جحاش بن كعب) ئامادەیی خۆی بۆ ئەوکارە دەردەبڕێ، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ چەند هاوەڵێکی بەڕێزی لەگەڵدا بوون لەوانە: (أبوبكرو عمر و علي....) -ڕەزای خوایان لێبێ-، خوای پەروەردگار پێغەمبەری ﷺ لە فێڵو داوی جوولەکەکان ئاگادار دەکاتەوە، بۆیە یەکسەر هەڵدەستێو دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە.

هاوەڵانیش لێی دەپرسن: ئەی پێغەمبەری خوا چی بوو؟ ئەویش دەفەرموێ: پیلانێکی ئاوایان بەدەستەوە بوو، دوایی پێغەمبەر ﷺ (١٠) ڕۆژ مۆڵەتی دایە (بني النضیر)، کە مەدینە چۆڵ بکەن، وە ئاگاداریشیان دەکاتەوە کە دوای ئەو ماوەیە هەر کامێکیان بمێنێتەوە خوێنی حەڵاڵە، چونکە پەیمانیان شکاندوە، لە سەرەتاوە (بني النضیر) خۆیان کۆکردەوە کە بڕۆن، بەڵام (عبدالله بن أبيّ بن سلول) سەرۆکی مونافیقەکانی مەدینە، وەڵامیان بۆ دەنێرێ: ئێمە لەسەرتان دەکەینەوەو شەڕتان لەسەر دەکەینو شوێنی خۆتان بەجێمەهێڵنو پەشیمانیان دەکاتەوە لە ڕۆیشتن، دوای ئەوەی ئەو ماوەی، کە پێغەمبەر ﷺ بۆی دانابوون تەواو بوو، وە چۆڵیان نەکرد لە مانگی (ربیع الأول)ی ساڵی چوارەمی کۆچیدا پێغەمبەر ﷺ هێرش دەکاتە سەریانو بۆ ماوەی (٦) ڕۆژ ئابڵووقەیان دەدا بۆ ئەوەی ورەیان بڕووخێو شوێنەکەیان بەبێ شەڕ بەجێبهێڵن.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمان بە هاوەڵان دەکا کە هەندێك لەو دارخورمایانەیان ببڕن کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەو دژایەتیکردنی مسوڵمانان بەکاریاندەهێنان، دوای ئەوەی (بني النضیر) نائومێد بوون لەوەی دەستیان پێ بکرێتەوە، داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن، کە ڕێیان پێ بدات لە مەدینە بڕۆن، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ڕێیان پێدەدا، بەمەرجێ هەرکامێکیان بۆی هەیە باری حوشترێك لەگەڵ خۆی بەرێو بڕوا جگە لە چەك،

ئەوانیش پێش ڕۆیشتنیان بەدەستی خۆیان زۆر لە خانووەکانیان ڕووخاندن‌و ڕۆیشتن بۆ (خیبر)و هێندێکیش بۆ (شام) وە کەسیان مسوڵمان نەبوو، جگە لە (یامین بن عمیر وأبو سعد بن وهب)، کە ماڵ‌و سامانیشیان وەکو خۆی مایەوە.

جا دەربارەی ئەو ڕووداوەی دەرکردنی (بني النضير) خوای پەروەردگار چەند ئایەتێکی لە سەرەتای سوورەتی (الحشر)، ناردنە خوارێ وەك دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٢﴾ ... ﴿٥﴾ ﴾ الحشر، هەروەها دەربارەی مونافیقەکانیش (عبدالله بن أبيّ بن سلول)و پێڕەکەی، خوای کاربەجێ ئایەتەکانی (١١ تا ١٧) لە سوورەتی (الحشر) ناردەخوار وەك دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾ ... ﴿١٧﴾ ﴾ الحشر، واتە: تەماشای ئەوانە ناکەی، کە مونافیقن بە برایەکانی خۆیانیان لە خاوەن کتێبەکان (جوولەکەکان، چونکە لە کوفردا برا بوون)، دەڵێن: ئەگەر وەدەرێ بنرێن ئێمەش لەگەڵتان دێینە دەرێ، وە هەرگیز فەرمانبەریی کەس ناکەین لە دژی ئێوە، وە ئەگەر جەنگیشتان لەگەڵدا بکرێ سەرتان دەخەین، بەڵام خوا شایەدیی دەدا، کە ئەوان درۆ دەکەن...، وە لەڕاستییدا درۆیانکردو ئەوەبوو، کە جوولەکەکانی (بني النضير) بەهۆی خیانەتی خۆیانەوە دەرکران‌و مونافیقەکانیش شەڕیان لەسەر نەکردن‌و یارمەتیان نەدان‌و لەگەڵ ئەوان مەدینەیان بەجێ نەهێشت‌و لە ماڵ‌و حاڵی خۆشیاندا مانەوەو درۆیان لەگەڵدا کردن!

## هەشتەم: قەدەغەکرانی شەراب (مەی):-

شەراب (مەی) بە چوار قۆناغ قەدەغە کراوە:-

**قۆناغی یەکەم:** خوای پەروەردگار تەنیا ئاماژە بە بەروبوومی خورماو تریّ دەکات، وەك لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرمویّ: ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ... ﴿٦٧﴾﴾ النحل، واتە: ئێوە لە خورماو تریّ ماددەیەکی سەرخۆشکەرو ڕۆزییەکی باش دروست دەکەن، کەواتە: ئەو ماددە سەرخۆشکەرە ڕزقێکی باش نیە، ئەوەش ئاماژەیە کە شەراب (ماددەی سەرخۆشکەرە)و خواردنەوەیەکی باش نیە.

**قۆناغی دووەم:** خوای بێوێنە دەفەرمویّ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ ... ﴿٢١٩﴾﴾ البقرة، واتە: ئەی موحەممەد! دەربارەی شەرابو قومار پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: گوناحێکی گەورەیان تێدایەو هەندێ سوودیشیان تێدایە بۆ خەڵکی، بەڵام گوناحەکەیان گەورەترو زیاترە لە قازانجیان، ئەوەش ئاماژەیەکی دیکەیە بۆ خراپیی شەرابو لێ دوورکەوتنەوەی.

**قۆناغی سێیەم:** خوای کاربەجێ لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرمویّ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ... ﴿٤٣﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بەسەرخۆشی نزیکی نوێژ مەکەون، دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بۆیان نەبوو لە نێوان نوێژەکانی نیوەڕۆو عەسرو شێوانو خەوتناندا... بخۆنەوە، دەبووایە یان لەدوای نوێژی خەوتنان خواردبایانەوە، یان لەدوای نوێژی بەیانی، بۆئەوەی بۆ نوێژی بەیانی، یان نیوەڕۆ سەرخۆشیی بەریاندا، کەواتە: لەم قۆناغەدا ماوەی خواردنەوە کەمکرایەوە.

www.alibapir.com


**قۆناغی چوارەم:** دواجار خوای زاناو شارەزا لە ئایەتی (٩٠ و ٩١) سوورەتی (المائدة)دا فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ٩١﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بێگومان شەرابو قومارو صەنەمەکانو زەلەمەکان[1] ئەوانە هەموو لە کردەوەی شەیطانن خۆتانی لێ دوور بگرن بۆ ئەوەی سەرفراز بن، بێگومان شەیتان دەیەوێ دوژمنایەتیو ڕقو قینەتان لەنێودا بڵاوبکاتەوە بەهۆی شەرابو قومارەوە، وە لە زیکری خوا لاتان بداو لە نوێژ دوورتانبخاتەوە، جا ئایا هەر دەست هەڵناگرن؟!، ئەو ڕۆژەی کە ئەم ئایەتە هاتە خوار، مسوڵمانان ئەو دەفرو کوپەو گۆزانەی کە تا ئەوکاتە شەرابیان تێدا دەخوارنەوەو تێیاندا هەڵدەگرت، هەموویان شکاندن[2].

دیارە بۆیەش ئاوا بەئاسانی دەستیان لێ هەڵگرت، چونکە پێشتر ئیمان لە دڵو دەرونیاندا ڕەگو ڕیشەی داکوتا بوو، وە هەر کەسو کۆمەڵو میللەتێکیش ئیمان لە دڵو دەروونیاندا بچەسپێو جێگیربێ، ئەوە هەر فەرمانێك لە خواوە دەرچێ، یەکسەر جێبەجێی دەکەن.

---

١) (أزلام) کۆی (زلم)ە، کە (قدح)یشی پێ دەگوترێو، بۆ جۆرە قومارێك بەکاریان هێناون، بڕوانە: (المصباح المنیر...)، ص(٣٩٨).

٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص (٣٩٨-٣٩٩).

# چەند ڕووداوێكی گرنگ پێش جەنگی ئەحزاب

ئەو ڕووداوانەی ئاماژەیان پێدەكەین، دەكەونە پێش جەنگی (ئەحزاب)، كە بە جەنگی (خەندەك)یش بەناوبانگە، كە شەش ڕووداوی گرنگن، جا هەرچەندە (ابن هشام) غەزای (بنو المصطلق)ی خستۆتە دوای جەنگی (ئەحزاب)، بەڵام زۆر لە مێژوو نووسانی دیكە، بۆ وێنە: (ابن سعد، البلاذري، ابن القيم، ابن حجر، ابن كثير) غەزای (بنو المصطلق)یان خستۆتە پێش جەنگی ئەحزابەوە.

## یەكەم: غەزای (ذات الرقاع) لە ساڵی (٤)ی كۆچیدا :-

هۆی ناونرانی ئەو غەزایە بە (ذات الرقاع) ئەوەیە كە (أبو موسى الأشعري) باسی دەكاتو (بخاري) لێی دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لەو غەزایەدا بە پێنج شەش نەفەر لە حوشترێك بە نۆرە سوار دەبووین، بۆیە پەڕۆمان لە پێیەكانمان دەئاڵاندو لە جیاتی پێڵاو پینەو پەڕۆمان دەكردە پێمان، هەر لەبەرئەوەش بە (ذات الرقاع) ناونراوە، چونكە (رقعة)یانی پینە، جا یان پێیان پینە پینە بووە، یان پەڕۆیان لە پێیان ئاڵاندوە لە جیاتی پێڵاوان، هەندێكیش دەڵێن ئەو شوێنەی ئەو جەنگەی لێ بووە هەندێكی ڕەشو سپی بووە، وەك پینە پینە وابووە، بەڵام ئەو ڕایەی (أبو موسى) زیاتر ڕێی تێدەچێ[1].

(ابن هشام)[2] دەڵێ: دوای ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ (بني النضير)ی لە مەدینە دەركردو هێندێك چوون بۆ خەیبەرو هێندێكیش چوون بۆ شام، مانگی (ربيع الثاني)و هەندێكیش لە (جمادي الأولى) لە مەدینەدا مایەوە، لەو ماوەیەدا هەواڵی پێگەیشت كە (بني محارب وبني ثعلبة) لە (غطفان) سوپایەكی زۆریان كۆكردۆتەوەو خۆ

---

١) صحيح البخاري: ٤١٢٨.

٢) (السيرة النبوية لابن هشام) ج٣، ص(٩٧-١٠٠).

www.alibapir.com


ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی شەبەیخوون بکەنە سەر مەدینە، پێغەمبەریش ﷺ وەکو ئینسانێکی زۆر شارەزا، کە ئەو هەواڵانەی دەبیست، دەست پێشخەریی دەکرد لە بڵاوەپێکردنو زەبر لێدانی دوژمنانیداو پێش ئەوەی ئەوان خۆیان کۆبکەنەوە بەسەریدا دەدان.

بەو پێیە پێغەمبەر ﷺ بەرەو (نجد) کەوتە ڕێو (أبو ذر الغفاري) یان (عثمان بن عفان)ی لە مەدینە لە شوێنی خۆی دانا، ئنجا بەڕێکەوتنو لە شوێنێك بەناوی (نخل) تووشی کۆمەڵێکی زۆر لە (بني غطفان) بوون، بەڵام کە کەوتنە بەرانبەر یەك، شەڕو کوشتار لە نێوانیاندا ڕووی نەداو لە سوپای مسوڵمانان ترسانو خۆیان پەنادا، هەر لەو غەزایەشدا بوو کە نوێژی ترس دانراوە بۆ مسوڵمانان، وەك (جابر بن عبدالله) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ﴿فنودي بالصلاة، فصلَّى بطائفة ركعتين، ثم تأخروا، وصلَّى بالطائفة الأخرى ركعتين، قال: فكانت لرسول الله ﷺ أربع ركعات، وللقوم ركعتان﴾ رواه البخاري ومسلم[1]، واتە: بانگدرا بۆ نوێژ، پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی کردۆتە دوو بەش، بەشێکیان بەرەو ڕووی دوژمن وەستان، دوو ڕکات نوێژی بۆ بەشێکیان کرد، ئنجا ئەوان کشانەوەو دوایی دوو ڕکات نوێژیشی بەوانەی دی کرد، بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکاتی کردو هاوەڵانیش دوو ڕکات.

هەر بەو بۆنەیەوە خوای زاناو شارەزا ئەم ئایەتەی سووڕەتی (النساء)ی ناردۆتە خوار کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ

---

١) صحيح مسلم: ١٩٤٦، (صحيح البخاري): ٤١٣٦ و ٤١٣٧.

www.alibapir.com



﴿... عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾﴾ النساء، کە باسی یەکێك لەجۆرو چۆنیەتییەکانی نوێژی ترس (صلاة الخوف) دەکات، دیارە پێغەمبەر ﷺ بۆ جێبەجێکردنی نوێژی ترس (صلاة الخوف) چەند شێوەیەکی داناوە، بۆ وێنە: ئەگەر دوژمن لە ڕووکاری قیبلە بووبێ، نوێژی بەهەموویان دابەستوەو هەندێکیان چوونە ڕکووعو سەجدە ئەوانی دیکە هەر بەپێوە بوون، تا ئەوانەی کە چوونە ڕکووعو هەڵدەستنەوەو بەو شێوەیە، یان پێغەمبەر ﷺ نوێژی بە بەشێك لە هاوەڵانی دابەستوەو ئەوانەی دیکە لە بەرەو ڕووی دوژمن بوون، ئیدی پێغەمبەر ﷺ ڕکاتێکی بەوانە کردوە کە لە سەرەتاوە لەگەڵ ئەو نوێژەکەیان دابەستوە، دوایی کە بۆ ڕکاتی دووەم هەستاوەتەوە، تاقمی یەکەم نوێژەکەیان بۆخۆیان تەواوکردوەو پێغەمبەریش ﷺ هەر بەوشێوەیە بووەو تاقمی دووەم هاتوون نوێژیان لە پشت پێغەمبەر ﷺ دابەستوەو ڕکاتی دووەمیان لەگەڵی کردوە، کە پێغەمبەر ﷺ سەلامی داوەتەوە ئەوان ڕکاتی دووەمی خۆیان کردوە، کەواتە: هەر کۆمەڵە ڕکاتێکیان بە جەماعەت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردوە، وە هێندێك جار پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی بە چوار ڕکاتو هێندێك جاریش بە دوو ڕکات کردوە، وەك (مسلم) گێراویەتەوە[1].

هەر لەو غەزایەدا (ذات الرقاع) بەسەرهاتێکی دیکە ڕوویداوە، کە (مسلم)[2] دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە سێبەری درەختێك ئیسراحەتی کردوەو شمشێرەکەشی بەدارەکەدا هەڵواسیوە، کابرایەکی کافر دەچێو شمشێرەکەی لە کالان دەردێنێو لێی ڕاست دەکاتەوەو دەڵێ: ئایا لێم ناترسێی؟! پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: نەخێر، کابرا دەڵێ: کێ دەتپارێزێ لە من؟ دەفەرموێ: خوا، ئنجا هاوەڵان هەڕەشەیان لێکردو ئەویش شمشێرەکەی خستەوە کالان، وە ئەم ئایەتەی سوورەتی

---

١) صحيح مسلم: ١٩٤٥.

٢) صحيح مسلم: ١٩٤٦، وە (صحيح البخاري): ٤١٣٦.

www.alibapir.com


(المائدة) بەو بۆنەیەوە هاتە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی، کە ئیمانتان هێناوە یادی چاکەی خوا بکەن بەسەر خۆتانەوە، کاتێك کە کەسانێك ویستیان دەست درێژیی بکەنە سەرتان، بەڵام خوا دەستی ئەوانی گێڕایەوە، وە پارێز لە خوا بکەنو با ئیمانداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن[1].

## دووەم: غەزای بەدری دووەم لە (شعبان)ی ساڵی (٤)ی کۆچیدا:-

لە کۆتایی جەنگی (ئوحود)دا (أبو سفیان) داوای لە پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان کرد کە بۆ ساڵی ئایندە لە بەدر بەیەك بگەنەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی باشە.

هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە هەزارو پێنج سەد کەسەوە بەرەو بەدر چوو، بۆ ئەو (موعد)ەی کە لەگەڵ (أبو سفیان) هەیان بوو، ئاڵای جەنگی دایە دەست (علي بن أبي طالب)و لە جێی خۆشی لە (مەدینە) (عبدالله بن رواحة)ی دانا بە براگەورە.

لەشکری مسوڵمانان هەشت ڕۆژ لە (بەدر) لەو شوێنەی کە لەگەڵ (أبو سفیان) دیاری یان کردبوو مایەوەو چاوەڕێی ئەوانی کرد، بەڵام (أبو سفیان) کە دوو هەزار کەسی لەگەڵ بوو، هەرچەندە هەتا (عسفان) هات، بەڵام لەوێ بە بیانووی جۆراوجۆر گەڕایەوەو بە قورەیشییەکانی گوت: ئەی کۆمەڵی قورەیش ئەم ساڵ ساڵێکی قاقڕو بێ بەرهەمەو پێمانەوە نایەت، با بگەڕێینەوە بۆ مەککەو ساڵێکی دیکە دەچین بۆ ئەو موعیدەمان.

بەو شێوەیە بە بیانووی نەهاتیی ساڵەوە (أبو سفیان) گەڕایەوەو نەوێرا ڕووبەڕووی مسوڵمانان ببێتەوەو، سوپای ئیسلامیش بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ بە

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(٣٦٢-٣٦٣).

سەربەرزیی‌و ورەی دامەزراوەوە گەڕانەوە بۆ (مەدینە)، بەو پێیە کە پێشتر دوژمنانی ئیسلام دەهاتنە سەر مسوڵمانان‌و زۆریان لەخۆڕادەبینی، لەم بەسەرهاتەدا دەردەکەوێ، کە لە دەرەوەو دوور لە مەدینەش کافرەکان ترساون، کە ڕووبەڕووی مسوڵمانان ببنەوە(١).

## سێیەم: غەزای (دومة الجندل):

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە غەزای بەدری دووەم گەڕایەوە، ماوەی شەش مانگان لە مەدینە مایەوە، دوایی بیستی کە هۆزەکانی دەوروبەری (دومة الجندل) ڕێگریی دەکەن‌و ئەوەی بە وێدا بڕوات تالآنی دەکەن‌و خەڵکێکیشیان کۆکردۆتەوەو دەیانەوێ بەسەر (مەدینە)دا بدەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەهەزار کەسەوە لە کۆتایی مانگی (ربيع الأول)ی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بەرەو (دومة الجندل) بەڕێ کەوت، کە بەرەو باکوور (١٥) ڕۆژ ڕێگا، یان (٤٥٠) کلم لە (مەدینە)وە دوورە، پێنج ڕۆژ ڕێگای مابوو بگاتە (دمشق)، کە ئەوکاتە پایتەختی دوومی دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵات بوو، وە لەو ماوەیەدا (سباع بن عرفطة الغفاري)ی وەکو بەرپرس لە مەدینە بەجێهێشتبوو.

دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە (دومة الجندل)و ماوەیەکیش لەوێ مایەوە، ئەوانەی کە دوژمن‌و ناحەزبوون دوورکەوتبوونەوەو ڕایانکرد بوو، بۆیە بەبێ‌ئەوەی کوشتار ڕووبدا، پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینەو کۆمەڵێك مەڕو ماڵاتی ئەوانی بە غەنیمەت لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە(٢).

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص١٠٠-١٠١، وە (البداية والنهاية)، ج٤، ص١٠٧-١٠٩.
٢) هەردووك سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ص١٠٢، وە ج٤، ص١١٢.

## چوارەم: غەزای (بنو المصطلق) لەلای سەرچاوەی (المریسیع) :-

(بنو المصطلق) لقێكن لە (خزاعة)، هۆی روودانی ئەو غەزوەیەش ئەوەبوو كە:

أ/ (بني المصطلق) لە جەنگی ئوحوددا هاوكاری قورەیشییەكانیان كردو یارمەتییان دان، لە دژی مسوڵمانەكانو بەشدارییان كرد لە جەنگەكەدا.

ب/ ئەوان كۆنترۆڵی رێی مەككەیان كردبوو، وە بووبوونە بەربەستێك لە بەرامبەر مسوڵماناندا، كە بتوانن هاتوو چۆی (مەككە) بكەن.

ج/ پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێ گەیشتبوو، كە (بني المصطلق) هێز كۆدەكەنەوە بۆئەوەی بەسەر (مەدینە)دا بدەن.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە مانگی (شەعبان)ی ساڵی پێنجەمی كۆچیدا بە (٧٠٠) موجاهیدو (٣٠) سی ئەسپ سوارەوە -كە ئەوكات ئەسپ كەمبووەو ولاخێكی كاریگەر بووە لە جەنگدا- بۆیان چووەو لە سەرچاوەی (المریسیع) لەگەڵ كافرەكان بەیەك گەیشتوونو دوای كوشتارێكی كەم (بنو المصطلق) تێكشكاونو پێغەمبەریش ﷺ مەرو ماڵاتو ماڵو منداڵەكانیشی بە غەنیمەت گرتوون، لەوبارەوە (بخاري)[١] و ئەم دەقەی ئاوا هێناوە: (... إن النبي ﷺ أغار على بني المصطلق وهم غارُّون، وأنعامهم تسقى على الماء، فقتل مقاتلتهم، وسبى ذراريهم، وأصاب يومئذ جويرية)، واتە: پێغەمبەر ﷺ هێرشی كردە سەر (بني المصطلق)، كە ئەوان بێئاگابوون، وە مەرو ماڵاتیان ئەوكاتە ئاو دەدرا لەسەر ئاو، جەنگاوەرەكانی كوشتن (هێندێكیش رایانكرد)، وە ژنو منداڵەكانیشیانی بە غەنیمەت گرتن، وە لەو رۆژەدا (جويرية بنت الحارث) كچی سەرۆك عەشیرەتی (بنو المصطلق) بەدیل گیراوە، (مسلم)یش ئەم بەسەرهاتەی باس كردوە[٢]، جا زانایان باسیان كردوە، كە چۆن

١) صحيح البخاري: ٢٥٤١.
٢) صحيح مسلم: ٤٤٩٤.

پێغەمبەر ﷺ لە بێئاگاییدا بەسەریدا داون، ڕوونی دەکەنەوەو دەڵێن: هەرچەندە ئەوان بێئاگابوون کە پێغەمبەر ﷺ بۆیان دەچێ، بەڵام پێشتر ئەوان هێزیان کۆکردۆتەوە کە بەسەر مەدینە دابدەنو هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ شەڕی لەگەڵ هیچ هۆزو تیرەیەکدا نەکردوە تا ئاگاداری نەکردبنەوەو بانگیان نەکا بۆ ئیسلام، پاشان پێغەمبەر ﷺ (جويرية بنت الحارث) دوای ئازادکردنی هێنایو کردی بە هاوسەری خۆی.

دوایی هاوەڵانی بەڕێزیش ئەو ئافرەتو منداڵانەی (بني المصطلق) کە کەتبوونە لایان، هەموویان ئازادکردنو گوتیان: مادام ئەوانە بوون بە خەزووری پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمە جوان نیە ئەوانە بکەینە دیلو کۆیلە.

(عائيشة) دایکی مسوڵمانان لەوبارەوە، دەڵێ: هیچ ئافرەتێك بەقەدەر (جويرية -خوا لێی ڕازی بێ- بە بەرەکەت نەبووە، چونکە بەهۆی ئەوەوە هەموو قەومەکەی ئازاد کراون، دواییش خەڵکێکی زۆر لە (بني المصطلق) مسوڵمان بوون، سەرۆکی عەشیرەتەکەش (الحارث) باوکی (جويرية) بەهەمان شێوە مسوڵمان بوو، کە ئەمە یەکێك بوو لەو حیکمەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ (جويرية)ی کردۆتە هاوسەری خۆی، کە کچی سەرۆك عەشیرەتی (بني المصطلق) بوو[١].

## پێنجەم: هەوڵدانی مونافیقەکان بۆ ئاژاوەنانەوە لەنێوان کۆچکەرانو پشتیوانانەدا لە غەزای (بنو المصطلق)دا[٢]:-

هەرچەندە مونافیقەکان لە غەزاکانی پێشوو خۆیان دوا دەخست، بەڵام ئەمجارەیان کە بینییان مسوڵمانان لە سەرکەوتن دان، بەمەبەستی دەستگیر بوونی غەنیمەت،

---

١) البداية والنهاية، ج٤، ص(١٨٦-١٩٠).

٢) بڕوانە: (صحيح البخاري): ٤٩٠٥، وە (صحيح مسلم): ٦٥٢٦، وە (المصباح المنير...)، ص(١٤٠٧-١٤٠٨).

www.alibapir.com


خەڵکێکی زۆریان لەو غەزایەدا بەشدارییان کرد، دوای ئەوەی مسوڵمانان سەکەوتنیان بەدەستهێنا لای ئاوی (مریسیع)، مونافیقەکان ویستیان کێشە لەنێوان کۆچکەرانو پشتیوانانداندا دروست بکەن، (زەیدی کوڕی ئەرقەم) دەڵێ لەو غەزایەدا گوێم لە (عبدالله بن أبيّ) بوو دەیگوت: هاوکاری هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ مەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵی نەمێننو دەوری چۆڵ بکەنو ئەگەر گەڕاینەوەش بۆ (مەدینە) دەبێ ئێمەی بەدەسەڵات پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکانی کە زەلیلن لەشارەکەمان دەربکەین، دوایی پێغەمبەر ﷺ لەوە ئاگادار کرایەوە، ئەویش (عبدالله)و هێندێك لە مونافیقەکانی بانگ کرد لەسەر ئەو قسەیە، بەڵام ئەوان سوێندیان خوارد کە ئەو قسەیەیان نەکردوە، ئیدی بەوبۆنەیەوە سوورەتی (المنافقون) هاتەخوارێ کە ئاوا دەست پێدەکات: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١﴾ (جابر بن عبدالله الانصاری)یش سەبارەت بەڕووداوێك لای ئاوی (مریسیع) دەڵێ: یەکێك لە کۆچ کەران لە یەکێکی پشتیوانانیدا دوایی هەردوو لا بانگی خەڵکی خۆی کرد بۆ هاوکاریی، واتە: کۆچکەرانو پشتیوانان، کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بیست فەرمووی: **{ما بال دعوى الجاهلية،... دعوها فانها مُنتِنةٌ؟!}** (بۆ بانگەشەی نەفامیی دەکەن ئەوە واز لێبێنن، چونکە بۆگەنە (واتە: ئەو جۆرە بیروڕاو قسانە بۆگەنن؟)، کە (عبدالله بن أبيّ) ئەوەی بیست گوتی: چۆن کۆچکەران ئەوە دەکەن؟ سوێند بە خوا کە چووینەوە مەدینە، دەبێ ئێمەی بەدەسەڵات ئەوانی زەلیل دەربکەین، (عومەری کوڕی خەتتاب)یش کە ئەو قسەیەی سەرۆکی مونافیقەکانی بیست گوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ لێم گەڕێ با لەگەردنی ئەو مونافیقە بدەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{دَعْهُ لا يتحدث الناس انَّ محمداً يقتل أصحابه}**، واتە: (لێی گەڕێ با خەڵك نەڵێ موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێ).

لە ڕیوایەتێکدا هاتوە، کە عومەر داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات فەرمان بکات بە (عبدالله بن بشر)، کە لە خەزرەجییەکانە، کە (عبدالله بن أبيّ) بکوژێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{فكيف يا عمر اذا تحدث الناس ان محمداً يقتل اصحابه، لا ولكن ناد يا عمر بالرحيل}**، واتە: ئەی عومەر چۆن کاری وادەکەم! دوایی خەڵك دەڵێ: موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێ، بەڵکو ئەی عومەر جاڕ بدە با بڕۆین، ئەوەش حیکمەتێکی دیکەی پێغەمبەرە ﷺ داوا لە عومەر دەکا، کە جاڕ بدا بۆ ڕۆیشتن بۆ ئەوەی ئەو قسەیەی (عبدالله بن أبيّ) بڵاونەبێتەوەو تەشەنە نەکات، کە ویستوویەتی ئاژاوەو دووبەرەکێ بنێتەوە لە نێوان کۆچکەران‌و پشتیوانانداو، هەرچەندە ماوەیەکی زۆر دەڕۆن، بەڵام دوایی قسەکە هەر بڵاودەبێتەوە، ئنجا ئەم بەسەرهاتەش کە (عبدالله بن أبيّ) دەیبیستێتەوە کە (زيد بن أرقم) ئەو قسەیەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، عبدالله دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺو دەڵێ: سوێند بە خوا من شتی وامنەگوتوەو...، پێغەمبەریش ﷺ دەکەوێتە گومان لە قسەکەی (زيد بن أرقم)، (زيد) دەڵێ قەت بەو ئەندازەیە تووشی نارەحەتی نەبووم، چونکە پێغەمبەر ﷺ لێم کەوتە گوومانەوەو دڵنیاش بووم، کە (عبدالله بن أبيّ) ئەو قسەیەی کردوە، بۆیە چوومە ماڵەوەو زۆر خەفەتم پێ خوارد، تا خوای پەروەردگار سوورەتی (المنافقون)ی ناردە خوارێ، دوایی پێغەمبەر ﷺ بانگی کردم فەرمووی خوای پەروەردگار ئەتۆی بەڕاست دانا، ئنجا (عبدالله بن عبدالله بن أبيّ)، کە دەبیستێتەوە بابی هەڵوێستێکی وای بووە، بۆخۆی دەچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو دەڵێ: ئەی پێغەمبەی خوا ﷺ بیستوومە بابم شتێکی وایگوتوەو تۆش دەتەوێ بابم بکوژی، دەترسێم ئەگەر تۆ مسوڵمانێك ڕاسپێری بۆ ئەوەی بابم بکوژێ، دوایی من بکەومە هەڵەوەو ئەو مسوڵمانە بکوژمەوە لە جیاتی کافرێك، چونکە ناتوانم بکوژی بابم ببینم!، جا بۆیە هاتووم داوات لێدەکەم ڕێگام بدەی کە خۆم بابم بکوژم، ئەویش دەفەرموێ: نەخێر بەڵکو چاکەی لەگەڵ دەکەین‌و ڕێزیشی دەگرین، وە لەکاتی گەڕانەوەیاندا بۆ مەدینە (عبدالله)ی کوڕی (عبدالله بن أبيّ) دەچێتە پێش بابی‌و پێی

دەڵێ: سوێند بەخوا تۆ ڕێگات نیە بچیەوە مەدینە تا پێغەمبەر ﷺ ڕێگات پێ نەدا، وە سوێند بەخوا دەبێ دەرکەوێ، کە پێغەمبەر ﷺ عەزیزەو تۆش زەلیلی، دوایی کە پێغەمبەر ﷺ پرسیار دەکاو دەفەرموێ: ئەوە چییە؟! (عبدالله) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ڕێگای بابم نادەم بچێتەوە نێو شاری مەدینە، مەگەر تۆ ڕێگای بدەی، ئەویش دەفەرموێ: قەیناکا ڕێگای بدە، (عبدالله)ش دوای فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگای دەدات بچێتەوە مەدینە!! ئیمانو هەڵوێستی ئیمانداران دەبێ ئاوا بێ[١].

## شەشەم: کارساتی بوختان (الإفك) :-

کارەساتی بوختان کردن بە (عائشة) دایکی مسوڵمانان -خوا لێی ڕازی بێ-، یەکێکە لەو ڕووداوانەی کە لەکاتی غەزای (بني المصطلق)دا ڕوویداوە، کە هەرکام لە (ابن هشام)و (بخاري)و (مسلم) لەبارەیەوە دواونو باسیان کردوە[٢]، دیارە بوختانەکە زیاتر لەلایەن (عبدالله بن أبيّ بن سلول)ەوە پەیدا بوو، بەڵام خەڵکێکی دیکەشی تێوە گلاندبوو.

(عائشة) -خوا لێی ڕازی بێ- بە درێژیی ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوەو ئەمە کورتەیەتی:

دەڵێ: دوای ئەوەی ڕۆیشتین بۆ غەزای (بنو المصطلق) پاشان گەڕاینەوە بۆ مەدینە نزیکی مەدینە بووینەوە، بارگەو بنەمان خست بۆئەوەی ئیسراحەت بکەین، شەو من لەگەڵ ئافرەتاندا چووم بۆ سەرئاو، ملوانکەیەکم هەبوو لێم پچڕا، نەشمزانیبوو تا هاتمەوە شوێنی بارگەو بنەکەم، دوایی کە دەستم بۆ بەرۆکم برد ملوانکەکەم پێ نەمابوو، کە خۆرهەڵات چووم لە ملوانکەکەم بگەڕێم، هەتامن

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(١٤٠٨-١٤٠٩).
٢) بڕوانە: (السيرة النبوية...)، ج٣، ص(١٥٥-١٥٩)، وە (صحيح البخاري): ٤١٤١و٤٧٥٧، وە (صحيح مسلم): ٢٧٧٠.

هاتمەوە شوێنی خۆم ئەوان ڕۆیشتبوونو کەسی لێنەما بوو، ئەوکاتە ئافرەتان لە کەژاوەدا هەڵگیراون، کە ژوورێکی بچووکی لە چەرم دروستکراوەو پەردەشی هەبووەو لەسەر حوشتر دانراوە.

(عائشة) دەڵێ: ئەو کاتەش ئافرەتان خواردنیان کەم دەخوارد، کە پیاوەکان کەژاوەکەیان هەڵگرتوەو خستویانەتە سەر حوشترەکە پێیان سەیر نەبووە کە سووکەو بە بەتاڵی خستوویانەتە سەر وڵاخەکەو وایانزانیوە منی تێدامو ڕۆیشتوون، دوایی من لە شوێنی خۆم دانیشتم وامزانی بەدوامدا دێنەوەو لەوێ خەوم لێکەوت، ئەوەندەی پێنەچوو گوێم لە (استرجاع)ی (صفوان بن المعطل)[١] بوو، دەیگوت (انا لله وانا اليه راجعون) ئەوە دایکی مسوڵمانانە لێرە بەجێماوە، کاتی خۆی پێش ئەوەی پەردە (حجاب) بگیرێتەوە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ منی بینی بوو، بۆیە دەیناسیم، منیش کە ئەوم دی لەچکەکەم لەخۆمەوە پێچا، سوێند بەخوا بەبێ ئەوەی یەك وشەی لەگەڵ بڵێم یان یەك وشەم لەگەڵ بڵێ، هاتو حوشترەکەی بۆ یەخ دامو دوورکەوتەوە تا سواری حوشترەکە بووم، دوایی جڵەوەکەی ڕاکێشاو ڕۆیشتین تا گەیشتینەوە سوپا، من ئاگام لە هیچ شتێك نەبوو، نەمزانی کە (عبدالله بن أُبيّ) ئەو بوختانەی بۆ من بڵاوکردۆتەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بیستبووی، بۆیە ئەو لوتفو خولقەی جارانی لەگەڵم نەمابوو، هەتا شەوێك لەگەڵ ئافرەتاندا چووم بۆ سەرئاو، دایکی (مسطح بن أثاثة) لە کراسەکەی خۆی هەڵئەنگوتو قسەیەکی بە (مسطح) گوت!

منیش گوتم بۆ وای پێ دەڵێی؟!

گوتی: بۆ نەتزانیوە بوختان بە تۆ کراوەو ئەویش یەکێکە لەوانەی، کە لەو بوختانەدا بەشدارە؟

---

١) پێغەمبەر ﷺ لە غەزایەکاندا نەفەرێکی لەپشتەوە بەجێ دەهێشت، وە فەرمانی پێ دەکرد، کە دوایی بە شوێنماندا وەرە، ئەگەر کەسێ شتێکی لەبیر چووبێ، وڵاخێك، کەلوپەلێك، ئەو لەگەڵ خۆی بیهێنێتەوە.

کە ئەوەم لەو ئافرەتە بیست نەمتوانی بچمە سەرئاو (تارەت بگرم)و هاتمەوە زۆر خەفەتم پێخواردو نەخۆش کەوتم، دوایی پێغەمبەر ﷺ هات و فەرمووی: ئەی (عائشة) من شتێکی ئاواو ئاوام بیستوە، جا ئەگەر لەوبارەوە بێتاوانی ئەوە خوا بێتاوانییەکەت دەخاتە ڕوو، وە ئەگەر گوناهێکیشت کردبێ داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەو بگەڕێوە بۆ لای، بەندە کە دان بەهەڵەی خۆی دابنێ و تۆبە بکا، خوا تۆبەی قبووڵ دەکات، دەڵێ: منیش بە بابمم گوت وەڵامی پێغەمبەری خوام بۆ بدەوە!

ئەویش گوتی: بەخوا نازانم لەوبارەوە چی بڵێم!

دوایی بە دایکمم گوت: وەڵامی پێغەمبەری خوام ﷺ لەجیاتی بدەوە!

ئەویش گوتی: بەخوا نازانم چۆن وەڵامی پێغەمبەری بدەمەوە!

منیش کە ئەوکاتە ئافرەتێکی کەم تەمەن بووم و قورئانم زۆر نەخوێندبوو، گوتم: بەخوا من دەزانم ئەو قسەیەتان بیستوەو لە دڵتاندایەو ئەگەر پێتان بڵێم من بێتاوانم، خواش دەزانێ کە بێتاوانم، ئەوە لەوانەیە باوەڕم پێ نەکەن، بەڵام ئەگەر دان بنێم بە شتێکدا کە خواش دەزانێ من لێی بەریم ئەوە لەوانەیە باوەڕم پێبکەن، بەهەر حاڵ هەر ئەوەندەم پێدەگوترێ، کە بابی (یوسف) گوتی: (ئەوکاتە ناوی (یعقوب)یشم لەبیر نەمابوو): ﴿... فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾﴾ یوسف، واتە: ئارامگرتنێکی جوان (دەکەم بە پیشە) وە یارمەتی لێوەرگیراو لەسەر ئەوە، کە دەیلێن، هەر خوایە! ئیدی ڕاکشامەوەو دەستم کرد بە گریان، هەر لەوکاتەداو لەوێ پێغەمبەر ﷺ کەوتە حاڵەتی (وحي) بۆ هاتنەوەو یەکسەر ڕاکشاو تا (وحي)یەکەی تەواو بوو، ئنجا هەستایەوەو ڕووی موبارەکی دەدرەوشایەوە وەك مانگی چواردەو فەرمووی: **{أبشري يا عائشة أمّا الله فقد برّأكِ}**، واتە: ئەی عائیشە مژدەت لێبێ، خوا تۆی بەپاك لەقەڵەمدا، دایك و بابیشم گوتیان: دەهەستە سوپاسی پێغەمبەر ﷺ بکە، منیش گوتم: بەخوا جگە لە خوا سوپاسی کەس ناکەم، چونکە خوا پاکیی منی ناردۆتە خوار، ئەو ئایەتانەی کە ئەوکاتەش هاتنە خوار ئەمانە بوون:

www.alibapir.com

۞إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ
مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١﴾ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ
ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ
شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ
عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ
بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ
﴿١٥﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ
﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ
وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ
عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ
عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ
ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ
عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾
وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ
يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ

وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ النور، کە ئێمە بەس ئایەتی کۆتاییان تەرجەمە دەکەین، واتە: ئافرەتانی پیس بۆ پیاوانی پیسو پیاوانی پیسیش بۆ ئافرەتانی پیسن، وە ئافرەتانی پاك بۆ پیاوانی پاكنو پیاوانی پاك بۆ ئافرەتانی پاكن، ئەوانە بەریینو دوورن لەوەی کە گوتراوە، وە لێبوردنێکی گەورەو ڕۆزییەکی پڕ حورمەتیان هەیە (لەلایەن خواوە).

هەر لە سووڕەتی (النور)یشدا سزای بوختان کردن بە ئافرەتی داوێن پاك هاتە خواریّ، کە هەرکەسێك بوختانی داوێن پیسیی بە ئافرەتێك بکاو بەڵگەو شایەدی نەبن، (٨٠) قەمچی لێدەدریّ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ ﴾ النور.

سەرەنجام سێ هاوەڵی بەڕێز سزادرانو یەکی (٨٠) قەمچیان لێدرا، ئەو سێ کەسەش بریتی بوون لە (حسان بن ثابت) کە شاعیری پێغەمبەر بوو ﷺ، بەڵام دیارە کەوتۆتە نێو ئەو قسەو باسانەوە، وە (مسطح بن أثاثة) کە خزمی (أبو بکر) بوو، هەروەها (حمنة بنت جحش) کە خوشکی (زینب بنت جحش)ی خێزانی پێغەمبەر بوو ﷺ.

(عائشە) -خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: هەرچەندە (زینب) هەوێشم بوو، بەڵام دینداریيو پارێزکارییەکەی ڕێگای ئەوەی لێگرت کە ناحەق بڵێ، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەو مەسەلەی منەوە پرسیاری لێکردبوو، گوتبووی: بەخوا من جگە لە پاکییو چاکیی هیچی دیکەم لەو ئافرەتە نەبینیوە، بەڵام خوشکەکەی، واتە: (حِمْنَةُ بنت جحش) لەبەر دەمارگیریی بۆ خوشکەکەی خۆی، خۆی تووشی ئەو گوناحە کرد، ئاشکراشە کە دوای ئەوەی ئەو سێ هاوەڵە داری حەددیان لێدرا، وە سزای خۆیان وەرگرتەوە، لەو گوناحە پاکبوونەوەو هەر هاوەڵی بەڕێزن، چونکە

فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە دەفەرموێ: (هەرکەسێك کە تاوانێکی کرد ئەگەر سزای دونیایی لەسەر بدرێ ئەوە لە گوناحەکە پاك دەبێتەوەو سزای دوارۆژیشی لەسەر نامێنێ)[1].

ئنجا (حسان بن ثابت) چەندان شیعری لە وەسفو مەدحی (عائشة)دا -خوا لێی ڕازی بێ- گوتوون، وە ئەوەشی دەرخستوە کە ئەو خۆی قسەکەی هەڵنەبەستوەو داری حەددیشی بەس لەبەرئەوە لێدراوە، کە قسەکەی گێڕاوەتەوە بۆ خەڵکی، نەك قسەکەی هەڵبەستبێ‌و لەوەش پەشێمانە، ئنجا هەرچەندە دروستکردنی بوختانەکە لەلایەن (عبدالله بن أُبيّ)یەوە بووە، بەڵام ئەو داری حەددی لێنەدراوە، ئەویش یان لەبەرئەوە کە خوا بەڵێنی داوە تووشی سزایەکی گەورەی بکات‌و حەددیش مایەی کەمکردنەوەی سزایە، یان لەبەر هەمان ئەو بەرژەوەندییەیە کە لە نەکوشتنەکەیدا ڕەچاو کرا بوو! یان لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی وا قسەکەی نەکردوە کە بە بەڵگە لەسەری ئیسپات ببێ. (مسطح)یش کە خزمی ئەبووبەکر – خوا لێی ڕازی بێ- بووەو پێشتریش ئەبووبەکر هاوکاریی کردوە، دوای ئەوەی لە بوختانەکەی عائیشەدا بەشدار دەبێ سوێند دەخوا کە ئیدی هاوکاریی نەکات‌و دەڵێ: (والله لا أُنفقُ عليه شيئاً أبداً)، بەڵام کاتێك خوا - عزّ وجلّ- ئەم ئایەتە دەنێرێتە خوار: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ النور، (أبوبكر) دەڵێ: (والله اني لأُحبُّ أن يغفر الله لي) بە خوا حەزدەکەم خوا لێم خۆشبێ، ئیدی لە قسەکەی خۆی ژیوان دەبێتەوەو دەست دەکاتەوە بەهاوکاریی کردنی (مسطح).

---

١) وەك لە (بيعة القبة الأولى) فەرموویەتی: بڕوانە: (السيرة النبوية)، ج١، ص(٢٢٣)، پێشتریش هێناومانە.

ئێستاش با سەرنجی هەڵوێستێکی دایکمان (عائشة)و هەڵوێستێکی (أبو بکر)ی بابی – خوا لێیان ڕازی بێ- بدەین تاکو زیاتر شارەزای پایەوپلەی بەرزی ئیمانییان بین:

١) (عائشة) دەڵێ: بە خوا من ئەوکاتە دەمزانی بەرییمو خوا پاکییم دەردەخات، بەڵام بەخوا پێم وانەبوو خوا وەحییەکم لەبارەوە بنێرێتە خواریو بخوێنرێتەوە، وەخۆمم لەلا لەوە کەمتربوو، کە خوای زاڵو شکۆدار بە قورئان قسەم لەبارەوە بکات، بەڵام ئومێدم وابوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا خەون ببینێو خوا پاکییمی پێ دەربخات.

هەڵبەتە ئەو خۆ لەلا کەمبوونەی دایکمان عائیشەش بووە، کە ئاوا خوای کاربەجێ بەرزی کردۆتەوە!

٢) (أبو بکر)یش -خوا لێی ڕازی بێ- کە (مسطح) هەرچەندە بوختان بۆ کچەکەی دەکاتو نە ڕەچاوی خزمایەتیو نە هاوکارییو چاکەی ئەبووبەکر ناکات، بۆی! بەڵام پاش فەرمایشتی خوا – عزّ وجلّ- لە بڕیارەکەی پەشیمان دەبێتەوەو چاوپۆشیی لە هەمو شتێك دەکات بۆ ڕازیکردنی خوا!

ئەوانەی باسمان کردن کۆمەڵێك ڕووداوی گرنگ بوون لە پێش جەنگی (ئەحزاب)دا، کە جەنگی (خەندەق)یشی پێ دەڵێن.

**چەند ڕاستیی یەك لەو ئایەتانەی لە كارەساتی (بوختان)دا هاتنە خوار وەردەگیرێن لەوانە :-**

١ - تاقیكردنەوەی هەریەك لە پێغەمبەر ﷺ و (أبو بكر)و خێزانیو (عائشة)و هەڵوێستی شەرعییانەیان بەرانبەریو تێكنەچوونی هاوسەنگیی (توازن)یان.

٢ - پاكییو بێتاوانیی نیشاندانی (عائشة)و (صفوان بن معطل) لەو مەسەلەیەدا، چونكە هەر ناونرانی بەهەڵبەستراو (إفك) ئەوە دەگەیەنێ.

٣ - داكۆكییكردنی مسوڵمانان لەسەر پاراستنی شەڕەفو نامووسی یەكدیو گومانی باش بەیەك بردنیان.

٤ - ناوزەدكرانی ڕێكخەرانی ئەو بوختانو ئاژاوەیە بە درۆزنو درۆ هەڵبەست.

٥ - پێویستە دركاندنی هەر قسەو هەواڵێك لە ڕووی زانیارییو لێكۆڵینەوە بێ.

٦ - حەد دەركردن لە هەركەسێك شایستەی بێ، با هاوەڵیش بێت.

٧ - قەدەغەكرانی بڵاوكردنەوەی قسەی فاحیشەو ناقۆڵا لەنێو مسوڵماناندا.

٨ - نەهی كران لە بەدواكەوتنی هەنگاوەكانی شەیتان كە ئینسان بەرەو هەڵدێر دەبات.

٩ - لێبوردنو چاوپۆشییو دڵگەورەیی لەئاست خەتاباراندا

١٠ - بەرگرییكردنی خوای پەروەردگار لە بەندەكانی خۆیو هەڕەشەكردنی لەوانەی درۆو بوختانیان بۆ هەڵدەبەستن.

# جەنگی ئەحزاب (خەندەق):-

خوا پشتیوان بێ لە چەند خاڵێکی کورت‌و گوشراودا، باسی جەنگی ئەحزاب دەکەین:-

## یەکەم: ناو و کاتی ڕوودانی جەنگی ئەحزاب :-

**یەك/** ئەم جەنگە دوو ناوی هەن:-

١) **غزوة الأحزاب:** چونکە کۆمەڵێك حیزب‌و خەڵکی جیاجیای مەککەو دەورو بەری یەکیان گرت لە دژی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان‌و هێرشیان کردە سەر (مەدینە)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾﴾ الأحزاب.

**٢) غزوة الخندق:** چونکە مسوڵمانان لەو جەنگەدا، بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ و لەسەر پێشنیاری (سلمان الفارسي) خەندەقیان لە چەند شوێنێکی دەوری شاری مەدینەدا لێدا، لەنێوان خۆیان‌و سوپای دوژمندا بۆئەوەی دوژمن زەفەریان پێ نەبا، کە ئەوکارە یەکەمین جار بووە مسوڵمانان بیکەن، بگرە لەنێو گەلی عارەبدا شتێکی تازەو داهێنراو بووە.

**دوو:** ڕوودانی جەنگی (ئەحزاب) لە مانگی شەووالی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە[١].

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام) ج٣، ص ١٠٣.

## دووەم: هـۆی ڕوودانی جەنگی ئەحـزاب:-

(ابن هشـام)[١] لـەبارەی هـۆی ڕوودانـی جـەنگی (ئـەحزاب)ەوە گوتوویـەتی: چـەند کەسێك لە جوولەکەکانی (بني النضیر) کە بـەهۆی پەیـمان شـکاندنیانەوە پێغەمبـەر ﷺ لە مـەدینە دەریکردنو بەشـێکیان چـوونە خەیبـەرو لـەوێ نیشـتەجێبوونو چـەند کەسێکی دیکە لە سـەرانی جوولەکـەی تیـرەی (بـني وائـل) لەوانـە: (سـلام بـن أبـي الـحقیق النضري وحُیَي بن أخطب النضري وكنانة بن أبي الحقیـق النضـري وهـوذة بـن قیس الوائلي وأبو عمار الوائلي) خـەڵکیان هانـدا، وە حزبـەکانیان کـۆکردەوە لـە دژی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان، نوێنەریان نارد بـۆ لای قوڕەیشـییەکان لـە مەککـەو زۆر هانیاندان بۆ دژایەتی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان، کـە بەیەکـەوە بەسـەر (مـەدینـە)دا بدەنو موحەممەدو کۆمـەڵەکەی ڕیشەکێش بکەنو تەڕو وشـکیان بەیەکـەوە بسـووتێنن، وە لەو ڕووداوە دابـوو کـە قوڕەیشـییەکان لـە جوولەکـەکانیان پرسـی[٢]: ئێـوە ئـەهلی کیتابنو زانیاریی وەحیی ئاسمانتان لایە کە ئێمە لامان نیە، ئایا دینـی ئێمـە چـاکترە یان دینی موحەممەد؟ ئەوانیش گوتیان: بێگومان دینی ئێوە باشترە!.

ئنجا خوای پەروەردگـار لەوبـارەوە ئەم ئایەتانەی ناردنـە خـوارێ، کـە دەفـەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ٥١ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ٥٢﴾ النسـاء، واتە: ئایا سەرنجی ئەوانـە نـادەی، کە شتێك لە کتێبی خوایان پێدراوە، ئیمان دێنن بە جیبـت (صـەنەم)و طـاغـووت، وە بەئەوانەی، کە کافرن دەڵێن: ئێوە دینەکەتان چاکتـرە لە هی ئەهلی ئیمان!...

١) (السیرة النبویة)، ج٣، ص(١٠٣-١٠٤).

٢) قوڕەیشییەکان جارێکی دی پێشتریش هەمان پرسیاریان لە جولەکەکان کرد، کاتێك چوون بۆ (یثـرب) پێش کۆچکردنی مسوڵمانان بۆ ئەوێ.

کەواتە: هۆی ڕوودانی جەنگی (ئەحزاب)و هەڵگیرسێنەری ئاگرەکەی جوولەکەکان بوون، کە چوون موشریکەکانی مەککەیان هانداو هەڵیاننانو بەڵێنیشیان پێدان کە پشتگیرییان بکەن دژی مسوڵمانان[١].

## سێیەم: بەشداربووانی بەرەی دوژمن لە جەنگی ئەحزابدا:-

بەشداربووانی جەنگی ئەحزاب لە ئەهلی کوفر، ئەوانە بوون[٢]:

١) لە باشوورەوە قورەیشو کینانەو هاوپەیمانانیان لە خەڵکی تیهامە، بە سەرکردایەتی (أبو سفیان) بە چوار هەزار کەسەوە.

٢) هۆزی (غطفان).

٣) أ- تیرەی (فزارة) بە سەرکردایەتی (عیینة بن حصن).

ب- تیرەی (مُرَّة) بە سەرکردایەتی (الحارث بن عوف).

ج- تیرەی (أشجع) بە سەرکردایەتی (مسعر بن رَخیلة).

کەواتە: وێڕای قورەیشو هاوپەیمانەکانیان چوار هێزی دیکەی موشریك لەو جەنگەدا بەشداربوون، جگە لە جوولەکەکانی خەیبەرو (بني قریظة) کە لەنێو مەدینەدا بوون، بەڵێنیان دابوو بە هەموو شێوەیەك هاوکاریی موشریکەکان بکەن، هەرچەندە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا هاوپەیمان بوون، ئەوانە هەموویان کۆبوونەوەو یەکیان گرت لە دژی مسوڵمانانو ئەوانە ناویان لێنراوە (الأحزاب) واتە: حزبەکان ژمارەیان وەك (ابن هشام) باس دەکات، (دەهەزار) کەس بووەو مسوڵمانانیش (سێ هەزار) کەس بوون[٣].

---

١) بڕوانە: (المصباح المنیر في تهذیب تفسیر ابن کثیر)، ص(٣٠٠).
٢) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٣، ص(١٠٣-١٠٤).
٣) (السیرة النبویة)، ج٣، ص(١٠٧).

## چوارەم: خەنـدەق لـێـدان بە پێشـنیاری سـەلمانی فارسـیی:-

بۆیەکەمین جار تاکتیکێك بـەکارهێنرا لـە جـەنگی (ئـەحزاب)دا، کـە لـە مێـژووی عـارەباندا وێنەی نەبوو، ئەویش بریتی بوو لـە هەڵکەنـدنی خەنـدەق لـەو شـوێنەی کـە پێدەشتەو دوژمـن دەتوانێ لێیەوە بێتە نێو شار، وە ئەو خەندەکەی کە پێغەمبـەر ﷺ لێیداوە بەدەوری هەموو شاری مەدینەدا نەبووە، بەڵکو تـەنها لـەو شـوێنانە بـووە کـە دەشتایی بـووەو دوژمـن توانیویـەتی بـە سـوارو پیـادە لێیـەوە بێتـە نێـو شـار، وە لـە شـوێنەکانی دیکـەی وەك چیاو گردەکانـدا، هـاوەڵانی بـەڕێز (سـەنگەر)یان دروسـت کردوونو تیـرهاوێژیان لـێداناون، خەندەك لێدانیش لە جەنگی (خندق)دا بە پێشنیاری سەلمان بووە -خوا لێی ڕازی بێ-، کە هەریەك لە (الواقدي)[1] و (إبـن سـعد)[2] و (إبـن هشـام)[3] هێناویانە دەڵێن: سـەلـمان گوتی: (یـا رسـول الله انـا اذا کنـا بـأرض فـارس وتـخوفنا الـخیل، خنـدقنا علینـا فهـل لـك یـا رسـول الله ان نـخندق؟ فأعجـب رأي سـلمان الـمسلمیـن)، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە وڵاتی فارس کاتێـك، کـە لـە سوارەی دوژمن دەترساین، لەو شـوێنەوە کە دوژمـن دەتوانـێ لێیـەوە بـێ خەنـدەکمان لێدەدا، ئایا فەرمانـمان پێناکەی خەنـدەکێك لێبـدەین؟! مسـوڵمانان ئـەو پێشـنیارەی سـەلـمانیان پێ چاك بوو، وە پێغەمبەر ﷺ پێشنیارەکەی سەلـمانی کـرد بـە کـردارو هەڵسان بە لێدانی ئەو خەندەکە.

دوای ئەو پێشنیارە باشەی (سـلمان) بە لێدانی خەندەك وەك (ابن هشـام)[4] دەڵـێ: کۆچکەران گوتیان: (سـلمانُ مِنّـا)، واتە سەلـمان لـە ئێمەیـە، پشـتیوانانیش گوتیـان: (سلمانُ مِنّا) سەلـمان لە ئێمەیە، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{سلمان مِنّا أهـل**

---

١) مَغـازي الواقـدي، ج٢، ص(٤٤٤).

٢) طبقـات ابن اسـعد، ج٢، ص(٦٦).

٣) (السیـرة النبویـة)، ج٣، ص(١٠٩).

٤) بڕوانە: ج٣، ص(١٠٩)، وە بڕوانە: (البدایة والنهایة)، ج٤، ص(١٢١).

**البیت}**، واتە: سەلمان لە بنەماڵەی ئێمەیە، جا وەك لە سەرچاوەكانی (سیرە)دا ئاماژەی پێكراوە، ئەو خەندەكە بە ئەندازەیەك قوڵ بووە، كە نەگونجێ پڕ بكرێتەوە، وە بە ئەندازەیەكیش بەرین بووە، كە نەگونجێ لێیەوە بازبدرێ، هەروەها باسی قوڵییو پانییەكەیان كردوە، كە چەند گەزێك بوون، وە لەو غەزایەدا پێغەمبەر ﷺ (عبدالله ابن ام مكتوم)ی لە شاری مەدینە بەجێهێشت بە برا گەورەو مشوورخۆر[1].

## پێنجەم: ئەو ئایەتانەی لەبارەی خەندەك لێدانەوە هاتنەخوارێ:-

ئەو خەندەكانەی كە لەو شەڕەدا هەڵكەنراون، هەمووی هەر بە پاچو بێڵو بە ئارەقەی نێوچاوانو قوەتی شانو هێزوبازووی هاوەڵان بووە، كە بەتەئكید كارێكی زۆر بەزەحمەتو پرۆژەیەكی زۆر گەورە بووە، كە پێغەمبەر ﷺ خۆشی لەگەڵ هاوەڵانی بەشداریی لە هەڵكەندنی ئەو خەندەكانەدا كردوە، وە بە باسك (ذراع) پێواویانەو بەش بەشیان كردوەو هەر بەشەیان داوەتە تیرەو كۆمەڵێك كە هەركەسە بەشی خۆی هەڵكەنێ، هەندێك لە دڵ نەخۆشو ئیمان لاوازەكانو مونافیقەكانیش لە هەڵقەندنی خەندەقەكەدا خۆیان دزیوەتەوەو لەوكارە خۆیان بواردوە، خوای پەروەردگاریش لەبارەی هەڵوێستی مسوڵمانانی خاوەن ئیمانی ڕاستەقینەو مسوڵمانە دڵ نەخۆشەكانو ئەو مونافیقانەوە كە بەڕواڵەت خۆیان بە مسوڵمان پیشان دەدا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٠٦).

﴿أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ النور، واتە: بێگومان ئیمانداران (مسوڵمانانی ڕاستەقینە) ئەوانەن، کە ئیمانیان بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە وە هەرکاتێك لە خزمەت پێغەمبەردا بن بۆ ئیشێك کە مسوڵمانانی لەسەر کۆبنەوە ناڕۆن (وئەو ئیشە بەجێناهێڵن) هەتاکو مۆڵەت لە پێغەمبەر ﷺ وەردەگرن، (ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ) ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ وەردەگرن ئنجا دەڕۆن وە ئیش‌و کارێکیان هەیە جێبەجێی دەکەن، ئائەوانە بڕوایان بەخواو بە پێغەمبەی خوا هەیە، وە هەرکامێکیان مۆڵەتی لێ وەرگرتی بۆ هەندێك لە ئیش‌وکارەکانی مۆڵەتی بدە، بانگکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ یەکێکتان وەك بانگکردنی هێندێکتان بۆ هێندێکتان تەماشا مەکەن (-دعاء- لێرەدا بەمانای بانگ کردن دێ نەك پاڕانەوە) خوا ئەوانەتان دەزانێ (دەناسێ)، کە خۆ دەشارنەوەو خۆ لەیەك دەگرن یان خۆیان لەشت دەگرن بۆ ئەوەی دیار نەبن لە پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان.

پاشان دەفەرمووێ: با ئەوانەی، کە بێفەرمانیی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، بترسن کە فیتنەو بەڵایەکیان لە دونیادا تووش بێ، یاخود لە دوارۆژدا تووشی عەزاب‌و ئەشکەنجە ببن، (دیارە مەبەستی ئەوانە بووە، کە ئیمانێکیان هەبووە، بەڵام ئیمانەکەیان لاواز بووە، ئەگەرنا مونافیقەکان پێش ئەوەی لەسەر ئەو شتە گچکەو کەمانە عەزاب بدرێن، لەسەر ئەسڵی (نیفاق)و کوفرەکەیان عەزاب‌و سزا دەدرێن).

## شەشەم: چەند موعجیزەیەك لە کاتی خەندەك لێدانـدا:-

بێگومان خوای پەروەردگار چاکەو بەزەیی بێسنووری هەیەو کاتێك، کە مسوڵمانان دەکەونە ناڕەحەتییانەوەو تووشی گرفتاریی دێن، هێندێك کارئاسانییان بۆ دەکات، جا چ لەڕێی هەندێك هۆکارەوە بێ، کە دەیانسازێنێ، چ بەبێ هۆکارێکی زانراو بێ، وەك دەستەوستانکەر (معجزة)ێك بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)و، کە یاسادڕ (خارق العادة)یەو بە شێوەی ئاسایی بۆ خەڵکی دیکە نیە، وە بۆ ئەهلی ئیمانیش بە کەرامەت لەقەڵەم دەدرێ، موعجیزەش ئەوەیە، کە خەڵکی لە بەرامبەریدا

دەستەوستانەو تایبەتیشە بە پێغەمبەرانەوەو کەرامەتیش تایبەتە بە ئەهلی تەقواو دۆستانی خواوە.

(جابر بن عبدالله) یەکێك لەو موعجیزانەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ[١]: لەو شوێنەی، کە ئێمە هەڵماندەقەند گەیشتینە شوێنێکی ڕەق کە زۆر سەختو بەزەحمەت بووو بۆمان نەدەشکا، چووینە لای پێغەمبەر ﷺو گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە شوێنێکی زۆر ڕەقو سەختە، نازانین چۆن هەڵیقەنینو ناشکرێ لێی بگوازینەوە!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەندێك ئاوم بۆ بێنن، ئاوەکەمان بۆ هێناو دووعای بەسەردا خوێندو بەسەر ئەو شوێنە ڕەقەی داکرد، دوایی دەستمان کردەوە بە هەڵکەندن سوێند بەو کەسەی کردوویەتی بە پێغەمبەر ئەو شوێنە زۆر بەئاسانی هەڵکەنراو وەکو لمێکی لێکهەڵوەشاوەی لێهات.

موعجیزەیەکی دی کە (ابن هشام)[٢] بۆمان دەگێڕێتەوە ئەوەیە کە کچی (بشیر بن سعد)، کە خوشکی (نعمان بن بشیر)ە دەڵێ: یەکێك لە ڕۆژەکانی خەندەك هەڵکەندن دایکم هەندێ خورمای لە کۆشێ کردمو پێی گوتم: ڕۆڵە ئەوانە بەرە بۆ بابتو خاڵت (عبدالله بن رواحة) با ژەمی نیوەڕۆیەی پێ بکەن، منیش ڕۆیشتمو بەلای پێغەمبەردا ﷺ ڕەت بووم، بانگی کردمو لێی پرسیم: ڕۆڵە ئەوە چییە پێتە؟!

گوتم: خورمایە، دایکم پێیدا ناردووم بۆ بابمو خاڵم بۆ ئەوەی نیوەڕۆیەی پێ بکەن!

فەرمووی: بۆم بێنە.

منیش خورمایەکانم بۆ بردو لە دەستی موبارەکیم کردن، دوایی ئەو لەسەر پەڕۆیەکی ڕۆکردنو دووعای بەسەردا خوێندو فەرمووی: مسوڵمانینە! هەموو وەرن لێی بخۆن، ئەوەی کە لەسەر خەندەك بوونو خەندەکیان لێدەدا هەموو هاتن، هەرکەسە

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٠٥).
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

بە ئەندازەی خۆی لێی خوارد، دوایی خورمایەکان هەروەکو خۆیان مابوونەوە، هیچ کەمیان نەکردبوو.

هەروەها (ابن هشام) باس دەکات، کە (جابر بن عبدالله) موعجیزەیەکی دیکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ[1]: ئێمە بەرخۆڵەیەکی گچکەمان هەبوو کە قەڵەویش نەبوو، بە هاوسەریشمم گوت: هێندێك جۆی بۆ هاڕینو کردی بەنانو بەرخەکەشم سەربڕیو بۆ پێغەمبەرمان ﷺ برژاند، کاتی ئێوارە کە پێغەمبەر ﷺ (خەندق)ی بەجێهێشت تاکو ئیسراحەت بکات، پێم گوت کە خواردنێکم بۆ ئامادە کردوەو داوام لێکرد کە بێتەوە ماڵمان، بەڵام دەمویست بەتەنیا بێتەوە بۆ ئەوەی خواردنەکە بەش بکات، کە پێم گوت، گوتی: باشە، یەکسەر بە یەکێکی گوت کە بانگ بکا هاوەڵان هەموویان بێن بۆ ماڵی (جابر)، ئەو هاتو خەڵکەکەشی لەگەڵ هات، دانیشتو ئێمەش خواردنەکەمان هێنا، پێغەمبەر ﷺ (بسم الله)ی کردو داوای بەرەکەتو پیێزی لە خوا کرد، ئنجا دەستی کرد بە خواردنو ئەوەی لەگەڵیشی بوون دەستیان بە خواردن کرد، دوای ئەوانیش خەڵکێکی دیکە کە خەریکی هەڵکەندنی خەندەقەکە بوون هاتنو لێیان خوارد، بەو شێوەیە ئەو خواردنە کەمە دوای دووعای پێغەمبەر ﷺ بەشی هەموو خەڵکەکە بوو، کۆمەڵ کۆمەڵ نانیان دەخواردو دەڕۆیشتن.

(سەلمانی فارسیی)یش شتێکی دیکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەکاتێکدا کە خەندەکمان لێدەدا، تووشی گاشە بەردێکی زۆر گەورە بووین، هەرچەندە پاچمان لێدەدا لێی هەڵدەبەزیەوەو هیچمان بۆ لەگەڵ نەدەکرا، بۆیە سکالامان بردە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش تەشریفی هێناو پاچ (کوین)ەکەی لێ وەرگرتمو چۆ خواری، سێ جاران دایوەشاندو سێ بڵێسەی لێ بەرزبۆوە، لەگەڵ هەر بلێسەیەکدا دەیگوت (الله أكبر) دوایی پرسیارم لێکرد، لەبارەی ئەو بڵێسانەوە، ئەویش فەرمووی: بۆچی سەلمان تۆش

---

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص(١٠٥-١٠٦).

بینینت؟ گوتم بەڵێ، ئەویش فەرمووی: بڵێسەی یەکەم (یەمەن)م لێ دەرکەوت، ئۆممەتی من ئەوێ دەگرن، لە بڵێسەی دووەمدا شامو لای ڕۆژئاوام لێ دەرکەوت (ناوچەی ڕۆم)، کە ئەوێش دەگرن، لە بڵێسەی سێیەمدا لای ڕۆژهەڵاتو ناوچەی فارسم لی دەرکەوت، کە ئۆممەتی من ئەو سێ شوێنە ئازاد دەکات، دوایی هێندێك لە دڵ نەخۆشو مونافیقەکان دەیانگوت: موحەممەد وەعدەو بەڵێنی کۆشکەکانی ڕۆمو فارسمان پێدەدا، کەچی ئێمە ناوێرین بچین دەست بە ئاو بگەیەنین!

بەڵام بێگومان بەڵێنەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان هاتنە دی، بە پێچەوانەی ویستو بۆچوونی ناحەزانی ئیسلامەوە[١].

## حەوتەم: سروود گوتنی هاوەڵان لە کاتی خەندەق لێداندا:-

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی هەڵکەندنی خەندەکدا سروودیان دەگوت، هەروەك چۆن لەکاتی دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ شیعرو سروودیان گوتوە، یەکێك لەو سروودانەی، کە لەکاتی خەندەك لێدان گوتوویانە، وەك (بخاري)[٢] هێناویەتی ئەوە بوو، کە دەیانگوت:

اللّهم لولا أنت ما اهتدينا ... ولا تصدقنا ولا صلينا
فأنزلن سكينة علينا ... وثبت الأقدام ان لاقينا
ان الأُلى قد بغوا علينا ... وان ارادوا فتنة ابينا

واتە: ئەی خوایە ئەگەر تۆ نەبای ڕێی ڕاستمان نەدەگرت، وە خێرو چاکەو نوێژمان نەدەکرد، ئارامیی بڕژێنە سەر دڵو دەروونمان، وە پێیەکانمان بچەسپێنە ئەگەر بەرەنگاری دوژمن بووینەوە، وە ئەوانە (ئەحزاب) دەیانەوێ دەستدرێژیی بکەنە

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.
٢) صحيح البخاري: ٤١٠٦.

www.alibapir.com

سەرمان، ئەگەر بیانەوێ لە دینمان هەڵگێڕنەوە ئێمە ڕازی نابینو بەرگریی لە دینی خۆمان دەکەین.

جا لەکاتێکدا کە هاوەڵان بە کۆڕس ئەو سروودەیان دەگوتەوە، پێغەمبەریش ﷺ کۆتایی نیوە دێڕەکانی لەگەڵدا دەگوتنەوە (اهتدينا، صلينا...).

(انس بن مالك) -ڕەزای خوای لێبێ- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەڵکەندنی خەندەقدا، کە بینی هاوەڵانی ماندووو برسی بووبوون، فەرمووی: **{اللّهم إن العيش عيش الآخرة، فاغفر للأنصار والمهاجرة}**، واتە: ئەی خوایە ژیان هەر ژیانی ڕۆژی دوایییە، دەجا لە پشتیوانانو کۆچکەران ببوورە.

(أنس) دەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ وایفەرموو، یارانیشی کە خەریکی خەندەق هەڵکەندن بوون، گوتیان:

نحن الذين بايعوا محمداً      على الجهاد ما بقينا أبداً[(١)]

واتە: ئێمەین کە پەیمانمان بە موحەممەد داوە لەسەر جەنگو جیهاد هەتاکو ماببین.

وە (بخاري ومسلم)[(٢)] هێناویانە لە (براء بن عازب) وە، کە پێغەمبەر ﷺ خۆشی بەشداریی لە هەڵکەندنی خەندەکدا کردوە: (كان رسول الله ﷺ يوم الأحزاب ينقل معنا التراب ولقد وارى الترابُ بياض بطنه)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئەحزابدا گڵی لەگەڵ دەگواستینەوەو خۆڵ سپێتی سکی داپۆشیبوو.

---

١) صحيح البخاري باب غزوة الخندق: ٤٠٩٩

٢) صحيح البخاري: ٤١٠٦، ومسلم: ٤٦٤٦.

## هەشتەم: شکاندنی پەیمان لەلایەن، (بني قريظة)ەوە:-

(حُيَي بن أَخطب)، کە یەکێك بووە لە جوولەکەکانی خەیبەر، دەچێ بۆ مەدینە بۆ لای (كعب بن الأسد القرظي)، کە سەرۆك تیرەی (بني قريظة) بوو، داوای لێدەکات کە پەیمان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بشکێنێ، (كعب)یش دەڵێ: من تائێستا بێ پەیمانییم لە موحەممەد نەبینیوە، (حُيَي بن أَخطب) وازناهێنێو زۆر داکۆکیی لێدەکاو دەڵێ هێزێکی زۆرمان کۆکردۆتەوەو، ئەگەر تۆ لەگەڵمان بی، بەیەکجاریی تەڕو وشکیان پێکەوە دەسووتێنینو، بنەبڕیان دەکەین، لە کۆتاییدا، قەناعەت بە (كعب بن الأسد) دێنێ، کە پەیمانەکەی بشکێنێو هەڵیبوەشێنێتەوە، دیارە دوای ئەوەی (كعب) پەیمانەکەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ شکاند، مسوڵمانان زۆریان پێ ناخۆش بوو، چونکە تا ئەوکاتەش (بني قريظة) هەر بەرەو ڕووی دوژمن بوون، ئیدی ئەو هەڵوێستەی (كعب) وایکرد، کە مسوڵمانان دوای ئەمە لە پشتەوەی خۆشیان ئەمین نەبن، چونکە (بني قريظة) لە پشتەوەی مەدینە بوون،(١) لەوکاتەدا بوو، کە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارێ، کە دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ ﴾ الأحزاب، بەڵام مسوڵمانان باوەڕی تەواویان بەخوای باڵادەستیان هەبوو، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَـٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٠٧-١٠٨).

إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسۡلِيمًا ﴿٢٢﴾ الأحزاب، واتـە: وەکاتێـك بـڕواداران حیزبـەکانیان ببیـنن گوتیـان: ئەمــە ئەوەیــە، کــە خــواو پێغەمبەرەکــەی بــەڵێنیان پێــدابووین، وە خــواو پێغەمبــەرەکەی ڕاســتیان کــرد، وە ئــەم مەســەلەیە بــەس ئیمــانو گەردنکــەچیــی تێیــاندا زیــاد کرد.

## نۆیــەم: قســەکــردن لەگــەڵ (بنـي قريظـة)دا:-

پێغەمبەر[1] ﷺ، کە بیستوویەتی (بني قريظـة) پەیـمانیان شکاندوە، (سـعد بـن معاذ) سەرۆکی تیرەی ئەوسو (سـعد بـن عبـادة) کـە سـەرۆکی تـیرەی خـەزرەج بـووە هەردووکیانی ناردوە، بۆلای (بني قريظة) سـەبارەت بـەو پەیــمانەیان کـە لەبەینیانـدا هەبووە، بەڵام کە چوونە لایان، بینییان هەڵوێسـتیان زۆر خراپـەو (بـني قريظـة) پێیـان گــوتن: پێغەمبــەری خــوا (رســول الله) کێیــە؟! ئێمــە هــیچ پــەیمانێکمان لەگــەڵ موحەمــمەددا نیەو چیتان لەدەسـتدێ بیکـەن!! ئێمـەش چیمان لەدەسـتبێ دەیکـەین، ئەوانیش دەچنەوەو هەواڵەکـە دەبەنـەوە بـۆ پێغەمبـەر ﷺو بـە ڕەمـز پێـی دەڵێـن: دەڵێـن (عضـل والقـارة)، چونکە پێغەمبەر ﷺ پێشتـر پێیان دەڵێ: ئەگەر پەیـمانیان نەشکاندبوو بەدەنگی بەرز پێم بڵێن بە ئاشکرا، بەڵام ئەگەر پەیـمانیان شــکاند بـوو بە هێما (رمز) پێم بڵـێن، ئـەم قسـەیەش واتـە وەکـو چـۆن تیــرەی (عضــل والقـارة) پەیـمانیان شـکاندو هـاوەڵانیان شــەهید کـرد، ئـەوانیش ئـاوا پەیــمانیان شــکاندوە، ئنجـا، کە ئەوەیان بـە پێغەمبــەر ﷺ گــوت، فــەرمووی: **{الله أكبــر أبشـروا يـا معشـر الـمسـلميـن}**، واتە: خوا گەورەترە لە هـەموو شـتێك موژدەتـان لێبـێ ئـەی کۆمـەڵی مسوڵمانان.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

## دەیەم: هەوڵی پێغەمبەر ﷺ بۆ پێکهاتن (صلح) لەگەڵ (غطفان)دا:-

پێغەمبەر ﷺ هەوڵیدا کە هۆزی (غطفان) لە شەڕەکەدا بێلایەن بکات، چونکە جگە لە قورەیش، ئەوان گەورەترین بەشی ئەو سوپایەیان پێکدەهێنا کە هاتبوونە سەر مەدینە، بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ سەرکردەکانی (غطفان)دا کەوتە دانوستانو گفتوگۆکردن، ئەوان مەرجیان ئەوەبوو، کە لە بەرانبەر جەنگ نەکردن لەگەڵ مسوڵماناندا و جیابوونەوەیان لە قورەیش، نیوەی بەروبوومی مەدینەیان بدرێتێ بۆماوەی ساڵێك، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئامادە بوو سێیەکی بەروبوومی مەدینەیان بداتێ نەك نیوە، بەم شێوەیە پەیمانەکەیان نووسیبوو، بەڵام پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئیمزای بکا، هەردوو (سعد)ی بانگ کردن، کە گەورەی ئەوسو خەزرەج بوون، ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا ئەوە خوا فەرمانی پێکردووی، کە هەردەبێ جێبەجێی بکەی، یان مەبەستت بەرژەوەندی ئێمەیە؟! ئەویش فەرمووی: مەبەستم تەنیا بەرژەوەندی ئێوەیە، چونکە هەموو عارەب لێتان کۆبوونەوەو لەیەك کەوانەوە تیرتان تێدەگرن، پێم باش بوو هەندێکیانتان لەکۆڵ بکەمەوە، ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئێمە کاتی خۆی، کە لەسەر کوفرو شیرك بووین، ئەوان تەماعیان لە بەروبوومو خورمای ئێمە نەکردوە، بە پارە، یان بە میوانداریی نەبێ، بۆیە سوێند بە خوا جگە لە شمشێر هیچیان نادەینێ، دوای ئەوەی، کە خوای پەروەردگار ئێمەی بەهۆی تۆو ئیسلامەوە عەزیز کردوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: من لەبەر بەرژەوەندی ئێوەم بوو، مادام لەخۆتان ڕادەبینن لێی گەڕێن[١].

بەو شێوەیە ئەو دانوستان (مفاوضة)ە سەری نەگرت.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٠٨-١٠٩).

لەو ڕووداوەشەوە ئەوە دەردەکەوێ، کە دروستە لەگەڵ دوژمندا پێکهاتن (صلح) بکەیو، بڕێك ماڵیشی بدەیتێ لە پێناو بەرژەوەندییەکی گەورەتردا، کە لە دوورخستنەوەی زیانێکی گەورەتردا، یان هێنانەدی سوودێکی چاکتردا خۆی دەنوێنێ، بەپێی بنچینەی شەرعیی: (دفع أعظم المفسدين، وجلب أعظم المنفعين)، واتە: دوورخستنەوەی خراپەی گەورەترو، وەدەستهێنانی بەرژەوەندی گەورەتر.

## یازدەیەم: کوشتنی (عمرو بن عبد ود) پاش پەڕینەوەی لە خەندەق:-

کۆمەڵێك لە سوپای کافران لە شوێنێکی تەسك لە خەندەکەکە پەڕینەوە، کە (عمرو بن عبد ود)یشیان لەنێو دابوو، (علي بن ابي طالب) -خوا لێی رازی بێ-، بۆی چوو بۆ لێکدانی بەتەنیا، کە جۆرە شێوازێکی شەڕکردنی ئەو سەردەمە بووە، نەفەر بە نەفەر[1]، پێکەوە شەڕیان کردوەو هەردووکیشیان هەر قوڕەیشی بوون، سەرەنجام (علي) -خوا لێی ڕازی بێ-، (عمرو بن عبد ود)ی کوشت، هەرچەندە لەنێو قوڕەیشییەکاندا (عمرو) ئینسانێکی ئازاو لێهاتوو ناسراو بوو[2].

## دوازدەیەم: مسوڵمانبوونی (نعیم بن مسعود بن عامر الغطفانی) :-

یەکێکی دیکە لەو ڕووداوانەی، کە کاریگەریی هەبووە لەوەدا، کە خوای پەروەردگار دەرووێك بکاتەوە لە مسوڵمانان، لە جەنگی خەندەقدا، بریتی بووە لە مسوڵمانبوونی (نعیم بن مسعود بن عامر الغطفاني)، کە یەکێك بووە لە قسە بەدەستانی تیرەی (غطفان)، کە دێتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! من مسوڵمان بوومو قەومەکەشم بە مسوڵمانبوونی منیان نەزانیوە، فەرمانم پێ بکە، چ فەرمانێکم پێدەکەی ئاوا دەکەم.

---

١) هەر لەشکرەو نەفەرێکیان لەنێو خۆیاندا هەڵبژاردوە هەردوو جەنگاوەرە هەڵبژێرراوە چوونە مەیدانی جەنگەوە، تا یەکیان ئەوەی دی کوشتوەو ئەمە (مبارزة)ی پێگوتراوە.

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٠٩-١١٠).

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: **{إنما أنت فينا رجل واحد فخذّل عنّا ان استطعت، فأن الحرب خدعة}**(١)، واتە: بێگومان تۆ یەك كەسی، ئەگەر شەڕ بكەی‌و بێیە سەنگەری ئێمەوە، بەڵام ئەگەر دەتوانی ڕیزی دوژمن‌و ناحەزەكانمان لێك بترازێنە، چونكە (جەنگ بریتیە لە فێڵ)، ئنجا (نعیم بن مسعود) كارێكی ئەنجامدا، كە سوپای ئیسلام سوودی لێ بینی‌و دڵەراوكێ‌و دووبەرەكیی خستە نێو لەشكری قورەیش‌و غەطەفان‌و جوولەكەكانەوە.

سەرەتا دەچێتە لای (بني قريظة)و پێیان دەڵێ: ئێوە چاك دەزانن، كە من دڵسۆزتانم، بۆیە شتێكتان پێ دەڵێم بەڵام بیشارنەوەو مەیدركێنن، دەڵێن: باشە نایدركێنین.

(نعیم) دەڵێ: قورەیشییەكان‌و غەطەفانیەكان وەك ئێوە نین، ئێوە خەڵكی ئێرەن‌و ماڵ‌و منداڵتان لێرەیە، ئەوان بۆ جەنگ‌و دوژمنایەتی موحەممەد هاتوون‌و دوایی دەڕۆنەوەو، هەر ئێوە بەجێ‌دەمێنن‌و بەتەنها دەمێننەوە، دوایی موحەممەدو هاوەڵانی تۆڵەتان لێ دەستێنن، بۆیە پێشنیار دەكەم، كە داوایان لێبكەن كۆمەڵێك لە سەركردەكانیان بە بارمتە (رهن) لای ئێوە بن، بۆئەوەی نەتوانن ڕابكەن‌و، ئێوە بەتەنیا بهێڵنەوە!

ئەوانیش پێشنیارەكەی (نعیم) پەسەند دەكەن‌و دەڵێن: قسەكەت زۆر جوانە!

دوایی دەچێ بۆ لای هەركام لە (قورەیش)و غەطەفانییەكان‌و پێیان دەڵێ: وەكو بیستوومە (بني قريظة) پەشیمانبوونەوە لە دژایەتی موحەممەدو ناردوویانە بۆ لای‌و بەڵێنیان پێداوە خەڵكێك لە ئێوە بگرن‌و تەسلیمی ئەوی بكەن‌و بیانكوژن، جا ئەگەر داوایان لێكردن، كە هێندێك لە سەرانی ئێوە بارمتە بن لای ئەوان، مەیاندەنێ، چونكە تەسلیمی موحەممەدیان دەكەن‌و دەكوژرێن، بۆئەوەی لە پاداشتی

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص١١٢.

ئەو کارەدا موحەممەد لێیان خۆش بێ، ئەو قسەیەشم با نهێنی بێ‌و بیشارنەوە کەسی دی نەیزانێ، دیارە هەرکام لە (قورەیش)و غەطەفان زۆر سوپاسی (نعیم) دەکەن‌و دەڵێن بەڕاستی تۆ پیاوێکی دڵسۆزی!

ئنجا ڕۆژی هێرش کردنەکەیان شەممە دەبێ، بۆیە قورەیشییەکان‌و غەطەفانییەکان هەواڵ بۆ (بني قريظة) دەنێرن‌و دەڵێن: دەبێ ڕۆژی شەممە هێرش بکەین!

ئەوانیش دەڵێن: ئێمە شەممە ناشکێنین (چونکە جوولەکەکان لە ڕۆژانی شەممەدا هیچ ناکەن) وە هەتاکو هەندێ کەسی بارمتەمان نەدەنێ، ئێمە شەڕ ناکەین، چونکە لەوانەیە ئێوە بەجێمان بهێڵن‌و ئێمە بەتەنیا بمێنینەوە.

قورەیشییەکان‌و غەطەفانییەکان لەنێو خۆیاندا دەڵێن: دیارە بۆچوونەکەی (نعيم بن مسعود) ڕاست دەرچوو، بەو شێوەیە لە یەکدی دەکەونە بێ‌متمانەیی‌و دوودڵییەوەو، قورەیشیەکان‌و غەطەفانییەکان بارمتە نادەنە (بني قريظة)و ئەوانیش پشتیان بەردەدەن‌و لە جەنگەکە دەکێشنەوە.

ئاوا (نعیم) توانی پەیوەندی نێوان جوولەکەکان‌و قورەیشییەکان تێکبداو ئەمەش بوو بە هۆیەکی سەرەکی تێکشانی سوپای قورەیشییەکان‌و غەطەفانییەکان[١].

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١١١-١١٢).

www.alibapir.com


## سێزدەیەم: هەڵکردنی بایەکی توندو دابەزینی فریشتەکان بۆ یارمەتی مسوڵمانان :-

هۆیەکی دیکەی تێکشکانی دوژمن ئەوەبوو کە بایەکی توند بە فەرمانی خوا هەڵیکرد، هەموو بارگەو بنەی تێکوەردانو چادرو خیوەتەکانی تێکدان وە فریشتەکانیش بە فەرمانی خوا (جل شأنه) ترسیان خستە نێو دڵی دوژمن، وەك خوای زاڵو توانا لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: ئەی بڕوادارینە! چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یادبکەنەوە، کە سوپایەك هێرشی کردە سەرتان، ئێمەش بایەکی توندو سەربازانێك کە نەتاندەبینین ناردمانە سەریان، وەخوا بەوەی کە دەیکەن بینایە.

شایانی باسیشە، کە وەك کتێبەکانی سیرە باس دەکەن ئەو (با)یە بە ئەندازەیەك توند دەبێ، کە ناتوانن ئاگر بکەنەوەو چادر هەڵبدەن، سەرەڕای هێزی فریشتەکان، کە ترسێکی زۆر دەخەنە دڵی دوژمنانەوەو کاروباریان هەموو تێك دەچێو ورەیان دەڕووخێ[1].

## چواردەیەم: هەوڵدانی پێغەمبەر ﷺ بۆ زانینی بارودۆخی دوژمن:-

وردەوردە ڕیزەکانی (أحزاب) لێك هەڵوەشانو هێزوپێزیان نەماو ورەیان ڕووخا، ئەوەش بە هۆی حیکمەتو دانایی پێغەمبەر ﷺو ئارامیو خۆڕاگریی مسوڵمانانو هەڵکەنرانی خەندەکەکەو هەوڵو تاکتیکی (نعیم)و هەڵکردنی ئەو بایە توندەو دابەزینی فریشتەو ترسو بیم خرانە نێو دڵی سوپای دوژمنەوە، ئەوانە هەموویان

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١١٣-١١٤).

هۆكـار بوون بۆ شكاندنی ئـەو ئابڵووقەیـە، دوایـی هێـزی دوژمـن شـیرازەی دەپچڕێو (أحـزاب) دەكەونە بیركردنەوەو مشـوورخواردن بـۆ بەجێهێشـتنو هـەڵاتن، لەوكاتـەدا پێغەمبـەر ﷺ سـێ جـار بـە هـاوەڵانی دەفـەرموێ، كـە یـەكێكیان بچـێو هـەواڵی دوژمنی بۆ بێنێ، بۆ ئـەوەی بزانـێ چـی دەكـەنو حاڵیـان چۆنە؟ بـەڵام لەبەرئـەوەی بایەكە زۆر ساردو بـەهێز دەبـێو شـەوەكە تاریـكو سـامناك بـووە، كـەس ئامـادەیی چوونی نابێو سەرەنجام پێغەمبەر ﷺ بە (حـذیفة بن الیمـان) دەفـەرموێ: (حذیفـة) تۆ بچۆ، (حذیفـة) دەڵێ: كە چووم دوژمـن وەزعێكـی زۆر خـراپو شـپرزیان هـەبوو و، بەدەست متمانە بەیەكدی نەبوونو، باو سـەرماو ترسـەوە گیـریان خـوارد بـوو، مـن لەوێ بووم كەوتنە تەكبیـرو گوتیان بەیانی دەڕۆین! دوایـی (أبو سفیان) داكۆكیی كـرد لەسەر ڕۆیشتـن[1].

بـەو شـێوەیە بارگـەو بنـەیان پێچـایەوەو هـەڵاتن، خـوای باڵادەسـتیش لـەو بـارەوە دەفـەرموێ: ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗاۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزٗا ٢٥﴾ الأحـزاب، واتـە: خـوا ئەوانـەی كـە بێبـڕوان بـە ڕقو قینی خۆیانەوە گێڕانـەوەو، هـیچ شـتێكی باشـیان دەسـت نەكـەوتو زەرەریـان بـۆ لـە ئەهلی ئیمان نەدراو خواش شەڕی لەكۆڵ مسوڵمانان كردەوە، وە خـوا بەهێـزو زاڵـە

دوای ئـەو جەنگـە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: **{الآن نغـزوهم ولا يغـزوننـا ونحـن نسيـر اليـهم}** رواه البخـاري[2]، واتە: لە مەودوا ئێمـە هێـرش دەكەینـە سەر ئـەوانو، جـارێكی دی ئـەوان نـاتوانن هێـرش بكەنـە سـەر ئێمـەو، ئێمـە بۆیـان دەچیـن.

---

١) هەمان سەرچاوە، ص(١١٤-١١٥).

٢) صحیح البخـاري: ٤١١٠.

# جەنگی (بني قريظة)

(ابن هشام)[١] دەڵێ: ئەو شەوەی، کە کافرەکان (أحزاب) ئابڵووقەی مەدینەیان بەرداو ڕۆیشتن، بۆ سبەی نیوەڕۆکەی جبریل ﷺ هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: ئایا ئێوە چەکتان داناوە؟

پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرمووی: بەڵێ!

(جبریل) گوتی: فریشتەکان تا ئێستاش چەکیان دانەناوە، منیش لەسەر داوای ئەوان هاتمەوە لات، خوا فەرمانت پێدەکات، کە هەر ئێستا بچی بەرەو (بني قريظة) (کە تیرەیەك بوون لە سێ تیرە جوولەکەکەی مەدینە، کە لە دەوروبەری مەدینەدا مابوون) منیش ئەوە دەڕۆم و ترسیان دەخەمە نێو دڵ و شوێنەکانیان لە بن پێ دەلەرزێنم.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ بۆیان چوو، وە بە هاوەڵانی فەرموو: **{لا يصلين أحد العصر الاّ في بني قريظة...}** رواه البخاري[٢]، هیچ کامێکتان با نوێژی عەسر، نەکا مەگەر لە لای (بني قريظة) بکرێت، مەبەستی ئەوەبوە پەلە بکەن بۆ ئەوەی کاتێك بگەنە ئەوێ کە نوێژی عەسر مابێ لەوێ بیکەن.

(ابن أم مكتوم)یشی وەك برا گەورە لە مەدینە بەجێهێشت، دیارە هەندێك لە هاوەڵان نیوەڕۆکی فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ یان وەرگرت و نوێژی عەسریان لە ڕێگا کرد، هەندێکی دیکەشیان ڕواڵەتی فەرمانەکەیان وەرگرت و نوێژی عەسریان نەکرد، تا گەیشتنە ئەوێ، کە هێندێکیان دوای نوێژی عیشا گەیشتنە ئەوێ و ئەوکات

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٣، ص(١١٥-١١٦)، وە (البخاري) بە ژمارە (٤١١٧) هێناویەتی.
٢) صحيح البخاري: ٤١١٩.

نوێژەکەیان کرد، پێغەمبەریش ﷺ ڕەخنەی لە هیچ کامیان نەگرت، چونکە هەریەکەیان دیوێکی فەرمانەکەیان جێبەجێ کردوە بەشی یەکەمیان دیوی نێوەوەی فەرمانەکەو بەشی دووەمیش ڕواڵەتی فەرمانەکەی، بەو شێوەیە کەلێی تێگەیشتوون.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە کۆچکەران و پشتیوانان بەڕێکەوت تا گەیشتە بیرێك لە بیرەکانی (قریظة) بەناوی (بئر أنا)، دواتر سوپای ئیسلام بەڕێکەوت تا ژمارەیان گەیشتە (٣٠٠٠) سێ هەزار کەس، پێغەمبەر ﷺ (٢٥) شەو ئابلۆوقەی قەڵایەکانیدا، کە (حُيَيّ بن أخطب)یش لەوێ دەبێ، بۆخۆی مالی لە (خەیبەر) بووە، بەڵام ئەو وەکو وەفایەك بۆ (کعب بن الأسد) بەوەی، کە پەیمانی لەگەڵ هەبوو لەوێ دەمێنێتەوە، لە میانەی ئەو (٢٥) شەوەی ئابلۆوقەدرانی (بني قريظة)دا (کعب بن الأسد) سێ ڕێیان لەپێش قەومەکەی خۆی دادەنێ و پێیان دەڵێ: وەك ئاگادارن مسوڵمانان دەورەیان گرتووین، من یەکێك لەو سێ ڕێیانەتان دەخەمە پێش چاو و یەکێکی هەڵبژێرن:

١- با مسوڵمان بین، چونکە بۆمان دەرکەوتوە، کە موحەممەد پێغەمبەری خوایەو ڕاست دەکات و با ئیمانی پێبێنین.

٢- ئەگەر مسوڵمانیش نابین با ماڵ و منداڵەکانمان هەموو بکوژین بۆئەوەی دەستمان بەتاڵ بێت، ئەوکاتە شەبەیخوون دەکەین و شەڕ دەکەین، یان ئێمە موحەممەدو کۆمەڵەکەی لەبن دێنین، دوایش ماڵ و منداڵمان دەست دەکەوێتەوە، یان هەموومان دەکوژرێین و هیچکەس پاش خۆمان بەجێناهێڵین مەراقی لێبخۆین!

٣- ئەگەر هیچ کام لەوانە پەسەند ناکەن با ئەمشەو شەبەیخوون بکەینە سەر موحەممەدو هاوەڵانی چونکە شەوی شەممەیە، ئەوان وادەزانن کە ئێمە شەممە ناشکێنین و شەڕ ناکەین، با ئێستا هێرش بکەینە سەریان، جا یان هەموویان دەفەوتێنین یان دەمانفەوتێنن، بەڵام خەڵکەکەی هیچ کام لەو سێ ڕایە پەسەند

ناکەن، ئەویش لێیان توورە دەبێو دەڵێ ئێوە قەومێکی بێعەقڵنو مادام بەقسەم ناکەن کەیفی خۆتانە.

دوایی (بني قريظة) یەکێك دەنێرن بۆ لای پێغەمبەر ﷺو داوای لێدەکەن، کە (أبو لبابة)یان بۆ بنێرێ بۆ ئەوەی سەبارەت بە وەزعی خۆیان ڕاوێژی پێبکەن، (أبو لبابة)ش -خوا لێی ڕازی بێ- یەکێك بووە لە پشتیوانەکان لە هۆزی ئەوس، کە پێشتر هاوپەیمان بوون لەگەڵ (بني قريظة)دا، وەك چۆن خەزرەج هاوپەیمان بوون لەگەڵ (بني النضير)دا، پێغەمبەر ﷺ (أبو لبابة) دەنێرێ بۆلایان، ئەوانیش لێی دەپرسن: ئەی (أبو لبابة) ئەوە موحەممەد ئابلۆوقەی داوینو دەڵێ لەسەر حوکمی من دابەزن! جا ئایا تەسلیم بین یان نا؟!!

ئەویش ئاماژە بۆ گەردنی دەکاو، دەڵێ: سەرتان دەبڕێ، دوایی (أبو لبابة) بۆ خۆی دەگێڕێتەوەو، دەڵێ: هەر لەوێ بووم زانیم خیانەتم کردوە، ئنجا دوایی دەچێتە مزگەوتێو خۆی لە کۆڵەکەیەکی مزگەوت دەبەستێتەوە، خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی لەوبارەوە ناردە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأنفال، واتە: ئەی ئەوانەی ئیماندارن! خیانەت بەخواو پێغەمبەرێو بە ئەمانەتەکانتان مەکەن، لە کاتێکدا کە دەزانن ئەوە خیانەتە، هێندێکیش دەڵێن: ئایەتی ژمارە (١٠٢)ی سوورەتی (التوبة) بەو بۆنەیەوە هاتۆتەخوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، دوای ئەوەی (أبو لبابة) ماوەیەك خۆی لەو کۆڵەکەیە دەبەستێتەوە، خوای لێبوردە تۆبەکەی دەنێرێتە خوار، ئنجا پێغەمبەر ﷺ تۆبە وەرگیرانەکەی پێڕادەگەیەنێو بەدەستی موبارەکی (أبو لبابة) لە کۆڵەکەکە دەکاتەوە، ئەگەرنا بۆ ماوەی شەش ڕۆژان بۆ کاتی نوێژەکان نەبووایە خۆی لە کۆڵەکەکەی نەدەکردەوە، وە سەرەنجام کە (بني قريظة) نائومێدبوون لە شەڕکردنو بەرگرییکردن، ڕازی دەبن بەوەی کە لەسەر

حوکمی پێغەمبەر ﷺ بێنە خواری، جا هەندێك لە خەڵکی ئەوس دەچن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا کاتێك (بني النضير) پەیمانیان شکاند ئەوانت بە خەزرەجییەکان بەخشی، بۆیە داوات لێ دەکەین، کە (بني قريظة)ش بە ئێمە ببەخشیو حوکمێکی وایان بۆ مەدە لەنێو بچن.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ئایا ڕازی دەبن برا گەورەکەتان (سعد بن معاذ) بکەم بە وەکیلی خۆم، ئەو چ حوکمێکیدا پێی ڕازی بم؟!

ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.

دوایی دەنێرێ (سعد بن معاذ) بێتو بە بریندارییی دەیهێنن، کە لە جەنگی خەندەقدا تیرێکی بە قۆڵی کەوتوەو دەمارەکەی بڕیوە، کە (سعد) دێ، پێغەمبەر ﷺ بە ئەنصارییەکان دەفەرموێ: هەڵسن بۆ گەورەکەتان! **{قوموا الى سيِّدكم}** دوایی فەرمووی: ئەی (سعد) ئەوانە ڕازین، کە تۆ حەکەم بیو منیش ڕازیم.

(سعد) دەڵێ: واتە هەر حوکمێك بدەم هەڵناوەشێتەوە؟

دەفەرموێ: نەخێر.

(سعد) دەڵێ: حوکمی من ئەوەیە: جەنگاوەرو شەڕکەرەکانیان بکوژنو ماڵو سامانەکەشیان غەنیمەت بێ بۆ مسوڵمانان، وە ژنو منداڵەکانیشیان دیلی مسوڵمانان بن، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: **{قضيت بحكم الله}**[(١)]، واتە: (حوکمت لەبەیندا کردن بە حوکمی خوا)، دوای ئەوەی کە قۆڵبەستیان دەکەنو دەیانهێننە خوارێ، ئەوەی کە لێیان مسوڵمان دەبێ نایکوژن، بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان دەکوژن، کە (إبن هشام) دەڵێ: ژمارەیان لەنێوان (٦٠٠ تا ٧٠٠) یان (٨٠٠ تا ٩٠٠)کەس بووە، تەنها ئافرەتێکیشیان لێ دەکوژرێ، ئەویش چونکە لەکاتی ئابڵووقەدانەکەدا گاشەبەردێك بەسەر یەکێك لە هاوەڵاندا دەخاتە خوارو شەهیدی

١) البخاري: ٤١٢١.

دەکات، بۆیە بەتۆڵە ئەو ئافرەتە دەکوژنەوە، ئەگەرنا ئافرەتەکانی دیکەیان هەموو بە دیل دەگیرێن، وەك خوای توانا و زانا لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: وە ئەوانەی کە پشتگیرییان کردن {پشتگیریی (أحزاب)یان کرد} لە ئەهلی کیتاب (جوولەکەکان) خوا لە قەڵاکانیان هێنانیە خوارێ وە ترسی خستنە نێو دڵو هەندێکیانتان کوشتو هەندێکیانتان لێ بە دیل گرتن، وە خوا سەرزەمینو ماڵو سامانی ئەوانی کردە میراتی ئێوە، وە سەرزەمینێکیش کە ئێوە نەیگەیشتوونێ (واتە: ئەو سەرزەمینەی کە خوا لەمەو دوا دەیکاتە غەنیمەت بۆ مسوڵمانان) وە بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.

بەم شێوەیە (بني قريظة) لە مەدینە ڕیشەکێش کران[١]، ئەو کۆمەڵە خیانەتکارەی کە چەندین جار بەرنامەی دوژمنایەتیو خراپەکارییان لە دژی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان دارشت، لە جەنگی (أحزاب)یشدا لە ناسکترین کاتداو، ویستیان لە پشتەوە خەنجەری غەدرو خیانەت لە ئیسلامو مسوڵمانان بوەشێنن، جگە لە (بني قريظة)، کە پیاوەکانیان هەموو کوژران، (حُيي بن الأخطب) گەورەی جوولەکەکانی (بني النضير)یش، کە لەوکاتەدا لەلای ئەوان بوو، ئەویش کوژرا، لە ماوەی ئابڵووقەدانی (بنو قريظة)دا یەکێك لە مسوڵمانان بەناوی (خلاد بن سويد) کوژراو، یەکێکیش بەناوی (أبو سنان بن محصن) برای (عكاشة) وەفاتی کرد[٢].

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص١١٥-١٢٢.

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٢٩.

www.alibapir.com

## چەند ڕووداوێکی گرنگ پێش صولحی (حديبية):-

### یەکەم: بوونی (زینب)ی کچی (جحش) بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ:-

لە سەرەتاوە پێغەمبەر ﷺ (زینب)ی داوا کردو خواستی بۆ (زيد بن حارثة) کە (زید) (مُتَبَنَّی)ی خۆی بوو، واتە: کردبووی بە کوڕی خۆی‌و ئەو شتەش پێش هەڵوەشاندنەوەی لەنێو گەلی عەرەبدا هەبووە، وە (عبدالله)ی برای‌و (زینب) کە زانیان ئەو داخوازییە بۆ پێغەمبەر ﷺ نیەو بۆ (زید)ە، پێیان ناخۆش بوو، وە (زینب) گوتی: من ئافرەتێکی قورەیشییم‌و لە (بني هاشم)م‌و کچە پووری پێغەمبەرم ﷺ‌و تا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردەخواری‌و فەرمووی:[1] ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ الأحزاب﴾، واتە: هیچ پیاوێکی ئیماندار (وەك: عبدالله بن جحش) وە هیچ ئافرەتێکی ئیماندار (وەك: زينب بنت جحش) بۆیان نیە سەرپشك بن لە بەرامبەر فەرمانی خوادا...، بۆیە کە زانییان خوای کاربەجێ ئەوەی فەرمووە، هەردووکیان، (زینب)و (عبدالله) ڕازی بوون.

بەو شێوەیە (زینب) بوو بە هاوسەری (زید)، بەڵام دوایی زەینەب هەمیشە لەگەڵ زەید پەیوەندییان سارد بوو، چونکە زینەب خۆی پێ لەو گەورەتر بووو خۆی بەسەر زەیددا هەڵدەکێشاو، ئەویش سکاڵای خۆی لەوبارەوە دەبردە لای پێغەمبەر ﷺ‌و دەیگوت: ئەو ئافرەتە خۆم بەسەردا هەڵدەکێشێ‌و خۆی پێ لە من گەورەترە بۆیە

---

١) رواه الطبراني عن قتادة، مسند صحيح، وأخرجه الطبري عن إبن عباس، بڕوانە: (الباب النقول في أسباب النزول) للسيوطي، ص(١٩٠).

www.alibapir.com


بەکەڵکی یەك نایەین‌و با تەڵاقی بدەم‌و لەیەك جیابینەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: تەڵاقی مەدە[1]، لەوبارەوە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ .... ﴿٣٧﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: کاتێك کە تۆ بەو کەسەت دەگوت، کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوەو تۆش چاکەت بەسەریەوە هەبووە: هاوسەرەکەت لای خۆت بهێڵەوەو پارێز لە خوا بکە! دیارە کە پێغەمبەر ﷺ زەینەبی لە زەید مارە کرد، عادەتێکی عارەبەکانی هەڵوەشاندەوە ئەویش ئەوەبوو ئەگەر ئافرەتێك کە لە تیرەیەکی بەرز بایە، ڕازی نەدەبوو مارە بکرێ‌و شوو بکا بە پیاوێك کە لەخۆی بە نزم تری دەزانی، بەڵام بەوە کە زەینەب لە زەید مارە کرا، ئەو عادەتە لابراو بە بەڵگەیەکی دیکە کردەیی ئیسپات کرا کە لە ئیسلامدا ئینسانەکان وەکو دانی شانە یەکسانن‌و نەتەوەو ڕەچەڵەك‌و ڕەنگ‌و زمان‌و... هیچ ئیعتیبارێکیان نیەو بەڕێزترین کەس لای خوا پارێزکارترینیانە.

وە دواتر کە خوای کاربەجێ زەینەبی لە پێغەمبەر ﷺ مارە کرد، عادەتێکی دیکەی عارەبەکانی هەڵوەشاندەوە، کە بریتی بووە لەوەی ئەگەر کەسێك کەسێکی دیکەی کردبا بە کوڕی خۆی‌و (تَبَنِّي) کردبایە، دوایی بۆی نەبوو هاوسەری ئەو کەسەی کە کردویەتی بە کوڕی خۆی مارە بکاتەوە، چونکە ئەوکاتە دەیانگوت ئەوە خێزانی کوڕی خۆی مارە کردۆتەوە، کە دیارە ئەوەش لە شەرعدا هیچ بنچینەیەکی نیە، چونکە کەسێکی بێگانە کراوە بە کوڕی خۆ بەبێ بەڵگەی شەرعیی، جا خوای زانا بۆ ئەوەی ئەو عادەتە هەڵبوەشێنێتەوە، دوای تەڵاقدرانی زەینەب لەلایەن زەیدەوەو بەسەرچوونی عیددەی، زەینەبی لە پێغەمبەر ﷺ مارە کرد، وە ئەو ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿ ...فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ... ﴿٣٧﴾ ﴾ الأحزاب،

---

١) أخرجه الحاكم عن أنس، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص(١٩١)، وە (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير)، ص(١٠٩١).

واتــە: کاتێــك کــە زەیــد کــاری پێ‌نــەماو وازی لــێ‌هێنا لــەتۆمان مــارە کــردەوە، حیکمەتەکەشــی ئــەوەبووە، کــە دەفــەرموێ: ﴿...لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا ... ﴿٣٧﴾﴾ الأحـزاب، واتە: بــۆ ئــەوەی، کــە بڕواداران هیچ سەغڵەتییەکیان لەسەر نەبێ، سەبارەت بە مارەکردنەوەی هاوسەری کەسانێك کە کردوویانن بە کوڕی خۆیان دوای ئەوەی کە ئەوان دەستیان لێ هەڵدەگرن‌و وازیان لێدێنن.

وە ئەوەی لە هەندێك تەفسیرو سەرچاوەی مێژووییدا هاتوە، کە گوایە پێغەمبەر ﷺ زەینەبی بینیوەو دڵی پێداچووە، ئنجا فەرموویەتی: (سبحان مقلب القلوب)، ئەوە ڕاست نیەو هیچ ئەسڵ‌و ئەساسی نیە، نە لە ڕووی سەنەدەوەو نە ئەو سیفەتەش لە پێغەمبەر ﷺ دەوەشێتەوە، ئنجا خوای پەروەردگاریش حیکمەت‌و هۆیەکەی زۆر بە ڕوونیی‌و بە ئاشکرایی باسکردوەو دیارە خوا شەرمیش لەکەس ناکات‌و ئەگەر وابووایەو پێغەمبەر ﷺ دڵی بە زەینەب داچووبایە خوای زانا دەیفەرموو لەبەر ئەو هۆیە بوو کە لێمان مارە بڕیوە.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ زۆر لەوە بەرزتر بووە، کە خیانەت بکاو دڵی بە ئافرەتێکی دیکە دابچێ کە لە ژێر نیکاحی پیاوێکی دیکەدایە، وە زەینەب کە کچە پووری پێغەمبەر ﷺ بووە، ئەوکاتەی کە کچ بووەو پێشی خۆش بووەو شانازیشی پێوە کردوە کە پێغەمبەر ﷺ بیخوازێ‌و بیهێنێ، ئەی بۆچی ئەو کاتە دڵی پێدا نەچووە؟! بێگومان ئەوە ڕاست نیە.

دیارە دوای ئەوەی (زینب بنت جحش) بە فەرمانی خوا بوو بە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، هەمیشە شانازیی بەسەر باقی هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەر

www.alibapir.com


ﷺدا دەکردو دەیگوت: {**زوجكن أهاليكنّ وزوجني الله تعالى من فوق سبع سموات**}(١)، واتە: ئێوە کەس‌وکارتان لە پێغەمبەری مارە کردوون، بەڵام من خوا لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە لە پێغەمبەری مارە بڕیوم، چونکە کە خوای زاناو توانا فەرمووی: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا﴾ ئەوە مارە کردن بووەو پێویستی بە مارەکردنی دیکە نەکردوە.

## دووەم: هاتنەخوارەوەی ئایەتی (حجاب):-

وشەی (حجاب)، کە ئێستا زۆر کەس بەمانای پۆشاکی ئافرەتان بەکاری دەهێنێ، ئەوە بەکارهێنانێکی هەڵەیە، چونکە (حجاب) یانی (پەردە) لە قورئانیشدا یەك جار بەو شێوەیە بەکارهاتوەو بەو پەردەیە دەگوترێ، کە دەبووایە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بیگرنەوەو لە پشت ئەو پەردەیەوە قسە لەگەڵ پیاواندا بکەن، کە پێشتر وانەبووە.

لە (صحيح البخاري)(٢)دا هاتوە، کە ڕۆژێك (عمر بن الخطاب) -خوا لێی ڕازی بێ-، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاك‌و خراپ دێنەماڵەکەتەوە، ئەگەر فەرمان بکەی بە دایکانی بڕواداران (هاوسەرە بەڕێزەکانت) کە پەردە بگرنەوە، وە لە پشت پەردەوە نەبێ با قسە لەگەڵ پیاواندا نەکەن، (واتە: چونکە پێشتر مسوڵمانان کەمبوون‌و مسوڵمانی دانستە بوون، ئێستا خەڵك پۆل پۆل دێن مسوڵمان دەبن‌و چەندین جۆریان تێدایە، نەزان، مونافیق...هتد، با ئەوانە خێزانەکانی تۆ نەبینن).

خوای کاربەجێ لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوار، کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ

١) صحيح البخاري: ٧٤٢٠.
٢) صحيح البخاري: ٤٠٢.

﴿وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ ۖ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ...﴿٥٣﴾﴾ الأحزاب،

ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا ...﴾ واتە: (هەر کاتێك کە شتێکتان لە هاوسەرانی پێغەمبەر داوا کرد لە پشت پەردەوە لێیان داوا بکەن، ئەوە چاکترە بۆ دڵی ئێوەو دڵی ئەوان)، لەدوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، پێغەمبەر ﷺ پەردەی لە ماڵەکانی خۆیدا گرتەوەو کەس بۆی نەبوو یەکسەر بچێتە ژووری‌و نێو ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو دەبووایە لە پشت پەردەوە قسە لەگەڵ هاوسەرە بەرێزەکانی پێغەمبەردا بکرێ، ئەو ئایەتەش لەوکاتەدا هاتەخوارێ کە زەینەب بۆ پێغەمبەر ﷺ گوازرایەوە.

## سێیەم: سەرییەی (محمد بن مسلمة):-

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (ئەحزاب)و (بني قريظة)دا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوە یەکەمین (سرية) بوو کە ناردی بۆ سەر دوژمن، لە (١٠)ی مانگی (محرم)ی ساڵی (٦)ی کۆچیدا بە سەرپەرشتی (محمد بن مسلمة) بە (٣٠) جەنگاوەرەوە، ناردی بۆ (قرطاء) لە خاکی (نجد)، کە گەیشتنە شوێنی مەبەست، بەسەر (بني قرطاء)یان دادا، کە لە هۆزی (بني بكر بن كلاب) بوون‌و سەرەنجام (١٠) کەسیان لێ کوشتن‌و مەڕو ماڵاتێکی زۆریشیان لێ بە غەنیمەت گیراو ئەوانی دیکەیان هەڵاتن.

وە لەکاتی گەڕانەوەیاندا (ثمامة بن أثال الحنفي)یان، کە گەورەی (بني حنيفة) بوو بە دیل گرت، لە سەرەتاوە نەیاندەناسی، دوایی کە بردیانە مەدینەو لە یەکێك لە پایەکانی مزگەوت بەستیانەوە، پێغەمبەر ﷺ بەلایدا تێپەڕی‌و پێی فەرموو: ئەی (ثمامة) چیت پێیە؟

ئـەویش گـوتی: چــاکەم پێیــە، ئەگــەر بــمکوژی خــاوەن خــوێنم هەیــە، ئەگــەر بەرهەڵداشـم بکەی ئەوە سوپاست دەکەم، ئەگەر ماڵو سامانیشت دەوێ بڵێ بتدەمێ.

دوو جـاری دیکـە پێغەمبـەر هـەمان پرسـیاری لێدەکـاو ئـەویش بەهـەمان شـێوە وەڵامـی دەداتـەوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ ئازادی دەکات.

ئەویش مسوڵمان دەبێو بە پێغەمبەر دەڵێ: سوێند بەخوا لەسـەر زەوی لـە هـەموو کەس زیاتر ڕقم لە تۆ بوو، بەڵام ئێستا لەسەر ڕووی زەوی کەسم لە تۆ خۆشتــر نـاوێ، لەسەر ڕووی زەوی لە هەموو شـتێك زیـاتر ڕقـم لـە دینەکـەت بـوو، بـەڵام ئێسـتا لـە هەموو دینێکـم خۆشتـر دەوێ[١].

شایانی باسیشە بۆیە (ثـمامة) بـەر لـە ئـازادکرانی ئیعلانـی مسـوڵمانبوونی خۆی نەکردوە، چونکە ویستوویەتی وا نەیەتە بەرچاو، کـە لـەژێر فشـاردا مسـوڵمان دەبـێو ئازادانە مسوڵمان ببێ.

## چوارەم: سـەریـیـەی (أبو عبیـدة بن الـجـراح):-

یەکێکی دیکە لەو ڕووداوانـە ئـەوەبوو، کـە پێغەمبـەر ﷺ سـەرییەیەکی (٣٠٠) سێسـەد کەسی بە فەرماندەیی (أبو عـبیدة بن الـجراح) ناردە کـەناری دەریـای سـوور، بۆ چاودێریکردنی کاروانەکانی قوڕەیش، کە دەچوون بۆ شـام، (بـخــاري) دەگێڕێتــەوەو دەڵێ: کە دەگەنە شوێنی مەبەست، لە ئەنجامی زۆر مانەوەیاندا لەوێ، خواردنیان لــێ دەبڕێو لەبرسان شپرزە دەبنو هیچیان دەست ناکـەوێ بیخـۆن، بۆیـە بڕیـار دەدەن کـە وڵاخەکانیان سەرببـڕن، بەڵام خوای بەخشـەر لەگـەڵ شـەپۆلەکانی دەریـادا ژیانـدارێکی زۆر گـەورەیان بـۆ دەهێنێتـە کـەنار دەریـا، کـە لـە زمـانی عارەبیـدا پێـی دەگـوترێ (عنبــر)، ئـەو (٣٠٠) کەسـە بـۆ ماوەیـەك لـە گۆشـتی ئـەو ژیانـدارە دەخـۆنو، کـە دەگەڕێنــەوە هەنـدێکیش لەگـەڵ خۆیانـدا بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دەبەنـەوە، ئـەویش لـە گۆشـتەکەی دەخواو دوایی دەفەرموێ: ئەوە ڕۆزیـیـەکە خـوای پـەروەردگار بـۆ ئێـوەی

---

١) صحیح البخـاري: ٤٣٧٢، وە: (تأریخ الأسلام للذهبِي، الـمغازي)، ص(٣٥١).

ناردوە، وە لەو چالاکییەدا هیچ کاروانێکی قورەیشییەکانیان بەردەست ناکەوێ‌و بەو شێوەیە دەگەڕێنەوە بۆ مەدینە(١).

وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (أبو عبیدة) دەفەرموێ:(٢){**لكل أمة أمين، وأمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح**} رواه البخاري، واتە: هەموو کۆمەڵێك ئەمینداریێکی هەیەو ئەمینداری ئەم ئۆممەتەش (أبو عبیدة بن الجراح)ە.

**پێنجەم: سەرییەی (عبدالرحمن بن عوف) بۆ (دومة الجندل):-**

(الواقدي) دەگێڕێتەوە(٣)، کە لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەر ﷺ بە (عبدالرحمن بن عەوف) فەرموو: {**تجهز فأني باعثك في سرية في يومك هذا أو من غد إن شاء الله**}، واتە: خۆت سازبکە، چونکە من بە سەرییەیەکەوە ئەمڕۆ یان بەیانی دەتنێرم، بەوشێوەیە فەرمانی پێکرد، کە بەڕێ بکەوێ بەرەو (دومة الجندل) بە مەبەستی بانگ کردنیان بۆ ئیسلام‌و ئەنجامدانی کاری سەربازییش.

ئنجا پێش ئەوەی (عبدالرحمن) بڕوا، پێغەمبەر ﷺ دانیشاندو مێزەرەکەی سەری هەڵوەشاندو، خۆی عەمامەیەکی ڕەشی لەسەری ناو، پێی فەرموو: {**أُغْزُ بسم الله وفي سبيل الله فقاتل من كفر بالله لاتغلَّ ولا تغدر ولا تقتل وليداً**}.

ئیدی (عبدالرحمن) ڕۆیشت تا گەیشتە (دومة الجندل)‌و سێ ڕۆژان لەوێ مایەوەو خەڵکەکەی بانگ کرد بۆ ئیسلام‌و کەمێکیان مسوڵمان بوون، دوایی گەڕانەوە بۆ مەدینە.

دیارە (عبدالرحمن) یەکێکە لەو (١٠) کەسە مژدەی بەهەشت پێدراوەکەو، لە پیاوانی سەرەتای بانگەوازی ئیسلامەو، پایەیەکی گرنگی سەرەتای کاری ئیسلامی بوو، کە لەسەر دەستی (أبو بکر)ی صدیق مسوڵمان بووبوو.

---

١) صحيح البخاري: ٤٣٦٢.

٢) صحيح البخاري: ٤٣٨٢.

٣) بڕوانە: (المغازي)، ج٢، ص(٥٦٠-٥٦١).

## شەشەم: غەزای (بني لحيان):-

دوای شکانی دوژمن لە شەڕی ئەحزابدا، مسوڵمانان لە قۆناغی بەرگرییەوە گواستیانەوە بۆ قۆناغی هێرش کردن، بۆیە کاتی ئەوە هاتبوو تۆڵە لە (بني لحيان) بکرێتەوە، کە کاتی خۆی غەدرێکی گەورەیان لە مسوڵمانان کردبوو لە (الرجيع) دەکەسیان لێ شەهید کردبوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەخۆیو (٢٠٠) کەسەوە لە مانگی (جمادي الأولى)ی ساڵی شەشەمی کۆچیدا بەرەو ئەوێ بەڕێکەوتو (ابن أم مکتوم)ی لە مەدینە لە شوێنی خۆی بەجێهێشت، لە سەرەتاوە وای نیشاندا، کە بەرەو باکووری مەدینە دەڕوا، بۆئەوەی دوژمن هەواڵی چوونە سەریانی نەزانێ، ماوەیەك بەرەو باکوور ڕۆیشت، ئنجا ڕێڕەوی گۆڕیو بەرەو باشور ڕێی گرتەبەر.

پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان نزیکی شوێنی (بني لحيان) بوونەوە، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە سەریان شوێنی خۆیان چۆڵ کردو هەڵاتنو ڕوویان کردە چیاکانی دەروبەر، مسوڵمانان دوو ڕۆژان لە شوێنی ئەوان مانەوەو کەسیان دەست نەکەوت، دوایی پێغەمبەر ﷺ خۆیو سوپاکەی بە مەبەستی ترساندنی موشریکەکان ڕۆیشتن بەرەو (واد عسفان)، لەوێ دوو ئەسپ سواری بەرەو لای مەککە نارد، تەنیا بە مەبەستی ترساندنیانو دەرخستنی توانای مسوڵمانان، ئەوانیش ڕۆیشتن، تا گەیشتنە (کراع الغميم)، کە شوێنێکی نیزیك مەککەیە، بەو پێیە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەترساندنیان هاتە دیو، دوایی هاوەڵانی گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەرو دواتریش سوپای ئیسلام سەربەرزانە بەرەو (مدينة) گەڕانەوە[1].

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٤٣-١٤٤).

www.alibapir.com

## حەوتەم: غەزای (ذي قــرد)، یان (الغـابـــة):-

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە غەزای (بني لحیان) بۆ مەدینە، (عیینة بن حصن الفزاري)، کە لە هۆزی (غطفـان) بوو، بەخۆیو (٤٠) کەسەوە لە (الغـابة)، کە شوێنێکە لە نزیك مەدینەوە، بەسەر حوشترەکانی مسوڵمانانو ئەوانەی لەژێر چاودێری پێغەمبەردا دەبن دادەنو، (ذر)ی کوڕی (أبي ذر)، کە لایان دەبێ دەکوژنو خێزانەکەشی، کە لەگەڵی دەبێ بەدیل دەگرنو، حوشترەکانیان بەتاڵان دەبەن، کە (٢٠) حوشتر دەبن.

کە پێغەمبەر ﷺ ئەو هەواڵە دەبیستێ بە پێنج سەد کەسەوە بۆیان دەچێو، (سعد بن عبادة)ش بە سێسەد کەسەوە لە هۆزەکەی، لە جێی خۆی بەجێدەهێڵێ لە مەدینە، بۆ پارێزگاریی.

لە شاخێك لە (ذي قرد)، پێغەمبەرو سوپاکەی دەگەنە دوژمنو خەڵکێکیان لێ دەکوژنو، حوشترەکانیش دەستێننەوە لەگەڵ خێزانی (ذر)، کە گرتبوویان ئەویش ئازاد دەکەن.

وە (سلمة بن الأكوع) لەو جەنگەدا دەورێکی باڵای بینی، ئەوەبوو پێش ئەوەی سوپای پێغەمبەر ﷺ بگاتە دوژمن، ئەو بە تەنیا دوایان دەکەویو قۆناغ بە قۆناغ تیریان تێدەگرێو هێندێك لە حوشترەکانیان پێ بەجێدەهێڵێ.

خێزانی (ذر)ش، کە ئازاد کرا بە سواری حوشترێك، کە هی پێغەمبەر ﷺ دەبێ دەیبەنەوە بۆ مەدینە، بەڵام لە ڕێگا لەسەر خۆی نەزر دەکا، کە ئەگەر خوا رزگاری بکاتو بە سەلامەتی بگاتەوە، ئەو حوشترەی سواری بووە سەری بڕێ، ئەو هەواڵە دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەفەرموێ: **{بئسما جزیتیها}**، واتە: پاداشتێکی خراپت دایەوە، واتە: ئەو حوشترەی سواری بوویو نەجاتی داوی لە دوژمن، پاداشتەکەی ئەوەیە سەر ببڕی؟ دوایی فەرمووی: **{لا نذر في معصیة الله ولا فیما لا تملکین}**، واتە: نەزر نیە لە بێفەرمانی خوادا، وە لە شتێکدا کە خاوەنی نەبی،

واتە: بۆی نیە نەزرەکە بکات، چونکە حوشترەکە هی خۆی نیە، پێغەمبەر ﷺ لەو غەزایە (٥) شەوی پێچوون، وە ئەم غەزایە یەکێکە لە گەورەترین غەزایەکانی کە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی سەرکردایەتی کردوە بۆ تەمبێکردنی نەیارانی لە عەرەبە دەشتەکییەکانی نەجد دوای جەنگی (خەندەك)و (بني قريظة)[١].

## هەشتەم: کوشتنی (سلام بن أبي الحقيق):-

(سلام بن أبي الحقيق)، کە (أبو رافع عبدالله بن أبي الحقيق)یشیان پێ‌گوتوە، لە جوولەکەکانی (بني النضير) بووەو لە خەیبەر دانیشتوەو، یەکێك بووە لەوانەی، کە زۆر دژایەتی پێغەمبەری کردوەو، لە کۆکردنەوەی سوپای ئەحزابدا بۆسەر مەدینە دەوری بالآی هەبوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەسەرپەرشتی (عبدالله بن عتيك) چەند پیاوێکی لە پشتیوانان ناردە سەری لە (خەیبەر)، کە بریتی بوون لەم پێنج کەسە: (عبدالله بن عتيك ومسعود بن سنان وعبدالله بن أنيس وأبو قتادة الحارث بن ربعي وخزاعي بن أسود)، کە هەر پێنجیان لە تیرەی (خەزرەج) بوون.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن بە کوشتنی (سلام بن أبي الحقيق)، وە لەوکارەدا دەست بپارێزن لە کوشتنی منداڵ‌و ئافرەتان، سەرەنجام ئەو چەند کەسە توانیان خۆ بگەیەننە شوێنی (سلام بن أبي الحقيق)و بیکوژن‌و، کارەکەیان ئەنجامداو گەڕانەوە مەدینە[٢].

دیارە تیرەی ئەوس پێشتر توانیبوویان (کعب بن الأشرف) بکوژن، بۆیە (خەزرەجییەکان) گوتیان نابێ (ئەوسییەکان) پێشمان بکەونەوە، بەو شێوەیە ئەوانیش توانیان سەرێکی دیکەی خیانەتکاری جوولەکە (سلام بن الحقيق) بکوژن.

---

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٤٤-١٤٧)، وە بڕوانە: (عيون الأثر) ابن سيد الناس، ج٢، ص(٧٢-٧٣).

٢) (السيرة النبوية لابن هشام) ج٣، ص(١٣٩-١٤١)، وصحيح البخاري: ٤٠٣٨- ٤٠٣٩.

www.alibapir.com


## نۆیـەم: سـەرییـەی (کـرز بن جـابـر الفهـري):-

پێغەمبەر ﷺ لـە مـانگی (شـوال)ی سـاڵی شەشـەمی کۆچیدا، سـەرییەیەکی بـە فەرماندەیی (کـرز بن جـابر الفهـري) ناردە سەر هۆزی (عـکل)و (عـرینـة)، کـە ئەوانـە لـە سـەرەتاوە لای پێغەمبـەر ﷺ خۆیـان بـە مسـوڵمان نیشـانداو گوتیـان: ئـەی پێغەمبەری خوا! ئێمە دوو تیـرەی دەشتەکیین، مسوڵمان بووینو هـاتووین بـۆ لای تـۆ بـەڵام ئێمـە بـەژیانی نێـو شـارەوە ڕانـەهاتووینو ئەگـەر بێیـن بـۆ ئێـرە (مـەدینـە) هـەموومان نـەخۆش دەبین، بۆیـە داوات لـێدەکەین کـە چـەند حوشترێکمان بدەیتێ بۆئـەوەی لەگـەڵ خۆمانـدا بیانبـەین، لـەوێ لـەلای خۆمـان بـەخێویان بکـەین، پێغەمبەریش ﷺ چەند حوشتـرێکیان تەسلیم دەکاتو شوانێکیشیان لەگەڵ دەنێرێ، وە دەفەرموێ: شیرەکەشیان بـخۆنو خۆشـتان بـە میزەکـەیان دەرمـان بکـەن(*)، بـەڵام دوای ئـەوەی کـە پێغەمبـەر ﷺ حوشـترەکانیان تەسـلیم دەکـاتو لـە مـەدینـە دوور دەکەونـەوە، ئـەوان شـوانەکە دەکـوژنو جەستەکەشـی دەشـێوێنن، بـە شـێوەیەکی زۆر ناشیـرین هـەردوو چاوی دەکۆڵنو هەردوو دەستو پێی دەبڕنو لەبـەر تـاوێی دادەنێن، پێغەمبەر ﷺ کە ئەوە دەبیستێتەوە، ئەو سەرییەیەی (کرز بن جـابر)یان بۆ دەنێرێ، ئـەوانیش بـە دوایـان دەکـەونو دەیـانگرن، وە دەیانهێننـەوە لای پێغەمبـەر ﷺ پێغەمبەر ﷺیش ئیسلامییان لەسەر ڕادەنوێنێو داوایان لـێ دەکـات کـە مسـوڵمان بن، بەڵام داواکەی پێغەمبـەر ﷺ ڕەت دەکەنـەوەو مسـوڵمان نـابن، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ لە تۆڵەی ئەو کردەوە نابەجێیەدا کە کردوویانە، سزایەکیان دەدا کە هـیچ کەسـی بەو شێوەیە سزا نەداوە: فەرمان دەکـات کـە چـاوەکانیان بکـۆڵنو هـەردوو دەستیانو پێیان ببـڕن، وە لەبەر تاوێیان دانێن تا دەمرن(١)، دیـارە وەکـو تۆڵـە (قصـاص) ئەمـە

---

*) میزی حوشتـر وەکو دەرمان بەکاردەهێنرێ، بۆ چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی پێست.

١) رواه البخاري ومسلم، بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير)، ص(٣٧٣-٣٧٤)، وە بڕوانە: (سبيل الهدى والرشاد) للشامي، ج٦، ص(١٨١-١٩٠).

دەکات، چونکە ئەوان شوانەکەیان بەو شێوەیە کوشتوە، نەك وەکو شێواندن، وە خوای دادگەر بەو بۆنەیەوە هەردوو ئایەتی: (٣٣و٣٤)ی لە سوورەتی (المائدة) ناردەخواریێ، کە دەفەرمویێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٤ ﴾، واتە: بێگومان سزای ئەوکەسانەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوادەکەن وە دەیانەویێ ئاشوبو ئاڵۆزیی لە زەویدا بڵاوبکەنەوە، ئەوەیە کە یان بکوژرێن یان بکوژرێنو هەڵبواسرێن، یاخود دەستی ڕاستو پێی چەپیان ببڕدریێ، یاخود لە وڵات دەربکرێنو دوور بخرێنەوە ئا ئەوە ڕیسواییەکە بۆیان لە دونیاداو لە دوارۆژیش سزایەکی مەزنیان هەیە... بێجگە لەوانەی کە بەرلەوەی بەردەستیان بکەن پەشیمان دەبنەوە، ئەوە بزانن کە خوا بەرانبەریان لێبوردەی بە بەزەییە.

دیارە زانایانی ئیسلام باسیان کردوە، کە چۆن چۆنی ئەو چوار سزایەیان بەسەردا دەچەسپیێ: ئەگەر تەنیا خەڵکیان کوشتبیێ دەبیێ بکوژرێن، بەڵام ئەگەر خەڵکیان کوشتبیێو ئەتکیشیان کردبنو لاشەشیان شێواندبن، دەبی بکوژرێنو هەڵبواسرێن، وە ئەگەر خەڵکیان کوشتبیێو ماڵیشیان بردبیێ، دەبیێ دەستو پێی چەپیان ببڕدریێ، وە ئەگەر خەڵکیان ترساندبیێ، دەبیێ لە وڵات دەربکرێنو دوور بخرێنەوە، هەرچەندە هەندێك لە زانایان لەبارەی چۆنیەتی جێبەجیێکردنی ئەو چوار سزایەوە ڕای جیاوازیان هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو چوار سزایەیان بەسەردا دەچەسپێنرێن، وە بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی وا سزا داوە لەبەر چەند هۆکارێك:

١) چونکە شوانەکەیان کوشتبوو بە شێوەیەکی دڕندانەو لاشەکەیان شێواندبوو.

٢) لەبەرئەوەی لەدین هەڵگەڕاونەوە، چونکە ئەوان خۆیان بە مسوڵمان نیشاندا.

www.alibapir.com

٣) لەسۆنگەی ئەوەوە، کە ویستبوویان فێڵ لە پێغەمبەر ﷺ بکەن.

٤) بۆ ئەوەی خەڵکی دیکەش فێر نەبێ، بە درۆ مسوڵمان ببن‌و، دوایی زەرەر لە ئیسلام‌و مسوڵمانان بدەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ سزایەکی وای داون، کە خەڵکێکی دیکەی پێوە تەمبێ بێ، بەو شێوەیە دەبێ هەموو ڕەهەندەکانی ئەو بەسەرهات‌و سزادانەی پێغەمبەر ﷺ لەبەرچاو بگرین‌و لێکبدەینەوە، ئەگەرنا شتێکی زۆر سەیرو قورسە پێغەمبەر ﷺ فەرمان بکا بەو شێوەیە سزا بدرێن! بەڵام کاتێك خراپەکاریی‌و زوڵم‌و ستەمی ئەوان دەبینری‌و حاڵ‌و وەزعی مسوڵمانانیش دەخەینە پێشچاو، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوان دەستپێشخەر بوون‌و تاوانیان کردوەو هەڵوێستی پێغەمبەریش ﷺ وەك تۆڵەو وەڵامدانەوە بووەو بۆ ئەوەی کەسانی دیکەش پێی تەمبێ بن‌و کەسی دیکە جورئەت نەکات لە بەرانبەر چاکەی ئیسلام‌و مسوڵمانان دا خراپە بکات‌و، چاکیی مسوڵمانان بۆ خراپەکردن ئیستغلال بکات!

# صوڵحی حودەیبییە

بەڕێــزان!

خوا یاربێ لەچەند خاڵێكی كورتو گوشراودا باسی سوڵحی حودەیبییە دەكەین:

**یەكــەم:** صوڵحی حودەیبییــە ڕێكەوتننامەیــەك بــوو لــە نێــوان پێغەمبــەر ﷺ، كــە فەرماندەی مسوڵمانان بوو، وە نوێنەری قوڕەیشییەكان (سهیل بن عمرو)دا، وە لــە شوێنێك ئەو ڕێكەوتننامەیە مۆر، كرا كە پێی دەگوترا (الحديبية)، كە دەكەوێتە نێــوان مەككــەو مەدینــەو لــەوەوە نــاوی لێنــرا (صلح الحديبية)، ئاشــتەوایی حودەیبییە.

**دووەم:** لــە مــانگی (ذو القعدة)ی ســاڵی (٦)ی كۆچــیدا پێغەمبــەر ﷺ خــۆیو (١٤٠٠) لــە هــاوەڵانی بــەرەو مەككــە بەڕێكــەوتن بــەنیازی (عــومرە) كــردن، وە ئیحرامیان بۆ عومرە بەست بۆئەوەی خەڵكی بزانن كــە مەبەســتیان شــەڕ نیــە، وە قوربانییشیان لەگەڵ خۆیاندا برد[1].

**سـێیەم:** كاتێك، كە پێغەمبەر ﷺو ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی كە لە خزمەتیدا بــوون، دەگەنە (عسفان) كە ناوچەیەكە لە نزیكی مەككە، قوڕەیشییەكان (بشر بن سفيان الكعبِي) دەنێرن، وە بڕیاردەدەن كە بەهیچ شێوەیەك نــەهێڵن مســوڵمانان بچــنە نێــو مەككەوەو عومرە بكەن، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: **{يا ويح قريش! لقد أكلتهم الحرب ماذا عليهم لو خلّوا بيني و بين سائر العرب فــان هــم أصابوني كان الّذي أرادوا، وان أظــهرني الله عليهم دخلوا فــي الإسلام**

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٦٢-١٦٣).

www.alibapir.com


**وافرين، وان لم يفعلوا، قاتلوا وبهم قوة...**[1]))، واتە: قورەیش بێ‌قەزابن، جەنگ خواردنی (لەنێوی بردن) چ دەبێ، ئەگەر لەمن‌و لە باقی عارەبان بگەڕێن، ئەگەر بەسەرمدا زاڵ بوون ئاواتیان هاتۆتە دی، ئەگەر خوا سەریخستم ئەوە بەهێزو پێزەوە دێنە نێو ئیسلامەوە، ئەگەر دەشیانەوێ مسوڵمان نەبن، با جەنگم لەگەڵدا بکەن لە کاتێکدا، کە هێزو پێزێکیان بە بەرەوە ماوە.

دیارە پێغەمبەر ﷺ لەو فەرمایشتەیدا مەبەستی ئەوەبووە، کە دەبوایە قورەیش چیدیکە شەڕ بە مسوڵمانان نەفرۆشن.

**چوارەم:** پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی تووشی جەنگ نەبێ لەگەڵ سوپای قورەیشییەکاندا کە بەرەو ڕووی هاتوون‌و دەیانەوێ بەرەنگاری ببنەوە، دەپرسێ: کێ هەیە بەڕێیەکی دیکەی جیا لەو ڕێیە سەرەکییە بزانێ، کە دەچێ بۆ مەککە، کابرایەك لە (بني أسلم) گوتی: من بەڕێیەك دەزانم، ڕێیەکی سەختەو بە شاخ‌و گردو تەپۆلکەدا دەڕوا، دوای ئەوەی پێغەمبەرو هاوەڵانی، ماوەیەك بەو ڕێیەدا دەڕۆن‌و زۆر دەرووی سەخت دەبڕن‌و ڕێیە سەختەکە تەواو دەکەن، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرموێ: **{قولوا نستغفر الله ونتوب اليه}**، واتە: (بڵێن: داوای لێبوردن لە خوا داوا دەکەین‌و بۆ لای وی دەگەڕێینەوە) هاوەڵان فەرمانی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ دەکەن‌و وادەڵێن، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{والله انها للحطة التي عرضت على بني اسرائيل فلم يقولوها}**[2]، واتە: {سوێند بە خوا ئەوەی، کە ئێستا جێبەجێتان کرد (ئەوە کە گوتم بڵێن، داوای لێبوردن لە خوا دەکەین‌و بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە)و واتانگوت، ئەوە هەمان (حطة)یە، (واتە: داوای لێبوردن لە خواکردن)، کە بە (بني اسرائيل) گوترا بیڵێن، بەڵام نەیانگوت}، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَـٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٣، ص(١٦٣).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.

﴿فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾ البقرة، واتە: وە کاتێك پێمان گوتن، بە کڕنووش بردوویی بچنە نێو ئەو شارەوەو بڵێن (حطة) واتە خوایە گوناحەکانمان لێدابوەرێنە...، بەڵام (بني اسرائيل) ئەو وشەیان گۆڕی‌و بە گاڵتە پێکردنەوە وشەیەکی دیکەیان بەکارهێنا.

**پێنجەم:** ئنجا پێغەمبەر ﷺ ویستی دووبارە ڕێ بگرێتەبەر بەرەو مەککە بۆیە سواری حوشترەکەی بۆوە کە نازناوی (قصواء) بوو، بەڵام حوشترەکەی یەخ بووو ڕێی دانەگرت، هاوەڵانی بەڕێز گوتیان: (خلأت الناقة)، واتە: (حوشترەکە جەنەی گرت) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **{ما خلأت وما هو لها بخُلُقٍ ولكن حبسها حابس الفيل عن مكة}**[1]، واتە: ئەو حوشترەی من جەنەی نەگرتوەو فێری جەنە گرتنیش نیە، بەڵام ئەوەی کە کاتی خۆی ڕێی لە فیلەکان گرت، بچنە مەککەوە هەر ئەوە ڕێی لەو حوشترەی من گرتوەو ناهێڵێ بچێتە نێو مەککە، واتە: خوای پەروەردگار ناهێڵێ، ئنجا لەو شوێنە ماوەیەك مانەوە، بەڵام ئەو شوێنە دێمەکارو بێ ئاو بوو، وە ئەو ئاوەی کە پێشیان بوو تەواو بوو، بۆیە هاوەڵانی بەڕێزی تینیان بۆ هات، لە دواییدا چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺو گوتیان: هیچ ئاومان پێ نەماوە، وە نازانین چی بکەین؟ ئەویش تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێناو دای بەیەکێك لە هاوەڵانی‌و پێی فەرموو: بچۆ لە یەکێك لەو چاڵانەدا بیچەقێنە، دوای ئەوەی لێی وەرگرت‌و تیرەکەی لەوێ چەقاند، سەرچاوەیەك ئاوی لێ پەیدا بوو، هەموو سوپاکە ئاویان لێ خواردەوەو کوندەکانیان لێ پڕکرد، کە ئەوەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ[2].

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٣، ص(١٩٨).
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(١٦٣-١٦٤).

**شەشەم:** پاشان قورەیش دەستیان کرد بە ناردنی چەند وەفدێك بە مەبەستی تێگەیشتن لە نیازو مەبەستی پێغەمبەر ﷺ:-

أ- یەکەم وەفد، کە ناردیان لە تیرەی (خزاعة) بە سەرۆکایەتی (بُدیل بن ورقاء) بوو، کە دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: ئەی موحەممەد! بۆچی هاتووی؟! ئەویش دەفەرموێ: وەك چۆن بۆخۆتان دەبینن، ئیحرامـمان بەستوەو مەڕو حوشترمان پێیەو هاتووین (عومرە) بکەین، وە چەکی جەنگیشمان پێ نیە، (بدیل)یش دەگەڕێتەوەو هەواڵ بۆ قورەیشییەکان دەباتەوەو پێیان دەڵێ: موحەممەد بۆ جەنگو شەڕ نەهاتوە، بەڵکو بۆ (عومرە) هاتوە[١].

ب- دوایی (مکرز بن حفص) دەنێرن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، کە پێغەمبەر ﷺ چاوی پێدەکەوێ دەفەرموێ: **{هذا رجل غادر}**، واتە: ئەمە پیاوێکی پەیمان شکێنە، دوایی پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن قسەی بۆ (بدیل) کرد ئاواش هەڵوێستی خۆی بە ئەویش گوت، کە ڕۆیشتەوە لای قورەیشییەکان قسەی پێغەمبەری بۆ گێڕانەوە[٢].

ج- جارێکی دیکە (الحلیس بن علقمة) دەنێرن، کە گەورەی (أحابش) بووە، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ (حلیس) دەبینێ دەفەرموێ: ئەوە لە قەومێکە، کە زۆر ئەهلی طاعەتو عیبادەتن، وە مەناسیکی حەج بە گەورە دەگرن، بۆیە قوربانییەکان (مەڕو مالات)ی بۆ بەردەن با بیانبینێ، کە چۆن گەردنبەدیان لەمل دایەو نیشانەدار کراون، بۆ ئەوەی کە سەر ببڕدرێن، تاکو بزانێ کە ئێمە بۆ (عومرە) هاتووین، (حلیس) کە ئەو مەڕو مالاتە دەبینێ، پێش ئەوەی بگاتە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی هەر لەوێ دەگەڕێتەوەو دەچێتەوەو ئەوەی بینیویەتی بۆیان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: موحەممەدو هاوەڵانی هاتوون بۆ ئەوەی (تعظیم)ی

١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

کابە (کعبة) بکەن، چۆن شەڕی لەگەڵدا دەکەن؟! قورەیشییەکان پێی دەڵێن: تۆ کابرایەکی خێڵەکیی‌و نەزانیی بۆیە هەر قسەی تێدا مەکە!

(حلیس)یش لێیان تووڕە دەبێ‌و دەڵێ: ئەی قورەیشییەکان! سوێند بەخوا لەسەر ئەوە هاوپەیمانیەتییمان پێکەوە نەبەستوە، ئایا ڕێ لە یەکێك دەگرن کە دەیەوێ بێت عومرە بکات‌و ماڵی خوا بەگەورە بگرێ؟ سوێند بەخوا یان دەبێ وازی لێبێنن یان (أحابش) دەنگ دەدەم لێتان هەڵگەڕێنەوە، ئەوانیش پەشیمان دەبنەوە لەو قسەیەی کە پێیانگوتوەو هەرچۆنێکی بێ ڕازی دەکەن[١].

د- ئنجا (عروة بن مسعود الثقفي) دەنێرن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەمەبەستی تێگەیشتن لە هەڵوێست‌و مەبەستیان دەربارەی هاتنیان بۆ مەککە، بەهەمان شێوە ئەویش بۆی دەرکەوت، کە نیازی پێغەمبەر ﷺ‌و مسوڵمانان تەنیا (عومرە) کردنەو بۆ شەڕ نەهاتوون، دوایی کە (عروة) گەڕایەوە بە قورەیشییەکانی گوت: (یا معشر قریش اني قد جئت کسری في ملکه وقیصر في ملکه والنجاشي في ملکه، واني والله مارأیت ملکا في قوم قط مثل (محمد) في أصحابه، ولقد رأیت قوماً لایُسْلِمونه لشيء أبداً فَرْوا رأیکم) واتە: ئەی کۆمەڵی قورەیش! من چوومە لای کیسرا لە بارەگای خۆی، وە چووم بۆلای قەیسەر لە بارەگای پادشایەتی خۆیدا، وەچووم بۆلای نەجاشی لە بارەگای پادشایەتی خۆیدا، سوێند بە خوا هیچ پادشاو دەسەڵاتدارێکم نەبینیوە لەنێو قەومی خۆیدا وەکو موحەممەد بێ لە نێو هاوەڵانیدا، کە هێندە ڕێزو خۆشەویستی هەیە لەلایان، بە هیچ شێوەیەك پشتی بەرنادەن‌و تەسلیمی کەسی ناکەن، (واتە: نەچن‌و خۆتان تووشی شەڕ مەکەن) جا بڕیاری خۆتانی لەبارەوە بدەن[٢].

١) هەمان سەرچاوە، ج٣، ص(١٦٥).
٢) هەمان سەرچاوە، ج٣، ص(١٥٥،١٦٦).

## حەوتەم: ناردنی وەفد بۆ لای قوڕەیشییەکان:-

ئنجا پێغەمبەر ﷺ دوو وەفد دەنێرێ بۆ لای قوڕەیشییەکان لە مەککە:

أ- جاری یەکەم: (خراش بن أمية الخزاعي) دەنێرێ بۆ مەککە بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێ، کە لە هاتنەکەیدا پێغەمبەر ﷺ مەبەستی (عومرە)یەو هیچی دیکە، بەڵام (خراش)، کە دەگاتە (مەککە)، پێش ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەن، حوشترەکەی لە بندا دەکوژن، دوایی دەیانەوێ خۆیشی بکوژن، بەڵام تیرەی (أحابش) دەربازی دەکەنو لێناگەڕێن بیکوژن.

ب- جاری دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێ (عمر بن الخطاب) بنێرێ، بەڵام عومەر -خوا لێی ڕازی بێ-، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا لە تیرەی من (بني عدي) کەسێکی وای لە مەککە نیە، ئەگەر ئەوان بیانەوێ ئیهانەم پێ بکەن، بتوانێ بەرگریم لێ بکات، بۆخۆشت چاك دەزانی، کە من لەسەر کافرەکانی قوڕەیش زۆر توندم، بۆیە پێشنیازم وایە، کە (عثمان بن عفان) بنێری، چونکە عەشیرەتەکەی ئەو (بني أمية) ڕێژەیان زۆرە لە مەککەو بەرگریی لێدەکەن، پێغەمبەریش ﷺ پێشنیازەکەی عومەر پەسەند دەکاتو عوسمان دەنێرێ.

ئنجا کە (عثمان) — خوا لێی ڕازی بێ-، دەچێ، (بني أمية) وەکو خزمەکانی خۆی پێشوازیی لێ دەکەنو ڕێزی دەگرنو داوای لێ دەکەن، کە طەواف بکا، ئەویش دەڵێ: چۆن طەواف دەکەم، تا پێغەمبەری خوا ﷺ طەواف نەکات؟! من تەنیا بۆ ئەوە هاتووم، کە پێتان بڵێم پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ بێ بۆ مەککە بۆ بەجێ هێنانی (عومرە)، بۆیە داواتان لێ دەکەم ڕێی لێ مەگرن، دواتر دەنگوباس وا بڵاودەبێتەوە، کە کافرەکانی قوڕەیش (عثمان)یان کوشتوە، پێغەمبەرو مسوڵمانانیش ئەو هەواڵەیان بیست، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی کۆدەکاتەوەو، پێیان دەفەرموێ: پەیمانم پێبدەن، ئەگەر کافرەکانی قوڕەیش (عثمان)یان کوشتبێ، ئێمە جەنگیان لەگەڵدا دەکەین، ئنجا پەیمانیان لێ وەردەگرێ، هەروەها لەجیاتی (عثمان)یش هەردووك دەستی لەیەك دەداتو

بەیعەتی لێوەردەگری، خوای پەروەردگار لەوبارەوە ئەم دوو ئایەتەی نارده خوار، کە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾﴾ الفتح، واتە: بێگومان خوا ڕازی بوو لەو ئیماندارانەی، کە پەیمانیان لەگەڵ تۆ بەست لەژێر درەختەکەدا، خوا زانی چی لەدڵو دەروونیاندا هەیە، بۆیە ئارامیی ڕژاندە سەر دڵیان، وە لە پاداشتی ئەوەدا فەتحێکی نزیکی بە نسیب کردن[1].

دوایی هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی گەیشت، کە (عثمان) زیندووەو نەکوژراوە، ئەو بەیعەتە (بەیعەتی مەرگ)یشی پێدەگوترێ، واتە: شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا تا مردن، وەك (البخاري) لە (سلمة بن الأكوع) دەیگێڕێتەوە[2].

هەندێکیشیان ناویان لێناوە (بەیعەتی ڕانەکردن) وەك (مسلم) لە (جابر) دەگێڕێتەوە، شایانی باسیشە لەو (١٤٠٠) کەسە تەنها یەك کەس بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ نەدا بەناوی (الجد بن قیس)، کە یەکێك لە هاوەڵان دەڵێ: بینیم خۆی لە پشت حوشترەکەی گرتبوو، بۆ ئەوەی بەیعەت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەکا، وە (جابر بن عبدالله) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی حودەیبییە پێی گوتین: **{أنتم خير أهل الأرض}**، رواه البخاري ومسلم[3].

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ص١٦٧-١٦٨، وە (صحيح البخاري): ٤١٥٣.

٢) صحيح البخاري: ٤١٦٩.

٣) صحيح البخاري: ٤١٥٤، (صحيح مسلم): ٤٧٨٨، واللفظ للبخاري.

**هەشتەم: ناردنی (سهیل بن عمرو) لەلایەن قورەیشییەکانەوە:-**

دوای ئەوەی کە قورەیشییەکان زانییان پێغەمبەر ﷺ سوورە لەسەر ئەوەی دەبێ ڕێگای بدەن عومرە بکا، یان جەنگیان لەگەڵدا دەکا، وە زانییان کە پێغەمبەر ﷺ پەیمانی جەنگی لە هاوەڵانی بەرێزی وەرگرتوەو ئەوانیش هەموو یەك دەنگ پەیمانیان پێداوە، (سهیل بن عمرو) کە ئینسانێکی عاقڵو تێگەیشتوو بووەو سیاسییو لێهاتوو بووە، دەنێرن بۆ دانوستان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، وەك (ابن هشام) گێڕاویەتەوە کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ (سهیل) دەبینێ، کە پیاوێکی قسە بەدەستی قورەیشییەکانە، دەفەرموێ:[1] **{قد أراد القوم الصلح حين بعثوا هذا الرجل}**، واتە: قورەیشییەکان دەیانەوێ صولح بکەن بۆیە ئەم کابرایەیان ناردوە، پێغەمبەر ﷺ هەمیشە عادەتی وابووە، کە قسەی گەشبینانەی کردوە، بۆیە کە (سهیل) دەبینێ دەفەرموێ: **{قد سَهُلَ أمركم}**، واتە: (ئیشەکەتان ئاسان بوو).

بەسەرهاتی ڕێککەوتنەکەش وێڕای (ابن هشام)[2] (بخاري)و (مسلم)یش ڕیوایەتیان کردوە، کە پێغەمبەر ﷺ بانگی (علي بن أبي طالب)ی کرد، کە پەیماننامەکە بنووسێو پێی فەرموو بنووسە: (بسم الله الرحمن الرحيم)، بەڵام (سهیل) ڕازی نەبوو، گوتی: من نازانم (الرحمن) کێیە! بەڵکو بنووسە: (باسمك اللّهم) بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە (علي) فەرموو: وەك ئەو دەڵێ وای بنووسە، ئنجا عەلی نووسی (هذا ما كاتب عليه محمد رسول الله )، واتە: ئەوە شتێکە موحەممەد پێغەمبەری خوا لەسەری ڕێککەوت، بەڵام (سهیل) ڕازی نەبوو، گوتی: ئەگەر زانیبامان تۆ پێغەمبەری خوای شەڕمان لەگەڵ

١) (السيرة النبوية)، ج٣، ص(١٦٨).

٢) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣ ص(١٦٨-١٦٩)، وە: (صحيح مسلم): ١٧٨٣، و (صحيح البخاري): ٤١٨١

www.alibapir.com


نەدەکردی، بۆیە دەبێ بنووسرێ: (محمد بن عبدالله)، پێغەمبەریش فەرمووی: من پێغەمبەری خوام هەرچەندە بە درۆشم بزانن، دەی (علي) بنووسە: (محمد بن عبدالله)و وشەی (رسول الله) ڕەش بکەوە، (علي)ش نارازی بوو بەوەو ڕەشی نەکردەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ خۆی ڕەشی کردەوە.

**نۆیەم:** بەندەکانی صولحی حودەیبیيە:-

دوای چوونی (سهیل) بۆ لای پێغەمبەر ﷺو وتوویژ کردنیان بە شێوەیەکی چڕوپڕو دوورو درێژ، سەرەنجام گەیشتنە ئەوە کە:

١/ پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان ئەمساڵ بگەڕێنەوەو نەچنە مەککە، وە ئەگەر ساڵێکی دیکە مسوڵمانان ویستیان بێن بۆ مەککە، سێ ڕۆژان لێی دەمێننەوەو شیرەکانیشیان لە کالاندا دەبێ‌و نابێ قوڕەیشییەکان بە هیچ شێوەیەك ڕێگایان لێ بگرن‌و ڕووبەڕوویان ببنەوە.

٢/ بۆماوەی (١٠) ساڵان شەڕ ڕادەگرن‌و خەڵکی تێیدا ئەمین دەبن‌و دەست لە یەکدی دەپارێزن.

٣/ هەرکەس‌و تاقمێك بیەوێ هاوپەیمان بێ لەگەڵ موحەممەددا، ئەوە بۆی هەیە، هەرکەسێکیش هاوپەیمانی ببەستێ لەگەڵ قوڕەیشدا بۆی هەیە، وە هەر هۆزێك دەچێتە نێو هاوپەیمانی هەرلایەکیانەوە، دەبێتە بەشێك لەوان، بۆیە هەر دوژمنکارییەك بکرێتە سەر ئەوانەی دێنە نێو هاوپەیمانی هەریەکێکیان ئەوە دوژمنکارییە بۆ سەر ئەو لایەنە.

٤/ هەرکەسێك بە بێ فەرمانی گەورەکەی لە قوڕەیش بچێتە لای موحەممەد دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆلای قوڕەیش، بەڵام هەرکەسێك لەلای موحەممەدەوە بچێتە لای قوڕەیش ناگێڕدرێتەوە.

ئنجا دوای ئەوەی صولحەکە تەواو بوو، (خزاعة) هاتە نێو هاوپەیمانێتی پێغەمبەر ﷺ، وە (بني بکر)یش بوویە هاوپەیمانی قوڕەیش.

## دەیەم: دڵتەنگیی مسوڵمانان:-

دوابەدوای ئیمزاکردنی صوڵحەکە زۆربەی مسوڵمانان، کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دابوون بە نێوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکە نیگەران بوون ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

١) پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدابوون، کە خەونی بینیوە دەچنە مزگەوتی حەرامو طەوافی کابەش دەکەن، ئەدی بۆچی دەگەڕێینەوەو ناچین؟!

٢) موحەممەد ﷺ پێغەمبەی خوایەو لەسەر حەقەو خوا بەڵێنی سەرکەوتنی دینی ئیسلامی داوە، ئەی بۆچی ئەو شکستییە قبووڵ بکەین؟!

دیارە ئەو ئیشکالو پرسیارە لە دڵو مێشکی زۆربەی هاوەڵاندا هەبوو، بۆیە (عمر بن الخطاب) -خوا لێی ڕازی بێ- وەك نوێنەرێکی ئەو ڕێڕەوە بەرهەڵستکارە چووە لای (أبو بكر) -خوا لێی ڕازی بێ-و پێی گوت: ئایا ئەبووبەکر ئەو پێغەمبەری خوا نیە؟ گوتی: با، گوتی: ئایا ئێمە مسوڵمان نین، گوتی: با، گوتی: ئایا ئەوان هاوبەشدانەر نین؟ گوتی: با، گوتی: ئەدی بۆچی لە ئایینەکەماندا تەنازول دەکەین؟! ئەبووبەکر گوتی: ئەی عومەر! شوێنپێی وی هەڵگرە، من شایەدیی دەدەم، کە ئەو پێغەمبەری خوایە! عومەر گوتی: منیش شایەدیی دەدەم، کە پێغەمبەری خوایە.

ئنجا چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟ فەرمووی: با، گوتی: ئایا ئێمە مسوڵمان نین؟ فەرمووی: با، گوتی: ئایا ئەوان هاوبەشدانەر نین؟ فەرمووی: با، گوتی: ئەدی بۆچی لە دینداریماندا تەنازول دەکەین؟! فەرمووی: **{أنا عبدالله ورسولُهُ لن أخالف أمرَهُ ولن يضيّعني}**، واتە: من بەندەو ڕەوانەکراوی خوامو سەرپێچی لە فەرمانی ناکەمو زایەم ناکات!

دیارە دواتر عومەر زۆر لەو هەڵوێستەی خۆی پەشێمان بۆتەوەو بۆی دەرکەوتوە، کە نیگەرانییەکەی خۆیو هاوڕێکانیشی لەجێگای خۆیدا نەبووە، وە گوتوویەتی: بەردەوام نوێژو ڕۆژووو خێرو صەدەقەم دەکرد بۆ کەفارەتی ئەو قسەو هەڵوێستەم کە مەبەستم پێی چاکەو خێر بوو[1].

ئنجا لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەردا ﷺ بەرەو مەدینەو لەنێوان مەککەو مەدینەدا سوورەتی (الفتح)ی بۆ هاتەخوار، کە پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: **{أنزلَتْ عليَّ الليلة سورة لهي أحبُّ اليَّ ممّا طَلَعتْ عليه الشمسُ}** رواه البخاري ومسلم، واتە: ئەمشەو سوورەتێکم بۆ نێرراوەتە خوار، کە لەلام خۆشەویستترە لە هەرچی خۆری لەسەر هەڵهاتوە، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾﴾ الفتح، واتە: ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان بۆ هێنایە دی، هاوەڵانی پێغەمبەر گوتیان: موبارەکەو بە سەرو دڵی خۆش، ئەدی بۆ ئێمە چی هەیە؟!

خواش ئەمەی نارده خوار: ﴿لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ... ﴿٥﴾﴾ الفتح، واتە: تاکو بڕوادارانی پیاوو بڕوادارانی ئافرەت بخاتە چەند باغێکەوە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن[2].

## یازدەیەم: ئیحرام شکاندنو هەڵوێستی (أُم سَلَمة):-

ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵان کرد، کە ئیحرام بشکێننو سەری خۆیان بتاشنو حوشترو ماڵاتەکەیان سەرببڕن، سێ جاران ئەوەی دووبارە کردەوە، بەڵام کەس هەڵنەستاو جێبەجێی نەکرد، دوایی پێغەمبەر ﷺ چووە

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص١٦٩.
٢) بڕوانە: (صحيح البخاري): ٤١٧٢-٤١٧٧، وە: (صحيح مسلم): ٤٦١٣.

لای (أُم سلمة)ی خێزانیو شتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: بێئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکەی تۆ حەیوانەکەی خۆت سەر ببڕەو سەری خۆت بتاشە، ئەویش هەڵساو بەو شێوەیەی کرد، کە هاوەڵان چاویان لێبوو ئەوانیش هەستانو حەیوانەکانیان سەربڕین، پێغەمبەر ﷺ حوشترێکی بۆخۆی سەربڕی، کە پێشتر هی (أبو جهل) بوو، وە ئاڵقەیەکی زیوی لە لووتی کرابوو، ئەوەشی بۆیە کرد، تا ڕقی کافرانی پێ هەڵسێنێ[1]، دواتر پێغەمبەر ﷺ سێ جار پاڕایەوە بۆ ئەوانەی سەریان تاشیو یەکجار بۆ ئەوانەی کورتیان کردەوە، وەك (بخاري)[2]و (مسلم)[3] هێناویانە، وە لەو سەفەرەدا خوای بە بەزەیی فیدیەی دیاری کرد بۆ ئەوکەسەی سەری دەتاشێ، بەهۆی نەخۆشی یان بەمانەوەی مووی سەری ئازاری پێ دەگا.

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ، کە پێغەمبەر ﷺ زۆر ڕێزی لە (أُم سلمة)ی خێزانی گرتوەو ڕاوێژی پێکردوەو، کە زانیویەتی قسەکەی ڕاستو باشە، بە قسەشی کردوەو چارەسەری کێشەیەکیشی پێکراوە.

## دوازدەیەم: مەسەلەی (أبا جندل):-

دوای ئەوەی هەردوولا لە نووسینی ئاشتەوایی حودەیبییە بوونەوە، لەوکاتەدا (أبا جندل)ی کوڕی (سهیل)، کە لایەنێکی مۆرکردنی پەیماننامەکە بوو، بە دەستبەستراویی لە مەککەوە هەڵاتبوو، گەیشتە لای مسوڵمانان، (سهیل)یش داوای کردەوەو پێغەمبەریش ﷺ وەك جێبەجێکردنی پەیمانەکە دوای ئەوەی داوای لە (سهیل)کرد بەوی ببەخشێو ئەوەی نەکرد، بە ناچاریی تەسلیمی (سهیل)یان کردەوە، (سهیل) یەخەی کوڕەکەی خۆی (أبا جندل)ی گرتو ڕای

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٧١).

٢) صحيح البخاري: ١٧٢٧.

٣) صحيح مسلم: ٣١٣٣.

www.alibapir.com


کێشاو مستێکیشی کێشا بە دەموچاویدا، لەکاتی بردنەوەیدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی (أبا جندل)! سەبر بگرەو خوا بۆ تۆو ئەوانی دیکەی وەك تۆ دەرووی خێر دەکاتەوە، ئێمە لەگەڵ ئەوان صوڵحمان کردوەو نابێ بیشکێنین(١).

دواتر هەندێك ئافرەت هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، کە لەلای کافرەکانەوە هاتبوونو مسوڵمان ببوبوون، کەس‌وکاریان داوایان کرد بیانبەنەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو، چونکە لە بەندەکاندا وشەی (پیاو) هاتبوو نەك (ئافرەت).

خوای تاك‌و پاك لەوبارەوە لە سوورەتی (الممتحنة)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ مُهَـٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَـٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَـٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ ... ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! کاتێك ئافرەتانی ئیماندار کۆچیان کرد بۆ لاتان تاقیانبکەنەوە، جا ئەگەر بۆتان دەرکەوتن، کە ئیماندارن (واتە: ئەگەر لە ڕقی مێردەکانیان نەهاتبوون، یان بەدوا پیاوێك نەکەوتبوونو تەنیا لەبەر ڕەزامەندیی خوا هاتبوون) مەیانگێڕنەوە بۆلای کافرەکان، چونکە نە ئافرەتەکان بۆ ئەوان حەڵاڵن، نە ئەوانیش بۆ ئافرەتەکان حەڵاڵن).

## سێزدەیەم: بەسەرهاتی (أبو بصیر):-

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە مەدینە، (أبو بصیر) کە مسوڵمان بوو، لە مەککە ئازاریان دەدا، بۆیە هاتە مەدینە، قورەیشییەکان دووکەسیان بەدوادا ناردن، پێغەمبەریش ﷺ پێی دانەوە، ئەو دوو کەسە (أبو بصیر)یان لەگەڵ

١) رواه أحمد بسندٍ حسن والبیهقي في الكبرى، وە لە (صحیح مسلم)دا ئەم ڕستەیە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **{ومن جاءنا منهم سیجعل الله لَهُ فَرَجاً ومخرجاً}**: ٤٦٠٨.

خۆیاندا بردەوە تا گەیشتنە (ذو الحليفة) لەوێ (أبو بصير) بە فێڵێك شیرەكەی لە یەكێكیان وەردەگرێو، دەیكوژێ ئەوی دیكەش هەڵدێو خۆی دەگەیەنێتەوە مەدینەو، مەسەلەكە بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێ، (أبو بصير)یش دێتەوە بۆ مەدینە، بەڵام كە زانی پێغەمبەر ﷺ دەیداتەوە قورەیشییەكان ئەویش ڕۆیشتو لە نزیك دەریای سوور مایەوە، دواتر (أبو جندل)یش پەیوەندی پێوە كرد، ئنجا خەڵكانی دیكەش، بەو پێیە زۆربوونو ئەو كۆمەڵە لەو ناوچەیە هەر كاروانێكی قورەیش ڕەت بووبایە دەیانگرتو نەفەرەكانیان دەكوشت، بۆیە قورەیش داوایان لە پێغەمبەر ﷺ كرد، كە ئەوانە بهێنێتەوە لای خۆیو، پێغەمبەریش ﷺ بەدوایاندا دەنێرێو دێنەوە مەدینە.

ئاشكرایە، كە صولحی حودەیبییە ڕووداوێكی زۆر گرنگ بوو لە مێژووی ئیسلامداو دەرگای فروانبوونو سەرەتای گەشەكردنی دەوڵەتو كۆمەڵگای ئیسلامیی بوو، هەرچەندە بە ڕواڵەت مسوڵمانان ئەو ساڵە نەگەیشتنە مەبەستو لەسەر داوای (موشریكەكان) گەڕانەوە بۆ مەدینە، بەڵام وەك پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێكرد، خوای كاربەجێ پشتیوانو یارمەتیدەریەتیو خوای زاناش ئەو صولحەی بە سەركەوتن (فتح) ناوبردوەو هەرواش بوو، چونكە: ئەو ساڵە كە (١٤٠٠) كەسی لەگەڵدا بوو، پاش دوو ساڵو لە ساڵی هەشتەمی كۆچیدا، ژمارەی مسوڵمانان بەشێوەیەك زیادی كردو گەشەیان، كرد كە بۆ فەتحی مەككە، پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە دە هەزار (١٠,٠٠٠) كەسی لەگەڵدا بوو، وە ئەو صولحە مایەی هێوركردنەوەی بارودۆخی ناوچەكەو ئاسایی بوونەوەی باری سیاسی بوو، دیارە ئیسلامیش لە كەشوهەوای ئارامو هێمندا زیاتر دەناسرێو گەشە دەكاتو دەتوانێ دەوری خۆی ببینێ، كەواتە: بێگومان صولحی حودەیبییە سەركەوتنێكی گەورە بوو بۆ ئیسلامو مسوڵمانان.

# جەنگی خەیبەر[1]

جەنگی خەیبەر لە مانگی (محرم)ی ساڵی (٧)ی کۆچیدا ڕوویداوە، دوای ئەوەی جوولەکەکانی (بني النضير) لە مەدینە دەرکرانو چوون بۆ خەیبەر ئەوانیشیان زیاتر لە پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان هاندا، دواتر بەیەکەوەو بەتایبەت (بني النضير) لە شەڕی ئەحزابدا دەوری زۆریان هەبوو بۆ کۆبوونەوەی ئەحزاب لە دژی پێغەمبەرو هاندانی (بني قريظة) لە مەدینەو کەینوبەین دروستکردن لەگەڵ مونافیقەکاندا، کە هەموویان لەو شەڕەدا لە دژی مسوڵمانان بوەستنەوە، بەو پێیە غەدرو خیانەتو دوژمنایەتییان بەرامبەر مسوڵمانان درێژەی خایاندو (خەیبەر) بوو بە شوێنێکی خەتەر بۆ سەر کیانو ئاسایشی مسوڵمانان، هەر بۆیە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە مەدینەو نزیکەی مانگێك مایەوە، سوپای کۆکردەوەو بە ئیمانو ڕووحییەتێکی بەرزەوە، بە شەو بەڕێکەوت بەرەو خەیبەر، کە پێغەمبەر ﷺو سوپاکەی گەیشتنە نزیك (خەیبەر) ئیسراحەتیان کردو هێندێك نووستن، وە چادرو خێوەتیان لە شیوی (الرجيع) لە نێوان (خيبر)و (غطفان) هەڵدا، تا (غطفان) نەتوانن یارمەتی خەڵکی خەیبەر بدەن، کە تاو هەڵاتو خەڵکی بۆ سەر زەویو مەزرای خۆیان ڕۆیشتن، سوپای ئیسلامیان بینیو هاواریان کرد ئەوە موحەممەدو جەیشەکەیەتی، پێغەمبەریش فەرمووی: **{الله أكبر الله أكبر خربت خيبر، انّا اذا نزلنا بساحة قوم: (فساء صباح المنذرين)}** رواه البخاري[2]، واتە: خوای

---

١) (السيرة النبوية لإبن هشام)، ج٣، ص(١٧٦).

٢) صحيح البخاري: ٦١٠.

www.alibapir.com


گەورەترە، خوا گەورەترە، خەیبەر ڕووخا، ئێمە هەرکات دابەزینە مەیدان بۆ کۆمەڵێك (لە دوژمنان)، ئەوە ئاگادارکراوان خراپترین بەیانیان دەبێ.

ئنجا شەو، کە گەیشتنە نزیك خەیبەر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{لأعطين هذه الراية غداً رجلاً يفتح الله على يديه يحبُ الله و رسولَهُ ويحبُهُ اللهُ و رسولُهُ...}**[1]، واتە: سبەینێ ئەم ئاڵایە دەدەمە دەستی پیاوێك خوا لەسەر دەستی ئەو سەرکەوتن بەدەست دێنێو خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێنو خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێ، خەڵکەکە چاوەڕوان بوون شەو بڕواو ڕۆژدابێ بۆئەوەی بزانن ئاڵاکە دەدرێتە کێ؟ کە ڕۆژ داهات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کوا (عەلی کوڕی ئەبی طالب)، گوتیان: نەساغەو چاوی دێشن، فەرمووی بەدوایدا بنێرن با بێت، هێنایانو پێغەمبەریش ﷺ تفی لە چاوەکانی داو دووعای بۆ کردو چاك بۆوە وەك ئەوەی قەت چاوی نەهێشابن، وە ئاڵاکەی دایە دەستی ئەو... .

ئەویش سەرپەشتی جەنگ دەکاتو قەڵاکان دەگرن، سەرەتا قەڵای (ناعم) گیرا، کە زۆر بەزەحمەت بوو، کە چەند ڕۆژان پێیەوە خەریك بوون.

دوایی مسوڵمانان بە فەرماندەیی (الحباب بن المنذر) ڕوویان کردە قەڵای (الصعب)و دوای سێ ڕۆژان ئەویش گیرا، دواتر قەڵای (الزبیر)، دوایی قەڵاکانی (أبيّ)و (النزار) هەموو گیران، دوایی هەریەك لە قەڵاکانی (القموص)و (الوطيح)و (السلالم) بۆ ماوەی (١٤) چواردە ڕۆژان لەلایەن مسوڵمانانەوە دەورە درانو دواتر جوولەکەکان داوای (صولح)یان کرد، بەو شێوەیە هەموو (خیبر) کەوتە ژێر ڕکێفی مسوڵمانەکانەوە، ئنجا خەڵکی (فدك) لە باکووری (خیبر) ئەوانیش داوای ئاشتییان کرد، وە لەو جەنگەدا مسوڵمانان غەنیمەتێکی زۆریان گرتو ئەوانەشیان، کە داوای مانەوەیان کرد لەسەر زەویو زاری خۆیان، پێغەمبەر ﷺ ڕێگای پێدان، بەمەرجێك بەروبوومی زەوییەکەیان نیوە بۆخۆیان نیوەش بۆ بیت المال بێ، وەك

---

١) صحيح مسلم: ٦١٧٣، و (صحيح البخاري): ٣٠٠٩ و ٤٢١٠

www.alibapir.com


(بـخاري) هێناویـەتی: (إن رسـول الله ﷺ أعطـى خيبـر اليهـود علـى أن يعملوهـا ويزرعوها ولـهم شـطر ما خـرج منها)[١]، وە هەرکاتێکیش بیـەوێ دەریـان دەکـات، وە بـەپێی ئـەو مەرجـەش (عمـر بـن الـخطـاب) لـە سـەردەمی خۆیـدا دوای ئـەوەی خیانەتی لـێ بینیـن، لە (خیبـر) دەریکـردن.

(ابن هشام)[٢] دەڵـێ: لەکاتی گرتنی (خیبـر)دا (جعفر بن ابی طالب)و هاوەڵەکانی لە (حەبەشە)وە گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺو ئەویش جەعفـەری بەخۆیـەوە گوشـیو نێوچاوانی ماچ کـردو، فەرمووی: **{ما أدري بأيهمـا انـا أسـر: بفتـح خيبـر أم بقدوم جعفـر}**، واتە: نـازانم بەکامیـان دڵخـۆش بـم: بـە فەتـحی خیبـر یـان بـە هاتنی جەعفـەر!

## (صـفـيـة) دەبێتـە هـاوسـەری پێغـەمبـەر ﷺ :-

دوای ئـەوەی مسـوڵمانان قـەڵای (القموص)یـان گـرت (صـفية بنـت حيـي بـن أخطـب) لەوێدا دەبێو دەکەوێتە دەستی مسوڵمانان، کە کچـی سـەرۆکی بەشـێك لـە جوولەکەکان بوو، دواییی هاوەڵان بە پێغەمبـەر ﷺ دەڵـێن، کـە ئـەوە کچـی سـەرۆك هۆزەکەیەو بۆتۆ بێ باشـە، ئەویش ئەو پێشـنیارە قبووڵ دەکات، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ئازادی دەکـاو دوای ئەوەی، کە مسوڵمان دەبـێ دەیکاتـە هاوسـەری خـۆی، کـە ئەمـە کاریگـەریی زۆر باشـی هـەبوو لەسـەر هـەموو هۆزەکـە، (أنـس) لـەبارەی چـۆنییەتی بەهاوسـەرگرتنی پێغەمبـەر بـۆ (صـفية) دەڵـێ: (سَـبى النبِـيُّ ﷺ صـفية فأعتقهـا وتزوجهـا) رواه البخـاري[٣]، واتـە: پێغـەمبـەر ﷺ صـەفییەی بـەدیلگرت، پاشـان ئـازادی کردو کردیە هاوسـەری خۆی.

---

١) صحيح البخـاري: ٢٤٩٩.
٢) (السيرة النبوية...)، ج٣، ص(١٩٨)، صـحيح رواه الـحاكم وأَقـرَّهُ الذهبِـي والطبـراني.
٣) صحيح البخاري: ٤٢٠١

www.alibapir.com

## هەوڵی ژەهر خواردکردنی پێغەمبەر ﷺ:-

ژنێکی جوولەکە بە ناوی (زینب بنت الحارث) پرسیاری کرد، ئایا پێغەمبەر ﷺ لە گۆشتی مەڕ کوێی زۆر حەز لێیە؟ وتیان دەستی پێشەوەی، ئەویش مەڕێکی ژەهراوی کردو ژەهری زیاتری لەو شوێنە کردو بە دیاریی و برژێنراویی بۆ پێغەمبەر ﷺی ناردو، هاوەڵێکی بە ناوی (بشر بن البراء) لەگەڵی خوارد، پێغەمبەر ﷺ، کە پاروویەکی خستە نێو زاری، لەلایەن خواوە ئاگادارکرایەوە، کە ژەهراوییەو نەیخوارد، بەڵام (بشر) خواردبووی و بەوە وەفاتی کرد، دوایی پێغەمبەر ﷺ لە خوێنی (بشر)دا ئەو ژنەی کوشتەوە.

پێش ئەوەی ژنەکە بکوژنەوە، پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی: بۆچی ئەوەت کرد؟ گوتی: (أردنا ان كنت كاذباً نستريح، وان كنت نبياً لم يضرك) رواه البخاري[1]، واتە: ویستمان ئەگەر تۆ درۆزن بی رزگارمان دەبێ لە دەستت، ئەگەر پێغەمبەریش بی، ئەو شتە زەرەرت لێ نادات.

لە جەنگی خەیبەردا دەوری (٢٠) کەس لە مسوڵمانان شەهید بوون، کە زۆربەیان لە پشتیوانان بوون، وە لە جوولەکەکانیش دەوری (٩٣) کەس کوژران[2].

دیارە هەرکەسێکیش بە ویژدانەوە سەرنج بدات، دڵنیا دەبێ، کە هیچ جەنگاوەرێك هێندەی سوپای ئیسلام دادپەروەرو ڕەوشت بەرزو جوان ڕەفتار نەبووەو، هیچکەسیش هێندەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دادگەرو سینەفراوانو لێبوردەو بەبەزەیی نەبووە.

---

١) صحيح البخاري: ٣١٦٩.

٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٨٧-١٨٨)، وە: (السيرة النبوية...)، د. علي محمد الصلابي، ص(٧٠١).

# ڕووداوە گرنگەکانی پێش ئازاد کردنی مەککە

## یەکەم: نامە نووسینی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پادشاو دەسەڵاتدارەکان و بانگکردنیان بۆ ئیسلام:

دوای صولحو ڕێککەوتننامەی حودەیبییە، خەڵك بۆی دەرکەوت، کە ئیسلام هێزێکی سیاسی گەورەیەو پێشتر، کە قورەیش دژایەتی دەکردو بەڕەسمیی دانی پێدا نەدەهێنا، ئێستا ئامادەیە بیناسێ‌و ڕێککەوتن نامەی لەگەڵدا مۆر بکات، کە ئەوە هۆکارێکی گەورە بوو بۆ ئەوەی خەڵکی بێنە نێو ئیسلامەوە، هەروەها زەمینەشی ساز کرد بۆ ئەوەی خەڵك گوێ بگرێ‌و بزانێ ئەو ئیسلامە چییەو ئەو موحەممەدە ﷺ کێیەو چۆنەو، ئامانجی چییەو، شێوازی کارو مامەڵەی چۆنە؟!

بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەو هەلومەرجەدا بەچاکی زانی نامە بنێرێ بۆ پاشاو دەسەڵاتدارانی فارس‌و ڕۆم‌و میصرو حەبەشەو...هتد، وە مەبەستو نێوەڕۆکی ئیسلامیان تێبگەیەنێ، پێش ئەوەی نامەکان بنووسێ، هاوەڵانی پێیان گوت[1]: ئەوان هیچ نامەیەك ناخوێننەوە، کە مۆر (ختم) نەکرابێ، پێغەمبەریش ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی لەدەست کردو ئەم نەخشەیەی لەسەر هەڵکەند: (محمد رسول الله)، (محمد) لە خوارەوەو (رسول) لە نێوەندێ‌و (الله) لەسەرەوە.

بۆ ئەو مەبەستە لە چەند کاتێکی جیاوازدا نامەی بۆ ژمارەیەك لە پادشاو دەسەڵاتدارانی شوێنەکان نارد، کە ئەمە چەند نموونەیەکن لەو نامانە:

---

١) صحيح البخاري: ٢٩٣٨.

**١) نامە بۆ (هـرقـل) پادشـای ڕۆم :**

پێغەمبـەر ﷺ یەکـەم نامـەی بـۆ (هرقـل)ی پادشـای ڕۆم نـارد، کـە هـەڵگری نامەکەش (دحیـة الكلبِي) بوو، وەك لـە (صـحیح البخـاري)[1] و (صـحیح مسـلم)[2]دا هاتوە، کە ئەمەش نامەکەیەتی:

**{بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد عبدالله و رسوله إلى هرقل عظيم الروم: سلام على من اتبع الهدى، أما بعد، فإني أدعوك بدعاية الإسلام، أسلم تسلم، يؤتك الله أجرك مرتين، فإن توليت فإن عليك إثم الأريسيين و ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾** آل عمـران، واتـە: بـەناوی خـوای بـە بـەزەیی بەخشندە، لە (محمد) پێغەمبەری خـواوە بۆ (هرقـل) گەورەی ڕۆم، سەلام لەو کەسە بێ کە بەدوای ڕێنمایی خوا دەکـەوێ، (أمـا بعـد) مـن بانگـت دەکـەم بـە بانگـەوازی ئیسـلام، مسـوڵمان بـە سـەلامەت دەبـی، وە مسـوڵمان بـە خـوا دوو جـار پاداشـتت دەداتەوە (جارێك لەسەر وازهێنانی لە نەصرانییەتو جارێکیش لەسەر ئەوە کە شوێنی ئیسـلام دەکـەوێ) ئەگـەر پشـتیش هەڵبکـەی گونـاهی خـۆتو کرێکـارو جوتیارەکانـت لەئەستۆ دایە، وە (ئەی خاوەن کتێبەکان! وەرن بۆ بڕواهێنان بە وشەیەك کە بۆ هـەموو لایەکمان یەکسانە: کە جگە لەخوا نەپەرستین، وە هیچ شتێکی نەکەینـە هاوبـەش، وە هەندێکمان هەندێکمان لەجیاتی خوا نەکەینە پەروەردگار، جا ئەگەر پشـتیان هـەڵکرد ئەوە بڵێن: شایەدیی بدەن کە ئێمە ملکەچین (یان مسوڵمانیـن).

دیارە (هرقـل) نامـەکەی وەردەگرێو دەیەوێ لە پێغەمبەر ﷺ بکۆڵێتەوە، وەك لـە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ (أبو سفیان)دا دەربـارەی پێغەمبـەر ﷺ چـەند شـتێکی لـێ

---

١) صحيح البخاري: ٧.

٢) صحيح مسلم: ٤٥٨٣

دەپرسێ دوایی بە (أبو سفیان)ی دەڵێ: **((فإن كان ما تقول حقاً فَسَيَمْلكُ موضع قدمي هاتين))** رواه البخاري[١]، واتە: ئەگەر ئەوەی دەیڵێی ڕاست بێ ئەوە ژێر ئەم دوو پێیەی من دەگرێ! وە (هرقل) هێندێك ماڵو پۆشاكیشی بە دیاری دایە (دحیة)، بەڵام لە گەڕانەوەدا لەڕێگا رووتیان كردو ماڵو بەرگەكەیان لێ ستاند، (دحیة)، كە گەیشتەوە لای پێغەمبەر ﷺو شتەكەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ سەرییەیەكی نارد بۆ ئەو شوێنەو، ئەوانەی بەو كارە هەستابوون تەمبێی كردن.

**٢) نامە بۆ كیسرا گەورەی فارس :**

پێغەمبەر ﷺ نامەیەكی بۆ كیسرا نووسیی‌و بە (عبدالله بن حذافة السهمي)دا بۆ مەلیكی بەحرەینی نارد، كە ئەویش بینێرێ بۆ كیسرا، دەقی نامەكەش ئەمەیە:

**{ بسم الله الرحمن الرحيم من (محمد) رسول الله إلى (كِسْرى) عظيم فارس، سلام على من اتبع الهدى، وآمَنَ بالله ورسولِهِ وشهد أن لا إله إلاّ الله وأنّي رسول الله إلى الناس كافة لينذر مَن كانَ حياً، أسلم تسلم فإن أبيتَ عليك إثم المجوس[٢]}**، واتە: {بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لە موحەممەد پێغەمبەری خواوە بۆ كیسرا گەورەی فارس، سەلام لەو كەسە بێ كە شوێن ڕێنمایی خوا دەكەوێ، وە ئیمان بە خواو پێغەمبەری خوا دێنێ، وە شایەدیی دەدا كە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، وە كە من ڕەوانەكراوی خوام بۆ تێكڕای خەڵكی، بۆ ئەوەی هەركەسێك كە زیندوویە بیترسێنێ (ئاگاداری بكاتەوە) مسوڵمان بە سەلامەت دەبی! ئەگەر ڕازی نەبی گوناهی مەجووس لەئەستۆی تۆیە}.

---

١) صحيح البخاري، برقم: ٧.
٢) تأريخ الطبري، ج٢، ص ٦٥٤-٦٥٥.

دوای ئەوەی کیسرا نامەکەی خوێندەوە، نامەکەی دڕاند، بۆیە پێغەمبەریش دووعای لێکرد، کە خوای کاربەجێ لەنێویان بەرێ و دەسەڵاتیان تێکبدا، وەك (بخاري) لە ئیبن عەباس ڕیوایەت دەکات[١].

**٣) نامە بۆ (النجاشي) پادشای حەبەشە:**

پێغەمبەر ﷺ نامەیەکیشی بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە نارد، کە هەڵگری نامە کە (عمرو بن أمية الضمري) بوو.

**٤) نامە بۆ (المقوقس) پادشای (مصر):**

نامەیەکیشی بۆ (المقوقس)ی پادشای (مصر) نووسی، کە بە (حاطب بن أبي بلتعة)دا بۆی نارد.

**٥) نامە بۆ پادشای دیمەشق:**

نامەیەکیشی بۆ (المنذر بن الحارث بن أبي شمر الغساني)ی پادشای دیمەشق نوسی، بە (شجاع بن وهب)دا بۆی نارد.

**٦) نامەیەکیشی بۆ پادشای بەحرەین:**

نامەیەکیشی بۆ (المنذر بن ساوى العبدي) پادشای (بحرين) نوسی، کە بە (أبو العلاء الحضرمي)دا بۆی نارد، وە لە وەڵامی نامەکەیدا مسوڵمان بوو.

---

١) صحيح البخاري: ٤٤٢٤.

### ٧) نامە بۆ (هوذة بن علي الحنفي):

نامەیەکیشی بۆ (هوذة بن علي الحنفي) نووسی، کە بە (سليط بن عمرو العامري)دا بۆی نارد[١].

ئنجا هەریەك لەو پادشایانە بەجۆریك وەڵامی پێغەمبەریان ﷺ دایەوە، جگە لە کیسرا کە نامەکەی دڕاند، وە پێغەمبەر ﷺ دووعای لێکردن کە (أن يُمَزَّقوا كل مُمزّق) رواه البخاري[٢]، واتە: خوایە موڵكو سەڵتەنەتەکەیان لەبەریەك هەڵوەشێنە، دوایی زۆری نەبرد کە کیسرا بەدەستی کوڕەکەی خۆی کوژرا.

دیارە بە ناردنی ئەو نامانە بۆ پادشاو مەلیکەکان، پێغەمبەر ﷺ توانی بانگەوازی خوایان پێ ڕابگەیەنێو تێیان بگەیەنێ، کە ئەو پێغەمبەری خوایەو شوێنکەوتنی پێویستە، کە لە ئەنجامدا هێندێکیان بڕوایان پێی هێناو هێندێکیشیان بڕوایان پێی نەهێنا.

### دووەم: (عمرة القضاء) عومرەی گێڕانەوە :

بۆیە پێی گوتراوە: (عمرة القضاء)، چونکە ساڵی پێشوو بەهۆی ڕێککەوتنێك لەگەڵ موشریکەکاندا پێغەمبەر عومرەی نەکردو گەڕایەوە مەدینە، جا مانگی (ذو القعدة)ی ساڵی حەوتەمی کۆچی، ئەو عومرەیان گێڕایەوە.

یان لەبەرئەوە ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە بەهۆی ڕێککەوتنو صوڵحێکەوە بووە کە ئاوا بڕیاری لەسەر درابوو کە ساڵی ئایندە بکرێ.

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية...)، للصلابي، ص(٧١٥- ٧١٦)، کە ئاماژەی بەو سەرچاوانە کردوە، کە باسی هەموو ئەو نامانەیان کردوە.

٢) صحيح البخاري: ٤٤٢٤.

www.alibapir.com

بۆیە لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی حەوتەمی کۆچی پێغەمبەر ﷺ خۆی و ئەو (١٤٠٠) کەسەی کە ساڵی پێشوو لەگەڵی بوون لە صولحی حودیبییەداو (٦٠٠) کەسی دیکەش، چوون بۆ مەککەو عومرەیان کرد، هەروەها چەکی شەڕیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو، وێڕای شمشێر، نەوەك قورەیشییەکان غەدریان لێ بکەن و شەڕیان پێ بفرۆشن، وە (٢٠٠) سوارەوە لەلای چەکەکانیان دانا، (محمد بن مسلمة)یان بە کە لە دەرەوەی حەرەم دایاننابوون، وە وەکو پەیمانیان دابوو، خۆیان تەنیا بە شمشێری نێو کالانێوە چوون، وە سێ ڕۆژ لە مەککە مانەوەو دوایی قورەیشییەکان پێغەمبەریان ئاگادار کردەوە کە ماوەکەی تەواو بووەو با مەککە بەجێ بهێڵێ، هەر لەو ماوەیەدا پێغەمبەر ﷺ (میمونة بنت الحارث)ی مارە کرد، کە بێوەژن بوو خوشکی (أم فضل)ی هاوسەری (عباس)ی مامی بوو، وە داوای لە قورەیشییەکان کرد کە مۆڵەتی بدەن لە مەککە بیگوازێتەوە -مەبەستی بووە ماوەیەکی زیاتر لە مەککە بمێنێتەوە- وە پێی گوتن، کە دەعوەتیشیان دەکا، بەلام ئەوان گوتیان دەعوەتی تۆمان ناوێ و لێرەش مەمێنەوە، بەڵکو دەمانەوێ ئێرە بەجێبهێڵی[(١)].

ئەوەبوو دوای سێ ڕۆژ، مانەوەی لە مەککەو بەجێهێنانی عومرە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە.

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٠٧-٢٠٨)، رواه الحاكم، وصحَّحه ووافقه الذهبي.

## سـێیەم: مسـولْمانبوونی (خالـد بـن الولیـد)و (عمـرو بـن العـاص)و (عـثمـان بن طـلـحـة):

هەرچەند هەریەك لە (خالد بن الولید)و (عمرو بن العاص) پێشتر دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوونو زیانی گەورەیان بە ئیسلام گەیاندبوو، بەلاّم دوای ئەوەی ئیسلام وردە وردە گەشەی زیاتری کردو لە زۆر ڕووەوە پەرەی سەندو واقیعێکی بەرجەستەی هێنایە کایەوە، بۆیان دەرکەوت ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیلێ ڕاستەو هیچی دیکە لەسەر هاوبەش پەرستیی نەمانەوەو ڕوویان کردە مەدینە بۆ لای پێغەمبەرو مسولْمان بوون، پێغەمبەریش ﷺ زۆر پێی خۆش بوو وە دلْیشی دانەوە، بەوەی کە مسولْمان بوون گوناهەکانی پێشوویان دەپۆشێو دووعای خێری بۆکردن.

بەلْێ زۆر لە مێژوونوسان باس دەکەن کە سەرەتای سالْی هەشتەمی کۆچی (خالد بن الولید)و (عمرو بن العاص)و (عثمان بن طلعة)، کە هەرسێکیان پیاوی بەرجەستە بوونو لە سەردەمی نەفافییدا شوێن دەستیان دیار بوو، مسولْمان بوون، وە کە مسولْمانیش بوون، بەهەمان شێوە شوێن پەنجەیان دیار بوو بە مێژووی ئیسلامەوە، (خالد بن الولید) دەلْێ: کە چووم مسولْمان بم پێغەمبەر ﷺ ئەم ڕستەیەی پێ فەرمووم: **{الحمد لله الّذي هداك، قد كنت أرى لك عقلاً رجوت ألاّ يُسْلِمَك إلا إلى الخير}**، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە تۆی هیدایەتدا، عەقلْێکم بەتۆوە دەبینی ئومێدم وابوو، کە ئەو عەقلْەت تەنیا بەرەو شتی چاکت بەرێ، خالید دەلْێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! وەك بۆخۆت دەزانی من زیانم بۆ ئیسلام زۆر بووە، (بەتایبەتی لەکاتی جەنگی ئوحوددا)، دەبێ داوای لێبوردنم بۆ لە

خوا بکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{الإسلام يجبُّ ما كان قبله}**، واتە: ئیسلام پێش خۆی هەموو دەسڕێتەوە(1).

(عمرو بن العاص)یش دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەستم برد بەیعەت بە پێغەمبەر ﷺ بکەم، پێغەمبەریش ﷺ دەستی هێنا، بەڵام دەستم کێشایەوە.

فەرمووی: بۆ دەستت کێشایەوە؟!

گوتم: شەرتم هەیە، کە خوا لێم خۆش بێ، (چونکە من زەرەرم لە ئیسلام داوەو زیانم پێگەیاندوە)!.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{أما علمت ان الإسلام يهدم ماكان قبله؟ وان الهجرة تهدم ماكان قبلها؟ وان الحج يهدم ماكان قبله؟!}** رواه مسلم(2)، واتە: ئایا نەتزانیوە کە ئیسلام پێش خۆی دەڕووخێنێ (گوناح‌و تاوان دەسڕێتەوەو لای دەبات) کۆچ کردن لە پێناوی خوادا پێش خۆی دەڕووخێنێ، وە حەج پێش خۆی دەسڕێتەوەو لای دەبا.

(عثمان بن طلحة)ش، کە کلیل بەدەستی کەعبە بوو، ئەویش پێش فەتحی مەککە مسوڵمان بوو، وەك (ابن کثیر) باس دەکات، هەرسێکیان بەیەکەوە چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺو مسوڵمان بوون(3).

## چوارەم: غەزای (مؤتة):

هەرچەندە جەنگی (مؤتة) پێغەمبەر ﷺ بەشداری تێدا نەکردوە، بەڵام لەبەرئەوەی سێ هەزار جەنگاوەری مسوڵمان بەشدارییان تێدا کردوەو کارەساتێکی

---

1) البداية والنهاية، ج٤، ص(٢٧٨-٢٨٠).

2) صحيح مسلم: ٣١٧.

3) بۆ چۆنییەتی مسوڵمان بوونی (خالد بن وليد)و (عمرو بن العاص)و (عثمان بن طلحة)، بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٤، ص(٢٧٦-٢٨٠).

www.alibapir.com


گـەورەش بـووە، زۆر لـە مێژوونووسـان بـە (غـەزا) ناویـان هێنـاوە، کـە لـە (جـمادي الأولى)ی سـاڵی هەشـتـەمی کۆچـیدا ڕوویـداوە، دوای ئـەوەی ڕۆمـەکان بـە چـەند کردەوەیـەکی دوژمنکارانـە هەسـتانو لـەکاتی نـاردنی چـەند (سـرية)یەکـدا بـۆ ناوچەکانیانو بانگهێشتنیان بۆ ئیسلام، چەند کەسیان لە هاوەڵان کوشتو دواجار، کـە پێغەمبەر ﷺ نامەی بۆ پادشـای (بُصـری) ناردو (شـرحبيل)، کـە سـەرکردەیەکی سـەر بـە ئـەوان بـوو، نێرراوەکـەی پێغەمبـەر ﷺی کوشـت، ئـەو هەڵوێسـتە دوژمنکارییانـە پێویسـتیان بـە وەڵامدانەوەیـەکی پـڕ بـە پێسـت هـەبوو، بۆیـە پێغەمبەریش ﷺ ویستی، کە بە دوژمن بڵـێ: مسـوڵمانان هـەر ئـەوە نین، کـە لـە وڵاتی خۆیاندا بتوانن جـەنگ لەگـەڵ دوژمنـدا بکـەن، بـەڵکو کـە زوڵمیـان لـێبکـرێ دەتوانن هێرش بکەنە سەر دوژمن لە قـووڵایی خـاکی خۆیـاندا، بۆ ئـەو مەبەسـتەش سوپایەکی نارد، کە ژمارەیان سێ هەزار کـەس بـوو، وە پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـێ فەرماندەی بۆ دیاری کردن وەك لەم فەرموودەیـەدا دەبینـرێ: {عـن عبـدالله بـن عمـر رضي الله عنهما، قال: (أمر رسـول الله ﷺ فـي غزوة مؤتـة زيـد بـن حـارثة، فقـال رسول الله ﷺ: إن قتـل زيـد فجعفـر، وإن قتـل جعـفر فعبـدالله بـن رواحـة} رواه البخاري[1]، واتە: پێغەمبەری خوا لە غـەزای (مؤتـة)دا (زيـد بـن الـحارثة)ەی کـردە سەرکردەیان، وە ئامۆژگاری کردن، کە ئەگەر (زيد) کـوژرا (جعفـر کـوڕی أبـو طالـب) بکەنە فەرمانـدەی خۆیـان، وە ئەگـەر ئـەویش کـوژرا (عبـدالله بـن رواحـة) بکـەن بـە فەرماندەی خۆیان.

ڕۆمـەکان کە ئەوەیان بیست، سەدهەزار کەسیان بە سەرکردایەتی (هرقل) کـۆکردەوە وە سەد هەزار کەسیش لە عارەبی کرێ گرتە، کـە بـەکرێ گـیراوی ڕۆم بـوون، پێکـەوە کۆبوونـەوەو[2] لـە شـوێنێك بـەناوی (البلقـاء) پێکگەیشـتن، وە مسـوڵمانان چـوونە

---

١) صحيح البخاري، باب غزوة مؤتة: ٤٢٦١.
٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢١٠).

www.alibapir.com

ئاوەدانییەکەوە بەناوی (المؤتة) کە ئێستاش شارۆچکەیەکە لە ئوردن، ئنجا مسولّمانان کە بیستیان سوپای ڕۆمەکان ئەوەندە زۆرە، گوتیان: با وەلاّم بنێرینەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ سوپامان بۆ بنێرێ، بەلاّم (عبدالله بن رواحة) ورەی بەرزکردنەوەو گوتی: ئەوەی ئێستا خۆی لێ دەپارێزن هەر بۆئەوە وەدەرکەوتوون، کە شەهیدبوونە، وە ئێمە جەنگ لەگەڵ دوژمندا بەزۆرو ژمارەو هێز ناکەین، بەڵکو بەهۆی ڕاستیی دینەکەمانەوە دەیکەین‌و، سەرەنجامیش یان شەهیدییە یان سەرکەوتن‌و پشتمان بەخوا بەهێزە[١].

ئیدی هەردووك سوپا لە (مؤتة) بە یەککگەیشتن‌و جەنگ بە گەرمی دەستی پێکردو (زید) ئالاّکەی بەدەستەوە بوو، تا دوای شەڕێکی قارەمانانەو ئازایەتییەکی بێوێنە شەهید بوو، دوای ئەو (جعفر بن أبي طالب) ئالاّکەی هەڵگرت‌و بەرەو ڕووی دوژمن چووو دەیگوت :

یا حبذا الجنّة واقترابها طيبة وباردا شرابها
والروم روم قد دنا عذابها كافرة بعيدة أنسابها
عَليَّ إذ لاقيتها ضرابها

واتە: خۆزگەم بۆ بەهەشت‌و نزیکیم لە بەهەشت چەند خۆشەو ئاوەکەی چەند سازگارەو شیرینە، ڕۆمیش ڕۆمەو عەزابیان نزیك بۆتەوە، کافرن‌و نەسەبیان دوورە (لەبەرئەوەی خێزانی شەرعییان پێکەوە نەناوە) لەسەرم پێویستە کاتێك کە لەگەڵیان ڕووبەڕوو دەبمەوە لێیان بدەم.

ئەویش ئازایەتی خۆی نواند تا شمشێرێکی دوژمن بەر ئەو دەستەی کەوت کە ئالاّکەی پێ هەڵگرتبوو، دوایی ئالاّکەی دایە دەستەکەی دیکەی بەهەمان شێوە ئەو دەستەشیان پەڕاند، دوایی بەهەردوو قۆڵەکانی ئالاّکەی هەڵگرت تا شەهید بوو[٢]،

١) هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢١٢).

(عبدالله کوڕی عمر) -ڕەزای خوای لێبێ- دەڵێ من لەو (غزوة) بووم دوای ئەوەی جەعفەر شەهید بوو سەیرمان کرد لە نەوەد برین زیاتری پێوە بوو، وەك بوخاریی گێڕاویەتیەوە[1].

دوای ئەوەی (جعفر) شەهید کرا، (عبدالله بن رواحة) ئاڵاکەی هەڵگرتو بوو بە فەرماندەی مسوڵمانان کە دیارە ئەویش بەهەمان شێوە دەستی شیعری هەبووەو لەکاتی چوونە نێو دوژمنەوە، ئەم شیعرە دەڵێ[2]:

أقسمت يا نفس لتنزلّنهُ ... لتنزلنّ أو لتكرهنه
ان أجلب الناسُ وشدّوا الرنّه ... مالي أراكِ تكرهين الجنّة
قد طال ما قد كنت مطمئنة ... هل أنت إلا نطفة في شنة

واتە: ئەی نەفس! یان دەبێ خۆت خۆ پێدادەی، یاخود زۆرت لێ دەکەم، کە خۆت پێدادەی، لەکاتێکدا کە خەڵك دەست دەکەن بە هەراو هێرش دێنن، ئەوە بۆ حەز بە بەهەشت ناکەی؟ لەمێژە لە ئیسراحەت دای، تۆ چیت بۆ ماوەتەوە لە ژیان جگە لە تۆزە ئاوێك کە لە بنی کوندەیەکدا دەمێنێتەوە!!

بە هەرحاڵ دوای نواندنی قارەمانەتییەکی کەم وێنە (عبدالله)ش شەهید دەکرێو ئاڵا دەکەوێ، یەکێك لە مسوڵمانان ئاڵاکە هەڵدەگرێتەوەو دەیبات بۆ خالیدی کوڕی وەلیدو دەڵێ: خالید! ئەوە ئیشی من نیەو فەرمانده‌یەتی سوپا بەمن ناکرێ، دوایی ئەوانەی کە مشوورخۆر دەبن داوا لە خالید دەکەن کە فەرماندەیەتی سوپای مسوڵمانان بگرێتە ئەستۆ[3]، ئینجا خالید لەوکاتە ناسکەدا ئەو بەرپرسیارێتییە وەردەگرێو بۆ ترساندنی دوژمنو وەك تاکتیکێکی جەنگ شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەکە

---

١) صحيح البخاري، كتاب المغازي: ٤٢٦١.
٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢١٢).
٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢١٣).

www.alibapir.com

دەگۆڕێو جێگۆڕکە بەڕاستو چەپی لەشکرەکەی دەکات، بۆ ئەوەی ڕۆمەکان وا بزانن کە مسولْمانەکان هێزی دیکەیان بۆ هاتوە، وە هێزی پشتەوەی سوپاکە دەباتە پێشەوەو ئەوەی پێشەوەش دەباتە دواوەی، وە کۆمەلْێك سواریش لە دوورەوە دادەنێتو پێیان دەلْێت: کە ئێمە هێرشمان کرد، ئێوەش لەگەلْماندا هێرش بکەن[1]!

ڕۆمەکان کە ئەوە دەبینن دەلْێن: دیارە مسولْمانان کۆمەکییان بۆ هاتوە! بۆیە زۆر دەترسێنو شپرز دەبنو دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکوژرێ، ڕێ بۆ مسولْمانان دەکەنەوە کە پاشەکشە بکەن، ئەگەرنا لە سەرەتاوە ڕۆمەکان دەیانویست ئابلْووقەیان بدەن، بۆئەوەی سوپای مسولْمانان بەیەکجاری بنبڕ بکەن، بەلاّم سەرەنجام زۆر بە لێزانییو دوای لێکدانەوەی ڕەوتی جەنگەکە سوپای مسولْمانان سەربەرزانە پاشەکشەیان کردو بەرەو (مەدینە) گەڕانەوەو ئەو سوپا زۆرەی ڕۆمەکان، کە زیاتر لە دووسەد هەزار کەس بوو بە شێوەیەك شپرز بووبوون، کە نەیانتوانی بەدوای مسولْمانان بکەونو شەڕەکە کۆتایی پێهات[2].

وەك (بخاري) دەگێڕێتەوە خالید گوتوویەتی: لەو ڕۆژەدا نۆ شمشێر لەدەستمدا پسان، تەنیا یەك شمشێری (یەمانیی) لەدەستمدا خۆی ڕاگرت[3].

لە کۆتایی جەنگەکەدا، کە سوپای مسولْمانان گەڕایەوە بۆ مەدینە، کۆمەلْێك لە منداڵو تازە پێگەیشتووانی مەدینە چوون بە پیریانەوەو پێیان گوتن: {یا فُرّار فررتم في سبیل الله}، واتە: ئەی ڕاکردووەکان! لە جیهاد لەڕێی خوادا ڕاتانکرد! بەلاّم پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{لیسوا بالفُرّار، ولکنهم الکُرّار إن شاء الله**

---

١) بڕوانە: (البدایة والنهایة)، ج٤، ص(٢٨٩).

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص(٢١٣).

٣) صحیح البخاري: ٤٢٦٥.

**تعالى**[1]} واتە: نەخێر! ئەوانە ڕاکردوو نین، بەڵکو هێرش بەرن، ئەگەر خوای بەرز بیەوێ.

ئنجا لەڕاستیدا ئەو هەڵوێستەی خالید -خوا لێی ڕازی بێ- زۆر لێزانانە بوە، چونکە زانیویەتی، کە ئەگەر گریمان هەر یەك لە موجاهیدانی سوپای مسوڵمانان (١٠) کەسی سوپای کوفریش بکوژن، هێشتا هەر تەواو نابن، چونکە هێزەکانیان جیاوازییان زۆر بووەو، زۆر نابەرانبەر بوون[2]، وە باشترین هەڵوێستیان نواندوە کە کشاونەوە، بەڵام دوای ئەوەی کە زەبرێکی گورچك بڕیان لە دوژمن وەشاندوە، بۆ ئەوەی نەتوانن بەدوایان بکەون.

(بخاري) گێڕاویەتەوە کە لە کاتێکدا هاوەڵانی بەڕێز، ئەو سێ هەزار موجاهیدە بەجەرگ‌و چاو نەترسە، لە (مؤتة) کەوتوونە شەڕەوە، پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە لە نێو هاوەڵە بەڕێزەکانی دانیشتوەو، فرمێسك لە چاوی موبارەکی هاتۆتە خوارو فەرموویەتی: ئەوە زەید ئاڵاکەی هەڵگرت‌و شەهید کرا، دوای کەمێکی دیکە فەرموویەتی: ئەوە جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت‌و شەهید کرا، پاشان فەرمووی: ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرتەوە، هێندەی پێنەچوو فەرمووی: ئەوە ئەویش شەهید کرا، لە کۆتاییدا فەرمووی: ئەوە یەکێك لە شمشێرەکانی خوا ئاڵای هەڵگرت، وە خوا لەسەر دەستی ئەو مسوڵمانان دەرباز دەکات، کە مەبەستی پێ خالیدی کوڕی وەلید بوو خوا لە هەموویان ڕازی بێ[3].

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٤، ص(٢١٥).
٢) دەوری شەست‌و شەش بەرانبەری سوپای مسوڵمانان بوون!!
٣) (صحيح البخاري): ٤٢٦٢.

www.alibapir.com

## پێنـجـەم: سـەرییـەی (ذات السـلاسـل)[1]:

یـەکێکی دیکـە لـە ڕووداوە گرنگـەکانی پـێش ئـازادکردنی مەککـە، بریتیـە لـە (سـەرییە)ی (ذات السـلاسل) کـە چـەند ڕۆژێـك دوای گەڕانـەوەی سـوپای (مؤتـة) بـۆ مەدینە پێغەمبەر ﷺ سوپایەکی (٣٠٠) کەسی ڕێك دەخاو بـە فەرمانـدەیی (عـمـرو بن العـاص) دەیاننێرێ بۆ تەمبێکردنی (قضاعـة)، کە لەگەڵ ڕۆمـدا بەشـداریی جـەنگی (مؤتـة)یان کردبوو لە دژی مسولڵمانان، وە زانیبوویـان کـە مسـولڵمانان لـەو جەنگـەدا زیانیان پێکەوتووەو سێ فەرماندەیان لـێ شـەهیدبوون، بەتـەمابوون هـەلێك بقۆزنـەوەو شەبەیخوون بکەنە سەر مەدینە، بەڵام دوای ئەوەی (عـمـرو) دەبینـێ دوژمـن ژمارەیـان زۆرە، خەبەر دەنێرێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە هێـزی دیکـە بنێـرێ بـۆ یارمـەتییان، پێغەمبەریش ﷺ سوپایەکی دیکەی دووسـەد کەسـی دەنێـرێ بـە سـەرکردایەتی (أبـو عبيدة بن الـجراح) بۆ کۆمەکی سوپاکەی (عمرو بن العـاص)، کە (أبو عبيـدة) دەگاتـە لایان لە نوێژدا دەیەوێ ببێتە ئیمامیان، بەڵام (عـمرو بن العـاص) بە (أبو عبيدة) دەڵێ: من ئەمیـرم‌و تۆ بۆ هاوکاری ئێمە نێردراوی‌و دەبێ من پێش نوێژییان بـۆ بکـەم، (أبـو عبيـدة)ش بـە قسـەی دەکـاو (عـمـرو بـن العـاص) ئیمامـەتی نوێـژیان بـۆ دەکـات، هەرچەندە (أبو عبيدة) زۆر لەپێش (عـمـرو)ەوە مسولڵمان بووەو نـازنـاوی (أمیـن هـذه الأمة)ی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ لێنراوە، واتە: (ئەمینداریی ئەم ئوممـەتە)، بـەڵام کـە زانیویـەتی جیـاوازی هەڵوێسـت‌و لێکتـرازان چـەندە زیـان بەخشـەو مایـەی تێشکانە، بۆیـە گوێڕایـەڵیی (عـمـرو)ی کـردو سـەرەنجام لـە کارەکەیانـدا سـەرکەوتن‌و دوژمنانیان ڕایان کرد.

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية الصحيحة)، ج٢، ص(٤٧١)، د. أكرم ضيـاء العمـري.

بەو پێیە (عمرو) سەرکەوت و توانی ئەو تیرانە تەمبێ بکا، وەك: (بنو عبس، بنو مرة، بنو ذبيان، بنو سُليم، بنو أشجع)، وە زۆربەیان لەگەڵ سوپای ئیسلامدا پەیمانیان بەست و زۆریشیان مسوڵمان بوون.

هەر لەو ڕووداوە دەبێ کە (عمرو بن العاص) ئیحتیلامی دەبێ و لەبەر سەرما بوون خۆی ناشواو تەیەممومم دەکاو پێش نوێژیش بۆ مسوڵمانان دەکات، بەڵام هەندێك لە مسوڵمانان ڕەخنەی لێ دەگرن، ئەویش ئەم ئایەتە بە بەڵگە دێنێتەوە: ﴿...وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ النساء، واتە: وە خۆتان مەکوژن خوا لەگەڵتان بە بەزەیی یە، دەڵێ: ئەگەر خۆ بشۆم سەرمایەو نەخۆش دەبم، خوای پەروەردگاریش (گڵ)ی کردوە بە جێگرەوە (بدیل)ی (ئاو)و، کە ناتوانم ئاو بەکاربێنم، تەیەممومم دەکەم.

لە دواییدا کە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەو هەڵوێستەی (عمرو)یان بۆ باسکرد، پێغەمبەریش ﷺ لە (عمرو)ی پرسی بۆ وات کردوە؟ (عمرو)یش ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنەیەکی هات و هیچی نەگوت، واتە: ڕەزامەندیی دەربڕی لەسەر هەڵوێستەکەی (عمرو بن العاص).

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە هەرکەسێك بزانێ بە خۆشۆردن نەخۆش دەبێ بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا، بۆی هەیە تەیەممومم بکا.

شتێکی دیکە کە دەمەوێ ئاماژەی پێبکەم، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لەم جەنگەدا (ذات السلاسل) (عمرو بن العاص) دەکاتە فەرماندەی سوپای مسوڵمانان، کە ئەوکاتە ساڵێك یا کەمتر بوو مسوڵمان بووبوو، بەڵام لەبەرئەوەی خاوەنی چەند سیفەتێکی باش بووەو لێزانیی و توانای بەڕێوەبردن و فەرماندەیی هەبووە، کردوویەتی بە فەرماندەی ئەو سوپایە، هەرچەندە کەسانی دیکە کە زۆر پێش (عمرو) مسوڵمان

بووبوون، لەنێو سوپاکەشدا هەبوون، بەڵام دیارە لە ڕووی لێهاتوویی فەرماندەێتییەوە وەك (عمرو) نەبوون، چونکە ئەو مەسەلەیە زۆر گرنگەو دەبێ کەسێك ببێتە لێپرسراوو فەرماندەی هێزێك کە شایستە بێو توانای جەستەییو عەقڵییو لێزانینی هەبێو، بتوانێ کارەکەی جێبەجێ بکات، دیارە (عمرو بن العاص)یش ئەو سیفەتانەی تێدا بوون ئەگەر لە هەندێك لایەنی دیکەشەوە کرچو کاڵیی تێدابووبێ، وەك لە تێکگیرانی لەگەڵ (أبو عبیدة)دا دەردەکەوێ.

هەروەها (خالد بن الولید)یش ئازایەتیو لێهاتووییەکەی کردوویەتی بە فەرماندە، کەواتە: ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگەو پێویستە ئێمە ئەوە بزانین کە لەبواری کاری ئیسلامییدا ئەو کەسە کە سەر ڕاستو لێهاتوە، دەبێ کارەکەی پێ بسپێررێ، چونکە زۆر کەس لە مێژووی ئیسلامدا بە درەنگەوە مسوڵمان بووەو هاتۆتە نێو ئیسلامەوە، بەڵام لەبەر لێهاتووییو شایستەیی کاری پێ سپێردراوەو لەو بوارەدا پێش کەسانی دیکە -کە پێش ئەو هاتوونە نێو ئیسلامەوە- کەوتوونەوە.

بۆ نموونە: لە (صحیح مسلم)دا هاتوە کە (أبو ذر غفاري) دەڵێ: گوتم (یا رسول الله ألا تستعملُني؟)، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! ئیشم پێ ناسپێریو نامکەی بە بەرپرس؟!، {(دیارە — أبو ذر-) لێرەدا مەبەستی دونیا نەبووە، چونکە کابرایەکی زۆر باشو دیندار بووە} (أبو ذر) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{یا أبا ذر أنك ضعيفٌ وإنها أمانة وإنها يوم القيامة خزي وندامة الاّ أخذها بحقها، وأدّى الّذي عليه فيها}** رواه مسلم[1]، واتە: ئەی (أبو ذر) تۆ پیاوێکی بێهێزییو ئەوەش سپاردەیە، وە ڕۆژی قیامەتیش مایەی سەرشۆڕییو پەشیمانییە، مەگەر کەسێك بەهەقی خۆی وەری بگرێو ئەرکی سەرشانی خۆیشی تێد جێبەجێ بکات.

---

١) صحیح مسلم: ٤٦٩٦.

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ کە بە (أبو ذر) دەفەرموێ: تۆ بێهێزی مەبەستی ئەوە نەبووە، کە (أبو ذر) ئیمانی لاوازە، یاخود پیاوێکی دڵسۆز نیە، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە کە سیفاتەکانی فەرماندەیی تێدا نیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ زۆر بە حەکیمانەو لێزانانە فەرماندەی هێزەکانی دیاری کردوونو کێ شایستەی ئەوە بووبێ پێی سپاردوەو کەسی شیاوی بۆ شوێنی شیاو هەڵبژاردوە، بۆ وێنە (خالد بن الوليد)، کە زۆر بە درەنگەوە مسوڵمان بوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەیزانی بۆچی بەکاردێو لە بواری سەربازییدا ئازاو کارامەیە، بۆیە لە زۆر شوێندا کاری فەرماندەیی پێ سپاردوە، هی واش هەبووە تاکو مردوە پێغەمبەر ﷺ هەروەك سەرباز هێشتوویەتەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## ئــازاد كــرانــی مەككـــە

بەڕێـــزان !

خوا پشتیوان بێ لـە چـەند خـاڵێكی گوشـراودا باسـی ڕووداوێكـی گـەورەو گـرنگ دەكـەین لـە مێـژووی ژیـانی پێغەمبــەر ﷺ و ئیســلام‌و مسـوڵمانانـدا، كـە ئـەویش ئازادكرانی مـەككــەیە:

### یەكــەم: دەســتدرێـژیی (بنــو بكــر) بۆ ســەر (خُــزاعــة):

وەك پێشــتر باسمــان كـرد لـە ڕێكەوتننامــەی (حديبيــة)دا هــۆزی (بنــو بكــر) بوونـە هاوپەیمانی قورەیشییەكان‌و (خزاعة)ش بـوون بـە هاوپەیــمانی پێغەمبــەر ﷺ، ئنجـا دوای ئەوەی (بنو بكر) بە ناڕەوا هێرشیان كردە سـەر (خزاعــة)و خـەڵكیان لــێ‌كوشتن‌و ستەمیان لێكـردن، پێغەمبــەر ﷺ بیــری لـە تۆڵەسـەندنەوەو ئـازادكردنی (مـەككـە) كردەوە، ڕووداوی ئەو زوڵمەش بەم شێوەیە بوو:

ڕۆژێكیان هەندێك لە (بنو بكر) بەیارمــەتی (قـریش)و بـە فەرمــاندەیی (نوفـل) بـە هەلی دەزانن لای ئاوی (الوتيـر) هێرش دەكەنە سەر (خـزاعة) لە كاتێكدا، كـە ئـەوان چەكیان پێ نابێ‌و زیاتر لە بیست كەسیان لــێ دەكـوژن، بۆیـە (خــزاعة)ییـەكان پـەنا دەبەنــە بــەر مزگــەوتی حــەڕام‌و دەچــنە ئــەوێ، بــەڵام (بنــو بكــر) لــەوێش وازیــان لــێ‌ناهێنــن! دوایی خوزاعەییەكان بە نەوفـەل دەڵـێن: {يـا نوفـل إنـا قـد دخلنـا حـرم إلـهك}، واتە: ئەی نەوفــەل ئێمـە هاتووینـە نێـو حـەڕەمی پەرسـتراوی تـۆوە ئـەویش دەڵێ: {لا إله اليوم يا بني بكـر خـذوا ثـأركم}، واتە: ئەمڕۆ هیچ پەرستراو نین، ئـەی

(بنو بكر) تۆڵەی خۆتان بستێننەوە[١]، وە قوڕەیش بە چەك‌و وڵاخ‌و سەرباز یارمەتی (بنو بكر) دەدەن، كە بێگومان هەڵەیەكی گەورەیان كردو ئەو هەڵوێستەیان بە خراپ بەسەریاندا شكایەوەو بوو بەهۆی شكانی ئەو رێكەوتننامەیەی كە لە حودەیبییە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا بەستبوویان، چونكە لەو رێكەوتننامەیەدا قوڕەیش پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا بەستبوو، كە تا (١٠) دەساڵی دیكە كوشتار لە یەكدی نەكەن، وە یەكێك لە بەندەكان باس لەوە دەكا، كە هەركەسێك ببەوێ هاوپەیمانی هەر لایەنێك بێ، هێرشكرانە سەر ئەو كەسە، هێرشە بۆ سەر لایەنەكە بۆیە قوڕەیش بەو هەڵوێستەیان پەیمانەكەیان شكاندو وەكو ئەوە وابوو هێرشیان كردبێتە سەر مسوڵمانان.

دوایی (عمرو بن سالم الخزاعي) لەگەڵ (٤٠) كەس لە (خزاعة) دەچنە مەدینە بۆ لای پێغەمبەر ﷺو دەنگ‌و باسی زوڵمی (بنو بكر)ی بۆ باس دەكات‌و سكاڵای خۆیانی لا دەكەن[٢].

سەرەتا (عمرو بن سالم الخزاعي) دەچێتە مەدینەو لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا ئەم شیعرە دەخوێنێتەوەو دەڵێ:

**يا رب إني ناشد (محمداً) حلف أبينا وأبيه الأتلدا**

واتە: ئەی پەروەردگار من سكاڵای خۆم لای موحەممەد دەكەم، ئەو پەیمانەی كە بەستوومانە بەیەكەوە، وە باب‌و باپیرانیشمان بەیەكەوە لەكۆنەوە هاوپەیمان بوون، چونكە كاتی خۆی (خزاعة) لەگەڵ (بني هاشم)یشدا هەر هاوپەیمان بوون، واتە ئەی موحەممەد! تۆش لەسەر هاوپەیمانەكانی خۆت بكەوە، چونكە ئەوانە (بنو بكرو قريش) بەغەدر بیست نەفەریان لێ كوشتووین.

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢١٩)، وە: (المغازي للواقدي)، ج٢، ص(٧٨٤).
٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٢١).

پێغەمبەریش ﷺ زۆر بە کورتیی‌و پوختی دەفەرمویَ[1]: **{نُصِرتَ یا عمرو بن سالم}**، واتە: ئەی عەمری کوڕی سالیم یارمەتیتان دەدریَ‌و پشتگیرییتان دەکریَ، (یانی: ئێمە خاوەنی پەیمان‌و بەڵێنی خۆمانین).

پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەندە دەفەرموێت، چونکە ئەوە مانای زۆر هەڵدەگریَ، شتێکیش پێغەمبەر ﷺ فەرموویێتی ڕاست دەرچووە.

## دووەم: (أبو سفیان) دەیەویَ قەرەبووی پەیمان شکێنی بکاتەوە:[2]

کە قورەیش دەبیستیَ (بدیل بن ورقاء)و (عمرو بن سالم الخزاعي) سکالای خۆیان بردۆتە لای پێغەمبەر ئەوانیش (أبو سفیان) دەنێرنە لای پێغەمبەر ﷺ، بەمەبەستی چارەسەری کێشەکەو توندکردنەوەی ڕێککەوتننامەکەو درێژکردنەوەی، کە (أبو سفیان) دەگاتە مەدینە، دەچێتە لای (أم حبیبة)ی کچی، -ڕەزای خوای لێبیَ-، کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ، جا (أبو سفیان) کە دەچێتە لای (أم حبیبة)، ئەو ڕایەخەی، کە لە ژوورەکەیدا ڕایخستوە هەڵی دەگرێتەوەو دەیپێچێتەوە.

(أبو سفیان)یش دەڵیَ: ڕۆڵەگیان ئەو ڕایەخەت پیَ شایستەی من نەبوو، یاخود منت پیَ شایستەی ئەو ڕایەخە نەبوو؟

(أم حبیبة) دەڵیَ: نەخێر تۆ شایستەی ئەوە نی، کە لەسەر ئەو ڕایەخە دابنیشی، چونکە تۆ هاوبەش دانەری‌و پیسی، ئەوەش ڕایەخی پێغەمبەرە ﷺ، ئەویش دەڵیَ: وەڵڵاهی ڕۆڵە دیارە لەدوای منەوە ڕەوشتت تێکچووە!! بێگومان مسوڵمانانی ئەو سەردەمە بەگشتیی‌و خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بەتایبەت، وا لە ئیمان‌و ئیسلام حاڵی بووبوون، کە مەسەلەی خزمایەتیی‌و باوک‌و کچایەتی یاخود باوک‌و کوڕایەتیی‌و... هتد، وای لیَ نەکردوون شیرازەکانی شەرع‌و سنوورەکانی بپچڕێنن‌و لەبیریان بکەن، بەڵکو گوتوویانە ئەوانەی کافرن هەرکەسێك بن پێویستە وەك خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٢٢١).

٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٢٢٢-٢٢٣).

www.alibapir.com


بکرێ، دوایی (أبو سفیان) دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و قسەی لەگەڵ دەکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەڵامی ناداتەوە، دوایی دەچێ بۆ لای (أبو بکر) -خوا لێی ڕازی بێ- کە قسە لەوبارەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکات، وە باسی دوو ڕووداوەکەی نێوان (بنو بکر)و (خزاعة) دەکات، بەڵام (أبو بکر) هیچ بەڵێنێکی پێ نادا، (أبو سفیان) دوای ئەوەی لەلای (أبو بکر) هیچی چنگ ناکەوێ، دەچێ بۆلای (عمر) -خوا لێی ڕازی بێ- وە دەڵێ: بۆ شتێکی ئاوا هاتووم، بەڵکو تەکلیفم بۆ لە پێغەمبەر ﷺ بکەی کە ئەو صولحو ڕێککەوتننامەیە پتەوتر بکەینو ماوەکەشی درێژتر بکەینەوە، (عمر)یش دەڵێ: من تەکلیفت بۆ لە پێغەمبەر ﷺ بکەم؟! بەخوا ئەگەر تەنیا مێرووە سوورەکانم دەست بکەوێ -ئەو مێروووانەی کە بەئاستەم دەبینرێن- بەوانەش شەڕتان لەگەڵدا دەکەم! سەرەنجام دەچێ بۆلای (علي بن أبي طالب) -خوا لێی ڕازی بێ-، ئەویش بەهەمان شێوە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: ناگونجێ قسە لە قسەی پێغەمبەردا بکەم ﷺ، ئنجا داوا لە (فاطمة)ی هاوسەری (علي) دەکات کە حەسەنی کوڕی بنێرێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەڵێ: (حسن) منداڵێکی بچووکەو لەوە گچکە ترە کە تەکلیف لە پێغەمبەری خوا بکات، یاخود تۆ پەنا بدات!.

لە کۆتاییدا (أبو سفیان) بە نائومێدیی دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا کە لە (المطالب العالیة)[1]دا هاتوە پێغەمبەر ﷺ لەدوای ئەو ڕووداوە ئاوا قوڕەیشییەکانی ئاگادار کردەوە: **{أما بعد: فإنكم ان تبرؤوا من حلف بني بكر، أوتلُوا خزاعة، وإلا أوذنكم بحرب}** قوڕیشییەکان دەخاتە بەردەم سێ شت کە دەبێ یەکێکیان هەڵبژێرن:

١- یان دەبێ حاشا (براءة) بکەن لە هاوپەیمانێتی (بنو بکر).

٢- یاخود خوێنی کوژراوەکانی (خزاعة) بدەن، کە (٢٠) کەسیان لێ کوژراوە.

---

١) (المطالب العالية): ٤٣٦١، وقال ابن حجر إنه صحيح.

٣- ئەگەر ئەو دوو خاڵەی سەرەوە جێبەجێ ناکەن، ئەوە خۆتان ئامادە بکەن بۆ جەنگ، چونکە پەیمانتان شکاندوە بە دەستدرێژیی کردنە سەر هاوپەیمانی ئێمە، (لەکاتێکدا کە ئەو هۆزە هاوپەیمانە (خزاعة) تا ئەوکاتەش هەر (مشرك) بوون)، لە وەڵامی ئەو مەرجانەدا قورەیشییەکان لەنێو خۆیاندا گوتیان:

أ) ئەگەر بێتو دەست لە هاوپەیمانێتی (بنو بكر) هەڵگرین، ئەوەبێ هاوپەیمان دەمێنینەوە، چونکە هەر ئەوانمان بەدەستەوە ماون کە لەسەر دینی باب‌و باپیرانمان بن، بێگومان ئەوە ناکەین.

ب) ئەگەر خوێنی ئەو بیست کوژراوەی (خزاعة)ش بدەین لە کاتێکدا کە خوێنی نەفەرێك (١٠٠) سەد حوشترە، وە خوێنی هەمووشیان کە (٢٠) بیست نەفەرە زۆر دەکات، ئەو مەرجەشمان بۆ جێبەجێ ناکرێ.

ج) کەواتە دەبێ ئامادە بین بۆ جەنگ.

## سێیەم: خۆئامادە کردن بۆ ئازادکردنی مەککە:

ئیدی پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادە دەکاو فەرمان بە مسوڵمانانیش دەکا، کە خۆیان ئامادە بکەن، بەڵام بە نزیکترین کەسی خۆشی ناڵێ بۆ کوێ دەچێ؟! تەنانەت (أبو بكر)یش – خوا لێی ڕازی بێ- کە نزیکترین کەس بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نازانێ[1]، بەڵگەش ئەوەیە کە (أبو بكر) دەچێتە ماڵی عائیشەی کچی – خوا لێی ڕازی بێ-، کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ دەڵێ: ڕۆڵە گیان هەست دەکەم پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادە دەکات‌و شتی بۆ دەپێچێتەوە! نازانی بۆ کوێیە؟!

ئەویش دەڵێ: نەخێر بابە گیان بەمنیشی نەگوتوە!

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٢٣).

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ هیچ کەسی لەو مەسەلەیە ئاگادار نەکردۆتەوە، تەنانەت خۆشەویستترین کەسیشی! چونکە لە (صحیح البخاري)و (صحیح مسلم)دا هاتوە[1]، کە (عمرو بن العاص) پرسیار لە پێغەمبەر دەکاﷺو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! کێت لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ؟

دەفەرموێ: (عائشة)، ئەویش دەڵێ: ئەدی لە پیاوان؟

دەفەرموێ: (أبو بكر).

دەڵێ گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: (عمر)...

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ خۆ ئامادەکردنەکەی بە ئەندازەیەك نهێنی بووە، کە بە خۆشەویستترین کەسیشی نەگوتوە!

دوایی کە پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی ئامادە کرد، پێی گوتن کە بەرەو مەککە دەچێت‌و دووعاشی کردو فەرمووی: **{أَللّهم خذ العيون والأخبار عن قريش حتى نبغتها في بلادها}**[2]، واتە: ئەی خوایە! مەهێڵە هەواڵ بە قورەیشییەکان بگات، تاکو کتوپڕ بەسەریاندا دەدەین لە وڵاتی خۆیاندا.

دیارە پێغەمبەر ﷺ لەو دووعایەیدا زیاتر مەبەستی ئەوە بووە، کە کوشتار ڕوو نەداو خوێن نەڕژێ.

---

١) (صحیح البخاري): ٣٦٦٢، وە: (صحیح مسلم): ٦١٢٧.
٢) (السيرة النبوية لابن هشام) ج٤ ص(٢٢٣).

## چوارەم: (حاطب) کەوتە هەڵەوە کە ویستی قوڕەیش ئاگادار بکاتەوە:

یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ بەناوی (حاطب بن أبي بلتعة)، کە یەکێك بووە لەوانەی لە جەنگی بەدریشدا بەشداریی کردوە، هەڵەیەکی کردو بە نامەیەك قوڕەیشی ئاگادار کردەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هێز کۆدەکاتەوەو دەیەوێ هێرش بێنێ بۆ سەر مەککەو بە ژنێکدا ئەو نامەیە دەنێرێ، لەوکاتەدا (جبریل) دێتە لای پێغەمبەر ﷺو ئاگاداری دەکاتەوە کە (حاطب بن أبي بلتعة) نامەیەکی لەوجۆرەی نووسیوەو بە ژنێکدا ناردوویەتی، پێغەمبەریش ﷺ (علي بن أبي طالب)و (زبير بن العوام)و (المقداد بن الأسود) دەنێرێو لە شوێنێك بەناوی (روضة خاخ) پیرەژنەکە دەگرن، لە سەرەتاوە ژنەکە ئینکاریی دەکات لەوەی کە نامەی پێ بێت، بەڵام (علي) دەڵێ: ئەگەر بۆخۆت نامەکەمان نەدەیتێ ناچار دەبین کە بتپشکنینو جلوبەرگەکانت لەبەر دانێین، چونکە پێغەمبەری خوا لەخۆوە فەرمایشت نافەرموێ، ئیدی پیرەژن کە نائومێد دەبێ لەوەی وازی لێ بێنن، نامەکەیان دەداتێ کە لەبن کەزییەکانیدا شاردبوویەوە، نامەکە دەهێنن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ (حاطب) بانگ دەکاتو لێی دەپرسێ: بۆچی ئەو کارەت کرد؟! ئەویش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! بەخوا ئیمانم بەخواو پێغەمبەرەکەی هەیەو هەڵنەگەڕاومەوەو دینیشم نەگۆڕیوە، بەڵام من لە قوڕەیش نیمو خزمو کەسو منداڵیشم لەنێو ئەواندایە، مەبەستم ئەوە بوو بەم شتەم ئەوان ئاگایان لە خزمو کەسم بێ، (عمر بن الخطاب) -خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! با لە گەردنی بدەم ئەوە خیانەتی لە خواو پێغەمبەر ﷺ کردوەو دەغەڵیی کردوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{انه قد شهد بدراً، وما يدريك لعل الله اطّلع على من شهد بدراً، قال: اعملوا ما شئتم فقد غفرتُ لكم}** رواه البخاري ومسلم[1]، واتە: ئەو بەشداری بەدر بووە، دەڵێی چی ئەی عومەر ئەگەر خوا بە ئەهلی بەدری فەرمووبێ: بڕۆن لەمەودوا هەرچییەك بکەن لێتان خۆش

---

١) صحيح البخاري: ٤٢٧٤، وە: صحيح مسلم: ٦٣٥١.

www.alibapir.com


بووم! کەواتە: بەشدار بووانی جەنگی بەدر ڕێزو تایبەتمەندییەکی زۆریان هەبووەو، چاکەو کردەوەی گەورەی باش دەبنە تکاکاری گوناهانو مایەی سڕانەوەیان، بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ (حاطب) عەفوو دەکات، دوای ئەوەی کە دەزانێ ئەو هەڵوێستەی لە کوفرو نیفاقەوە نەبووە، بەڵکو لە بێهێزییەوە بووە، هەر بەو بۆنەیەشەوە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتە دەنێرێتە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ ...﴿١﴾﴾ الممتحنة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە دوژمنی منو دوژمنی خۆتان مەگرن بەدۆست، کە بەهۆی خۆشویستنیانەوە ئاگاداریان بکەنەوە لە نهێنی مسوڵمانان...

## پێنجەم: پێغەمبەر ﷺو سوپاکەی بەرەو مەککە بەڕێ دەکەون:

پێغەمبەر ﷺ لە (١٠)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٨)ی کۆچی دوای خۆ ڕێکخستنو ئامادەیی تەواو، بە سوپایەکی دە هەزار کەسییەوە بەرەو مەککە بەڕێ دەکەویو (أبا رهم الغفاري) لە مەدینە لەجێی خۆی بەجێدەهێڵێ[1]، لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین:

لە صوڵحی حودەیبییەدا، کە لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا بوو، پێغەمبەر ﷺ هەزارو چوار سەد لە هاوەڵانی لەگەڵدا بوون، بەڵام بۆ ئازادکردنی (مەککە) لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا دە هەزار کەس لە هاوەڵانی بەڕێزی لەگەڵدا بوون.

واتە: لەماوەی دوو ساڵی صوڵحدا، هەشت هەزار کەس زیادی کردوە، کەواتە: ئیسلام لە کەشوهەوای هێمنو ئارامدا گەشە دەکات، بۆیە خوای پەروەردگار ناوی لە صوڵحی حودەیبییە ناوە سەرکەوتنی ئاشکرا (فتحاً مبيناً)، چونکە زۆر لە تیرە عەرەبەکان چاوەڕێی قورەیش بوون، کە بینییان قورەیش ڕێککەوتنو لەگەڵ

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام) ج٤، ص(٢٢٤).

مسوڵمانانیدا ڕێککەوتننامە ئیمزا دەکەنو دانیاننناوە بە قەوارەی سیاسی ئیسلام دا، ئەمە ڕێی کردەوەو زۆر لە تیرە عەرەبەکان هاتنە نێو ئیسلامەوە.

شایانی باسیشە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەڕێزی، کە لە مەدینەوە بەڕێ دەکەون بەڕۆژووبوون {(١٠)ی ڕەمەزان بوو}، بەڵام لە شوێنێك بەناوی (الكدید) پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووەکەی شکاندو فەرمانیشی کرد بە هاوەڵانی، کە ئەوانیش ڕۆژووەکانیان بشکێنن، چونکە بەرەو جەنگ دەڕۆیشتنو بۆئەوەی کە لەگەڵ دووژمندا ڕووبەڕوو دەبنەوە بە هێزو توانا بن[1].

## شەشەم: (أبو سفیان) دەکەوێتە بۆسەی سوپای ئیسلامەوە:[2]

دیارە قوڕەیشییەکان بە بەردەوامی گوێ لەسەر هەست دەبن، کە سوپای ئیسلام بێتو بەسەر مەککەدا بدا، ئەو بەسەرهاتەش (عباس)ی مامی پێغەمبەر ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: شەو بوو من سواری ئێسترە سپیەکەی پێغەمبەر ﷺ بووم دەچووم بەرەو مەککە بۆ ئەوەی یەکێك ببینم، بینێرم قوڕەیشییەکان ئاگادار بکاتەوە، کە بێنو ئەمان بخوازن لە پێغەمبەر ﷺ، وە داوای ئەوەی لێ بکەن کە بە شەڕو کوشتارەوە نەچێتە نێو مەککەوە، بۆئەوەی قوڕەیش نەکوژرێنو خەسارەت زۆر نەبێ، لەڕێدا بووم بەرەو مەککە، گوێم لە دەنگەدەنگێك بوو کە نزیك کەوتمەوە، بینیم ئەوە (أبو سفیان)و (بدیل بن ورقاء)ن بەیەکەوە قسە دەکەن، گوێم لێبوو (أبو سفیان) دەیگوت ئەو ئاگرو جەیشەی ئەمشەو بینیومە قەت نەمدیوە، دیارە لەو سەردەمەدا شەوانە سوپا بارگەو بنەیان خستوەو خێمەیان هەڵداوەو ئاگریان کردۆتەوە، (بدیل بن ورقاء)یش گوتی: ئەوە (خزاعة)ن وا بە حەماسەتن.

---

١) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٤، ص(٢٢٤-٢٢٥).

٢) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٢٢٦-٢٢٧).

(أبو سفيان) گوتی: (خزاعة) زۆر لەوەی کەمترن ئەو هەموو ئاگرانە بکەنەوە! ئەوان لەو قسانەدا بوون، من بانگم کرد فلان کەس؟! (أبو سفيان) دەنگی منی ناسی، گوتی: تۆ فلانکەسی؟!

گوتم: بەڵێ.

گوتی: ئەوە چییە؟

گوتم: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ، کە بە سوپایەکەوە هاتوە شەڕی لەگەڵدا ناکرێ! جا وەرە لەگەڵ من سواربە، چونکە ئەگەر بێتو حەرەسو ئێشکچی ئەو سوپایە بتبینن، گیانت دەکەوێتە مەترسییەوە، (عباس) دەڵێ: (أبو سفيان)م لەپشت خۆم سوارکردو بەلای ئاگرەکاندا چووین، کە تەماشایان کردم ناسیانم، کە من مامی پێغەمبەرم ﷺو ئێسترەکەی ئەویشم پێیە، بۆیە تەماشای (أبو سفيان)یان نەکرد، کە لەدوای خۆمەوە سوارم کردبوو، بەو شێوەیە ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای ئاگری (عمر بن الخطاب) -خوا لێی ڕازی بێ- (عمر) کە (أبو سفيان)ی بینی بە دوامانداں ڕایکردو، گوتی: ئەوە دوژمنی خوایە! هیچ پەیمانێك نیە دەستێکم بیگاتێ دەیکوژم، منیش بە ئێسترەکە غارم کردو، زووتر گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لێی نزیك کەوتمەوەو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە (أبو سفيان) گەورەی قورەیشە، (عمر)یش -خوا لێی ڕازی بێ- گەیشتە لامانو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێم گەڕێ با لە گەردنی بدەم، ئەوە دوژمنی خواو پێغەمبەری خوایە، منیش گوتم من پەنام داوە، دوایی لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتمو سەری (أبو سفيان)م لە کۆشی خۆم نابوو دوای ئەوەی (عمر) چەند جارێك ئەوەی دووبارە کردەوە، منیش پێم گوت لەسەرخۆبە (عمر)، ئەگەر (أبو سفيان) یەکێك بووایە لە (بني عدي) (تیرەکەی خۆت) هێندە سوور نەدەبووی لەسەر کوشتنی!

(عمر)یش گوتی: ئەی (عباس)! بە خوا مسولمانبوونی تۆم پێ خۆشتر بوو لە مسولمانبوونی (خطاب)ی بابم، ئەویش لەبەرئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ بە مسولمانبوونی تۆ دڵخۆشتر بوو لە مسولمانبوونی بابم!!

بەڵام دوایی پێغەمبەر ﷺ بە (عباس)ی فەرموو (عباس) تا بەیانی بیبەو لە قۆناغەکەی خۆتی دابنێ، بەیانی (أبو سفیان)م لەگەڵ خۆم بردە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{ویحك یا أبا سفیان! ألم یأن لك ان تعلم أن لا إله إلاّ الله}**، واتە: بێ قەزا بی (أبو سفیان) کاتی ئەوە نەهاتوە، کە بزانی جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین؟!.

(أبو سفیان)یش گوتی: دایكو بابم بە قوربانت بن ئەی موحەممەد چەندە ئارامی! چەندە بەرێزی! چەندە خزم دۆستی! بە خوا بۆم دەرکەوتوە، ئەگەر ئەو پەرستراوانەی ئێمە دەیانپەرستین سوودیان پێ گەیاندباین، ئێستا تووشی ئەو وەزعە نەدەبووین.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **{ویحك یا أبا سفیان ألم یأن لك أن تعلم اني رسول الله}**، واتە: بێ قەزا بی (أبو سفیان) ئەدی کاتی ئەوە نەهاتوە بزانی من پێغەمبەری خوام؟!.

بەڵام ئەمجارەیان (أبو سفیان) گوتی: ئەوەیان هێشتا گومانێکم لەدڵدا ماوە! (عباس) دەڵێ: منیش گوتم: (أبو سفیان) مسولمان بە بەرلەوەی ملت بپەڕێنرێ! بەهەر حاڵ (أبو سفیان) ئیمانی هێنا[١].

ئومێد وایە لەدواییدا بووبێتە مسولمانێکی باش، چونکە لە جەنگەکاندا بەشداریی کردوەو چاوێکی لەدەست داوە، بە هەرحاڵ مسولمانبوونەکەی بەو شێوەیە بووە.

١) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٢٢٧).

www.alibapir.com


(عباس) دەڵێ: دوایی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: (أبو سفیان) بەرەو لە تەنگەبەرێك ڕای بگرە با سوپای ئیسلام پۆل پۆلو کەتیبە بە کەتیبە ببینێ، منیش بردم لە تەنگەبەرێك ڕامگرت، سوپای مسوڵمانان دەستی کرد بە جووڵە، هەر کۆمەڵێك دەهات (أبو سفیان) پێی دەگوتم ئەوانە کێن؟! ئەوە کێیە؟!

منیش دەمگوت: ئەوانە فلاّن تیرەن، ئەوە فلاّن کەسە، ئنجا کەتیبەیەك هاتن، کە لە چەکدا دەبریسقانەوە.

گوتی: ئەدی ئەوانە کێن؟!

منیش گوتم: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺو سوپای کۆچکەرو پشتیوانانی لەخزمەت دایە.

ئنجا (أبو سفیان) پێی گوتم: ئەی (أبو الفضل) بەڕاستی موڵکی برازایەکەت چاك گەورە بووە! منیش گوتم: ئەی (أبو سفیان) ئەوە موڵكو پادشایەتی نیە، ئەوە پێغەمبەرایەتییە، گوتی: دەی ئەوە باشتر[1]!

دوایی (عباس)ی مامی پێغەمبەر ﷺ پێشنیار دەکاتو دەڵێ[2]: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (أبو سفیان) فەخرو دەرکەوتنی پێخۆشە، ئەگەر شتێکی بدەیتێ باشە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: باشە جاڕ بدەن: هەر کەسێك بچێتە ماڵی (أبو سفیان) ئەوە ئەمین دەبێت، وە هەرکەسێکیش دەرگا لەسەر خۆی دابخا ئەمین دەبێ، وە هەرکەسێکیش بچێتە نێو مزگەوتی حەرامەوە ئەمین دەبێت، پێغەمبەر ﷺ لێرەدا شتێکی ڕواڵەتیی دەداتە (أبو سفیان)، کە دیارە ئەوکاتە (أبو سفیان) دڵی بەوە خۆش بووە.

---

١) هەمان سەرچاوە، ص(٢٢٨).
٢) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

## حەوتەم: پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆ بەکەمگرتن (تواضع)ەوە دەچێتە نێو مەککەوە :

پێش ئەوەی سوپای پێغەمبەر ﷺ بچێتە نێو مەککەوە، (عباس) بە (أبو سفیان) دەڵێ: بەخێرایی بڕۆوە (مەککە)، ئەویش دەچێتەوە نێو شارو بەدەنگی بەرز هاوار دەکات‌و دەڵێ: ئەی خەڵکینە ئەوە موحەممەدە بە سوپایەکەوە دێت، هەرکەسێك بچێتە ماڵی (أبو سفیان) با لەخۆی ئەمین بێ.

گوتیان: خوا لەنێوت بەرێ ماڵی تۆ قازانجمان پێ ناگەیەنێ، دوایی گوتی: هەرکەسێك بچێتە ماڵی خۆی‌و دەرگا لەسەر خۆی دابخات، با لەخۆی ئەمین بێ، وە هەرکەسێك بچێتە مزگەوت با لەخۆی ئەمین بێ، بەو شێوەیە زۆربەی خەڵکەکە چوو بۆ مزگەوت‌و نێوماڵی خۆی.

مێژوونووسان دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە (ذي طوى)و بۆ چوونە نێو مەککەوە، سەری موبارەکی خستبوە سەر قەرپوزی وڵاخەکەی‌و ملکەچیی بۆ خوا دەکرد بەو سەرکەوتنەی کە پێی بەخشیبوو، چونکە دەیزانی کە ئەوە نیعمەت‌و چاکەی خوایە داویەتی بە خۆی‌و مسوڵمانان‌و ئەو شارەی هەشت ساڵ لەمەوپێش موشریکەکان ئەویان لێ دەرکردوە، ئێستا بەسەر بەرزیی‌و هێزو عیززەتەوە دەچێتەوە نێوی‌و فەتحی دەکات‌و خەڵکەکەی چاوەڕێن ئەو عەفوویان بکاو بەزەییان لەگەڵدا بنوێنێ!

جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێوەیەك سوپایەکە تەرتیب دەکا کە لە چوار قۆڵەوە بچنە نێو شاری مەککەوە، (خالد بن الولید)ی دیاری کرد کە خۆی‌و هێزەکەی لەبەشی خوارەوەی مەککە بچنە نێو مەککەوەو لە (صفا) لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ یەکبگرنەوە وە فەرمانیشی بە (زبیر بن العوام) کرد کە لە باکوورەوە بڕواتە نێو مەککەوە لە ڕێگەی (کداء)ەوەو ئاڵاکەی لە (حجون) بچەقێنێ.

(أبو عبیدة)شی کردە سەرکردەی پیادەو بێ چەکەکان‌و پێی فەرموو، کە بەنێو دۆڵەکەدا بڕوات تا دەگاتە نێو مەککەو لەوێ یەکدەگرنەوە.

وە (سعد بن عبادة)ش لەگەڵ هێزێکی پشتیوانان (الأنصار) لە پێشەوەی پێغەمبەر ﷺ بەڕێ دەکەوێ، وە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری هەموویان دەکات، کە شەڕ

تەنیا لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە شەڕیان لەگەڵ دەکەن، وە لەو قۆڵەی کە (خالد بن الولید) سەرکردەی سوپایەکە دەبێ، قوڵە شەڕێکی بچووك ڕوو دەداو کوشتارێکی کەم دەکرێ، کە هێزێك لە قوڕەیشییەکان لە (الخندمة) کۆبووبوونەوە بەنیازی بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئیسلام بوون، لەوانە: (صفوان بن أمیة، عکرمة بن أبي جهل، سهیل بن عمرو) وە چەندین کەسی دیکە بوون، بەڵام زوو دەشکێنو جگە لەوانەی کە دەکوژرێن، ئەوانەی دیکە هەڵدێنو پەرتەی لێ دەکەن.

پێغەمبەر ﷺ زۆر مەبەستی بوو کێشەو کوشتار لەنێو مەککەدا ڕوو نەدات، بۆیە کاتێك بیستی (سعد بن عبادة) گوتوویەتی: {الیوم یوم الملحمة، الیوم تُسْتَحلُّ الحرمة[١]}، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگەو حەڕام حەڵاڵ دەکرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر ئەمڕۆ ڕۆژێکە خوا ڕێزی کەعبەی تێدا دەگیرێ، وە ئاڵاکەی لە (سعد) وەرگرتەوەو دای بە (قیس)ی کوڕی، بۆ ئەوەی پشتیوانەکانیش گلەیی نەکەنو (سعد)یش بۆ کوڕی خۆی پێی ناخۆش نەبوو[٢].

ئنجا کە پێغەمبەر ﷺ دەچێتە نێو شاری مەککەو وەزعەکە هێور دەبێتەوە، فەرمان دەردەکا کە چەند کەسێك بکوژرێن، لەوبارەوە (ابن حجر) دەڵێ: ئەو کەسانەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کوشتنی دان سەرجەم (١٣) کەس بوون، چوار ئافرەتو نۆ پیاو لەبەرئەوەی ئەو سێزدە کەسە، یان خوێنی خەڵك قەرزدار بوون، یان زۆر ئازاری ئیسلامو مسوڵمانانیان دابوو.

دیارە هەندێك لەوانە دێنو مسوڵمان دەبنو پێغەمبەریش ﷺ لێیان خۆش دەبێو عەفوویان دەکات، بەڵام ئەوانەیان، کە نایەنو پەشیمان نابنەوە، دەکوژرێن[٣].

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٢٣٠).

٢) (السیرة النبویة)، للصلابي، ص(٧٦٢).

٣) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٤، ص(٢٣١-٢٣٣)، وە: (فتح الباري)، لابن حجر العسقلاني، ج٧، ص(٩).

www.alibapir.com


## هەشتەم: پاککردنەوەی کەعبە لە بتەکان و دەرکردنی لێبوردنی گشتی:

ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەچێتە مزگەوتی حەرامەوەو حەوت جار تەوافی کەعبە دەکات، لەکاتی تەواف کردنەکەشدا یەکێك لە کافرەکان دەیەوێ پێغەمبەر ﷺ بکوژێ، بەناوی (فضالة بن عمیر)، کە بۆخۆی ئاوا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لە تەوافکردندا بوو، چووم بیکوژم، ئەویش ڕووی تێکردم و فەرمووی: ها (فضالة) ئیشت چییە؟!

منیش گوتم: هیچ ئیشێکم نیە تەنیا تەواف دەکەم و دووعا دەکەم.

فەرمووی: دووعا دەکەی! نەخێر داوای لێبوردن لە خوا بکە، چونکە نیەتێکی دیکەت هەیە وەرە پێش، منیش لێی چوومە پێش و دەستێکی بە سینگمدا هێناو دووعای بۆ کردم، سوێند بەو کەسەی موحەممەدی بەحەق ناردوە، پێش ئەوەی دەست بخاتە سەر دڵم هیچ کەس لەسەر زەوی نەبوو لەوی زیاتر ڕقم لێی هەڵسێ، بەڵام کە دەستی لەسەر سینەم داناو دووعای بۆ کردم، هیچ کەس نەبوو لەسەر زەوی هێندەی ویم خۆش بوێ[1].

وە (بخاري ومسلم)[2] هێناویانە، کە پێغەمبەر ﷺ دوای تەوافی کەعبە دەچێتە نێو کەعبەوە، کە (٣٦٠) بتی تێدا بووەو پێغەمبەر ﷺ بە گۆچانەکەی ئیشارەی بۆ بتەکان دەکردو دەیخستن و ئنجا دەیفەرموو: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ... ﴿٨١﴾ ﴾ الإسراء، ﴿ قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ ﴾ سبأ، واتە:

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٢٣٧).

٢) صحيح البخاري: ٤٢٨٧، وە (صحيح مسلم): ٤٦٠١.

{وە بڵێ حەق هاتو (باطل) پووچایەوە}، بڵێ حەق هاتو (باطل) دروست نابێتەوەو ناگەڕێتەوە) وە فەرمانی کرد کە هەموو ئەو بتانە بشکێنن، هەروەها وێنەی (إبراهیم)و (إسماعیل) لەسەر دیواری کەعبە کێشرابوون کە (أزلام)یان بەدەستەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە ئەو وێنانەش بسڕنەوە، پاشان خەڵکەکە کۆبوونەوەو چاوەڕوانی پێغەمبەریان دەکرد ﷺ وتاریان بۆ بدا، پێغەمبەریش ﷺ لە دەرگای کەعبە وەستاو فەرمووی: **{لا إله إلا الله وحده لا شريك له، صدق وعده، ونصره عبده، وهزم الأحزاب وحده...}**، واتە: بێجگە لەخوا هیچ پەرستراو نین، بەڵێنی خۆی بردەسەرو بەندەی خۆی سەرخست، وەخۆی بەتەنیا حیزبەکانی تێکشکاند، ئنجا فەرمووی: ئەی کۆمەڵی قورەیش خوا مێشکی نەفامێتی لە ئێوەدا لابرد، شانازی بە باب‌و باپیرانتانەوە مەکەن‌و خۆ بەسەر خەڵکدا هەڵمەکێشن، خەڵك هەمووی لە ئادەمن، ئادەمیش لە گڵە، ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە دروستمان کردوون لەنێر (ئادەم)و مێ (حواء) یەك، وە گێڕاومانن بە چەند گەل‌و هۆزێك بۆئەوەی یەکدی بناسن، بێگومان بەڕێزترینتان لای خوا پارێزکارترتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

پاشان فەرمووی: ئەی کۆمەڵی قورەیش پێتان وایە چیتان لێدەکەم؟!

گوتیان: تەنیا چاکەو خێرت لێ چاوەڕێ دەکەین، برایەکی بەڕێزو برازایەکی بەڕێزی!

ئەویش فەرمووی دەبڕۆن ئەوە هەمووتان ئازادن[١].

(أبو هريرة) –خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوە، دەڵێ[١]: دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مەککە نیشتەجێ بوو، مسوڵمانانی مەدینە (پشتیوانەکان) هەندێکیان بە

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٣٣-٢٣٤)، وە (البداية والنهاية)، ج٤، ص(٣٨٤).

هەندێکیان گوت: پێغەمبەر ﷺ هاتۆتەوە نێو شارو خزمەکانی خۆی، لەوانەیە لەمەودوا لێرە نیشتەجێ بێت‌و بەیەکجاریی لێرە بمێنێتەوە، لەوکاتەشدا وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی، چونکە پێغەمبەر ﷺ کە وەحی بۆ دەهات ئێمە لێمان ئاشکرا بوو، لەبەرئەوەی دەکەوتە حاڵەتێکی نائاساییەوەو دەموچاوی موبارەکی سوور دەبۆوە، تەنانەت ئەگەر لە ڕۆژی زۆر ساردی زستانیشدا بووایە، دەموچاوی موبارەکی ئارەقی پێدا دەهاتە خوار، بۆیە ئێمە چاومان تێدەبڕی هەتا وەحییەکە تەواو دەبوو، دوای ئەوەی کە وەحی هاتە خوار پێغەمبەر ﷺ بانگی پشتیوانانی کرد، فەرمووی: **{يا معشر الأنصار قُلْتُمْ أما الرجل فأدركته رغبةُ في قريتهِ ورأفة بعشيرته؟!}**، واتە: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان! ئایا لەنێو خۆتاندا گوتتان: پێغەمبەر ئارەزوومەندە، کە بێتەوە نێو شارەکەی خۆی‌و بەزەیی بە خزم‌و هۆزەکەیدا هاتەوە؟! گوتیان: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا لەنێو خۆماندا قسەیەکی وامان کرد، فەرمووی: **{كلاَّ إنِّي عبدالله ورسوله هاجرت إلى الله وإليكم والمحيا محياكم والممات مماتكم}** رواه مسلم[٢]، واتە: نەخێر ئەو گومانەی بەدڵتاندا هاتوە وانیە، من بەندەی خوام‌و پێغەمبەری خوام، کۆچم کردوە بۆ لای خوا، پاشان بۆلای ئێوە، ژیانم لەگەڵ ئێوەیەو مردنیشم لەگەڵ ئێوەیە، ئەوانیش لێی نزیک کەوتنەوە گریان‌و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! بەخوا بۆیە ئەوەمان گوتوە، پێمان ناخۆش بوو لێمان دوور بکەویەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **{إن الله ورسوله يُصَدِّقانكم ويَعْذرانِكم}**، واتە: خواو پێغەمبەری خوا بەڕاستتان دەزانن (کە لەبەر زێدە خۆشەویستی منتان بووە، نەك ئەوەی کە گومانی خراپتان بەمن بردبێ)، وە عوزریشتان بۆ دێننەوە.

---

١) (البداية والنهاية)، ج٤، ص(٣٥٤-٣٥٥).
٢) صحيح مسلم: ٤٥٩٨، وە: (البداية والنهاية)، ج٤، ص(٣٥٥).

## نۆیـەم: مسـولـمانبوونی سـەرانی قـورەیـش :

دوای ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ لـە مەککـەدا نیشـتـەجێ بـوو، سـەرانو زۆربـەی زلەزلەکانی قورەیش ئەوانەی، کە تا ئەوکات زۆر دژایەتی پێغەمبەریان ﷺ کردبوو، هاتنە نێو ئیسلامەوەو مسولّمان بوون.

یـەکێك لەوانـە (سـهیل بـن عـمـرو) کـە نوێنـەری قورەیشـییەکان بـوو لـە صـولّحی حودیبییەدا، هەروەها (صفوان بن أمیـة)و (عـکرمـة بـن أبـي جهـل) ئەوانـە هەرسـێك هاتن مسولّمان بوون، کە هەرکامێك لەوانە بەسەرهاتی خۆی هەیە، بۆ وێنـە: (سـهیل بن عمرو) دەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەککە دەرگام لەسەر خۆم داخستو خۆم پەنهان کرد، گوتم ئەگەر پێم بزانێ دەمکوژێ، (عبدالله)ی کـوڕم نـارد گـوتم بـڕۆ بزانـە موحەممەد ئەمانم دەدا؟

کوڕەکەم هاتەوە گوتی: بابە، پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: باخۆی دەربخات لای ئێمە ڕێـزی لێگیراوە! ئەگەر ئیمانیش نەهێنێ قەیناکە، منیش چەند مانگێـك لەسـەر دینـی خـۆم مامەوە، پێغەمبەریش ﷺ ئامۆژگاری هاوەڵانی کردبـوو، کـە مـۆڕە لـە (سـهیل بـن عمرو) نەکەن! هەرچەند لەسەر دینی خۆی ماوەتەوەو ڕێزی لـێدەگرین، سەرەنجام دوای چەند مانگێك مسولّمان بووم[(١)].

هەروەها (صفوان بـن أمیـة)ش دەڵـێ: ڕۆیشـت، کـە خـۆی بـخاتە دەریـاوەو خـۆی بـخنکێنێ، بەڵام (عمیـر بـن وهـب) بەدوایـدا ڕۆیـیو، گـوتی: مـن ئەمانـم بـۆ لـە موحەمـمەد خواستووی! ئەویش دەگەڕێتەوەو دوای ماوەیەك ئیمان دێنێ[(٢)].

(عکرمـة بـن أبـي جهـل)یـش بەهـەمان شـێوە سـەری خـۆی هەڵـدەگرێ، بـەڵام خێزانەکەی، کە پێش خۆی مسـولّمان دەبـێ، بەدوایـدا دەچـێو دەیهێنێتـەوەو دەچـێتە

---

١) بڕوانە: (المعازي) للواقدي، ج٢، ص(٨٤٦-٨٤٧)، و رواه الحاكم في (المستدرك).
٢) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٤، ص(٢٣٧-٢٣٨).

خزمەت پێغەمبەر ﷺو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! من بە مەرجێك مسوڵمان دەبم داوای لێبوردنم بۆ لە خوا بکەی من زۆر ئازاری ئیسلامو مسوڵمانانم داوە.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: خوایە لە هەموو شتێکی ببوورە[1]، هەرچەندە کوڕی (أبو جهل)یشە بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری مسوڵمانان دەکاتو پێیان دەڵێ: کەستان باسی (أبو جهل) نەکەن! چونکە باسکردنی مردوو زەرەر بە مردوو ناگەیەنێو دڵی زیندووش ئازار دەدا.

**دەیەم: گرنگی ئازاد کرانی مەککە :**

بەو شێوەیەی باسکرا بەبێ ڕژانی خوێنو توندو تیژییەکی وا کە شایانی باسکردن بێ، مەککە ئازاد کرا، کە پێغەمبەر بە دە هەزار جەنگاوەرەوە لە هاوەڵانی بەڕێزی، زۆر حەکیمانە لە چوار قۆڵەوە ڕۆیشتە نێو شاری مەککەوەو بەپێی بەرنامەیەکی تۆکمەو دارێژراوەوە لە ماوەکی کەمدا مەککە ئازاد کراو خەڵکێکی زۆری ئەوێش مسوڵمان بوونو ئەویش عەفووی کردن، وە پێغەمبەر بۆ ماوەی نۆزدە ڕۆژان لە مەککەدا مایەوەو لەو ماوەدا بە تێگەیاندنی خەڵکیو کارەکانی دیکەی گرنگی خۆیەوە خەریك بوو.

بەم شێوەیە مەککە، کە تا ئەوکات پایتەختو نێوەندی کافرانی قوڕەیش بوو، کەوتە بەردەستی ئیسلامو، دواتر لەوێوە توانرا ناحەزانی دیکەی دەوروپشتیش تەمبێ بکرێنو لەنێو ببرێن.

وە ئازادکرانی مەککە شوێنەواری گرنگی سیاسییو کۆمەڵایەتیی لێکەوتەوەو بەڵێنو گفتی پەروەردگاریش هاتە دی، بە جێگیر بوونو دەسەڵات پەیدا کردنو حوکمکردنی مسوڵمانانی ڕاستەقینە لە زەویدا.

---

١) (المغازي) للواقدي، ج٢، ص(٨٥١-٨٥٣).

# جەنگی حونەین و ئەوطاس و طائیف

## یەکەم: جەنگی حونەین :

یەکێك لەو جەنگانەی، کە پێغەمبەر ﷺ پێیان هەستا جەنگی حونەین بوو، ئەوەبوو کە لە (٥)ی (شوال) بەڕێ کەوتن و لە (١٠)ی (شوال)ی ساڵی (٨)ی کۆچی گەیشتنە (حنين)، کە دۆڵێکەو هۆزی (هوازن) لەوێ بوون، چونکە هۆزی (هوازن) لەگەڵ (ثقيف) بەسەرکردایەتی (مالك بن عوف) هێزیان کۆکردبۆوەو ویستیان بە سوپایەکی زۆرەوە، کە دوایی دەرکەوت دوو ئەوەندەی سوپای مسوڵمانان بوو، بەسەر مەککەدا بدەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی ئەوان بەسەر مەککەدا بدەن، فەرمانی دەرکرد، کە مسوڵمانان ئامادە بن بۆ هێرشکردنە سەریان، ژمارەی سوپای مسوڵمانان دوانزە هەزار کەس بوو، دە هەزار لەوانەی کە لە مەدینەوە لە خزمەت پێغەمبەردا هاتبوون و، دوو هەزاریش لە خەڵکی مەککە، کە تازە مسوڵمان بووبوون[1].

پێش بەرێکەوتنی، پێغەمبەر ﷺ داوای سێ هەزار (ڕم)ی لە (نوفل بن الحارث بن عبدالمطلب) کردو، داوای چەند (زرێ)یەکیشی لە (صفوان بن أمية) کرد بەئەمانەت، کە دوای شەڕەکە بیانداتەوە، چونکە ئەو دوو کەسە تا ئەوکاتیش هەر کافر بوون، (مالك بن عوف)، کە سەرکردەی سوپای دوژمن بوو خەڵکی خۆیانی هاندا بۆ شەڕو، ورەی بەبەرنان و بڕیاریشیدا ژن و منداڵ لەگەڵ لەشکرەکەیان بەرن، بۆئەوەی پیاوەکانیان لە شەڕدا شەرم بیانگرێ و هەڵنەیەن، وە سوودیشی لە

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٥١).

(درید بن الصمة) بینی لە دانانی بۆسەدا دژی مسولمانانو لەو ناوچەیەش زۆر شارەزا بوون.

سوپای بێبڕوایان پێش مسولمانان لە شیوی (حنین) خۆیان مەلاس دابوو، کە سوپای ئیسلام گەیشتە ئەوێ، لە هەموو لاوە بە خەستی تیرباران کرانو سەریان لێ شێواو زۆر زیانیان پێگەیشتو زۆربەی مسولمانان هەلاتن (عباس)ی مامی پێغەمبەر ﷺ دەلێ: کە لە سەرەتاوە مسولمانان ڕایانکرد من ڕێشمەی ئیسترەکەی پێغەمبەرم گرتبوو ئەو لە مەیدان مابۆوە، پێی گوتم: **{یا عباس إصرخْ یا معشر الأنصار! یا معشر أصحاب السَّمُرة}**، واتە: ئەی عەبباس! هاوار بکە: هۆ کۆمەلی پشتیوانان! هۆ کۆمەلی هاوەلانی درەختەکە!، منیش بەدەنگی بەهێزی خۆم بانگم کردن، سوێند بە خوا کە گوێیان لە دەنگی من بوو وەك چۆن مانگا بۆ گوێرەکەکەی خۆی سۆزی هەیەو دەگەڕێتەوە سەری، ئاوا گوتیان: (لبیك، لبیك)، واتە: لە خزمەتتین، لە خزمەتتین! دوایی پێغەمبەر ﷺ چنگە خۆلێکی بە کافران داکردو فەرمووی: **{انهزموا وربّ محمد}** رواه مسلم[1]، واتە: بە پەروەردگاری موحەممەد تێك دەشکێن!

ئنجا سوپای مسولمانان بەرگریی مەردانە دەکەنو لە مەیداندا دەمێننەوەو خوای پەروەردگاریش بەناردنی فریشتە بۆ یارمەتی دانیان لە جەنگەکەدا، ئەوەندەی دیکە مسولمانان بەهێزو کافران تووشی ترسو دلەڕاوکێ دەکات، بەو جۆرە مسولمانان سوپای کوفر تێك دەشکێننو خەلکێکی زۆریان لێ دەکوژنو خەلکێکی زۆر بەدیل دەگرنو مەڕو مالاتو چەکێکی زۆریش کە بە هەزاران مەزەندە دەکرا، بە غەنیمەت دەگرن[2]، لەوبارەوە خوای زال دەفەرموێ:

---

١) صحیح مسلم، کتاب الجهاد: ٤٥٨٨.

٢) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٤، ص(٢٥٦-٢٥٧).

www.alibapir.com


﴿ لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا وَضَاقَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ ثُمَّ وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾ التوبة، واتە: بێگومان خوا لەزۆر شوێنان ئێوەی سەرخست، وە ڕۆژی (حونەین)، کە بەزۆرییەکەتان سەرسام بوون، {چونکە یەکێك لە تازە مسوڵمانبووەکان گوتی: (لن نُغْلَب اليوم من قلة)[1]، واتە: ئەمڕۆ بەهۆی کەمییەوە تێك ناشکێین}، بەڵام زۆریەکەتان هیچ دادی نەدان...؛ کەواتە: ئێوە بەهۆی ئیمانو پارێزکارییتانەوە خوا سەریخستوون، نەك بەهۆی زۆرییتانەوە، ئنجا لە کۆتایی جەنگەکەدا پاشماوەی لەشکری شکاوی بێبڕوایان بەرەو (طائف) دەچێو هەندێکیشیان بەرەو (ئەوطاس) دەچ\\تن.

## هۆیەکانی تێشکانی مسوڵمانان لە سەرەتاوە:

١) شانازیی کردن بەزۆریی سوپای خۆیانو گێڕانەوەی سەرکەوتن بۆ خۆیان نەك بۆ خوا.

٢) لەنێو جەیشی پێغەمبەر ﷺدا خەڵکێك هەبوو، کە بێ چەك بوونو لەبەر دڵگەرمییان چوبوون بۆ جەنگەکە.

٣) ژمارەی لەشکری دوژمن دوو هێندە زۆرتر بوو لە سوپای مسوڵمانان.

٤) (مالك بن عوف) سەرکردەی کافرەکان پێش گەیشتنی سوپای مسوڵمانان چووبووە شیوی (حنین)و شوێنە گرنگەکانی گرتبوو، وە کەمینی لە مسوڵمانان دانابوو.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٢٥٤).

٥) هێندێك لە ئیمان لاوازەکان کە تازە لە مەککە مسوڵمان بووبوون، ڕایان کرد لە مەیدانو ئەمەش بوو بەهۆی تێکچوونی بارودۆخو شیرازەی سوپاکە.

## هۆیەکانی سەرکەوتنی مسوڵمانان لە کۆتایی جەنگەکەدا:

١/ مانەوەو ورەبەرزیی پێغەمبەر ﷺ لە مەیدانی جەنگدا، کە بوو بەهۆی گەڕانەوەی خەڵکە هەڵاتووەکە کە بینییان سەرکردەیان لە مەیدان دایە.

٢/ ئازایەتی پێغەمبەر ﷺ کە قارەمانانە شەڕی کردو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەچوو.

٣/ ئازایەتییو مانەوەی ئەو کۆمەڵە هاوەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا.

٤/ بەخێرایی گەڕانەوەی هەڵاتووەکان.

٥/ سوپای کوفر کەوتە هەڵەیەکی سەربازییەوە کە بەدوای مسوڵماناندا هێرشەکەیان درێژەی پێنەداو مسوڵمانان خۆیان گرتەوە.

٦/ دووعاو پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ سەرکەوتنی سوپای ئیسلام.

٧/ فڕێدانی مستەخۆڵ بەرەو ڕووی دوژمن لەلایەن پێغەمبەر ﷺ تێکچوونی شیرازەی سوپاکەیان.

٨/ دابەزینی فریشتەکان لەلایەن خواوە، بۆ یارمەتیدانی مسوڵمانان.

## دووەم: جەنگی (أوطاس):

پێغەمبەر ﷺ سوپایەك بە سەرکردایەتی (أبو عامر الأشعري) دەنێرێ بەرەو (أوطاس) بۆ سەر پاشماوەی لەشکری شکاوی جەنگی حونەین، کە لەوێ هەندێکی دیکەشیان لە بێبڕوایەکان ڕەگەڵ دەکەونو خۆ کۆدەکەنەوە لە دژی سوپای ئیسلام بە فەرماندەیەتی (درید بن الصمه)، کە پیاوێکی زۆر دنیا دیدەو شەڕ زان بووەو

تەمەنیشی زۆر بووە، سوپای مسوڵمانان بەرەو (أوطاس) دەڕۆن و لەوێ شەڕ ڕوودەدات، سەرەنجام سوپای مسوڵمانان سەردەکەوێ و سەرکردەکەی ئەوانیش دەکوژن، کە (درید بن الصمة)یە، بەڵام فەرمانددەی سوپای مسوڵمانان (أبو عامر)یش شەهید دەبێ[1].

## سێیەم: جەنگی (طائف):

پێغەمبەر ﷺ پاش گەڕانەوەی لە جەنگی (حونەین)، بە سوپایەکەوە بەرەو (طائف) دەکەوێتە ڕێ، چونکە هۆزی (ثقیف) دوای تێشکانیان لە (حونەین) گەڕابوونەوە (طائف)، وە پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەی (١٧)یان (٢٥) ڕۆژ ئابڵووقەی شارەکەیدا، وە (ابن هشام) دەڵێ[2]: بۆ یەکەمجار پێغەمبەر ﷺ سوودی لەدوو ئامێری جەنگی وەرگرت (مەنجەنیق)و (دەبابە).

**مەنجەنیق**: ئامرازێك بووە بەرد یان ئاسنی سووركراوەیان تێخستووە و پێیان فڕێداوە، لە جێگای تۆپ و هاوەنی ئەم سەردەمەی خۆمان بووە.

**دەببابە**: شتێك بووە لە تەختە دروستیان كردووە و ڕەوڕەوەیان بۆ كردووە و لەسەر ئەو ڕەوڕەوانە ڕۆیشتووە و جاری واش بوو لەسەر وڵاخ دایاننناوە، بۆئەوەی ئەو تیرو شیرو بەردو ئاسنەی كە دوژمن دەیانهاوێ كاریان تێنەكات، ڕۆڵی دەببابەو زرێپۆش (مُدَّرعة)ی ئەم سەردەمەی ئێمەی بینیوە.

كەواتە پێغەمبەر ﷺ هەوڵیداوە سوود لە نوێترین ئامڕازی جەنگی لە سەردەمی خۆیدا وەربگرێ.

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٢٥٩-٢٦١).

٢) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٢٧٤).

لە ماوەی ئەو ئابلۆوقەیەدا (١٢)کەس لە هاوەڵانی شەهید دەبن، بە تیری تیرهاوێژەکانی قەڵا، ڕووداوێکی گرنگی دیکەی جەنگی طائیف ئەوەبووە، کە کۆیلەکانی نێو قەڵاکەی شاری (طائف) دادەبەزن‌و پەیوەندیی دەکەن بە سوپای ئیسلامەوەو مسوڵمان دەبن، جا دوای ئەوەی هۆزی (ثقیف) مسوڵمان دەبن، دێنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای کۆیلەکانیان دەکەنەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{أولئك عتقاء الله}**، واتە: ئەوانە ئازادکراوانی خوان، یانی ئەو کۆیلانەتان تەسلیم ناکەمەوە، مادام لەوکاتە ناسکەدا هاتوون‌و پەنایان بۆ ئێمە هێناوە(١).

پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی حونەیندا نزیکەی (٦٠٠٠) شەش هەزار لە منداڵ‌و ئافرەت لە (هوازن) دەگرێ، بەڵام دواتر هۆزی (هوازن) دێن‌و مسوڵمان دەبن، پێغەمبەریش ﷺ سەرپشکیان دەکات لە نێوان ماڵ‌و سامانەکەیان‌و ژن‌و منداڵەکانیاندا، ئەوانیش ژن‌و منداڵەکانیان دەوێتەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمان دەکا بە هەموو سوپایەکەی، کە ژن‌و منداڵەکانیان تەسلیم بکەنەوە(٢)، وە پێغەمبەر ﷺ هەواڵ بۆ (مالك بن عوف) دەنێرێ کە ئەگەر بێ بۆلامان‌و مسوڵمان بێ، ئێمە ماڵ‌و سامان‌و خێزان‌و منداڵەکانی دەدەینەوە، (مالك بن عوف)یش کە ئەوکات لەگەڵ هۆزی (ثقیف) لەنێو شاری (طائف) دەبێ، خۆی‌و هەندێك خەڵك کە لەگەڵی بوون، دێن‌و مسوڵمان دەبن، پێغەمبەریش ﷺ ڕێزی لێ دەگرێ‌و ماڵ‌و خێزانەکەشی دەداتەوەو دەیکاتە برا گەورەش لەسەر ئەوانەی کە لە قەومەکەی مسوڵمان بوون.

(ابن القیم)(٣) دەڵێ: یەکێك لە هاوەڵان داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە دووعا لە (ثقیف) بکات، ئەو هۆزەی کە لە نێو شاری (طائف) بوون، ئەویش دەفەرموێ: **{اللّهم اهد ثقيفاً وأت بهم}**، واتە: خوایە هیدایەتی (ثقیف) بدەو بیانهێنە بۆ

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٢٧٦).
٢) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٢٧٨،٢٧٩).
٣) (زاد المعاد)، ج٣، ص(٤٩٧)، رواه أحمد في المسند، ورواه الترمذي، وصحّحه شعيب الأرناؤوط

لام، ئەو هاوەڵە داوا دەكات، كە دووعایان لێ بكات خوا لەنێویان بەرێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دووعای هیدایەتیان بۆ دەكات، وە دوایش وەك باسمان كرد، مسوڵمان بوون.

ئەوەی كە لێرە پێویستە قسەیەكی لەبارەوە بگوترێ، دوو هەڵوێستن:

## یەك: دابەشكردنی غەنیمەت لە (جەعرانە)[1]:

پێغەمبەر ﷺ دەستكەوتەكانی جەنگی (حونەین)و (أوطاس) كە بە هەزاران سەر حوشترو مەڕو ماڵاتو پارەی نەقدو زێڕو زیوو...هتد دەبێ، زۆربەی هەرەزۆری ئەو دەستكەوتانەی دابەش كرد بەسەر ناودارو سەرۆك عەشیرەتەكانی قوڕەیشو غەیری قوڕەیشدا كە تازە مسوڵمان بووبوون، لەوانە:

١) أبو سفيان بن حرب .
٢) معاوية بن أبي سفيان .
٣) حكيم بن حِزام .
٤) الحارث بن الحارث بن كلدة .
٥) الحارث بن هشام .
٦) سهيل بن عمرو .
٧) حويطب بن عبد العزى .
٨) العلاء بن جارية الثقفي .
٩) عيينة بن حصن بن حذيفة .
١٠) الأقرع بن حابس التميمي .
١١) مالك بن عوف النصري .
١٢) صفوان بن أميّة .

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢١٨-٢٨٤).

www.alibapir.com

هەرکام لەوانە یەکی سەد حوشتریان دەداتێو، هێندێکی دیکەش لە خوار ئەو ژمارەیەیان دەداتێ، ئەوانەش کە ئاوا پێغەمبەر ﷺ ماڵیان دەداتێ، ناویان لێنراوە (المؤلفة القلوب) دڵ ڕاگیراوەکان، دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەکا، هەست دەکا مقۆمقۆیەك لەنێو پشتیوانانی ئیسلامدا -خوا لێیان ڕازی بێ- دروست بووەو دەڵێن: ئێمە شمشێرەکانمان ئێستاش خوێنی ئەو کافرانەی لێدەچۆڕێ، کەچی هەرچی غەنیمەتو دەستکەوتە هەمووی درا بەوان، پێغەمبەر ﷺ کە ئەوە وەك هەواڵێك لە (سعد بن عبادة) دەبیستێ پێی دەفەرموێ: سەرجەم خەڵکەکەتم بەتەنیا بۆ کۆبکەوە، وە ڕێگا نەدرا کەسی دیکە کۆببێتەوە لەگەڵیان، بێجگە لە کەسانێکی دیاریکراو لە کۆچکەران، ئنجا دوای ئەوەی پشتیوانان هەموویان کۆدەکاتەوە، وتاریان بۆ دەداو دەفەرموێ: ئەی پشتیوانان ئەی کۆمەڵی پشتیوانان! ئەوە چییە قسەیەکم لێتانەوە بیستوە؟ ئایا ئێوە ڕێ لێونبوو نەبوون، بەهۆی منەوە خوا هیدایەتیدان؟! هەژار نەبوون خوا بەهۆی منەوە دەوڵەمەندی کردن؟! بەیەکەوە دوژمنو ناکۆك نەبوون بەهۆی منەوە خوا کردنیە برا؟!.

دەڵێن: با، هەرچاکەو منەتی خواو پێغەمبەری خواش بەسەر ئێمەوەیە، دەفەرموێ: دەی ئێوەش جوابم بدەنەوە.

دەڵێن: چیت جواب بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ هەر چاکەی خواو پێغەمبەری خوا بەسەر ئێمەوەیە!.

دەفەرموێ: نەخێر!

بەخوا ئێوەش بۆتان هەیە وەڵامم بدەنەوەو ڕاستیش دەکەن لە وەڵامەکەتاندا، ئێوەش بڵێن: ئایا تۆش دەرکراو نەبووی ئێمە پەنامان دای؟ ئەدی تۆش بە درۆ دانەنرای ئێمە بڕوامان پێهێنای؟! ئەدی ئەتۆش بێهێز نەبووی ئێمە پشتیوانیمان لێکردی؟!.

www.alibapir.com


گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە واناڵێین، بەڵکو هەر تۆ چاکەو منەتت بەسەر ئێمەوە هەیە.

دوایی دەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئایا شتێکتان لەدڵدا پەیدابوو بۆ تۆزە ماڵێکی دونیایی[١]، کە دڵی هەندێك کەسم پێ ڕاگرت بۆئەوەی بێنە نێو ئیسلامەوە، وە ئێوەم حەواڵەی ئیسلامەتییەکەتان کرد؟! ئەی کۆمەڵی پشتیوانان! ئایا ڕازی نابن خەڵك حوشترو مەڕو بزن لەگەڵ خۆی بەرێتەوە، ئێوەش پێغەمبەری خوا لەگەڵ خۆتاندا بەرنەوە بۆ هەوارگەی خۆتان؟! سوێند بەوەی کە نەفسی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر کۆچ کردن نەبووایە (منیش کۆچم کردوەو پلەیەکی گەورەشە) من خۆم بە یەکێك لە پشتیوانان لەقەڵەم دەدا! وە سوێند بەخوا ئەگەر خەڵك بە ڕێیەکدا بڕواو پشتیوانانیش بە ڕێیەکدا بڕۆن من بەڕێی پشتیواناندا دەڕۆم، خوایە بەزەییت بە پشتیواناندا بێ، وە بە ڕۆڵەکانی پشتیوانان، وە ڕۆڵەی ڕۆڵەکانی پشتیوانانیشدا!

ئنجا کە پێغەمبەر ﷺ ئەو قسانەیان بۆ دەکات هەموویان دەگرین تا ڕیشیان لە فرمێسکدا تەڕ دەبێ، دوایی دەڵێن: ئێمە ڕازین کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەش‌و قسمەتی ئێمە بێ[٢].

لەم ڕووداوەشەوە ئەو حیکمەتە فێردەبین، کە پێویستە هەمیشە تەقدیری هەست‌و نەستی خەڵکی بکەین‌و هەرکات پێویستیشی کرد بەخێرایی ئەو شتانەی دەبنە مایەی ئیشکال‌و دوودڵیی ڕوونیان بکەینەوەو، فەلسەفەو حیکمەتەکەیان دەربخەین، بەرلەوەی ببنە مایەی دروستبوونی گرێکوێرەو نیگەرانیی لەدڵ‌و دەروونیاندا.

---

١) ئەو فەرموویەتی: (لُعاعةٌ من الدنيا)، واتە: ئەو گیا سەوزەی، کە بە باران سەردەردێنێ‌و دوایی وشك دەبێ.

٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٢٨٥-٢٨٦)، وە (صحيح البخاري): ٣٧٧٩ و ٣٧٧٨.

**دوو: هەڵوێستی یەکێك لە پشتیوانان لە دابەشکردنی غەنیمەتدا:**

هەڵوێستی دووەم ئەوەیە، کە (بخاري)و (مسلم)[1] لە (أبو وائل) ئەویش لە عبدالله)ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ ئەو دەستکەوتانەی ئاوا دابەش کردن، کابرایەك گوتی: سوێند بەخوا ئەم دابەشکردنە دادگەریی تێدا ڕەچاو نەکراوەو ڕەزامەندیی خواشی پێ مەبەست نەبووە، (مەبەستی ئەوەبووە کە پێغەمبەر ﷺ خزمایەتی یان بەرژەوەندییەکی دونیایی دوور لە دینی بەکارهێناوە!!).

پێغەمبەر ﷺ دەمو چاوی موبارەکی گۆڕاو ڕووی گرژ بوو، دوایی فەرمووی: **{فمن يعدل ان لم يعدل الله ورسوله؟}**، واتە: کێ دادگەر دەبێ، ئەگەر خواو پێغەمبەری خوا دادگەر نەبن؟ دوایی فەرمووی: **{يرحم الله موسى قد أوذي بأكثر من هذا فصبر}**، واتە: خوا بەزەیی بە مووسادا بێتەوە، کە بە زیاتر لەوەش ئازار درا، بەڵام خۆڕاگر بوو.

لەمەشەوە وەردەگیرێ، کە هەمیشە کەسانی دڵنەخۆش و بیرکورت و کەللە وشك هەردەبن و پێویستە بابای بەرپرس وێڕای گوێنەدان بە منگەمنگ و توانج و پلاری بێجێ، هەتا دەشتوانێ سینگ فراوان و لێبوردە بێت.

دوایی پێغەمبەر ﷺ، کە لە (جعرانة) غەنیمەتەکەی دابەشکرد، بە نیازی (عومرە) بەرەو (مەککە) بەڕێکەوت و دوای بەجێهێنانی عومرە (عَتَّاب بن أُسَيْد)ی کردە برا گەورە لە مەککەو (معاذ بن جبل)یشی بۆ شارەزاکردنی خەڵکی لە دین لەگەڵ ئەودا بەجێهێشت، ئنجا عومرەکەی لە (ذي القعدة)دا بەجێهێناو هەر لەو مانگەشدا گەڕایەوە بۆ مەدینە[2].

---

١) (صحيح البخاري): ٣١٥٠، وە: (صحيح مسلم): ٢٤٤٤.
٢) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٨٦).

# جــەنگــی تەبـــووك

بەڕێــزان!

خوا پشتیوان بێ لەچەند خاڵێکدا بەکورتی باسی جەنگی (تەبووك) دەکەین[1]:

**یەکــەم:** جەنگی تەبووك لە مانگی (رجب)ی ساڵی (٩) نۆیەمی کۆچییدا ڕوویداوە، ئەویش دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێگەیشت کە ڕۆمەکان خەریکی کۆکردنەوەی سوپان لەدژی مسوڵمانانو دەیانەوێ بەسەریاندا بدەن، فەرمانی بە مسوڵمانان کرد کە خۆیان ساز بکەنو سوپا ڕێکخەن، وەك عادەتی هەمیشەیی پێغەمبەر ﷺ هەر کە زانیویەتی دوژمنان خەریکی خۆڕێکخستنو کۆکردنەوەی سوپان، بۆ ئەوەی بەسەر مسوڵماناندا بدەن، ئەو سوپای ئامادە کردوەو هێرشی کردۆتە سەر دوژمن، بۆئەوەی ئابلووقە نەدرێو نەخرێتە هەڵوێستی بەرگرییکردنەوە، وەك گوتراوە: هێرشبردن باشترین ئامڕازی بەرگریی کردنە، دیارە ئەوە یەکەم جار بوو کە پێغەمبەر ﷺ بە سوپایەکەوە بەرەو ڕۆم بچێت، وە جەنگی تەبووك لە وەرزی هاویندا بووە، هاوینی نیوە دوورگەی عەرەب کە زۆر گەرمە، مسوڵمانانیش هەژارو کەم دەرامەت بوونو ڕێگاکەش زۆر دوور بووە، میوە تازە پێگەیشتبوو، چاوەڕوانی ئەوەشیان دەکرد کە ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیان شەڕو کوشتارێکی زۆری تێدا ڕووبدات، هەربۆیە مسوڵمانان ڕۆیشتنیان بۆ ئەو جەنگە زۆر لەسەر دڵ قورسو بەزەحمەت بوو.

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٩٢-٣٠٨)، کە بەدرێژیی باسی ڕووداوەکانی جەنگی تەبووکی کردوە.

www.alibapir.com


بۆیەش خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التوبة)دا ناوی لەو ڕووداوە ناوە: کاتی سەغڵەتیی (ساعة العسرة) وەك دەفەرموێ: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا خۆش بوو لە پێغەمبەر ﷺو لە کۆچکەرانو پشتیوانانو ئەوانەی کە دوای پێغەمبەر ﷺ کەوتبوون لەکاتی سەغڵەتییدا...

کەواتە: مەبەست لە (ساعة العسرة) تەنیا سەعاتێکی دیاری کراو نیە، بەڵکو مەبەست پێی کاتی سەغڵەتییو نارەحەتییە، ئنجا خوای کاربەجێ هەر دوا بەدوای ئەو ئایەتانە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ... ﴿١٢٠﴾ ﴾التوبة، واتە: خەڵکی مەدینەو خێڵەکییەکانی دەوروبەری مەدینە، بۆیان نیە خۆیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێبێڵن وە خۆیان لەو خۆشتر بوێ، یانی: لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئامادەیە فیداکاریی بکا لەپێناوی دینی خوادا، دەبێ ئێوەش چاو لەو بکەنو ڕێی ئەو بگرن، نەك ئەو بچێ بۆ جەنگو جیهادو ئێوەش خۆتان بگێڕنەوەو نەچن!.

**دووەم:** پێغەمبەر ﷺ بۆ یەکەمین جار لە مێژووی سیاسیو سەربازیی خۆیدا، ناوی ئەو شوێنەی هێناوە کە بۆی دەچێو فەرموویەتی: ئێمە بەرەو ڕۆم دەچین[1]، چونکە پێشتر پێغەمبەر ﷺ کە ویستبای بەرەو ئاراستەیەك بڕوا بەشێوەیەك خەڵکی حاڵی دەکرد، کەوا بزانن بەپێچەوانەی ئەو ئاراستەیە دەڕوا، بۆ وێنە: ئەگەر ویستبای بەرەو باکوور (شمال) بڕوا، دەستەیەك لە هاوەڵانی بەڕێزی دەنارد

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٢٩٢).

www.alibapir.com


بۆ باشوورو دەیفەرموو ئێوە لای خواروومم بۆ بپشکنن، بۆیە خەڵکیش وایاندەزانی پێغەمبەر ﷺ بەرەو باشوور دەڕوات، بەڵام سەرەنجام بەرەو باکوور (شمال) دەڕۆیشت، ئەوەش بۆ ئەوە بوو کە کتو پڕ بەسەر دوژمندا بدات‌و، دەرفەت نەداتە دوژمن کە زانیاری لەسەر جم‌و جۆڵیان هەبێ، کە ئەمە لەڕووی سەربازییەوە گرنگترین هۆکاری سەرکەوتنە لە جەنگدا.

**سێیەم:** پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی تەبووکدا قەیران‌و گرفتی هەرەگەورەی بریتی بووە لە نەداریی‌و بێدەرامەتیی، بۆیە فەرمانی کردوە بە مسوڵمانان، کە ئەو سوپایە چەکدار بکەن بە سامانی خۆبەخشانە، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر هانی داون، کە پارەو سامانیان پێشکەش بکەن بۆ ئەو جەنگەو ئەوانیش دریغییان نەکردوە لەوبارەوە، بۆ وێنە (عثمان بن العفان) -خوا لێی ڕازی بێ- هەزار دیناری زێڕی بەخشی[1] لەگەڵ سێ سەد حوشتر بە هەموو کەل‌وپەلی پێویستییانەوە، بۆئەوەی پێغەمبەر ﷺ بتوانێ ئەو سوپایەی پێ چەکدار بکا، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە بەرانبەر ئەو هەڵوێستەی (عثمان)دا فەرموویەتی: **{ما ضَرَّ ابنَ عفان ما عَمِلَ بعد اليوم}**[2]، واتە: کوڕی عەففان لەمەودوا هەر شتێك بکات، زەرەری لێنادا، یانی: ئەگەر لەمەودوا هەڵەو کەم‌وکوڕییەکیش بکات، هیچ زیانی لێنادا، چونکە لە کاتێکی زۆر ناسکدا بەتەنگ دینی خواوە هاتوە، ئەوەش دوور بینی پێغەمبەر بووەو خوای زانا حاڵی کردوە کە کاتێك دێ خەڵکێکی مسوڵمان لە (عثمان) دەکەونە دژایەتی‌و بیانووگرتن‌و کەمێکی بە هەق‌و زۆریشی بە ناهەق، ئەوەبوو کە لەسەردەمی خیلافەتی خۆیدا گێچەڵیان پێگێڕاوەو سەرەنجام شەهیدیشیان کردوە.

---

١) ئەو سەردەمە دوو جۆرە دراو هەبووە، دیناری زێڕ، کە هی ڕۆمەکان بووەو، درهەمی زیویش، کە هی فارسەکان بووە.
٢) رواه أحمد .

www.alibapir.com

سەبارەت بە بەخشینی ماڵ بۆ غەزای تەبووك (أبو داود)[1] دەڵێ: (عمر) من هەموو جارێ پێشبڕکەم دەکرد، لەگەڵ (أبو بکر)دا کە ئەو کردەوەیەکی باشی دەکرد، هەوڵم دەدا وەکو وی بکەم یان پێشی بکەومەوە، بەڵام هەمیشە ئەو لەپێش منەوە بوو، کە جەنگی تەبووك هاتە پێش‌و پێغەمبەر ﷺ زۆر هانیداین، کە ماڵی خۆمان ببەخشین، گوتم ئەمڕۆ دەرفەتەو دەبێ پێش (أبو بکر) بکەومەوە، بۆیە ماڵەکەم کردە دووبەش بەشێکم لە ماڵێ بەجێهێشت‌و بەشەکەی دیکەشم لەگەڵ خۆمدا بردە خزمەت پێغەمبەر ﷺ‌و لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر ئەمڕۆ پێش (أبو بکر) نەکەومەوە قەت پێشی ناکەومەوە، بۆیە نیوەی ماڵەکەم برد کە چووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ها (عمر) چیت بۆ ماڵێ بەجێهێشتوە؟

منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ماڵەکەم کردۆتە دووبەش، بەشێکم لەلای ماڵ‌و خێزانم بەجێهێشتوە، بەشەکەی دیشم لەگەڵ خۆمدا هێناوە بۆ ئیسلام‌و بۆ ئامادەکردنی ئەو سوپایە.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەوەی کە بەخشیوتە خوا لێت قبووڵ بکات‌و ئەوەی کە ماویشە خوا بەرەکەتی تێبخات.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە (أبو بکر)و فەرمووی: (أبو بکر) ئەی تۆ چیت کردوە؟!

ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من هەرچی هەمبوو هێناومەو ماڵ‌و خێزانیشم بەتەما خوا بەجێ هێشتوون! پێغەمبەریش ﷺ دووعای خێری بۆ کرد، منیش گوتم: سوێند بەخوا لەمەودوا قەت پێشبڕکەت لەگەڵدا ناکەمەوە! خوا لەهەموو لایەکیان ڕازی بێ.

هەروەها (عبد الرّحمن بن عوف) دوو هەزار درهەمی زیوی بەخشیوە، کە نیوەی ماڵ‌و سامانەکەی بووە، وە لەوانەی کە زۆر ماڵی خۆیان بەخشیوە: (عباس بن

---

[1] سنن أبي داود: ١٦٧٨.

www.alibapir.com


عبدالمطلب، طلحة بن عُبَیْدالله، سعد بن عبادة، محمد بن مسلمة، عاصم بن عدي)[١] بەو شێوەیە هەرکەسە بەپێی خۆی زۆر یان کەم، هی وایان هەبووە بە پارەی نەغدینە بەشداری کردوە، هی واشیان هەبووە حوشتر، یاخود ئەسپی بردوە بۆ پێکهێنانو ئامادەکردنی ئەو سوپایە، وە زۆر لە ئافرەتان بە بەخشینی خڕخاڵو ئەنگوستیلەو بازن بەشدارییان کردوە بۆ ئامادەکردنو سازدانی ئەو سوپایە.

سوپای پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ڕۆشتنیاندا بۆ تەبوك، لەڕێگا زۆر تووشی برسیەتیو تینوێتیو نارەحەتیی بوون، تا وایان لێهات داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، کە ڕێیان بدات هێندێك لە حوشترەکانیان سەرببڕن، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێی دان (عمر بن الخطاب) چووە لای پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: ئەگەر بێتو حوشترەکان سەرببڕین ولآخی سوارییو بارمان نامێنێو سوپاکەمان زیاتر تووشی گرفت دەبێو پێشنیاری کرد لەبری ئەوە ئەو خواردنەی پێیانە کۆی بکەنەوەو پێغەمبەر ﷺ دووعای بەرەکەتی لەسەر بخوێنێ، ئەویش قسەی (عمر)ی پەسند کردو دووعای لەسەر خواردنەکەیان خوێندو بەشێوەیەك زیادی کردو بەرەکەتی کەوتێ، کە هەموو سوپایەکە لە خواردن تێربوون.

**چوارەم:** هەڵوێستی دەغەڵو دووڕووەکانیش بەو شێوەیە بوو کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التوبة)دا باسیان دەکاتو لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە بەجێهێڵرابوون دڵخۆشبوون بەوەی، کە لەپاش پێغەمبەر بەجێماون، وە پێیان

١) (المغازي) للواقدي، ج٣، ص(٣٩١).

ناخۆش بوو لەڕێی خوادا بەماڵو گیانی خۆیان جیهاد بکەن، وە بە خەڵکیشیان گوت: بەو گەرمایە مەچوون، (بۆ جەنگو جیهاد)، پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ گەرمترە ئەگەر شارەزاییان هەبێ، با کەمێك پێبکەنن (لە دونیادا) وە زۆریش بگرین (لە دوارۆژدا)، بەهۆی ئەو کردەوە خراپانەی کە دەیانکرد.

لە زۆر ئایەتی دیکەش لە سوورەتی (التوبة)دا خوای زاناو شارەزا باسی هەڵوێستی ئەو دەغەڵو مونافیقانە دەکات، لە جەنگی تەبووکدا.

بۆ وێنە: هەڵوێستی یەکێك لەو دەغەڵانە باس دەکات کە ناوی (الجَدّ بن قیس) بوو لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ پێی دەڵێ: ئەی (جَدّ)! ئێمە دەمانەوێ بەرەو جەنگی ڕۆمەکان بچین، ئایا خۆت ئامادە کردوە؟! ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! لێم گەڕێ با نەیەم، چونکە قەومەکەی من دەزانن کە کەس ئەوەندەی من سەرسام نابێ بە ئافرەتان، دەترسێم کە ئافرەتی ڕۆمەکان ببینمو سەبرم نەمێنێو تووشی گوناهێ ببم! پێغەمبەریش ﷺ لێی گەڕا، جا لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾ التوبة، واتە: هەیانە (یانی لە دەغەڵو دوو ڕووەکان) دەڵێ ڕێگام بدەو بانەیەمو تووشی گوناهم مەکە (کە تەماشای ئافرتان بکەم) ئاگادار بن (ئەوانە) لە گوناهدا ڕۆچوون (بەوەی کە ناچن بۆ جیهاد) وە دۆزەخیش دەوری کافرانی داوە، یانی: بەوە کە خۆیان بەجێدێڵن گەورەترین گوناهو تاوانیان ئەنجام داوە.

هەروەها دواتر خەڵکێکی دیکە چوونە لای پێغەمبەر ﷺو هێندێك بڕوبیانووی نابەجێیان هێنایەوە کە نەچن بۆ جیهادو بەشداریی لەو غەزایەدا نەکەن، ئەویش ڕێی دان، خوای پەروەردگاریش لۆمەی پێغەمبەر ﷺی کردو فەرمووی: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾ التوبة، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوا لێت ببوورێ،

بۆ مۆڵەتت دان، مۆڵەتت نەدابان، تاکو بۆت دەرکەوێ کێ ڕاست دەکا عوزری هەیە، وە کێش درۆزنە (وە هیچ عوزری نیەو بە درۆ بڕووبیانوو دەگرێو خۆی بەجێدێڵێ لە جیهادێ).

بەو شێوەیە خوای بەرزو مەزن هەڵوێستی مونافیقەکان لەپێش‌و لەکاتی جەنگی تەبووکدا دەخاتە ڕوو، کە داوای مۆڵەتیان دەکردو خۆیان دوا دەخستو دەیانویست بەشداریی لە جەنگەکەدا نەکەن، یەکێك لەوانە (عبدالله بن أبيّ بن سلول) بوو، کە خوای تاك‌وپاك دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٤٢﴾﴾ التوبة، واتە: ئەگەر دەستکەوتێکی نزیك‌و سەفەرێکی کورت بایە بەدوات دەکەوتن، بەڵام کاتو ماوەکەی زۆرە، وە سوێندیش بەخوا دەخۆن (دەڵێن) ئەگەر توانیبامان لەگەڵت دەهاتینەدەر (بۆ جیهاد)، ئەوانە خۆیان دەفەوتێنن، وە خواش دەزانێ، کە ئەوانە درۆزنن.

ئنجا خوای بەخشندە بەگشتی باسیان دەکات، کە کێ لەو کاتانەدا خۆی بەجێدێڵێ، جا چ لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ چ هەرکاتێکی دی، کە مسوڵمانان دەکەونە جیهادو تەنگانەوەو دینی ئیسلام پێویستی بە فیداکاریی هەیە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾﴾ التوبة، واتە: بێگومان هەر ئەوانە مۆڵەت لەتۆ وەردەگرن (کە نەیەن‌و بەشداریی جەنگ‌و جیهاد نەکەن)، کە ئیمانیان بە خواو بەڕۆژی دوایی نیە، وە دڵیان لەگوماندایەو لە گومانی خۆیاندا دەخولێنەوە.

www.alibapir.com

ئنجا دەغەڵەکان بەوەندەش وازیان نەهێنا بەڵکو پڕوپاگەندەشیان بڵاوکردەوە دژی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانانو، بە مسوڵمانانیان دەگوت: ئایا ئێوە پێتان وایە جەنگی ڕۆمەکان وەکو جەنگی (عەرەب)انە کە لەگەڵ یەکدیدا دەیکەن؟! سوێند بەخوا ئێمە دوایی هەمووتان بەدیلی دەبینینەوە[1]، بەو شێوەیە پڕوپاگەندەو قسەی دڵ ساردکەرەوەیان بڵاودەکردەوە، بۆئەوەی مسوڵمانان بترسێننو دوودڵییان بکەوێتە نێو، بەڵام بە ئاواتی خۆیان نەگەیشتنو ئیمانی مسوڵمانان بەهێزتر بوو لە درۆو فڕوفێڵو پڕوپاگەندەی ئەوان.

**پێنجەم:** وەك باسمان کرد مسوڵمانان هەژارونەدار بوونو بۆ سازدانی سوپاو ئامادەکردنیشی پێویست بوو مسوڵمانان هاوکارییان کردبایە بەپارەوماڵو سامانیان، هەرکەسە بەپێی توانای خۆی، وە شوێنی غەزایەکەش دوور بوو، بۆیە هێندێك لەو مسوڵمانانەی توانای ئەوەیان نەبوو وڵاخی سواری پەیدا بکەن، مسوڵمانی وا هەبوو تەنانەت (شمشێر) یان هەرجۆرە سیلاحێکی دیکەشی نەبوو، کە بتوانێ بەشداریی ئەو جەنگە بکات، بۆیە زۆر خەفەتبارو دڵتەنگ بوون کە ناتوانن بەشدار بن، خوای بێوێنە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ التوبة، واتە: بێگومان ئەوانەی کە جەستەیان لاوازەو توانای شەڕکردنیان نیە (وەك کوێرو شەلو پەککەوتە) یان نەخۆشن، وە ئەوانەی کە توانای ماڵییان نیە، کەلوپەلی جەنگو جیهادی پێ ساز بکەن، ئەوانە هیچیان سەغڵەت ناکرێن (وە هیچیان گوناهیان

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٩٩).

ناگاتێ کە بەشدار نیـن)، بەمەرجێك دڵسۆز بن[١] بۆ خواو بۆ پێغەمبـەری خـوا، وە کەسانێك چاکەکار بن، وە عـوزریان هەبێ، ئەوانە هیچ ڕێی گلەیی لێکردنیان نیـە، وە خوا لێبوردەی بەبەزەیی یە، وە ئەوانـەش کـە دێـن بـۆلات بۆئـەوەی کـە سـواری وڵاخێکیان بکەی (بۆیان پەیدا بکەی) وە تۆ پێت گوتن، وڵاخـێکم نیـە کـە ئێـوەی سوار بکەم، پشت هەڵدەکـەنو دەڕۆن وە چـاویان بەخـوڕ فرمێسـکی لـێ دەڕژێـن، وە دڵتەنگن بەوەی کە توانایان نیـە بۆئـەوەی، کـە بێـنو بەشـداریی ئـەو جـەنگو جیهادە بکەن، بەهەمـان شێوە گلەییان لەسەر نیە.

سەرەنجام پێغەمبەر ﷺ خۆیو سـی (٣٠) هـەزار جـەنگاوەر بەرێکـەوت بـەرەو تەبوك، وە (محمد بن مسلمة) کە یەکێکە لە پشتیوانان، وەکو بـەرپرس بەجێـدێڵێ لەسـەر مـەدینـە، هـەروەها (علـي بـن أبـي طالـب) لەسـەر مـاڵو خێزانـەکانی بەجێدێڵێ، بۆ سەرپەرشتیکردنو چاودێریی کردنیان.

(ابن هشام) دەڵێ: دوایی هێندێك لە مونافیقەکان بڵاویانکردەوە کە (علي) خۆی دواخسـتوەو نـەیویراوە بـڕوا بـۆ جیهـاد، بۆیـە (علـي) -ڕەزای خـوای لێبـێ- سیلاحەکەی هەڵگرتو خۆی گەیاندە لەشکری پێغەمبەر ﷺ کە نزیکەی (٣) میل لە مەدینە دوورکەوتبوونەوەو پێی گوت، کە مونافیقەکان وایانگوتوە، بۆیە دەیەوێ بەشداریی ئەو غەزایە بکات، پێغەمبەر ﷺیش پێـی فـەرموو: ئـەوان درۆ دەکـەن بـەڵکو مـن جـێم هێشـتووی، کـە سەرپەرشـتی ماڵـەکانم بکـەی، بگـەڕێوەو گـوێ مەدەیە، ئایا ڕازی نی بەوەی تۆ بۆمن لەجێی هـاڕوون بی بـۆ مووسـا، بـەڵام هـیچ پێغەمبەرنیـن لەدوای من؟ **{ألا ترضى ان تكون مِنِّي بمنزلةِ هارون من موسى إلاّ انه ليس نبيٌّ بعدي؟}** رواه البخاري[٢].

١) لێرەدا (نصح) بەمانای دڵسۆزییە، نەك ئامۆژگاریی‌و (موعظة) یانی ئامۆژگاریی.
٢) صحيح البخاري: ٤٤١٦، وە (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٩٤-٢٩٥).

پێغەمبەر ﷺ لە گەڕانەوەیاندا لە غەزای تەبووك، بە هاوەڵانی دەفەرمویێ: هەر دۆڵو شیوێکمان بڕیبیێ، هەر زەحمەتێکمان کێشابیێو، هەر پاداشتێك، کە بۆمان نووسرابیێ، بەهەمان شێوەو ئەندازەش بۆ ئەوانە نووسراوە، کە لە مەدینەدا بەجێمان هێشتوون، ئەوانەی، کە عوزرو پەرچێك لەڕێیاندا هەبووەو نەیانتوانیوە بەشداریی بکەن[1].

کەواتە: ئیماندار لەبەر هەر هۆیەکی شەرعیی نەیتوانی بەشداریی لە کارێکی چاكو خێردا بکاتو بەدڵ ئاواتی دەخواست، کە بۆی کرابـاو بەشداربوایە، ئەوە بەپێی نیەتو ویستی خۆی، پاداشتو خێری بۆ دەنووسریێو لەوکارەدا بەشدارە.

**شەشەم:** هێندێك لە هاوەڵانی لە غەزاکە بەجیێدەمێنن، کە ئەوانیش جۆراو جۆرن، جۆرێکیان دەغەڵەکانن، کە لە مەدینە خۆیان بەجیێهێشت، بەبیانووی بێهێزی جۆراوجۆرو درۆکردنو خۆدزینەوە، هەر بۆئەوەی بەشداریی لە جەنگدا نەکەنو سەرکەوتنو پێشکەوتنی ئیسلامیان پیێ ناخۆش بوو، لەوانە (عبدالله بن أبيّ)، بەڵام ئەوانی دیکە دوو جۆرن: جۆرێکیان بیێ عوزر خۆیان بەجیێهێشتوە، کە ئەمانەن:

١) كعب بن مالك.
٢) مرارة بن الربيع.
٣) هلال بن أمية.

کە دوایی باسی بەسەرهاتەکەیان دەکەین.

---

١) صحيح البخاري: ٢٨٣٩، وە: (صحيح مسلم): ٤٩٠٩.

جۆرێکی دیکەشیان، کە لە خۆئامادەکردنێدا بەدوادەکەون‌و بەجێ‌دەمێنن، بەڵام لەدواییدا دەگەنەوە سوپای مسوڵمانان کە (ابن هشام[1]) لەوبارەوە باسی سێ کەسانی کردوە:

١/ أبو خيثمة.
٢/ عمير بن وهب .
٣/ أبو ذر الغفاري .

دەربارەی (أبو خيثمة) دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ غەزای تەبووك بەڕێکەوت، (أبو خيثمة) بەجێما، ڕۆژێکیان (أبو خيثمة) ڕۆیشتەوە ماڵێ، ڕۆژێکی گەرما بوو، هەردوو ژنەکەی هەریەك لە ساباتی خۆیدا خۆی ڕازاندبۆوەو بۆ فێنکبوونەوە بن ساباتیان ڕشاندبوو، خواردنی باشیان بۆ ئامادە کردبوو، کە گەیشتەوە ماڵێ سەیری دوو ژنەکانی کرد، کە چۆن بن کەپریان فێنك کردۆتەوەو خواردنی باشیان ئامادەکردوە، گوتی: چۆن دەبێ پێغەمبەر ﷺ لە ماندووبوون‌و گەرمادابێ‌و منیش لە ئیسراحەت‌و خۆشیدا بم‌و لەنێو ژنی جوان‌و ئاوی ساردو سێبەرو فێنکایەتیدا ژیان بەسەربەرم؟ گوتی: سوێند بە خوا نایەمە ژێر سێبەری کەپری هیچتانەوە، تا خۆم نەگەیەنمە پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە پێی گوتن: شتی ڕێگام بۆ بپێچنەوە، بۆیان پێچایەوەو بەڕێکەوت لەڕێگا تووشی (عُمَير بن وهب الجمحي) بوو، کە ئەویش دەیویست خۆی بگەیەنێتە پێغەمبەر ﷺ، دوایی (أبو خيثمة) پەلەی بوو بگاتە پێغەمبەر ﷺو لەو جیابۆوەو بەپەلە ڕۆیشت تا لێیان نزیکبۆوە لە تەبووك، هێندێك لە هاوەڵانی بە پێغەمبەریان گوت: لە دوورەوە یەکێك دیارەو بەرەو ئێرە دێ، ئەویش فەرمووی: (كن أبا خيثمة) یانی: (أبو خيثمة)بە، دوای ئەوەی کە نزیك دەبێتەوە دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا (أبو خيثمة)یە، دوایی (عمير)یش بەهەمان شێوە دەگاتە پێغەمبەر ﷺو

---

١) (السيرة النبوية...)، ج٤، ص(٢٩٥-٢٩٦، وە ٢٩٨).

مسولّمانان، بەلاّم (أبـو ذر) ولاّخەکـەی زۆر لـەڕولاواز دەبـیّو ناتوانـیّ بـڕوا، بۆیـە بەجێدەمێنیّ، هاوەلاّن بە پێغەمبـەریان گـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا فـلاّن کـەس بەجێما، ئەویش فەرمووی: لێیگەڕێن ئەگـەر خێرێکـی پێـوە بـیّ دەمانگاتـەوە، وە ئەگەر خێریشی پێوە نەبیّ، سوپاس بۆ خوا کە لەیەخـەمان بـۆوە، (أبـو ذر) دەڵـیّ: ولاّخەکەم زۆر لەڕولاواز بوو نەدەڕۆیی، بۆیە وردەوردە لـە سـوپا بـەجێمام، دوایـی زەخیـرەو کەلوپەلـەکانم لەسـەر پشـتی ولاّخەکـەم هێنانـە خـواریّو، بـۆ خـۆم هەلّمگرتنو بەپیّ ڕۆیشتم تا گەیشتمە سـوپا، کاتێـك کـە پێغەمبـەر ﷺ ئـەوەی بیسـت فـەرمووی: خـوا بـەزەیی بـە (أبـو ذر)دا بێتـەوە بەتـەنیّ دەڕواو، بەتـەنیّ دەمـریّو، بەتـەنێش زیندوودەبێتـەوە **{رحـم الله أبـا ذرٍ، يـمشـي وحـده، ويـموت وحْـدَهُ، ويُبْعَـثُ وحْـدَهُ[1]}**.

<u>**حـەوتەم:**</u> پێغەمبـەر ﷺ بەشـوێنی گـەلی (ثـمود)دا تێدەپـەڕیّ، کـە پێـی دەگـوتریّ (الـحجر)، وە ئەو شوێنەوارەی قەومـی (ثـمود) دەکەوێتە نێـوان شـامو حیجـازەوە، پێغەمبـەر ﷺ ئامۆژگـاریی هـاوەلاّنی کـردو فـەرمووی: **{لا تـدخلوا مسـاكن الّـذين ظلموا أنفسـهم إلا أن تكونـوا باكيـن حـذراً أن يصـيبكم مثـل مـا أصـابهم}** رواه البخاري[2]، واتە: بە شـوێنەواری ئەوانـەدا مـەڕۆن، کـە سـتەمیان لەخۆیان کردوە، ئەگەر هەر ڕۆیشتیشن بەگریانەوە بڕۆن، بۆئـەوەی ئـەو بەلاّیـە کـە تووشی ئەوان بووە (کە خوا لێیان تووڕە بووە) تووشی ئێوەش نەبیّ، هەر لەوبارەوە (بـخاري)[3] لە هاوەلاّنی بەڕێز دەگێڕێتەوە، کە گوتوویانە: ئێمە لە بیـری (ثـمود) ئاومـان هـەلّێنجابوو، هەویریشـمان پـیّ شـێلابوو وە گۆشتیشـمان پـیّ لێنـابوو، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئـەو گۆشـتە بڕێـژن، وە هەویرەکـەش بـدەن بـە

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٢٩٨).
٢) صحيح البخاري: ٣٣٨١.
٣) صحيح البخاري: ٣٣٧٩.

www.alibapir.com


حوشترەکانو ئاوەکەش برێژن، چونکە ئەو بیرە هی قەومێکە، کە خوا لەعنەتی لێکردوون، وە فەرمانی پێکردین کە بچین ئاو لەبیری حوشترەکە هەڵێنجین (ئەو حوشترەی کە خوای پەروەردگار وەکو موعجیزەیەك لە شاخێکی گەورە بۆ (صالح)ی هێنایەدەرو فەرمووی: لەو بیرە ئاو هەڵێنجن).

**هەشتەم:** پێغەمبەر ﷺ دەگاتە تەبووك، بەڵام رۆمەکان جورئەتی رووبەڕووبوونەوەیان نابێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، بۆیە دەکشێنەوەو خۆیان لە رووبەڕووبوونەوە لادەدەن، دوایی پێغەمبەر ﷺ لەوێ لەگەڵ هێندێك لەوانەی کە جۆرێك لە پادشایەتییو دەسەڵاتیان هەبووە، کۆمەڵێك ڕێککەوتننامە مۆر دەکات، کە هەموویان سەرانە بدەن بە دەوڵەتی ئیسلامیی، وە هاوپەیمان بن لەگەڵ مسوڵماناندا، یەکێك لەوانە خاوەنی (أيلة) بوو، کە نیمچە دەوڵەتێك بووەو ناوی (يُحَنّة بن رؤبة) بووە، لەوبارەوە (ابن هشام)[1] دەڵێ: ئەو پیاوە ڕێککەوتننامەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا کردو بڕیار درا (جزية) بدەن بە دەوڵەتی ئیسلامییو ئەوانیش لە شوێنی خۆیاندا پارێزراو دەبن، کە بێگومان ئەوانیش دەبێ لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا دۆست بنو، پەنای هیچ کەسێك نەدەن، کە دژی دەوڵەتی ئیسلامیی بێ.

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٢٩٩)، کە دەقی (ڕێکەوتننامە)کەشی هێناوە.

www.alibapir.com


**نۆیەم:** ئنجا پێغەمبەر ﷺ (خالد بن الوليد)ی بە هێزێکەوە نارد بۆ (دومة الجندل)و توانی (أكيدر بن عبد الملك الكندي)، کە پاشای (دومة الجندل) بووە بە دیل بگرێ، لەکاتێکدا لە ڕاووشکار بووە، وە هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش ڕێککەوتننامەیەکی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ مۆرکرد، کە سەرانە بدات[1].

هەروەها لەگەڵ خەڵکی هەر یەك لە (جرباء)و (أذرح)و (مقنا)، کە کیانی سیاسی بچووك بچووك بوون، ڕێککەوتن نامە مۆر دەکا، کە ساڵانە سەرانە بدەن‌و ملکەچی دەوڵەتی ئیسلامیی بن، کە هەموویان عەرەبی نەصرانیی بوون[2]، وە هەموو ئەوانە دەکەونە نێوان سنووری دەوڵەتی ئیسلامیی‌و ڕۆمەکان، بۆئەوەی ئیسلام لەو سنوورانە بێخەم بێ‌و، هەرکاتێك ڕۆم بیەوێ لەشکرکێشی بکا، ئەوانە ڕێگای لێ بگرن، یاخود بەلایەنی کەمەوە مسوڵمانان لەوە ئاگادار بکەنەوە، وە سەرەنجام دوای ڕێکخستنی ئەو سنوورانەو هێنانەدی مەبەستی غەزایەکەو پاش نزیکەی (٥٠) ڕۆژ، کە (٢٠) ڕۆژ لە تەبووك ماونەوەو ئەوی دیکە بە ڕێگای چوون‌و هاتنەوە بوون، پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە مەدینە، ئەم غەزایە ئامانجی خۆی بەتەواویی هێنایەدی، چونکە ئەگەر پێش ئەوە ڕۆمەکان بیریان لەوە کردۆتەوە، کە دەوڵەتی ئیسلامیی لاوازەو نێچیرێکی تووك نەرمە، ئەوە دوای ئەو غەزایە، بەپێچەوانەوە تێڕوانینێکی دیکەیان بۆی هەبووە.

هەروەها ئەو تیرە عەرەبانەش، کە لەگەڵ ڕۆمدا هاوپەیمان بوون، بۆیان دەرکەوت کە دەوڵەتی ئیسلامیی، نەك هەر دەتوانێ بەرگریی لە شاری مەدینە بکات، بەڵکو دەتوانێ لەکاتی پێویستدا هێرش بکاتە سەر ناحەزانی، ئەگەر لە دەرەوەو لە دووری مەدینەش بن!

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٣٠٠).

٢) (الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة)، محمد حميدالله، ص(١١٩-١٢٤).

جێی سەرنجیشە، کە لە تێکڕای غەزاکاندا، یەك لەدوای یەك پێشکەوتنی لایەنی سەربازیی ئیسلام بەشێوەیەکی خێرا دەردەکەوێ، وێڕای لایەنەکانی دیکە، کە دەبینن لە غەزای (بدر) سوپای ئیسلام سێ سەدو سێزدە کەس بوون‌و، لە غەزای (أحد)دا حەوت سەد کەس‌و لە (الأحزاب)دا سێ هەزار جەنگاوەرو، لە (فەتحی مەککە)دا دە هەزار کەس‌و لە (حنین)دا دوازدە هەزارو، لە (تبوك)دا سی هەزار کەس بووەو، جار لەدوای جار ژمارەیان زیادی کردوە.

**دەیەم:** مزگەوتی زیانگەیاندن (مسجد الضرار): کۆمەڵێك لە مونافیقەکانی مەدینە بۆ دژایەتیکردنی پێغەمبەرو گرفت دروست کردن لەسەر ڕێی ئیسلام‌و بەمەبەستێکی گڵاوی تایبەتی خۆیان‌و پیلان‌و تەفرەقە گێڕان دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان، لە نزیك مزگەوتی (قباء) مزگەوتێك دروست دەکەن‌و پێش ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ تەبوك، داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن، کە دوو ڕکات نوێژی تێدا بکات، بۆ زیاتر ناساندن‌و ڕەواج پێدانی ئەو بەناو مزگەوتەیان، ئەویش دەفەرموێ: ئێستا لەسەر سەفەرم بۆ غەزای تەبوك دەچم، ئەگەر هاتمەوە (إن شاء الله)، دێینەلاتان‌و نوێژی بۆتان تێدا دەکەین، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە تەبوك گەڕایەوە، پێش ئەوەی بگاتەوە مەدینە، بە فەرمانی خوا (جبریل) هاتە لای‌و مەسەلەی ئەو مزگەوتەی تێگەیاند کە مونافیقەکان بەمەبەستی خراپ‌و تێکدانی کاری مسوڵمانان‌و ئاژاوەو دووبەرەکییانەوە دروستیان کردوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بگاتەوە مەدینە، چەند کەسێکی نارد مزگەوتەکەیان ڕووخاند، خوای شارەزاش دەربارەی ئەو مزگەوتە دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ ...﴿١٠٨﴾ ...﴿١١٠﴾﴾ التوبة، واتە: {ئەوانەی مزگەوتێکیان دروست کرد بۆ زیانگەیاندن‌و کوفر بڵاوکردنەوەو پەرتەوازەکردنی

www.alibapir.com

مسوڵمانان، وە بۆئەوەی ببێتە بنکەو کەمینگەیەك بۆ کەسانێك، کە لەوەو پێش دژایەتی خواو پێغەمبەریان کردوە، وە سوێند دەخۆن کە تەنیا مەبەستیان چاکەیە، بەڵام خوا شایەدە کە درۆ دەکەن (ئەی موحەممەد) هەرگیز لەو مزگەوتەدا نوێژ مەکە...}[١].

وەك دەرکەوت مونافیقەکان دەیانویست بەناوی مزگەوتو لە ژێر دروشمی خواپەرستییدا دژایەتی ئیسلامو مسوڵمانان بکەنو زیانیان پێ بگەیەنن، بەهەمان شێوە لەم زەمانەو لە کۆمەڵگای ئێمەشدا زۆر جار بە مەبەستێکی خراپو بەناوی ئیسلامەوە لەژێر پەردەی دیندا شت دەکرێو، هی وا هەیە کە بەرنامەی پێچەوانەو دژ بە ئیسلامە، کەچی بەناوی دیفاع کردن لە ئیسلامەوە، دژی ئیسلام کار دەکاتو دەیەوێ مسوڵمانان بکاتە دوژمنی یەکدیو چەمکەکانی ئیسلامو نێوەڕۆکی دین لە خەڵکی دەگۆڕێ، وە کەسانێك هەن لە کاتێکدا، کە بڕوایان بە خواو بەرنامەو حوکمی ئیسلام نیە، فرمێسکی تیمساحی بۆ دەڕێژنو لەژێر ئەو پەردەیەدا پیلان لە دژی ئیسلامو مسوڵمانان دەگێڕن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص(٥٩٠-٥٩١)، وە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٣٠٢-٣٠٣).

**یازدەیەم** : بەسەرهاتی ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزەش کە خۆیان دواخست (کعب بن مالك)و (مرارة بن الربيع)و (هلال بن أمية) هەریەك لە (بخاري)[1] و هێناویانەو خوای پەروەردگاریش لە ئایەتی (١١٨،١١٩)ی سوورەتی (التوبة)دا ئاماژەی پێکردوە، جا (کعب) بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوەو پوختەکەی ئەوەیە کە دەڵێ: ئێمە بەبێ هیچ عوزرێك نەچووین بۆ ئەو جەنگە، لاوازیی رووی تێکردین‌و شەیتان‌و نەفس بەسەرماندا زاڵ بوو، کاتێکیش کە پێغەمبەر ﷺ هاتەوە بۆ مەدینە، هەمو ئەوانەی کە دەغەڵو دووڕوو بوون دەچوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺو عوزریان بۆ دەهێنایەوە، (پێغەمبەریش ﷺ لەبەرئەوەی، کە لە لووتکەی هەرەبەرزی شەرم‌و شکۆو ئەدەب‌و ڕێز دابووە، لەڕووی نەدەدان‌و دەیفەرموو: باشە بڕۆن لەگەڵ ئەوەشدا، کە دەیزانی ئەو دەغەڵو موونافیقانە درۆ دەکەن).

(کعب) دەڵێ: بەڵام من‌و (مرارة)و (هلال) وامان نەکرد، بۆیە من چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺو سەلامم لێکرد، ئەو بە تووڕەبوونەوە زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: وەرە!

منیش چوومە نزیکی دانیشتم، پێی گوتم: بۆ دواکەوتی؟

منیش گوتم: سوێند بە خوا، ئەگەر لای یەکێکی دیکە جگە لەتۆ بوومایەو ویستبام بە هێنانەوەی عوزر خۆم دەرباز دەکرد، بەڵام بە خوا ئێمە هیچ بەڵگەو بیانوومان نەبوو، تەنیا نەفس‌و شەیتان بەسەرماندا زاڵ بوو، کە لەو جەنگە دواکەوتین، ئێستاش چ بڕیار دەدەی ئێمە ملمان کەچە، ئەویش فەرمووی: مادام ڕێك‌و ڕاستتان گوت، بڕۆن تا بزانم خوا چ حوکمێکتان بۆ دەدات، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی کردبوو، کە بە هیچ شێوەیەك قسە لەگەڵ ئەو سێ کەسەماندا نەکەن، ئێمەش کەوتبووینە حاڵەتێکی نەفسیی‌و تەعزیبێکی

---

١) صحيح البخاري: ٤٤١٨.

٢) صحيح مسلم: ٢٧٦٩.

www.alibapir.com


زۆر ناخۆشەوە، هیچ کەسێك قسەی لەگەڵدا نەدەکردین، تەنانەت کە دەچوومە مزگەوتو سەلامم لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد ئەوەندە بەبێدەنگی وەلامی دەدامەوە، نەمدەزانی داخۆ وەلامی داوەمەوە یان نا، هەڵبەتە من لە هەردوو برادەرەکەم کەم تەمەنتر بوومو بەهێزتر بووم، ئەوان لە ماڵێ نەدەهاتنە دەرێو هەر دەگریان.

(کعب) دەڵێ: ڕۆژێکیان سەلامم لە (أبو قتادة) کرد کە ئامۆزام بوو، بەڵام وەلامی نەدامەوە، منیش پێم گوت: سوێندت دەدەم بەو پەروەردگارەی، کە دەیپەرستی: ئایا تۆ پێت وایە من خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێ؟ ئەویش وەلامی نەدامەوە، سێ جار ئەوەم لێ دووبارە کردەوە، دوایی زۆر بەئاسایی گوتی: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن! کە ئەوەم بیست زۆر دڵم بە خۆم سووتاو بەزەییم بە خۆمدا هاتەوە، بۆیە تێر گریام، ماوەیەکی دیکەی پێچوو، پادشای غەسسان نامەیەکی بۆ ناردم تێیدا نووسیبوو: بیستوومە هاوەڵەکەت لێت تووڕەبووە، تۆ ئەو پیاوە نی[1] کە بەو شێوەیە لە عەزابو ناڕەحەتییدا بی، وەرە بۆ لای ئێمە ڕێزت لێدەگرین!

منیش دوای خویندنەوەی نامەکە، بێدەنگ بوومو نامەکەم لە تەندووری هاویشتو سووتاندم، گوتم: ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی دیکەیە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر خەفەتم دەخواردو ناڕەحەتتر دەبووم[2] ئەو ناڕەحەتییو تاقیکردنەوەیە پەنجا ڕۆژی خایاند، دوای چل ڕۆژ پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لام، کە ژنەکەم بنێرمە ماڵی بابی.

---

١) چونکە (کعب) لەنێو قەومەکەیدا پیاوێکی زۆر ناسراو بووە.

٢) هەر یەك لەو سێ هاوەڵە بەڕێزە لە جەنگی بەدردا بەشدار بوون، بۆیە ئەو سزایە قورسەیان بۆ دانراوە، چونکە وەك گوتراوە: (حسنات الأبرار سيئات المقرَّبين)، واتە: ئەوەی بۆ چاکەکاران چاکەیە، بۆ زۆر لە خوا نزیکخراوان خراپەیە!

منیش گوتم: ئایا تەڵاقی بدەم؟

گوتی: نەخێر جارێ ئاوا بیهێڵەوە.

بەو شێوەیە دوو هاوەڵەکەشمی ئاگادار کردبۆوە، منیش خێزانەکەم ناردەوە ماڵێ بابیو ئەو ماوەیەمان بە خەمو خەفەتەوە بەڕێکردو زۆر پەشێمان بووین لە هەڵوێستەکەمان، تا خوای بەخشندە دوای ئەو پەنجا ڕۆژە، ئەم دوو ئایەتەی ناردنە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾﴾ التوبة، واتە: {وە خوا خۆش بوو لە پێغەمبەر ﷺو کۆچکەرانو پشتیوانان، کە لەکاتی سەغڵەتییدا لەگەڵ پێغەمبەر بوون، دوای ئەوەی خەریك بوون دڵی هێندێکیان لا بدات، دوایی خوا لێیان خۆش بوو، بێگومان خوا تۆبە وەرگرو میهرەبانە بۆیان، وە لەو سێیانەی کە حوکمەکەیان دواخرابوو، هەتا وایان لێهات زەوی لێیان وەتەنگ هات بەو فراوانییەی وە نەفسی خۆشیان لێ وەتەنگ هات، وە زانییان کە هیچ پەناگەیەك نیە بێجگە لە خوا، ئنجا خوا لێیان خۆش بوو، بێگومان تەنیا خوا تۆبە وەرگرو بەخشندەیە}.

دوایی دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ التوبة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو لەگەڵ ڕاستان دا بن، چونکە ئەوانە بەهۆی ڕاستییانەوە سەرکەوتوو بوون، وە ناویشیان لە قورئاندا تۆمار کرا، وەك خوای پەروەردگار ئاماژەیان پێدەکات:

﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ...﴾ کەواتە: دیارە بایی ئەوەندە ئیمانو تەقوایان هەبووە کە شایستەی ئەوە بن خوا ئاماژەیان پێبکاتو تۆبە لێ قبووڵ کردنیشیان بخاتە نێو قورئانەوە، وە ئەو پەنجا شەو سزایەش بۆیان بۆتە مایەی ڕەشبوونەوەی گوناهەکانیان، ئنجا (کعب) دەڵێ: ئەو ڕۆژەی کە ئەو ئایەتە هاتە خوار، یەکێك هاواری کردو، گوتی: ئەی (کعب) موژدەت لێبێ، منیش ئەو ڕۆژە بەرگێکی باشم هەبوو بۆم بردو لەجیاتی مژدە پێدانەکە، دامێ، ئنجا زۆر بەخێرایی چوومە مزگەوت بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە بینیم ڕووی موبارەکی وەکو مانگی چواردە دەدرەوشایەوەو فەرمووی: ئەی (کعب)! مژدەت لێبێ ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژە لە هەموو ژیانتدا خوا لێت خۆش بوو، ئنجا ئایەتەکانی بەسەردا خوێندمەوە، منیش بە ئەندازەیەك دڵخۆش بووم، کە هەرگیز ئاوا دڵخۆش نەبووبووم، ئنجا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من لەسەر خۆمم فەرز کردوە، کە ئەگەر بێتو خوا -عزّ وجل- لێم خۆش بێ، هەموو ماڵەکەم ببەخشم.

ئەویش فەرمووی: هەندێکی بهێڵەوە، باشترە.

گوتم: بیدەم بەکێ؟

فەرمووی: بە زۆری بیدە بە خزمەکانت[1].

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٣٠٣- ٣٠٨).

## هاتنی وەفدی (ثقیف) بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانبوونی خەڵكی (طائف)[١]:

لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٩)ی كۆچیدا پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە مەدینەو هەر لەو مانگەشدا وەفدێكی (ثقیف) هاتنە لای و مسوڵمان بوون، مسوڵمانبوونەكەشیان بەم شێوەیە بوو:

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی هەشتەمی كۆچییدا لە غەزای (طائف) گەڕایەوە، پێش ئەوەی بگاتەوە مەدینە (عروة بن مسعود الثقفي) كە گەورەی (ثقیف) بوو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمان بوو، دوایی گەڕایەوە بۆلای قەومەكەی و داوای مسوڵمانبوونی لێكردن، بەڵام ئەوان ئەو داوایەیان ڕەدكردەوەو هەر بەوهۆیەشەوە (عروة)یان كوشت، ماوەیەك ئاوا مانەوە، دوایی بۆیان دەركەوت كە وردە وردە ئیسلام گەشە دەكاتو ناتوانن بەرانبەری ئیسلام بوەستنو دژایەتی بكەن، ئنجا بیریان لەوە كردەوە بچنە لای پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمان ببن، بۆ ئەو مەبەستە ویستیان (عبد یالیل) بنێرن، ئەویش لەوە ترسا، كە وەكو (عروة) بیكوژن، بۆیە داوای كرد بەتەنیا نەڕواو چەند كەسێكی دیكەی لەگەڵ بنێرن، بۆیە پێنج كەسیان لەگەڵ ناردن كە (عثمان بن أبي العاص الثقفي) یەكێك بوو لەوان، هەر شەشیان چوونە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەویش ئیسلامی بۆ ڕوونكردنەوەو داوای مسوڵمانبوونی لێكردن، دوایی ئەوان داوایان كرد كە پێغەمبەر ﷺ ڕێككەوتنێكیان لەگەڵ مۆر بكاتو ڕێگایان بدات كە زینا بكەنو، خواردنەوەی شەڕابو خواردنی ڕیباشیان لێ قەدەغە نەكاتو، (اللات)[٢] كە بتیان بوو دەیانپەرست هەر بمێنێو،

---

١ ) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص٣٠٨-٣١٢.

٢) (لات) ناوی یەكێك لە پەرستراوەكانیان بووەو (مؤنث)ی (الله)یە، چونكە ئەوان بەپێی بۆچوونی خۆیان گوتوویانە ئەو پەرستراوانەمان مێینەن، بەهەمان شێوەش (عُزّى) (مؤنث)ی (عزیز)ەو (مناة)یش هی (منّان)ە.

لە نوێژکردنیش عەفوویان بکات، وە بتەکانیش بەدەستی خۆیان نەشکێنن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بێجگە لە داواکاریی کۆتایی، هیچ کام لەوانەی قبووڵ نەکرد، ئەوانیش ڕاوێژی خۆیان کردو سەرەنجام هاتن مسوڵمان بوون، وە (عثمان بن أبي العاص الثقفي)ی لەسەر کردنە برا گەورە، چونکە ئەو زۆر بەپەرۆش بوو بۆ تێگەیشتنی لە دین و لە هەمووشیان تەمەنی کەمتر بوو، کە وەفدەکە گەڕایەوە (طائف) بابەتەکەیان بە قەومەکەیان ڕاگەیاند، لە سەرەتاوە ئەوان بەوە ڕازی نەبوون و بەنیازی شەڕ بوون، بەڵام دوای دوو تا سێ ڕۆژ، خوا ترسی خستە نێو دڵیانەوەو وەفدەکەیان ناردەوە لای پێغەمبەرو مسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند.

## حەج کردنی (أبو بكر) بە مسوڵمانان:

(ابن هشام)[1] دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مانگی (ذي الحجة) ساڵی نۆیەمدا (أبو بكر) لەجیاتی خۆی دەکاتە (أمیر)ی حەج و، ژمارەیەکی زۆر لە مسوڵمانان لە مەدینەو شوێنەکانی دیکەوە لە خزمەتیدا دەڕۆن بەرەو مەککەو، قوربانیی (هدي)یش لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، (أبو بكر) خوا لێی ڕازی بێ، لەجیاتی پێغەمبەر ﷺ پێنجەمین پایەی ئیسلام (حەج) بە مسوڵمانان ئەنجام دەدا، کە زۆر لە زانایان دەڵێن (حەج) هەر لە ساڵی (نۆیەم)یشدا پێویست کراوە، چونکە ساڵەکانی پێشتر، مەککەو ئەو شوێنانەی کە واجبی حەجیان لێ ئەنجام دەدرا، لەژێر ڕکێف و دەسەڵاتی کافرەکاندا بوون، خوای کاربەجێش ئەرکێك ناخاتە سەرشانی مسوڵمانان کە توانای بەجێهێنان و ئەنجامدانی ئەو ئەرکەیان نەبێ، بەڵام دوای ئەوەی کە (أبو بكر) دەکەوێتە ڕێ، پێغەمبەر ﷺ سەرەتای سوورەتی (التوبة)ی بۆ دادەبەزێ، کەوا

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٣١٣-٣١٥).

www.alibapir.com


پێدەچێ لە ئایەتی: (١ تا ٢٤) بێ، چونکە پەیوەندی بەم باسەوە هەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ (علي بن أبي طالب)ی ئامۆزای خوا لێی ڕازی بێت، ڕادەسپێرێ کە لەجیاتی پێغەمبەر ﷺ ئەو پەیامە بگەیەنێ بە مسوڵمانان، کە ئایەتەکان بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن:

﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢﴾ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ...﴿٣﴾﴾ التوبة.

واتە: {ئەمە ڕاگەیاندنی حاشالێکردنو پەیوەندیی پچڕاندنی خواو پێغەمبەری خوایە لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون لەهاوبەش بۆ خوا دانەران، چوار مانگ مۆڵەتە کە بەزەویدا بڕۆن، وە بزانن کە ئێوە خواتان پێ دەستەوستان ناکرێ، وەخوا کافران سەرشۆڕ دەکا...}

دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَـٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ التوبة﴾.

واتە: {بێجگە لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، وە شتێکیشیان لێ دەرنەکەوتوە، پێچەوانەی ئەو پەیمانە بێ، کە لەنێوانتاندا هەیە، وە هاوکاریی هیچ دوژمنێکیشیان نەکردوە لەدژی ئێوە، ئەوانە پەیمانەکەیان لەگەڵ

بەرنە سەر، تا ئەوکاتەی کە پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون چونکە خوا پارێزکارانی خۆشدەوێ}.

هەروەها لە ئایەتێکی دیکەداو هەر لەهەمان باسدا دەفەرموێ: ﴿...إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ...﴿٧﴾ التوبة﴾، واتە: {جگە لەوانەی کە لەلای مزگەوتی حەرام پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون}، کەواتە: مانای ڕۆشنو بەهێز بۆ تەفسیری ئەو ئایەتانە ئەوەیە کە: لێرەدا خوای زانا دەیەوێ هەموو کافرەکان ئاگادار بکاتەوە کە جگە لەوانەی پابەندبوون بە پەیمانەکانیانەوە، ئەوانی دی هەموویان پەیمانەکانیان بە هەڵوەشاوە لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام چوار مانگ مۆڵەتیان بۆ دادەنرێ (لەوکاتەوە کە هەواڵەکەیان پێ دەگا تا چوار مانگ) مسوڵمان دەبن، یان بەکافریی دەمێننەوە، یاخود کۆچ دەکەن، دوای ئەو چوار مانگە دەکەونە حاڵەتی جەنگەوە، ئەوکاتە یان دەبێ مسوڵمان بن، یان سەرانە بدەن، یان سەرو ماڵیان بۆ مسوڵمانان حەڵاڵ دەبێ! دیارە لە سۆنگەی ئەوەوە نا کە کافرن، بەڵکو لە سۆنگەی پەیمان شکێنیو دژایەتیکردنیانەوە بۆ ئیسلامو مسوڵمانان.

هەروەها خوای بێهاوتا هەرلەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ...﴿٢٨﴾ ﴾ التوبة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پیسن (وەك دڵو هەناوو ڕووحیان) بۆیە لەدوای ئەمساڵەوە نابێ توخنی مزگەوتی حەرام بکەون، (چونکە هیچ پەیوەندییان بە ماڵی خواوە نیە، ماڵی خوا هی ئەوکەسەیە کە خوا دەپەرستێو ماڵی خوا پاکەو هی پاکانە).

دوای ئەوەی کە ئەو ئایەتانە هاتنە خوار پێغەمبەر ﷺ بانگی (علي بن أبي طالب) دەکا خوا لێی ڕازی بێو پێی دەفەرموێ: ئەو ئایەتانە لەبەربکە، وە لەجیاتی من بچۆ لەسەر مسوڵمانان بیانخوێنەوە، یەکێك لە مسوڵمانان پێشنیار دەکاتو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ (أبو بكر)یان بنێرە! ئەویش دەفەرموێ: نا، دەبێ

www.alibapir.com


یەکێك لە بنەماڵەو خزمانی خۆم بەناوی منەوە ڕایبگەیەنێ، دیارە ئەوە لەبەر ئیعتیباری عورفو باوی کۆمەڵگا بووە، چونکە تیرەو هۆزەکانی عەرەب ئەو شتانەیان لێك داوەتەوەو (علي)یش ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ بووە، بۆیەش لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەم، چونکە هەندێك لە (شیعة) بێ ویژدانن بەرانبەر بە (أبو بکر) خوا لێی ڕازی بێ، درۆو دەلەسەی زۆریان خستۆتە نێو ئەو باسەوەو دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی (أبو بکر)ی ناردوە (علي) بەدوای ئەودا ناردوەو ئەوی کردۆتە ئەمیر، وە (أبو بکر)ی لە ئەمیرێتی خستوە کە بەڕاستی ئەوە بێ بنچینەیەو هەڵبەستراوە.

(ابن هشام)[(١)] لەوبارەوە دەڵێ: کاتێك (علي) دەگاتە لای (أبو بکر) خوا لە هەموویان ڕازی بێ، (أبو بکر) دەپرسێ: {أأمیر أم مأمور؟!}، واتە: ئەمیری یاخود سەربازی؟! (علي)یش دەڵێ: {بل مأمور}، بەڵکو سەربازم، واتە: لەبەردەستی تۆم، بەلام پێغەمبەر ﷺ هەندێك ئایەتی بۆ هاتوونە خوار، منی ڕاسپاردوە کە بیانخوێنمەوە، ئنجا (علي) خوا لێی ڕازی بێ لە عەرەفاتو لەو شوێنە گشتییانەی کە خەڵکیان لێ کۆدەبێتەوە[(٢)] ئایەتەکان ڕادەگەیەنێو دەڵێ: {یا أیها الناس: إنه لا یدخل الجنّة کافر، ولا یحج بعد العام مشرك، ولا یطوف بالبیت عریان}[(٣)]، واتە: ئەی خەڵکینە! ئاگاداربن ئەوەی کافربێ ناچێتە بەهەشت، لەم ساڵیش بەدواوە هیچ کەسێکی هاوبەشدانەر نابێ حەج بکات لەگەڵ مسوڵمانان، وە لەمەودوا نابێ کەس بەڕووتیی بەدەوری (کەعبە)دا تەواف بکا! چونکە هەندێك لە تیرەو هۆزەکانی عەرەب پیاوو ئافرەتیشیان بەڕووتیی بەدەوری (کەعبە)دا تەوافیان کردوەو پێیان وابووەو گوتوویانە: ئەو بەرگەی کە گوناهمان پێوە کردوە، شایستەی ئەوە نیە، لەبەرماندا بێو بەدەوری ماڵی خوادا بگەڕێین!!

---

١) (السیرة النبویة)، ج٤، ص(٣١٥).

٢) چونکە ئەوساڵە هەم خەڵکی مسوڵمانو هەم کافرانیش هاتوون بۆ حەج.

٣) هەمان سەرچاوەو بەرگولاپەڕە.

بەوشێوەیە پیاوو ئافرەتیان بەڕووتیی تەوافیان کردوە، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ ئەوساڵە بۆخۆی نەچووەو (أبو بكر)ی لەجیاتی خۆی ناردوە، چونکە شتێکی گونجاو نیە پێغەمبەر ﷺ لەوێ بێو ئافرەتی ڕووتو پیاوی ڕووتیش بە دەوری (کەعبە)دا تەواف بکەن! وە پێغەمبەر ﷺ ئەو ساڵە (أبو بكر)ی ناردوە حەج بە خەڵکەکە بکات، (علي)یشی ناردوە، کە ئەو پەیامەیان پێ ڕابگەیەنێ، بۆئەوەی ساڵی ئاینده، کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ حەج، حەجێکی تێرو تەواوبێو هیچ شتێکی ناشایستەی تێدا نەبێ.

## مردنی (عبدالله بن أبيّ بن سلول):

(عبدالله بن أبيّ بن سلول) لە مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی نۆیەمی کۆچیدا، مرد.

وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، (عبدالله بن أبيّ) کە سەرۆکی مونافیقەکان بوو، کوڕێکی بووە بەناوی (عبدالله)و کوڕێکی زۆر صالحو چاك بووە، جا دوای مردنی بابی، دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! بابم مردووە، ئەگەر بێی نوێژی لەسەر بکەی، ئەویش دەفەرموێ: باشە دێم، هەروەها داواشی لێ دەکاتو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! بابم زۆر لەگەڵم چاك بووە، ئەگەر کراسەکەی خۆشتی بدەیتێ بۆ ئەوەی پێی کفن بکەین، بەڵکو لە عەزابو سزا چەپاڵە بدرێ، دەفەرموێ: باشە، کراسەکەشی دەداتێو ئنجا لەگەڵیشی دەچێ تا سەر گۆڕستان، لەوێش بەرانبەر جەنازەکە ڕادەوەستێ، بۆئەوەی نوێژی لەسەر بکات، عومەریش خوا لێی ڕازی بێ دەچێتە پێشیو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ لەسەر ئەوە دەکەی؟ هەر ئەوە بوو فلان ڕۆژە وای گوتو فلانە ڕۆژە ئاوای کرد...هتد، وە زۆر لە هەڵوێستە خراپەکانی باس دەکات، دوایی پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی دێتێو دەڵێ: خۆت لادە عومەر من سەرپشك کراوم لەنوێژ لەسەرکردنیو لەسەرنەکردنی، دوایی پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر دەکات، وە دەچێ بۆ سەر قەبرەکەشی، دوای ئەوە زۆری

www.alibapir.com


نەخایاند ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُواْ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة، واتە: لەمەودوا نوێژ لەسەر هیچ کام (لەوانەی کە دەزانی مونافیقن) مەکە، وە لەسەر گۆڕەکەشیان رامەوەستە، چونکە ئەوان بڕوایان بەخواو پێغەمبەرەکەی نەبووە، وە بە لاریی مردوون، واتە: لە مەڕاسیمی بەخاك سپاردنیشدا ئامادە مەبە.

دیارە ئەم هەڵوێستەش یەکێکی دیکەیە لەو هەڵوێستانەی کە عومەر خوا لێی ڕازی بێ، پێشنیاری کردوەو خوای زاناو شارەزاش وەحی ناردۆتە خوارێو موافیقی پێشنیاری ئەو بووە، شایانی باسیشە دوای ئەوە، پێغەمبەر ﷺ تا وەفاتی کرد نوێژی لەسەر هیچ مونافقێك نەکردوەو نەچۆتە سەرگۆڕەکانیشیان لەکاتی نێژراندا.

## سەرپشککرانی هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ[١]:

کاتێك خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبینن ژیانی هێندێك لە مسوڵمانان کەمێك خۆش بووەو دەستکەوتو غەنیمەتیان وەرگرتوەو...هتد، بەڵام ژیانی ئەوان هەر وەکو خۆیەتی، چونکە پێغەمبەر ﷺ ژیانیماڵو منداڵی زۆر سادە بووە، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: {إن كنا لننظر إلى الهلال ثلاثة أهلة في شهرين وما أوقدت في أبيات رسول الله ﷺ نار، فقلت: ما كان يُعَيِّشكم؟ قالت: الأسودان: التمر والماء} رواه البخاري[٢]، واتە: ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد لە دوو مانگاندا سێ جار مانگمان دەبینی، کە نوێ دەبۆوەو ئاگر لە ماڵەکانی پێغەمبەردا نەدەکرایەوە.

{(عروة) دەڵێ:} پێم گوت: ئەدی بەچی دەژیان؟

---

١) (السيرة النبوية لإبن هشام)، ج٤، ص(٣١٩).
٢) صحيح البخاري: ٦٤٥٩.

گوتی: بە دوو شتە ڕەشەکان، خورماو ئاو، بۆیە هەموویان داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن کە ژیانو گوزەرانیان خۆشتر بکاو نەفەقەو خەرجییان بۆ زیاد بکاتو، بۆ ئەو مەبەستە لێی کۆدەبنەوە، ئەویش ئەو هەڵوێستەیانی زۆر لەسەر دڵ قورس دەبێو ماوەی مانگێك یان بیستو نۆ ڕۆژ لێیان جیا دەبێتەوەو[1] لێیان نیگەران دەبێ، وە خواش – عزّ وجلّ- بەوبۆنەیەوە چەند ئایەتێك دەنێرێتە خوار، کە لە سەرەتایانەوە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ٢٨ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٢٩ ﴾ الأحزاب، واتە:{ئەی پێغەمبەر! بە هاوسەرەکانت بڵێ: ئەگەر ژیانی دنیاو جوانیی دنیاتان دەوێ، وەرن هەریەکەتان دیارییەکتان بدەمێو بەشێوەیەکی جوان بەرهەڵداتان بکەم، وە ئەگەر خواو پێغەمبەری خواو ژیانی دوا ڕۆژیشتان دەوێ، ئەوە بێگومان خوا بۆ چاکەکاران لەئێوە پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردوە}.

دیارە ئەم ئایەتانە لەساڵی نۆیەمی کۆچیدا هاتنە خوارێ، کەواتە ئەو بەسەرهاتەش لەو ساڵەدا بووە، جا کاتێك ئەم ئایەتانە هاتنە خوار، پێغەمبەر ﷺ پێش هەموویان (عائشة) بانگ دەکاو پێی دەڵێ: خوا –عزّوجلّ- ئاوا فەرمانی پێکردووم، جا تۆش پەلە مەکە تا بابو دایکت ئاگادار دەکەیەوەو ڕاوێژیان پێدەکەی، (عائشة) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەشیزانی، کە بابو دایکم قەت پێم ناڵێن لە پێغەمبەر ﷺ جیا ببمەوە، دوایی بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: لە چیدا پرس بە بابو دایکم بکەم؟ پێویست ناکات، من خواو پێغەمبەری خواو ڕۆژی دواییم دەوێ، (عائشة) دەڵێ: دوایی هەموو خێزانەکانی دیکەی پێغەمبەر ﷺ هەڵوێستیان وەکو هەڵوێستی من بوو[2].

---

١) واتە: جێگایان لێ جیا دەکاتەوەو ناچێتە ژوورەکانیانەوە.

٢) صحيح البخاري: ٤٧٨٦، وە: صحيح مسلم: ٣٦٦٥.

ئاشکرایە کە پێغەمبەر ﷺ عائیشەی لە هەموو خێزانەکانی دیکەی زیاتر خۆشویستوە، چونکە لە هەموو هاوسەرە بەڕێزەکانی دیکە زیاتر بەکەڵکی ئیسلام هاتوەو، زۆر فامیدەو تێگەیشتووو ئەهلی تەقوا بووە.

چونکە دەبینین ئەو فەرمایشتانەی کە لەو گێڕراونەوە لە هیچ کام لە خێزانەکانی دیکەی پێغەمبەر ﷺ نەگێڕراونەوە، بۆیەش دەڵێم: لە هەموویان بەتەقواتر بووە، بە بەڵگەی ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی چەند جارێك گلەییان لێ کردوەو گوتوویانە: تۆ زیاتر ڕوو دەدەیە (عائشة)، هەڵبەتە مەبەستیان ئەو ڕوو پێدانە بووە کە پێچەوانەی دادگەریی نیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە لووتکەی دادگەرییدا بووە، ئەویش فەرموویەتی: گلەیی چیم لێ دەکەن! بێجگە لە پێخەفی (عائشة) لە پێخەفی هیچ کامێکتاندا (جبریل) نەهاتوە بۆ لامو وەحی بۆ نەهێناوم!! کەواتە: وا دیارە ئەو لە هەموویان لە خوا نزیکترو صاڵحتر بووە، هەروەها پێوەری پێغەمبەریش ﷺ بۆ خۆشویستن پارێزکاریی (تقوى) بووە، جا کێیان لە هەموویان پارێزکارتر بووبێ ئەوی لە هەموویان زیاتر خۆشویستوە.

وە (مسلم) هێناویەتی کە (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ پاش ئەوەی ڕای خۆی دەخاتە ڕوو، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو هەڵوێستەی من بە خێزانەکانی دیکەت مەڵێ! پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ئەی (عائشة) خوا منی بەرەحمەت ناردوە، هەرکامێکیان لێم بپرسێ هەڵوێستی (عائشة) چۆن بووە؟ پێی دەڵێم بۆئەوەی ئەویش چاو لەتۆ بکا![١] سەرەنجام هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەو ژیانە سادەیەی کە لەگەڵ ئەودا دەیگوزەرێنن ئەوە هەڵدەبژێرن، وە پەشیمانیش دەبنەوە لەو هەڵوێستەی خۆیان، کە پێغەمبەری پێ نیگەران بوو بوو.

---

١) صحيح مسلم: ٣٦٧٤.

**هاتنی وەفدەكـان لە ساڵی نۆیەمـدا كە بـە: (عام الوفـود) ناسراوە:**

دوای فەتحی مەككەو گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە تەبووكو مسـوڵمانبوونی هـۆزی (ثقیف)و دیاری كرانـی چـوار مـانگ بـۆ هـۆزە عـەرەبـە هاوبـەش پەیداكـەرەكان، كـە هەڵویستـی خۆیـان دیـاری بكـەن پـێش ئـەوەی دەوڵـەتی ئیسـلامیی هەڵوێسـتێكی تایبەت وەرگرێ لە بەرانبـەریان، دوای ئەوانەو لە سـاڵی نۆیـەمی كۆچیدا ژمارەیـەكی زۆر لـە نوێنـەرو وەفـدی تیـرەو هۆزەكـان هاتنـە لای پێغەمبـەر ﷺو مسـوڵمانێتی خۆیان ڕاگەیاند.

هەربۆیەش ساڵی نۆیەم بە ساڵی وەفـدەكان (عـام الوفـود) نـاونراوە، جـا هـەرچـەندە ژمارەی ئەو وەفدانە زۆرن، بەڵام لێرەدا تەنیا ئاماژە بە هەندێكیان دەكەین:

١- وەفدی (بني تـمیم) ڕیش سپییان (عطارد بـن حاجـب) بـوو، وە چـەند نـاودارێكی دیكەشی لەگەڵ بوون، وەك: (الأقـرع بـن حـابس)و (الزبرقـان بـن بـدر)و (عـمرو بـن الأهـتم)و (الحبحـاب بـن یزیـد). وە هـاتن بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر ﷺو سـەرەتای سـووڕەتی (الـحجرات)یش بەبۆنـەی ئەوانـەوە هاتۆتـە خـوار، وەك (إبـن هشـام)(١) هێنـاویەتی دەڵێ: كە هاتنـە لای پێغەمبەر ﷺ لە دەرێ ڕا بانگیان كردو گوتیان: یا (مـحمد أخـرج إلینـا) ئـەی موحەممـەد وەرە دەرێ ئیشـمان پێتـە!! پێغەمبـەر ﷺ كەمێك پێی ناخۆش بوو، كە بەو شێوەیە بانگ كرا، بۆیـە خـوای پـەروەردگار فـەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾ الحجرات،

---

١) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٤، ص(٣٢٤-٣٢٥)، وە: (الـمصباح الـمنیـر...)، ص(١٣٠٠).

واتە: {ئەوانەی لە پشت ژوورەکانەوە (ژووری خێزانەکانی) بانگت دەکەن، زۆربەیان نەفامن، ئەگەر ئارامیان گرتبا تا دەچووی بۆ لایان باشتر بوو، وە خواش لێبوردەو بە بەزەییە} دیارە دواتر ئیسلامیان وەرگرتو مسوڵمان بوون.

٢- وەفدی (بني عامر) کە (عامر بن الطفیل) و (أربد بن قیس)ی لەگەڵدا بوو، وە (عامر بن الطفیل) ئەو کەسەیە کە لە (بئر المعونة) خیانەتی لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کردو شەهیدی کردن، ئەو دوو کەسە، چەند کەسێکی دیکەشیان لەگەڵدا بوو، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، پێش ئەوەی بگەنە لای ڕاوێژیان کردبوو کە هەوڵی کوشتنی پێغەمبەر ﷺ بدەن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوونو پێغەمبەریش ﷺ کە زانی نیازیان خراپە دووعای لێکردن، ئیدی (أربد) بە هەورە تریشقە مردو (عامر)یش بە (طاعوون) لەنێوچوو[١].

٣- وەفدی هۆزی (بني سعد بن بکر)، کە (ضمام بن ثعلبة) بە نوێنەری خۆیان دەنێرن بۆ لای پێغەمبەر ﷺو چەند پرسیارێك لە پێغەمبەر ﷺ دەکات دەربارەی خواپەرستییو نوێژو زەکاتو ڕۆژووو حەجو..هتد، دوایی ئیمان دێنێو بڕیار دەدا هەموویان جێبەجێ بکات، دوایی کە (ضمام) دەگەڕێتەوە نێو هۆزەکەی، هەر یەکەم قسەی دەڵێ: {بئست اللات والعزی}، واتە: خراپترین شت (لات و عزی)ن! هۆزەکەشی زۆر بەسەر سوڕمانەوە دەڵێن: ئەی (ضمام) ئەوە چۆن وا دەڵێی؟! لە بەڵەکی بترسە! لە شێتی بترسە! ئەویش پێیان دەڵێ: ئەو دووە ناتوانن هیچ زەرەرو قازانجێك بەکەس بگەیەنن، خوا پێغەمبەرێکی ناردووەو کتێبێکی پێدا ناردوە ڕزگارتان دەکات لە نەهامەتییەکان، من ئیمانم هێناوەو

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، (ص٣٢٩-٣٣٠).

www.alibapir.com

ئێوەش ئیمان بێنن، ئەو ڕۆژە بۆ ئێواریێ کەس نەما لە ژنو پیاویان مسولمان نەبووبێو هەموویان ئیمانیان هێنا، (إبن عباس) دەڵێ: نەمانبیستوە وەفدی هیچ قەومێك باشتربووبێ لە (ضمام)[١].

٤- وەفدی (عبد القیس)، کە (الجارود)و دەستەیەك بەنوێنەری خۆیان دەنێرن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، کە دیارە نەصرانیی بووەو لەوێ مسولمان دەبێو کاریگەریشی دەبێ لەسەر قەومەکەی هەم بۆ مسولمانبوونیانو هەم بۆ دامەزراوییان لەکاتی هەڵگەڕانەوە (الردَّة)دا، پاش مردنی پێغەمبەری خوا[٢].

٥- وەفدی (بني حنيفة)، کە لە (يَمامَة)وە هاتوونو (مسيلمة الكذاب)يشیان لەگەڵدا بووە، کە ناوی (مسيلمة بن ثمامة)ە بووە، بەڵام ئەوانە مسولمان نەبوونو (مسيلمة)یش داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد، هەر بۆیە بە (کذّاب) ناوزەد کرا، وە لە سەردەمی (أبو بكر)دا لە شەڕی (يمامة) لە ساڵی (١٢)ی کۆچیدا کوژرا[٣].

٦- وەفدی (طيء)، کە سەرۆك هۆزەکەیان ناوی (زيد الخيل) بوو بە نوێنەری هۆزەکەی هاتە لای پێغەمبەر ﷺو مسولمان بوو، وە هەر لەو سەروحەدەشدا (عدي بن حاتم الطائي) هاتوەو مسولمان بووە.[٤]

٧- (فروة بن مسيك المرادي)، کە لە پادشاکانی (كندة) جیابووبۆە، هاتە لای پێغەمبەر ﷺو مسولمان بوو[٥].

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٣٣٢-٣٣٣).
٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٣٣٣-٣٣٤).
٣) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٣٣٤-٣٣٥).
٤) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٣٣٥-٣٣٧).
٥) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٣٣٨-٣٣٩).

٨- وەفدی (بني زبيد)، کە نوێنەرەکەیان (عمرو بن معد يكرب) کە لە سەرەتاوە مسوڵمان بووە، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، لەدین هەڵگەڕایەوە(١).

٩- وەفدی (كندة)، کە نوێنەرەکەیان (الأشعث بن قيس) بوو هاتە لای پێغەمبەر ﷺو مسوڵمان بوون(٢).

١٠- وەفدی (أزد) نوێنەریان، کە (صرد بن عبدالله) بوو، هاتە لای پێغەمبەر ﷺو مسوڵمان بوو، پێغەمبەریش ﷺ کردیە براگەورەی ئەوانەی لە قەومەکەی مسوڵمان بووبوون(٣).

١١- وەفدی کۆمەڵێك لە پادشاو پادشا زادەکانی (حمير)، کە بە نوێنەرەکانیاندا نامەیان بۆ پێغەمبەر نووسیو مسوڵمان بوونو پێغەمبەریش نامەیەکی بۆ نووسینەوەو سوپاسی خوای کرد لەسەر مسوڵمانبوونیان(٤).

١٢- وەفدی (فروة بن عمرو الجُذامي)، کە کار بەدەستی ڕۆمەکان بووە بەسەر خێڵە عەرەبەکانەوە، یەکێکی بۆلای پێغەمبەر ﷺ ناردووەو ئیسلامەتی خۆی پێ ڕاگەیاندوەو ئێسترێکی سپیشی بە دیاری بۆ پێغەمبەر ناردوە(٥).

١٣- وەفدی (هَمْدان)، کە بە سەرۆکایەتی (مالك بن النمط) چوونە مەدینەو مسوڵمان بوونو پێغەمبەریش (مالك)ی کردە گەورەی ئەوانە، کە مسوڵمان بوون، دواتر خەڵکی (همدان) تێکڕا مسوڵمان بوون(٦).

---

١) و(٦): هەمان سەرچاوە، ج٤، ص٣٣٩ تا ٣٤٩، کە بەدرێژیی باسی ئەو وەفدانە کراوە.

١)و (٢) و (٣) و (٤) سەرچاوەی پێشو، ج٤، ص(٣٣٩ تا ٣٤٩)، کە بەدرێژیی باسی ئەو وەفدانە کراوە.

شایانی باسیشە کە زۆربەی هەرەزۆری ئەو وەفدانەی هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ مسوڵمان بوون، تەنیا وەفدی (مسیلمة الكذاب) مسوڵمان نەبوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو وەفدانە هیچ فشارو زۆرێکیان لەسەر نەبووە لە وەرگرتنی دینداو ئەوانەی مسوڵمان بوون، بە ڕەزامەندیی و ویستی خۆیان مسوڵمان بوونو ئەوی نەشیویستبێ موسڵمان ببێ، ئازادانە گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی.

## دەرکـەوتنی (مسـیلمة الکـذاب) لـە (یمامـة)و (الأسـود العنسـي) لـە (صنعاء):

لە کۆتایی ساڵی دەیەمی کۆچیدا دوو کەس پەیدا دەبن، کە لـەنێو خەڵکدا لافـی پێغەمبەرایەتی لـێ دەدەنو بانگەشەی پێغەمبـەرایەتی دەکـەن، یـەکیان لـە یەمـامـە کە (مسیلمة الکذاب)ە، کە (مسیلمة بن ثمامة بن کبیر بن حبیب بن الحرث)ەو، لە (بني حنیفة)یە، وە پێغەمبەر ﷺ ناوی (الکذاب)ی بەسەردا بڕیوە، دووەمیشـان (الأسود العنسي)یە لە (صنعاء) لە یەمەن.

(إبن هشام)[1] هێناویەتی دەڵێ: (مسیلمة) نامەیەك بۆ پێغەمبـەر ﷺ دەنووسـێ کە ئەمە دەقی نامەکەیەتی: {من مسیلمة رسول الله الی محمد رسول الله، سلام علیك، أما بعد، فأني أُشرکت في الأمر معك، وان لنا نصف الأرض ولقریش نصف الأرض، ولکن قریش قوم یعتدون}، واتە: {لە (مسیلمة) ڕەوانەکراوی خـواوە بۆ موحەممەد ڕەوانەکراوی خـوا، سەلامت لـێ بێ -أما بعد- ئەوە من لەو ئیشـەی تۆدا بەشدارکراوم نیوەی سـەرزەوی بـۆ ئێمـەو نیوەشـی بـۆ قـوڕەیش، بـەڵام قـوڕەیش قەومێکە دەسـتدرێژیی دەکەن}، پێغەمبەریش ﷺ بەم شێوەیە وەڵامـی دەداتـەوە: **{بسم الله الرحمن الرحیم، من محمد رسول الله إلی مسیلمة الکذاب السلام علی من اتبع الهدی أما بعد، فان الأرض لله یورثها من یشاء من عباده والعاقبة للمتقین}**، واتـە: {بـەناوی خـوای بـە بـەزەیی بەخشـندە، لـە (محمد) ڕەوانەکـراوی خـواوە بۆ (مسیلمة)ی درۆزن، سەلام لەو کەسە بێ، کە بەدوای ڕێنمایی خـوا دەکەوێ -أما بعد- زەوی هی خوایە دەیکا بەمیـراتی هەرکەسێك لە بەندەکـانی کە بیەوێ، وە سەرەنجامیش بۆ پارێزکارانە}، دیارە ئـەوەی کـە پێغەمبـەر ﷺیـش فـەرمووی ئـەوە هاتـەدیو سـەرەنجام (موحەممـەدی ڕاسـتگۆ) سـەرکەوتو (موسەیلەمەی درۆزن)و هاووێنەکانی تێشـکانو ڕیسـوا بوون.

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٣٣٩-٣٥١).

## ناردنی چەند نوێنەرێك بۆ تێگەیاندنی خەڵكی:

دوای ئەوەی وەفدی هۆزو ناوچەكان پەیتا پەیتا هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە بۆ مسوڵمانبوونو شارەزابوون لە ئیسلامو دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو، وە پەیامو بانگەوازی ئیسلام پەرەی سەند، پێغەمبەر ﷺ چەند كەسێكی شارەزای لە هاوەڵانی نارد بۆ چەند ناوچەیەك، بۆ تێگەیاندنو پێگەیاندنیان لەوانە:

أ- ناردنی (خالد بن الولید) بۆ لای (بني الحارث بن كعب) كە لە (نجران) دادەنیشت، كە لە مانگی (ربیع الثاني) ساڵی دەیەمی كۆچی دابوو، تاكو بانگیان بكات بۆ ئیسلام، پێش ئەوەی جەنگیان لەگەڵدا بكات، وە دوای ئەوەی بانگهێشتنی كردن مسوڵمان بوونو ماوەیەك (خالد) لە نێویاندا مایەوەو ئیسلامی تێگەیاندن، دوایی پێغەمبەر ﷺی ئاگادار كردەوە بە مسوڵمانبوونیان، وە دوای گەڕانەوەی (خالد) پێغەمبەر ﷺ (عمرو بن حزم)ی بۆ ناردن بۆئەوەی شارەزایان بكات لە ئیسلام(١).

ب- ناردنی (معاذ بن جبل) بۆ یەمەن، وەك ئەمیرو قازیو تێگەیەنەریان لە دینو كۆكەرەوەی زەكات لەوێ، كە هاوەڵێكی بەڕێزو زاناو تێگەیشتوو بوو بە حەرامو حەڵاڵ، وە لەكاتی بەڕێكردنیدا پێغەمبەر ﷺ چەند ئامۆژگارییو ڕێنموونییەكی كرد، كە چۆن تەعامول بكات لەگەڵ خەڵكی یەمەنو چۆن بانگەواز بۆ ئیسلام بكات، وە تێی گەیاند كە پێشەكی عەقیدەیان تێبگەیەنێ،

---

١) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص(٣٤٥-٣٤٨).

پاشان عیبادەت، وە پلەپلەیی لە مسوڵمانبوونیاندا ڕەچاو بکات، وەك (بـخاري)[١] گێڕاویەتـەوە.

ج- ناردنی (أبو موسى الأشعري) بۆ یەمەن، پێغەمبـەر ﷺ ئەویشـی هـەر نـارد بـۆ لایەکەی دیکەی یەمـەنو ئامۆژگـاریو ئەویشـی کـرد، بۆئـەوەی لەگـەڵ (معـاذ)دا بتوانن ئەركی بانگەوازی کردنەکەیان بەباشی ئەنجام بـدەنو بەرهـەمی هـەبێ، پێـی گوتن: **{يسّـرا ولا تُعسِّـرا، وبشِّـرا ولا تُـنفِّــرا، وتطــاوعا}** رواه البخـاري[٢]، واتـە: دینـداریی ئاسـان بکـەنو وەزەحمـەتی مەخـەن، وە دڵـی خـەڵك خۆشـبکەنو مەیانسڵەمێننەوە، وە پێکەوە هاوکار بن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

١) بڕوانە: (صحيح البخاري): ٤٣٤٧.
٢) صحيح البخـاري: ٤٣٤٤ و ٤٣٤٥.

www.alibapir.com

# (حجة الـوداع) حـەجـی مـاڵـئاوایی

پێغەمبەر ﷺ لەژیانیدا یەك جار حەجی کردوە، وە لە حەجەکەیدا ئاماژەی بەوە کردوە، کە ئەوە دواجارە مسولمانان بەو شێوە گشتیە ببینێ‌و فەرموویەتی: **{أيها الناس إسمعوا قولي، فأني لا أدري لعلّي لا ألقاكم بعد عامي هذا بهذا الموقف أبداً}**[1]، واتە: ئەی خەڵکینە! گوێتان لە قسەم بێ، چونکە من نازانم ڕەنگە دوای ئەم ساڵەم هەرگیز لەم شوێنە پێتان نەگەمەوە... وە کۆتا حەجیشی بوو.

(إبن هشام)[2] دەڵێ: پێنج شەو مابوون لە مانگی (ذو القعدة) لە ساڵی (دەیەم)ی کۆچیدا پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەوە بەمەبەستی (حەج) کردن بەرەو مەککە بەڕێکەوت‌و لەکاتی وتاری (حجة الوداع)دا زیاتر لە سەد هەزار مسولمانی لە خزمەتدا بوون لە پیاوو ئافرەت، دوای ئەوەی کە دەگەنە مەککەو پێغەمبەر ﷺ حەج دەکات، بەمەبەستی شارەزابوون‌و تێگەیاندنی مسولمانان لە چۆنیەتی حەجکردن، چەند جار لە مسولمانان دووبارە دەکاتەوەو پێیان دەڵێ: **{لتأخذوا مناسككم، فأني لا أدري لَعلّي لا أَحجُ بعد حَجّتي هذه}** رواه مسلم[3]، واتە: خواپەرستییەکانی حەج‌و عومرەتانم لێوەربگرن، چونکە من نازانم ڕەنگە پاش ئەم حەجەم هیچ حەجی دیکە نەکەم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ حەجێك بەو شێوەیە، کە خوا پێویستی کردوەو بە ڕێك‌وپێکی بە مسولمانان دەکات‌و وتارێکی زۆر گرنگ‌و مێژووییدا، کە کۆمەڵێك هێڵی گشتی‌و بنەمای گرنگ‌و گەورەی ئیسلامەتیی تێدا خستنەڕوو.

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٣٥٣).
٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٣٥١).
٣) صحيح مسلم: ٣١٢٤.

## وتـاره گرنگ‌و مێژووییـەکەی پێغـەمبـەر ﷺ لە حەجی ماڵئاواییـدا

جا ئێمە سـەرەتا دەقی[1] وتارەکە دێنین، پاشان تەرجەمەی دەکەین:

**أيها النـاس!**

**اسـمعوا قولـي، فاني لا أدري لَعلِّي لا ألـقاكم بعد عامي هذا بهذا الـموقف أبداً، أيها النـاس ان دِمـاءكم وأمـوالكم علـيكم حـرامٌ الـى أن تلْـقَوا ربكـم كَحـرْمَـةِ يومكم هذا وكحـرمة شهركم هذا، وإنكم سَتَلْقَوْنَ ربكم فيسألكم عن أعمالكم وقد بلَّـغتُ، فَمَنْ كـانت عنده أمـانة فَلْيـؤدّها الـى من أتـمنه عليهـا، وانَّ كلّ ربـاً موضوعٌ، ولكن لكم رؤس أموالكم لاتظـلمون ولاتظـلمون، قضـى الله أنه لا ربـا، وأن ربـا عباس بن عبدالـمطلب موضـوعٌ كلّه، وأن كل دمٍ كـان فـي الـجاهلية موضـوع، وان أوّل دِمائكم أضـعُ: دَمُ ابن ربيعـة بن الـحـارث بن عبدالـمطـلب، وكان مُسـتـرضـعاً فـي بنـي ليث فَقَتَـلَتْه هَــذيلٌ فهــو أول مـا أَبـدَأُ به من دمـاءِ الـجاهليـة.**

**أما بعـد أيها النـاس!**

**فـأن الشـيطان قد يئِسَ مـنْ انْ يُعبدَ بارضكم هـذه أبــداً ولكنــه إن يُطَــعْ فيمـا سـوى ذلـك فقد رَضيَ به مِمّا تـحـقرون من أعمـالكم، فـاحذروه علــى دينكم.**

---

١) بڕوانـە: (السيـرة النبويـة لابـن هشـام)، ج٤، ص(٣٥٣-٣٥٤)، وە بڕوانـە، صـحيح مسـلم: ١٢١٨، هەروەها (الطبـري) دەقی ئەم وتارەی هێناوە، (تأريخ الامم والـملوك)، ج٢، ص(٤٧٥).

أيـها النـاس!

إنَّ النَّسيّ زيـادة من الكفـر يُضَلُّ به الّذين كفـروا يحِلّونَه عـاماً، ويُحرِّمونَهُ عـاماً لِيُواطئوا عِـدَّة ما حرَّم الله، فَيُحِلّوا ما حَرَّم الله ويُحرِّموا ما أحل الله، وانَّ الزمـان استدار كهيئته يوم خلق الله السموات والأرض وان عِدَّة الشـهور عند الله اثنا عشر شهراً منها اربعة حرُمٌ، ثلاثة متوالية و رجب مُضر الّذي بين جمادي و شعبان.

أما بعد أيها النـاس!

فأن لكم على نسائكم حقاً ولهنَّ عليكم حقاً، لكم عليهن أن لايوطِئْن فرُشكم أحداً تكرهونَهُ، وعليهن أن لا يأتين بِفاحشةٍ مُبيِّنةٍ، فأنْ فَعَلْنَ فأن الله قد أَذِن لكم أن تهجروهن في المضاجع، وتضربوهن ضَرْباً غير مبرِّحٍ، فأن انتهين فلهن رزقهن وكسوتهنَّ بالمعروف، استوصوا بالنساءِ خيراً، فأنهن عِندكُمْ عوان لايملكْنَ لأنفسهنَّ شيئاً وانّكم إنّما أخذتموهُنَّ بأمانة الله واستَحْلَلْتُمْ فروجهُنَّ بكلمات الله.

فاعقلوا يا أيها الناس قولي، فأني قد بلَّغْتُ، وقد تركْتُ فيكم ما ان اعتصمتُمْ به فَلَنْ تَضِلّوا أَبداً أمراً بَيّناً: كتاب الله وسنة نبيِّه.

أيها النـاس!

اسمعوا قولي واعقلوُه يَعْلَمُنَّ أنَّ كلَّ مسلمٍ أخٌ للمسلم، وأنَّ المسلمين إخوة، فَلا يَحِلُّ لامريءٍ مسلم من أخيه الاّ ما أَعطاه عن طِيبِ نفسٍ منه، فلا تظلمنَّ أنفسكم، اللّهم هل بلَّغتُ؟!

قال ابن اسحاق (فذكر لي أن الناس قالوا: اللّهم نَعَمْ، فقال رسول الله ﷺ: اللّهمَّ أشهَدْ!).

www.alibapir.com



واتە: ئەی خەڵکینە! قسەکانم ببیستن، چونکە نازانم ڕەنگە پاش ئەم ساڵەم هەرگیز لەم شوێنە (عەرەفات) پێتان نەگەمەوە!

هـۆ خەڵکینـە!

بێگومان خوێنتانو سامانتان لێتان قەدەغەیە، هەتا دەگەنە پەروەردگارتان، وەك قەدەغەبوونی ئەمڕۆژەتانو قەدەغەبوونی ئەم مانگەتان، بێگومان ئێوە دەگەنە پەروەردگارتان، لەبارەی کردەوەکانتانەوە لێتان دەپرسێ، جا ئەوە پێم ڕاگەیاندن: هەرکەسێك سپاردەیەکی لەلایە با بیداتەوە دەست ئەو کەسەی کە پێی سپاردوە.

وە هەموو سوود (ڕیبا)یەك لابراوە، بەڵام سەرمایەکانتان هی خۆتانن، نە ستەم بکەنو نەستەمتان لێبکرێ، خوا بڕیاری داوە کە سوود خۆریی نەمێنێ، وە سوودی عەبباسی کوڕی عەبدولـموتتەلیب هەمووی لابراوە، وە هەر خوێنێکی ڕۆژگاری نەفامیێتی لابراوە، وە یەکەمین کە لە خوێنەکانتان لایدەبەم: خوێنی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدولـمتتەلیبە کە لە هۆزی (بـني ليـث) بەدایەن درابوو هۆزی (هـذيل) کوشتی، ئەوە یەکەمین خوێنی سەردەمی نەفامێتییە کە لێیەوە دەست پێدەکەم! ئنجا دوایی ئەی خەڵکینە! بەڕاستی شەیطان بێ هیوابووە کە هەرگیز لەم سەرزەمینەتاندا بپەرسترێ، بەڵام بەوە ڕازی دەبێ کە لە شتی دیکەدا بەقسەی بکرێ، لەو کردەوە خراپانەتان کە بەکەمیان دەگرن، جا لەبارەی ئایینتانەوە لێی وریابن!

هۆ خەڵکینە!

بێگومان دواخستنی مانگە جەنگ تێدا حەرام کراوەکانو دەستکاریی کردنیان کوفرێکی زیادەیە کە کافرەکانی پێ گومڕا دەبن کە ساڵێك حەڵاڵی دەکەنو ساڵێك قەدەغەی دەکەن، تاکو بکەوێتە بەر ئەو مانگە خوا حەرامی کردوەو سەرەنجام ئەوەی خوا قەدەغەی کردوە حەڵاڵی بکەنو ئەوەی خوا حەڵاڵی کردوە قەدەغەی بکەن، وە ڕۆژگار (ساڵو مانگەکان) گەڕاوەتەوە سەر ئەو حاڵەتە ئاساییەی کە خوا ئاسمانەکانو زەوی تێدا هێناونە دی، وە ژمارەی مانگەکان لەلای خوا (دوازدە

مانگن) چواریان حەرامن، (واتە: جەنگ تێدا کردنیان قەدەغەیە) سێیان لەدوای یەکن (محرم، صفر، ربیع الأول) وە (رجب)ی (مُضَر)، کە دەکەوێتە نێوان (جمادي)و (شعبان)ەوە.

ئنجا دوایی، هۆ خەڵکینە!

بێگومان مافتان بەسەر ژنەکانتانەوە هەیەو ئەوانیش مافیان لەسەرتانە: مافتان لەسەریانە کە هیچ کەس فەرمووی ماڵەوەو سەرجێگاتان نەکەن کە حەز بەچارەی نەکەن، وە لەسەریان پێویستە کە کاری ناقۆڵای ئاشکرا (واتە: سەرپێچی مێرد) نەکەن، وە ئەگەر کردیان ئەوە خوا مۆڵەتی داون (پاش ئامۆژگاریی کردنو بێ سوود بوونی) کە واز لەسەر جێگایان بهێنن (ئەگەر ئەمیش دادی نەدا) بە لێدانێکی نارەحەت نەکەرو بریندارنەکەر لێیان بدەن، جا ئەگەر وازیان لە یاخیبوون هێنا، ئەوە مافیانە کە بژێوو پۆشاکیی باوو پەسندیان بۆدابین بکرێ.

وە لەگەڵ ژناندا باش بن چونکە لەبەردەستتان دیلنو هیچیان پێناکرێ (واتە: ژنان مل بەملەیان لەگەڵ پیاوان پێناکرێ) وە ئێوە وەك سپاردەی خوا ئەوانتان هێناوە وە بە وشەکانی خوا داوێنیانتان حەڵاڵ کردوون.

خەڵکینە لە قسەکانم تێبگەن!

ئەوە پێم ڕاگەیاندن، وە شتێکم لەنێودا جێهێشتوون کە ئەگەر دەستی پێبگرن هەرگیز ون نابن، شتێکی ڕوونە: کتێبی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی!

هۆ خەڵکینە!

قسەکانم ببیستن لێیان تێبگەن! بزانن، کە هەموو مسوڵمانێك برای مسوڵمانە، وە مسوڵمانان بران، (وە ئافرەتان خوشکنو پیاوانو ئافرەتان خوشكو بران).

جا مسوڵمان هیچ شتێکی برایەکەی بۆ ڕەوا نیە (ماڵو سامان) مەگەر بەڕەزامەندیی خۆی بیداتێ، دەجا ستەم لەخۆتان مەکەن، ئەی خوایە: ئایا گەیاندم؟!

www.alibapir.com


(إبن إسحاق) گووتویەتی: بۆم باسکراوە، کە خەڵکەکە گوتویانە: ئەی خوایە! بەڵێ (گەیاندی)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی خوایە شایەد بە!

هەروەها (مسلم)[1] هێناویەتی، کە پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی وتارەکەیدا فەرموویەتی: **{وأنتم تسألوني، فما أنتم قائلون؟! قالوا: نشهدُ أنك بلّغتَ وأدّيتَ ونصحتَ، فقال بأصبعِهِ السبّابة يرفعها الى السّماءِ وينكُتُها الى الناس اللّهم اشهد! اللّهم اشهد! ثلاث مرات}**، واتە: جا ئێوەش لەبارەی منەوە لێتان دەپرسرێ، ئایا چی دەڵێن؟!

گوتیان: شایەدیی دەدەین، کە گەیاندووتەو ئەنجامت داوەو دڵسۆزییت نواندوە، ئەویش پاش ئەوەی سێ کەرەتان پەنجەی شایەدمانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو، ئاماژەی بەرەو لای خەڵکەکە پێکردو، فەرمووی: ئەی خوایە شایەد بە! ئەی خوایە شایەدبە!

شایانی باسیشە، کە ئەم ڕستە قورئانییەش هەر لەهەمان ئەو ڕۆژو کاتو ساتو شوێنەدا هاتۆتە خوارێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وتارە گرنگو گشتگیرەی تێدا داوە.

﴿... ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ...﴾ (٣) المائدة، واتە: ئەمرۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواوکردنو چاکەی خۆم لەسەرتان تەواو کرد، وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆتان پەسندکرد.

وە لەمبارەشەوە کۆمەڵێك فەرموودە هەن، کە ئەمە یەکێکیانە:

---

٢) صحيح مسلم: ٢٩٤١.

(جاء رجلٌ من اليهود الى عمر بن خطاب، فقال: يا أمير المؤمنين! إنكم تقرؤن آيةً في كتابكم لو علينا معشر اليهود نزلت، لأتخذنا ذلك اليوم عيداً، قال: وأيُّ آيةٍ؟ قال: قوله: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى﴾ فقال عمر: والله إني لأعلم اليوم الذي نزلت على رسول الله ﷺ والساعة التي نزلت فيها على رسول الله ﷺ: عَشيَّة عرفة، في يوم الجمعة) رواه أحمد والبخاري ومسلم وغيرهم(١)، واتە: پیاوێکی جوولەکە هاتە لای عومەری کوڕی خەتتاب، گوتی، ئەی ئەمیری بڕواداران! ئێوە ئایەتێك لە کتێبەکەتاندا دەخوێننەوە، کە ئەگەر بۆ سەر ئێمەی کۆمەڵی جوولەکە هاتبایە خوار ئەو ڕۆژەمان دەکردە جەژن، گوتی: کام ئایەت!؟ گوتی: ئەوە کە دەڵێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى ...﴾ ئەویش گوتی: بە خوا من دەزانم لە چ ڕۆژێك دابەزیە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، وە لە چ سەعاتێکدا دابەزیە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ: ئێوارەی ڕۆژی عەرەفە لە ڕۆژی جومعەدا.

پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە هەندێك لە شارەزایانی هاوەڵان لەم ڕستە قورئانییەوە نزیکبوونەوەی کاتی مردنی پێغەمبەر ﷺ حاڵی بوونە، چونکە مادام ئاین و بەرنامەو پەیامی خوا تەواو بووبێ، دیارە کارو ئەرکی پێغەمبەریش تەواو بووەو بەکۆتا هاتوە.

١) صحيح البخاري: ٤٦٠٦، وە: (المصباح المنير..)، ص(٣٥٤).

## ناردنی سوپایەك بە فەرماندەیەتی ئوسامەی كوڕی زەید بەرەو فەلەستین[1]:

پێغەمبەر ﷺ پاش گەڕانەوەی لە سەفەری حەجیماڵئاوایی پاش ماوەی مانگی (ذي الحجة ومحرَّم وصفر) لە مەدینە بوو، وە خەڵكی ئاگاداركردەوە كە بەرەو شام خۆیان ئامادە بكەن، ئەوە بوو سوپایەكی پێكهێناو (أُسامة بن زید بن حارث)ی كردە فەرماندەی، كە ئەو كاتە گەنجێكی هەژدە تا بیستساڵیی بوو، وە فەرمانی پێكرد، كە بچێتە سنوورەكانی (البلقاء)و (الداروم) لەسەر زەمینی فەلەسطین.

شایانی باسیشە كە پاش ئامادەكردنی ئەو سوپایە پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەوێتە نەخۆشی مەرگەوە، بۆیە سوپایەكە هەر لە قەراغ شاری مەدینە دەمێننەوە، بەلاّم پاش كۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺو هەڵبژێرانی (أبوبكر الصدیق) -خوا لێی ڕازی بێ-، بە یەكەمین خەلیفەی پێغەمبەر، هەرچەندە زۆرێك لە مسوڵمانان ڕایان لەسەر نابێ، بەلاّم ئەبووبەكر ئەو سوپایە بەڕێ دەكات بۆ شوێنی دیاریكراوو، دواییش دەردەكەوێ كە چوونی ئەو سوپایە لەو كاتە ناسكەدا بەرەو سەرزەمینی ڕۆم چەند حیكمەتو ئامانجی پێكاوە، گەورەترینیان ئەوە بوو، كە دوژمنانی لەبۆسەدای مسوڵمانان، بزانن كە مسوڵمانان بەهۆی مردنی پێغەمبەرەكەیانەوە نەك هەر بێهێز نەبوون هی تەماع تێكران نین، بەڵكو زۆریش بەهێزو پێزنو دەتوانن لەدەرەوەی سنووری دەوڵەتەكەشیان چالاكی سەربازیی ئەنجام بدەن!

---

١) (السیرة النبویة لابن هشام)، ج٤، ص(٣٥٥).

## نەخۆشیی پێغەمبەر ﷺ و دوا هەفتەی کۆچی دوایی تێداکردنی

بەپێی ئەوە دەردەکەوێ، کە نەخۆشییەکەی پێغەمبەر ﷺ یەك هەفتەی خایاندوە، چونکە دووشەممەی مانگی (ربیع الأول)ی ساڵی (یازدە)ی کۆچی نەخۆش کەوتوەو بۆ دووشەممەی دواتر -یانی دوای یەك هەفتە- پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردوە.

جا ئێمە هەوڵدەدەین لە چەند بڕگەیەکدا بەکورتی باسی نەخۆشییەکەی‌و چەند فەرمایشتێك کە لەوکاتەدا فەرموونی‌و، چۆنیەتی وەفاتکردنەکەشی بکەین:

**یەکەم:** وەك (ابن هشام)[١] باسی کردوە: (أبو مويهبة)، کە یەکێکە لەو کۆیلانەی، کە پێغەمبەر ﷺ ئازادی کردوە، وە عەرەب پێی دەڵێن (مولى) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەنیوەی شەوێدا لەدوای ناردم‌و لەگەڵ خۆی بردم بۆ گۆڕستانی (بقيع الغرقد)، کە لە تەنیشت مزگەوتی پێغەمبەرە، زۆر بۆیان پاڕایەوەو داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کردن، دوایی گەڕایەوە ماڵێ، وە بۆ بەیانییەکەی نەخۆش کەوت.

**دووەم:** (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ[٢]: ئەو شەوەی، کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ گۆڕستانی (بقيع)و هاتەوە، کە بەیانییەکەی بینیم، گوتم: ((وا رأساه))، واتە: ئای سەرم دێشێ!

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٣٧٨، ٣٧٩).

٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص(٣٧٩).

ئەویش فەرمووی: {**بل أنا والله يا عائشة وا رأساه**}، واتە: بەڵكو من بە خوا ئەی عائیشە سەرم دێشێ، ئیدی هەر ئەو نەخۆشییە بوو کە بەهۆیەوە وەفاتی کرد.

دیارە پێغەمبەر ﷺ هەر شەوە لەلای یەکێك لە خێزانەکانی بووەو دادگەرییەکی تەواوی لە بەیندا کردوون، ئەو دادگەرییەی کە بە ئینسان دەکرێ، بەڵام لەکاتێکدا، کە نەخۆش کەوتو نەخۆشییەکەی قورستر بوو، وەك عائیشە -ڕەزای خوای لێبێ- دەڵێ: ئەوکات لە ماڵی (میمونة) بوو -ڕەزای خوای لێبێ-، پێغەمبەر ﷺ هەموو خێزانەکانی بانگ کردنو داوای لێکردن، کە مۆڵەتی بدەن، کە لە ژوورەکەی مندا خزمەتی بکرێ وەك نەخۆشێك، ئەوانیش ئیزنیاندا[(١)]، بێگومان عائیشە تەمەنی کەمتر بووەو چاکتر توانیویەتی خزمەتی بکاو بەسەری ڕابگات، لەوانەیە هەر لەبەرئەوە بووبێ داوای کردوە بە نەخۆشی لە ماڵی ئەو بێ.

**سێیەم:** کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ نەخۆشییەکەی زۆر توندبوو فەرمووی: ئاوی حەوت کوندە کە لە چەند بیری جیاجیا هەڵهێنجرابن، بێننو پێمدا بکەن (عائشة) دەڵێ: دوای ئەوەی کە ئەو ئاوانەمان بۆ تێکەڵ کردو لە (سەرشۆرك)ێکدا ئاوەکەمان پێدا کرد، پێغەمبەر ﷺ تەندروستی چاکتر بوو[(٢)]، وە هەرکام لە (مسلم)و (ابن هشام) هێناویانە کە[(٣)]: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا چۆ سەر مینبەرو دانیشت، یەکەم شت کە گوتی، ئەوە بوو کە دووعای بۆ بەشداربوانی غەزای ئوحود کردو داوای لێخۆشبوونی بۆ لە خوا کردن، دوایی فەرمووی: بەندەیەك لە بەندەکانی خوا، لەلایەن خواوە سەرپشك کراوە لەنێوان دونیاو گەیشتن بەخۆیدا، ئەو بەندەیەش گەیشتن بەخوای هەڵبژاردوە، (أبو

---

١) صحيح البخاري: ٤٤٤٢، ومسلم: ٩٣٧.
٢) صحيح البخاري: ٤٤٤٢.
٣) (السيرة النبوية...)، ج٤، ص(٣٨٤)، وە: (صحيح مسلم): ٦١٢٠.

بکر) لەو قسەیە گەیشتو زانی مەبەستی وەفاتی خۆیەتیو گریا، وە پێغەمبەر بەوبۆنەیەوە دەربارەی (أبو بکر)، وەك (ابن هشام) هێناویەتی، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **لا أعلم أحداً كان أفضل في الصحبة عندي يداً منه}**، وە مسلم هێناویەتی، کە دەفەرموێ: **{إنّ أمنَّ الناس عليّ في ماله و صحبته أبو بكر}** رواه مسلم(١)

پێغەمبەر ﷺ ڕۆژانی پێشوو، کە نەیدەتوانی بچێ پێشنوێژیی بۆ خەڵك بکات فەرمووی: بە (أبوبکر) بڵێن با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، **{مُرُوا أبا بكر فليصل بالناس}** رواه مسلم(٢).

عائشە دەڵێ: منیش پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! (أبو بکر) ئینسانێکی دڵ نەرمو دڵ ناسکەو دەنگی نزمەو، کە قورئان دەخوێنێ زۆر دەگریێ، بەڵام پێغەمبەر دیسان فەرمووی: پێی بڵێن نوێژیان بۆ بکات.

ڕۆژی دووشەممەو لە دوارۆژی نەخۆشییەکەی پێغەمبەردا ﷺ، لەکاتی نوێژی بەیانیدا، کە (أبو بکر) پێشنوێژیی بۆ مسوڵمانان دەکرد، لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ هاتە ژووری مزگەوتو خەڵکەکە، کە زانییان، دڵخۆش بوونو خرۆشان، (أبو بکر)یش کشایەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ چووە لای ئەبووبەکرو بە دانیشتنەوە نوێژی دابەستو پێشنوێژیی بۆکردنو ئەبووبەکر بەپێوە ئیقتیدای بە نوێژی پێغەمبەر ﷺ کردو مسوڵمانانیش ئیقتیدایان بە نوێژی ئەبووبەکر کرد(٣).

**چوارەم:** یەکێکی دیکە لەو شتانەی کە (ابن هشام) هێناویەتی ئەوەیە، کە: پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نەخۆشییەکەیدا لەسەر مینبەر سەبارەت بە فەرماندەیی (أسامة) قسەی کردوەو، دوای ئەوەی کە بیستوویەتی هێندێك گوتوویانە: تەمەنی

---

١) (السيرة النبوية..)، ج٤، ص(٣٨٤)، وە: (صحيح مسلم): ٦١٢٠.
٢) صحيح مسلم: ٩٣٩ .
٣) (صحيح البخاري): ٧١٣، وە: (صحيح مسلم): ٩٤٢و ٩٤٣.

کەمەو کراوەتە فەرمانددەی لەشکرێك، کە زۆر لە هاوەڵانی کۆچکەری پێشینی تێدان، لەوبارەوە فەرموویەتی: ئەگەر ڕەخنە لە فەرماندەیی (أسامة) بگرن، ڕەخنەتان لە فەرماندەیی بابیشی گرت، بەڵام (أسامة)ش شایستەیەو بابیشی شایستەبوو، دوای ئەوە جەیشەکە بەڕێکەوت و ڕێی گرتەبەر، تا گەیشتە (جرف) لەوێ مانەوەو چاوەڕوانی ئەنجامی نەخۆشیی پێغەمبەریان دەکرد[1].

**پێنجەم:** پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نەخۆشیی سەرەمەرگیداو لەو ڕۆژەدا، کە داوای لێبووردنی بۆ هاوەڵانی ئوحود کرد، ئامۆژگاریی هاوەڵە کۆچکەرەکانی کرد دەربارەی پشتیوانان و فەرمووی: ئەوانە پشتیوانی من بوون و پشتگیریی منیان کردوە، ئاگاتان لێیان بێ، پاداشتی چاکەکانیان بەچاکە بدەنەوە، وە لە کەم وکوڕییەکانیان ببوورن، ئەوان جێی متمانەو نهێنیی من بوون، وەك (بخاري) هێناویەتی: **{...أوصيكم بالأنصار فإنهم كرشي وعيبتي}**[2].

**شەشەم:** (جابر بن عبدالله) -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: سێ ڕۆژ پێش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ لێم دەبیست دەیفەرموو: **((لا يموتن أحدكم إلا وهو يحسن بالله الظن))**[3]، واتە: با یەکێکتان نەمرێ مەگەر گومانی بەرانبەر بە خوا چاك بێ، بەڵێ یەکێك لە سیفەتەکانی ئینسانی مسوڵمان ئەوەیە، کە لەکاتی سەرەمەرگدا گومانی چاك بێ بەخوا، وە ئومێدی بەهێزبێ بەخوا کە خوا لێی خۆش دەبێ، نەك گومانی خراپ بێ و بێئومێدبێ.

**حەوتەم:** (عائشة) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نەخۆشییەکەیداو چەند ڕۆژێك پێش وەفاتی فەرمووی: **{قاتل الله اليهود اتخذوا قبور أنبيائهم**

---

١) (السيرة النبوية...)، ج٤، ص(٣٨٤).
٢) (صحيح البخاري): ٣٧٩٩.
٣) (صحيح مسلم): ٧١٥٨.

www.alibapir.com


**مساجد}**[١]، واتە: خوا جوولەکەکان لەبەین بەرێو بیانکوژێ، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت، لە ڕیوایەتێکی دیدا هاتوە: کە (عائشة) -خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویەتی: **{حذراً أن يفعلوه}**، واتە: وەکو ترس دانە بەر مسولْمانان بۆئەوەی ئەوانیش وانەکەن، یانی مسولْمانانیش گۆڕی پێغەمبەر ﷺو غەیری ویش نەکەنە مزگەوت، یاخود ڕووی تێنەکەن، یان لێی نەپاڕێنەوە، وە خۆیان تووشی کوفرو شیرك نەکەن، چونکە هەموو ژیانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبووە، کە خەلْکی بانگ کردوە بۆ خوا بەیەککگرتن (توحيد)و هەولْیداوە خەلْکی دوور بخاتەوە لە کوفرو شیرك.

**هەشتەم:** (عبدالله بن عباس) دەگێڕێتەوەو دەلْێ: (كَشَفَ رسولُ الله ﷺ السِّتْرَ وَرَأْسُهُ معصوب في مرضه الذي مات فيه، فقال: **{اللّهم هل بلغت، ثلاث مرات، إنه لم يبق من مبشرات النبّوة إلاّ الرؤيا الصالحة يراها العبد الصالح أو تُرى له}**[٢]، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیی مەرگیدا پەردەی لادا، کە سەری خۆی پێچابوو، سێ جاران فەرمووی: ئەی خوایە ئایا گەیاندم؟ بێگومان لە دلْخۆشکەرەکانی پێغەمبەرایەتی بێجگە لە خەونی باش هیچ شتێك نەماوە، کە پیاوی باش خۆی دەیبینێ یان پێوەی دەبینرێ، کە دیارە ئەوەش ئاگادارییەکە بۆ مسولْمانان، کە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ وەحی نامێنێو تاکە کلاوڕۆژنەیەکمان، کە بۆ بمێنێ بەرەو خوای پەروەردگار تەنیا خەونە، بەلاّم لەگەلْ ئەوەشدا خەون ناکرێتە بەلْگەی شەرعیی، وەك زانایان دەلْێن: وە بێگومان ئەو خەونەی، کە پێغەمبەری ﷺ تێدا دەبینرێ، دلْخۆشکەرترە، چونکە دەفەرموێ: **{من رآني في المنام فقد رآني، فأن الشيطان**

---

١) (صحيح البخاري): ٤٣٧.
٢) صحيح مسلم: ١٠٧٥.

**لايَتَمَثَّلُ بي))**[1]، واتە: هەرکەسێك منی لە خەودا بینی ئەوە منی بینیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ خۆی بێنێتە سەر شێوەی من.

**نۆیەم:** عائیشە – خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ بە ماوەیەك پێش گیان دەرچوونی، جارجار دەستی دەخستە نێو ئەو ئاوەی، کە لە دەفرێکدا لە پێشی بوو، دوایی بە دەموچاوی خۆیدا دەهێناو دەیفەرموو: **{لا إله إلاّ الله، إنّ للموت سكراتٍ}**، واتە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، بێگومان مردن نارەحەتیی هەن.

هەروەها عائیشە لەسەر گێڕانەوەی قسەکەیدا، کە وەسفی چۆنیەتی گیان سپاردنی پێغەمبەری خوای تێدا دەکات بەردەوام دەبێو دەڵێ: **{ثم نصبَ يَدَهُ فَجَعَلَ يقولُ: في الرفيق الأعلى، حتى قُبِضَ ومالَتْ يَدَهُ}**[2] رواه البخاري، واتە: پاشان دەستی چەقاندو بەرەو سەرێ بەرزی کردەوەو دەیفەرموو: لەگەڵ هاوەڵانی سەرەوە، هەتا گیانی کێشراو دەستی شل بووو لاربۆوە.

دیارە مەبەست لە (الرفيق الأعلى) فریشتەکانی ئاسمانن، وەك ڕواڵەتی فەرمایشتەکە دەیگەیەنێو زانایانیش لەوبارەوە یەکڕان.

شایانی باسیشە کە ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ گیانی موبارەکی تێدا سپاردوە ڕۆژی دووشەممە بووە، پێش نیوەڕۆیەکەی، ڕێکەوتی: (١٢)ی (ربيع الأول)ی ساڵی یازدەمینی کۆچی، بەرانبەر بە: (٨ / ٦ / ٦٣٢ز)، کەواتە تەمەنی موبارەکی (٦٣) ساڵ بوو، وەك عائیشە گوتوویەتی: ((ان رسول ﷺ الله تُوفِّي وهو ابن ثلاث وستين))[3].

---

١) صحيح البخاري: ٦٩٩٤، و(صحيح مسلم): ٥٨٧٩.
٢) صحيح البخاري، باب مرض النبّي: ٤٤٤٩.
٣) صحيح البخاري: ٤٤٦٦.

**دەیەم:** مسوڵمانان بە بیستنی ئەو هەواڵە یەکجار دڵتەنگو نارەحەت بوونو، خەندە لە لێوانیان باری کردو، خەمو پەژارەو پەرۆشو گریان جێی گرتەوە.

عومەری کوڕی خەتتاب، کە ئەوەی بیست باوەڕی نەکردو، گوتی: هێندێک کەس، کە گومان دەبا پێغەمبەر ﷺ مردبێ، ئەوە وانیە، ئەو وەك (مووسا)یە، کە چل ڕۆژ دوورکەوتۆتەوە لە قەومەکەیو دوایی گەڕاوەتەوە نێویان، سوێند بە خوا پێغەمبەریش دەگەڕێتەوەو دەستو پێی ئەوانەش دەبڕێ، کە گومانیان وابووە کە مردوە[١].

دوایی کە ئەبووبەکر هەواڵەکەی بیست، هات بۆ مزگەوتو چوو بۆ لای (عائشة)ی کچی، کە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە چاوی بە پێغەمبەر ﷺ کەوت، ماچی کردو گریا، دوایی چۆ نێو خەڵکەکەو بینی عومەر قسە دەکاو توندە، گوتی: ئەی عومەر دانیشە، بەڵام ئەو بێدەنگ نەبوو، دوایی ئەبووبەکر وتارێکی بۆ خەڵکەکەدا، سەرەتا حەمدو سوپاسی خوای کرد، دوایی گوتی: {أما بعد: من كان منكم يعبد محمداً، فأن محمداً قد مات، ومَن كان يعبد الله فأن الله حيّ لا يموت، قال الله: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران}[٢]، واتە: ئنجا دوایی: هەرکامێکتان موحەممەدی ﷺ دەپەرست، ئەوە موحەممەد مردوە، هەر کەسێکیشتان خوا دەپەرستێ، ئەوە خوا زیندوویەو نامرێ، خوا فەرموویەتی: وە موحەممەد جگە لە پێغەمبەرێك نەبووە، کە لە پێغەمبەرانی دیکەش پێش وی تێپەڕبوون، جا ئایا ئەگەر هاتو مرد یان کوژرا، لەسەر پاژنە پێیەکانتان پاشگەز

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٤، ص(٣٨٩).

٢) صحيح البخاري: ٤٤٥٣-٤٤٥٤.

دەبنەوەو؟! وە هەرکەسێکیش لەسەر پاژنەکانی هەڵگەڕێتەوە، هیچ زیان لە خوا نادات، وە خوا لەمەودوا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە.

بەو شێوەیە ئەبووبەکر توانی هاوسەنگیی بگێڕێتەوە بۆ عومەرو زۆر لە هاوەڵانی بەڕێز، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، کە بە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵتەنگو نیگەران بووبوون، ئەو پێغەمبەرە گەورەیە کە هەڵبژاردەی خوا بوو بۆ مرۆڤایەتیو ڕزگارکەری خەڵکی سەرزەوی بوو لە طاغووت پەرستیو بتو صەنەم پەرستییو، خوو ڕەوشتی خراپو، سەرگەردانییو سەرجەم نەهامەتییەکانی ژیانیان، بەرەو یەکتاپەرستییو سیفەتە بەرزەکانو بەختەوەریی دنیاو دوارۆژیان.

# میراتی پێغەمبەر ﷺ

ئەوەی کە لە دوای پێغەمبەر ﷺ لە ماڵو سامان بەجێما، واتە: میراتەکەی، بریتی بوو لە:

١) ئێسترێکی سپی لەگەڵ چەکەکەی.

٢) پارچە زەوییەك کە کردبووی بە صەدەقە.

٣) زرێیەك، کە لە ڕەهنی جوولەکەیەکدا بوو لەبری سی ڕبە (صاع) جۆ، وەك (بخاري) لە عائیشەوە گێڕاویەتەوە، کە گوتوویەتی[1]: (توفي النبيّ ﷺ ودرعه مرهونة عند يهودي بثلاثين)، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا (بثلاثين صاعاً من شعير) [2].

بەڕێزان!

بەجۆرە پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ بەیارمەتی خوا توانی لە ماوەی (٢٣) ساڵەی پێغەمبەرایەتییەکەیدا پەیامی خوا بەتەواویی بەقسەو هەڵوێستو ڕەفتار بە خەڵکی ڕابگەیەنێو، هەموو ئێشو ئازارو ناڕەحەتییەك لەو پێناوەدا لەخۆی بگرێو، کۆمەڵێك تێبگەیەنێو پێبگەیەنێ، کە بتوانن بەرنامەی خوا لەنێو خۆیانداو لە چوارچێوەی کۆمەڵگاو دەوڵەتێکی ئیسلامیی تۆکمەو پتەودا بەرجەستە بکەنو پیادە بکەنو بەزۆر شوێنی ئەم سەر زەمینەی بگەیەننو، مرۆڤایەتی بەرەو بەختەوەریی دنیاو قیامەت پەلکێش بکەنو لە تاریکاییەکان بەرەو ڕووناکیی ئیسلام، دەریانبێنن.

وصلى الله على سيدنا (محمد) وآله وصحبه وسلم .

١٦ / ٥ / ٢٠٠٦

١٩ ربيع الثاني ١٤٢٧

---

١) صحيح البخاري: ٤٤٦٧.

٢) صحيح البخاري: ٢٩١٦.

بە پێویستی دەزانم لە کۆتایی پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ باسێکی گوشراو لە بارەی شێوەو دیمەنی ڕواڵەتیی‌و خوو و ڕەوشت‌و خەسڵەتە بەرزو ناوازەو شیرینەکانییەوە بنووسم، تاکو هەردووك دیوی دیارو ئاشکراو، پەنهان‌و نەبینراوی کەسایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ مان بۆ ڕوون‌و ئاشکراتر بێت.

دیارە من باسەکەم بۆ چوار تەوەرە دابەش دەکەم: لە تەوەرەی یەکەمیان داو لەبەر تیشکی دوو دەقدا، کە یەکیان لە (علي بن أبي طالب)و ئەوی دیکەشیان لە (الحسن بن علي بن أبي طالب)ەوە گێڕراونەوە لەبارەی وەسف‌و پێناسەکردنی پێغەمبەرەوە ﷺ، بە گشتی باسی شێوەو دیمەن‌و خوو وڕەوشتی دەکەین.

وە لە تەوەرەی دووەمدا چەند دەقێکی سوننەت بە تایبەت لەبارەی دیمەن‌و شێوەی پێغەمبەری خواوە ﷺ دێنینەوە.

لە تەوەرەی سێیەمیشدا، لە حەڤدە خاڵ دا چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی خووو ڕەوشت‌و ئاکارو خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانییەوە دێنینەوە.

وە لە تەوەرەی چوارەمیش دا دیسان لە حەڤدە خاڵ داو لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی سوننەت دا باسی هەڵس‌وکەوتی ئاسایی ڕۆژانەی خوا ﷺ دەکەین:

# تـــەوەرەی یەکـــەم

## وەســـفو پێناسـەی پێغـەمبـەر ﷺ بە گـــشـتی

## جەســتەو دیمـەن، خــوو و ڕەوشـتی، هەڵسـوکەوتی

١/ (كَانَ عَلِيٌّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ إِذَا وَصَفَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: لَمْ يَكُنْ بِالطَّوِيلِ الْمُمَغَّطِ، وَلا بِالْقَصِيرِ الْمُتَرَدِّدِ، كَانَ رَبْعَةً مِنَ الْقَوْمِ، لَمْ يَكُنْ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلا بِالسَّبِطِ، كَانَ جَعْدًا رَجِلا، وَلَمْ يَكُنْ بِالْمُطَهَّمِ، وَلا بِالْمُكَلْثَمِ، وَكَانَ فِي وَجْهِهِ تَدْوِيرٌ أَبْيَضُ مُشْرَبٌ، أَدْعَجُ الْعَيْنَيْنِ، أَهْدَبُ الأَشْفَارِ، جَلِيلُ الْمُشَاشِ وَالْكَتَدِ، أَجْرَدُ، ذُو مَسْرُبَةٍ، شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، إِذَا مَشَى تَقَلَّعَ كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ فِي صَبَبٍ، وَإِذَا الْتَفَتَ الْتَفَتَ مَعًا، بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ، وَهُوَ خَاتَمُ النَّبِيِّينَ، أَجْوَدُ النَّاسِ صَدْرًا، وَأَصْدَقُ النَّاسِ لَهْجَةً، وَأَلْيَنُهُمْ عَرِيكَةً، وَأَكْرَمُهُمْ عِشْرَةً، مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ، وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ، يَقُولُ نَاعِتُهُ: لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلا بَعْدَهُ مِثْلَهُ ﷺ) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٦٣٨) وَقَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالْمُتَّصِلِ.

واتە: عـەلی خـوا لێـی ڕازی بـێ، کـە وەسـفی پێغەمبـەری خـوا ﷺی دەکـرد دەیگوت: باڵای زۆر درێژ نەبوو وە کورتە باڵاش نەبوو، لـە نێـو خەڵکیـدا میـانجیو دەستە پیاو دیار بوو، قژی سەری نە زۆر لوول بوو نە زۆریش نـەرم بـوو، بـەڵکو لـە نێوان لوولییو نەرمیی دابوو، (دەموچاوی) زۆر گەورەو هەڵاوساو نـەبوو، هـەروەها گچکەو چـەناگەو نێوچـەوان لەیـەك نـزیکیش نـەبوو، ڕووی مـەیلـەو بازنـەیی بـوو، سوورو سپی بوو، چاوی زۆر ڕەش بوون، برژانگی درێژ بـوون، ئەنـدام گـەورەو پتـەو بوو، جەستەی تووکاویی نەبوو، تەنیا لەسەر سـینگیو خـوارووی سـینگیو باسـكو لاقی موو هـەبوو، دەسـتو پـێی پتـەو و بـەخۆوە بـوون، کـە دەڕۆیشـت جەسـتەی بەرەوپێش دەچوو وەك لە لێژایی بچێتە خـوار، وە ئەگـەر ئـاوڕی دابایـەوە هـەموو جەستەی دەسووڕاند، لە نێوان هەردووك شـانی مـۆری پێغەمبەرایـەتی هـەبوو، وە

www.alibapir.com

ئەو کۆتایی پێغەمبەران بوو، لە هەمووکەس سینە دەوڵەمەندترو سەخی تر بوو، وە ڕاستبێژتر بوو، وە تەباو گونجاوترو بەڕێزوحورمەتتربوو، هەرکەسێك کتو پڕ بینیبای سامی لێدەکرد، وە هەرکەسێك ناسیبای و تێکەڵیی کردبایە خۆشیدەویست، وەسفکەری دەڵێ: نەپێشی وی نەدوای وی کەسم وەك وی نەدیوە.

وەك دەبینین لەم دەقەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب -خوا لێی ڕازی بێ- ئامۆزاو زاوای پێغەمبەری خوا، بەگشتیی وەسفو پێناسەی پێغەمبەری خوای کردوە، هەم جەستەو شێوەو دیمەنیو، هەم ڕەوشتو ئاکارو هەڵس وکەوتی.

دیارە لە دەقی دووەمدا، کە لە هەر کام لە حەسەنو حوسەینی کوڕی عەلی خوا لێیان رازی بێ دەیهێنینەوە، وردەکارییو ڕوونکردنەوەی زۆر زیاتر لەبارەی شێوەو دیمەنو هەڵسوکەوتو ئاکارو ڕەفتارو ڕەوشتو خووی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەبینینو دەبیستین:

**٢/ (عَنْ الحَسَنُ بْنُ عَلِيّ, رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما, قَالَ: سَأَلْتُ خَالِي هِنْدَ[(١)] ابْنَ أَبِي هَالَةَ, رضي الله عنه, عَنْ حِلْيَةِ[(٢)] رَسُولِ الله، وَكَانَ وَصَّافًا، وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يَصِفَ لِي مِنْهُ شَيئًا أَتَعَلَّقُ بِهِ ﷺ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ فَخْمًا مُفَخَّمًا، يَتَلَأْلأُ وَجْهُهُ تَلَأْلُؤَ القَمَرِ لَيلَةَ البَدْرِ، أَطْولَ مِنَ المَرْبُوعِ، وَأَقْصَرَ مِنَ المُشْذَّب، عَالِيَ الهَامَةِ، رَجِلَ الشَّعْرِ، إِنِ انفرقت عَقِيصَتُهُ فُرِّقَ، وَإِلاَّ فَلاَ يُجَاوِزُ شَعْرُهُ شَحْمَةَ أُذُنِهِ إِذَا هُوَ وَفَّرَهُ، أَزْهَرَ اللّونِ، وَاسِعَ الجَبِينِ، أَزَجَّ الحَوَاجِبِ، سَوَابِغَ فِي غَيْرِ قَرْنٍ، بَيْنَهُمَا عِرْقٌ يَدُرُّهُ الغَضَبُ، أَقْنَى العِرْنَيْنَ، لَهُ نُورٌ يَعْلُوهُ يَحْسَبُهُ مَنْ لَمْ يَتَأَمَّلْهُ أَشَمَّ، كَثَّ اللِّحْيَةِ، أَدْعَجَ، سَهْلَ الخَدَّيْنِ، ضَلِيعَ الفَمِ، أَشْنَبَ، مُفَلَّجَ**

---

١) هند کوڕی (أبي هالة)و دەبێتە خاڵی حەسەن چونکە برای (فاطمة)ی دایکیەتی لە (خديجة)وە خوا لێیان رازی بێ، چونکە (أبي هالة) پێش پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢) الحِلْيَةُ: من الرجُلِ، صيفَتُهُ و خِلْقَتُهُ وصورتُهُ، المعجم الوسيط، ص: (١٩٥).

الأَسنَانِ، دَقِيقَ الـمَسْرُبَـةِ، كَـانَّ عُنُقَـهُ جِيـدُ دمية فِي صَـفَاءِ الْفِضَّـةِ، مُعتَـدِلَ الـخَلْقِ، بَـادِنـاً، مُتَمَاسِـكاً، سَـوَاءَ البَطْـنِ وَالصَّدرِ، عريضَ الصـدر، بَعِـيدَ مَـا بَيـنَ الـمَنْكِبَيْنِ، ضَخْمَ الكَـرَادِيسِ، أَنْـوَرَ الـمُتَجَـرِّدِ، مَوصُـولَ مَـا بَيـنَ اللَّبَـةِ وَالسُّـرَّةِ بِشَـعرٍ يَجْـرِي كَالـخَـطِّ، عَـارِيَ الثَّـدْيَيْنِ والبطـن مِمَّا سِـوَى ذَلِكَ، أَشْـعَرَ الذِّرَاعَيـنِ وَالـمَنْكِبَيْنِ وَأَعَـالِيَ الصَّـدْرِ، طَوِيلَ الزَّنْدَيْـنِ، رَحْـبَ الرَّاحَـةِ، شَـثْنَ الكَـفَّيْنِ وَالقَـدَمَيْنِ، سَـائِلَ الأَطْرَافِ، خُـمْصَانِ الأَخْمَصَـيْنِ، مَسِـيحَ القَـدَمَيْنِ، يَنْبُـوُ عَنْهُـمَا الْـمَاءُ، إِذَا زَالَ زَالَ قَلِـعًا، يَخـطُو تَكَـفُّؤاً، وَيَمْشِـي هَوْنًـا، ذَرِيـعَ الْمِشْـيَةِ، إِذَا مَشَـى كَأَنَّمَا يَنْحَـطُّ مِنْ صَـبَبٍ، وإِذَا التَفَـتَ التَفَـتَ جَمِيـعًا، خَافِـضَ الطَّرْفِ، نَظَـرُهُ إِلَـى الأَرضِ أَطْـوَلُ مِـنْ نَظَـرِهِ إِلَـى السَّـمَاءِ، جُـلُّ نَظَـرِهِ الْـمُلاَحَظَـةُ، يَسُـوقُ أَصْحَابَهُ، وَيَبدَأُ مَنْ لَقِيَ بِالسَّـلاَمِ, قَالَ: قُلـتُ: صِـفْ لِـي مَنْطِـقَهُ: قَـالَ: كَـانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُتَوَاصِـلَ الأَحْـزَانِ، دَائِمَ الْفِكْـرَةِ، لَيسَـتْ لَهُ رَاحَـةٌ، لاَ يَتَكَلَّمُ فِي غَيـرِ حَاجَـةٍ، طَوِيـلَ السُّـكُوتِ، يَفْتَـحُ الكَـلاَمَ وَيَخْتِمُـهُ بِأَشْـدَاقِـهِ، وَيَتَكَـلَّمُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ فَصْـلاً لاَ فُـضُولَ فِيـهِ وِلاَ تَقْـصِيـرِ، دَمِـثًا لَيـسَ بَالـجَافِي، ولاَ الْمُهِيـنِ، يُعَـظِّمُ النِّعْمَـةَ وَإِنْ دَقَّـتْ، ولاَ يَـذُمُّ مِنْهَا شَيْئًا غَيـرَ أَنَّـهُ لَمْ يَكُـنْ يَذُمُّ ذَوَاقـاً، ولاَ يَمْدَحُـهُ، ولاَ تُغْضِـبُهُ الدُّنْـيَا وَمَـا كَـانَ لَـهَا، فَـإِذَا نُـوزِعَ الْحَـقُّ لَمْ يَعْـرِفْهُ أَحَـدٌ، وَلَـمْ يَقُـمْ لِغَضَـبِهِ شَـيْءٌ حتـى يَنْتَـصِـرُ لَـهُ، لاَ يَغْضَـبُ لِنَفْسِــهِ، ولاَ يَنْتَصِـرُ لَـهَا، إِذَا أَشَـارَ أَشَـارَ بِكَـفِّهِ كُلِّـهَا، وَإِذَا تَعَجَّـبَ قلبها وإذا تـحدث اتصـل بها، فضـرب براحتـه اليمنـى باطـن إبهامـه اليســرى، وإذا غضـب أَعْرَضَ وَأَشَـاحَ، وَإِذَا فَـرِحَ غَـضَّ طَـرْفَهُ، جُـلُّ ضَـحِكِهِ التَّبَسُّـمُ، وَيَفْـتَرُّ عَنْ مِثْـلِ حَبِّ الْغَمَـامِ، قَالَ: فَكَتَمْتُـهَا الْحُسَيـنِ زَمَانًا، ثُمَّ حَدَّثْـتُهُ بِـهَا فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَـبَقَنِي إِلَيْـهِ ، فَسَـأَلَهُ عَمَّـا سـألته عَنْـهُ، وَوَجَدْتُهُ قَدْ سَـأَلَ أَبَاهُ عَنْ

مَدْخَلِهِ وَمَخرَجِهِ وَمَجْلِسِهِ وَشَكْلِهِ، فَلَمْ يَدَعْ مِنْهُ شَيْئًا قَالَ الْحَسَنُ: سَأَلْتُ أَبِي عَنْ دُخُولِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: كَانَ دُخُولُهُ لِنَفْسِهِ، مَأذُونٌ لَهُ فِي ذَلِكَ، فَكَانَ إِذَا أَوَى إِلَى مَنْزِلِهِ جَزَّأَ دُخُولَهُ ثَلاَثَةَ أَجزَاءٍ: جُزْءٌ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ, وَجُزْءٌ لِنَفْسِهِ، ثُمَّ جَزَّءَ جُزْأَهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ، فَيَرُدُّ بِذلِكَ عَلَى العَامَّةِ وَالْخَاصَّةِ، وَلاَ يَدَّخِرُ عَنْهُمْ شَيْئًا، فَكَانَ مِنْ سِيرَتِهِ فِي جُزْءِ الأُمَّةِ، إِيثَارُ أَهْلِ الفَضْلِ بِإِذْنِهِ، وَقِسْمَتُهُ عَلَى قَدْرِ فَضْلِهِمْ فِي الدُّنْيَا، فَمِنْهُمْ ذُو الْحَاجَةِ، وَمِنهُمْ ذُو الحَاجَتَيْنِ، وَمِنْهُمْ ذُو الْحَوَائِجِ يَتَشَاغَلُ بِهِمْ، وَيُشْغِلُهُمْ فِيمَا أَصْلَحَهُمْ وَالأُمَّةَ، مِنْ مَسأَلَتِهِ عَنْهُمْ وَإِخْبَارِهِمْ بِالَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ، وَيَقُولُ: لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، وَابلِغُونِي حَاجَةَ مَنْ لاَ يَستَطِيعُ إِبْلاَغَهَا، فإِنَّه مَنْ أبلَغ سلطاناً حاجة من لا يستطيعُ إبلاغها ثَبَّتَ اللَّهُ قَدَمَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يُذْكَرُ عِنْدَهُ إِلاَّ ذَلِكَ، وَلاَ يُقْبَلُ مِنْ أَحَدٍ غَيْرُهُ، يَدْخُلُونَ عَلَيْهِ رُوَّادًا، وَلاَ يَفْتَرِقُونَ إِلاَّ عَنْ ذَوَاقٍ، يَخْرُجُونَ أَدِلَّةً على الخير, قَالَ: قُلتُ لَهُ: أَخْبِرْنِي عَنْ مَخْرَجِهِ كَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ فِيهِ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَخْزُنُ لِسَانَهُ إِلاَّ فِيمَا يَعنِيهِ، وَ يؤلِّفهُم ولا يُغرِّقهم، وَيُكْرِمُ كَرِيمَ كُلِّ قَومٍ، وَيُوَلِّيهِ عَلَيْهِمْ، وَيَحْذَرُ النَّاسَ وَيَحتَرِسُ مِنْهُمْ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَطْوِيَ عَنْ أَحَدٍ بِشْرَه وَ خُلُقَهُ، وَيَتَفَقَّدُ أَصْحَابَهُ، وَيَسْأَلُ النَّاسَ عَنْ مَا فِي النَّاسِ، وَيُحَسِّنُ الْحَسَنَ وَيُقَوِّيهِ، وَيُقَبِّحُ الْقُبْحَ وَيُوهِنُهُ، مُعتَدِلُ الأَمرِ غَيرُ مُختَلِفٍ، لاَ يَغْفَلُ مَخَافَةَ أَنْ يَغْفَلُوا، أَوْ يَمَلُّوا، لِكُلِّ حَالٍ عِنْدَهُ عَتَاد، أَوْ غَنَاءٌ، الشَّكُّ مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عُمَرَ، لاَ يَقْصرُ عَنِ الْحَقِّ، وَلاَ يُجَاوِزُهُ إِلَى غَيْرِهِ، الَّذِينَ يَلُونَهُ مِنَ النَّاسِ خِيَارُهُمْ، وَأَفْضَلُهُمْ عِنْدَهُ أَعَمُّهُمْ نَصِيحَةً، وَأَعظَمُهُمْ عِنْدَهُ مَنْزِلَةً أَحسَنُهُمْ مُوَاسَاةً، قَالَ: فَسَأَلْتُهُ عَنْ مَجلِسِهِ كَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ فِيهِ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لاَ يَجْلِسُ، وَلاَ يَقُومُ إِلاَّ عَلَى ذِكْرٍ، لاَ يُوطِنُ

الأَمَاكِنَ وَيَنْتَهِي عَنْ إِيطَانِهَا، وَإِذَا انْتَهَى إِلَى قَوْمٍ جَلَسَ حَيْثُ يَنْتَهِي بِهِ الْمَجْلِسُ، وَيَأْمُرُ بِذَلِكَ، يُعْطِي كُلَّ جُلَسَائِهِ نَصِيبَهُ، لاَ يَحْسَبُ جَلِيسُهُ أَنَّ أَحَداً أَكْرَمَ عَلَيْهِ مِنْهُ، مَنْ جَالَسَهُ، أَوْ قَادَمَهُ لِحَاجَةٍ صَابَرَهُ حَتَّى يَكُونَ هُوَ الْمُنْصَرِفُ عَنْهُ، وَمَنْ سَأَلَهُ حَاجَةً لاَ يَرُدُّهُ إِلاَّ بِهَا، أَوْ بِمَيْسُورٍ مِنَ الْقَوْلِ، قَدْ وَسِعَ النَّاسَ بَسْطُهُ وَخُلُقُهُ، فَصَارَ لَهُمْ أَبًا، وَصَارُوا عِنْدَهُ فِي الْحَقِّ سَوَاءً، مَجْلِسُهُ مَجْلِسُ حِلْمٍ وَحَيَاءٍ وَصَبْرٍ وَأَمَانَةٍ، لاَ تُرْفَعُ فِيهِ الأَصْوَاتُ، وَلاَ تؤبن فِيهِ الْحُرَمُ، وَلاَ تثني فلتاته، يَتَفَاضَلُونَ فِيهِ بِالتَّقْوَى، مُتَوَاضِعِينَ يُوَقِّرُونَ فِيهِ الْكَبِيرَ، وَيَرْحَمُونَ الصَّغِيرَ، وَيُرْفِدُونَ ذَا الْحَاجَةِ، وَيَحْفَظُونَ الْغَرِيبَ قَالَ : فَسَأَلْتُهُ عَنْ سِيرَتِهِ فِي جُلَسَائِهِ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ دَائِمَ الْبِشْرِ، سَهْلَ الْخُلُقِ، لَيِّنَ الْجَانِبِ، لَيْسَ بِفَظٍّ، وَلاَ غَلِيظٍ، وَلاَ صَخَّابٍ، وَلاَ فَاحِشٍ، وَلاَ عَيَّابٍ، وَلاَ مَدَّاحٍ، يَتَغَافَلُ عَمَّا لاَ يَشْتَهِي، وَلاَ يُؤَيِّسُ مِنْهُ، وَلاَ يَخِيبُ فِيهِ، قَدْ تَرَكَ نَفْسَهُ مِنْ ثَلاَثٍ: مِنَ الْمِرَاءِ وَالإِكْثَارِ ومَا لاَ يَعْنيهِ، وَتَرَكَ النَّاسَ مِنْ ثلاَثٍ، كَانَ لاَ يَذُمُّ أَحَداً، وَلاَ يُعَيِّرُهُ، وَلاَ يَطْلُبُ عَوْرَتَهُ، وَلاَ يَتَكَلَّمَ إِلاَّ فِيمَا رَجَا ثَوَابَهُ، إِذَا تَكَلَّمَ أَطْرَقَ جُلَسَاؤُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُؤُوسِهِمُ الطَّيرُ، وَإِذَا سَكَتَ تَكَلَّمُوا، لاَ يَتَنَازَعُونَ عِنْدَهُ الْحَدِيثَ، مَنْ تَكَلَّمَ أَنْصَتُوا لَهُ حَتَّى يَفْرُغَ، وَحَدِيثُهُمْ عِنْدَهُ حَدِيثُ أَوَّلِهِمْ، يَضْحَكُ مِمَّا يَضْحَكُونَ مِنْهُ، وَيَعْجَبُ مِمَّا يَعْجَبُونَ مِنْهُ، وَيَصْبِرُ لِلْغَرِيبِ عَلَى الْجَفْوَةِ فِي مَنْطِقِهِ وَمَسْأَلَتِهِ، حَتَّى إِنْ كَانَ أَصْحَابُهُ لَيَسْتَجْلِبُونَ لَهُ، وَيَقُولُ: إِذَا رَأَيْتُمْ طَالِبَ الحاجَةِ يَطْلُبُهَا فارفدوه، وَلاَ يَقْبَلُ الثَّنَاءَ إِلاَّ مِنَ مُكَافِئٍ، وَلاَ يَقْطَعُ عَلَى أَحَدٍ حَدِيثَهُ حَتَّى يَجُوزَ، فَيَقْطَعُهُ بِنَهْيٍ، أَوْ قِيَامٍ.

(وفي رواية، قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ كَانَ سُكُوتُهُ؟ قَالَ: كَانَ سُكُوتُهُ عَلَى أَرْبَعٍ: الْحِلْمُ، وَالْحَذَرُ، وَالتَّقْدِيرُ، وَالتَّفكيرُ، فَأَمَّا تَقْدِيرُهُ فَفِي تَسْوِيَةِ النَّظَرِ وَالإِسْتِمَاعِ

www.alibapir.com


**بَيْنَ النَّـاسِ، وَأَمَّا تَفْكِيـرُهُ فَفِيمَا يَبْقَـى وَيَفْنَى، جُمِعَ لَهُ الْحِلْمُ فِي الصَّبْـرِ فَكَـانَ لاَ يُغضِبُهُ، وَلاَ يَستَفِزُّهُ، وَجُمِعَ لَهُ الحَذَرُ فِي أَرْبَعٍ: أَخْذُهُ بِالْحَسَـنِ لِيُقْتَـدَى بِـهِ، وَتَركُـهُ القَبِيحَ لِيُنْتَهَى عَنْهُ، وَاجْتِهَـادُهُ الرَّأْيَ فِيمَا أَصْلَحَ أُمَّتَهُ، وَالْقِيَـامُ لَهُمْ فِيمَا جَمَعَ لَهُمْ مِنَ أَمْرِ الدُّنْيَـا وَالآخِـرَةِ)** أَخْـرَجَهُ التِّرمِـذِيُّ فـي (الشمائل) وَأَبُو عَبـدُالله التِّرمِـذِي فـي (النعـت) والإمـام البَيْهَقِـيُّ فـي كتـاب: (دلائِـل النبـوة)، والقاضـي عِياض فـي (الشِّـفاء)[١].

{واتە: حەسەنی کوڕی عەلـی - خوا لێیان ڕازی بـێ- دەڵـێ: دەربـارەی وەسـفی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خاڵم (هینـدی کـوڕی ئـەبی هالـە)م پرسـی، کـە زۆر بـاش وەسفی دەکرد، بە هیوای ئەوە، کە شتێکم لە وەسـفی پێغەمبـەر بـۆ بـاس بکـات، تاکو پێیەوە پەیوەست بمو چاوی لێبکەم، ئەویش گوتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە شانو شەوکەتو بەرێز بوو، ڕووی وەك مـانگ لە شەوی بـەدردا دەدرەوشـایەوە، لـە دەستە پیاو درێژترو لە بابای زۆر کەڵەگـەت کورتتـر بوو، سەری تێـرو تـەواو بـوو، قـژی سـەری لـەنێوان گـرژو لـوولییو زۆر خاوییـدابوو، ئەگـەر قـژی هـەرخۆی بڵاوبووبایەوە بڵاوی دەکـردەوە، وە ئەگـەر هێشـتبایەوە لـە نەرمـەی گـوێی درێـژتر نەدەبوو، ڕەنگـی سپیو ڕوون بـوو، نێوچـەوانی پـان بـوو، برۆیـەکانی بـاریکبوونو درێــژبوون، بــەڵام پێکــەوە نــەلکابوون، دەمارێکیـان لەنێوانـدا هـەبوو لەکـاتی تووڕەییدا دەجووڵا، لـووتی مەیلـەو باریـكو نێـوە ڕاسـتی کووڕبـوو، ڕووناکییـەکی بەسەرەوە بوو، ئەوەی سـەرنجی وردی نەدابایە وایدەزانـی بەلای درێژیی دایـە.

ڕیشــی پڕبــوو، ڕەشــکێنەی چـاوی زۆر ڕەشو ســپێنەکەی زۆر ســپی بــوو، ڕوومەتەکانی تەختو لووسبوون، زاری فراوانبوو، ددانەکانی زۆر سپی بوونو لەیەك دووربوون، خەتی مووی نێوان سینگو نێوکی باریـك بـوو، گـەردەنی وەك بووکـە

---

١) ئەو دوو دەقـەم لە کـتێبی: (الـجامع للأوصـاف الرسـول)ی (ابـن العـاقولي) وەرگرتـوون، بـڕوانە: ص: (٥١ تا ٥٩).

www.alibapir.com


شووشــە بــوو، لــە ســاف‌و ســپێتی زیــودا، ئەندامــەکانی ڕێــك‌و پێــك‌و پێکــەوە هاوسەنگبوون، بەخۆوەو دامەزراوبوو، سینگ‌و سکی یەکسان بوون، سینەی پان بوو، نێوان شانەکانی لەیەك دووربوون، ئێسك‌و جومگەکانی گەورە بوون، جەستەی موودار نەبوو، نێوان سینگ‌و نێوکی خەتێکی مووی باریك پێکی دەگەیاند، بەڵام مەمکەکانی‌و سکی‌و جەستەی دیکەی موودار نەبوو، باسك‌و شانەکانی‌و سەرەوەی سینگی مووداربوون، باسکی درێژبوون، دەستی پان بوون، هەردوو لەپە دەست‌و پێیەکانی ئەستوورو گۆشتن بوون، دەست‌و لاقەکانی درێژ بوون، نێوان پاژنەو سینگی پێیەکانی چاڵ بوو، پێیەکانی ساف‌و لووسبوون، ئاویان پێوە ڕانەدەوەستا (چاڵ‌و چۆڵییان نەبوو)، ئەگەر دەڕۆیی باش هەنگاوی هەڵدەهێنا (پێی بەرزدەکردەوەو نەیدەخشاند)، وە بەلای پێشەوەدا دەچوو، بە ئارامی دەڕۆیشت بەڵام بە خێرایی، کە دەڕۆیشت وەك لە لێژاییی بچێتە خوار، وە ئەگەر ئاوڕی دابایەوە بەتەواویی خۆی دەسووڕاند، چاوی نزم دەکرد، سەرنجدانی بۆ زەوی زیاتر بوو لە ڕوانینی بۆ ئاسمان، بەزۆری بە گۆشەی چاو سەرنجی دەدا، هاوەڵانی پێش خۆی دەخستن، هەر کەسێك پێی گەیبایە سەرەتا خۆی سڵاوی دەکرد.

**(حەسەن دەڵێ) گوتم: چۆنیەتی قسەکردنیم بۆ وەسف بکە !**

گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام غەمبار بوو، هەمیشە بیری دەکردەوە، ئیسراحەتی نەبوو، زۆر بێدەنگ دەبوو، بەپێی پێویست نەبا قسەی نەدەکرد، سەرەتاو کۆتایی قسەی بە هەموو زاری بوو (بەسەری لێوو زمان قسەی نەدەکرد)، لە قسەکردنیدا وشە کۆکەرەوەکانی بەکاردێنا (وشەی کەم‌و مانای زۆر)، قسەی ڕوونبوو، بێ‌کەم‌و زیاد بووە، تەباو گونجاو بوو، نا تەباو خەڵك بە کەم سەیرکەر نەبوو، نیعمەت ئەگەر گچکەش بوایە بە گەورەی دادەنا، زەمی هیچ شتێکی نەدەکرد، نە زەمی خواردنی دەکردو نە مەدحیشی دەکرد، وە ئەگەر لای ئەو پێچەوانەی هەق گوترابایە هیچ شتێك خۆی بۆ تووڕەیی وی نەدەگرت، هەتا هەقی سەرنەخستبایە، وە لەبەر خۆی تووڕە نەدەبوو و تۆڵەشی نەدەساندەوە.

ئەگەر ئاماژەی کردبایە بە هەموو لەپەدەستی ئاماژەی دەکرد، وەئەگەر شتێکی پێ سەیر بووایە، لەپە دەستی دەسووڕاند، وە ئەگەر قسەی کردبایە لەگەڵ ئاماژەی دەستی پێکەوە پەیوەستی دەکردن، وە پەنجە گەورەی دەستی ڕاستی لەبەری لەپە دەستی چەپی دەدا، وە ئەگەر تووڕە ببوایە ڕووی وەردەچەرخاندو پشتی لەولا دەکرد، وەئەگەر دڵخۆش ببووایە چاوی دەنووقاند، پێکەنینی بەزۆریی زەردەخەنە بوو، لەکاتی پێکەنیندا ددانەکانی وەك دەنکە تەرزەی سپی دەردەکەوتن.

**حەسەن - خوا لێی رازی بێ- دەڵێ:**

ماوەیەك ئەو وەسفەم لە حوسەینی کوڕی عەلی خوا لێیان ڕازی بێ شاردەوە پاشان بۆم باسکرد، تەماشام کرد پێشی من کەوتوە، وە ئەوەی من لەبارەیەوە لێم پرسیبوو ئەویش لێی پرسیبوو، وە بینیم کە پرسیاریشی لە بابی کردبوو[١]، لەبارەی چۆنیەتی چوونە ژووری و هاتنە دەری و شێوەی، هیچ شتێکی نەهێشتبۆوە کە نەیپرسێ.

**حوسەین - خوا لێی رازی بێ- دەڵێ:**

پرسیارم لە بابم - خوا لێی ڕازی بێ- کرد لەبارەی چۆنیەتی چوونەوە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی:

هەرکات چووبایەوە مۆڵەت دراوبوو، جا کاتێك دەچۆوە ماڵ، کاتی لەماڵبوونەکەی بۆ سێ بەش، دابەش دەکرد: بەشێك بۆ خوا، وە بەشێك بۆ ماڵ و خێزانی و، بەشێکی بۆخۆی، پاشان بەشەکەی خۆیشی لە نێوان خۆی و خەڵکیدا دابەش دەکردو بۆ خەڵکی گشتیی و تایبەتی، وە هیچی لێ نەدەگێڕانەوە (هەموو کاتەکەی خۆی بۆوان تەرخان دەکرد).

---

١) واتە: حوسەین لەبارەی ئەو شتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە بابی (عەلی) کردبوو، خوا لێیان ڕازی بێ.

وە لەو کاتەی، کە بۆئۆممەتی تەرخان دەکرد، مۆڵەتی دەدا کە خاوەن چاکەکان هەڵبژێرێ، وە بە گوێرەی چاکەو پێگەیان لە دیندارییدا کاتەکەی لێ دابەش دەکردن، جا هەیانبوو ئیشێکو هەیانبوو دوو ئیشو هەیانبوو کۆمەڵێك ئیشی هەبوون، ئیدی پێیانەوە سەرقاڵ دەبوو، وەئەوانیشی بەوەوە سەرقاڵ دەکرد، کە بۆیان باش بوو، وە بۆ ئۆممەت باشبوو، کە پرسیاریان لێدەکردن (خەڵك پرسیاریان لەوانە دەکرد، کە چوونەتە خزمەتی) وە ئەوانیش هەواڵیان پێدەدات بەوەی کە بۆیان پێویستە، وە دەیفەرموو ((با ئەوەی لێرەیە هەواڵ بەوە بدات، کە لێرە نیە، وە کارو پێویستی ئەوانەم پێبگەیەنن، کە ناتوانن خۆیان ئیشو پێویستییانم پێ بگەیەنن، چونکە هەر کەسێك پێویستی کەسێك بگەیەنێتە حوکمڕانێك کە خۆی ناتوانێ بیگەیەنێ خوا پێیەکانی لەڕۆژی قیامەتدا دەچەسپێنێ))، ئەو جۆرە شتانە نەبووایە لەلای باس نەدەکران، وە جگە لەوە لە هیچ کەسی قبووڵ نەدەکرد، (واتە: قسەی دیکەی وەك زەمو غەیبەتو شکاندنی ئەمو ئەوی لەکەس قبووڵ نەدەکرد)، ئەوانەی دەچوونە خزمەتی بۆ وەرگرتنی زانستو شارەزایی دەچوونو هەتا تامو چێژی زانستیشیان نەکردبایە بڵاونەدەبوون، وە کاتێك لەلای دەردەچوون، دەبوونە ڕێنمایی کەری چاکە.

**(حوسەین دەڵێ) گوتم:**

پێم بڵێ، کە لە ماڵ دەردەچوو چۆن بوو، چی دەکرد ؟!

گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو مەگەر شتێك پەیوەندیی پێوەی ببووایە، ئەگەرنا زمانی خۆی لێدەگرت، وە هەمیشە پێکەوە تەبای دەکردن، واتە: هاوەڵانیو مسوڵمانان، وە پەرتەوازەی نەدەکردن، ڕێزی بە ڕێزی هەر کۆمەڵێکی دەگرت، وە دەیکردە سەرپەرشتیاریان، وە لە خەڵك وریابوو و خۆی لێیان دەپاراست، بێ ئەوەی ڕووی خۆشو ئاکاری (جوانی) لە هیچکامیان لابدات، وە لە هاوەڵانی دەپرسیو پرسیاری لە خەڵکی دەکرد لەوەی لەنێو خەڵکیدا دەگوزەرێ، وە شتی جوانو باشی بە باشو ڕاست دادەناو بەهێزی دەکرد، وە شتی ناشیرینو خراپی بە خراپ دادەناو بێهێزی دەکرد، وە کاروبارو هەڵسوکەوتی ڕێكو پێکبوو ناڕێکی تێدا نەبوو،

بێئاگا نەدەبوو نەوەك ئەوانیش بێئاگابنو بێزار ببـن، بۆ هەر حاڵە مامەڵەی پێویستی خۆی لەگــەڵ دەكرد، لە هەق كورتی نەدەهێنـاو لێشی تێنەدەپەڕاند بەرەو ناهەق، ئەو كەسـانەی كـەلێی نزیكتــر بـوو هەڵبـژاردەی خەڵكەكـە بـوون، وە باشتــرینیان لـەلای دڵسۆزترینیان بوو، پایەدارترینیان لەلای ئەو كەسە بوو، كە چاكتـر بەدەم خەڵكەوەیەو باشتـر هاوكارییـان دەكات.

**(حوسەین) دەڵێ:**

ئەوجار لەبارەی كـۆڕو مەجلیســیەوە لێم پرســی؟

گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ عـادەتی وابـوو هەمیشـە بـە دەم زیكـری خـواوە لـە مـەجلیس دادەنیشتو هەڵدەستا، وە جێگای تایبەتی دیـاری نەدەكـرد (بـۆ دانیشـتن)، وە قەدەغەشی دەكرد جێگـای تایبـەت دابنـرێن، وە ئەگـەر چـووبایە لای كۆمـەڵێك، كـوێ چۆڵــبایە دادەنیشــت، وە فەرمانیشــی بـەوە دەكـرد، وە مــافی هــەركام لــە هاونشینەكانی خـۆی دەدا بە شێوەیەك، كە هیچ هاونشینێك هەست نەكات كەسـێكی دیكە لەو لەلای بەرێزترە.

هەر كەسێك لەگەڵی دانیشتبایە یان ڕاوەسـتابایە، چـاوەڕوانی دەكـرد هـەتاكو ئـەو كەسە خۆی لێدە بۆوەو بەجێی دەهێشت، وە هەركەسـێك شـتێكی لــێ داوا كردبایــە، یان بۆی جێبەجێ دەكرد، یان قسەی خۆشی بـۆ دەكـرد، بـە جۆرێـك بـوو كـە بـەڕووی خۆشو ئاكاری هەموو خەڵكی گرتبۆوە، بۆیان وەك باب بوو، وە لە هەقـدا لـەلای وەك یەك بوونو بـە پارێزكـاریی بـەرزییو نزمییـانی دەزانـرا، لـە ڕیوایەتێكـدا: لـە هەقـدا هـەموویان لـەلای وەك یـەك بـوون، كـۆڕی وی كـۆڕی هێمنیــیو شـەرمو خـۆڕاگرییو ئەمینـداریی بـوو، دەنگـەكانی تێـدا بـەرز نەدەكرانـەوەو، ڕێـزو حورمـەتـەكانی تێـدا نەدەشكێنران، وە هەڵەو پەڵەكانی تێـدا دووبـارە نەدەكـرانەوە، بـە پارێزكـاریی تێیـدا پلــە بەنـدیی دەكـران، خـۆ بەكـەمــگر بـوون، تێیـدا ڕێزیـان لـە تەمەنـدار دەگـرتو ڕەحـمیان بە گچكـە دەكـرد، وە هاوكــاریی بابـای ئاتاجیــان دەكـردو، لەگـەڵ بابـای غـەریب بە بەزەیی بـوون.

**(حوسەین) دەڵێ:**

ئەوجار لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەی لەگەڵ هاونشینیانییەوە لێم پرسی؟

گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە ڕووگەش و خۆش ڕەفتار بوو، نەرم و نیان بوو، قسە ڕەق و زبر نەبوو بەقڕە قڕو جنێودەر نەبوو، کەم و کوڕیی باس نەدەکردن و، زۆر گاڵتەکەر[1] نەبوو، ئەگەر حەزی بە شتێك نەکردبایە، خۆی لێ بێئاگا دەکرد، وە هیچکەس لێی نائومێد نەدەبوو.

لە خودی خۆیدا توخنی سێ شتان نەدەکەوت:

ڕیابازیی و، زۆر باسکردنی هەر شتێك و، قسەکردن لەبارەی شتێکەوە کە پەیوەندیی پێوە نیە.

وە لەبارەی خەڵکیشەوە توخنی سێ شتان نەدەکەوت:

بە خراپیی باسی کەسی نەدەکرد و عەیبی لێ نەدەگرت، وە بە دوای عەیب و عاردا نەدەگەڕا، وە مەگەر شتێك چاوەڕیی پاداشتی لێکردبای، ئەگەرنا قسەی لەبارەوە نەدەکرد، وە کاتێك قسەی دەکرد هاونشینەکانی بێدەنگ دەبوون، وەك باڵندەیان لەسەر سەرهەڵنیشتبێ[1] ،وە ئەگەر ئەو بێدەنگ بووایە قسەیان دەکرد، وە لەلای وی قسەیان بەیەکدی نەدەبڕی، هەر کەس دوابایە لەلای وی، بێدەنگ دەبوون و گوێیان دەگرت هەتا لێدەبۆوە، کامیان پێشی قسەی کردبایە نۆرەی وی بوو.

ئەگەر ئەوان (هاونشینانی) بە شتێك پێکەنیبان ئەویش پێدەکەنی، وە ئەگەر شتێکیان پێ سەیر بووایە پێی سەیر دەبوو، بابای نامۆ ئەگەر قسەی نارێکیشی کردبایە تەحەمولی دەکرد، وە دەیفەرموو (ئەگەر بابای خاوەن پێویستیتان بینی هاوکاریی بکەن) چاوەڕێی سوپاسی لە هیچ کەس نەدەکرد، مەگەر چاکەیەکی

---

١) مَزّاح: زۆر گاڵتەکەر، هەروەها بە (مدّاح)یش هاتوە، واتە: زۆر مەدحکەر، بڕوانە: (شمائل المصطفى)، وهبة الزحيلي، ص(١٧٦).

١) چونکە کەسێك باڵندەی لەسەر سەر هەڵنیشتبێ و بیەوێ نەفڕێ، نابێ خۆی بجوولێنێ.

www.alibapir.com

لەگەڵ کرابێ، وە قسەی بە کەس نەدەبڕی، مەگەر تەواوی کردبایە، ئیدی خۆی قسەکەی بڕیبایە، یان بە تەواوکردن، یان بە هەڵسان.

وە لە ڕیوایەتێکدا: گوتم: ئەدی بێدەنگییەکەی چۆن بوو؟

گوتی: بێدەنگییەکەی بە چوار جۆر بوو:

بە زانیاریی‌و وریایی‌و ڕێکخستن‌و بیرکردنەوە، (واتە: بۆ یەکێك لەو چوارانە بێدەنگ دەبوو، نەك بەبێ هۆ بێدەنگ بێ).

ئنجا ڕێکخستنەکەی بۆ چاوپێداگێڕانی خەڵکەکە بە یەکسانیی‌و گوێی بۆ هەڵخستنیان، وە بیرکردنەوەکەی لەبارەی ئەوەوەبوو کە دەمێنێ (کە دوارۆژە)، وە کە نامێنێ (کە ژیانی دونیایە)، وە لە خۆڕاگرییەکەیشیدا هێدیی‌و مەندبوو، هیچ شتێك توورەی نەدەکردو، هیچ شتێك نەیدەورووژاند، وە لە وریاییەکەیدا چوار شتی کۆکردبوونەوە:

چاکەکردن‌و چاکە وەرگرتن تاکو چاوی لێبکرێ، وە توخن نەکەوتنی شتی ناقۆڵا تاکو وازی لێبهێنرێ، وە بیرکردنەوەو کۆششکردن بۆ دۆزینەوەی ڕێی چارە بۆ چاککردنی ئوممەت، وە هەڵسان بەوکارانەی کە کاروباری دونیاو دوارۆژیان بۆ ڕێکدەخات‌و کۆدەکاتەوە.

خوێنەری بەڕێز!

بە سەرنجدانی ئەو دوو دەقەی سوننەت، کە لە هەرکام لە (علي)و لە هەردووك کوڕی (حسن‌و حسین)ەوە - خوا لێیان ڕازی بێ- هێنامانەوە، ئێستاکە هەرکام جەستەو شێوەو دیمەنی پێغەمبەری خوا ﷺەوە خەسڵەت‌و ئاکارو ڕەفتارو ڕەوشت‌و خووی ڕەندو پەسندیمان زۆر جوان بۆ دەرەوشایەوە.

لێرەشدا کۆتایی بە تەوەرەی یەکەم دێنین‌و دەچینە سەر تەوەرەی دووەم، تاکو لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی دیکەی سوننەتدا، کە تایبەتن بە وەسفی جەستەیی‌و ڕواڵەتیی پێغەمبەری خواوە ﷺ، شێوەو دیمەنی پێغەمبەری خوامان بۆ ڕۆشنتر بێت.

## تــەوەرەی دووەم

## شــێوەو ڕوخسارو دیـمەنـی پێغـەمبــەر ﷺ

خوێنــەری بەڕێــزو ســەنگین !

ئــەم تەوەرەیــە تایبەتــە بــە خســتنەڕووی وەســفە جەســتەیی‌و ڕواڵەتییەکــانی پێغەمبــەری خـوا ﷺ، قـەدو قیافـەی ڕێك‌وپێـك‌و میـانجیی‌و هاوسـەنگی، ئەندامـە ڕێك‌و تێرو تەواوەکانی، ڕەنگ‌و ڕوخساری گەش‌و درەوشاوەی، گفت‌و لـفتی شیــرین‌و بەڕێ‌و جێی، بۆن‌و بەرامەی خۆشی.... هتد.

شایانی باسیشە هەندێك لە دەقەکان باسی وەسف‌و حاڵـەتێکی جەسـتەیی تایبـەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، بۆ وێنـە: قژی سەری، یـان بـۆنی خۆشــی، وە هەنـدێك باسـی زیاتر لە وەسـفێکی دەکەن:

**یەکــەم: قــەدو قــیافــەو بــاڵای :-**

**١- (كَــانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُــلاً مَرْبُوعًا، بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، عَظِـيمَ الْجُمَّــةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْــهُ)** أَخْرَجَــهُ الْبُخَــارِيُّ برقم: (٣٥٥١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣٧) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی دەستە (باڵا نێوەنـجیی) بوو نێو شانی پـان بوو، قژی پێشەسەری گەورە بوو، قژی هەتا نەرمە گوێیەکانی دەهات، پۆشـاکێکی سووری لەبەردابوو، هەرگیز شتی وا جوانم نەبینیوە.

**٢- (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَحْسَــنَ النَّــاسِ وَجْهًــا وَأَحْسَــنَهُمْ خَلْقًــا لَـيْسَ بِالطَّوِيــلِ الذَّاهِبِ وَلاَ بِالْقَصِيرِ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٥٤٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣٧) عَـنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لە هەموو کەس جوانتربوو، وە لە هەموویان ڕەوشتو ئاکاری پەسندتربوو، نە زۆر درێژ بوو نە کورتەباڵا بوو.

**دووەم: دەمو چاوو ڕووی :-**

**١- ( عَنْ أَبِى الطُّفَيْلِ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَمَا عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ رَجُلٌ رَآهُ غَيْرِى، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ فَكَيْفَ رَأَيْتَهُ؟ قَالَ: كَانَ أَبْيَضَ مَلِيحًا مُقَصَّدًا)** أَخْرَجَهُ وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٤٠).

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوەو، ئێستاکە هیچ پیاوێك لەسەر زەوی نیە بینیبێ جگە لە من، دەڵێ: پێم گوت: چۆنت بینی؟ گوتی: سپیو دڵگیربوو، وە دەستە پیاو بوو.

**٢- (وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٤١٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٦٩) عَن كَعْبِ بْنِ مَالَكٍ رضي الله عنه.

واتە: وە پێغەمبەری خوا ﷺ، کە دڵخۆش دەبوو ڕووی دەدرەوشایەوە تەنانەت دەتگوت پارچە مانگە.

**٣- (... فَكَشَفَ النَّبِيُّ ﷺ سِتْرَ الْحُجْرَةِ يَنْظُرُ إِلَيْنَا وَهُوَ قَائِمٌ كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٨٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤١٩) عَن أَنَسٍ رضي الله عنه.

واتە: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی لاداو بە ڕاوەستاویی تەماشای کردین، ڕووی دەتگوت پەڕی موصحەفە.

**٤- (عن جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ رضي الله عنه أن رجلاً، قال له: أَكَانَ وَجْهُ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلُ السَّيْفِ؟ قَالَ: لاَ، بَلْ كَانَ مِثْلَ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ وَكَانَ مُسْتَدِيرًا)** أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٢٤٤).

www.alibapir.com


واتە: پیاوێك لە (جابر بن سمرە)ی پرسی: ئایا ڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك شمشێر بوو؟ گوتی: نا بەڵكو وەك خۆرو مانگ بوو، وە بازنەیی بوو.

**سێیەم: زارو ددانی :-**

**(وَكَانَ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ ثَغْراً)** أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ، برقم: (٣٢٤٤) عَنْ عُمَر بْنُ الخَطَّاب رضي الله عنه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەمو ددانی لە هی هەمووكەس جوانتر بوو.

**چوارەم: دەنگو سەدای :-**

**(عَنِ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ فِي الْعِشَاءِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ، فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ صَوْتًا مِنْهُ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٧٦٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٦٤).

واتە: بەڕائی كوڕی عازیب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژی خەوتناندا سوورەتی (التين والزيتون)ی خوێند، دەنگی هیچ كەسم نەبیستوە هێندە خۆش بوو بێ.

**پێنجەم: هێزی جەستەی :-**

**(عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه فَقَالَ: إِنَّا يَوْمَ الْخَنْدَقِ نَحْفِرُ فَعَرَضَتْ كُدْيَةٌ شَدِيدَةٌ فَجَاءُوا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا: هَذِهِ كُدْيَةٌ عَرَضَتْ فِي الْخَنْدَقِ، فَقَالَ: أَنَا نَازِلٌ، ثُمَّ قَامَ وَبَطْنُهُ مَعْصُوبٌ بِحَجَرٍ وَلَبِثْنَا ثَلاثَةَ أَيَّامٍ لا نَذُوقُ ذَوَاقًا، فَأَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ الْمِعْوَلَ فَضَرَبَ فَعَادَ كَثِيبًا أَهْيَلَ أَوْ أَهْيَمَ..)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤١٠١).

www.alibapir.com


واتە: ئێمە لە ڕۆژی خەندەقدا هەڵمان دەکەند پارچە زەوییەکی پتەومان هاتە پێش، ئینجا هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەوە گرێیەکە لە خەندەکدا ڕێی گرتوە (هەڵناکەنرێ) ئەویش فەرمووی: خۆم دەچمە خوارێ، ئینجا هەڵساو سکیشی بەردێکی لێ بەسترابوو، وەسێ ڕۆژ مابووینەوە هیچمان نەخواردبوو، ئیدی پێغەمبەر ﷺ پاچەکەی وەرگرت و لێیدا، یەکسەر وەك تەپۆلکەی لم هەڵوەری...

**شەشەم: بۆنی خۆشی ئارەقەی و جەستەی :-**

**(قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَزْهَرَ اللَّوْنِ كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ وَلاَ مَسِسْتُ دِيبَاجَةً وَلاَ حَرِيرَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلاَ شَمَمْتُ مِسْكَةً وَلاَ عَنْبَرَةً أَطْيَبَ مِنْ رَائِحَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ)** أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣٠) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی گەش و[1] ڕوون و درەوشاوەبوو، ئارەقەکەی دەتگوت گەوهەرە، ئەگەر دەڕۆیی بەلای پێشەوەدا دەچوو، هیچ قوماشێکی لە ئاوریشم چنراوو ئاوریشمم دەست لێنەداوە، لە لەپە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ نەرمتر بووبێ، وە هیچ میسك و عەنبەرێکم بۆن نەکردوە، لە بۆنی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشتر بووبێ.

**حەوتەم: مۆری پێغەمبەرایەتی (خاتم النبوّة) بەنێو شانییەوە :-**

١- **(عن جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ خَاتِمًا فِي ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّهُ بَيْضَةُ حَمَامٍ)** أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٤٥).

واتە: مۆرێکم لە پشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بینی، وەك هێلکەی کۆتر بوو.

---

١) بڕوانە: المعجم الوسيط: (الأزهر: كلُّ لونٍ أبيض صافٍ مُشرقٍ مضيءٍ..)، ص: (٤٠٤)، واتە: وشەی (أزهر) هەر ڕەنگێکی سپی سافی گەشی درەوشاوەیە.

www.alibapir.com



**٢- (عَنِ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ ﷺ يَقُولُ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ ابْنَ أُخْتِى وَجِعٌ، فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتِمِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلَ زِرِّ الْحَجَلَةِ)** أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩٠)، ومُسْلِمٌ: (١١١/٢٣٤٥).

واتە: سائیبی کوڕی یەزید، دەڵێ: پوورم (خوشکی دایکم) بردمی بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەم خوشکەزایەم نەخۆشە، ئەویش دەستی بەسەرم داهێناو دووعای بەرەکەتی بۆ کردم، پاشان دەستنوێژی گرتو منیش لە ئاوی دەست نوێژەکەیم خواردەوە، پاشان لە پاش پشتی ڕاوەستامو سەرنجی مۆرەکەیمدا کە لەنێو دوو شانەکانیدابوو، وەك دووگمەی قایمکردنی پەردە وابوو.

تێبینی:-

دیارە ئەو مۆرەی نێو شانی پێغەمبەر ﷺ، کە لە دەقەکەی پێشتردا هێنامان لە (جابر بن سَمُرة)ەوە، کە گوتوویەتی: هێندەی هێلکەی کۆتر دەبوو، لەگەڵ ئەوەی کە لێرەدا دەڵێ: هێندەی دوگمە (قۆپچە)ی پەردە پێ قایم کردن دەبوو، لە نێوەڕۆکدا هەر یەکنو، وا دیارە ئەو قۆپچەو دوگمەیەی مۆری سەر پشتی پێغەمبەری خوا ﷺی پێ چوێنراوە، هێندەی هێلکە کۆتر بووە.

ئێستاش نۆرەی تەوەرەی سێیەمە:

# تـــەوەرەی سێیەم

# ئاکـــارو ڕەوشـتە بەرزو پەسندەکانی پێغەمبـــەر ﷺ

خوێنـــەری بەرێـز !

لەم تەوەرەیەدا ژمارەیەك لە خەسـڵەتو ئاکارە بـەرزو پەسـندەکانی پێغەمبـــەری خوا ﷺ سەرژمێر دەکەین.

سـەرەتاش دەڵێـین:

مــادام خـوای زانـاو شـارەزا لــە مــەدحو ستایشــی پێغەمبــەری خاتــەمدا ﷺ فەرمـوویەتی، ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلـم، واتــە: وە بێگومــان تـۆ لەسـەر ڕەوشتو ئاکارێکی مەزنی.

هەروەها خۆیشـی لـەبارەی پێناسـەی خۆیو ئامـانجو مەبەسـتی ڕەوانەکرانییـەوە فەرمـوویەتی: (**إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَرِمَ الأَخْلاَقِ**) أَخْرَجَــهُ البَيْهَقِـيُّ بـرقم: (٢٠٥٧١)، واتە: بێگومـان تەنیا بـۆ ئـەوە ڕەوان کـراوم، کـە ڕەوشـتو خەسـڵەتە بـەرزەکان تـەواو بکەم.

بـەڵێ مـادام خـــواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەبارەی کەسـایەتیی بـەرزو نـاوازەی پێغەمبەری کۆتاییو ڕەوشتو ئاکاری ڕەندو پەسندییەوە وایان فەرمووە، دیـارە دەبـێ ئەو بەرێزو خۆشەویسـتە لـە لوتکـەی هـەرە بڵنـدی ڕەوشـتو ئاکـارو هـەڵسو کـەوت ڕەفتـاری جـوانو پەسـندا بووبـێ لـە هـەموو ڕوویێکـەوە، هەڵبەتـە لـە حـاڵێکی وادا سەرژمێرکردنی سەرجەم خووڕەوشتە بەرزو پەسـندەکانی پێغەمبـەری خاتـەم شـتێکی ئەستەمو نەگونجاوەو کاری کردن نیـە، بۆیـە بـەپێی بنچـینەی: (**مـا لايُـدرِكُ كُلُّـهُ لاَ يُتـرَكُ بَعْضُـهُ**) واتـە: ئـەوەی هـەمووی نـاکرێ، هەندێکیشـی واز لـێ نـاهێنرێ، بـە پێویستمزانی گوڵبژێرێکی خەسڵەتە پەسندو ئاکارە جوانـەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ

www.alibapir.com



بکەم و لە چەند خاڵێکداو لەبەر ڕۆشنایی چەند دەقێکی سوننەتدا، چەپکە گوڵێک لە گوڵزاری ڕەوشت و ئاکاری بەرز و شیرینی ئەو زاتە بەڕێز و خۆشەویستە بچنم:

**یەکەم: خواپەرستیی :-**

* **(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُومُ مِنْ اللَّيْلِ حَتَّى تَتَفَطَّرَ قَدَمَاهُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لِمَ تَصْنَعُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: أَفَلَا أُكُونَ عَبْدًا شَكُورًا)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٨٣٧).

واتە: عائیشە خوای لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوانە هێندەی شەو نوێژ دەکرد، هەتا پێیەکانی قڵیش قڵیش دەبوون، عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی وا دەکەی لە حاڵێکدا، کە خوا لە هەڵەی ڕابردووو داهاتووت بوردوە؟ فەرمووی: ئەدی نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزار بم؟

* **(عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاشْتَدَّ بِهِ وَجَعُهُ، اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي فَأَذِنَّ لَهُ، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُطُّ رِجْلَاهُ فِي الْأَرْضِ بَيْنَ عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَبَيْنَ رَجُلٍ آخَرَ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٩٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤١٨).

واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشی مەرگی دا گران بووو دەردەکەی توندبوو، مۆڵەتی لە هاوسەرەکانی وەرگرت، کە لە ماڵەکەی مندا خزمەتی بکرێ و ئەوانیش مۆڵەتیاندا، جا پێغەمبەر ﷺ خۆی خستبۆ سەر قۆڵی دوو پیاوان عەبباس و پیاوێکی دیکە، چووە دەرێ (بۆ نوێژی بە کۆمەڵ) لاقەکانی لە زەوی دەخشان.

کەواتە:

پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیی و مەرگیشداو بەو حاڵەشەوە، کە دایکمان عائیشە باسی کردوە، هەر سوور بووە لەسەر نوێژی بە کۆمەڵ !

دووەم: پشت بە خوا بەستنیو متمانەپێبوونی :-

* (عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّه ﷺ قَالَ غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ فَأَدْرَكَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَعَلَّقَ سَيْفَهُ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، قَالَ: وَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي الْوَادِي يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ، قَالَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {إِنَّ رَجُلاً أَتَانِي وَأَنَا نَائِمٌ فَأَخَذَ السَّيْفَ فَاسْتَيْقَظْتُ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي فَلَمْ أَشْعُرْ إِلاَّ وَالسَّيْفُ صَلْتًا فِي يَدِهِ، فَقَالَ لِي: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قَالَ قُلْتُ اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّانِيَةِ: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قَالَ قُلْتُ: اللَّهُ، قَالَ فَشَامَ السَّيْفَ فَهَا هُوَ ذا جَالِسٌ}، ثُمَّ لَمْ يَعْرِضْ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤١٣٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨٤٣).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرەو لای نەجد بۆ جەنگێك چووین، پێغەمبەری خواش لە دۆڵێكی پڕ دارو درەختدا پێمان گەیشت، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر درەختێكدا دابەزیو شمشێرەكەیشی بەیەكێك لە لقەكانییەوە هەڵواسی، ئیدی خەڵكەكەش بە دۆڵەكەدا بڵاوبوونەوە لە سێبەری درەختان دەخەفتان، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە كاتێكدا، كە خەوتبووم پیاوێك هاتە سەر سەرمو شمشێرەكەی هەڵگرت، منیش كە خەبەرم بۆوە لەسەر سەرم ڕاوەستا بوو، ئیدی هەستم پێ نەكرد هەتا شمشێرەكەی بە هەڵكێشراویی بە دەستەوە نەگرت، پێی گوتم: كێ لەمن دەتپارێزێ؟ فەرموویەتی: گوتم: خوا، پاشان بۆ جاری دووەم گوتی: كێ لەمن دەتپارێزێ، فەرمووی: ئیدی شمشێرەكەی خستەوە كالانو ئەوەتا لێرە دانیشتوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی لێ نەكرد.

دیارە ئەم هەڵوێستەش ئەوپەڕی لەخوا ڕادیتنو پشت بە خوا بەستنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیەنێ.

سێیەم: دنیا بەکەمگرتنی (زهد):

* (عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: ابْنَ أُخْتِي! إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلَالِ ثَلَاثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ وَمَا أُوقِدَتْ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَارٌ فَقُلْتُ مَا كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتْ الْأَسْوَدَانِ التَّمْرُ وَالْمَاءُ إِلَّا أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ جِيرَانٌ مِنْ الْأَنْصَارِ كَانَ لَهُمْ مَنَائِحُ وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَبْيَاتِهِمْ فَيَسْقِينَاهُ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٤٥٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٧٢).

واتە: لە عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- گێڕراوەتەوە، کە بە (عروە)[١]ی گوتوە: کوڕی خوشکم! ئێمە جاری وابوو سێ جار مانگ نوێبوونەوەمان لە ماوەی دوو مانگاندا دەبینی، لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوادا ئاگر نەدەکرایەوە، (عروة) دەڵێ: گوتم: ئەدی بەچی دەژیان؟ گوتی: بە دوو شتە ڕەشەکان، خورماو ئاو، ئەوەندەش هەبوو، کە هەندێك دراوسێی پێغەمبەری خوا لە پشتیوانان حوشتری شیردەریان هەبوون، کە لە ماڵەکانیانەوە شیریان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێناو ئەویش پێی دەنۆشین.

* (عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ لَنَا سِتْرٌ فِيهِ تِمْثَالُ طَائِرٍ وَكَانَ الدَّاخِلُ إِذَا دَخَلَ اسْتَقْبَلَهُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {حَوِّلِي هَذَا، فَإِنِّي كُلَّمَا دَخَلْتُ فَرَأَيْتُهُ ذَكَرْتُ الدُّنْيَا}) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢١٠٧).

واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پەردەیەکمان هەبوو وێنەی باڵندەی تێدا بوو، وە هەر کەسێك هاتبایە ژوورێ دەهاتە پێش چاوی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەم پەردەیە لابدە (لەم شوێنەی لابەرە)، چونکە هەر جارێك، کە دێمە ژوورێو دەیبینم دنیام دێتەوە یاد.

---

(١) (عروة) کوڕی (زبیر)ەو دایکی (أسماء)ی کچی (أبو بکر)ە -خوا لێیان ڕازی بێ-.

هەڵبەتە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دنیا هاتنەوە یاد ئەوە بووە، کە جۆرێك لە سەرقاڵیی و خافڵانی بۆ دروست دەبێ بەهۆی دیتن و سەرنجدانی ئەو پەردەیەو دیمەنی باڵندەکە، کە لەسەری چنراوە.

**چوارەم: خۆشەویستی بۆ ئۆممەتەکەی :-**

*** (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ وَإِنِّي اخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَهِيَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا})**
أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٣٠٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٩).

واتە: هەموو پێغەمبەرێك پاڕانەوەیەکی گیرا بووی بۆ دانراوە، جا هەموویان پاڕانەوەکەیان لە دنیادا گوزەراوە، بەڵام من پاڕانەوەکەی خۆمم، وەك تکاکردن بۆ ئۆمەتم بۆ ڕۆژی قیامەت هەڵگرتوە، وە ئەگەر خوا بیەوێ بە قسمەت هەرکەسێك لە ئۆمەتم دەبێ، کە بمرێ بێئەوەی هیچ شتێك بکاتە هاوبەشی خوا.

**پێنجەم: سۆزو بەزەیی و پەرۆشی :-**

سۆزو بەزەیی و پەرۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکە لە سیفەت و ڕەوشتە هەرە دیارو بەرجەستەکانی و، ئەوەندە بەسە کە خوای کاربەجێ نازناوی (رحمة للعالمين)ی پێداوە: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء، واتە: وە تۆمان تەنیا بۆ ئەوە ناردوە، کە بەزەیی بی بۆ تێکرایی جیهانییان، هەروەها خوا (عزّ وجلّ) بە بەزەیی و میهرەبانە بەرانبەر بە بڕواداران وەسفی کردوە: ﴿ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ

رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة، واتە: ئەوە لە خۆتان پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە، کە هەر شتێك ببێتە مایەی نارەحەتییو سەغڵەتییتان لەسەر دڵی قورسە زۆر بەتەنگتانەوەیەو بەرانبەر بە بڕواداران میهرەبانو بە بەزەییە، بەڵێ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەرجەستەکەری ڕەحمەتو بەخششی خوایە سبحانە وتعالی بۆ هەموو جیهانییان بە بەشەرو جنو ئاژەڵو باڵندەو درەختو... هتدەوە، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەوبارەوە:

* **(عَنْ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَبَّلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ وَعِنْدَهُ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ جَالِسًا فَقَالَ الْأَقْرَعُ إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنْ الْوَلَدِ مَا قَبَّلْتُ مِنْهُمْ أَحَدًا فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: {مَنْ لَا يَرْحَمُ لَا يُرْحَمُ}** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٩٩٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣١٨).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا، کە ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی لە لا دانیشتبوو، حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، ئەقرەعیش گوتی: دە منداڵم هەن هیچیانم ماچ نەکردوە! پێغەمبەری خواش ﷺ تەماشای کردو فەرمووی: هەرکەسێك بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی بەرانبەر نانوێنرێ.

کەواتە: ماچکردنی منداڵ لە سۆزو بەزەییەوە دێو، سۆزو بەزەییش لە مرۆڤدا مەرجی بەزەیی پێداهاتنەوەیەتی لەلایان خوای بە بەزەییەوە!

* **(عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلِأَبِي الْعَاصِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥١٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٤٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد لەکاتێکدا، کە ئوّمامەی کچی زەینەبی کچی پێغەمبەری خواو هاوسەری ئەبی العاص کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدوشەمسی هەڵگرتبوو، جا کە سەجدەی دەبرد دایدەناو، کە هەڵدەستایەوە هەڵیدەگرتەوە.

لەم فەرمایشتەشەوە وەردەگیرێ، کە زۆر وردەکاریی فیقهیی، بەتایبەت لە مەزەبی شافیعیدا – خوا لێی خۆشبێ- لە بواری جوولەکردن لە نوێژداو لە بواری پاكو خاوێنیدا زادە بیروزەیِنو دووربینی (إحتیاط)کردنی خۆیانەو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا سەختگیر نەبووە!

* (**عَن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَيُخَالِطُنَا حَتَّى يَقُولَ لأَخٍ لِي صَغِيرٍ: يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟**) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٢١٩)، وَمُسْلِمٌ **برقم: (٢١٥٠).**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێکەڵییمانی دەکرد، هەتا بە برایەکی گچکەمی دەفەرموو: ئەی ئەبا عومەیر! نوغەیر چی کرد؟!

شایانی باسیشە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتووە، کە ئەو منداڵە (أبو عمیر)، کە برای ئەنەس بووە باڵندەیەکی هەبووە بەناوی (نُغیر)، بەڵام لێی مردووەو بۆی گریاوە، پێغەمبەری خواش ﷺ گاڵتەی لەگەڵ کردوەو ئاوای پێ فەرمووە.

* (**... وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلاَ أَنْ يَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلاَفَ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللهِ أبداً..**) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٣٦)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٨٧٦).

واتە: وە سوێند بەو کەسەی گیانمی بە دەستە، ئەگەر لەسەر مسوڵمانان زۆر قورس نەبووایە، هەرگیز لە هیچ دەستەیەکی جەنگاوەر دوانەدەکەوتم، کە لەڕێی خوادا دەجەنگێ.

کەواتە: هۆی دەرنەچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەندێك لە چالاكییە جیهادییەكان، ئەوە بووە كە لەسەر مسوڵمانان نەبێتە فەرزی عەین، كە بۆ هەموو چالاكییەكی جیهادیی دەربچن، لە سۆنگەی ئەوەوە، كە ئەو بەڕێزو خۆشەویستەیان هەمیشە دەرچووەو بەشدار بووە!

* **{إِنِّي لأَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ}** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧٧) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه.

واتە: من جاری وایە لە نوێژدا دەوەستم، دەمەوێ درێژی بكەمەوە، بەڵام كە گریانی منداڵ دەبیستم كورتی دەكەمەوە، حەز ناكەم دایكی ناڕەحەت بكەم!

* **{لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلاَةٍ}** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٨٨٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٢).

واتە: ئەگەر لەسەر ئۆممەتم، یان لەسەر خەڵكیم بە قورس نەكردبایە، لەگەڵ هەموو نوێژێكدا سیواك كردنم لەسەر پێویست دەكردن.

* **{إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ فَأَعْطُوا الإِبِلَ حَظَّهَا مِنَ الأَرْضِ، وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ فَأَسْرِعُوا عَلَيْهَا السَّيْرَ...}** أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ، برقم: (١٩٢٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه.

واتە: ئەگەر بە شوێنی بەلەوەڕدا سەفەرتان كرد، بەشی حوشترەكانیش لە زەوی بدەن، (بیانلەوەڕێنن)، وە ئەگەر بە شوێنی بێ لەوەڕدا ڕۆیشتن بە خێرایی پێدا گوزەر بكەن..

هەڵبەتە لە تێكڕای ئەم فەرمایشتانەو هاووێنەكانیشیاندا، بەزەییو سۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك مانگی چواردە نمایانو درەوشاوەیە.

www.alibapir.com

**شـەشـەم: سـەخاوەت‌و بـەخشـندەیی :-**

* **(عَن ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكونُ فِي رَمَضَانَ، حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ وَكَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ فَلَرَسُولُ اللهِ ﷺ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٧٣).

واتە: پێغەمبەری خـوا ﷺ سـەخییتـرین کـەس بـوو، وە لـە کاتێکـدا، کـە لـە ڕەمەزاندا بە جیبریل دەگەیشت لـە هـەموو کاتێـك بەخشـەرتر بـوو، کـە هـەموو شەوێکی ڕەمەزان پێی دەگەیشت قورئـانی لەگـەڵ دەور دەکـردەوە، ئـالـەو کاتانـەدا پێغەمبەری خـوا ﷺ لە بەخشیندا لە بـای هەڵکردوو خێراتـر بوو.

* **{عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، بِبُرْدَةٍ ... فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكْسُوكَ هَذِهِ؟ فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ ﷺ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا فَلَبِسَهَا، فَرَآهَا عَلَيْهِ رَجُلٌ مِنْ الصَّحَابَةِ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا أَحْسَنَ هَذِهِ فَاكْسُنِيهَا، فَقَالَ: نَعَمْ...}** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٠٣٦).

واتە: ئافرەتێـك بوردەیەکی[١] بۆ پێغەمبـەر هێنـا... گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئەمـەت پـێ بپۆشـم؟ پێغەمبـەریش پێویستی بـوو لێـی وەرگـرت‌و پۆشـی، پیـاوێك لە هـاوەڵان ئەو پۆشاکەی لەبەردا بینـی، گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! ئەوە چـەند جوانە دەبـەر منی بکـە ! فەرمووی: بەڵێ...

---

١) البـردة: كسـاءٌ مُخـطَّطٌ يُلْتَحَفُ بـه، المعجـم الوسـيط، ص: (٤٨)، واتـە: بـوردە پۆشـاکێکی خەتـخـەتە لە خۆوە دەپێچرێ.

**حەوتەم: شەرمو شکۆی (حیاؤە) :-**

* **(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، يَقُولُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئًا عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٥٦٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٢٠).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کچی نێو پەردەکەی بە شەرمتر بوو، وە ئەگەر شتێکی پێناخۆش بووایە لە ڕوویدا دەزانرا.

هەڵبەتە مەبەست لە شەرمو شکۆی زۆری پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوە نەبووە، کە لە سنوور بچێتە دەرێو ڕێگریی هەق گوتنو بەرپەرچدانەوەی ناهەقی لێ بکات، چونکە تێپەڕاندن لە هەموو شتێکدا هەر خراپە.

**هەشتەم: خۆ بە کەمگریی (تواضعە) :-**

* **(عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: إِنْ كَانَتْ الأَمَةُ مِنْ إِمَاءِ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَتَأْخُذُ بِيَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَنْطَلِقُ بِهِ حَيْثُ شَاءَتْ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٠٧٢).

واتە: جاری وابوو کەنیزەکێك لە کەنیزەکەکانی خەڵکی مەدینە، دەستی پێغەمبەری خوا ﷺی دەگرتو بۆ هەر کوێیەك ویستبای لەگەڵ خۆی دەیبرد.

واتە: هەر کەسێك تەنانەت کۆیلەو کەنیزەکیش، کە ئەوکاتە هەبوون، پلەیەکی کۆمەڵایەتی نزمیان هەبووە، کارێکی بە پێغەمبەر بوو بووایە لەگەڵی دەچووو بەدەمیەوە دەچوو.

* **(عَنْ عَمْرَةَ بِنتِ عَبْدُالرَّحْمَن، قَالَتْ: قِيلَ لِعَائِشَةَ مَاذَا كَانَ يَعْمَلُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ بَشَرًا مِنَ الْبَشَرِ يَفْلِي ثَوْبَهُ، وَيَحْلُبُ شَاتَهُ، وَيَخْدِمُ**

www.alibapir.com


**نَفْسَـــهُ)** أَخْرَجَــهُ أَحْمَــد بـرقم: (٢٦٢٣) قَـالَ: الشيخ شُـعيب الأرنـاؤوط: حَـدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: بە عـائیشە خوا لێی ڕازی بێ گوترا: پێغەمبەری خوا ﷺ لـە ماڵەکەیـــدا چی دەکرد؟ گـوتی: مرۆڤێـك بـوو، وەك خـەڵك (ڕەفتـاری دەکـرد): پۆشـاکی خـۆی دەپشکنیو، مەڕەکـەی خۆی دەدۆشیو، خزمـەتی خۆی دەکـرد.

مـەبەست لە پشکنینی پۆشـاك دەگونجێ دۆزینـی بێ، واتـە کوشـتنی ئەسـپێو کێچو پاککردنەوەی لێیان، دەشگونـجێ مـەبەست پاککردنەوەی بێ لەهەر شـتێك، کە پێی هەڵبواسرێو پێیـەوە بنووسێ، وەك پووشکەو دڕكو... هتـد، وە مـەبەست لە خـزمـەتی خۆکردن، ئەوەیە کە کارە ئاساییەکانی خـۆی بۆخـۆی ئەنــجام داوە، بۆ نـموونە: ئاو خواردنەوەو جـلو بەرگ هەڵگرتنو قەدکـردن.... هتد.

* **(عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ لَمْ يَكُنْ شَـخْصٌ أَحَـبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ، قَالَ: وَكَـانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا لِمَا يَعْلَـمُونَ مِنْ كَرَاهِيَتِهِ لِـذَلِكَ)** أَخْرَجَـهُ التِّرمِـذِي بـرقم: (٢٧٥٤) هَــذَا حَــدِيثٌ حَسَــنٌ صَحِيحٌ غَرِيـبٌ مِــنْ هَـذَا الْوَجْـهِ، وَصَـحَّحَهُ الألباني.

واتە: هاوەڵان هیچ کەسیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ لـەلا خۆشەویستتـر نـەبوو، دەڵێ: بەڵام کە دەیاندی لەبەری هەڵنەدەستان، چونکە دەیانزانی پێی ناخۆشـە.

* **(عَـنِ ابْنِ عَبَّـاسٍ، عَنْ عُـمَـرَ بْنُ الـخَـطَّاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَـالَ: قَــالَ رَسُــولُ اللَّهِ ﷺ: لا تُطْـرُونِـي كَمَـا أَطْـرَتِ النَّصَارَى ابْــنَ مَرْيَــمَ، إِنَّمَـا أَنَــا عَبْــدٌ، فَـقُولُـوا: عَبْـدُ اللَّهِ وَرَسُـولُهُ)** أَخْرَجَهُ البُخاريُّ برقم: (٣٢٦١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێدەڕۆیی مەکەن لە مەدحکردنمدا، وەك نەصرانییەکان لە مەدحی کوڕی مەریەمدا تێیانپەڕاند، بێگومان من بەس بەندەم، بۆیە بڵێن: بەندەو ڕەوانەکراوی خوا.

**نۆیەم: ئازایەتیی :-**

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَحْسَنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ النَّاسِ وَكَانَ أَشْجَعَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَخَرَجُوا نَحْوَ الصَّوْتِ فَاسْتَقْبَلَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، اسْتَبْرَأَ الْخَبَرَ وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، فِي عُنُقِهِ السَّيْفُ وَهُوَ يَقُولُ: {لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا})** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٩٠٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٠٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترین کەسو سەخیترین کەسو ئازاترین کەس بوو، شەوێکیان خەڵکی مەدینە شڵەژانو بەرەو دەنگەکە چوون، بەڵام لەو سەرەوە پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕوویان دەهات هەواڵەکەی ساغ کردبۆوە (کە ئایا چی ڕوویداوە؟) بە سواری ئەسپێکی ڕووتی ئەبی طەڵحەو شمشێرێکی لەمل کردبوو، دەیگوت: ترستان لەسەر نیە، ترستان لەسەر نیە.

**دەیەم: خۆڕاگریی و لێبوردەیی (صَبْرُهُ و عَفْوُهُ):**

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیداو لەگەڵ سەرجەم خەڵکیدا بە مسوڵمانو نامسوڵمانو سەرجەم توێژەکانەوە پشوو درێژو باخەڵ فەراحو خۆڕاگرو لێبوردەو دڵ گەورە بووەو، لەوبارەوە بەڵگە یەکجار زۆرن، بەڵکو وەك چۆن ژیانی پێغەمبەری خوا سەر لەبەری بەرجەستەکردنی بەزەیی بووە، بەهەمان شێوەش تێکڕای ژیانو سیرەی خۆڕاگریی و پشوو درێژیی و لێبوردەیی بە جوانترین شێوە تێدا

نمایان‌و به‌رجه‌سته بووه، ئه‌مانه‌ش چه‌ند نموونه‌یه‌كن له خۆڕاگرییی‌و لێبوورده‌یی ئه‌و زاته به‌ڕێزو خۆشه‌ویسته:

* **(عَنْ عَائِشَةَ، زَوْجِ النَبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ: هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ قَالَ: لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ مَا لَقِيتُ، وَكَانَ أَشَدُّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلاَّ وَأَنَا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ عَزَّ وجَلّ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ فَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّ اللهَ قَدْ سَمِع قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَأنا مَلَكُ الجِبال، وَقَدْ بَعَثَنِي رَبِّي إِلَيْكَ لِتَأْمُرَنِي بِأَمْرِكَ، فَمَا شِئْتَ، إِنْ شِئْتَ أَطْبَقْتُ عَلَيْهِمُ الأَخْشَبَيْنِ؟ فَقَالَ النبيّ ﷺ: {بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً)** أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٢٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٩٥).

واته: له عائیشه‌ى هاوسه‌رى پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ هاتوه، كه به پێغه‌مبه‌رى خواى گوتوه: ئه‌ى پێغه‌مبه‌رى خوا! ئایا هیچ ڕۆژێكت لێ گوزه‌راوه سه‌ختتر له ڕۆژى ئوحود؟ ئه‌ویش فه‌رمووى: له خه‌ڵكه‌كه‌ته‌وه ناڕه‌حه‌تیى زۆرم بینى، وه سه‌ختترین شت كه به‌سه‌رم هات ئه‌وه‌ى ڕۆژى عه‌قه‌به بوو، كه چوومه لاى (ابن عبد یالیل ابن عبد كُلال)، به‌لام ئه‌وه‌ى ویستم وه‌لامى نه‌دامه‌وه، بۆیه به خه‌فه‌تبارییه‌وه سه‌رى خۆم هه‌لگرت‌و سه‌ره‌نجام له (قرن الثعالب) خۆم بینییه‌وه، ئیدى سه‌رم بلند كرد هه‌ورێكم بینى سێبه‌رى لێكردبووم، سه‌رنجمدا جیبریلى تێدا بوو بانگى كردم، گوتى: بێگومان خواى زال‌و شكۆدار قسه‌ى گه‌له‌كه‌ت‌و وه‌لامه‌كه‌یانى بۆ تۆ بیست، ئێستاش فریشته‌ى چیایه‌كانى ناردووه تاكو

www.alibapir.com


هەرچی دەتەوێ بەسەریانبێ فەرمانی پێبکەی، فەرمووی: فریشتەی چیایەکانیش بانگی کردمو سەلامی لێکردم، پاشان گوتی: ئەی موحەممەد! بێگومان خوا قسەی گەلەکەتی، کە لەگەڵیان کردی بیست، منیش فریشتەی چیایەکانم پەروەردگاریشت ناردوومی بۆلات تاکو چیت دەوێ فەرمانم پێبکەی، ئەگەر دەتەوێ دوو چیایەکانیان بەسەردا دەڕووخێنم! پێغەمبەری خواش پێی فەرموو: بەڵکو هیوادارم خوا لە پشتی ئەوانە کەسانێك دەربێنێ، کە خوا بپەرستێو هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی.

* **(عَن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كُنْت أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَعَلَيْهِ بُرْد نَجْرَانِيٌ غَلِيظُ الحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ، فَجَبَذَهُ بِرِدَائِهِ جَبْذَة شَدِيدَة حَتَّى نَظَرْت إِلَى صَفْحَة عَاتِق رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَقَدْ أَثَّرَتْ بِهَا حَاشِيَة الرِّدَاء مِنْ شِدَّة جَبْذته، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّد! مُرْ لِي مِنْ مَال اللَّه الَّذِي عِنْدك، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولِ اللهِ، ثُمَّ ضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ)** أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٨٠٩).

واتە: من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتم، کە بوردێکی نەجرانیی قەراغو یەخە زبری لەبەردابوو، ئەعرابییەك پێی گەیشتو بە ڕاکێشانێکی توند ڕایکێشا هەتا تەماشای لا ملی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد، قەراغی عەبایەکە لەبەر زۆر توند ڕاکێشانی شوێنی لێ پەیدا کردبوو، ئینجا گوتی: ئەی موحەممەد! لەو سامانەی خوا کە لەلاتە هێندێکم بەش بدە! پێغەمبەری خواش ئاوڕی لێدایەوە: ئنجا پێکەنیو فەرمانی کرد شتێکی بدەنێ.

* **(عَن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: دَخَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَبِي سَيْفٍ القَيْنِ، وَكَانَ ظِئْرًا لِإِبْرَاهِيمَ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِبْرَاهِيمَ، فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ، ثُمَّ دَخَلْنَا عَلَيْهِ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَذْرِفَانِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: {يَا ابْنَ عَوْفٍ إِنَّهَا رَحْمَةٌ، ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى، فَقَالَ: إِنَّ العَيْنَ تَدْمَعُ، وَالقَلْبَ يَحْزَنُ،**

www.alibapir.com


**وَلا نَقُولُ إِلا مَا يَرْضَى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٣٠٣).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ چووینە لای (أبي سيف القَين)، کە مێردی شیرپێدەر (مرضع)ی ئیبراهیم بوو، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیبراهیمی (کوڕی) وەرگرتو ماچی کردو بۆنی کرد، پاشان جارێکی دیکە چووینەوە لای (أبی سيف) لە کاتێکدا، کە ئیبراهیم خەریکی ڕووحدان بوو، چاوەکانی پێغەمبەری خواش فرمێسکیان لێهات. (عبدالرحمن بن عوف)یش پێی گوت: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: ئەی کوڕی عەوف ئەمە نیشانەی بەزەییە، پاشان فرمێسکی دیکەی هەڵوەراندن، وە فەرمووی: چاو فرمێسکی دێ‌و دڵ خەمبار دەبێ، بەڵام تەنیا ئەوە دەڵێین، کە پەروەردگارمان پێی ڕازی بێ، وە ئەی ئیبراهیم ئێمە بە کۆچی تۆ دڵتەنگیین !

وەك لەم سێ دەقەی سوننەتەوە بۆمان دەرکەوت، کە تەنیا وەك نموونە هێنامانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو حاڵەکانیدا پشوو درێژو خۆڕاگرو ڕاوەستاوو دامەزراوو نەلەخشاو بووە .

## یازدەیەم: تووڕەبوونی لە سەختگیریی‌و تێپەڕاندن لە دینداریيدا:

بێگومان جوانیی‌و ڕەونەقی ئیسلام لەو هاوسەنگیی (توازن)یەی دایە، کە خوای کاربەجێ تێیدا ڕەچاو کردوە، کە بەهۆی تێپەڕاندن‌و بەزایەدان (إفراط و تفريط)ەوە لەبەین دەچێ‌و، هەرکاتێکیش ئیسلام‌و دینداریی لەسەر حاڵەتی ئاسایی خۆی (کە هاوسەنگی یە) نەما، لەگەڵ عەقلی سەلیم‌و سروشت (فطرة)ی ساغدا تێکدەگیرێ‌و خەڵك پێیان تەحەممول ناکرێ، بۆیەش پێغەمبەری ﷺ دانا، زۆر بە تێکدانی ئەو هاوسەنگییە قەڵس بووە، ئەگەر بە باری تێپەڕاندن‌و بە هاندەری باش پەرستنی خوای پەروەردگاریشەوە بووبێ، وەك- بۆ نموونە- لەم دەقەوە دەردەکەوێ:

www.alibapir.com


* (عَنْ عَبدِاللّه بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً، قَالَ: وَاللّهِ يَا رَسُولَ اللّهِ ﷺ، إِنِّي لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاةِ الغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلانٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا، فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، ثُمَّ قَالَ: {إِنَّ مِنكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيَتَجَوَّزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ، وَالْكَبِيرَ، وَذَا الْحَاجَةِ}) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧٠٢).

واتە: پیاوێك گوتی: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا من لەبەر فلان کەس، کە نوێژەکەی زۆر درێژ دەکاتەوە لە نوێژی بەیانیان (واتە: نوێژی بە کۆمەڵ) دوا دەکەوم، جا هیچ کاتێك پێغەمبەری خوام ﷺ لە ئامۆژگاریی کردندا وەك ئەو ڕۆژە تووڕە نەدیوە، پاشان فەرمووی: بێگومان ئێوە کەسانی سڵەمێنەرەوەتان تێدان، با هەر کامێکتان پێش نوێژیی بۆ خەڵك کرد با کورتی بکاتەوە، چونکە بابای بێهێزو بەتەمەنو خاوەن ئیشو کاریان تێدایە.

ئاشکراشە کە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە نەبووە، کە بابای ئیمام نوێژەکەی لەبەر ڕازیکردنی خەڵکێکی بەزایەدەر (مُفَرِّط) کەمو کورت بکات، بەڵکو مەبەستی تێنەپەڕاندن بووەو گوتراویشە: (خير الأمور أوسَطُها) باشترین کارەکان نێوەنجییەکانیانن، واتە: لەو شتانەدا کە ئەملاولایان خراپن بەزایەدانو تێپەڕاندنیان تێدا ڕوو دەدات، بۆ وێنە: بەخشەربوونو سەخاوەت، حاڵەتی نێوەنجیی نێوان دەست بڵاویی و چەنگ قووچاندن (الإسراف والتقتير)ە.

**دوازدەیەم: توندیی لە هەق بێژیی و بەرپەرچدانەوەی ناهەقییدا :-**

وەك لەم دەقەدا دەبینرێ کە تەنیا وەك نموونەیەك دەیهێنینەوە:

* (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْها أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللّهِ ﷺ؟! فَقَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِيءُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ حِبُّ

**رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ، ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا})** أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٤٧٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٨٨).

واتە: قورەیش زۆر خەمیان بەو ئافرەتە مەخزوومییەوە هەڵگرت، کە دزیی کردبوو، گوتیان: ئایا کێ لەبارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بکات؟ گوتیان: جا جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید، خۆشەویستی پێغەمبەری خوا کێ دەوێرێ ئەوە بکات؟! ئیدی ئوسامە قسەی لەگەڵ کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا لە سزایەك لە سزایەکانی خوادا (کە جێبەجێ نەکرێ) تکا دەکەی؟! پاشان هەڵساو، وتاریداو فەرمووی: بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە ئەوە لە بەینی بردوون، کە ئەگەر بابایەکی پایەدار دزیی کردبایە وازیان لێدەهێنا، بەڵام ئەگەر بێهێزێك دزیی کردبایە، سزایان بەسەردا دەچەسپاند! بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزیی بکات، دەستی دەبڕم!

**سێزدەیەم: نەرمو نیانیی لە ڕاستکردنەوەی هەڵەی نەزانان‌دا :-**

کە دیارە ئەمەش بوارو بازاڕێکی دیکەیەو شێوازێکی دیکەی جیاوازی دەوێ‌و، لەوبارەشەوە بە نموونەیەك وازدێنین :

*** (عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ مَعَ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ إِذْ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَقَامَ يَبُولُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: مَهْ مَهْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {لاتزرموهُ دَعُوهُ، فَتَرَكُوهُ حَتَّى بَالَ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ: إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لاَ تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا الْبَوْلِ وَلاَ الْقَذَرِ،**

**إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللَّهِ عزَّ وجلَّ وَالصَّلاَةِ، وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَ رَجُلاً مِنَ الْقَوْمِ فَجَاءَ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ، فَشَنَّهُ عَلَيْهِ})** أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٨٥).

واتە: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مزگەوتێ بووین، ئەعرابییەك هات هەڵسا لە مزگەوتێ میز بکات، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا گوتیان: مەکە، مەکە، دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لێیگەڕێن میزەکەی پێ مەبڕن، ئیدی وازیان لێهێنا هەتا میزی کرد، پاشان پێغەمبەری خوا بانگی کرد پێی فەرموو: بێگومان ئەم مزگەوتانە ناگونجێ میزو پیسایییان تێدا بکرێ، بەڵکو تەنیا بۆ یادی خوا عزّو جلَّو نوێژو قورئان خوێندنن، یان وەك پێغەمبەری خوا فەرمووی، دەڵێ: ئینجا فەرمانی بە پیاوێك لە خەڵکەکە کردو دۆڵچەیەك ئاوی هێناو بەسەریدا کرد.

## چواردەیەم: خۆش ڕەفتاریی لەگەڵ هاوسەرانیدا :-

هەڵبەتە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەموو کەسدا لە لووتکەی خۆش ڕەفتاریی‌و ڕووگەشیی‌و زمان شیرنییدا بووە، بەڵام بەتایبەت لەگەڵ هاوسەرانیدا، کە ئاشکراشە ژیانی هاوسەریی بەبێ خۆش ڕەفتاریی‌و گەشیی‌و گفت‌و لفت شیرنیی ژیانێکی ئاسایی نابێ، چ لەلایەن مێردو چ لەلایەن ژنەوە، بەڵام بێگومان لەلایەن مێردەوە، کە مشوورخۆرو سەرپەرشتیاری ژن‌و خێزانە پێویستترە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ ... وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ... ﴿١٩﴾ ﴾ النساء، واتە: وە (ئەی پیاوینە!) بە شێوەیەکی پەسند لەگەڵ ژنەکانتاندا ڕەفتار بکەن...

ئەمەش دەقێکی سوننەت لەوبارەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە لوطف‌و دڵنەرمیی‌و خۆش ڕەفتارییەوە مامەڵەی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا - خوا لێیان ڕازی

بێ- کردوەو دڵی ڕاگرتوونو، نەیویستوە بێنە ئاستی خۆیو فشاری لێ نەکردوون، وەك هەندێك لەگەڵ ژنەکانیاندا ڕەفتار دەکەنو بە ناوی شەرعو دینەوە، نەك هەر سەغڵەتو بێزاریان دەکەن، بگرە ستەمیان لێ دەکەنو، لە زۆر ماف کە شەریعەت پێیداون، بێ بەشیان دەکەن:

* (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثٍ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَانْتَهَرَنِي، وَقَالَ: مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: {«دَعْهُمَا»، فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا، وَكَانَ يَوْمَ عِيدٍ يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالْحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَإِمَّا قَالَ «تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ»؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ خَدِّي عَلَى خَدِّهِ وَهُوَ يَقُولُ: «دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ»، حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: «حَسْبُكِ»، قُلْتُ نَعَمْ، قَالَ: «فَاذْهَبِي»}) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٩٥٠).

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لێم هاتە ژوورێو دوو کەنیزەك (یان دوو کچ)م لەلا بوون گۆرانیی ڕۆژی (بُعاث)[1] یان دەگوت، ئەویش لەسەر جێی ڕاکشاو ڕووی وەرگێڕا، ئەبوو بەکریش هاتە ژوور تێی خوڕیمو گوتی: شمشاڵی شەیتان لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ لێبدرێ؟ پێغەمبەری خواش ڕووتێکردو فەرمووی: لێیان گەڕێ، جا کاتێك (پێغەمبەر) ئاگای لێبڕا، ئاماژەم بۆکردنو چوونە دەرێ.

(١) بُعاث: ناوی جەنگێکی نێوان هەردووك هۆزی ئەوسو خەزرەجە لە سەردەمی نەفامییدا، کە دیارە گۆرانییەکی تایبەتی بەبۆنەوە گوتراوە.

وە ڕۆژێکی جەژن بوو ڕەش پێستەکان بە قەڵغانو نێزە یارییان دەکرد، یان داوام لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، یان خۆی فەرمووی: حەزدەکەی تەماشا بکەی؟ گوتم: بەڵێ، ئیدی لە پشت خۆیەوە ڕایگرتم، ڕوومەتم لەسەر ڕوومەتی بوو، دەیفەرموو: یاریی بکەن ئەی نەوەی ئەرفیدە! هەتا کاتێك ماندوو بووم، فەرمووی، بەستە؟ گوتم: بەڵێ: فەرمووی: دەبڕۆ.

## پازدەیەم: وەفاداریی بۆ هاوسەرەکانی :-

دیارە ئەمەكو وەفاداریی ژنو مێرد بۆ یەکدی، خەسڵەتێکی بەرزو پەسندە، بەتایبەت وەفاداریی پیاو بۆ ژنەکەی جوامێریی‌و گەورەییە، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو خەسڵەتەشیدا وەك سەرجەم خەسڵەتە بەرزوپەسندەکان لە لووتکە دابووە، با لەوبارەوە گوێ لەم دەقە بگرین:

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها، قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ، مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ، وَمَا رَأَيْتُهَا، وَلَكِنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكْثِرُ ذِكْرَهَا وَرُبَّمَا ذَبَحَ الشَّاةَ، ثُمَّ يُقَطِّعُهَا أَعْضَاءً، ثُمَّ يَبْعَثُهَا فِي صَدَائِقِ خَدِيجَةَ" فَرُبَّمَا قُلْتُ لَهُ: كَأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ فِي الدُّنْيَا امْرَأَةٌ إِلاَّ خَدِيجَةُ فَيَقُولُ: إِنَّهَا كَانَتْ، وَكَانَتْ، وَكَانَ لِي مِنْهَا وَلَدٌ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٨١٨).

واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویەتی: بەرانبەر بە هیچ کام لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ هێندەی خەدیجە غیرەم نەبووە، هەرچەندە نەشمدیوە، بەڵام پێغەمبەر زۆری باسدەکرد، وە جاری وابوو مەڕێکی سەردەبڕی پاشان بەش بەشی دەکردو بۆ دەستە خوشکەکانی خەدیجەی دەنارد، جارێکیان گوتم: وەك جگە لە خەدیجە هیچ ئافرەتێك لە دنیادا نەبووبێ! ئەویش دەیفەرموو: ئەو ئاواو ئاوا بوو (مەدحی دەکرد)، وە منداڵیشم لێی هەبوو.

**شازدەیەم: گونجاویی‌و تەبایی :-**

خەسڵەتێکی دیکەی دیاروگرنگی پێغەمبەری خوا ﷺ بریتییە لەوە، کە گونجاوو تەباو بە مودارا بووە لەگەڵ دەوروبەریدا، بێ ئەوەی بەشداریی شتی ناهەق‌و هەڵەیان بکات.

بۆیە ئەوانەی کە بە بیانووی پابەندیی بە شەریعەتەوە، حاڵەتێکی نامۆیی‌و ناتەبایی‌و نەگونجاویی لەگەڵ دەوروبەردا بەخۆوە دەگرن‌و، هەمیشە گرژو مۆن‌و زبرو ڕەق‌و تەقن! دەبێ بزانن کە ئەو هەڵس‌و کەوتەیان، پێچەوانەی ڕەوشت‌و ئاکاری بەرزو پەسندی پێغەمبەری خوایە ﷺ!

ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت، وەك نموونە لەبارەی موداراو گونجاویی‌و هۆگریی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خەڵك‌و دەوروبەردا بەگشتی:

* **(عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رضي الله عنه، قَالَ: دَخَلَ نَفَرٌ عَلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فَقَالُوا لَهُ: حَدِّثْنَا أَحَادِيثَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: مَاذَا أُحَدِّثُكُمْ ؟ كُنْتُ جَارَهُ، فَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ، بَعَثَ إِلَيَّ، فَكَتَبْتُهُ لَهُ، فَكَانَ إِذَا ذَكَرْنَا الدُّنْيَا، ذَكَرَهَا مَعَنَا، وَإِذَا ذَكَرْنَا الآخِرَةَ، ذَكَرَهَا مَعَنَا، وَإِذَا ذَكَرْنَا الطَّعَامَ ذَكَرَهُ مَعَنَا، فَكُلُّ هَذَا أُحَدِّثُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ)** أَخْرَجَهُ الترمذي في (الشمائل): ٣٣٧.

واتە: کۆمەڵێك لە زەیدی کوڕی ثابیت وە ژوورکەوتن، پێیان گوت: بۆمان باسی هەڵس‌و کەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکە!

ئەویش گوتی: چیتان بۆ باس بکەم؟ من دراوسێی بووم: کاتێك وەحی بۆ دادەبەزی لە دوای دەناردم‌و بۆم دەنووسی، ئینجا کاتێك باسی دنیامان دەکرد لەگەڵی باس دەکردین، وە ئەگەر باسی ڕۆژی دواییمان کردبایە لەگەڵی باس دەکردین، وەئەگەر باسی خواردنمان کردبایە لەگەڵی باس دەکردین، هەموو ئەو شتانەتان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ باس دەکەم.

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنها، قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ -أَوْ أَخُو الْعَشِيرَةِ- ثُمَّ أَذِنَ لَهُ، فَلَمَّا دَخَلَ أَلانَ لَهُ الْقَوْلَ، فَلَمَّا خَرَجَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! ﷺ قُلْتَ لَهُ مَا قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ؟ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٠٧)، وَالتِّرمِذِيُّ فِي (الشمائل): ٣٤٤.

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك مۆڵەتی هاتنە ژووری لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت‌و منیش لە خزمەتیدا بووم، فەرمووی: خراپترین کوڕی هۆزەکەیەتی (یان برای هۆزەکەیەتی) پاشان مۆڵەتیدا، جا کاتێك وەژوور کەوت، قسەی نەرمی لەگەڵ کرد، ئینجا کاتێك ڕۆیشت، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوەی فەرمووت، فەرمووت، کەچی دوایی قسەی نەرمت لەگەڵ کرد؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! بێگومان خراپترین کەس کەسێکە، کە خەڵکی لەبەر خراپییانی وازی لێبێنن، یان پشتگوێی بخەن، بۆئەوەی لە خراپەی خۆیان بپارێزن.

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنها، قَالَتْ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا)** أَخْرَجَهُ أبو داود برقم: (٣٥٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ فِي (الشمائل):٣٥١ .

واتە: پێغەمبەری ﷺ دیاریی وەردەگرت‌و لە بەرانبەردا پاداشتیشی دەدایەوە (بە خاوەنەکەی).

بێگومان، دیاریی لە خەڵك وەرگرتن‌و دیاریی پێدانیشیان، هۆکارێکی گرنگ‌و کاریگەری تەبایی‌و مودارا‌و گونجاویی‌و نیزیکییە لە خەڵك‌و کۆمەڵگا.

**هەڤدەیەم: هەڵبژاردنی ئاسانیی :-**

*** (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُنْتَصِرًا مِنْ مَظْلَمَةٍ ظُلِمَهَا قَطُّ مَا لَمْ يُنْتَهَكْ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ تَعَالَى شَيْءٌ، فَإِذَا انْتُهِكَ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ شَيْءٌ كَانَ مِنْ أَشَدِّهِمْ فِي ذَلِكَ غَضَبًا، وَمَا خُيِّرَ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ مَأْثَمًا)** أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ فِي (الشمائل): ٣٤٣.

واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە کە بەهۆی ستەمێکەوە کە لێی کراوە (وەك شەخسی خۆی) تۆڵەی کردبێتەوە، مادام هیچ شتێك لە حورمەتەکانی خوا نەشکێنرابن، بەڵام ئەگەر شتێك لە حورمەتەکانی خوا شکێنرابن، لە هەموویان توندتر تووڕەبووە لەوبوارەدا، وە هیچ کات لە نێوان دوو شتاندا سەرپشك نەکراوە، کە کامەی ئاسانترە هەڵینەبژاردبێ مادام گوناهباریی تێدا نەبووبێ.

شایانی باسیشە، کە ئەو مەبدەئەی لێرەدا دایکمان عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- لەبارەی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیخاتەڕوو چەندان ئایەتی موبارەکی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەری خوا بە ڕوونو ڕاشکاویی دەیگەیەنن بۆ نموونە:

١- ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ...﴿١٨٥﴾﴾ البقرة، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێو زەحمەتی بۆتان ناوێ....

٢- ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ... ﴿٦﴾﴾ المائدة، واتە: خوا نایەوێ لە دینداریيدا سەغڵەتتان بکات...

٣- (بَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٩٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٣٥)، وَأَحْمَد برقم: (٢٦٤٢٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٧٦) وَقَالَ:

حَسَنٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٩٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٨٥٤) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَيْخَيْنِ، واتە: دڵخۆشکەربن‌و سڵەمێنەرەوە مەبن، وە ئاسانکەر بن‌و، وە زەحمەتخەر مەبن.

کەواتە: نابێ هیچکەس پێی وابێ، کە خۆو خەڵك سەغڵەتکردن بە هەڵبژاردنی لایەنی زەحمەت‌و قورس لە ئەرکە شەرعییەکاندا نیشانەی دینداریی‌و پارێزکارییەو مایەی پاداشت‌و لێخۆشبوونی خوایە! بەڵکو بەپێچەوانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاندوە، کە ڕۆچوون‌و تێپەڕاندن (غلوّ) لە دینداریدا مایەی فەوتان‌و گومڕاییە، وەك فەرموویەتی: {هلكُ المُتَنطّعون}[1]- قَالَهَا ثلاثاً أَخْرَجَهُ مُسْلِم.

واتە: تێپەڕێنەران فەوتاون (سێ جاران وایفەرموو)، هەروەها فەرموویەتی: {إِيّاكُم والغُلوَّ في الدّين، فإنَّما أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُم الغُلوّ في الدِّين}، صحيح إبن خزيمة (٢٧٤/٤)،و إبن حبان (١٨٣/٩)، واتە: خۆتان لە تێپەڕاندن لە دینداریدا بپارێزن، چونکە بێگومان ئەوانەی پێش ئێوە تێپەڕاندن لە دینداریی دا سەری بە فەتارەتدان.

ئێستاش نۆرەی تەوەرەی چوارەم‌و کۆتاییە:

---

(١) النووي: لەبارەی مانای وشەی (المتنطعون)ەوە گوتوویەتی: (المتنطعون: المتُعَمّقون المتشدِّدون في غير موضع التشديد) رياض الصالحين، ص(٤٠)، واتە: (المتنطعّون) یانی: زۆر ڕۆچووان‌و سەختگیران لە شوێنێك لە شتێکدا، کە پێویست نەکات.

www.alibapir.com

# تـــەوەرەی چـــوارەم

## هەڵـــس وكەوتی ئاســـایی و ڕۆژانەی پێغـــەمبـــەر ﷺ

خوێنــەری بەڕێــز!

خــوا پشتیوان بێ لەم تــەوەرەی چــوارەمەدا، لــە چــەند خاڵێكداو، لەبــەر تیشــكی چەند دەقێكی سوننەتدا باسی ڕەفتــارو هەڵس وكەوتــە ئاســاییەكانی پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەكەین كە لە ژیانی ڕۆژانەیدا ئەنجامی داون.

ســەرەتــاش دەڵێیــن:

خوای زانــاو توانا لە چــەندان ئایەتی قورئاندا ئــەو ڕاســتییەی دووپــات كردۆتــەوە، كە موحەمــمەد ﷺ لــەڕووی مرۆڤبوونــەوە، بەشــەرێكە وەك خــەڵكی دیكــەو، لێیــان جیــاواز نیە، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ... ﴿٦﴾ ﴾ فصــلت، واتە: بڵێ: بێگومــان من تــەنیا بەشــەرێكم وەك ئێــوە، بــەڵام وەحییم بــۆ دێ، كــە پەرستــراوی ئێوە یەك پەرستــراوە...

٢- ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ ﴾ الإسـراء، واتــە: وە تــەنیا ئــەوە ڕێی لــە خــەڵكی گــرت، كــە پــاش ئــەوەی ڕێنماییــان بۆهــات بــڕوابێنن، جگــە لــەوە كــە گوتیــان: ئایــا خــوا بەشــەرێكی بــە پێغەمبەر ناردوە؟!

٣- ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ... ﴿١١٠﴾ ﴾ الكهف.

جا ئێســتا با ســەرنج بــدەین داخــۆ پێغەمبــەری خــوا ﷺ وەك مرۆڤێــك چــۆن لــە ژیــانی ڕۆژانەو ئاساییدا هــەڵس وكەوتی كــردوە؟!

هەڵبەتە لەو بوارەشدا دەگونجێ زۆر شت باس بکرێ، بەڵام بە حەقدە خاڵ وازی لێ دێنین، کە تێیاندا حەقدە نموونە لە هەڵسو کەوتە ئاساییەکانی ڕۆژانەی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەخەینەڕوو:

**یەکەم: ڕۆیشتنی : -**

* **(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، كَأَنَّ الشَّمْسَ تَجْرِي فِي وَجْهِهِ، وَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَسْرَعَ فِي مَشْيِهِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، كَأَنَّمَا الأَرْضُ تُطْوَى لَهُ، إِنَّا لَنُجْهِدُ أَنْفُسَنَا، وَإِنَّهُ لَغَيْرُ مُكْتَرِثٍ)** أَخْرَجَهُ الترمذي في (الشمائل)، ١١٦، وَأَحْمَد برقم: (٨٥٨٨)، وَابْنُ حِبَّانَ فِي صَحِيحِهِ برقم: (٦٣٠٩) قال شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صحيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: هیچ شتێکم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ جوانتربێ، وەك ئەوەی خۆر لە نێو ڕوویدا بێ، وە هیچ کەسم نەدیوە لە ڕۆیشتنیدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ خێراتربێ، وەك زەوی بۆ بپێچرێتەوە وابوو، ئێمە بۆ پێگەیشتنی خۆمان ماندوو دەکردو ئەویش ئاسایی بوو بەسەرخۆی نەدەهێنا.

دیارە پێشتریش باسمان کرد، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوڕو تینەوە بەڕێدا ڕۆیشتوە، وەك لە لێژایی بچێتە خوار وا بووە! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ, کە ئەوەی هەندێك لە ئەهلی عیلم کردوویانە بە عادەتو ڕەنگە بە سوننەتیشی بزانن، کە هێواش هێواش، یان بە مردە لۆخەیی بە ڕێدا دەڕۆن، پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ!

هەڵبەتە زۆریشن ئەو قسەو بیروڕاو ڕەفتارو هەڵسوکەوتانەی، کە بە سوننەت دادەنرێن، بەڵام بە پێچەوانەوە لە سوننەت دوورنو دژیشینی.

**دووەم: دانیشتنیو ڕاکشانیو پاڵدانەوەی:**

ئەمیش چەند دەقێکی سوننەت لە بارەی هەرسێك حاڵەتەکەیەوە:

* **(عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ،إِذَا صَلَّى الْفَجْرَ تَرَبَّعَ فِي مَجْلِسِهِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَسْنَاءَ) أَخْرَجَهُ أَبُو دَوُدَ برقم: (٤٨٥٢)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٩٥٤).**

واتە: پێغەمبەر ﷺ، کە نوێژی بەیانی دەکرد بە شێوەی چوار مەشقی لە شوێنی خۆی دادەنیشت هەتا بە تەواوی خۆر هەڵدەهات.

* **(عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا جَلَسَ فِي الْمَسْجِدِ احْتَبَى بِيَدَيْهِ)**، أَخْرَجَهُ التِّرمِذِي فِي (الشمائل)، ١٢٢، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٨٢٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وا بوو، کە لە مزگەوتێ دادەنیشت، هەردووك دەستی لە هەردووك لاقی وەردێنانو لاقەکانی بە سکییەوە دەنووساندن(١).

* **(عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ ﵁، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٦٣)، وَالتِّرمِذِي في (الشمائل)، ١٢١، وَصَحَّحَهُ لألباني.

واتە: (عباد بن تميم) لە مامییەوە گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەری ﷺ بینیوە لەسەر پشت لە مزگەوت ڕاکشاوەو لاقێکی خستۆتە سەر ئەوی دیکەی.

---

١) ئەوەی گوتوومە پێناسەو شەرحی شێوە دانیشتنی (إحتباء)ە .

* (عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {أَلا أُحَدِّثُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، قَالَ: وَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ مُتَّكِئًا، قَالَ: وَشَهَادَةُ الزُّورِ، أَوْ قَوْلُ الزُّورِ..} أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٥١١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٩).

واتە: پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئایا گەورەترین گوناهتان پێتان بڵێم؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: هاوبەش بۆ خوادانان، وە ئازاردانی دایكو باب، دەڵێ: وە پێغەمبەری خوا ﷺ، كە لەوكاتەدا پاڵیدابۆوە، دانیشتو فەرمووی: وە شایەدیدانی درۆ، یان قسەی درۆ.

* (عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مُتَّكِئًا عَلَى وِسَادَةٍ) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٨٢٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٩٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٤٢٢).

واتە: (جابر بن سمرة) – خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ-: پێغەمبەری خوام ﷺ دی لەسەر سەرینێك (پشتییەك) پاڵیدابۆوە.

لە كۆی ئەم دەقانەش وەردەگیرێ، كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەرسێك شێوەكانی ئیسڕاحەتكردن: دانیشتن (بەچەند شێوەیەك)، پاڵدانەوە، ڕاكشان، ئیسڕاحەتی كردوەو پشووی داوە چ لە ماڵو، چ لە مزگەوت كە دیارە هەر ئەوەش شتێكی ئاساییو سروشتییو لەگەڵ عەقڵو فیطرەتدا گونجاوە.

بۆیە دیاریكردنی جۆرە دانیشتنێكی تایبەت بە ناوی سوننەتەوە لە حاڵێكدا، كە دانیشتن لە بازنەی عادەتو هەڵسوكەوتەكان (العادات والمعاملات) دایە، كە بناغە تێیاندا ڕەواییو دەستكراوەییە، پێچەوانەی سوننەتو ڕێبازو هەڵسوكەوتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

**سێیەم: بەلای ڕاست دەستپێکردنی ئیش و کارەکانی :-**

پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابووە، کە بۆ زۆربەی هەرە زۆری ئیش و کارەکانی لای ڕاستی پێشخستوە، بەڵام هەندێك جاریش لای چەپی پێشخستوە، ئەویش بۆ ئەو ئیش و کارو هەڵسوکەوتانەی، کە پێچەوانەی پاك و خاوێنیی و ڕێزن، وەك لەم دەقانەدا دەبینرێ:

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ: فِي طُهُورِهِ، وَتَرَجُّلِهِ، وَتَنَعُّلِهِ)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد هەموو کارێکی بەلای ڕاست دەست پێبکات، لە پاك و خاوێنی (دەستنوێژو خۆشۆردن)و قژ شانەکردنی و نەعل و پێڵاو لە پێکردنی دا.

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْيُمْنَى لِطُهُورِهِ وَطَعَامِهِ وَكَانَتْ يَدُهُ الْيُسْرَى لِخَلَائِهِ وَمَا كَانَ مِنْ أَذًى)** أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٣)، وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: دەستی ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەستنوێژو خۆشۆردنیو خواردنی بوو، وە هی چەپیشی بۆ تارەت گرتنی شتی پیس بوو (بۆ وێنە: چڵم سڕین).

* **(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ؓ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ { إِذَا لَبِسْتُمْ وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَءُوا بِأَيَامِنِكُمْ})** أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٦٣٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤١٤١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٠٩٠).

www.alibapir.com


واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پۆشاکتان دەبەرکرد، وە ئەگەر دەستنوێژتان گرت، بەلای ڕاستەتان دەست پێبکەن.

* **(إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى، وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، وَلْتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٨٥٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٩٧) وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِي عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه.

واتە: ئەگەر یەکێکتان پێڵاوو نەعلی دەپێ کرد، با بە پێی ڕاستی دەست پێبکات، وە ئەگەر داینا، با بەهی چەپی دەست پێبکات، با پێی ڕاست بۆ دەپێکردن یەکەم‌و، بۆ پێڵاوو نەعل دانان دوامین بێ.

لەم دەقانەوە کە ڕابردن بۆمان دەردەکەوێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگیی بە بەکارهێنانی لای ڕاست‌و چەپیداوە، هەرکامیان لە شوێنی خۆیدا، دیارە ئەمەش نیشانەی ڕێک‌و پێکیی (نظام) ڕەچاوکردنی ئەو زاتە بووە لە هەموو کاروبارەکانیدا تەنانەت لە ئیش‌و کاری سادەو ئاساییی ڕۆژانەشیدا، چونکە بێگومان بەدیلی ڕێک‌وپێکی بریتیە لە بێ سەرەوبەرەیی‌و ئاڵۆزیی.

شایانی باسیشە، کە (النووي) زۆربەی ئەو ئیش‌و کارانەی کە پەسندە بەلای ڕاست یان چەپ دەست پێبکرێن، سەر ژمێرکردوون‌و لە یەکێك لە باسەکانی کتێبە ناودارەکەی خۆیدا، نووسیویەتی[1]:

* **(باب استحباب تقديم اليمين في كُل مَا هُو مِن باب التكريم: كالوضُوءِ وَالغُسْلِ وَالتَّيمُّمِ، ولُبْسِ الثَّوْبِ وَالنَّعْلِ وَالخُفِّ، وَالسَّرَاوِيلِ وَدُخُولِ الْمَسْجِدِ، وَالسِّوَاكِ، وَالإكْتِحَالِ، وَتقليم الأظْفار، وَقَصِّ الشَّارِبِ، وَنَتْفِ الإبْطِ، وَحلقِ**

---

١) رياض الصالحين، (١٦)، ص١٥٥.

www.alibapir.com

**الـرَّأسِ، وَالسّلامِ مِنَ الصَّلاَةِ، وَالأكْلِ، والشُّربِ، وَالـمُصافحَةِ، وَاسْـتِلاَمِ الـحَجَـرِ الأَسْـوَدِ، والـخروجِ منَ الـخلاءِ، والأخذ والعطـاء وغيـرِ ذَلِكَ مِمَّا هُوَ فـي معنـاه. ويُسْـتَحَـبُّ تَقديمُ اليسارِ فـي ضـدِ ذَلِكَ، كالامْتِخَاطِ وَالبُصَاقِ عن اليسار، ودخولِ الـخَلاءِ، والـخروج من الـمَسْجِدِ، وخَلْعِ الـخُـفِّ والنَّعْـلِ والسـراويلِ والثـوبِ، والإِسْـتِنْجَاءِ وفِعلِ الـمُسْـتَقْذَرَاتِ وأَشْبَاه ذَلِكَ).**

واتە: باسی پەسندیی پێشخستنی لای ڕاست لەهەر کارێکدا، کە ڕێزی تێدایە، وەك: دەستنوێژو خۆشۆردنو تەیەمموم‌و پۆشینی بەرگ‌و دەپێکردنی پێڵاوو گۆرەو شەڕواڵ، وە چوونە مزگەوت‌و، سیواك کردن‌و، چاوشتن‌و، نینۆك کردن‌و سمێڵ کورتکردنەوەو مووی بن هەنگڵ هەڵقەندن‌و سەرتاشین، وە سەلامدانەوە لە نوێژ، وە خواردن‌و خواردنەوە، وە تۆقەکردن، وە دەستدان لەبەردە ڕەشەکە، وە چوونە دەر لە ئاودەست، وە شت وەرگرتن‌و وێدان‌و هەر شتێکی دیکەی لەم بابەتە.

وە پەسندە کە لای چەپ پێشبخرێ لە هەموو ئەو شتانەدا، کە پێچەوانەی ئەوانەن، وەك: چڵم سڕین‌و تف ڕۆکردن لەلای چەپ، وە چوونە ئاودەست، وە چوونەدەر لە مزگەوت، وە داکەندنی گۆرەو پێڵاوو شەڕواڵ‌و پۆشاك، وە تارەتگرتن‌و ئەنجامدانی کاری بێزلێکراوو وێنەی ئەوانە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

**چوارەم: خـواردن و خواردنەوەی : -**

ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی چۆنیـەتیو جۆری خـواردنو خواردنـەوەی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ، کـە لەبـەر ڕۆشـناییيان دا دەتـوانین زۆر هەڵـەو پەڵـەو تێپەڕاندنی مسوڵمانان لە بواری خـواردنو خواردنەوەدا ڕاست بکەینەوە،

* (**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ﷺ **مَا عَـابَ رَسُـولُ اللَّهِ** ﷺ **طَعَـامًا قَـطُّ، كَانَ إِذَا اشْـتَهَى شَـيْئًا أَكَلَـهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَـهُ**) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، الْبُخَـارِيُّ بـرقم: (٥٤٠٩)، وَمُسْـلِمٌ برقم: (٢٠٦٤) وَاللَّفْظُ لِلْمُسْلِمِ.

واتە: هەرگیـز پێغەمبەری خـوا ﷺ ڕەخنەی لە خـواردن نـەگرتوە، ئەگـەر پێـی خۆش بووبێ خواردوویەتیو، ئەگەر پێی خۆش نەبووبێ وازی لێهـێناوە.

* (**عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ قَـالَ: كُنْـتُ غُلاَمًـا فِي حَجْرِ رَسُـولِ اللهِ** ﷺ، **وَكَـانَتْ يَـدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُـولُ اللهِ** ﷺ: **يَا غُـلاَمُ! سَـمِّ اللهَ، وَكُـلْ بِيَمِينِكَ، وَكُـلْ مِمَّا يَلِيـكَ**) مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ، الْبُخَـارِيُّ بـرقم: (٥٣٧٦)، وَمُسْلِمٌ برقـم: (١٠٨).

واتە: عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە - خوا لێيان ڕازی بێ- دەڵێ: منـداڵ بـووم لەژێـر سەرپەرشـتياريی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ، وەدەستم لـە قـاپی خواردنەکـە دەگێڕا، پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم: ڕۆڵە گیـان! ناوی خـوا بێنەو، بە دەسـتی ڕاستت بخۆو، لە پێش خۆتەوە بـخـۆ.

* (**عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ وَهْبِ بْنِ عَبْدِ اللَّـهِ** ﷺ، **قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ** ﷺ: {**لاَ آكُـلُ مُتَّكِئًا**}) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد برقم: (١٨٧٧٦)، والبُخَارِيُّ برقـم: (٥٣٩٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧٧١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە پاڵدانەوەوە ناخۆم.

* (عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ بِثَلَاثِ أَصَابِعَ فَإِذَا فَرَغَ، لَعِقَهَا) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٧٢١١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٨٥٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧٧١).

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ دی بە سێ پەنجان خواردنی دەخوارد، کاتێك تەواو بوو پەنجەکانی لێستەوە.

* (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٣٩٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧١٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٢٥٤).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە شیرینیو هەنگوین بوو.

* (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَشَ مِنْهَا) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٦٢١)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٣٥)، وَمُسْلِم برقم: (٥٠١).

واتە: گۆشتیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، ڕانێکیان بۆ بەرزکردەوە، کە حەزی لێدەکرد بە دەمی لێی پچڕیو خواردی.

* (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ رضي الله عنه، قَالَ: أَكَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شِوَاءً فِي الْمَسْجِدِ) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٧٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ في (الشمائل) برقم: (١٦٧).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ گۆشتی برژاومان خوارد لە مزگەوتی.

* (عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَأَلَ أَهْلَهُ الأُدُمَ، فَقَالُوا: مَا عِنْدَنَا إِلاَّ خَلٌّ، فَدَعَا بِهِ فَجَعَلَ يَأْكُلُ بِهِ وَيَقُولُ: {نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ}). أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٢٠٥٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای پێخۆرێکی لەماڵەوەیان کرد، ئەوانیش گوتیان: بەس سرکەمان لەلایە ئەویش داوای کرد بۆی بێنن، ئیدی دەیخواردو دەیفەرموو: سرکە باشترین پێخۆرە، سرکە باشترین پێخۆرە.

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلاثًا)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٥٦٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٢٨).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو لە کاتی خواردنەوەدا سێ جار هەناسەی دەدا، واتە: لە دەرەوەی ئەو دەفرەی لێی دەخواردەوە.

* **(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الإِنَاءِ أَوْ يُنْفَخَ فِيهِ)** أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧٢٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٤٢٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٨٨) وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٤٢٧٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە، کە لە دەفردا هەناسە بدرێ، یان فووی لێ بکرێ.

* **(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، قَالَ: سَقَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مِنْ زَمْزَمَ، فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (١٦٣٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٢٧).

واتە: ئاوی زەمزەممدا بە پێغەمبەری خوادا ﷺ بە پێوە خواردیەوە.

* **(عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رضي الله عنه، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ الله ﷺ يَشْرَبُ قَائِمًا وَقَاعِدًا)** أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٨٣) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە پێوەو بە دانیشتنەوە دەیخواردەوە.

* (عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، قَـالَ: كُنَّـا نَأْكُلُ عَلَى عَهْـدِ رَسُـولِ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَمْشِـي، وَنَشْـرَبُ وَنَحْـنُ قِيَامٌ) أَخْرَجَـهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٨٠)، وَقَالَ: هَـذَا حَـدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: ئێمە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ بە ڕۆیشتنەوە دەمانـخواردو بە پێوە دەمانـخواردەوە.

کەواتـــە:

هەڵوێستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری خواردنو خواردنەوەدا بەم شێوەیە بووە:

١- هەرگیز ڕەخنەی لە خواردنو خواردنەوە نەگرتوە.
٢- ناوی خوای هێناوەو بە دەستی ڕاستیو لە پێش خۆیەوە خواردوویەتی.
٣- بە پاڵدانەوەوە شتی نەخواردوەو نەخواردۆتەوە.
٤- پاش خواردن، پەنجەکانی خۆی لێستۆتەوە.
٥- حەزی لە شیرینیو هەنگوینو گۆشتی ڕانی ئاژەڵ بووەو شتی خۆشی خواردوە ئەگەر چنگی کەوتبێ، ئەگەرنا هەرچی چنگ کەوتبێ بە ئارەزووەوە خواردوویەتیو، هەرچەندە خواردنێکی سادەش بووبێ مەدحی کردوە.
٦- بە یەکجار خواردنەوەی نەخواردۆتەوە، بەڵکو بە زۆریی بە سێ جار خواردوویەتەوەو لە دەرەوەی دەفرەکەش هەناسەی داوە.
٧- وە جاری وابووە بە ڕۆیشتنەوە هاوەڵان خواردنیان خواردوە، وە پێغەمبەریشو هاوەڵانیش بە پێوەو بەدانیشتنەوەش خواردنەوەیان خواردۆتەوە.

**پێنجەم: خۆ بۆنخۆشکردنی :-**

پێشتریش باسمان کرد، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خودی خۆیدا بۆنخۆش بووە، بەتایبەت ئارەقەی، بەڵام وێڕای ئەوەش بۆنی خۆشیشی بەکارهێناوەو زۆر گرنگیی بە بۆنخۆشیی داوە، وەك لەم دەقانەوە دیارە:

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ سُكَّةٌ يَتَطَيَّبُ مِنْهَا)** أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرَقم: (٤١٦٤)، وَالتِّرمِذِيُّ فِي (الشمائل) برقم: (٢١٨) وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عەتردانێکی هەبوو لێیەوە بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا .

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لا يَرُدُّ الطِّيبَ)** أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤٤٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنی خۆشی وەردەگرتو نەیدەگێڕایەوە.

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: {حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُم الطِّيبُ، وَالنِّسَاءُ، وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاةِ}** أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٣١٥)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٩٣٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٦٧٦) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، قَالَ الشَيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە دونیای ئێوە بۆنی خۆشو ئافرەتانم لەلا خۆشەویست کراون، وە دڵخۆشیی تەواوم لە نوێژێ دایە.

کەواتە: پێچەوانەی بۆن خۆشیی، پێچەوانەی سوننەتو عادەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بۆیە پێویستە ئەوانەی کە بە بیانووی خواپەرستییو دنیا بەکەمگرتن (زهد)ەوە جەستەی خۆیان پشتگوێ دەخەن، لەڕووی پاكو خاوێنییو خۆ بۆنخۆشکردنەوە، بزانن و دڵنیا بن، کە بەو ڕەفتارەیان لە خوا نیزیك ناکەونەوە ئایا دەگونجێ بە پێچەوانەی ڕەوشتو ڕەفتاری پێغەمبەرەوە لە خوا نیزیك

بکەوینـەوە؟ یان ئایا پیس‌و پۆخـەڵێی‌و چڵکن‌و کوڵکنیی‌و بۆن ناخۆشیی مایەی لە خوا نیزیك کەوتنەوەیە؟

## شەشەم: قسـەکردنی :-

لەبارەی شێوازو چۆنیەتی قســـەکردنی پێغەمبەری خـواوە ﷺ، دەگونـجێ زۆر شـت باس بکرێ، بەڵام بەم چەند دەقــە واز دێنیـن:

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلاثًا حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ، وَإِذَا أَتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، سَلَّمَ عَلَيْهِمْ ثَلاثًا)** أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٢٤٤)، البُخَارِيُّ برقم: (٩٥).

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ، کـە قسـەیەکی دەکـرد سـێ جـاران دووبـارەی دەکردەوە، تاکو لێی فـام بکرێ، وە ئەگەر لای کۆمـەڵێك‌و سڵاوی لێکـردبان، سێ جاران سڵاوی لـێ دەکردن.

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْرُدُ سَرْدَكُمْ هَذَا، وَلَكِنَّهُ كَانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلامٍ بَيِّنٍ فَصْلٍ، يَحْفَظُهُ مَنْ يَجْلِسُ إِلَيْهِ)** أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٦٢٥٢)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٦٣٩)، وَقَـالَ: حَسَـنٌ صَحِيحٌ، قَـال الشيخ الألبـاني: حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئێوە بەخێرایی قسەکانی ڕیز نەدەکـردن، بەڵکـو بە شـێوەیەکی ڕوون‌و ئاشـکرا قسەی دەکرد، کە ئـەو کەسـەی لـەلای دانیشـتبایە لەبـەری دەکـرد.

* **(عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رضي الله عنه، قَالَ: سَأَلْتُ خَالِي هِنْدُ بْنُ أَبِي هَالَةَ، وَكَانَ وَصَّافًا، فَقُلْتُ: صِفْ لِي مَنْطِقَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَاصِلَ الأَحْزَانِ، دَائِمَ الْفِكْرَةِ، لَيْسَتْ لَهُ رَاحَةٌ، طَوِيلُ السَّكْتِ، لاَ يَتَكَلَّمُ فِي غَيْرِ**

**حَـاجَـةٍ، يَفْتَتِـحُ الْكَلاَمَ وَيَخْتِمُهُ بِاسْـمِ اللّهِ تَعَالَى، وَيَتَكَلَّمُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، كَلاَمُـهُ فَصْلٌ، لاَ فُضُولَ وَلاَ تَقْصِيـرَ...)** أَخْرَجَـهُ الطَّبَرَانِـيُّ بـرقم: (٤١٤)، وَالتِّرمِـذِيُّ فـي (الشمائل) برقم: (٢٢٦).

واتـە: حەسەنی کوڕی عـەلی – خـوا لێیان ڕازی بێ- دەڵـێ پرسـیارم لـە هینـدی کوڕی ئەبی هـالەی خاڵم کرد، کە بابایەکی زۆر کارامـە بوو لە وەسـفکردندا، گـوتم: بـۆم باسی قسەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بکە، گوتی: پێغەمبەری خـوا بـەردەوام پـەژارەدار بـوو، هەمیشـە لـە بیـرکردنەوەدا بـوو، ئیسـڕاحەتی نـەبوو، بـە زۆریـی بێدەنگ بوو، بە گوێرەی پێویسـت نەبووایـە قسـەی نـەدەکرد، بـەناوی خـوای بـەرز فەرمایشـتەکانی دەسـت پێـدەکردو کۆتـایی پێـدەهێنا لـە قسـەکردنیدا وشـەی وای بەکاردەهێنان کۆکـەرەوەی مانـاو مـەبەستی زۆر بـوون (وشـەی کـەمو مانـای زۆر)، قسـەکانی ڕوون بوون، نە زۆرو بۆر بوون، نە کەمو کورت...

* **(وَعَـنْ عَمَّـارِ بْنِ يَاسِـرٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنهُمَا، قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ يَقُـولُ: إِنَّ طُولَ صَلَاةِ اَلرَّجُلِ، وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِـهِ، فَـأَطِيلُوا الصَّـلاَةَ وَاقْصُـرُوا الْخُطْبَةَ)** رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٠٤٦).

واتـە: عـەمـاری کوڕی یاسر - خوا لێیان ڕازی بێ-دەڵێ: گـوێم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومـان درێژیی نوێژی پیاوو کـورتیی وتـاری نیشـانەی شـارەزاییەتی، بۆیە نوێژ درێژ بکـەنەوەو وتار کورت بکەنەوە.

کەواتـە:

پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە قسەکردنیشـیدا وەك سـەرجەم حاڵـەتو هـەڵسو کەوتەکانی تەواوترینو چاکتـرین شێوازو چۆنیەتی هەبووە، بەم شێوەیەی خوارێ:

١ - قسەکردن پاش بیرکردنەوە.

٢ - بەناوی خوا دەست پێکردن‌و کۆتایی پێهێنان.

٣ - قسەی ڕوون‌و ئاشکرا.

٤ - دووبارە کردنەوەی قسەی گرنگ.

٥ - بەپێی پێویست قەسەکردن.

٦ - بەکارهێنانی وشەی مانا کۆکەرەوە.

٧ - نەزۆرو بۆریی‌و نەکەم‌و کورتیی لەڕووی قەبارەی وشەو قسەکانەوە.

## حەوتەم: قورئان خوێندنی : -

هەرچەندە قورئان خوێندن یەکێکە لە خواپەرستیە هەرە گەورەکان‌و بەرزترین جۆری یادی خوا کردنیشە، بەڵام بۆیە لەم تەوەرەیەدا هێنامان، چونکە قورئان خوێندن یەکێك بووە لە هەڵس‌وکەوتە ئاساییی‌و ڕۆژانەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ‌و شەوانەو ڕۆژانە دووبارەی کردۆتەوە، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی چۆنیەتی قورئان خوێندنی ئەو زاتە بەرزو ناوازەیەوە ﷺ:

* (عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سُئِلَ أَنس بْنُ مَالِكٍ رضي الله عنه: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَ: كَانَتْ مَدًّا) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٠٢٥)، الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٧٥٩).

واتە: قەتادە دەڵێ: لەو ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی: قورئان خوێندنی چۆن بووە؟ گوتی: قورئانخوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ لێککێشراوە بوو.

* (عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ، يَقُولُ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ثُمَّ يَقِفُ، ثُمَّ يَقُول: ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ ثُمَّ

www.alibapir.com


**يَقِــفُ وكَــانَ يَقْرَؤُهَـــا: ﴿مَلِـــكِ يَـوْمِ الدِّيـــنِ﴾** أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٦٦٢٥)، وَالتِّرمِــذِيُّ برقم: (٢٩٢٧) وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: ئومــمو ســەلەمە – خــوا لێــی رازی بــێ- گوتوویــەتی: پێغەمبــەری خــوا ﷺ قورئــان خوێندنەکـــەی لەیــەك دەپچــڕاند، دەیفــەرموو: ﴿الْحَمْـدُ لِلَّـهِ رَبِّ الْعَــالَمِينَ﴾ ئینجــا دەوەســـتا پاشــان دەیفــەرموو: ﴿الرَّحْمَـــنِ الرَّحِيـــمِ﴾ ئینجــا دەوەستا، وە ﴿مَلِـكِ يَوْمِ الدِّيــنِ﴾ی دەخوێنـد.

* **(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ ﷺ قَــالَ: سَــأَلْتُ عَائِشَـــةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا، عَـنْ قِـرَاءَةِ النَّبِــيِّ ﷺ؟ أَكَانَ يُسِــرُّ بِالْقِـرَاءَةِ أَمْ يَجْهَـرُ؟ فَقَالَــتْ: كُــلُّ ذَلِكَ قَدْ كَــانَ يَفْعَــلُ، رُبَّمَا أَسَــرَّ بِالْقِـرَاءَةِ، وَرُبَّمَا جَهَـرَ، فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّـهِ الَّــذِي جَعَــلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً)** أَخْرَجَـهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٣١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی قەیس دەڵێ: پرسیارم لە عـائیشە - خوا لێـی ڕازی بـێ- کرد لەبارەی قوڕئان خوێندنی پێغەمبەرەوە ﷺ، کە ئایا بەدەنگی نزم دەیــخوێند، یان بە دەنگی بەرز؟ گوتی: هــەردوو شــێوازەکەی هــەبوو، جـاری وابـوو بــە کپیــیو جاری واش بوو بە دەنگی بڵـند دەیـخوێند، گوتــم: ستـایش بـۆ ئـەو خوایـەی، کـە فراوانیی خســتۆتە کارەکەوە .

## هەشــتەم: گوێگــرتنی بۆ شیعرو قسـەی ئاسـایی خـەڵك : -

وەك پێشـتریش باســـمان کـرد پێغەمبــەری خـوا ﷺ لەگـەڵ خـەڵكو دەوروبەریـدا گونجاوو تەباو بە مودارا بووە، ئاشکراشە یەکێك لە هۆکـارەکانی گونـجاویی و تەبـایی مرۆڤ لەگەڵ خەڵکدا، بریتیە لە گوێگرتنی بە قسـەو گفـتوگۆیـانو بەشـدارییکردنی لە کۆڕو مـەجلیسیاندا، ئەمـەش چەند دەقێك لەوبارەوە، کـە پێغـەمبــەری خــوا ﷺ بەشـداریی قسـەو بـاسو خواسـی خەڵکـی کــردوەو گوێـی بۆ گرتـوون:

www.alibapir.com


* (**عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ** رضي الله عنه، **قَالَ: جَالَسْتُ النَّبِيَّ** ﷺ **أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ مَرَّةٍ، وَكَانَ أَصْحَابُهُ يَتَنَاشَدُونَ الشِّعْرَ، وَيَتَذَاكَرُونَ أَشْيَاءَ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَهُوَ سَاكِتٌ، وَرُبَّمَا يَتَبَسَّمُ مَعَهُمْ**) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٨٥٠) قَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٤٣٤).

واتە: جابیری کوڕی سەموڕە – خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: زیاتر لە سەد جار لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دانیشتووم، وە هاوەڵەکانی شیعریان دەگوتو باسی شتی ڕۆژگاری نەفامێتییان دەکرد، ئەویش بێدەنگ بوو، جاری واشبوو لەگەڵیان پێدەکەنی (بە شێوەی زەردەخەنە).

* (**عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ** رضي الله عنه، **قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ، **فَأَنْشَدْتُهُ مِائَةَ قَافِيَةٍ مِنْ شعر أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ، كُلَّمَا أَنْشَدْتُهُ بَيْتًا، قَالَ لِيَ النَّبِيُّ** ﷺ: {**هِيهِ، حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةً، -يَعْنِي مِائَةَ بَيْتٍ- فَقَالَ النَّبِيُّ** ﷺ: **إِنْ كَادَ لِيُسْلِمُ**}) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٣١).

واتە: شەریدی کوڕی سوەید - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ سواربوو بووم، سەد دێرە شیعرم لە قسەی ئومەییەی کوڕی ئەبی صەلتی ئەثثەقەفییم بۆ گوت، هەر کە شیعرێکم بۆ دەگوت، دەیفەرموو: دەی بیڵێ، هەتا سەد دێرم بۆگوت، ئینجا پێغەمبەر فەرمووی: نیزیك بووە مسوڵمان ببێ.

* (**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ **يَضَعُ لِحَسَّانَ بْنِ ثَابت مِنْبَرًا فِي الْمَسْجِدِ يَقُومُ عَلَيْهِ قَائِمًا يُفَاخِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ، **أَوْ قَالَ يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ، **وَيَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: {**إِنَّ اللَّهَ يُؤَيِّدُ حَسَّانَ بِرُوحِ الْقُدُسِ مَا يُفَاخِرُ، أَوْ يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ}) أَخْرَجَهُ أحْمَد، برقم: (٢٤٤٨١)، وَالتِّرمِذِيُّ في (الشمائل) برقم: (٢١٣)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٦٥٧).

www.alibapir.com


واتە: پێغەمبــەری خوا ﷺ دوانگەیەکی بۆ حەسسـانی کوڕی ثـابیـت – خــوا لێـی ڕازی بـێ- لـە مزگـەوتێ دروسـت دەکـرد، لەسـەری دەوەسـتاو بـەرگریی لـە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، یان گوتی: لەسـەر پێغەمبـەری خـوای دەکـردەوە، وە دەیفەرموو: بێگومـان خوای بەرز بە گیانی پیرۆز (جیبـریل) پشتگیـریی لە حەسسـان دەکات، هەتا ئەو لەسەر پێغەمبــەری خوا ﷺ بکاتەوە یان ستایشی بکات.

کەواتە: ڕەوشتەو ڕەفتـاری پێغەمبــــەر ﷺ لـەبواری تێکـەڵیی لەگـەڵ خـەڵكو گوێگرتنی بۆ قسـەو بـاسو خـواسو شـیعری بەرومەجلیسـاندا، ئـاوا بـووەو وەك دەبینیـــن زۆر گونجـــاوو کـراوە بـووە، بۆیــە پێویسـتە ئێمـەش وەك پێغەمبــەری پێشەوامان بـە حەوسـەڵەو سـەلیقەو کراوەو تەبابیــنو، پێمـان وانـەبێ کـە دەبـێ هەمیشــە کـۆڕو مەجلیســمان ئایــەتی قورئــانو فەرمایشــتی پێغەمبــەری تێـدا بگوترێ، بەڵکو گرنـگ ئەوە بە ناهەقیو ناشـەرعیی تێدا نەبێ، وە ئەگـەر بووش ڕێگریی لـێ بکەین، یان چۆڵی بکەینو بەجێبهێڵیــن.

**نۆیـەم: سـڵاوکردن لەگـەڵ وردو درشـتو ڕووخـۆش بوونی لەگەڵیان :-**

پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشــە ڕوو خـۆشو دەم بەزەردەخەنـە بـووەو، هەرکـەس پێی گەیشتبێ ڕێزی لێگرتووەو سەلامی لێکـردوە، چ پیـاو چ ئـافرەت چ منـداڵ، وەك لەم دەقانەی سوننەتەوە دیـارە:

* **(عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ** رضي الله عنه، **قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ تَبَسُّمًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٤١)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (مختصر الشمائل) برقم: (١٦٥٧).

واتە: هیچ کەسێکم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر زار بەزەردەخەنە بووبێ.

* **(عَنْ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه، مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلاَ رَآنِي إِلاَّ ضَحِكَ)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٣٦١١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٥١٨).

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: لەوەتی مسوڵمان بووم پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێی چوونە ژووری (ماڵیانی) لێنەگرتووم، وە هیچ کات نەیبینیوم، کە پێنەکەنیبێ.

* **(عن أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَى مَجْلِسٍ فِيهِ أَخْلاَطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةَ الأَوْثَانِ، واليَهُودِ فَسَلَّمَ عَلَيْهِم النَّبِيُّ ﷺ)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٥٦٦٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٩٨).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆڕێکدا ڕەتبوو، کە تێکەڵەیەك بوو لە مسوڵمانانو هاوبەشدانەرانی بتپەرستو جوولەکە، پێغەمبەریش ﷺ سەلامی لێکردن.

* **(عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتَ يَزِيدَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ ﷺ مَرَّ فِي الْمَسْجِدِ يَوْمًا، وَعُصْبَةٌ مِنَ النِّسَاءِ قُعُودٌ، فَأَلْوَى بِيَدِهِ بِالتَّسْلِم)** أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٩٧) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بە مزگەوتدا تێپەڕیو کۆمەڵێك ئافرەتیش دانیشتبوون، بەدەست ئاماژەی سەلامکردنی بۆ کردن.

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ مَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَفْعَلُهُ)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٦٢٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١٦٨).

واتــە: لــە ئەنەســەوە - خــوا لێــی ڕازی بــێ- گێڕراوەتــەوە، کــە بــەلای کۆمەڵــە منداڵێکدا ڕەتبووەو سەلامی لێکردوون، وە گوتوویــەتی: پێغەمبــەری خــواش ﷺ هـــەر وای دەکــرد.

کەواتــە: پێغەمبــەری خــوا ﷺ هەمیشــە ڕووخــۆش‌و دەم بەزەردەخەنــە بــووەو ڕێــزو حورمەتی لە هەموو کەس گرتووەو هەر کەس پێی گەیشتبێ سلاوی لــێ کــردوە.

**دەیـەم: قســەی خــۆش‌و گاڵتە کــردنی :**

یەکێکی دیکە لە عادەتــەکانی ئــەوە بــووە، کــە جاروبــار قســەی خــۆش‌و گاڵتــەی لەگــەڵ هاوەڵانیــدا کـــردوە، چ پیـــاو بووبــێ، چ ئــافرەت چ منــداڵ وەك لــەم دەقانــەوە دیــارە:

* **(عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﵁، قَـالَ: قَـالُوا يَا رَسُولَ اللَّـهِ ﷺ! إِنَّـكَ تُدَاعِبُـنَا ؟ قَـالَ: نَعَـمْ غيـر لا أَقُولُ إِلا حَقًّا)** أَخْرَجَـهُ التِّرمِـذِيُّ برقــم: (١٩٩٠) وَقَــالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني فــي (مــختصر الشمائل) برقم: (٢٠٢).

واتــە: ئــەبو هــورەیرە - خــوا لێــی ڕازی بــێ- دەڵــێ: (هــاوەڵان) گوتیــان: ئــەی پێغەمبەری خــوا ﷺ تــۆ قســەی گاڵتــەمان لەگــەڵ دەکــەی! فــەرمووی: بەڵـــێ: بــەڵام جگــە لە هــەق ناڵــێم.

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِـكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَـالَ لَـهُ: (يَـا ذَا الأُذُنَيْـــنِ)! يعـني: يُمَـازِحُهُ)** أَخْرَجَـهُ التِّرمِــذِيُّ بـرقم: (٣٨٢٨)، وَقَـالَ هَــذَا حَـدِيثٌ صَـحِيح غَرِيـبٌ وَصَـحَّحَهُ الألبــاني.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك - خوا لێی ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبــەری خــوا ﷺ پێی فەرمــووە: هۆ خاوەن دوو گــوێ! یانی: گاڵتــەی لەگــەڵ کــردوە.

www.alibapir.com


* (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، يَقُولُ: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، لَيُخَالِطُنَا حَتَّى يَقُولَ لأَخٍ لِي صَغِيرٍ: {يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ ؟ لأَنَّهُ كَانَ لَهُ نُغَيْرٌ يَلْعَبُ بِهِ، فَمَاتَ فَحَزِنَ الغُلامُ عَلَيْهِ، فَمَازَحَهُ النَّبِيُّ ﷺ}) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٥٧٧٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١٥٠) وَغَيْرُهُم.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تێکەڵییمانی دەکرد، هەتا بە برایەکی بچووکمی دەفەرموو: ئەی عومەیر! نوغەیر چی لێهات؟ چونکە بەچکە باڵندەیەکی هەبوو یاری پێدەکرد، مرد، کوڕەکەش پەرۆشی بوو، پێغەمبەریش ﷺ گاڵتەی لەگەڵ کرد.

* (عَنْ أَنَسٍ ﵁، أَنَّ رَجُلاً اسْتَحْمَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: {إِنِّي حَامِلُكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ، فَقَالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! وَمَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ الإِبلِ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَهَلْ تَلِدُ الإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ}) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٠٠٠)، التِّرمِذِيُّ في (الشمائل) برقم: (٢٠٣) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيح غَرِيبٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: پیاوێك داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، کە سواری وڵاخێکی بکات، ئەویش فەرمووی: سواری بەچکە حوشترێکت دەکەم! گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! جا چی لە بەچکە حوشتر بکەم؟ ئەویش فەرمووی: ئەدی حوشتری گەورەش هەر بەچکە حوشتر نین ؟!

* (عَنِ الْحَسَنِ البَصرِي قَالَ: أَتَتْ عَجُوزٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُدْخِلَنِي الْجَنَّةَ، فَقَالَ:{ يَا أُمَّ فُلاَن، إِنَّ الْجَنَّةَ لاَ تَدْخُلُهَا عَجُوزٌ قَالَ: فَوَلَّتْ تَبْكِي فَقَالَ: أَخْبِرُوهَا أَنَّهَا لاَ تَدْخُلُهَا وَهِيَ عَجُوزٌ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ ﴾

www.alibapir.com


الواقعة[1]}) أَخْرَجَهُ التِّرمِـذِيُّ فـي (الشمائل) برقم: (٢٤٠)، وَحَسَّـنَهُ الألباني فـي (مـختصر الشمائل) برقم: (٢٠٥).

واتە: پیرەژنێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! داوا لە خوا بكە بمخاتە بەهەشتێ، فەرمووی: ئەی دایكی فلان! بێگومان پیرەژن ناچێتە بەهەشتێ، دەڵێ: ئەویش بە گریانەوە ڕۆیی، فەرمووی: پێی بڵێن: كاتێك دەچێتە بە هەشتێ پیرەژن نابێ، چونكە خوای بەرز فەرموویەتی: «ئێمە ئافرەتانی بەهەشتمان بەشێوەی تایبەت دروست كردوون، گێڕاومانن بە كچ لەگەڵ هاوسەرانیاندا گونجاوو هاوتەمەنن».

كەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ جاروبار نوكتەو قسەی خۆشیشی هەبووە، بەڵام وەك خۆی فەرموویەتیو لەو چەند نموونەیەشەوە، كە هێنامانەوە دیارە، تەنیا هەقو ڕاستیی فەرمووە.

**یازدەیەم: پێكەنینی : -**

پێشتر باسمان كرد، كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە دەم بە پێكەنینو زەردەخەنە بووە، جا ئایا پێكەنینی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن چۆنی بووە؟ با سەرنجی چەند دەقێكی سوننەت بدەین لەوبارەوە:

* (**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ** رضي الله عنه، **قَالَ مَا كَانَ ضَحِكُ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ، **إِلاَّ تَبَسُّمًا**) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٤٢)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح التِّرمِذِي) برقم: (٢٨٨١).

---

١) العروب من النساءِ العَرُوس الـمُتَحببّة الى زوجها والجمع: عُرُب، مختار الصحاح، ص(٣٧٢)، واتە: (عُرُب) كۆی (عَروب)ەو ئەمیش یانی ژنێك كە خۆی لەلای مێردی خۆشەویست بكات.

واتە: پێکەنینی پێغەمبەری خوا ﷺ بەس زەردەخەنە بوو.

* **(عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطُّ مُسْتَجْمِعًا ضَاحِكًا حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ[1] إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ)** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٤٨٢٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨٩٩) وَغَيْرُهُم.

واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە پڕ بەزاری پێبکەنێ بە شێوەیەك کە مەلاشووی ببینم، بەڵکو بەس زەردەخەنەی دەهاتێ.

کەواتە: هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین بووە، بەڵام شێوەی پێکەنینەکەی بەزۆری زەردەخەنە بووەو بە قاقا پێنەکەنیوە.

لێرەشەوە دەزانین، کە ئەوانەی بە بیانووو پاساوی زێدە خواپەرستیی و پارێزکارییەوە، هەمیشە مۆن و گرژن و زەردەیان نایەتە سەر لێو، وە پێیان وایە ڕووخۆشیی و زمان شیرینی و پێکەنین نیشانەی بێ تەقواییە، خراپ حاڵی بوون، چونکە مادام تەقوا پابەندیی بێ بەشەریعەتەوەو پێغەمبەریش ﷺ، کە بەرجەستەکەری شەریعەتە، هەمیشە گەش و گوڵ و گەفت و لفت شیرین و دەم بە پێکەنین بووە، دەڵێین: بەشێك لە تەقوا بریتیە لە سەرو ڕووخۆشیی و قسە شیرینی لەگەڵ خەڵکداو، مۆن و مرچیی و گرژیی و ترش و تاڵیی پێچەوانەی تەقواو ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوایە، خوایە هەردەم سەڵات و سەلام و بەرەکاتی لێ بێ هەتا دنیا دنیایە.

## دوازدەیەم: گریانی : -

---

١) اللَّهاة: الهَنَةُ المطبِقَةُ في أقصى سقف الفَم، والجمع: اللَّهَا واللهَوات، مختار الصحاح، ص: (٥٢٣)، واتە: (لهاة) کۆیەکەی (لَها)، و(لهات)ە، ئەو گۆشتەیە کە بەوپەڕی سەقفی زارەوەیە، کە بە کوردی (مەلاشووی) پێدەڵێن.

هەركام لە گریانو پێكەنیــن لـەكاتی هـەبوونی هۆكاریانـدا، دوو حاڵـەتی ئاسـایی مرۆڤــەكانن، وەك خـوای عـزّ وجـلّ فەرموویـەتی: ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾ النجم، واتـە: وە (خـوا) ئەو كەسەیە، كە (مرۆڤ) پێدەكەنینیو دەگریـەنێ.

پێغەمبەری خواش ﷺ، كە مرۆڤێك بـووە بـەمانای وشـە، تێـرو تـەواو، ئـەو دوو حاڵەتەشی بەسەردا هاتوون، جا ئێمە لـە خـاڵی پێشـوودا چـەند دەقێكـی سوننەتـمان لەسەر پێكـەنینی پێغەمبـەری خـوا ﷺ هێنانـەوەو، لێرەشـدا چـەند دەقێكـی دیكـە لەسـەر حاڵەتی گریـانی دێنینەوە:

* (**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ عَنْ أَبِيهِ** رضي الله عنه**، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **وَهُوَ يُصَلِّي وَلِجَوْفِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ، مِنَ الْبُكَاءِ**) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٦٣٥٥)، وَالتِّرمِذِيُّ فِي (الشمائل) برقم: (٣١٦).

واتە: چوومە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە حاڵێكـدا كـە نوێـژی دەكـرد، وە هەنـاوی بەهۆی گریانەوە وەك قوڵپـەی كوڵینی مـەنجەڵ دەنگی دەهات.

* (**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ مَسعُودٍ** رضي الله عنه**، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ **{اقْرَأْ عَلَيَّ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي}، فَقَرَأْتُ سُورَةَ النِّسَاءِ، حَتَّى بَلَغْتُ إِلَى قَوْلِهِ:** ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ ﴾النساء، **قَالَ: فَرَأَيْتُ عَيْنَي رَسُولِ اللَّهِ تَهْمِلَانِ**) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٥٥٨٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٦٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٢٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٤٢) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٦٧٣).

واتـە: عـەبدوڵڵای كوڕی مـەسعوود – خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێی فەرمووم قورئانم بەسەردا بــخوێنەوە، گــوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا مــن بەسەرتدا بـخوێنمەوە لە حاڵێكدا كە بۆ سەر تۆ دابەزێنراوە؟ فـەرمووی: مــن حـەز

دەكەم لە یەكی دیكە ببیستم، منیش سورەتی (**النســاء**)م بەسەردا خوێندەوە هەتا گەیشتمە: (وە تۆمان وەك شایەد بەسەر ئەوانەوە هێنا) دەڵێ: ئێدی چاوەكانی پێغەمبەری خوام ﷺ دیتن فرمێسكیان لێ هەڵدەڕژان.

* **(عَنْ أَنَسٍ** رضي الله عنه**، قَالَ: شَهِدْنَا ابْنَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ عَلَى الْقَبْرِ، فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَدْمَعَانِ، فَقَالَ: هَلْ فِيكُمْ رَجُلٌ لَمْ يُقَارِفْ اللَّيْلَةَ؟ فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: نَعَمْ أَنَا، قَالَ فَانْزِلْ، قَالَ: فَنَزَلَ فِي قَبْرِهَا)** أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٢٩٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٢٢٥).

واتە: ئامادەی ناشتنی كچێكی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، پێغەمبەری خواش لەسەر گۆڕەكە (واتە: لە نیزیكەوە) دانیشتبوو، چاوەكانیم بینین فرمێسكیان لێدەهاتن، فەرمووی: پیاوێكتان لەنێودایە دوێنێ شەو هیچی نەكرد بێ؟ (واتە: لەگەڵ هاوسەری جووت نەبووبێ) ئەبو طەڵحە گوتی: من، فەرمووی: دابەزە، ئیدی دابەزییە نێو گۆڕەكەی (بە مەبەستی خستنیە گۆڕەوە).

كەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حاڵەتی جۆراوجۆرو بەبۆنەی جۆراو جۆرەوە گریاوە، لەكاتی نوێژكردندا، لەكاتی قورئان خوێندراندا، وە لەكاتی مردنی خۆشەویستو نیزیكانیدا... هتد.

شایانی باسیشە فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەفامرێتەوە، كە واباشە مرۆڤی مسوڵمان هەوڵ بدات، ئەگەر گریانی لەبەر خوا عزّ وجلّ لە پێكەنینی زیاتر نەبێ، یان یەكسان نەبن، بەلای كەمەوە جاروبار گریانی هەر هەبێ، ئەمەش فەرموودەكەیە:

* **(عَنْ أَنَسٍ** رضي الله عنه**، قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ خُطْبَةً، مَا سَمِعْتُ مِثْلَهَا قَطُّ قَالَ: {لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا}، قَالَ: فَغَطَّى**

www.alibapir.com


**أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وُجُوهَهُمْ، لَهُمْ خَنِينٌ**[١]) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٦٢١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٥٩).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی بۆ داین هەرگیز وتاری وام نەبیستبوو، فەرمووی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم زانیباتان، کەم پێدەکەنین‌و زۆر دەگریان، ئیدی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا دەم‌و چاوی خۆیان داپۆشی‌و بەکوڵ دەگریان.

هەروەها ئەم فەرموودەیە لێشی وەردەگیرێ، کە مرۆڤی مسوڵمان هەتا زاناتر بێ، گریانی لەبەر خوا زیاترو پێکەنینی (مەبەست پێکەنینی بە قاقایە) کەمتر دەبێ.

## سێزدەیەم: نووستن‌و لە خەو هەڵستانی :-

کۆتا بڕگەمان لە باسی هەڵس‌وکەوتی ئاسایی‌و ڕۆژانەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بریتیە لە خستنە ڕووی چۆنیەتی‌و شێوازی خەوتن‌و لە خەو هەڵستانی، لەبەر تیشکی چەند دەقێکی سوننەتدا:

* (**عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ إِنَّ النَّبِيُّ ﷺ كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجِعَهُ، وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى تَحْتَ خَدِّهِ الأَيْمَنِ، {وَقَالَ رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ}**) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٦٥٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٩٩) وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح التِّرمِذِي) برقم: (٢٧٠٥).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو کە ڕادەکشا (بۆ خەوتن) دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستی‌و دەیفەرموو: پەروەردگارم ! ئەو ڕۆژە کە بەندەکانت زیندوو دەکەیەوە، لە سزات بمپارێزە.

---

١) الخَنين: بالخاء المُعجمة: هو البكاءُ مع غُنَّةٍ وانتشاق الصوت من الأنف، رياض الصالحين، ص(٩٢)، واتە: (خنين) گریانێکی بە لوشمە لوشمەوە بێ، بەکوردی دەڵێن: پڕمەی گریان.

www.alibapir.com


* (عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ، قَالَ: {اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَبِاسْمِكَ أَحْيَا، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ، قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَمَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ}) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٣١٤).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو، کە دەچۆ سەرجێگاکەی (بۆ نووستن) دەیفەرموو: ئەی خوایە! بە ناوت دەمرمو دەژیم، وە ئەگەر بێدار دەبۆوە، دەیفەرموو: ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە پاش ئەوەی مرادبووینی زیندووی کردینەوەو هەر بۆلای ویش دەچینەوە.

* (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ فَنَفَثَ فِيهِمَا، وَقَرَأَ فِيهِمَا: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَ(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وَ(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا رَأْسَهُ، وَوَجْهَهُ، وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ، يَصْنَعُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٥٠١٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١٩٢) وَغَيْرُهُم.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەوێك، کە دەچووە سەر جێگایەکەی هەردووك لەپەدەستی کۆدەکردنەوەو بە فووپێداکردنەوە ئەم سێ سوورەتەی تێدا دەخوێندن: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وە (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وە (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) پاشان ئەوەندەی توانیبای لە جەستەی هەردووك لەپەدەستی خۆی پێدا دەهێنا، بەسەرو دەموچاوی دەستی پێدەکرد، وە بەلای پێشەوەی جەستەی سێ جاران ئەوەی دەکرد.

* (عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رضي الله عنه، قَالَ إِنَّ النَّبِيُّ ﷺ كَانَ إِذَا عَرَّسَ بِلَيْلٍ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ، وَإِذَا عَرَّسَ قُبَيْلَ الصُّبْحِ نَصَبَ ذِرَاعَهُ وَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى كَفِّهِ) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٨٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بە شەو لە ڕێگاو سەفەردا لایدابایە بۆ ئیسراحەت کردن لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا، بەڵام ئەگەر پێش بەرەبەیان بووایە، باسکی دەچەقاندو سەری دەخستە سەر لەپی دەستی (بۆئەوەی خەوەکەی قووڵ نەبێ زوو خەبەری بێتەوە).

* **(عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ نَامَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قَالَ: {اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ})** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٣١٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٠٥٩)، بِلَفْظٍ قَرِيبٍ مِنْهُ، وَفِي رِوَايَةٍ لَهُمَا أَنَّهُ قَالَ ﷺ: لِبَرَاءٍ: **(اجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَقُولُ)**.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ، کە دەچووە سەر جێگاکەی، لەسەر لای ڕاست ڕادەکشا پاشان دەیفەرموو:

ئەی خوایە! خۆمم بە تۆسپارد، وەڕووی خۆم لە تۆ کرد، وە کاری خۆم حەواڵەی تۆ کرد، وە پشتم بە تۆ بەست، خۆشم دەوێی‌و لێت دەترسم، هیچ پەناو دەربازگە نین لە تۆ مەگەر بۆلای تۆ، بڕوام بەو کتێبەت هێناوە کە ناردووتە خوار، وە بەو پێغەمبەرەت کە ڕەوانەت کردوە، وە لە ڕیوایەتێکدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەڕائی کوڕی عازیبی فەرمووە: ئەم قسانە بکە بە دوایین قسەت لەسەر جێگای خەوتن.

www.alibapir.com

کەواتـە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەوتنــیش هـەم پـێش نووستــنو هـەم پـاش بێداربوونەوەشی، هەر بەدەم یـادی خـواو پاڕانـەوەوە خـەوتوەو لـە خـەو هەڵساوەو هەمیشە دڵی موبارەکی پەیوەست بووە بە خواوە (سـبحانە وتعـالی)، دیـارە هەر ئـەو هـەردەم دڵ بـە خـــواوە پەیوەسـت بوونەشـی بـووە، کـە لـە هـەموو ئاکـارو ڕەوشـــتێکی بـەرزو جـوانیو لـە سـەرجەم کـردەوەو ڕەفتـارو هەڵوێسـتەکانیدا لـە لووتکەی هەرە بەرزدابێ.

**ئێسـتاش بـە پێویسـتی دەزانــم لـە چـوار خاڵانـدا بـە کـورتی باسـی: تەمـەنی موبـارەکیو، کـۆچی دوایـی کـردنیو، میـراتلێگیـرانیو، خـەون پێـوە بینـرانی بکـەین:**

لە ڕێی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

چواردەیەم: تەمەنی پڕ بەرەکەتی :-

* (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، مَكَثَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَكَّةَ ثَلاثَ عَشْرَةَ سَنَةً، يُوحَى إِلَيْهِ، وبالمَدِينة عَشْراً، وَتُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاثٍ وَسِتِّينَ سَنَةً) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٦٨٩).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سێزدە ساڵان لە مەککە مایەوە، وەحی بۆ دەهات، وە لە مەدینەش دە ساڵان مایەوە، وە لە تەمەنی شەستو سێساڵییدا کۆچی دوایی کرد.

* (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلا الْقَصِيرِ، وَلَيْسَ بِالأَبْيَضِ الأَمْهَقِ، وَلَيْسَ بِالآدَمِ، وَلا بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلا بِالسَّبْطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، وَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً، وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعَرَةً بَيْضَاءَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٥٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٢٣٥).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ باڵای نە زۆر درێژ بوو نە کورت بوو، وە ڕەنگی نە زۆر سپی بوو، نە ئەسمەریش بوو، وە قژی سەری نە گرژو لوول بوو نە خاویش بوو، خوا پاش چل ساڵیی ڕەوانەی کرد، دە ساڵان لە مەککە بوو، دە ساڵانیش لە مەدینە بوو، وە خوا پاش شەست ساڵیی بردیەوە، لە سەرو ڕیشیدا بیست مووی سپی نەبوون.

* (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَاتَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاثٍ وَسِتِّينَ سَنَةً) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٢٣٨).

واتە: پێغەمبەر لە تەمەنی شەستو سێ ساڵییدا مردوە.

شایانی باسیشە فەرموودەکەی ئەنەس - خوا لێی ڕازی بێ -، کە باسی دە ساڵ مانەوەی پێغەمبەر دەکات لە مەککە کە لەڕاستیدا سێزدە ساڵ بووە، وا دیارە مەبەستی پێ دە ساڵی ئاشکرا بووە لە تەمەنی موبارەکی پێغەمبەرایەتی، چونکە سێ ساڵان بە پەنهانیی بانگەوازی کردوە.

هەروەها، کە باسی شەست ساڵیی کردوە، یان وایزانیوە، کە ئەوەندە بووە، یان بەپێی باوی خۆیان بە پێویستی نەزانیوە سێ ساڵەکە باس بکات.

کەواتە:

پێغەمبەری خوا ﷺ شەستو سێ (٦٣)ی ساڵی مانگیی ژیاوە، بەمجۆرە:

چل (٤٠) ساڵی پێش پێغەمبەرایەتیو وەحی بۆ هاتنی.

سێزدە (١٣) ساڵی مەککە، سێ (٣)ی پەنهانو دە (١٠)ی ئاشکرا.

دە (١٠) ساڵی مەدینە.

٤٠+١٣+١٠ = ٦٣ ساڵ .

## پازدەیەم: کۆچی دوایی کردنی : -

* **(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: آخِرُ نَظْرَةٍ نَظَرْتُهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَشْفُ السِّتَارَةِ يَوْمَ الاثْنَيْنِ، فَنَظَرْتُ إِلَى وَجْهِهِ كَأَنَّهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ، وَالنَّاسُ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه، فَكَادَ النَّاس أَن يَضطَرِبوا، فَأَشَارَ إِلَى النَّاسِ أَنِ اثْبُتُوا، وَأَبُو بَكْرٍ يَؤُمُّهُمْ ، فَأَلْقَى السَّجْفَ وَتُوُفِّيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ)** أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤١٩).

واتە: ئەنەس - خوا لێی ڕازی بێ - دەڵێ: دوایین ڕوانینم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەممە بوو، کە پەردە لادرا (پەردەی سەر دەرگای ژووری عائیشە، کە پێغەمبەری لێبوو) تەماشای ڕوویم کرد، وەك پەڕی موصحەف بوو، خەڵکیش

لە پشت ئەبوبەکرەوە - خوا لێی ڕازی بێ- بوون (پێش نوێژیی بۆ دەکردن) خەڵکەکە خەریك بوو نوێژەکەیان تێکبدەن، بەلاَم (پێغەمبەر) ئاماژەی بۆ خەڵکەکە کرد، کە مەجووڵێن! ئەبوبەکریش پێشنوێژیی بۆ دەکردن، وە پەردەکە دادرایەوەو پێغەمبەریش ﷺ لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا کۆچی دوایی کرد.

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ النبيَّ ﷺ وَهُوَ مُسْتَنِدٌ إِلَيَّ، يَقُولُ: {اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وارْحَمْنِي، وأَلْحِقْنِي بالرَّفِيقِ الأَعْلَى})** أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٩٨٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤١٧٦) وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٤٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٩٦)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَغَيْرُهُم.

واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ-، گوتوویەتی: لەکاتێکدا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشی مەرگیدا، پاڵی بەمنەوە دابوو گوێم لێبوو دەیفەموو: ئەی خوایە! لێم ببوورەو بەزەییت پێمدابێ‌و بە هاوەڵانی باڵاوە پەیوەستم بکە، (واتە: فریشتەکان‌و ڕووحی پێغەمبەران)

* **(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ بالـمَوتُ وَعِنْدَهُ قَدَحٌ فِيهِ مَاءٌ، وَهو يُدْخِلُ يَدَهُ فِي الْقَدَحِ، ثُمَّ يَمْسَحُ وَجْهَهُ بِالْمَاءِ، ثُمَّ يَقُولُ: {اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى غَمَرَاتِ الْمَوْتِ، وسَكَرَاتِ الـمَوت})** أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٩٦)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَضَعَّفَهُ الألباني.

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ لە کاتی مردندا بینی، وە قاپە ئاوێکی لەلا بوو، دەستی دەخستە نێو قاپەکەو، دەموچاوی خۆی بە ئاوەکە دەسڕی، ئینجا دەیفەرموو: ئەی خوایە! لەسەر ئازارەکانی مەرگ‌و بێهۆشییەکانی مردن هاوکارییم بکە.

کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن ژیانێکی ئاسایی بەشەرانەی گوزەراندوەو ژیاوە، لە ڕووە ماددییەکەیەوە، بەلاَم لەبەر ڕۆشنایی وەحی‌و ئاڕاستەکردنی خوای

www.alibapir.com


پەروەردگاردا، بەهەمان شێوەش بە مردنێکی ئاسایی کۆچی دوایی کردوە، وەك سەرجەم مرۆڤەکان، وەك خوای بەرزومەزن و بێ هاوتاش پێی فەرموو بوو: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الزمر، واتە: بێگومان تۆش دەمری و ئەوانیش دەمرن.

لێرەشدا بە پێویستی دەزانم لەبەر تیشکی ئەو سێ دەقەدا، کە لەبارەی کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ هێنامانەوە، ئاماژە بە سێ مەسەلان بکەم:

**یەکەم:** وەك لە دەقی یەکەمدا دەبینرێ پێغەمبەری خوا ﷺ پێش کۆچی دوایی چاوی موبارەکی بە دیمەنی نوێژی بەکۆمەڵی هاوەڵانی ڕۆشن بۆتەوە، کە هاوەڵی هەر نیزیك و دڵسۆزو خۆشەویستی (أبوبکر الصدیق) ئیمامیان بووەو بە دڵنیاییەوە بەجێی هێشتوون.

**دووەم:** دوا فەرموودەو پاڕانەوەی لە دنیادا ئەوە بووە، کە خوا بیبەخشێ و لەگەڵی بە بەزەیی بێ و بە هاوەڵانی باڵاوە پەیوەستی بکات، کە ئەوە بەرزترین مەبەستی ژیانی دنیای بووە، ئەمیش لە دەقی دووەمدا دیارە.

**سێیەم:** لە کاتی مردنیدا هەستی بە ئێش و ئازارکردوەو، داوای لە خوا کردوە، کە یارمەتی بدات و هاوکاری بێ بۆ تێپەڕاندنی ئازارو ناڕەحەتییەکانی مەرگ، ئەمیش لە دەقی سێیەمدا دیارە.

هەڵبەتە چۆنیەتی مردنی پێغەمبەری خواش ﷺ وەك ژیانەکەی بۆ ئێمە جێگای گەلێك دەرس و پەندی جۆراوجۆرە.

**شازدەیەم: میراتی :-**

*** (عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ – أَخِي جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ مَوْتِهِ إِلاَّ سِلاَحَهُ وَبَغْلَتَهُ وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً)** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: (٢٧٣٩).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی مردنی دا هیچی بەمیرات بەجێ نەهێشت، جگە لە چەکەکەی و ئێسترەکەی و زەوییەك، کە کردبوویە خێر.

* (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: {لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ}) صحيح البُخَارِيُّ: (٢٦٦٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، ئێمە (پێغەمبەران) میراتمان لێناگیرێ هەرچی بەجێی بهێڵین، خێرە (بۆ خەڵکی).

* (عَنْ أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: لا يَقْتَسِمُ وَرَثَتي ديناراً، ما تركْتُ بعد نفقةِ نسائي ومؤونة عاملي، فهو صدقة ) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: (٢٧٧٦).

واتە: میراتگرەکانم یەك دینار دابەش ناکەن، ئەوەی بەجێم هێشتوە پاش جیاکردنەوەی بژێوی هاوسەرانم و کرێی کرێکارەکەم، ئەوە دەکرێتە خێر.

* (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، دِينَارًا، وَلا دِرْهَمًا، وَلا شَاةً، وَلا بَعِيرًا) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٢٢٢)، ومُسْلِمٌ: (١٦٣٤) بلفْظ قريب مِنْهُ.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نە دینارێك نە درەمێك و، نە مەڕێك نە حوشترێکی بە میرات بەجێ نەهێشت.

کەواتە:

پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی بەمیرات بەجێ نەهێشتوە، جگە لە پێداویستییەکانی ڕۆژانەی خۆی و ئەوانیشی کردۆتە خێر بۆ خەڵکی!

بەڵێ ئاوا دەبێ بۆ خوا ژیان و تەنیا بە هیوای ژیانی ڕۆژی دوایی بوون!

www.alibapir.com


**حەڤدەیەم: خەون پێوە بینـرانی : -**

بێجگە لە پابەندیی بە سوننەتو ڕێبازی پێغەمبەری خواوە ﷺ، ئێمە هیچ ڕێیەکی دیکەمان نیە بۆ نیزیکی لە پێغەمبەرەوە، بەڵام وێڕای پابەندیی بە سوننەتەوە، بۆ هەندێك كەس دەگونجێ لەڕێی خەون پێوە بینینیشەوە، بەهرە لە ئاراستەكردنو ڕێنمایی پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرن، بەڵام بێگومان مەرجی ئەو جۆرە خەونانەش[1] ئەوەیە، كە لە شیرازەی قورئانو سوننەت نەچنە دەرێ، پاشان زیاتر وەك: دڵخۆشكردنو وریاكردنەوەو بەرچاو ڕوونیی... سوودیان لێوەربگیرێ، چونكە ئیسلام تەواوو كامڵەو تەنیا لە قورئانو سوننەتیشدا كورت هەڵاتوەو، خەون بە بەڵگەی شەرعیی دانانرێو حەڵاڵو حەرامو، ئەمرو نەهی، تەنیا لە شەریعەت وەردەگیرێن.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی خەون پێوە بینرانیەوە، چەند شتێكی گرنگی فەرمووە، كە بۆ ئەو كەسانەی خوای بە بەزەییو بەخشەر لەوبارەوە بەهرەمەندی كردوونو بەهرەمەندیان دەكات، مـوژدەو دڵخۆشیی زۆریان تێدایە، ئەمەش چەند نموونەیەكی ئەو جۆرە فەرموودانەنو لە پێشەوەشیان دوو فەرموودە لەبارەی خەونەوە بە گشتی دێنینەوە:

*** (عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: {لَمْ يَبْقَ مِنْ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الْمُبَشِّرَاتُ، قَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ})** أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٥٨٩).

---

١) لە كتێبی: (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)دا بە درێژیی باسی خەونمان كردوە، هەروەها لە بەرگی دووەمی كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا دیسان توێژینەوەیەكمان لەبارەی خەونو خورپە (الرؤيا والإلهام)ەوە كردوە.

واتــە: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: جــگە لــە دڵخۆشـکەرەکان هیچ شتێك لــە پێغەمبــەرایەتی نەماوەتـــەوە، گوتیـان، دڵخۆشـکەرەکان چیـــن؟ فەرمووی: خەونی باشــە.

* (عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: {إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَـدْ تَكْـذِبُ رُؤْيَـا الْمُؤْمِـنِ، وَرُؤْيَـا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِـتَّةٍ وَأَرْبَعِـينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُـوَّةِ}) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، الْبُخَارِيُّ برقم: (٧٠١٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣).

واتە: ئەگەر کاتی ڕۆژی دوایی نیزیك بـۆوە، بەدەگمـەن خـەونی بـڕوادار ناڕاسـت دەرناچێ، وە خەونی بڕوادار بەشێکە لە چل‌و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

* (عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه قَـالَ: قَالَ رَسُـــولُ اللهِ ﷺ: {مَـنْ رَآنِـي فِـي الْمَنَــامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَـةِ، أَوْ كَأَنَّمَا رَآنِي فِي الْيَقَظَـةِ، لاَ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي}) مُتَّفَقٌ عَلَيْـهِ، الْبُخَـارِيُّ برقـم: (٦٩٩٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٦).

واتە: هەر کەسێك منی لە خەونیدا بینی، ئەوە بـە بێدارییش دەمبینـــێ، یـان: وەك بـە بێداریی بینیـبمی، شـەیتان ناچێـتە سـەر شێوەم.

* (عَـنْ أَبِي قَـتَادَةَ رضي الله عنه قَـالَ: قَالَ رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ: {مَـنْ رَآنِـي (يَعْنِـي فِـي النَّوْمِ) فَقَـدْ رَآنِـي الْحَـقَّ}) أَخْـرَجَهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٢٦٥٩)، وَقَـالَ شـعيب الأرنـؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: هەرکەسێك منی بیـنی (واتە لە خـەودا) ئەوە هـەقی بینـیوە.

* (عَـنِ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه قَـالَ: قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَـدْ رَآنِـي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لا يَتَصَـوَّرُ -أَوْ قَــالَ: لا يَتَشَـبَّهُ بِـي-}) أَخْـرَجَـهُ أَحْـمَـد بـرقـم: (٢٢٦٥٩)، وَقَالَ شـعيب الأرنـؤوط: إِسـنَادُهُ صَـحِيحٌ عَلَـى شَـرْطِ الشَـيْخَيْن.

واتە: هەر کەسێك لە خەودا بینیمی ئەوە (بەڕاستی) بینیومی، چونکە شەیتان خۆی بە من وێنا ناکات، یان فەرمووی: خۆی بە من ناچوێنێ.

* (عَنْ عَبدالله بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ بِي}) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٧٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (مختصر الشمائل) برقم: (٣٤٣).

واتە: هەر کەسێك لە خەودا بینیمی ئەوە (بەڕاستی) بینیومی، چونکە شەیتان ناچێتە سەر شێوەم.

کەواتە:

خەون (رؤیا) بینین بە پێغەمبەری خواوە ﷺ نیعمەتێکی گەورەیەو جیاوازییەکی بنەڕەتیشی لەگەڵ سەرجەم خەونەکانی دیکەدا هەیە، ئەویش ئەوەیە بە پێی ئەو جەختکردنەوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە بابای خەون بین (صاحب الرؤیا) دڵنیایە، کە ئەو کەسەی لە خەوندا بینیویەتیو بە خزمەتی گەیشتوە، وەك پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، ئەوە پێغەمبەری خوایەو هیچ وەهمو گومانو بەهەڵەداچوونێك لە ئارادا نیە.

**لـە کۆتـایی ئـەم لێکۆڵینەوەشـدا لـەبارەی کەسـایەتیی پێغـەمبەری خاتـەمـەوە ﷺ دەڵـێـین : -**

بێگومان حیکمەتو ئامانجی گەورەو گرنگی ئاشنا بوون بە کەسایەتییو ڕەوشتو ئاکاروخەسڵەتە بەرزو ناوازەکانی پێغەمبـەری کۆتـایی موحەممـەد ﷺ، ئەوەیـە، کـە بیکەینە مامۆستاو چاوساغو سەرمەشقمانو، ڕەوشـتو ڕەفتـارو ئاکارەکـانی بکەینـە ئاوێنە، کە خۆمانو هەڵسوکەوتو ئاکارەکانمانی تێدا ببینینو، بیانکەینە تـەرازوو و پێوەرێك، کە خۆمانو کاروکردەوەو هەڵوێستەکانمانی پێ هەڵسەنگێنینو بپێوین.

وەك **(الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)** گوتوویەتی: **(سَأَلْتُ خَالِي هِنْدُ بْنُ أَبِي هَالَةَ، وَكَانَ وَصَّافًا، عَنْ حِلْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ وأنا أَشْتَهِي أَنْ يَصِفَ لِي مِنْهَا شَيْئًا أَتَعَلَّقُ بِهِ...)**.

واتە: پرسیارم لە خاڵم هیندی کوڕی ئەبی هالە، کە زۆر وەسفکەر بوو، کرد، لەبارەی ئاکارو ڕەوشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ، کە من ئارەزووم بوو شتێکم لەبارەیەوە (واتە: لەبارەی ڕەوشتو ڕەفتاری پێغەمبەرەوە) بۆ باس بکات، تاکو پێیەوە پابەندبم.

بەڵێ، ئامانجو حیکمەتی ئاشنایی بە کەسایەتیی پێغەمبەری خواو شارەزابوونی ئاکارو ڕەوشتو خەسڵەتو هەڵسوکەوتو هەڵوێستەکانی بریتییە لە پێوە پەیوەستبوونی:

**(أَتَعَلَّقُ بِهِ)** !

خوا بە لوطفو بەزەیی بێ سنووری خۆی یارمەتیمان بدات، کە پێغەمبەرە ڕەوشت مەزنو کۆتاییەکەی، بکەینە سەر مەشقی ژیانی تاکییو خێزانییو

www.alibapir.com

کۆمەڵایـەتیی‌و سیاسـییمان‌و بـەو هۆیەشـەوە سـەربەرزیی‌و بەختـەوەریی دنیـاو سـەرفرازیی‌و، بە مراد گەیشتنی قیـامەت وەدەست بێنیـن. ئامیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَه إِلاّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتوبُ إِلَيْكَ.

٢٤ی ڕەجەبـی ١٤٣٣هـ
١٣ ی حوزیرەانی ٢٠١٢ز
هـەولێر

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

# بەرهـەمـەكانی دانـەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦,

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچكان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- كۆمەڵی خـوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید كێیەوچۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ كامەیە؟! چاپی ١/ ١٩٨٩

تێبینی: دواتر خرایە نێو كتێبی (مسوڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .

٨- ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون. چاپی ٥ /٢٠١٢

تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبیو لەژێر چاپە .

٩- كوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

١٠- حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١١- سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥

١٢- مسـوڵمانی كامڵ/بەشی یەكەم: بیروبڕوای مسوڵمان. چاپی ١٩٩٧/١

تێبینی: ((دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسـەری كێشـەی كورد لە نێوان ئیمانو پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٥- بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و ئایندەیەكی گەشو ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیسـلامییەكانی كوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٨- ئیسلام‌و کێشـە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٥

١٩- با وریا بین! داڕووخـانی ڕەوشـت کۆمەلگاکــەمان بـەرەو هەڵدێر دەبــات. چــاپی ٢ /,٢٠٠٦

٢٠- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بەگشتی، پاك‌وخاوێنی .

٢١- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن .

٢٢- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشین‌و زەکات.

٢٣- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەج‌و عومرە، زیکری خوا.

٢٤- گەڕانەوە بۆ لای خـوا ﷻ . چاپی ٥ /٢٠١٠

٢٥- زانایانی ئیسـلام کێن‌و چۆنن ؟! چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەڕەبیش وەرگێڕراوە.

٢٦- بنچینە گرنگـەکانی هەڵس‌وکەوتی شەرعییانـەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییـەکاندا، چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسـلامیی)یە، بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوەو چاپیش کراوە.

٢٧- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٨- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی‌یەو چۆنە؟ چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٩- بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن .

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٣٠- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج‌و هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٣١- پاسـاوو بەڵگـە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسـلامیی، ئاڵقـەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٢- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی‌و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /,٢٠٠٠

٣٣- ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەت دا . چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٤- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٦- ستووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٧- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٨- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لە ڕێی خواداو چەندسەرنجو ئاگادارییەك. چاپی ١/ ٢٠٠٢

٤٠- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٤١- جیهاد لەڕێی خوادا چی‌یەو بۆچی دەکرێ‌و چۆن دەکرێ؟ چاپی١/ ٢٠٠٢,

٤٢- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٤٣- کارو پرۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢ / ٢٠٠٦ .

٤٤- ئیسلامو مسوڵمانەتی‌وکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٥- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی چی‌یەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٦- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگاریێتی دا. ١٣ تا ٢٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

